# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی سی و سێیەم

سوورە تەکانی

(العلق) و(القدر) و(البينة) و(الزلزلة) و(العاديات)
و(القارعة) و(التكاثر) و(العصر) و(الهمزة) و(الفيل)
و(قريش) و(الماعون) و(الكوثر) و(الكافرون)و(النصر)
و(المسد) و(الإخلاص) و(الفلق) و (الناس)

عەلی باپیر

# تەفسیری نۆزدە سوورەتەکانی

# العلق تاکو الناس

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٨٥٦ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّـهِ نَحْمَـدُهُ وَنَسْـتَعِينُهُ، وَنَسْـتَغْفِرُهُ، وَنَعُـوذُ بِاللَّهِ مِـنْ شرُورِ أَنْفُسِـنَا، وَمِنْ سَـيِّئَاتِ أَعْمَالِنَـا، مَـنْ يَهْـده اللَّـهُ فَـلاَ مُضِـلَّ لَـهُ، وَمَـنْ يُضلِـلْ فَـلاَ هَـادِيَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَن لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيـكَ لَـهُ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسـولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١ ﴾ الأحزاب .

أَمَّـا بَعْـدُ: فَـإِنَّ أَصْـدَقَ الحَدِيـث كَلَامُ اللَّـه، وَخَـيْرَ الْهَـدِي هَـدْيُ مُحَمَّـد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُـلَّ بِدْعَةٍ ضَـلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَـلاَلَةٍ فِي النَّـار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هیچ گومانی تێدانییە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیـش - کـە وەك باسـکردنی چاکـەی خـوا (**التحـدّث بنعمـة اللّـه**) دەیخـەمەڕوو- لـەوەتی فامـم کردۆتـەوە، خـوای بەبەزەیـی و بەخشـەر چاکـەی لەگـەڵ کـردووم و، بـە فەرمایشـتی بـەرزو بـێ وێنـەی خۆیـەوە سـەرگەرمی کـردووم و، بـەر لـە تەمـەنی بیسـت سـاڵییەوە هیدایـەتی داوم، قورئـانی بەڕێـزو پێـز لەبـەر بکـەم و، سـەرقـاڵی خوێندنـەوەی تەفسـیرەکانی قورئـان و، تێوەڕامـانی ئایەتـە پـڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیـان بـم.

هـەر بۆیـەش تێکـڕای کتێـب و نامیلکـەو وتـارو دەرسـەکانم، کـەم و زۆر لەبـەر ڕۆشـنایی قورئـان دابـوون، کـە دیـارە هـەر ئەمـەش شـتێکی سرووشـتییە؛ ئاخـر ئایا ئیسـلام، بێجگـە لـە قورئـان پاشـان سـوننەتی پێغـەمبـەر ﷺ، کـە ئەویـش هـەر ڕوونکردنـەوەی قورئـان و چۆنیـەتی جێبەجێکـردن و کارپێکردنیـەتی، شـتێکی دیکەیـە؟! بێگومـان نەخێـر.

ئنجـا لەمێـژ ساڵیش بـوو، کـە بـراو خوشـکانێکی دڵسـۆزی نزیـك و ئاشـنام، داوایـان لێدەکـردم کـە دەسـت بکـەم بـە دانـانی تەفسـیرو لێکدانەوەیـەکی قورئـان، هـەتا لـە ڕەمـەزانی سـاڵی (١٤٢٨)دا هاتـە دڵمـەوە، کـە نـاوی خـوای لێبهێنـم و دەسـت بـەو کارە گـەورەو گرنگـە بکـەم، بەڵکـو وردە وردە بەپێـی بـوارو دەرفـەت، هـەرساڵە هـەندێکی لـێ ئەنجـام بـدەم، لەگـەڵ سـەرقاڵیی زۆرو جـۆراو جۆریشـدا، هـەتا دەرفەتێـکی وام بۆ دەڕەخسـێ کـە بتوانـم خێرایـی تێدا بکـەم و خۆمـی بـۆ یەکلایـی (**متفـرِّغ**) بکەمـەوەو، خـوا پشـتیوان بـێ تـەواوی بکـەم، ئەگـەر تەمـەن بەبەریـەوە مابێ.

سـەرچاوەی دانـانی ئـەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشـم، وێـڕای سـەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسـیرانەی کـە بـاون و، دەسـتم پێیان گەیشـتوە، بریتیە لـە وردبوونـەوەو تێوەڕامانی خـۆم لە خـودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هـەندێکی هـەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّـر بَعضُهُ بَعْضَـاً**)، پاشان سـوننەتی پێغـەمبـەری خوا ﷺ، چونکە پێغـەمبـەری خـواش ڕوونکەرەوە (**مُبَيِّن**)ی قورئـانە، وەك خـوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿...وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: هەروەها زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاكو ئەوەی بۆ خەڵكی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بكەیەوە، وە بەڵكو خۆشیان بیربكەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێكدانەوەیەكی وا بۆ قورئان پێشكەش بە مسوڵمانانی كوردستان بكەم، كە لە قورئان بوەشێتەوەو، مایەی بەهرەو سوودی خوێنەران بێ، بەتایبەتیش كە زیاتر لە سی (٣٠) ساڵە لەگەڵ قورئانی بەرزو مەزن و تەفسیرەكانی و كتێبەكانی سوننەتدا خەریكم و، دەیان كتێب و بەرهەمی جۆراوجۆرم لە زۆربەی بوارەكانی زانستەكانی شەریعەتدا پێشكەش كردوون.

شایانی باسیشە كە ئەو بیست و دوو مانگ زیندانیی كرانەم لەلایەن ئەمریكاوە - لە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاكو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێكی گەورەو گرنگ بوو، بۆ زیاتر پێدا قووڵبوونەوەی كتێبی خوا (تبارك و تعالى) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشتنی تایبەت لەبارەی زۆرێك لە ئایەتەكانییەوە، ئەم ڕاستییەش لە مەوسووعەی: **(الإسلام كما يتجلّى في كتاب اللّه تعالى)**دا زۆر چاك درەوشاوەتەوە[1]، بەڵام هەڵبەتە ناڵێم و هیچكەسیش بۆی نیە بڵێ: كە ئەم تەفسیرەی من تێروتەواوە، چونكە وێڕای سنووورداربوونی تواناو بڕستم، لە بەرانبەر كتێبی لە هەموو ڕوویێكەوە ڕەها (مطلق)و بێسنوور (لا محدود)ی خوادا، نەشمویستوە كە زۆر بەملاولادا بچم و بچمە نێو هەندێك وردەكارییەوە، كە یان من تێیدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسووعەیە ئێستا چاپ كراوەو، كەوتۆتە بەردەستی خوێنەران و، سەرجەم هەشت بەرگ و دەوری سێ هەزارو پێنج سەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هەوڵمداوە بەگشتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەكانی ئیسلام بكەم و، تاكە سەرچاوەشم قورئان بووە، وێڕای دەقەكانی سوننەت، كە لە هۆش (ذاكرة)دا بووون.

شایانی باسە ئەو مەوسووعەیە لە چاپی دووەمی دا، كراوە بە دوازدە (١٢) كتێبی سەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسانتر سوود لێ بینرانی .

شــارەزا نیـم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئان تێبـگات و، بزانـێ خـوا (تبـارك وتعــالـی) ڕاستـەوخۆ چـی پـێ فــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویستی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـاوە، خــوا بـە باشتـرین شـێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســوورەتێك بۆخــۆی شــتێکی ســەربەخۆیــەو، ســەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەستن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســت (٦٠) (حـزب)، شتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەشـدا، دیسـان حیسـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگـەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـرا دڵسـۆزە ئێسـتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـان بەردەوام بێ، هەتـا کۆتـایی ئەم تەفسیـرە سـەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسـڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هـەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرەتای سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەكی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەكی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان كردوە كە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە كۆتایی هەر بەرگێكی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەكانیانمان بە ڕیز نووسیون[1]، بەڵام لێرەش وەك جەختكردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەكانمان نووسیوە، نە پێویست دەكات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆكەیەك، كە زۆربەی تەفسیرەكان لەبارەی ئایەتێكەوە، یان ڕستەو بڕگەیەكی ئایەتێكەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر كات بیرۆكەو تێگەیشتنێكی تایبەتی یەكێك لە تەفسیرەكان هەبێ و بكەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بكەم، چ ڕەفزی بكەم، هەر كات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەكەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەكان لە كۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیكتیفا دەكەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمية) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بكەم، چونكە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێكی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

---

(١) دوایی وا بەباش زانرا ناوی تەفسیرەكان لابرێن و، لە كۆتایی كۆی بەرگەكانی [تەفسیری قوڕئانی بەرز و بەپێز]دا دەیاننووسین.

شایانی باسیشـە جاری وا هەیـە بیـرۆکەو تێگەیشـتنێکی تایبەتیـی خـۆمم، دەربارەی کۆمەڵـە ئایەتێـك یـان ئایەتێـك یـان ڕسـتەو بڕگـەیەکی ئایەتێـك، بۆ دروسـت دەبێ، وەك تێگەیشـتن و بۆچوونـی خـۆم دەینووسـم، کەچـی ڕەنگـە لـە تەفسـیـرەکانی دیکـەش - یەکێکیـان یـان زیـاتر - دا هەبێ، ئەویـش بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە مـن ئەو تەفسیـرەم نەکەوتـۆتـە بەر دیـدە، یان دیتوومـەو لەیـادم نەمـاوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله حق حمده والصلاة والسلام والبركات من الله تعالى على محمد عبده المصطفى وآله المهتدين بهديه من الصحب والأزواج والقرابة والتابعين السالكين لدربه.**

بەڕێـــــزان!

ئەمە بەرگی سی و سێیەم و کۆتایی تەفسیری قورئانی بەرز و بەپێزە و شازدە (١٦) سووڕەتەکەی کۆتایی قورئانی بەپێزی گرتووونە خۆی: (العلق-الناس).

ئەم بەرگەش بەهەمان شێوازی بەرگە پێشووەکان بەحەوت قۆناغ سووڕەتەکانمان تەفسیرکردوون و، چەمک و واتای ئایەتە بەپێزەکانمان ڕوونکردوونەتەوە.

هەروەها ژمارەیەکی زۆری کورتە باس کراونە نێواخنی تەفسیری ئایەتەکان، بەم جۆرەی خوارێ:

**یەکەم: لەسووڕەتی (العلق) دا:**

١- پێنج هەڵوەستە لەبەردەم ئەو پێنج ئایەتەدا (١-٥).
٢- کورتەباسێک دەربارەی (بوونناسی ئیسلامی).

**دووەم: لەسووڕەتی (القدر) دا:**

کورتە باسێک لەبارەی شەوی قەدرەوە.

**سێیەم: لەسووڕەتی (البیِّنة) دا:**

١- سێ کورتە سەرنج.
٢- چوار سەرنجی گرنگ.

**چوارەم: لەسووڕەتی (الزلزلة) دا:**

کورتە لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی هەردووک ئایەتی (٧و٨) و دیتنی مرۆڤ بۆ چاکەو خراپەکانی.

**پێنجەم: لەسووڕەتی (القارعة) دا:**

چەند دەقێکی سوونەت لەبارەی چەمک و واتای ئەم سووڕەتەوە.

**شەشەم: لەسووڕەتی (التكاثر) دا:**

١- نۆ فەرموودە لەبارەی لێپرسرانەوە لەسەر نازونیعمەتەکان.

٢- کورتە باسێک لەبارەی مامەڵە لەگەڵ مردووان دا.

**حەوتەم: لەسووڕەتی (العصر) دا:**

کورتە باسێک لەبارەی ڕوونکردنەوەی ئیمانەوە.

**هەشتەم: لەسووڕەتی (الفيل) دا:**

١- کورتەی بەسەرهاتی هاوەڵانی فیل.

٢- نۆ وردە سەرنج دەربارەی ئەم سووڕەتە.

**نۆیەم: لەسووڕەتی (القريش) دا:**

١- پێنج سەرنج لەبارەی ئەم سووڕەتە موبارەکەوە.

٢- کورتە باسێک لەبارەی خوا پەرستییەوە.

**دەیەم: لەسووڕەتی (الماعون) دا:**

پێوەر و تەرازوویەکی گرنگ بۆ هەڵسەنگاندنی خەڵک.

**یازدەیەم: لەسووڕەتی (الكوثر) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی بێبڕوایی و هۆکارەکانییەوە.

**دوازدەیەم: لەسووڕەتی (النصر) دا:**

١- کورتەباسێک لەبەسەرهاتی فەتحی مەککە.

٢- کورتە باسێک دەربارەی ئاین لەبەر تیشکی ئەم ئایەتە بەپێزەوە ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾.

**سێزدەیەم: لە سوورەتی (الحسد) دا:**

پێنج هەڵوەستەی پێنج هەڵوەستە لەبارەی ئەم سوورەتەوە.

**چواردەیەم: لە سوورەتی (الإخلاص) دا:**

١- حەوت وردە سەرنج لەبارەی سوورەتی (الإخلاص)ەوە.

٢- پێگەو گەورەیی ئەم سوورەتەو سوورەتی (الکافرون) و پاداشتی خوێندنەوەیان.

**پازدەیەم: لە سوورەتی (الفلق) دا:**

١- کورتە باسێک: پێگەی فەلەق و ناس و جادوولێکرانی پێغەمبەری خوا.

٢- قسەیەکی کورت و پوخت لەبارەی جادوولێکرانی پێغەمبەری خواوە.

**شازدەیەم: لەسوورەتی (الناس) دا:**

کورتەباسێک لەبارەی سوورەتی **(الفلق)** و سوورەتی **(الناس)** ەوە.

**هیواداریشم ئەم بەرگەش وەک بەرگە پێشووەکانی بەنەفەس درێژ و ڕامانەوە بخوێندرێتەوە و بەهرەو سوودی شایستەی لێوەربگیرێ.**

**سبحان ربک رب العزة عما یصفون، وسلام علی المرسلین، والحمد لله رب العالمین.**

١٤٤٥/٤/١٦ك - ٣١/ ١٠/ ٢٠٢٣ز هەولێر

# دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٥)ی (**ذي الحجـة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٨/١٥)ی زایینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیر کردنـی سـوورەتی (**العلـق**)، سـەرەتاش پێناسـەو نێـوەڕۆکی ئـەو سـوورەتە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (العلق) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە نـاوی هـەرە بـاوی: (**سُـورَةُ العلـق**)ە، بـەڵام وێـڕای ئـەوە، ئـەم ناوانەشـی بـۆ بەکارهێـنراون:

١- (سورة اقرأ باسم ربك).

٢- (سورة اقرأ باسم ربك الذي خلق).

٣- (سورة اقرأ).

٤- (سورة اقرأ والعلق).

٥- (سورة القلم).

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە لـە شـاری مەككـە دابەزیـوە، بگـرە پێنـج ئایەتـی سـەرەتای، یەكەمیـن ئایەتـن كـە لـە ئەشـكەوتی حیرائـدا دابەزیونـە سـەر دڵـی بەرزو پاكـی موحەممـەد صـەڵات و سـەلامی خـوای لەسـەربێ.

لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

**(عَـنْ عَبْـدِ اللـه بـنِ عَبَّـاسٍ ﷺ، قَـالَ: أَوَّل مَـا نَـزَلَ مِـنَ القُـرآنِ بِمَكَّـة سُـورَةُ إِقْـرَأْ بِاسْـمِ رَبِّـكَ الَّـذِي خَلَـق) (أورده الـسيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٦٥٠، وزاد نسـبته لابـن الضريـس والطـبراني وابـن مردويـه، الإسـتيعاب في بيـان الاسباب: ج٣، ص٥٣٤، قـال مؤلفـا الإسـتيعاب: صحيـح لغـيره).**

واتــە: عەبدوڵــڵای كــوڕی عەببــاس ﷺ گوتوویەتــی: یەكەمیــن شــتێك كــە لــە قورئـان لـە مەككـە دابـەزی، بریتـی بـوو لـە: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِی خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾، واتـە: ئەمـە یەكەمیـن ئایـەت بـوو، هەروەهـا چـوار ئایەتەكـەی دوای ویـش.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە موصحەفدا ژمارەكـەی: (٩٦)و، لـە دابەزینـدا ژمارەكـەی یـەك (١)ە، بـە تایبەت پێنـج ئایەتـی سـەرەتای، بـەڵام بێگومـان ئـەوەی دیكـە دواتـر بـووە، كـە دوایـی لـە كاتـی تەفسـیركردنی ئایەتەكانـدا، زیاتـر ڕوونـی دەكەینـەوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

ئایەتەكانی ئەم سووڕەتە، سێ ژمارەیان بۆ داناون:

أ- خەڵكی مەدینەو مەككە ژمارە بیست (٢٠)یان داناوە.

ب- خەڵكی شام ژمارە هەژدە (١٨)یان داناوە.

ج- خەڵکی کووفەو بەصڕاش ژمارە نۆزدە (١٩)یان داناوەو، ئەمەش لە موصحەفەکانی لای ئێمەدا تەبەننیی کراوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکیی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە چەنـد ڕاسـتییەکی یەکجـار گـەورەو گرنگـی گرتوونـە خـۆی، بـە تایبـەت پێنـج ئایەتـی سـەرەتای، کـە یەکەمیـن ئایەتـن بـۆ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دابەزیـون، ئایەتەکانـی: (١ - ٥).

دوایـی لـە سـێ ئایەتـی (٦ و ٧ و ٨)دا، باسـی یاخیـی بوونـی مـرۆڤ کـراوە، لـە کاتـی هەسـتکردنی بـە هەبـوون و بـە دەستڕۆیشـتوویەتیی و دەسـتکراوەیی و، بـێ ئاگابوونـی دا لـە گەڕانـەوەی بـۆ لای خـوا.

پاشـان لـە ئایەتەکانـی: (٩ - ١٨) دا، باسـی وێنەیەکـی مرۆڤـی یاخیـی کـراوە، کـە ڕێگریـی لـە خواپەرسـتیی دەکات، لـە حاڵێکـدا ئـەو خواپەرسـتە لەسـەر ڕێـی ڕاسـتە و فەرمانکاریشـە بـە پارێزکاریـی، دوایـی هەڕەشـە لێکردنـی بـە گرتنـی تووکـی پێشـە سـەری بـە توندیـی و، بانگکردنـی دۆزەخەوانـەکان بـۆ سـزادانی، کـە زۆربـەی هـەرە زۆری ڕوونکەرەوانـی قوڕئـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتانـە لەبـارەی ئەبـوو جەهلـەوە دابەزیـون، کـە ڕێگریـی کـردوە لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ یاخـود هەڕەشـەی لێکـردوە نەهێڵـێ نوێـژ بـکات، لـە ئایەتـی کۆتایـی ژمـارە (١٩) نـۆزدەش دا، فەرمـان بـە پێغەمبـەر ﷺ کـراوە کـە بـە قسـەی ئـەو بێبـڕوا لـە خـوا یاخییـە نـەکات و، کڕنـووش بـۆ خـوا ببـات و، خـۆی زیاتـر لـێ نزیـك بخاتـەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئەم سوورەتە موبارەکە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی هەن، ئێمە حەوتیان لێ دێنین:

**١)-** پێنج ئایەتی یەکەم، یەکەمین ئایەتانێکن کە دابەزیون بۆ سەر دڵی موبارەکی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕای زۆربەی هەرە زۆری، نیزیك بە یەکدەنگیی زانایان، کە ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سوورەتی **(المدثر)** و **(المزمل)**دا، ڕایەکی دیکەشمان لە جابیری کوڕی عەبدوڵڵاوە (خوا لێیان ڕازی بێ) هێنا، بەڵام ڕای ڕاست و بێ گرێ و گۆڵ، هەر ئەوەیە، وەك دواییش لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە موبارەکە، بەتایبەت ئەم پێنج ئایەتەدا، باس دەکەین.

**٢)-** دەست پێکردن بە فەرمانکردن بە بخوێنە **(إقرأ)** لە ئایەتی ژمارە یەکدا، کە لە هەموو قورئان دا، تەنیا لێرەدا ئەم وشەو تەعبیرە هاتوە.

**٣)-** ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە خوا بە قەڵەم مرۆڤی فێری ئەوە کردوە کە نەیزانیوە: ﴿ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾.

**٤)-** مرۆڤ لە کاتی هەبوون و دەستڕۆیشتندا یاخیی و بوغرا دەبێ، لە سەرکێشیی و بێ فەرمانیی دا سنوور دەبەزێنێ، ئایەتەکانی: (٦ و ٧).

**٥)-** هەڕەشەکردنی توند لە بابایەکی ڕێگر لە نوێژ کردن، ئایەتەکانی ٩ - ١٨ : ﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾.

**٦)-** فەرمانکردنی خوای پەروەردگار بە کڕنووش بردنی پێغەمبەرەکەی ﷺ و خۆ لە خوا وەنیزیك خستنی، ئایەتی نۆزدە (١٩)و کۆتایی.

**٧)-** چەند وشەو تەعبیرێك تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوون:

**١-** وشەی **(إقْرَأْ)**.

**٢-** وشەی **(عَلَق)**.

**٣-** وشەی **(وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ)**.

٤- تەعبیری (عَلَّمَ بِالْقَلَمِ).

٥- تەعبیری (أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى (٩) عَبْدًا إِذَا صَلَّى (١٠)).

٦- تەعبیری (أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى).

٧- تەعبیری (لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ).

٨- تەعبیری (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ).

٩- تەعبیری (سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ).

١٠- تەعبیری (كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِبْ).

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكانی:

ئێمە كۆی نۆزدە (١٩) ئایەتە موبارەكەكەی ئەم سوورەتە، دەكەین بە دەرسێك، لەبەر ئەوەی هەموویان تێكهەڵكێش و پێكەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەمە دەرسە كۆی نۆزدە ئایەتەكەی ئەم سوورەتە پێكدێنێ، پێشتریش باسمان كرد كە ئەم سوورەتە موبارەكە نۆزدە ئایەتەكەی پێكەوە پەیوەستن، بەڵام پێنج ئایەتی یەكەمی، یەكەمین ئایەتانێكن دابەزیون بۆ سەر دڵی موبارەكی پێغەمبەری كۆتایی ﷺ، كە خوای بەرزی مەزن تیایاندا دەفەرموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾، واتە:

بخوێنە یانی: ئەو ئایەتانەی بۆتیان دەخوێنینەوە، بیانخوێنە، بە ناوی ئەو پەروەردگارەت كە هێناویەتە دی، چی هێناوەتە دی؟ هەموو شتێكی هێناوەتە دی.

﴿ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ﴾، لە نێو دروستكراوەكاندا مرۆڤی لە خوێنپارە دروستكردوەو، خوێنپارەیی مرۆڤ قۆناغی دووەمی دروست بوونیەتی، قۆناغی یەكەم نوتفەیە، دوایی دەبێتە خوێنپارە (**علقة**)، ئنجا دەبێتە پارچە گۆشتێكی زارچوو (**مضغة**) ئاسا، دوایی دەبێتە ئێسقان، دوایی ئێسكەكان بە گۆشت دادەپۆشرێن، قۆناغی حەوتەمیش ئەوەیە كە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾**المؤمنون**، دوایی بە دروستكراوێكی دیكە دروستمان كرد، كە مەبەست پێی ڕووح بە بەرداكردنیەتی.

﴿ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ﴾، دووبارەی دەكاتەوەو دەفەرموێ: بخوێنە پەروەردگاریشت هەر بەخشندەیە، (كریم) بە مانای بەخشەرو بەخشندەیە، (**الأكرم**) یانی: هەرە بەخشندە، ئەوپەڕی بەخشەر.

ئنجا لە بەخششی خۆی نموونەیەكمان پێشان دەدات، كە گرنگترین شتە لە ژیانی بەشەردا: ﴿ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾، كە بە قەڵەم فێری كردوە، واتە: فێری

مرۆڤی کردوە، چی فێر کردوە؟ ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾، شتێکی فێری مرۆڤ کردوە کە نەیدەزانی و، نەدەگونجا بەبێ خوێندن و نووسین بیزانێ.

دوایی خوا ﷻ لە سێ ئایەتەکانی دوای ئەوەدا، ئایەتەکانی: (٦ و ٧ و ٨)، باسی جۆرە مرۆڤێکمان بۆ دەکات کە کاتێك هەست بەبێ نیازیی و دەوڵەمەندیی و دەستڕۆیشتوویی دەکات، لە خوا یاخیی و بوغرا دەبێ و لە کەوڵی خۆی دەردەچێ، دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ ﴾، نەخێر وانیە، ئەمە پەیوەندیی بە ئایەتەکانی دواییەوە هەیە، واتە: با وازبێنێ لە گومڕایی، یانی: ڕاست نیە وابکات، (ألـ)ی (الإنسان) بۆ ناساندن (**تعريف**)ەو بۆ جینسەو کۆی مرۆڤان دەگرێتەوە، بەڵام جینسی عورفیی، یانی: ئەو ئینسانانەی ئەو کاتە هەبوون و، جگە لە موحەممەد ﷺ ئەوانی دیکە هەموویان بەو شێوەیە بوون کە خوای پەروەردگار پێناسەی کردوون، ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ ﴾ مرۆڤ لەسەرپێچییدا سنوور دەبەزێنێ ﴿ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾، کاتێك خۆی بینی بێنیازو دەستڕۆیشتوو و دەوڵەمەندە، ﴿ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ ﴾، بەدڵنیایی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارتە، کەواتە با بزانێ دەچێتەوە بۆلای خاوەن و پەروەردگاری خۆی.

ئنجا لە دە (١٠) ئایەتی دواییدا، خوا ﷻ باسی کەسێکمان بۆ دەکات کە هەوڵیداوە ڕێگریی نوێژکردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکات، دەفەرموێ: ﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی کە قەدەغەو ڕێگریی دەکات لە بەندەیەك کاتێك نوێژ دەکات، کەسێك کە قەدەغەو ڕێگریی کردوە، زۆربەی هەرە زۆری ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەبوو جەهل بووە کە ناوی عەمر بووەو کونیەکەی ئەبوولحەکەم بووە، بەڵام دوایی نازناوی ئەبوو جەهلی وەرگرتوە، ئەو بەندەیەش کە ڕێی لێگیراوە، بێگومان موحەممەدە ﷺ، ﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوْ أَمَرَ بِٱلتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ ﴾، ئایا دەبینی، هەواڵم پێبدە (ئەو کەسەی نوێژ دەکات) ئەگەر لەسەر ڕێی ڕاست بێ و، فەرمانیش بکات بە پارێزکاریی،

﴿ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ ﴾، هەواڵـم پێبـدە ئەگـەر بابـای ڕێگرییـكار (پەیامـی خـوا) بـە درۆ دابنـێ و پشـتی تێبـكات، ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤ ﴾، ئایـا نازانـێ كـە خـوا دەبینـێ، دەزانـێ! لـە دواییـدا خـوا هەڕەشـەی لێـدەكات: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ١٥ ﴾، بـا وازبێنـێ، ئەگـەر وازنەهێنـێ بـە توندیـی تووكـی پێشـە سـەری ڕادەكێشـین (دەیگریـن) ﴿ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ١٦ ﴾، تووكـی پێشـە سـەری بابایەكـی درۆزنـی گوناهـكار، ﴿ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ١٧ ﴾، ئنجـا بـا ئـەو خەڵـكی یانـەو كـۆڕو دیوەخانەكـەی خـۆی بانـگ بـكات (دەفریـای بێـن) ﴿ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ١٨ ﴾، ئێمـەش فریشـتە دۆزەخەوانـەكان بانـگ دەكەیـن.

لـە ئایەتـی كۆتایـی دا خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ ١٩ ﴾، نەخێـر فەرمانبەریـی مەكـە، گوێڕایەڵیـی بـۆ مەكـە، (گوێـی پـێ مـەدەو لێـی مەترسـێ و بێبـاك بـە) كڕنـووش بـۆ خـوا بـەرەو لـە خـوا زیاتـر خـۆت نزیـك بخـەوە، كەواتـە: بەهـۆی كڕنـووش بردنـەوە مـرۆڤ زیاتـر لـە خـوا نیزیـك دەكەوێتـەوەو، مرۆڤیـش هەتـا لـە خـوا نیزیكتـر بـێ، لـە جگەلـە خـوا بـێ منەتـرو بـێ باكتـر دەبـێ و، گـوێ نـادات بـەو كۆسـپ و تەگەرانـەی دێنـە بەردەمـی.

﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ٢ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ٣ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ٤ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ٥ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ٩ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ١٢ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤ كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ١٥ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ١٦ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ١٧ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ١٨ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ ١٩ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. بخوێنە بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروستکردوە ﴿١﴾ مرۆڤی لە خوێنپارە دروستکردوە ﴿٢﴾ بخوێنەو پەروەردگاریشت هەرە بەخشەرە ﴿٣﴾ ئەو کەسەی بە قەڵەم زانیاریی فێری مرۆڤ کردوە ﴿٤﴾ ئەو (زانیاریی)ەی فێری مرۆڤ کردوە کە نەیدەزانی ﴿٥﴾ نەخێر وانیە (کە بێبڕوایان دەڵێن)، بەدڵنیایی مرۆڤ یاخیی دەبێ ﴿٦﴾ هەر کات بینی بێنیازو دەستڕۆیشتوو بووە ﴿٧﴾ بێگومان گەڕانەوە (ی هەموو لایەك بۆ سزاو پاداشت) بەس بۆ لای پەروەردگارتە ﴿٨﴾ ئایا ئەو کەسەت بینی کە ڕێگریی دەکات ﴿٩﴾ لە بەندەیەك کاتێك نوێژی کرد! ﴿١٠﴾ ئایا بینیت (هەواڵم پێبدە) ئەگەر ئەو نوێژکارە لەسەر ڕێی ڕاست بێ ﴿١١﴾ یان فەرمان بە پارێزکاریی بکات (ڕەوایە ڕێگریی لێ بکات)؟ ﴿١٢﴾ ئایا دیتت ئەگەر بابای ڕێگرییکار بەدرۆی داناو پشتی هەڵکرد ﴿١٣﴾ ئایا نازانێ خوا دەبینێ؟ ﴿١٤﴾ نەخێر با وازبێنێ، بێگومان ئەگەر وازنەهێنێ بە توندیی تووکی پێشە سەری دەگرین ﴿١٥﴾ تووکی پێشە سەرێکی درۆزنی گوناهکار ﴿١٦﴾ ئنجا با ئەو بەشداربووانی کۆڕەکەی بانگ بکات ﴿١٧﴾ ئێمەش دۆزەخەوانەکان بانگ دەکەین ﴿١٨﴾ نەخێر (ئەی موحەممەد ﷺ) بە قسەی مەکە، کڕنووش (بۆ خوا) ببەو، زیاتر (لێی) نیزیك ببەوە ﴿١٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(اقــرأ) بخوێنــە (القِـرَاءَةُ: ضَـمُّ الحُـرُوفِ والكَلِـمَاتِ بَعْضِهَـا إلى بَعْـض فِي التَّرْتِيـل)، (قِرَاءة): بریتیـە لـە پێکـەوە لکاندنـی پیـت و وشـەکان هەندێکیـان بـۆلای هەندێکیان لـە خوێندنـەوەدا.

(عَلَـقْ) (التشَـبُّثُ بالـشَّيءِ، وَالعَلَـق: دودٌ يتعلَّـق بالحلْق، والعَلَـقُ: الـدَّمُ الجَامِـدُ، وَمِنْـهُ العَلَقَـة الَّتِـي يَكُـونُ مِنْـهُ الوَلَـدُ)، (عَلَـق): بریتیـە لـە خۆهەڵواسـین بـە شـتێك، (عَلَـق) بـە کرمێـك دەگوتـرێ بـە گـەرووەوە دەنـووسرێ، هەروەهـا بـە خوێنێکـی خەسـت دەگوتـرێ، لەویشـەوە بـە وەی کۆرپەلـەی لـێ دروسـت دەبـێ، گوتـراوە: (عَلَقَـة)، چونکـە لـە قۆناغـی دووەمـی دروسـتبوونیدا بریتیـە لـە خوێنێکـی وەك زەروو، بـە دیـواری منداڵدانـەوە نووسـاو.

(الأكـرم ): (الكَـرَمُ: إِذَا وُصِـفَ بِـهِ اللـه، اسْـمُ إِحْسَـانِهِ، وَإِنْعَامِـهِ الظاهـر)، (كَـرَم): ئەگـەر بکرێتـە وەصـف بـۆ خـوا، بریتیـە لـە چاکـەو بەهرەمەندکردنـی ئاشـکرای وی، (الأكـرم) زاتێـك کـە لـە هەمـوو کـەس بەخشـەرترە.

(القلـم) (القَلَـمُ: أَصْـلُ القَلْـمِ: القَـصُّ مِـنَ الـشَّيءِ الصُّلْـب، وَمِنْـهُ تَقْلِيـمُ الأَظَافِـر)، (قَلْـم): بریتیـە لـە بڕینـی شـتێکی ڕەق، لـەوەوە گوتـراوە: (تَقْلِيـمُ الأَظَافِـر) نینـۆك کـردن، نینـۆك بڕیـن، (وَالقَلَـمُ: المَقْلُـومُ)، (قَلَـم): بریتیـە لـە شـتێك لێـی بردرابـێ، ئنجا لـەوەوە ئـەو نـاوە خوازراوەتـەوەو بەکارهێـنراوە بـۆ پێنـووس (وَخُـصَّ ذَلِـكَ بِمَا يُكْتَـبُ بِـهِ، وَجَمْعُـهُ: الأَقْـلاَم)، دوایـی قەڵـەم تایبەتکـراوە بـەوەی پێـی دەنـووسرێ و بـە قەڵەمـەکان کۆدەکرێتـەوە، بـە کوردیـی پێنـووس بەکاردەهێـنرێ بـۆ قەڵـەم، بـەڵام قەڵـەم زیاتـر نـاودارەو زانـراوە.

(ليطغى): (الطُّغْيَانُ: تَجَاوزُ الحَدِّ فِي العِصْيَانِ): (لَيَطْغى) لەسەرپێچییدا لە سنوور دەردەچێ، چونکە (طُغْيَان): بریتیە لە سنووربەزێنیی لەسەرپێچییدا.

(الرجعى): (الرُّجْعَىَ والرُّجُوعُ والمَرْجِعُ): هەر سێکیان بە مانای گەڕانەوە دێن و چاوگن.

(ينهى): (النَّهيُ: الزَّجْرُ عَنِ الشَّيءِ): (نَهي): بریتیە لە تێخوڕین بۆ ئەوەی شتێك بکرێ یان نەکرێ، واتە: ڕێگرییکردن و ڕێ لێگرتن.

(لنسفعاً) (السَّفْعُ: الأَخْذُ بنسعة الفَرَسِ، وَهِيَ سَوَادُ نَاصِيَتِهِ)، (سَفْع): بریتیە لەوەی تووکی نێوچەوانی ئەسپ بگیرێ، بەکوردیی پێی دەگوترێ: بژ، هەروەها تووکی گێزەکەی ملی ئەسپ پێی دەگوترێ: بژ، یاخود یاڵ، هەروەها (سفع) بریتیە لەوەی شتێك بە توندیی بگیرێ و ڕابکێشرێ.

(بالناصية) (النَّاصِية: قِصَاصُ الشَّعْرِ، وَالقصَاصُ جَمْعُ قُصَّة: الخَصْلَةُ مِنَ الشَّعْرِ، وَالقُصَّةُ: شَعْرُ مُقَدَّمُ الرَّأْسِ، والجع القُصَص وَالقِصَاص): (نَاصِيَة): بریتیە لە قژو پرچێك کە بە نێوچەواندا شۆڕدەبێتەوە، (قِصَاص)یش کۆی (قُصَّة)یە، ئەویش بریتیە لەو موانەی بە نێوچاواندا دێنە خوار، مووی پێشەوەی سەر.

(نادیه) (النَّادِي وَالمنْتَدَى: المَكَان المُهيَّأُ لِجُلُوسِ القَوْمِ فِيهِ) (نادي) و (منتدى) شوێنێکە ئامادەکراوە بۆ کۆمەڵە خەڵکێك تێیدا دابنیشن، وشەی (نادي) بە (أَنْدِية) و (نَوَادِي) کۆدەکرێتەوە، بە کوردیی یانەی پێ دەگوترێ، یاخود دیوەخان و شوێنی کۆڕ و مەجلیس.

(الزَّبَانِية: زَبَنَهُ أي: دَفَعَهُ، رَمَى بِهِ) واتە: پاڵی پێوەناو هاویشتی، (والزبانيَّة: الشُّرَطُ) ئەو پۆلیسانەی دادەنرێن بۆ ڕێگریی کردن لە شتی خراپ لە نێو کۆمەڵگادا، یاخود بۆ چاودێریی کردن.

هەندێك لە فریشتەکان ناوی زەبانییەیان لێنراوە، لەبەر ئەوەی ئەوانەی دۆزەخیین پاڵیان پێوەدەنێن و دەیانخەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: وشەی (زبانية) ناوی فریشتە دۆزەخەوانەکانە.

## هۆی هاتنە خوارەوی ئایەتەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خواری ئەم سوورەتە موبارەکە، زانایان زۆر شتیان باسکردوە، بەڵام لە هەموویان گرنگتر ئەم گێڕراوەیە:

{عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها أَنَّهَا قَالَتْ: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ: الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ -وَهُوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ، فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ. قَالَ: «مَا أَنَا بِقَارِئٍ»، قَالَ: «فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي، فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ﴾ العلق»، فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رضي الله عنها فَقَالَ: «زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي» فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: «لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي»، فَقَالَتْ خَدِيجَةُ رضي الله عنها: كَلَّا وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ، فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ رضي الله عنها وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الْإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ، اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَبَرَ مَا رَأَى، فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ»، قَالَ: نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ

رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلَّا عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وَفَتَرَ الوَحْيُ} (أخرجه البخاري: ٣، ومسلم: ٦٠)

واتە: عائیشەی دایکی بڕواداران ﵂ دەگێڕێتەوەو دەڵێ: سەرەتای دابەزینی سرووش بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بە شێوەی خەونی چاك بوو، هیچ خەونێكی نەدەبینی مەگەر وەك شەبەقی بەیانی دەهاتە دی، دوایی دوورەپەرێزیی و تەنیایی لەلا خۆشەویستكرا، لە ئەشكەوتی حیرادا دەمایەوە -و پەرستشی ئەنجامدەدا- چەند شەوێك دەمایەوەو نەدەگەڕایەوە بۆ نێو خانەوادەكەی (بایی ئەوەندە شەوەش) خواردنی لەگەڵ خۆی دا دەبرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە ﵂ (ئەگەر خواردنەكەی كۆتایی هاتبایە) بە هەمان شێوەی پێشوو خواردنی لەگەڵ خۆی دەبردەوە (و دەچووە ئەشكەوت)، هەتا هەق (قورئان) ی بۆ هات لە كاتێكدا لە ئەشكەوتی حیرادا بوو، فریشتەیەك هات بۆ لای پێی فەرمووو: بخوێنە، (پێغەمبەریش ﷺ) فەرمووی: «من خوێندەوار نیم»، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: ئنجا گرتمی و توند بە خۆیەوە گوشیمی، پاشان وازی لێهێنام، دوایی فەرمووی: بخوێنە! منیش گوتم: خوێندەوار نیم، بۆ دووەمجاریش گرتمی و توند بە خۆیەوە گوشیمی، پاشان وازی لێهێنام و فەرمووی: بخوێنە، منیش گوتم: خوێندەوار نیم، بۆ سێیەمجاریش گرتمی و توند بە خۆیەوە گوشیمی، پاشان وازی لێهێنام و فەرمووی: [بخوێنە! بە ناوی ئەو پەروەردگارەتەوە كە هەموو شتێكی دروستكردوە، مرۆڤی دروستكردوە لە خوێنێكی مەییو، بخوێنە! پەروەردگاری تۆ (لە هەموو كەس) بەخشندەترە] ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەلەرزو شڵەژاوییەوە هاتەوە (بۆ ماڵ) بەهۆی ئەو ڕووداوەوە، چووە ژوور بۆ لای خەدیجەی كچی خوەیلید (ی هاوسەری) ﵂ فەرمووی: «دامبپۆشن، دامبپۆشن»، ئنجا دایانپۆشی تاكو ترسەكەی نەما، ئنجا هەواڵی ڕووداوەكەی بۆ خەدیجە ﵂ باسكرد، فەرمووی: «بەڕاستیی ترسم لە خۆم بۆ پەیدابووە (شتێكم بەسەربێ)»، خەدیجەش ﵂ گوتی: نەخێر، بە خوا شتی وا ڕوونادات، خوا هەرگیز شەرمەزارت

ناکات، چونکە تۆ پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیەنی و، دەستبارگری کەسی بێتوانای و، یارمەتییدەری نەداری و، خواردنـدەری میوانـی (و ڕێزی لێ دەگری)و، هاوکاریی خەڵك دەکەی لە کاتی سەغڵەتییدا، ئنجا خەدیجە ﵂ لەگەڵ خۆی بردی تاکو گەیشتە لای وەڕەقەی کوڕی نەوفەلی کوڕی ئەسەدی کوڕی عەبدولعوززا، ئامۆزای خەدیجە بوو، لە سەردەمی نەفامییدا چوو بووە سەر ئایینی نەصرانیی و، بە زمانی عیبریی نووسینی دەکرد، بۆیە بە زمانی عیبریی ئەوەندەی خوا ویستی لەسەربایە ئینجیلی دەنووسیەوە، پیاوێکی زۆر بە تەمەن بوو، کوێر بوو بوو، خەدیجە ﵂ گوتی: ئەی ئامۆزایەکەم! گوێ بگرە لە برازای خۆت، (واتە: پێغەمبەر موحەممەد ﷺ)، وەرەقە گوتی: برازای خۆم چیت بینیوە؟ ئنجا پێغەمبەری خواش ﷺ ئەوەی بینیبووی بۆی گێڕایەوە، وەرەقە پێی گوت: ئەمە ئەو پەیکە (فریشتە) یە کە خوا ناردی بۆ لای مووسا، خۆزگە لەو کاتەدا کە بانگەوازەکەت دەکرد گەنج دەبووم، خۆزگە زیندوو دەبووم کاتێك هۆزەکەت دەربەدەرت دەکەن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: «بۆچی هۆزەکەم دەرمدەکەن؟!»، وەرەقە گوتی: بەڵێ دەربەدەرت دەکەن، لەبەر ئەوەی هەر پیاوێك هاوشێوەی ئەم پەیامەی تۆی هێنابێ، مسۆگەر دژایەتیی کراوە، ئنجا ئەگەر گەیشتمە ئەو ڕۆژگارەت بەرگرییەکی توندت لێ دەکەم، دوایی وەرەقە زۆر نەمایەوە کۆچی دوایی کردو، دابەزینی وەحییش بۆ ماوەیەك دواکەوت و نەهاتە خوار.

ئنجا دەربارەی کۆی سوورەتەکەش، بە تایبەت ئایەتەکانی: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ۝٩ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ۝١٠﴾، چەند گێڕدراوەیەك هەن، ئێمە دووانیان دێنین:

**١)- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي فَجَاءَ أَبُو جَهْلٍ فَقَالَ أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا، أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا، أَلَمْ أَنْهَكَ عَنْ هَذَا؟ فَانْصَرَفَ النَّبِيُّ ﷺ فَزَبَرَهُ، فَقَالَ أَبُو جَهْلٍ إِنَّكَ لَتَعْلَمُ مَا بِهَا نَادٍ أَكْثَرُ مِنِّي، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: (فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَوَاللَّهِ لَوْ دَعَا نَادِيَهُ لَأَخَذَتْهُ زَبَانِيَةُ اللَّهِ}، (أخرجه الترمذي: ٣٣٤٩، قَالَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ، والنسائي في تفسيره: ٧٠٤، قال الألباني: صحيح الإسناد).**

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی عەبباس ﵄ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ نوێـژی دەکـرد، ئەبـوو جەهـل هاتـە لای پێـی گـوت: ئایـا ڕێگرییـم لـەوە لـێ نەکردبـووی؟ ئایـا ڕێگرییـم لـەوە لـێ نەکردبـووی؟ ئایا ڕێگرییـم لـەوە لـێ نەکردبـووی؟ پێغەمبەریـش ﷺ ڕۆیـی و خـۆی لـێ تـووڕە کـرد، قسـەیەکی زبـری پێگـوت، ئەبـوو جەهلیـش گوتی: تـۆ دەزانـی کـە هیچکـەس لـە مـن کـۆڕو مەجلیسـی زیاتـر نیـە، ئیـدی لـەو بـارەوە خـوا عزوجـل ئەمـەی دابەزانـد: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾، بـا ئـەو کـۆڕو مەجلیسـەکەی خـۆی بانـگ بـکات ئێمـەش دۆزەخەوانـەکان بانـگ دەکەیـن، ئیبنـو عەبباس خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ دەڵـێ: سـوێند بـە خـوا ئەگـەر کـۆڕو مەجلیسـەکەی خـۆی بانـگ کردبایـە، دۆزەخەوانەکانـی خـوا بـە توندیـی دەیانگـرت.

**٢)- { عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ: هَلْ يُعَفِّرُ مُحَمَّدٌ وَجْهَهُ بَيْنَ أَظْهُرِكُمْ؟ قَالَ فَقِيلَ: نَعَمْ، فَقَالَ: وَاللَّاتِ وَالْعُزَّى لَئِنْ رَأَيْتُهُ يَفْعَلُ ذَلِكَ لَأَطَأَنَّ عَلَى رَقَبَتِهِ أَوْ لَأُعَفِّرَنَّ وَجْهَهُ فِي التُّرَابِ، قَالَ: فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي زَعَمَ لِيَطَأَ عَلَى رَقَبَتِهِ، قَالَ: فَمَا فَجِئَهُمْ مِنْهُ إِلَّا وَهُوَ يَنْكُصُ عَلَى عَقِبَيْهِ وَيَتَّقِي بِيَدَيْهِ، قَالَ فَقِيلَ لَهُ: مَا لَكَ؟ فَقَالَ: إِنَّ بَيْنِي وَبَيْنَهُ لَخَنْدَقًا مِنْ نَارٍ وَهَوْلًا وَأَجْنِحَةً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لَوْ دَنَا مِنِّي لَاخْتَطَفَتْهُ الْمَلَائِكَةُ عُضْوًا عُضْوًا، قَالَ فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (لَا نَدْرِي فِي حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَوْ شَيْءٌ بَلَغَهُ:) [كَلَّا إِنَّ الْإِنْسَانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى إِنَّ إِلَى رَبِّكَ الرُّجْعَى. أَرَأَيْتَ الَّذِي يَنْهَى. عَبْدًا إِذَا صَلَّى أَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ عَلَى الْهُدَى أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَى أَرَأَيْتَ إِنْ كَذَّبَ وَتَوَلَّى (يَعْنِي أَبَا جَهْلٍ)، أَلَمْ يَعْلَمْ بِأَنَّ اللَّهَ يَرَى كَلَّا لَئِنْ لَمْ يَنْتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ. فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ. كَلَّا لَا تُطِعْهُ واسجد واقترب} (أخرجه أحمد: ٨٨، ومسلم: ٢٧٩٧).**

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: ئەبـوو جەهـل گوتـی: ئایـا موحەممـەد ﷺ لـە نێـو ئێـوەدا دەم وچـاوی خـۆی بـە گڵـەوە دەنووسـێنێ (واتـە: کڕنـووش دەبـات؟)، پێـی گوتـرا: بەڵـێ، گوتـی: سـوێند بـەلات و عـوززا، ئەگـەر ببینـم وابـکات، دەچمـە سـەر ملـی، یاخـود دەم وچـاوی لـە گڵ وەردەدەم، دەڵـێ: هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە نوێـژی دەکـرد، پێـی وابـوو دەتوانـێ بچێتـە سـەر گـەردن

و ملی، هەر ئەوەندەیان زانی پاشەو پاش كشایەوە، بەهەردوو دەستی خۆی دەپاراست، لەو بارەوە پێی گوترا: چیتە؟ گوتی: لە نێوان من و ئەودا شیوێك لە ئاگر هەبوو! ترس هەبوو و باڵ هەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر لێم نزیك كەوتبایە، فریشتەكان پارچە پارچەیان دەكرد، ئەندام ئەندام دەیانگرت، ئیدی لەو بارەوە خوا عزوجل ئەم ئایەتە موبارەكانەی دابەزاندن، ئنجا بابای گێڕەرەوە دەڵێ: نازانین ئایا ئەوە ئەبوو هورەیرە خۆی گوتوویەتی، یاخود شتێك بووە پێی گەیشتوە، یانی: بیستوویەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئنجا خوا **عزَّ وجل** ئەو ئایەتانەی دابەزاندن (ئایەتەكانی: ٦ - ١٩).

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە، پێنـج ئايەتـى سـەرەتاى، يەكەميـن ئايەتانێكـن كـە خـوا دايبەزاندوونـە سـەر دڵـى موبارەكـى پێغەمبـەرى كۆتايـى خـۆى موحەممـەد ﷺ، بـەڵام ئايەتەكانـى دوايـى بەپێـى نێوەڕۆكيـان، ديـارە لـە قۆناغەكانـى دواتـرى تەمەنـى پێغەمبـەردا ﷺ دابەزيـون و، كاتێـك بـووە كـە بانگەوازەكـەى ئاشـكرا كـردوەو، دوژمنـان و ناحەزانێكـى بـۆ پەيدابـوون و، ويسـتوويانە ئەزيەتـى بـدەن و ناڕەحەتـى بكـەن، كەواتـە بـەلاى كەمـەوە ئايەتەكانـى ديكـە، بەتايبـەت ئايەتەكانـى: (٩ - ١٩) بـەلاى كەمـەوە لـە چـوار پێنـج سـاڵى پێغەمبەرايەتيـى بـەولاوەدا دابەزيـون.

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بەناوى خواى بەبەزەيى بەخشندە، واتە:

١- ئەم قورئانخوێندنە بەناوى خواى بەبەزەيى بەخشندە دەست پێدەكەم.

٢- ئەم قورئانە بەپێى ئايين و بەرنامەو ڕێنمايى خوا دەيخوێنم.

٣- ئەم قورئانە بۆ بەدەستهێنانى ڕەزامەنديى خوا دەيخوێنم.

٤- ئەم قورئانە بە تواناو وزەيەك كە خوا بۆى ڕەخساندووم ئەنجامدەدەم، چ قورئانخوێندن، هەر كارێكى ديكە، كە ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ى لێدەكرێ.

ئنجـا دەفەرمـووێ: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ①﴾، بخوێنـە بەنـاوى ئـەو پـەروەردگارەت كـە دروسـتيكردوە، پێشـتر هـۆى هاتنـە خوارەيەكەيـمان باسـكرد، كـە هـەر كام لـە پێشـەوايان بوخاريـى و موسـليم لـە هـەردوو صەحيحەكـەى خۆيانـدا هێناويانـەو، هەروەهـا ئيبنـو هيشـام لـە (**السـيرة النبويـة**)دا هێناويەتـى، كـە بـۆ يەكەمجـار پێغەمبـەرى خاتـەم ﷺ دواى شـەش مانـگ خەڵوەنشـينيى و خواپەرسـتيى

لـە ئەشـكەوتی حیرائـدا، لـە كۆتایـی شـەش مانگەكـەدا جبریـل لـە شـێوەی پیاوێـك دا دەچێتـە لای و، دوای ئـەوەی تونـد دەیگـرێ و بەخۆیـەوە دەیگوشـێ هەتـا تینـی دەگاتـێ، ئنجـا بـەری دەدات و پێـی دەفەرمـوێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾ بخوێنە، ئەویـش لە وەڵامدا دەڵـێ: (**مـا أنـا بقـارئ**) مـن خوێنـەر نیـم! بـۆ جـاری دووەم دەیگـرێ بەخۆیـەوە دەیگوشـێ هەتـا تینـی دەگاتـێ، ئنجـا بـەری دەدات و پێـی دەفەرمـوێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ ﴾ بخوێنـە، ئەویـش دووبـارەی دەكاتـەوە دەڵـێ: (**مـا أنـا بقـارئ**) مـن خوێنـەدەوار نیـم! ئنجـا بـۆ جـاری سـێیەم دەیگـرێ و بەخۆیـەوە دەیگوشـێ تاكـو تینـی دەگاتـێ، ئنجـا بـەری دەدات و دەڵـێ: بخوێنـە، ئەویـش دەفەرمـوێ: (**مـا أنـا بقـارئ**) مـن خوێنـدەوار نیـم! جیبریلیـش دەفەرمـوێ: ﴿ ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ ﴾، بخوێنـە، بـە نـاوی ئـەو پـەروەردگارەت كـە هێناویەتـە دی، یـانی: هەمـوو شـتێك: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴿٦٢﴾ ﴾الزمر، واتـە: خـوا بەدیهێنـەری هەمـوو شـتێكەو ئـەو بەسـەر هەمـوو شـتێكەوە چاودێـرە. ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ ﴾النحـل، واتـە: ئایـا ئـەوەی بـەدی دێنـێ و دروسـت دەكات، وەك ئـەوە وایـە كـە هیـچ بـەدی ناهێنـێ، ئایـا بیرناكەنـەوە؟

بەناوی ئەو پەروەردگارەت بخوێنە كە هەموو شتێكی هێناوەتە دی.

﴿ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ﴾ مرۆڤـی لـە خوێنپـارە دروسـتكردوە، لـە نێـو هەمـوو شـتەكاندا لێـرەدا خـوا باسـی مـرۆڤ دەكات، مرۆڤـی هێناوەتـە دی لـە (**عَلَـق**)، كـە كـۆی (**عَلَقَة**)یـەو بـە كوردیـی دەڵێیـن: خوێنپـارە، كـە قۆناغـی دووەمـی دروسـتبوونی مرۆڤـە، بەڵكـو ئەگـەر بگەڕێینـەوە بـۆ سـەرەتاتر دەڵێیـن: خوێنپـارە (**عَلقـة**) قۆناغـی سـێیەمی دروسـتبوونی مرۆڤـە، خـوا لـە سـوورەتی (**المؤمنون**)دا بـە حـەوت قۆنـاغ باسـی دەكات، وەك ئێمـە لە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**المؤمنون**) دا، كورتـە باسـێكمان كـردوە لەبـارەی دروسـتبوونی مرۆڤـەوە، چ ئـادەم و حـەووا سـەلامی خوایـان لێبـێ، چ وەچەكەیـان، كـە خـوا لـە سـوورەتی (**المؤمنون**)دا باسـی

دروستبوونی وەچەکەیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾المؤمنون، بەدڵنیایی مرۆڤمان لە پوختەیەك لە قوڕ دروستکردوە:.

**١-** ئەمە قۆناغی یەکەمی دروستبوونی مرۆڤە، کە پوختەیەك لە قوڕ بەهۆی خواردن و خواردنەوەوە دەبێتە خوێن، خوێنەکەش دوایی تۆو (**مني**)ی لێ پەیدادەبێ، چ هی پیاو، چ هی ئافرەت.

**٢-** ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ﴾**المؤمنون**، ئەوەش قۆناغی دووەمە دوایی کردمان بە تۆویلکەیەك لە نشینگەیەکی مەحکەم و جێی دڵنیاییدا، کە منداڵدانی دایکە، نوتفەش ئەنجامی پێکەوە لکانی ژیانداری تۆویی پیاوو هێلکۆڵەی ئافرەتە (**الحيوان المنوي والبويضة**)، کە زیندەوەرێکی سێیەم پێکدێنن و پێی دەگوترێ: (**نُطْفَة**)، دوایی باسی پێنج قۆناغەکەی دیکە دەکات: ﴿ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾**المؤمنون**.

**٣-** قۆناغی سێیەم: دوایی نوتفەکەمان گۆڕی بۆ عەلەقە، واتە: خوێنێکی خەستی زەرووئاسا، کە خۆی بە دیواری منداڵدانی دایکەوە نووساندوە.

**٤-** قۆناغی چوارەم: دوایی عەلەقەکەمان گۆڕی بۆ (**مضغة**) واتە زارجوو، پارچە گۆشتێك بە ئەندازەی ئەوەی بجووڕێ.

**٥-** قۆناغی پێنجەم: دوایی پارچە زارجووە گۆشتەکەمان گۆڕی بۆ ئێسقان.

**٦-** ئنجا لە قۆناغی شەشەمدا: ئێسکەکەمان بە گۆشت داپۆشی.

**٧-** لە قۆناغی حەوتەم و کۆتایی دا: کردمانە دروستکراوێکی دیکە، دوای ئەوەی لە ڕووی جەستەوە ئامادەبووەو پێگەیوە، ئنجا بە کەڵکی ئەوە هاتوە، دوای چوارمانگ زیاتر، ڕووحی بە بەردا بکرێ و، خواش ناوی ناوە: (**خلقا آخر**) کە پێشێ هەر ژیاندار بوو، ئنجا بوو بە ژیانداڕێکی گیاندار، واتا بوو بە زیندوویەکی خاوەن ڕووح، کە ڕووح تایبەتە

بە مرۆڤەوە، بە پێی ئەوەی بۆ ئێمە زانراوە، هەڵبەتە جندیش جۆرێك لە ڕووحیان هەیە، بەڵام نازانین هی ئەوان چۆنە، بەڵام لە قورئاندا خوای پەروەردگار ڕووحی تەنیا بۆ مرۆڤ باسکردوە، ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾ بەرزیی و بەپێزیی بۆ خوای باشترینی بەدیهێنەرەکان.

﴿ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ﴾، بخوێنەو پەروەردگاریشت هەرە بەخشندەیە، لێرەدا **(الأكرم)** واتە: هەرە بەخشەر، یانی: هیچکەس لە بەخشیندا نایگاتێ، بەڵام ئەمە بۆ بەراورد نیە لەگەڵ کەسانی دیکەدا، چونکە کەسانی دیکە هەموویان دروستکراوی خۆینی، بەڵکو بۆ باسکردنی ئەوەیە کە سیفەتی بەخشەریی لە خوای پەروەردگاردا لەوپەڕی دایە.

﴿ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾، ئەو کەسەی بە قەڵەم فێری کردوە، واتە: مرۆڤی فێرکردوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ ﴿٥﴾ ﴾، مرۆڤی فێری شتێك کردوە کە نەیزانیوە، دوای ئەوەی باسی کەڕەم و بەخشندەیی و بەخشەریی خۆی دەکات، ئنجا باسی ئەوە دەکات کە بەهۆی قەڵەم و خوێندن و نووسینەوە فێری مرۆڤی کردوە، چی فێر کردوە؟ فێری شتێکی کردوە کە نەیدەزانی، کە لە ڕاستییدا ئەوپەڕی بەخشندەیی خوا ﷻ لە ژیانی مرۆڤدا، دوای دروستکردنی بۆ مرۆڤ، لەوەدا بەرجەستە دەبێ کە فێری خوێندن و زانست و زانیاریی کردوە.

ئەمە پێنج ئایەتی یەکەم، کە ئێمە لە کۆتایی تەفسیرکردنی ئەم سووڕەتە موبارەکەدا، کورتە باسێك دەکەین دەربارەی: بوونناسیی ئیسلامیی، چونکە ئەم پێنج ئایەتە موبارەکە، بناغەی بوونناسیی ئیسلامیی دەگرنە خۆیان، کە خوا پەیداکەرو بەدیهێنەری هەموو شتێکەو، خوا پەروەردگاری مرۆڤ و هەموو دروستکراوەکانەو مرۆڤی هێناوەتە دی لە خوێنپارەو، پەروەردگار خاوەنی ئەوپەڕی بەخشەرییە، بەخشەریی و بەخشندەیی خواش زیاتر لەوەدا بەرجەستە

دەبێ کە بە خوێندن و نووسین و قەڵەم فێری مرۆڤی کردوە، مرۆڤی فێری شتێك کردوە کە نەیزانیوە.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦﴾، وشەی (**كلاّ**) وشەیەکە بۆ تێوەخوڕین و هەڵوەشاندنەوە، بەکاردێ، یاخود بۆ سەرزەنشتکردن و هەڵوەشاندنەوە ئنجا لەوانەی پێشێدا، هیچ شتێك نیە شایستەی ئەوەبێ خوا هەڵیوەشێنێتەوە، کەواتە ئەوە پەیوەندیی بەدوای خۆیەوەیە، وەك (**طبري**)و ڕوونکەرەوانی دیکەی قورئان گوتوویانە، پەیوەندیی بەدوای خۆیەوە هەیە، کە باسی یاخیی بوون و لە کەوڵی خۆدەرچوونی مرۆڤ دەکات، ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ﴾ بە دڵنیایی مرۆڤ لەسەرپێچییدا لە سنوور دەردەچێ و سنوور دەشکێنێ.

﴿أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧﴾، کاتێك خۆی بینی بێنیازو دەستڕۆیشتوویە.

﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨﴾، بەڵام بە دڵنیایی گەڕانەوە بۆلای پەروەردگارتە، ئنجا مادام دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری، با وریابێ چۆن دەچێتەوە بۆ خزمەتی، با ئێستا لەو ژیانە دنیاییەی دا، یاخیی نەبێ و لە سنوور دەرنەچێ.

کەواتە ئەم (**كلاّ**)یە پەیوەندیی بەئێرەوە هەیە، واتە: با مرۆڤ وازبێنێ لە یاخیی بوون لە بەرامبەر خوادا، بەهۆی هەبوونێکەوە کە هەر خوا پێیداوە، بەهۆی دەست ڕۆیشتوویییەکەوەو بێ نیازییەکەوە کە هەر خوا پێیداوە، با بەوە لە کەوڵی خۆی دەرنەچێ و بوغڕا نەبێ، چونکە بەدڵنیایی دەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگاری.

بۆیە نەیفەرمووە: (**إن إلى ربه الرجعى**) فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨﴾ چونکە ئەو کەسەی لە پەروەردگار یاخیی دەبێ، شایستەی ئەوەنیە پاڵ بدرێتە لای پەروەردگاری، ئەگەرنا بەدڵنیایی خوا پەروەردگاری هەموو کەس و هەموو شتێکە.

ئنجا خـوا ﷻ باسـی وێنەیـەك لـەو مرۆڤـە لـە خـوا یاخییانەمـان بـۆ دەكات، كـە وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەكـەی باسـمان كـرد، لـە هەمـوو تەفسـیرەكاندا، زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵێـن: لەبـارەی ئەبـوو جەهلـەوە ئـەم ئایەتانـە هاتوونـە خـوار.

كـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ﴿٩﴾ ﴾، ئایـا ئـەو كەسـەت بینـی كـە ڕێگریـی دەكات، قەدەغـە دەكات، كـێ قەدەغـە دەكات؟

﴿ عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ﴿١٠﴾ ﴾، بەندەیـەك كـە نوێـژ دەكات، ڕێگریـی لـێ دەكات و نایهێڵـێ، لێـی قەدەغـە دەكات نوێـژ بـكات، ئایـا ئـەو كەسـەت بینـی؟ هەڵبەتـە هەندێـك لـە زانایـان ئـەو وشـەی (**أرأيت**) كـە لـە ئەسـڵدا بەمانـای: (ئایـا بینیـت)ە، بـە (**أخبرني**) هەواڵـم پێبـدە، مانـا دەكـەن، چونكـە بـۆ كەسـێكە شـتێك ببینـێ، دوایـی هـەواڵ بـدات، لێـرەش خـوا ﷻ فەرموویەتـی: ئایـا كەسـێكت بینـی - واتـە: ئەبـوو جەهـل - ڕێگریـی لـە بەندەیەكـی خـوا دەكات، كـە مەبەسـت پێـی موحەممـەدە ﷺ كاتێـك نوێـژ دەكات، بـەڵام بێگومـان (إن خصـوص السـبب لا يمنـع شـمول المعنـى) تایبەتمەندبوونـی هـۆكاری دابەزیـن، ڕێ لـە گشـتگیربوونی واتـا ناگـرێ، وەك هەندێـك لـە تەفسـیرەكان گوتوویانـەو ڕاستیشـیان گوتـوە دەڵێـن: بەڵـێ ئـەو ئایەتانـە لەبـارەی ئەبـوو جەهلـەوەن كـە ڕێگریـی كـردوە لـە موحەممـەد ﷺ نوێـژ بـكات لـەلای كەعبـە، وەك لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەكانـدا باسـمان كـرد كـە هەڕەشـەی كـردوە بچێتـە سـەر ملـی، یاخـود دەم وچاوی لـە گڵ هەڵكێشـێ و لـە خۆڵـی وەردا، بـە تایبـەت لەبـارەی ئـەوەوە دابەزیـون، بـەڵام هـەر كەسـێكی دیكـەش ڕێگریـی بـكات، لەهـەر بەندەیـەك لـە بەندەكانـی خـوا، كـە بـە ئازادیـی خواپەرسـتیی بـكات، بێگومـان ئـەو حوكمـەی لـەو ئایەتانەدایـە هـەر دەیگرێتـەوە.

﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلْهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾، ئایـا دەبینـی! (هەواڵـم پێبـدە) ئـەو كەسـەی ڕێگریـی لـێ دەكـرێ نوێـژ بـكات، ئەگـەر لەسـەر ڕێـی ڕاسـت بـێ، (**هـدى**) یانی: بەڕێـگا زانیـن و بەرچاوڕوونیـی.

﴿ أَوْ أَمَرَ بِالتَّقْوَىٰٓ ﴿١٢﴾ ﴾، یاخـود ئەگـەر فەرمـان بـکات بـە پارێزکاریـی، یـانی: بـۆ خـۆی لەسـەر ڕێـی ڕاسـت بێ، یاخـود وێـڕای ئـەوەی لەسـەر ڕێـی ڕاسـتە، فەرمانیـش بـکات بەپارێزکاریـی.

﴿ أَرَءَيْتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ ﴾، ئایا دەبینـی! (هەواڵـم پێبـدە) ئەگـەر ئـەو کەسـەی ڕێگریـی دەکات، بـەدرۆ دابنـێ و پشـت هەڵبـکات، ﴿ أَلَمْ يَعْلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾، ئایـا نازانـێ خـوا دەیبینـێ، تێـوەی ڕامـاوەو دەیبینـێ، چـی دەکات و چـۆن دەکات؟

کەواتـە بینینـی خـوا بـۆی، دەبووایـە ببێتـە هـۆی سـڵەماندنەوەو پرینگاندنـەوەی لـەو کـردەوە خراپـەی دەیـکات، کـە بریتیـە لـە ڕێگریـی کـردن لـە بەندەیەکـی خـوا، بەڵکـو چاکتریـن بەنـدەی خـوا کـە موحەممـەدە ﷺ، لـەوەی نوێـژ بـکات و بەندایەتیـی بـۆ خـوا بـکات، لـە حاڵێکـدا لەسـەر ڕێـی ڕاسـتەو فەرمانیـش دەکات بـە پارێزکاریـی، واتـە وادەکات خەڵکـی دیکـەش خـۆی بپارێـزێ لـە سـزای خـوا.

ئنجـا خـوا ﷻ هەڕەشـە دەکات لـەو جـۆرە کەسـەو، دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّا ﴾ بـا وازبێنـێ، ئەمـە وشـەیە کـە بـۆ هەڵوەشـاندنەوەو تێوەخوڕیـن و، لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا سـێ جـاران (**كلاّ**) هاتـوە:

١- ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾.

٢- ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾.

٣- ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾ ﴾، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴾. با وازبێنێ ئەگەر دەست هەڵنەگرێ و واز نەهێنێ، زۆر بە توندیی تووکی پێشە سەری دەگرین، (**ناصية**) تووکی پێشە سەرە، ئەمە ئیعجازێکی عیلمییشی تێدایە، چونکە ئەو بەشەی مێشك کە پەیوەندیی هەیە بەبیرکردنەوەی مرۆڤ و کەسایەتیی مرۆڤەوەو، بەهەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ و، هەڵبژاردنەکانی مرۆڤەوە، لە نێوچەوان دایە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو تووکی پێشە سەرە دەگرین، کە خاوەن ئەو جۆرە کەسایەتیی و ئەو جۆرە ڕەفتارو بیرکردنەوەیە.

﴿ نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ ﴿١٦﴾ ﴾، تووکی پێشە سەرێکی درۆزنی گوناهکار، واتە: تووکی پێشە سەری کەسێکی درۆزنی گوناهکار، بەتوندیی تووکی پێشە سەری ڕادەکێشین.

﴿ فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾، ئنجا ئەوکاتە با ئەو دیوەخان و یانەکەی خۆی، هاونشینەکانی خۆی بانگ بکات، کە خۆییان پێوە هەڵدەکێشن، کاتی خۆی ئەبووجەهل بە پێغەمبەری ﷺ گوت: ئایا ڕێگریی ئەوەم لێ نەکردی، ئایا پێم نەگوتی نوێژ مەکە؟! دیارە پێغەمبەریش ﷺ قسەیەکی زبری لەگەڵ دەکات، ئەویش دەڵێ: هەڕەشە لە من دەکەی، من لە خەڵکی ئەو دۆڵە، لە هەموویان زیاتر کۆڕو مەجلیسم قەرەباڵغترە، دۆست و پشتیوانم زیاترن، (**نادي**) هەم بە شوێنی کۆبوونەوەو دانیشتن دەگوترێ، هەم بە کەسانێکیش کە لەو کۆڕو مەجلیسەداهەن، هۆزی قورەیش (دار الندوة)یان هەبووە کە کاتی خۆی قوصەی بۆی دامەزراندوون بۆ ڕاوێژکردن، بۆ بەڕێوەبردنی کاروباریان، لەوێدا دانیشتوون دیوەخانێك بووە تەگبیریان تێدا کردوون، خوا ﷻ دەفەرموێ: با ئەو خەڵکی دیوەخان و کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی بانگ بکات.

﴿ سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾، ئێمەش دۆزەخەوانەکان بانگ دەکەین، ئەو فریشتانەی سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن، (**زبانية**) یان ناوی کۆیەو تاکی نیە لە بێژەی خۆی، یان تاکی خۆی هەیەو ناوی کۆ نیە، تاکەکەی (**زِبْنِيَّة**) و (**زَبْنَة**)یەو لە ئەسڵدا لە (**زَبَن**)ەوە واتە: (**دفعَ ورمى**) پاڵی پێوەناو هاویشتی، لەبەر ئەوەی دۆزەخەوانەکان پاڵ بە دۆزەخییەکان و بێبڕوایەکانەوە دەنێن و فڕێیان دەدەنە نێو دۆزەخەوە.

لە کۆتاییدا خوای زاناو کاربەجێ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾، نەخێر، بەقسەی مەکە، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی مەکەو کڕنووش ببەو، نیزیك ببەوە (لە خوا ﷻ)، یانی: ئەو نوێژکردن و تاعەتەی ئەو ڕێت لێ دەگرێ، بەقسەی مەکە، بەڵکو هەر بەردەوام بە لەسەر کڕنووش بردن بە تایبەت و نوێژ کردن بە گشتیی و، لە خوا نیزیك بوونەوەی زیاتر.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**فەرمانکردنی خوا عزوجل بە موحەممەد ﷺ بە خوێندن، بەناوی خوای بەدیهێنەرەوە کە مرۆڤی لە خوێنپارە دروستکردوەو، پەروەردگاریشی هەرە بەخشەرە، مرۆڤی بە قەڵەم فێری شتانێك کردوە کە نەیدەزانین:**

وەك دەفەرموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥) ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) ﴾، بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەت کە هێناویەتە دی، لێرەدا (**إقرأ**) ئەوە دەگەیەنێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەتا ئێستا نەیتوانیوە خوێنەر بێ و شت بخوێنێتەوە، واتە: لەبەر بیخوێنێ، نەك لە نووسراودا بیخوێنێتەوە، لەمەودوا دەبێتە خوێنەر، کە پێشتر وانەبووە، وەك لە سووڕەتی (العنكبوت)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذًا لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ (٤٨) ﴾، واتە: تۆ پێش وی (قورئان) هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوەو، بەدەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، ئەگەرنا ئەوانەی لەسەر ناحەقن دەکەوتنە دوو دڵییەوە، یانی: تاڕاددەیەك بیانوویان هەبوو بکەونە دوو دڵییەوە کە ڕەنگە فێرکرابێ و فێربووبێ، بەڵام مادام خوێندن و نووسینت نەبێ، چۆن فێردەبی؟

کە دەفەرموێ: (**إقرأ**) ئەمە فەرمانکردنە بە خوێندنەوە، خوێندنەوەش بریتیە لە گۆکردن و بێژتنی قسەیەکی دیارییکراو کە نووسرابێ، یان لەبەرکرابێ و، لەبەر بخوێنرێتەوە، هەردووکیان پێیان دەگوترێ: خوێندنەوە، کە دەگوترێ: وتارخوێن،

مـەرج نیـە لـە کتێـب دا بیخوێنێتـەوە، بەڵکـو لەبەریەتـی و لەبـەرڕا دەیخوێنێ، یـان قورئانخوێـن، مـەرج نیـە هـەر لەسـەر موصحـەف دا بیخوێنـێ، دەگونجـێ لەبـەرڕا بیخوێنـێ.

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾، بخوێنـە بەنـاوی ئـەو پـەروەردگارەت کـە هێناویەتـەدی، دروسـتیکردوە، لێـرەدا (**خلـق**) دروسـتیکرد، کـردار (**فعـل**) ێکـە، بەرکارەکـەی دیارنیـە، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: (**خَلَـقَ أي: خَلَـقَ كُلَّ شَيء**) هەمـوو شـتێکی هێناوەتـەدی، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی ئاشـکرایە هـەر شـتێك هێنرابێتـە دی، بەدیهێنـەر (**خالـق**) هێناویەتـە دی، بۆیـە بەپێویسـت نەزانـراوە بـاس بکـرێ.

یاخـود وشـەی (**خلـق**) وەك کـرداری لازیـم مامەڵـەی لەگەڵـدا کـراوەو، کـرداری (**لازِم**)یـش پێویسـتی بـە بـەرکار نیـە، وەك: (**جـاء محمـد**) موحەممـەد هـات، یاخـود: (**غَـرِقَ الـزَّوْرَقُ**) بەلەمەکـە نغـرۆ بـوو، پێویسـتییان بـە بـەرکار نیـە.

ئنجا خوا لە نێو هەموو شتەکاندا باسی مرۆڤ دەکات:

**٢)**- ﴿ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ ﴾، مرۆڤی لە (**عَلَق**) هێناوەتەدی، (**عَلَقة**) کە تاکی (**عَلَق**)ە، بریتیە لە پارچە خوێنێك بە ئەندازەی سەرە پەنجەو ئەنگوستێك لە خوێنێکی خەست، چوێندراوە بە کرمێکی گچکەوە کە پێی دەگوترێ: رەروو، بە کوردیی (**عَلقة**) خوێنپارەیە، (**علق**)یش ناوی کۆیە، چونکە (**الإنسان**)، (**أل**)ی ناساندنی لەسەرەو ناساندنەکە بۆ جینسە، واتە: خوا تێکڕای مرۆڤانی دروستکردوە لە (**علق**)، خوێنپارەکان، ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەمە قۆناغی دووەمی دروستبوونی مرۆڤە، بەڵام بەپێی ئایەتی (١٤)ی سوورەتی (**المؤمنون**) قۆناغی سێیەمیەتی، بەمجۆرەی خوارێ:

قۆناغی یەکەم: (**سُلالةٍ من طين**) پوختەو گوشراوێك لە قوڕ.

قۆناغی دووەم: (**نطْفة في قرار مكين**) تۆویلکەیەك لە نشینگەیەکی مەحکەم و قایم دا.

قۆناغی سێیەم: (**علقة**) خوێنپارە.

قۆناغی چوارەم: (**مضغة**) زارجوو.

قۆناغی پێنجەم: (**عِظَام**) ئێسکەکان.

قۆناغی شەشەم: (**کسونا العظام لحماً**) ئێسکە بەگۆشت داپۆشراوەکان.

قۆناغی حەوتەم: (**ثم أنشأناه خلقاً آخر**) کران بە دروستکراوێکی دیکە، کە بریتیە لە ڕووح بەبەرداکردنی.

ئایا بۆچی خوا ﷻ لە نێو هەموو قۆناغەکانی دروستبوونی مرۆڤدا، باسی (علق) دەکات؟ دەڵێین: ئاماژەیە بۆ ئەوە کە ئەی مرۆڤ! خوا ﷻ تۆی لە کوێوە هێناوەتە کوێ؟ لە چییەوە تۆی کردۆتە ئەو مرۆڤەی ئێستا خۆت دەبینی؟ کەواتە: زۆری تێڕابمینەو هەموو شتێکی لە دەست دێ، پەروەردگارێك کە تۆی لە نێو مندالدانی دایکتدا لە نوتفەوە گۆڕیوە بۆ عەلەقەو، لە عەلەقەوە بۆ زارجووە گۆشتێك و، لەویشەوە بۆ ئێسقان و، لە ئێسقانەوەش، بۆ بەگۆشت داپۆشین، دوایی قۆناغی ڕووح بەبەرداکران، خوایەك کە ئەو هەموو قۆناغانەی بە تۆ بڕیون، ئێستاش کە لە دایك بووی و هاتوویە ژیانی دنیاوە، دەتوانێ قۆناغەکانی دیکەشت پێ ببڕێ.

**٣**)- ﴿ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴿٣﴾ ﴾، بخوێنەو پەروەردگاریشت هەر بەخشندەیە، بخوێنە (**إقرأ**)ی دووەم، دووبارەیە بۆ جەختکردنەوەی بخوێنە (**إقرأ**)ی یەکەم.

دیارە (**الأکرم**): داڕێژراوە بۆ ئەوەی ئەو واتایە بگەیەنێ، کە خوا زۆر بەخشەرەو زۆر دەبەخشێ، بۆ ئەوە دانەڕێژراوە کە بگوترێ: بەخشەرترە لە فلان و فیسار، یان لە کێ و کێ، بۆیە بەرانبەرەکەی دیار نیە.

کەواتە: ﴿ ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ ﴾، بخوێنەو پەروەردگاریشت هەرە بەخشەرە، یانی: هەر چەندە ببەخشێ، بەخشینی خوا کۆتایی نایەت و، هەر چەندە ببەخشێ، عەمبارەکانی خوا نابڕێن: ﴿ وَلِلَّهِ خَزَآئِنُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴿٧﴾ ﴾**المنافقون**، واتە:

خەزنـەو عەمبارەکانـی ئاسـمانەکان و زەوی هـی خـوان ﷻ، ئنجـا وەك چـۆن دوای ئـەوەی لـە ئایەتـی یەکەمـدا فەرمـووی: بخوێنـە بەنـاوی ئـەو پەروەردگارەتـەوە، کـە هەمـوو شـتێکی هێناوەتـە دی، دوایـی لە نێـو هەموو دروسـتکراوەکاندا باسـی مرۆڤی کـرد، کـە مرۆڤیشـی لـە خوێنپارەیەکـەوە کـردوە بـە ئـەو مرۆڤـە، لێـرەش دەفەرمـوێ: بخوێنـەو پـەروەردگارت هـەرە بەخشـەرە، ئنجـا وەك پێشـاندان و بەرجەسـتە کردنـی نموونەیـەك لـە بەخشـینی خـوا، دەفەرمـوێ:

٤)- ﴿ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾، ئەو کەسەی بە قەڵەم فێری کردوە، کێی فێرکردوە؟ بەدڵنیایی یانی مرۆڤی فێری زانست کردوە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: (عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ) (عَلَّـم) هـەردوو بەرکارەکـەی قرتێـنراون: (عَلَّـمَ **الإنسـانَ العِلْـمَ بالقَلَـم**) مرۆڤـی فێـری زانیاریـی کـردوە بـە قەڵـەم، (**علَّـم**) دوو بـەرکار (**مفعـول بـە**) دەخـوازێ، هەردووکیـان قرتێـنراون، لەبـەر ئـەوەی دیـارن، بەتایبەتـی ڕسـتەی دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾، مرۆڤـی فێـری ئـەوە کـردوە کـە نەیزانیـوە، کـە دەفەرمـوێ: (عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ)، ئەمـە سێ واتایـان هەڵدەگـرێ:

أ- نووسەرەکانی فێری نووسین کردوون بە قەڵەم.

ب- خەڵکی فێری نووسین کردوە.

ج- خەڵکی فێری زانیاریی کردوە.

٥)- ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾، مرۆڤی فێری ئەوە کردوە کەنەیدەزانی، یانی: هەموو ئەو شتانەی نەیدەزانین فێری کردوون، قەڵەمیش جۆری زۆرن، کاتی خۆی لە قامیش دایانتاشیوە، بۆیە یەکێك لە زانایان لە پێناسەی قەڵەمدا دەڵێ[1]:

قەڵـەم پارچەیەکـە لـە قامیـش، نـەرم و باریـك دەکـرێ، بـە چەقـۆ دەبـڕدرێ تاکـو لـووس بـێ لـە نێـو پەنجەکانـدا، لایەکـی لـەت دەکـرێ بـە ئەنـدازەی نیـو سـەرە

---

(١) (إبن عاشور) لە (التحرير والتنوير: ج١٢، ص٤٤٠ و ٤٤١)دا هێناویەتی.

ئەنگوست، ئنجا هەر کاتێك تەڕ کرا بە مەڕەکەب، لەسەر کاغەزو هەر شتێکی دیکە دابنرێ، دەنووسێ.

ئەوە وەك قەڵەمی کاتی خۆی، بەڵام ئێستا قەڵەم زۆرو جۆراو جۆرن.

کە دەفەرموێ: (مَا لَمْ يَعْلَمْ) واتە: ئەوەی نەیدەزانی، کەواتە: بەهۆی و خوێندن و نووسینەوە، کە ئامرازەکەی قەڵەمەو، ئێستا زۆر جۆرە نووسینی دیکەش پەیدابوون، جگە لەهی قەڵەمی ئاسایی و بەهۆی خوێندن و نووسینەوە، مرۆڤ دەتوانێ فێری شتێك ببێ نەیزانیبێ.

## پێنج هەڵوەستە لە بەردەم ئەو پێنج ئایەتەدا

**هەڵوەستەی یەکەم:** یەکەمین وشەی یەکەمینن ئایەتی یەکەمین سووڕەت کە بۆ پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ، کە هەم لە کتێبە پێشووەکان دا، هەم لە خوێندن و نووسین دا، نەشارەزابوو، چونکە وشەی **(أمي)** هەردوو واتایەکەی هەن، **(أمي)** واتە: کەسێك خوێندن و نووسین نەزانێ، هەروەها **(أمي)** واتە: کەسێك شارەزای کتێبە پێشووەکان نیە، پێغەمبەری خواش ﷺ بە هەردوو واتایەکە ئوممیی بووە: ﴿ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ﴿١٥٧﴾ ﴾ **الأعراف**، پێغەمبەری ﷺ نەشارەزا لە کتێبە پێشووەکان و پێغەمبەری ﷺ نەشارەزا لە خوێندن و نووسین، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ **العنكبوت**، تۆ پێش وی (قورئان) هیچ کتێبێکت نەخوێندۆتەوە (لەبەرت بێ و بیخوێنیەوە)و بەدەستی ڕاستیشت هیچت نەنووسیوە، چونکە نووسین زیاتر بەدەستی ڕاست دەکرێ، یانی: نە خوێندنەوەت هەبووە، نە نووسینت هەبووە، کەچی بۆ پێغەمبەرێکی ﷺ نەشارەزا لە کتێبە پێشووەکان و نەشارەزا لە خوێندن و نووسین، یەکەمین وشەی یەکەمین ئایەتی یەکەمین سووڕەت کە بۆی دادەبەزێندرێ بریتیە لە: بخوێنە **(إقرأ)** کە ئەمەش لە خودی خۆیدا بەدڵنیایی موعجیزەیە، خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى پێغەمبەرێکی نەخوێندەواری ناردوە وەك کۆتا پێغەمبەری خۆی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی، کە فێری خوێندن و شارەزایی و بەرچاوڕوونیی و هیدایەتی خوایان بکات!! بۆیە مەولەوی شاعیر گوتوویەتی: [هەتیو وەئەدەو ئوممیی عەللامە لەمە موعجیزتر موعجیزە کامە؟] موحەممەد ﷺ بەبێ بابیی گەورە بووەو هەتیو بووە، ئەو هەموو ئەدەب و ڕێزەشی بووە کە خوا پێی وەسف دەکات: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ **القلم: ٤**، هەروەها موحەممەد ﷺ ئوممیی بووە بەهەردوو واتای: نەشارەزا لە کتێبە پێشووەکان و،

نەزانینی خوێندن و نووسین، کەچی عەللامە بووە، ئایا لەمە موعجیزتر موعجیزە کامە؟ ئەمە لەزاتی خۆیدا بەڵگەو موعجیزەیە لەسەر پێغەمبەرایەتییەکەی.

**هەڵوەستەی دووەم:** بریتیە لە گرنگیی خوێندن و نووسین، چونکە خوا ﷻ لە کاتێکدا باسی ئەوپەڕی بەخشەریی خۆی دەکات، باسی خێرکردنی زانست بە قەڵەم دەکات: ﴿ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ﴿٤﴾ ﴾، کەواتە لە زۆر بەخشەریی خوایە ﷻ کە بەهۆی قەڵەمەوە مرۆڤی فێرکردوە، فێری چی کردوە؟ ﴿ عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾، فێری هەرشتێکی کردوە کە نایزانێ.

**هەڵوەستەی سێیەم:** ئەم ئایەتە موبارەکانە دڵنیاکردنەوەی پێغەمبەریان ﷺ تێدایە، کە نەشارەزایی بە خوێندن و نووسین، ڕێی لێ ناگرێ بخوێنێ و شارەزابێ و زانابێ، بەڵکو ببێتە مامۆستای زانایان.

**هەڵوەستەی چوارەم:** هەروەها ئاماژەشیان بەوە تێدایە کە نەزانینی خوێندن و نووسین، لە پێغەمبەردا ﷺ هەر دەمێنێتەوە، چونکە نافەرموێ: بنووسە (**أكتب**) بەڵکو دەفەرموێ: بخوێنە (**إقرأ**) خوێندنیش پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە مرۆڤ شارەزای خوێندن و نووسین بێ، بەڵکو تەنیا پێویستی بەوەیە ئەو شتەی مەبەستیەتی، لەبەری بکات و بیخوێنێتەوەو بیڵێ.

**هەڵوەستەی پێنجەم:** ڕێگایەکانی بەدەست هێنانی زانست، دەکرێ بڵێین ئەم چوارەن:

**یەك:** ئەوەیە کە مرۆڤ بەهۆی خوێندنەوەو موتاڵەعەوە لە جگەلە خۆی وەربگرێ، کتێبەکەی یان بەرهەمەکەی بخوێنێتەوە.

**دوو:** لە دەمی وەری بگرێ، واتا بەزارەکیی (**شفهي**) لێی وەربگرێ، لەکاتی دەرس پێگوتندا.

**سێ:** ئەوەیە خۆی بیر بکاتەوەو ئەنجامگیریی بکات و هەڵبهێنجێ.

**چوار:** بریتیە لە ئەزموون و لە حاڵەتی کردەیی، کە مرۆڤ بە ئەزموون بە کردەوەی خۆی، تاقیکردنەوەو ئەزموونکاریی بکات، تاکو بەزانست بگات.

ئەمانە ڕێیەکانی بەدەستهێنانی زانیارییـن، بێگومان ئیسلام زانیاریی بە چاکەو نیعمەتێکی زۆر گەورەی خوای پەروەردگار داناوە، بۆیەش فێربوونی زانست فەرزو پێویستە بۆ دینداریی و بۆ دنیاداریی، پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: **(طَلَبُ العلمِ فريضة على كلِّ مسلم) رواه ابن ماجه** (٢٢٤). واتە: داواکردنی زانیاریی لە سەر هەموو مسوڵمانێك پێویستە. هەر بۆیەش یەکەمین وشەی یەکەمین ئایەتی یەکەمین سوورەت، کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزیوە، فەرمانکردنە بە خوێندن، دوای ئەوەش ئاماژە دەکات بەوەی خوا ﷻ مرۆڤی بە قەڵەم فێری شتێك کردوە کە نایزانێ، کەواتە لە ڕێی فێربوون و نووسینەوە، مرۆڤ دەتوانێ دەست بگەیەنێتە ئەو زانیاریيانەی لەوەو پێش نەیزانیون.

مەسەلەی دووەم:

**باسی مرۆڤی بوغراو یاخیی بەهۆی هەبوونەوەو، بێئاگابوون لە گەڕانەوەی بۆ لای خواو، ڕێگریی کردنی بابایەکی لەخوا یاخیی، لەنوێژکردنی پێغەمبەر ﷺ، لە حاڵێکدا ئەو ڕێ ڕاستگرتوو و فەرمانکارە بە پارێزکاریی، خۆیشی (بابای ڕێگرییکار لەنوێژکردن) بێبڕواو پشت هەڵکردووییە لە هەق.**

خوا دەفەرمووێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ ٧ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ ٨ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ٩ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ١١ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ١٢ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ ٦ ﴾، نەخێر (باوازبێنێ) بەدڵنیایی مرۆڤ یاخیی دەبێ، (**كَلاَّ: كَلِمَةُ رَدْعٍ وَإِبْطَال**) (كلاّ) وشەی تێوەخوڕین و هەڵوەشاندنەوەیەو، ئەو هەڵوەشاندنەوەو تێوەخوڕینەش پەیوەندیی بە قسەیەکی پێشترەوە نیە، بەڵکو پەیوەندیی بە قسەیەکەوە هەیە دواتر دێ، کە بریتیە لە: ﴿ أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ ٩ عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠ ﴾، چونکە ئەوەی لە پێنج ئایەتی پێشوودا هاتوە، کە لە مەسەلەی یەکەمدا شیمان کردنەوەو ڕابرد، تەنیا باسی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار لەسەر زمانی جیبریل بە پێغەمبەری خاتەمی ﷺ فەرموو: بخوێنە! بەناوی ئەو پەروەردگارەت کە هەموو شتێکی بەدیهێناوە، مرۆڤی لە خوێنپارە دروستکردوە، بخوێنەو پەروەردگاریشت هەرە بەخشندەیە، هەرە بەخشەرە، مرۆڤی بەقەڵەم فێر کردوە، فێری شتێکی کردوە کە نەیزانیوە.

بێگومان هیچ کام لەوانەش هی ئەوە نین، بەرپەرچ بدرێنەوە، بەڵکو لێرەدا (كلاّ) وەك هەندێ لە زانایان گوتوویانە: (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَإِبْطَال، لِمَا سَيَأْتِي مِنَ الْكَلَام**) وشەی تێوەخوڕین و هەڵوەشاندنەوەیە بۆ قسەیەك کە لەمەودوا دێ.

هەندێکیش دەڵێن: (كلاً) قسەی دواتری خۆی هەڵناوەشێنێتەوە، بەڵکو هی پێشتری خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆیە لێرەدا (كلاً) یانی: (حقّاً) بەدڵنیایی، ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ ﴾ **العلق**، بەدڵنیایی مرۆڤ یاخیی دەبێ لە سنوور دەردەچێ و بوغرا دەبێ، کەی؟

**٢)-** ﴿ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾، کە خۆی بینی بێنیازە، خۆی بینی دەستڕۆیشتوویەو شت هەبوویە، لەکەوڵی خۆی دەردەچێ و بوغرا دەبێ و سنوور دەبەزێنێ، مانایەکەی ئاوای لێدێتەوە: (**إِنَّ الإِنْسَانَ لَيَطْغى لِرُؤْيَتِهِ نَفْسَهُ مُسْتَغْنِيَاً**) مرۆڤ لە سنوور دەردەچێ لە سەرپێچیی کردندا، کاتێك خۆی بینی بێنیازەو دەوڵەمەندە، هەبوویە.

زانایانی زمانی عەرەبیی هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (أل)ی سەر (إنسان) بۆ تێکڕا (جنس)ە، واتە: تێکڕای مرۆڤەکان وان، مرۆڤ بە تێکڕایی بەو شێوەیەیە، بەڵام چ مرۆڤێك؟ ئەو مرۆڤەی کاتێك پێی وابوو بێنیازەو پێویستیی بە کەس نیە، یاخیی دەبێ. هەر مرۆڤێك پێی وابێ هەمووشت هەر خۆیەتی و پێویستیی بە کەس نیەو، لە هەموو کەس و لەهەموو شتێك بێنیازە، بەدڵنیاییەوە تووشی بوغرایی و لەکەوڵی خۆ دەرچوون دەبێت.

**(الطبري)** لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتە موبارەکەدا: ﴿ كَلَّآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَيَطْغَىٰٓ ﴿٦﴾ أَن رَّءَاهُ ٱسْتَغْنَىٰٓ ﴿٧﴾ ﴾ **العلق**، دەڵێ: (**مَا هَكَذا يَنْبَغي أَنْ يَكُونَ الإِنْسانُ أَن يُنْعِمَ عَلَيْهِ رَبُّهُ بِتَسْوِيَتِهِ خَلْقِهِ، وَتَعْليمِهِ مَا لَم يَكُنْ يَعْلَم، وَإِنْعامِهِ بِما لا كُفْؤَ لَهُ، ثُمَّ يَكْفُرُ بِرَبِّهِ الَّذي فَعَل بِهِ ذَلِكَ، ويطْغى عَلَيْهِ، أَنْ رَآهُ اسْتَغْنَى**) واتە: مرۆڤ نەدەبوو وابێت کە پەروەردگاری چاکەی لەگەڵدا بکات، ڕێك دروستی بکات و شتێکی فێر بکات کە نەیزانیوە، کەچی دوایی بێبڕوا بێ بەرانبەر بەو پەروەردگارەی ئەوەی بۆ کردوە، هەرکات خۆی بینی هەبوویەو بێنیازە، لێی یاخیی ببێ.

**٣)-** ﴿ إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ﴿٨﴾ ﴾، بەدڵنیایی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارتە، **(الطبري)** دەڵێ: (**إِنَّ إِلى رَبِّكَ يَا مُحَمَّد! مَرْجِعُهُ، فَذَائِقٌ مِنْ أَليمِ عِقَابِهِ، وَالرَّجْعى مَصْدَر**) واتە: ئەی

موحەممەدا! گەڕانەوەی ئەو مرۆڤە (کە لە بەرانبەر خوادا یاخیی و بوغڕا دەبێ و لە کەوڵ دەردەچێ) بۆ لای پەروەردگارتەو لە سزای بە ئێشی وی دەچێژێ. وشەی **(الرُّجْعى)** چاوگە، یانی: گەڕانەوەی بۆ لای پەروەردگارتە. **(رُجْعى)** و **(رجوع)** و **(مَرْجِع)** هەرسێکیان چاوگن.

ئنجا دوای ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە مەزنەی کە گشتگیرە بۆ هەموو مرۆڤەکان، هەموو مرۆڤەکان هەربەو شێوەیەن و کاتێك خۆیان بێنیاز بینی، خۆیان بینی دەستپڕن، دەوڵەمەندو هەبوون، خاوەن توانان، لەڕووی ماددیی و مەعنەوییەوە پێویستییان بەکەس نیە، بوغڕا دەبن و لە سنوور دەردەچن. بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجْعَىٰٓ ٨﴾، بەدڵنیایی گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارتە، کەواتە: تۆ بزانە بەچ ڕووێکەوە دەچیەوە خزمەت خوا! بەچ سیفەتێکەوە دەگەڕێیەوە لای، چ تێلەگەیەکت[1] پێیەو هەڵتگرتوەو لەکۆڵت ناوە؟ ئایا بە تێلەگەی پڕ لە تاعەت و چاکە، یاخود تێلەگەی پڕ لە گوناهو تاوان و لادانەوە دەچیەوە خزمەت خوا؟!

ئنجا خوای پەروەردگار لەم چەند ئایەتەدا دێتە سەر باسی مرۆڤێك کە مرۆڤێکی دیاریی کراوە، یاخود جۆرە مرۆڤێکی دیاریی کراوە، کە ڕێگریی دەکات لە بەندەیەکی خوا کاتێك نوێژ دەکات، یان ڕێگریی لە بەندەکانی خوا دەکات، کاتێك دەیانەوێ خوا بپەرستن و دەفەرموێ:

٤)- ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يَنْهَىٰ ٩﴾ ئایا ئەو کەسەت بینی کە ڕێگریی دەکات.

٥)- ﴿عَبْدًا إِذَا صَلَّىٰٓ ١٠﴾، لە بەندەیەك کاتێك نوێژ دەکات، ئەو ڕێگریی لێ دەکات، وشەی ﴿أَرَءَيْتَ﴾ **(كَلِمَةُ تَعْجيبٍ مِنْ حَالٍ)** وشەیەکە بۆ سەرسوڕماندن لە حاڵی کەسێك، ئەوکەسەت دیوە! کە دەفەرموێ: بینیوتە، بینین لێرەدا بۆ زانینە، ئایا ئەو کەسەت زانی، دەیناسی؟ کە ڕێگریی دەکات لە بەندەیەك کاتێك نوێژ دەکات، واتە: ڕێگریی

---

(١) تێلەگە: کۆڵ، هەرشتێك کەل و پەل و شتێکی تێدەکرێ و هەڵدەگیرێ.

نوێژکردنەکەی لێ دەکات و، لێی قەدەغە دەکات نوێژەکەی بکات و دەبێتە لەمپەر لەبەردەمیدا.

٦)- ﴿ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾، [ئەمەش سەرسوڕماندنێکی دیکەیە]، ئایا دەبینی [بەچاوی عەقڵ و دڵ]، ئەگەر ئەو کەسە [کە نوێژ دەکات و بابای ڕێگر دەیەوێ ڕێی لێ بگرێ]، لەسەر ڕێی ڕاست بێ.

٧)- ﴿ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾ ﴾، یاخود فەرمان بکات بە پارێزکاریی؟ لێرەدا وەڵامەکەی قرتێندراوە، واتە: ئایا هەر ڕێگریی لێ دەکات؟ یان: ئایا شتێکی زۆر بێ جێ و ناهەق نیە؟!

٨)- ﴿ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١٣﴾ ﴾، ئایا دەبینی ئەگەر ئەو [بابا ڕێگرە پەیامی خواو کتێبی خواو پێغەمبەری خوای] بەدرۆی داناو پشتیشی تێکرد.

**یانی:** لە عەقڵ و دڵ و دەروونیدا بەدرۆی داناو، بە کردەوەو جەستەش پشتی تێکرد.

٩)- ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴿١٤﴾ ﴾، ئایا نەیزانیوە کە خوا دەبینێ؟ چی دەبینێ؟ بەرکاری ﴿ يَرَىٰ ﴾ قرتێندراوە، تاکو هەموو شتێك بگرێتەوە، یانی: خوا هەموو شتێك دەبینێ.

زانایان لەبارەی ئەو سێ جار دووبارە بوونەوەی: ﴿ أَرَءَيۡتَ ﴾ زۆر قسەیان کردوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: ﴿ أَرَءَيۡتَ ﴾ ئەسڵە واتایەکەی یانی: ئایا بینیت؟

ب- هەندێکیان گوتوویانە: یانی: هەواڵم پێبدە، چونکە کەسێك کە شتێك دەبینێ، دوایی هەواڵ بە خەڵك دەدا، دەڵێ: خەڵکینە فڵان شتم بینی، واتە: هەواڵم پێبدەن (**أخبروني**) کە پەیوەست (**لازم**)ی واتایەکەیەتی، واتە: واتای ڕاستەوخۆی نیە، بەڵکو ئەو واتایەیە کە لێیەوە پەیدا دەبێ.

کە دەفەرمووێ: ﴿ أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿١١﴾ أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ﴿١٢﴾ ﴾، ئایا دەبینی ئەگەر ئەو ڕێگریی لێکراوە لەنوێژ، وێڕای نوێژکردنەکەی خۆیشی، لەسەر

ڕێیەکی ڕاست بێ، یاخود فەرمان بکات بە پارێزکاریی، ئایا هەر شایستەی ئەوەیە ڕێگریی لێ بکرێ؟! ﴿ أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ ١٣ ﴾، ئایا دەبینی ئەو کەسەی بەدرۆی داناو پشتی هەڵکرد، ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ١٤ ﴾، ئایا نازانێ کە خوا دەبینێ؟ لێرەدا ﴿ أَلَمۡ يَعۡلَم ﴾، پرسیار کردنی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: هەقی وابوو بزانێ و، خۆشی بپارێزێ لە سزای خوا کە بۆ ئەو جۆرە ڕەفتارە داینەوە.

ئێمە لە هۆی هاتنە خواردا باسمان کرد، کە ئەم ئایەتانە لەبارەی ئەبوو جەهلەوە دابەزیون، هۆی هاتنە خوارەوەکە دووبارە ناکەینەوە، فەرموودەناسان هێناویانە کە ئەم ئایەتانە لەبارەی ئەبوو جەهلەوە دابەزیون، بەڵام بێگومان وەك زۆرجار گوتوومانە: (**إِنَّ خُصوصَ السَّبَب لاَ يَمْنَعُ شمُولَ المَعْنى**) واتە: تایبەتمەندبوونی هۆکار ڕێ لە گشتگیربوونی واتا ناگرێ، هەرچەندە لەبارەی ئەبوو جەهلەوە دابەزیون، کە ڕێگریی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوە، وەك لە هۆکاری هاتنە خوارەوەکەی باسمان کرد، بەڵام بێگومان هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە وەك ئەبوو جەهل دەکەن و بەشوێن پێی ئەودا دەڕۆن، کەسانێك قەدەغە دەکەن و ڕێگرییان لێ دەکەن، لەخوا پەرستیی، کە بەڕێی موحەممەددا ﷺ دەڕۆن و خوا پەرستیی ئەنجام دەدەن.

(**طبري**) هێناویەتی لە قەتادەوە: {**وَكانَ يُقال: لِكُلِّ أُمَّةٍ فِرعَون، وَفِرْعَونُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَبو جَهْل**} (**جامع البيان: ٣٧٨٩٣**)، واتە: هەموو ئۆممەتێك فیرعەونێکی هەیە، فیرعەونی ئەم ئۆممەتەی ئیسلامیش ئەبوو جەهلە.

هەڵبەتە کەسانی دیکەش لە دوای ئەبوو جەهلەوە پەیدابوون، کە وەك ئەبوو جەهل یان خراپتربوون لەویش، بەڵام دیارە ئەو ئایەتە موبارەکانە لەبارەی ئەوەوە دابەزیون، ئایەتەکانیش هەم ئەو دەگرنەوە، هەم تێکڕای ئەوانەی وەك ئەو دەکەن، یاخود خراپتریش دەکەن.

## مەسەلەی سێیەم:

**هەڕەشەی خوای دادگەر کە ئەگەر ئەو کەسە واز نەهێنێ، بەتوندیی تووکی پێشەسەری دەگرێ، پێشە سەری کەسێکی درۆزنی گوناهکار، ئنجا با ئەو خەڵکی دیوەخانی خۆی بانگ بکات و، ئێمەش دۆزەخەوانان بانگ دەکەین، فەرمانکردنیش بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بە قسەی نەکات و، بەردەوام بێت لەسەر کڕنووش بۆ خوا بردن و لەخوا نزیك بوونەوەی زیاتر:**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُ ﴿١٧﴾ سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَاسْجُدْ وَاقْتَرِب ۩ ﴿١٩﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾﴾، نەخێر (باوازبێنێ) ئەگەر وازنەهێنێ بە توندیی تووکی پێشەسەری دەگرین و ڕایدەکێشین. (كلاَّ) لێرەدا (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَإِبْطَال**) واتە: با واز بێنێ - ئەمە بۆ سڵەماندنەوەیەتی لەوەی دەیڵێ و دەیکات - ئەگەرنا تووکی پێشەسەر گرتن بۆی لە بۆسەدایە؟

﴿كَلَّا﴾ با واز بێنێ، ﴿لَئِن لَّمْ يَنتَهِ﴾ (ل)ی (**لَئِن**) زەمینە خۆشکەرە بۆ سوێند، (**إن**)یش (**شرطية**)یە، دیارە (**إن الشرطية**)ش وەڵامی دەوێ، بەڵام وەڵامەکەی قرتێندراوە، چونکە وەڵامی سوێندەکە وەڵامی (**إن الشرطية**)شی گرۆتە خۆی، ﴿كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ﴾ با وازبێنێ، ئەگەر وازنەهێنێ، ﴿لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ﴾ ئەمە وەڵامی سوێندەکەیەو وەڵامی مەرجەکەشی گرتۆتە نێو خۆی، ئەگەر وازنەهێنێ، ئێمە تووکی پێشەسەری بەتوندیی دەگرین و ڕایدەکێشین،

(**السَّفع: القَبْض الشَّديدُ بِجَذْبٍ**) (سَفع) بریتیە لە گرتنێکی توند لەگەڵ ڕاکێشاندا، تووکی پێشەسەری دەگرین و ڕایدەکێشین، (**الناصية**) تووکی پێشەسەرە

(شعر مقدم **الرأس**) ئەو تووکەی لە پێشەوەی سەری مرۆڤ دەڕوێ، کە ئێستاش و کاتی خۆیشی خەڵکێك هەبووە، وەك شتێکی عادەتیی تووکی پێشەسەری بەرداوەتەوەو هێشتوویەتەوە.

**٢)**- ﴿ نَاصِيَةٍ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾، تووکەسەرێکی درۆزنی گوناهکار، (نَاصِيَةٍ )ی دووەم جێگرەوە (**بَدَل**)ی (نَاصِيَةِ )ی یەکەمە، تووکە سەرێك کە خاوەنەکەی درۆزنەو خەتاکارو گوناهباریشە، بۆیەش بەنەناسراو (**نَكِرة**) هێناویەتی، تاکو تێکڕای ئەو کەسانەی بەو شێوەیەن، هەموویان بگرێتەوە، کە فەرموویەتی: ﴿ لَنَسْفَعًۢا بِٱلنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾، (**الناصية**) (أل)ی ناساندنی لەسەرەو ناساندنە کە بۆ (**عهد**)ە، واتە: تووکی پێشە سەرەکەی، ئەو کەسە دەگرین، کە ناسراوە، یاخود (أل) قەرەبووی پاڵوێدراو (**مضاف إليه**) دەکاتەوە، (**أي: لَنَسْفَعاً بِنَاصِيَتِهِ**) ئێمە تووکی پێشەسەری وی دەگرین.

**٣)**- ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾، ئنجا (ئەگەر ئێمە تووکی پێشە سەریمان گرت) با ئەو کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی بانگ بکات، ﴿ نَادِيَهُۥ ﴾ (**اِسمٌ لِلمَكَانِ الَّذي يَجْتَمع فِيهِ القَوْم، يُقال: نَدَا القَومُ نَدْواً، إذ اجْتَمَعُوا، وَالنَّدوة (بِفَتحِ النُّون) الجَمَاعة، وَيُقال: نَادٍ ونَدِيّ، وَلا يُطْلَق هَذا الإسْمُ عَلى المَكان إلاَّ إذَا كَانَ القَوْم مُجْتَمِعينَ فِيه**) واتە: (نادیە) ناوە بۆ ئەو شوێنەی خەڵکەکە تێیدا کۆدەبنەوە، دەگوترێ: (**ندا القومُ نَدْواً**) ئەگەر کۆبوونەوە، (**النَّدوة**)ش بەمانای کۆمەڵە خەڵکێك دێ، هەروەها (**نَادٍ ونَدِيّ**) بەکۆمەڵە خەڵکێك دەگوترێن، بەڵام ئەو ناوە بەکارنایەت بۆ شوێنێك، مەگەر خەڵکەکە تێیدا کۆبووبنەوە.

کاتی خۆی قوصەی، کە باپیرە گەورەی قورەیش بووە، بۆ هۆزی قورەیش کۆڕو مەجلیسێکی داناوە، مەنزڵگایەکی داناوە پێی گوتراوە: (**دار النَّدوة**) واتە: مەنزڵگای کۆبوونەوەو قسە تێداکردن و تەگبیر تێدا کردن، لە نیزیك مزگەوتی حەرام بووە، دایناوە بۆ ڕاوێژ پێکەوە کردنیان، لەکارو بارە گرنگەکانیاندا، هەروەها ئەگەر ژنیشیان هێنابن هەر لەوێدا مارە کراون و، زۆر کاری دیکەیان تێدا ئەنجام داون.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾، با ئەو دیوەخانەکەی خۆی بانگ بکات، ئەمە وەك ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿ وَسْـَٔلِ ٱلْقَرْيَةَ ﴿٨٢﴾ ﴾ **یوسف**، یانی: لە ئاوەداییەکە بپرسە! **(أي: وَاسْئَل أَهْلَ القَرية)**، واتە: لەخەڵکی ئاوەدانییەکە بپرسە، لێرەش ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴾، بێگومان خودی دیوەخانەکە بانگ ناکرێ، واتە: باخەڵکی دیوەخانەکەی بانگ بکات، (ل)ی سەر (یدع)ش، بۆ دەستەپاچەکردن و دەستەوستان کردن **(تعجیز)**ە، یانی: ناتوانێ ئەوانە بانگ بکات.

ئنجا ئەگەر ئەو بتوانێ خەڵکی دیوەخانەکەی خۆی، کۆڕو مەجلیسەکەی بانگ بکات، کە ئەبوو جەهل خۆی هەڵدەکێشاو دەیگوت: من لە خەڵکی ئەو دۆڵە هەمووی، کۆڕو مەجلیسم قەرەباڵەغ ترە، ئەگەر ئەو وا بکات:

**٤)-** ﴿ سَنَدْعُ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴿١٨﴾ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئێمەش دۆزەخەوانەکان (فریشتەکانی کە سەرپەرشتیی دۆزەخ دەکەن) بانگ دەکەین.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ﴿ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾ ناوی کۆیەو تاکی نیە لە بێژەی خۆی، وەك (أبابیل) و (عبابید) ئەوانە ناوی کۆن، هی یەکەمیان باڵندەیەکە، کوردەواریی خۆشمان هەر پێی دەڵێن: تەیرە ئەبابیل، پێم وایە ئەوەی پەڕەسێلکەشی پێدەگوترێ، هەر ئەوەیە.

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾ کۆی **(زَبْنَة)** یاخود **(زِبْنِيَّة)**یە.

﴿ ٱلزَّبَانِيَةَ ﴾ش داتاشراوە لە **(زَبْـن)**، **(والزَّبْـن: الدَّفـعُ بِشِـدَّة)** **(زَبْن)**یش پاڵپێوەنانی بەهێزە، ئەو فریشتانە بێبڕوایەکان بەتوندیی پاڵ پێوە دەنێن و پاڵەستۆیان دەدەن بەرەو دۆزەخ.

**٥)-** ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾، نەخێر (باوازبێنێ) گوێرایەڵیی مەکەو کڕنووش بەرەو نیزیك ببەوە. **(كلاّ)** وشەیەکە بۆ هەڵوەشاندنەوەو تێخوڕین، **(كلاّ)** بۆ هەڵوەشانەوەی ئەوەیە کە ڕستەی پێشێ گرتوویەتە نێو خۆی، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَدْعُ نَادِيَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾، با ئەو کۆڕو مەجلیسەکەی خۆی بانگ بکات، بەرگریی و پشتیوانیی لێ

بکەن، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ﴾ واتە: ناتوانێ ئەوە بکات، ﴿ لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾، تۆش فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی بۆ مەکە، بە قسەی مەکەو کڕنووش (بۆ خوا) ببەو لێی نیزیك ببەوە.

هەندێکیش گوتوویانە: (لا تُطِعْهُ) مانا پەیوەست (لازم)ەکەی مەبەستە، واتە: لێی مەترسێ، ترست بەرانبەری نەبێ.

(إقتِراب: إفتِعالٌ مِنَ القُرب أَي: اجْتَهِدْ فِي التَّقَرُّبِ إِلى اللهِ) وشەی (إقتراب) لە (قرب)ەوە هاتووە، واتە: نیزیکیی، زۆر هەوڵبدەو تێبکۆشە بۆ زیاتر خۆ وەنیزیکخستن لە خوای پەروەردگار.

دوو فەرموودە لەبارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە:

**١)- {أَقْرَبُ مَا يَكونُ العَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِد، فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ} (أخرجه مسلم: ٤٨٢، وأبو داود: ٨٧٥، والنسائي: ١١٣٧، وابن حبان: ١٩٢٨)**، واتە: کاتێك بەندە لە کڕنووش دایە، لە هەموو کاتان زیاتر لە پەروەردگاری نیزیکترە، بۆیە پاڕانەوەی زۆر تێدا بکەن.

**٢)- {أَلَا وَإِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَقْرَأَ الْقُرْآنَ رَاكِعًا أَوْ سَاجِدًا، فَأَمَّا الرُّكُوعُ فَعَظِّمُوا فِيهِ الرَّبَّ، وَأَمَّا السُّجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدُّعَاءِ، فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ} (أخرجه أحمد: ١٩٠٠، ومسلم: ٤٧٩، وأبو داود: ٨٧٦، والنسائي: ١٠٤٥، وابن ماجه: ٣٨٩٩، وابن حبان: ١٨٩٦).**

واتە: ئاگاداربن! من ڕێگرییم لێکراوە کە قورئان لە حاڵەتی ڕکووع بردندا، یان لەحاڵەتی کڕنووش بردندا، بخوێنم، بەڵکو ڕکووع پەروەردگاری تێدا بە مەزن بگرن، بەڵام کڕنووش زۆری تێدا بپاڕێنەوە، چونکە شایستەیە وەڵامتان بدرێتەوە، چونکە مرۆڤ لەو کاتەدا، لە هەموو کاتان لە خوا نیزیکترە.

بێگومان مرۆڤیش هەتا لەخوا نزیکتربێ، خوای پەروەردگار باشتر بەدەنگیەوە دێ، خوا هەمیشە لە بەندەکانی نیزیکە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەوان لێی نزیك بن، کە بە هۆی چاکەو بەندایەتیی و بۆ خوا صوڵحانەوە، لەخواوە نیزیك دەبن.

ئیعجازێکی زانستیی پێشتریش ئاماژەیەکمان پێداو گوتمان:

ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکە کـە دەفەرمـوون: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ نَاصِيَةٍ كَاذِبَةٍ خَاطِئَةٍ ﴿١٦﴾ ﴾، بـا وازبێنـێ، ئەگـەر دەسـت هەڵنەگـرێ بەتوندیـی تووكـی پێشـە سـەری دەگریـن، تووكـی پێشەسـەرێكی درۆزنـی گوناهـكار، بۆچـی خوای پـەروەردگار باسـی (**ناصیة**) دەكات؟ ئەمـە ئیعجازێكـی زانسـتیی تێدایـەو دوای ئـەوەی زانسـتی توێكاریـی (**علـم التشريـح**) بـەرەو پێشـەوە چـووە، ئنجـا زیاتـر دەزانیـن بۆچـی خـوای زانـا و توانـا باسـی تووكـی پێشەسـەر دەكات؟

هەڵبەتـە مەبەسـت لـە: پێشەسـەری هەركەسـێك گرتـن، كۆنتـڕۆڵ كـردن و بێدەسـەلاتكردن و دەسـتەپاچە كردنیەتـی، چونكـە كەسـێك كـە یەكێـك پەلامـاری دەدا، هەوڵـدەدا دەسـتبكاتەوە، بەدەسـتان بەرگریـی لەخـۆی دەكات، ئنجـا ئەگـەر تووكـی پێشەسـەری گیـرا، مانـای وایـە دەسـتەكانی هیـچ كارە بـوون و هیچیـان لەدەسـت نەهاتـوە، بۆیـە تووكـی پێشەسـەر گرتنـی هەركەسـێك، بێدەسـەلات كـردن و دەسـتەپاچە كردنیەتـی، ئـەو واتایـە لێرەدا هەیـەو، زانـاو ڕوونكـەرەوانی پێشـووش باسـیان كـردوە.

بـەلام لـەڕووی زانسـتییەوە (**النابلـسي**)[1] گوتوویـەتی: ئـەم ئایەتـە موبارەكـە ئیعجازێكـی زانسـتیی تێدایـە، چونكـە:

أ- لەكەللە سەری مرۆڤدا مێشك هەیەو، ڕێژەی مێشك لەچاو جەستەدا لە مرۆڤدا، بەرزترین ڕێژەی هەیە بەبەراورد لەگەڵ ژیاندارانی دیكەدا، بۆ وێنە:

ئەگـەر مێشـكی نەهەنگـی شـین بێنیـن، كـە گەورەتریـن ژیانـدارە لـە دەریـادا، هـەروەك چـۆن فیـل گەورەتریـن ژیانـدارە لـە وشـكانییدا، دەبینیـن ڕێـژەی كێشـی مێشـكی نەهەنگـی شـین لەچـاو جەسـتەكەی، بەبـەراورد لەگـەڵ هـی مـرۆڤ دا، زۆر كەمـە، هەروەهـا گەورەتریـن ژیانـداری وشـكانیی فیلـە، ئەویـش دیسـان ئەگـەر

---

(١) تفسير النابلسي، ج ١٠ ص ٤٢٨.

مێشکەکەی بەراورد بکەین لەگەڵ جەستەکەیدا، دیسان دەبینین مێشکەکەی لەچاو جەستەکەی ڕێژەکەی زۆر کەمترە، هەروەها ئەو ژیاندارەی پێی دەگوترێ: (**وحيد القرن**) یەك قۆچ، یاخود کەرگەدەن، یان هەر ژیاندارێکی دیکە، بەراورد بکەین لەگەڵ مرۆڤدا، ڕێژەو قورسایی مێشکی، لەچاو جەستەکەیدا زۆر کەمە.

گەورەترین ڕێژەی مێشك بەبەراورد لەگەڵ جەستەیدا، بریتیە لە مێشکی مرۆڤ.

**ب-** مێشکی مرۆڤ سەدو چل (١٤٠) ملیار خانەی تێدایە، کە خانەی خۆڵەمێشییان پێ دەگوترێ و، تاکو ئێستا ئەرکەکانیان نەزانراون، بەدڵنیاییەوە ئەگەر زانست زیاتر بەرەو پێش بچێ، ئەو (١٤٠) ملیار خانەیەش ئەرکەکەیان دەزانرێ.

**ج-** لەسەر توێژاڵی مێشك چواردە (١٤) ملیار خانە هەن، پێیان دەگوترێ: (**الخلايا القشرية**) خانە توێکڵییەکان، ئنجا هەرچی مرۆڤ ئەنجامی دەدا لە کارو کردەوەکان، هەمووی پەیوەندیی بەو چواردە ملیار خانەوە هەیە.

**د-** لە نێو ئەو چواردە ملیار خانەیەش دا مێشك دابەش دەکرێ، بەشێکی پێی دەگوترێ: (**فَصٌّ جَبهيٌّ**) واتە: پلی نێوچەوان، ئەم پلی نێو چەوانەش گەورەترین پلە لەبەشەکانی مێشك، لەو بەشەی مێشکدا دادوەریی کردن، هەڵهێنجان، ئەنجامگیریی کردن، بڕواهێنان بەدڵنیایی، هەرچی جووڵەی مرۆڤە لەڕووی فیکرییەوە، ویستی مرۆڤ، کەسایەتیی مرۆڤ، ئەگەر کەسێك بیەوێ چاکە بکات، ئەگەر کەسێك بیەوێ خراپە بکات، هەمووی پەیوەندیی هەیە بەو بەشەی مێشکەوەو، لەوێوە بڕیار دەدرێ و لەوێوە عەزم جەزم دەکرێ، لەسەر هەر کارێك مرۆڤ بیەوێ ئەنجامی بدات، بۆیەش خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾ **العلق**، نەخێر ئەگەر وازنەهێنێ، تووکی پێشەسەری بە توندیی ڕادەکێشین و دەیگرین.

کەسانێك هەن کە کەوتوون، یان تووشی ڕووداوێك بوون و ئەو بەشەی پێشەوەی مێشکیان زەربەی خواردوە، کەسایەتییان گۆڕاوە، پێشێ کەسەکە دیندار بووە، دوایی ڕوو لە بێدینیی دەکات، یان بێدین بووە، ڕوو لە دینداریی دەکات،

یان پێشـێ جـۆره شـتێكی پـێ خـۆش بـووه، ئێسـتا جـۆره شـتێكی دیكـەی پـێ خـۆش دەبـێ، كەسـایەتییان دەگـۆڕێ! كەواتـە: ئـەم بەشـەی پێشـەوەی مێشـك، پەیوەندیـی بـە كەسـایەتیی مرۆڤـەوە هەیـە.

بۆیـە خـوای پەنهانـزان دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّا لَئِن لَّمْ يَنتَهِ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾ **العلـق**، ئـەو مرۆڤـە ئەگـەر ئەبـوو جەهلـە، ئەگـەر هەركەسـێكی دیكـەی وەك ئەبـوو جەهلە، ئەگـەر وازنەهێنـێ لـەو كردەوەیـەی بریتیـە لـە ڕێگریـی كـردن لـە بەندەیەكـی خـوا، كـە نوێـژ دەكات بـۆ خـوا، ئێمـە تووكـی پێشەسـەری دەگریـن، تووكـی پێشەسـەرێكی درۆزنـی گوناهـكار، چونكـە درۆكردنـە، گوناهكردنـە، چاكەیـە، خراپەیـە، هەمـووی پەیوەسـتە بەو بەشـەی پێشـەوەی مێشـك، بێگومـان بەشـەكانی دیكـەش هەریەكەیان پەیوەندیـی بـە جۆرێـك لـە كاروكردەوەكانـی دیكـەی مرۆڤـەوە هەیـە.

بەشـێك پەیوەندیـی بـە ڕەنگەكانـەوە هەیـە، بەشـێك پەیوەندیـی بـە تامەكانـەوە هەیـە، بەشـێك پەیوەندیـی بـە بۆنەكانـەوە هەیـە، بەشـێك پەیوەندیـی بـە بینیـن و، بەشـێك پەیوەندیـی بـە بیسـتنەوەو، بەشـێك پەیوەندیـی هەیـە بـە خەیـاڵ كردنـەوە، هەركامێـك لـە بەشـەكانی مێشـك ئەركێكـی تایبـەت بەخـۆی هەیـە، بـەڵام ئـەو بەشـەی پێشـەوەی سـەر، كـە (**ناصیـة**) تووكـی پێشەسـەر لەسـەری دەڕوێ، پەیوەندیی هەیـە بـە كەسـایەتیی مرۆڤـەوە، بۆیـەش خـوای زانـاو شـارەزا باسـی ئـەوێ دەكات بەدیاریـی كراویـی: ﴿ لَنَسْفَعًا بِالنَّاصِيَةِ ﴿١٥﴾ ﴾ **العلـق**.

# کورتە باسێک دەربارەی بووناسیی ئیسلامیی

ئـەم کورتـە باسـە بـە پوختەکراویـی و گوشراویـی لـە کتێبـی چوارەمـی «مەوسـووعەی: بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لەنێـوان وەحیـی و واقیـع»دا بەناوونیشـانی: [پایەکانـی بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی] وەردەگریـن، کـە پایـەی یەکـەم، بریتیـە لـە بووناسـیی (علـم الوجـود - ontology).

شـایانی باسـە: کاتـی خۆشـی ئـەم بەشـی یەکەمەمـان دیسـان جارێکـی دیکـە، وەك گـوشراو لـە کتێبـی یەکەمـی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلّى في كتـاب اللـه**) وەرگرتـوە، بەنـاوی: (**الإسـلام معرفـة صحيحـة بالخالـق والخلـق**)، کـە کتێبـی یەکەمـی مەوسـووعەی ناوبـراو دەوری (٥٠٠) لاپەڕەیـەو هەمـووی بۆ بووناسـیی تەرخانکراوە، ئنجا ئێمـە ئـەم بەشـی یەکەمەی کتێبـی چـوارەم «پایەکانـی بیرکردنەوەی ئیسـلامیی» وەك پوختـەو گوشراوێـك لـەو کتێبـی یەکەمـەی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلّى في كتـاب اللـه**) وەرمانگرتـوە، ئێسـتاش ئـەم کورتـە باسـەمان جارێکـی دیکـە، وەك گوشراوێـك لـەو باسـەی کتێبـی چوارەمـی مەوسـووعەی: (بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لەنێـوان وەحیـی و واقیعـدا) وەردەگریـن، واتـە: ئـەم کورتـە باسـە دەبێتـە پوختـەی پوختـە، یاخـود گـوشراوی گـوشراو.

**ئەم کورتە باسە لەبارەی بووناسیی ئیسلامییەوە، لەچوار تەوەردا دەخەینە ڕوو:**

تەوەری یەکەم: خواناسیی، لە یازدە بڕگەدا باسی خوا ناسی دەکەین.

تەوەری دووەم: گەردووناسیی، لە هەشت بڕگەدا باسیی دەکەین.

تەوەری سێیەم: مرۆڤناسیی، لەشەش بڕگەدا باسی دەکەین.

تەوەری چوارەم: دونیاو دوارۆژناسیی، لەحەوت بڕگەدا باسی دەکەین.

کەواتە: (١١+٨+٦+٧=٣٢) بڕگە.

## تەوەری یەکەم: خواناسی:

لەو کتێبەدا باسمان کردوە کە (بووناسیی)، خەڵکی دیکە وشەی: (دنیابینیی)، یاخود (جیهانبینی) بۆ بەکارهێناوە، بەڵام من ئەوەم پێ هەڵەیەو پێم وایە وشەی (بووناسیی) ڕێك و ڕاست و پڕ بە پێستە، هەم لەگەڵ وشە عەڕەبییەکەی دا: (علم الوجود) یان (**معرفة الوجود**) کە تەرجەمەی (ontolo-gy)یە، چونکە (جیهان) و (دونیا) مەبەست پێیان ئەو بوونەوەرە بەرهەستەی ئێستایە کە دەبینرێ، لەو سنوورە بەدواوە، دەلالەت لەسەر هیچی دیکە ناکات، بەڵام بووناسیی، یاخود: بوونزانیی، زانینی بوون (وجود)، هەم خوای پەروەردگار دەگرێتەوە، کە خاوەنی بوونەو، خاوەنی بوونێکی سەربەخۆو خودییە، هەم بەدیهێنراوەکانی خواش دەگرێتەوە، دیسان هەم ئێستا دەگرێتەوە کە دنیایە، هەم قۆناغەکانی دیکەی ژیان کە قۆناغی بەرزەخ و ڕۆژی دواییە، دەگرێتەوە، هەروەها هەم بینراوەکان و بەرهەستەکان دەگرێتەوە، هەم شتە نابەرهەستەکانیش دەگرێتەوە.

### تەوەری یەکەم: خواناسیی ئێمە لە یازدە (١١) بڕگەدا باسی خواناسیی دەکەین، بەڵام زۆر بە پوختکردنەوەوە:

**بڕگەی یەکەم:** خوا تاکە بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگارەو، ئەوە گەورەترین ڕاستیی خواڕسکە لەدەروونی مرۆڤداو، مەزنترین حەقیقەتی عەقڵییە:

دەتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ئەوە بێنینەوە، کە ناسینی خوا وەك بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگار، گەورەترین ڕاستیی زگماك و خواڕسکە لە دەروونی مرۆڤدا و، مەزنترین حەقیقەتی عەقڵییە:

**١)**- بەڵگەی یەکەم: ئەو پێنج ئایەتەی سەرەتای سوورەتی (العلق)ن، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ۝١ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ۝٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ۝٣ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ۝٤ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۝٥ ﴾.

ئەمـە بەڵگەیـە لەسـەر خواڕسـك بـوون و زگـماك بوونـی ناسـینی خـوا، لـە نـاخ و جەوهـەری مرۆڤـدا، چ لـە دەروونیـدا، چ لـە عەقڵیـدا، بەبەڵگـەی ئـەوەی خـوای پـەروەردگار یەکسـەر پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەدوێنـێ و دەفەرموێ: بخوێنـە! بەناوی ئـەو پـەروەردگارەت کـە هەمـوو شـتێکی بەدیهێنـاوە، ئنجـا دوایـی لەنێـو هەمـوو شـتەکاندا دروسـتکردنی مـرۆڤ دیاریـی دەکات، ئـەو زاتـەی ئینسـانی لـە خوێنپـارە دروسـت کـردوە، بخوێنـەو پـەروەردگارت هـەرە بەخشـەرە، بەقەڵـەم مرۆڤـی فێـری شـتێك کـردوە کـە نەیزانیـوە.

کەواتـە: ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ کـە بڕوابـوون بـە بوونـی خـوای پـەروەردگار، بەبەدیهێنەرایەتیـی خـوا، خاوەنداریيەتـی، پەروەردگارييەتـی، شـتێکی سرووشـتییە لـە خواڕسـکی مرۆڤـداو، عەقڵـی سـەلیمیش زۆر بـە سـێنایی خـوا دەناسـێ.

**٢)**- بەڵگەیەکی دیکە لەو بارەوە ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ **الأعراف**، واتە: یاد بکەوە کاتێك پەروەردگارت لە وەچەی ئادەم لە پشتیان وەچەکەیانی وەرگرت و لەسەر خۆیانی کردن بە شاهێد، (فەرمووی:) ئایا پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: با، شایەتییمان دا، [بۆیەش ئەو شایەتییەمان لێوەرگرتن] تاکو ڕۆژی قیامەت نەڵێن: ئێمە لەمە بێئاگابووین.

ئەمـەش وێنـا کردنـی ناسـینی خوایـە لـە عەقڵـی مرۆڤەکانـدا، واتـە: لـە عەقڵـی سـەلیمی مرۆڤەکانـدا.

**٣)**- بەڵگەیەکی دیکە لەوبارەوە ئەوەیەکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ **الروم**. واتە: ڕووی

خۆت ڕێك و ڕاست بكە بەرانبەر بە ئایین بە پاكیی، ئەو خوارِسكەی خوا خەڵكی لەسەر ڕسكاندوە، گۆڕان نیە بۆ دروستكراوی خوا، ئا ئەوەیە ئایینی ڕێك و ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

كەواتە: فیترەت و شەریعەت دووڕووی دراوێكن.

٤)- بەڵگەیەكی دیكەش لەو بارەوە ئەو ئایەتە موبارەكەیە، كە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قَالَتْ رُسُلُهُمْ أَفِي اللَّهِ شَكٌّ فَاطِرِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴿١٠﴾﴾ **إبراهيم**، واتە: پێغەمبەرەكانیان گوتیان: ئایا لە بوونی خوادا دوودڵیی هەیە، بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی؟!

پێغەمبەران سەلامی خوایان لێبێ هەموویان لەو خاڵەوە دەستیان پێكردوە، كە ناسینی خواو پەیپێبردنی خوا، شتێكی خوارِسكەو لە زگماكی مرۆڤدا هەیەو، شتێكە عەقڵی سەلیم ڕاستەوخۆ پەی پێ دەبات.

**برگەی دووەم:** خوای پەروەردگار پاكە لەهەموو كەم وكوڕییەك و، تێرو تەواویی ڕەهای هەیەو، هەموو دروستكراوەكان خوا بەپاك دەگرن و ستایشی دەكەن:

لەزۆر ئایەتدا ئەم ڕاستییە مەزنەش، كە چەند ڕاستییەكی گرتوونە خۆی، دەرەوشێنراوەتەوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾﴾ **التغابن**، واتە: هەرچی لە ئاسمانەكان و هەرچی لە زەویدا هەیە، خوا بەپاك دەگرێ، دەستەڵات و حوكمڕانیی هەر هی ئەوە، ستایش هەر بۆ ئەوەو، ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە.

**برگەی سێیەم:** خوای پەروەردگار خاوەنی هەموو ناوە هەرە چاكەكانەو، خاوەنی تێكڕای سیفەتە هەرە بەرزەكانە:

١)- خوای بەرزی مەزن لە سوورەتی **(الأعراف)** ئایەتی (١٨٠)دا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُوا الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَائِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ

﴿١٨٠﴾ ﴾ الأعراف، واتە: خوا ناوە هەرە چاكەكانی هەن، ئنجا بەس بەو ناوە چاكانەی لێی بپاڕێنەوەو واز لەوانە بێنن كە لادان دەكەن لە ناوەكانیدا، ئەوانە لەسەر ئەوەی دەیكەن سزایان دەدرێتەوە.

٢)- لە سوورەتی (الإسراء) ئایەتی (١١٠)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿١١٠﴾ ﴾، واتە: بڵێ: لەخوا بپاڕێنەوە، یان لە بەبەزەیی (الرحمن) بەهەر ناوێك لێی بپاڕێنەوە، ئەو ناوە هەرە چاكەكانی هەن.

٣)- لە سوورەتی (طه) ئایەتی (٨) دا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: خوا بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، ناوە هەرە چاكەكانی هەن.

٤)- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ لِلَّهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ اسْمًا مِائَةً إِلَّا وَاحِدًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنَّةَ} (أخرجه البخاري: ٢٥٨٥). واتە: خوا نەوەدو نۆ ناوی هەن، هەركەسێك بیانژمێرێ، (واتە: بە تێگەیشتن و كارپێكردنەوە) دەچێتە بەهەشت.

بێگومان ناوەكانی خوا لەو نەوەدو نۆیەش زیاترن و سیفەتەچاكەكانی خوا بێسنوورن، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خواوە ﷺ دەردەكەوێ:

{أللهم أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ هُوَ لَكَ، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ صَدْرِي، وَجِلَاءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي} (أخرجه أحمد: ٤٣١٨، قال الهيثمي (١٣٦/١٠): رجاله رجال الصحيح غير أبي سلمة الجهني، وقد وثقه ابن حبان. وابن أبي شيبة: ٢٩٣١٨، والطبراني: ١٠٣٥٢، والحاكم: ١٨٧٧، وقال: صحيح على شرط مسلم، وصححه الألباني).

واتە: ئەی خوایە! لێت دەپاڕێمەوە، داوات لێدەكەم بە هەر ناوێك كە تۆ هەتە، خۆتت پێ ناوناوە، یان لە كتێبەكەتدا داتبەزاندوە، یان بە یەكێك لە دروستكراوەكانی خۆتت فێركردوە، یاخود لە زانیاریی پەنهان لەلای خۆت

هەڵتگرتوە، کە قورئان بکەیە بەهاری دڵم و، ڕووناکیی سینەم و، لابەری خەم و پەژارەم و، نەهێڵەری دڵتەنگییم.

**بڕگەی چوارەم:** خوای تاك و پاك وەك هیچ کام لە دروستکراوەکانی ناچێ و، هیچ کام لە دروستکراوەکانیشی وەك وی ناچن، لە هیچ شتێکدا:

**١)-** خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە (١١)ی سووڕەتی (**الشورى**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١ ﴾، واتە: خوا بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە، لە خۆتان هاوسەری بۆ هێناونە دی، هەروەها ئاژەڵەکانیشی بەجووت خوڵقاندوون، هیچ شتێك وەك خوا نیە، خوا بیسەری بینەرە.

**٢)-** دیسان لە سووڕەتی (**طه**) ئایەتی (١١٠)دا خوای تاك و پاك دەفەرموێ: ﴿ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمٗا ١١٠ ﴾ ، واتە: ئەو (خوا) ئەوەی لە پێشیانەوەیەو ئەوەی لە دوایانەوە (یاخود ڕابردوویان و داهاتوویان) دەزانێ، زانیاریی ئەوان ناتوانێ دەوری خوا بدات.

واتە: ناتوانێ پەی بە چییەت و ماهییەتی خوا ببات، نەك پەی بە بوونی خوا، نەبات، چونکە پەی بە بوونی خوا دەبردرێ و، فیتڕەت و عەقڵی ئینسان بۆ خوا تینوون، بەڵام حەقیقەتی خوا، چییەتەکەی، چۆنە؟ بێگومان لەسەرووی ئەوەوەیە مرۆڤ بیزانێ.

مرۆڤ تاکو ئێستا چییەتی ماددە نازانێ، هەرئەوەندە دەزانێ یەکەی دروست بوونی ماددە، خشتی یەکەمی بریتیە لە گەردیلە، ئەتۆم (atom)، زەڕڕە، گەردیلەش لە سێ پێکهاتەی سەرەکیی پێکهاتوە:

**یەك:** نێوك، کە لە پڕۆتۆن (Proton)و نیوترۆن (Nutron)پێك دێ و بارگەیەکی موجیبی هەیە.

**دوو:** ئەلیکترۆن، (Electron)بەدەوری نێوکدا دەخولێتەوەو بارگەیەکی سالیبی هەیە.

بەڵام تا ئێستا كەس نەك گەردیلەی نەبینیوە، بەڵكو مۆڵكۆڵیشی نەبینیوە، مۆڵكۆڵ (molcol) گەردی پێ دەڵێن، تاكو ئێستا ئەوەش هەر نەبینراوە، كە هەر مۆڵكۆڵێك لە ملیۆنان گەردیلە پێك دێ، لە حاڵێكدا كە بە میكرۆسكۆبی ئەلیكترۆنییش هەر گەردیش نەبینراوە، كە زیاتر لە (٦٠٠٠٠٠) جار شت گەورە دەكات.

هەروەها تاكو ئێستا ڕووحەكەی خۆی كە لە نێوان دوو تەنیشتەكانیدایە، نایزانێ، دەزانێ هەیە، بەڵام چییەتەكەی نازانێ، ئەدی چۆن خوا بزانێ؟ مرۆڤ تاكو ئێستا هێزی كێشندەی زەوی نازانێ چۆنە، دەزانێ گەردوون بە هێزی كێشندەوە وەستاوە، هەروەها ئەلیكترۆن و نێوكەكان، بەهێزی كەهرۆموگناتیسیی، بەڵام تاكو ئێستا چییەتەكەیان نازانێ و بەس شوێنەوارەكانیان دەبینێ.

**بڕگەی پێنجەم:** هیچ شتێك و هیچ كەس هیچ جۆرە نیسبەتێكی لەگەڵ خوادا نیەو، هیچ پەیوەندییەكی بەخواوە نیە، مەگەر پەیوەندیی دروستكراو، لەگەڵ بەدیهێنەردا:

خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنی قورئان دا ئەم ڕاستییەی ڕاگەیاندوە، بۆ وێنە:

**١)-** خوا لە سوورەتی **(مریم)** ئایەتی (٩٣)دا دەفەرموێ: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: هیچكەس نیە لە ئاسمانەكان و زەویدا، مەگەر بە بەندایەتیی دێتە لای (خوای) بە بەزەیی.

كەواتە: هەموو ئەوانەی جۆرێك لە خۆپاڵدانە لای خوایان داهێناوە، وەك جوولەكەكان و نەصرانییەكان، كە گوتوویانە: ئێمە دۆست و نزیكی خواین: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ المائدة، جوولەكەو نەصرانییەكان گوتیان: ئێمە كوڕانی خواو خۆشەویستانی ئەوین.

لەڕاستییدا جگە لە ئەفسانەو شت هەڵبەستن بەناوی خواوە، هیچ بنەمایەكی دیكەیان نیە بۆ ئەو قسەیان، بۆیەش خوای پەروەدگار لەهەمان ئایەتدا

بەرپەرچیان دەداتـەوەو دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ﴿١٨﴾ ﴾ المائدة، واتـە: بلّێ: ئـەدی بۆچـی خـوا بەهـۆی گوناهەکانتانـەوە سـزاتان دەدات! بەڵکـو ئێـوەش هـەر مرۆڤێکـن وەك ئـەو مرۆڤانـەی (خـوا) دروسـتیکردوون.

**برگـەی شەشــەم:** خــوا باڵادەســتە بەســەر دروســتکراوەکانی خۆیــداو، بەســەر هەمــوو شــتێکدا بەتوانایــە، هەرچــی بیــەوێ دەیــکات و، بەهەمــوو شــتێك زانــاو شــارەزایە:

لەزۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، ئەم ڕاستییانە دەرەوشێنراونەوە بۆ وێنە:

١)- لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ ﴾، واتە: حوكمڕانیی ئاسمانەکان و زەوی هی خوایەو خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

٢)- لە سووڕەتی (**فاطر**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ عَالِمُ غَيْبِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٣٨﴾ ﴾، بە دڵنیایی خوا زانای نهێنیی ئاسمانەکان و زەوییەو، بە نهێنیی سینەکان و دڵ و دەروونەکانیش ئاگادارە.

**برگـەی حەوتــەم:** خــوای بــەرزو مــەزن هەمیشــە ژیــاوی سەرپەرشــتیارەو، دروســتکراوەکانی خــۆی بــەردەوام لــە ژێــر ڕکێــف و کۆنترۆڵــی خۆیــدا دەهێڵێتــەوە، تەنانــەت چاوترووکانێــك لــە دروســتکراوەکانی خــۆی بێئــاگا نیــەو، خــوا نــە ماندوویێتیی نــە خــەو، ڕێــی تــێ نابــەن:

هەڵبەتــە ئــەم برگەیــە ئێســتا بۆتــە شــتێکی ڕوون و ئاشــکرا، بــەڵام کاتــی خــۆی بەشــەر وای نەزانیــوە، بەڵکــو وەك لەشــوێنی تایبەتــدا باســمان کــردوە، بەتایبــەت لــە مەوســووعەی ئیــمان و ئیلحــاد: (دەرەوشــاوەیی ئیســلام و پوچەڵیــی ئیلحــاد لەبــەر تیشــکی زگــماك و عەقــڵ و زانســت و وەحیــی دا) گەورەتریــن فەیلەســووفەکانی یۆنــان، پێیــان وابــووە خــوا ئــەم گەردوونــەی دروســتکردوە، وەك ســەعات چــۆن

قورمیش دەکرێ، قورمیشی کردوەو بەرهەڵدای کردوەو لێیگەڕاوە! بەڵام خوای کاربەجێ ڕوونی کردۆتەوەو ڕایگەیاندوە کە سەرپەرشتیی دروستکراوەکانی خۆی دەکات و ئاگای لێیانە، چاودێرییان دەکات و تاو بەتاو ئاگای لە وردو درشتیانە:

١)- لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلْخَلْقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: لە سەرووتانەوە، حەوت چینمان، یان حەوت ڕێمان خوڵقاندوون و، ئێمە لە دروستکراوەکانی خۆمان بێئاگانین.

٢)- هەروەها لە سوورەتی (**الرحمن**)دا دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾، هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە داوای لێ دەکات، لەهەموو کاتاندا ئەو کارێکی هەیە.

واتە: خوای پاك و تاك هەمیشە ئاگای لە دروستکراوەکانی خۆیەتی، وشەی (یوم) کە دەفەرموێ: ﴿ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ ﴾، بەپێی باوی ئێمە بیست و چوار (٢٤) سەعاتە، دابەش دەبێ بۆ (٢٤) یەکە کە پێیان دەگوترێ: سەعات، بەڵام ڕۆژی ئێمە لە ئەنجامی خولانەوەی زەوی بەدەروی خۆی لە بەرانبەر خۆردا پەیدا دەبێ، نیوەی شەوو نیوەی ڕۆژ، بەشێوەیەکی هاوکۆیی دوازدە سەعات شەو، دوازدە سەعات ڕۆژ، بەڵام بێگومان لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا وشەی (یوم) واتە: (**مُـدَّةٌ مِـنَ الزَّمَـان أيُّ مُـدَّةٍ كانَـت**) ماوەیەك لە کات، هەرچەندێکی بێ، کەم بێت، یاخود زۆربێت.

**بڕگەی هەشتەم:** دروستکراوەکان بۆ ویستی خواو یاسای خوا ملکەچن، هیچ دروستکراوێك بە ئەندازەی سەرە ئەنگوستێك، بەڵکو بەقەدەر موویێك، لاملیی ناکات لەو یاسایانەی خوا بۆی داناون و ناتوانن لەژێر ڕکێفی ویستی خوا بچنە دەر:

بەس ئەو ئایەتەی سوورەتی (الحج) بەبەڵگە بێنینەوە، بەسە بۆ ئەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسْجُدُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ وَٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلْجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٌ مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ ٱلْعَذَابُ ۗ وَمَن

يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكْرِمٍ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینی چۆن هەرکەس لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، کڕنووش بۆ خوا دەبات، هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و چیایەکان و دارو درەخت و ژیانداران و زۆرێك لە خەڵکیش، زۆرێکیش سزایان لە سەر پێویست بووە، هەرکەسێکیش خوا (بەهۆی کوفرو لادانیەوە) سووك و ڕیسوای بکات، ئەوکات هیچ ڕێزگرێکی نابێ، بەدڵنیایی خوا هەرچی بیەوێ دەیکات.

**بڕگەی نۆیەم:** خوا چەند یاسایەکی داناون بۆ دروستکراوەکانی خۆی، بەسەر هەموو شتێکدا جێبەجێ دەبن، بەڵام وا نیە خوای باڵادەست نەتوانێ لەو یاسایانە دەرباز بێ:

١)- خوای زاناو توانا دەفەرموێ: ﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾ **البروج**، واتە: ئەنجامدەری هەرشتێکە بیەوێ.

٢)- هەروەها لە سوورەتی (**الحج**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ ﴾، واتە: بێگومان خوا هەرچی بیەوێ ئەنجامی دەدا.

٣)- هەروەها لە سوورەتی (**المائدة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ﴿١﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیاییەوە خوا چۆنی بوێ وا بڕیار دەدات.

٤)- هەروەها لە سوورەتی (**الرعد**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَحْكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِۦ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: خوا بڕیار دەداو هیچکەس ناتوانێ بەدوایدا بچێ (بڕیارەکەو حوکمەکەی هەڵبوەشێنێتەوە).

٥)- دیسان لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: ئەو لێی ناپرسرێ لەوەی دەیکات و ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە.

چونکە خوای پەروەردگار هەرچی دەیکات لەسەر بناغەی ئەوپەڕی زانیاریی و ئەپەڕی حیکمەت و ئەوپەڕی میهرەبانییە، سیفەتەکانی خوا هەموویان

لەوپەڕدان، بۆیە شتێکی بێجێ ناکات شایستەی ئەوەبێ لێی بپرسرێتەوە، بەڵام بێگومان هەرکاتێك ویستی یاسایەکانی خۆی ڕادەگرێ، هەروەك چۆن یاسای سووتاندنی ئاگری ڕاگرت لەسەر ئیبراهیم کە خستیانە نێو ئاگرەوە: ﴿ قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ ﴾ **الأنبياء**، گوتمان: ئەی ئاگر! ساردبەو سەلامەتیش بە لەسەر ئیبراهیم.

**بڕگەی دەیەم:** خوای پەروەردگار لەسەرووی دروستکراوەکانیەتی خۆیەتی، بەوشێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، چونکە هیچ شتێك وەك خوا نیە.

خوای پەروەردگار لەزۆر ئایەتدا، ئەو ڕاستییەی ڕوونکردۆتەوە:

**١)**- لە سوورەتی (**الزخرف**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ ﴾، واتە: ئەو لە ئاسمان دا پەرستراوەو لە زەویشدا پەرستراوە و، ئەو کارزانی زانایە.

**٢)**- لە سوورەتی (**النساء**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾ ﴾، واتە: خوا دەورەدەری هەموو شتێك.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴿١١﴾ ﴾ **الشورى**، واتە: هیچ شتێك وەك خوا نیە.

هەربۆیە زانایان وەك بنەمایەك دایانناوە دەڵێن: (**أَللهُ مُسْتَوٍ عَلى عَرْشِه، بَائِنٌ عَن خَلْقِه**) خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی (بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە) بەڵام لەدەرەوەی چوارچێوەی دروستکراوەکانیەتی.

دروستکراوەکان مەحکوومی کات و شوێنن، شوێن بریتیە لە درێژبوونەوەی ماددەو، کاتیش بریتیە لە جووڵانی ماددە، خوای پەروەردگار لەدەرەوەی جوغزی کات و شوێنە.

**بڕگەی یازدەیەم و کۆتایی:** خوای پەروەردگار یەکەمینەو دواهەمینەو، ئاشکراو پەنهانە:

لە سووڕەتی (الحدید) ئایەتی ژمارە (٣)دا دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلْأَوَّلُ وَٱلْءَاخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ٣﴾، واتە: خوا یەکەمە (بەبێ سەرەتاو دەستپێکردن)و دواهەمینە (بەبێ ئەوەی کۆتایی بێ)و، ئاشکرایە (بەبێ ئەوەی ببینرێ)و پەنهانە (بێ ئەوەی نکوولیی لێ بکرێ)و، ئەو بەهەموو شتێك زانایە.

زانایان دەڵێن: خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلْبَاطِنُ﴾ **الحدید**، ئاشکرایەو پەنهانە، واتە: ئاشکرایە بۆ کەسێك بە چاوی عەقڵ و دڵ و فیترەت بۆی بگەڕێ و دەیبینێ، بەڵام پەنهانە بۆ کەسێك بیەوێ بەچاوی سەر بۆی بگەڕێ، بەدڵنیاییەوە نایبینێ.

ئەمە تەوەری یەکەم بە نسبەت خواناسییەوە.

هەڵبەتە ئەگەر ئێمە وەك لەو یازدە بڕگەیەدا هاتووە، ئاوا خوا بناسین، بەڕاست و دروستیی خوا بناسین، ئەوکاتە مامەڵەیەکی ڕاست و دروستیشی لەگەڵدا دەکەین، دیارە خوای پەروەدگار ئاوا خۆی بە ئێمە ناساندوە، وەك بەدیهێنەرو پەروەردگارو، خاوەن و، مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری هەموو ئەو دروستکراوانەی ئێمە بەشێکی کەمیان لێ دەبینین، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان نابینین، ئەوەی خوا هەواڵی پێنەدابین و ناشیانزانین.

## تەوەری دووەم: گەردووناسیی

خـوای پـەروەردگار گەردوونـی بەهـەق دروسـتکردوە، هەمـوو شتێکیشـی بەوپەڕی ڕێـك و پێکیـی و وردەکاریـی بەدیهێناوە:

لە هەشت بڕگەدا باسی گەردووناسیی دەکەین:

**بڕگـەی یەکـەم:** دروسـتکراوەکان لـە بچووکترینیانـەوە تاکـو گەورەترینیـان، هەموویـان دروسـتکراوی خـوان، بەبـێ هـەڵاواردن، خـوای بەدیهێنـەر هەموویانـی بەدیهێنـاوەو خـاوەن و مشـوورخۆری هەمـوو شـتێکە:

بچووکتریـن شـت تاکـو ئێسـتا کە بۆ زانسـت ئاشـکرا بـووە، گەردیلەیە، بـە عەڕەبیی (ذرة) بـە ئینگلیزیـی (ئەتـۆم - atom)ی پـێ دەگوتـرێ، دیـارە ئەویـش بچووکتریـن شـت نیـە، بەڵکـو لـە سـێ پێکهاتـەی سـەرەکیی پێکهاتـوە، کـە بریتیـن لـە: (پڕۆتـۆن و نیوتـڕۆن وەك نێـوك، ئەلیکتـڕۆن کـە بەدەوریانـدا دەخولێتـەوە)، بەڵکـو ئێسـتا دەرکەوتـوە ئەوانیـش بـە تایبـەت هـەرکام لـە ئەلیکتـڕۆن و نیوتـڕۆن، لـە پێکهاتـەی بچووکـتر پێکهاتـوون و پێیـان دەگوتـرێ: کواڕکـەکان (الكـواركات)، بـەڵام هەرچـۆن بێ گەردیلـە بـە خشـتی یەکەمـی مـاددە دادەنـرێ، ئنجـا هـەر لـە گەردیلـەوە بگـرە، کـە وەك گوتـم: بـە بچووکتریـن شـتی کـە خـوا دروسـتیکردوە، دادەنـرێ، ئەگەرنـا لەویـش بچووکـتر هەیـە، تاکـو کەهکەشـانەکان و گەلەکەهکەشـانەکان، کەهکەشـانەکەی ئێمـە بـە مەزەنـدە دووسـەد (٢٠٠) ملیـار ئەسـتێرەی تێدایـەو. هەندێـك دەڵێـن: یـەك تریلیـۆن، هـەزار ملیـار (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەسـتێرە، هەروەهـا بـۆ ژمـارەی کـە هکەشـانەکانیش زانایـان دەڵێـن: تاکـو ئێسـتا ئـەوەی کەوتۆتـە بەرچـاوی تەلیسـکۆبەکان بەیـەك تریلیـۆن کەهکەشـان، یـان بـەلای کەمـەوە بـە دوو سـەد ملیـار کەهکەشـان مەزەنـدە دەکـرێ، ئنجـا هەمـوو ئەمانـە لـە گچکەترینیانـەوە تاکـو گەورەترینیـان، بێگومـان خـوا بەهـەق دروسـتیکردوون، هەمووشـیان بەدیهێـنراوی خـوان و خـوا سەرپەرشـتییان دەکات.

**بڕگەی دووەم:** سەرەتای دروستکراوەکانی خوا بۆ ئێمە نەزانراوە، وەك کۆتاییان و جگە لەوەی خوای کاربەجێ بۆی باسکردووین، هیچی دیکەی لێ نازانین:

خوا لە سوورەتی **(الكهف)** ئایەتی (٥١)دا دەفەرمووێ: ﴿مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ خَلۡقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَا خَلۡقَ أَنفُسِهِمۡ ۝٥١﴾، واتە: دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی و هی خۆشیانم پیشان نەداون، چونکە (مَّآ أَشۡهَدتُّهُمۡ) دوو واتای هەن:

**أ-** **(أَي مَا جَعَلتُهم شَاهِدِينَ)** واتە: نەمکردوونە شایەدو بینەر.

**ب-** **(مَا أَحْضَرْتُهم)** ئامادەم نەکردوون، لەوکاتەدا.

ئنجا ئەم گەردوونەی ئێستای ئێمە کە بە پێی نوێترین بیردۆزە، کە بریتیە لە بیردۆزەی: (تەقینەوەی مەزن **bigbang**) سێزدە تاکو چواردە ملیار حەوتسەد هەشتسەد ملیۆن ساڵ لە مەوبەر ئەو تەقینەوەیە ڕوویداوەو، تەنێکی یەکجار بچووك بەناوی (سینگۆلاریتی **sungolarety**) واتە: تاکی گەردوونیی، یاخود هێلکەی گەردوونیی، یان تۆوی گەردوونیی، کە زۆرزۆر لە ئەلیکترۆنیش بچووکتر بووەو لەوپەڕی گەرمییدا بووە، ئەو تەنە گچکەیە تەقیوەتەوەو سەرەنجام ئەم گەردوونەی ئێمە لەوەوە هاتوە، بێگومانیش جگە لەوەی خوای پەنهانزان لەبارەی سەرەتاو کۆتایی گەردوونەوە بۆی باسکردووین، زانیاریی نە ئاگای لە سەرەتا هەیە، نە ئاگای لە کۆتایی هەیە، بەڵام دەتوانێ باسی ئێستا بکات، ئەویش زیاتر بەمەزەندە.

**بڕگەی سێیەم:** دروستکراوەکان هەیانە بەرهەست و بینراوەو، هەشیانە نابەرهەستەو نەبینراوو شێردراوەیە:

ئەمەش لەزۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە:

**١)-** لە سوورەتی **(الحاقة)**دا خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿فَلَآ أُقۡسِمُ بِمَا تُبۡصِرُونَ ۝٣٨ وَمَا لَا تُبۡصِرُونَ ۝٣٩﴾، واتە: وانیە! سوێند دەخۆم بەوەی دەیبینن و، بەوەش کە نایبینن.

**٢)-** هەروەها خوای پەروەردگار لەسوورەتی (**الأنعام**)دا دەفەرموێ: ﴿ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: (خوا) زانای پەنهان و ئاشکرایە.

کەواتـە: دروسـتکراوەکان هـەر ئەوەنـدە نیـن کـە دەبینرێـن و بەرهەسـتن، بەڵـکو زۆر زۆر زیاتـر لەوانـەی بەرهەسـتن، نابەرهەسـتن و، زۆر زۆر زیاتـر لەوانـەی دەبینرێن، نابینرێن.

**بڕگـەی چـوارەم:** خوای پـەروەردگار هەموو دروسـتکراوەکانی بەهەق دروسـتکردوون و بـە حیکمەت و تـەرازوو:

ئەمیـش لـە گەلێـك لـە ئایەتەکانـی قورئانـدا خـوای کاربەجـێ ئـەو ڕاسـتییەی خسـتۆتە ڕوو، بـۆ وێنـە:

**١)-** لە سوورەتی (**الجاثية**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بەهەق هێناونە دی و، بۆ ئەوەی هەر نەفسێك سزاو پاداشت بدرێتەوەو ستەمیشیان لێ ناکرێ.

**٢)-** لە سوورەتی (الروم)دا خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَـٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾ **الروم**، واتە: ئایا لە دڵی خۆیاندا بیریان نەکردۆتەوە، لەبەر خۆیانەوە ڕانەماون، کە خوا ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیانی بەهەق نەبێ و بۆ کاتێکی دیارییکراو نەبێ دروستنەکردوون، بەدڵنیایی زۆرێك لە خەڵکیش بەدیداری خوا بێبڕوان.

**بڕگـەی پێنجـەم:** وەك چـۆن دروسـتکراوەکان بەگشـتیی بـە حیکمـەت بەهـەق دروسـتکراون، ئەویـش ئەوەیـە کـە مـرۆڤ و جنـد تاقیبکرێنـەوە، هـەرکام لـە دروسـتکراوەکانیش بەهـەق و حیکمـەت و وردەکاریـی و بەباشـترین شـێوە دروسـتکراون:

خوای بێ وێنە لە چەند شوێنێکی قورئان دا ئەو ڕاستییەی بەیان کردوە، بۆ وێنە:

**١)**- لە سووڕەتی (السجدة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَىۡءٍ خَلَقَهُۥ ۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَـٰنِ مِن طِينٍ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: خوا هەر شتێکی دروست کردوە، بەباشترین شێوە دروستیکردوە، دروستکردنی مرۆڤیشی لە قوڕێوە دەست پێکردوە. واتە: یەکەمین دوو مرۆڤ کە ئادەم و هاوسەرەکەی حەووان.

**٢)**- هەروەها لە سووڕەتی (النمل)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَىۡءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئەوە دروستکراوی خوایە کە هەموو شتێکی بە باشترین شێوە هێناوەتە دی، بە دڵنیایی ئەو شارەزای ئەوەیە کە دەیکەن.

**بڕگـەی شەشـەم:** خـوا ئـەو دروسـتکراوانەی هەمـوو هێناونـە دی، بەمەبەسـتی ئـەوەی مرۆڤیـان تێـدا تاقـی بکرێتـەوەو، دوایـی سـزاو پاداشـت بدرێتـەوە:

ئەمیش لەزۆر شوێن لە ئایەتەکانی قورئاندا خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە:

لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرۡشُهُۥ عَلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾ ، واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژ (واتە: بە شەش قۆناغ) هێناونە دی و عەڕشەکەی لەسەر ئاو بوو لەو کاتەدا، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی چاکترە!

کەواتـە: ئـەم گەردوونـە هەمـووی تاقیگەیەکـە بـۆ مـرۆڤ، هەمـووی هۆڵێکـی تاقیکردنەوەیـە مـرۆڤ و جنـدی تێـدا تاقـی دەکرێنـەوە.

**بڕگـەی حەوتـەم** ئـەو دروسـتکراوانە هەموویـان سـەرەتایەکیان هەیـە لەوێـوە دەسـتیان پێکـردوەو، کۆتاییەکیشـیان هەیـە، لـەوێ کۆتاییـان پێـدێ، بـەڵام نەسـەرەتایەکە تاکـو ئێسـتا کـەس دەیزانـێ، نەکۆتاییەکـەش:

خـوای بـەرز لەبـارەی کۆتایـی دروسـتکراوەکانەوە دەفەرمـوێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ﴿١٨٧﴾ ﴾ **الأعـراف**، لێـت دەپرسـن ئاخیـر زەمـان (کۆتایـی گـەردوون) لەنگەرگرتنەکـەی کەیـە؟ بڵـێ: زانیاریـی ئـەوە تەنیـا لـەلای پەروەردگارمـە، خـۆی نەبـێ کـەس دەری ناخـات.

پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـەو فەرموودەیـەدا کـە بـە فەرمـوودەی جبریـل نـاسراوە، کاتێـك جبریـل لێـی دەپرسـێ: {**مَتَـى السَّـاعَةُ**}؟ ئاخیـر زەمـان کەیـە؟ دەفەرمـوێ: {**مَـا الْمَسْـئُولُ عَنْهَـا بِأَعْلَـمَ مِـنْ السَّـائِلِ**} پرسـیارلێکراو لەبارەیـەوە زاناتـر نیـە لـە پرسـیارکەر[١].

**بڕگەی هەشتەم و کۆتایی:** پێنج ڕاستیی مەزن لەبارەی گەردوونەوە لە قورئاندا:

ڕاسـتیی یەکـەم: پێکهاتەکانـی دروسـتکراوەکانی خـوا، حـەوت شـتی سـەرەکیین: کـە بریتیـن لـە:

**١-** دروستکراوی یەکەم: عەڕش، بارەگا، تەختی خوا، وەك بۆ خوا شایستەیە کە دروستکراوێکی خوایەو کێشی هەیە، بەبەڵگەی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: {**سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضَا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ، وَمِدَادَ كَلِمَاتِهِ**}[٢] (**زنة عرشه**) واتە: کێشی عەڕشەکەی.

**٢-** هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ: ﴿ وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَٰنِيَةٌ ﴿١٧﴾ ﴾ **الحاقة**، لەو ڕۆژەدا (واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا) هەشت عەڕشی خوا هەڵدەگرن.

دروسـتکراوی دووەم: (**سِـدْرَةُ الْمُنْتَهـى**): درەختـی کۆتایـی، کـە خـوای خـاوەن لـە سـوورەتی (النجـم)دا باسـی کـردوە: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ .

---

(١) أخرجه أحمد: ٩٤٩٧، والبخاري: ٥٠، ومسلم: ١٠، وابن ماجه: ٤٠٤٤.

(٢) أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٩٣٩٥، ومسلم: ٢٧٢٦، وأبو داود: ١٥٠٣، وابن ماجه: ٣٨٠٨.

٣- دروستكراوی سێیەم: (**سَبع سَمَاوات**): حەوت ئاسمانەكان.

٤- دروستكراوی: چوارەم زەوی.

٥- دروستكراوی پێنجەم: ئەوەی دەكەوێتە نێوان زەوی و ئاسمانەكانەوە.

كە خوای بێ هاوتا ئەوسێیەی پێكەوە باسكردوون: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ **ق**.

٦- دروستكراوی شەشەم: بەهەشت.

٧- دروستكراوی حەوتەم: دۆزەخ.

دیارە هەموو ئەمانە لە ئایەتەكانی قورئاندا باسكراون، بۆ وێنە:

١- لەبارەی عەرشەوە دەفەرموێ: ﴿ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ ﴿٧﴾ ﴾ **هود**.

٢- لەبارەی درەختی كۆتاییەوە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ ﴾ **النجم**.

٣- لەبارەی ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی نێوانیانەوە، دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ ﴿٨﴾ ﴾ **الروم**.

٤- لەبارەی بەهەشتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ **آل عمران**.

٥- لەبارەی دۆزەخەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا ﴿٧١﴾ ﴾ **الزمر**.

بۆیەش عەرشمان لە پێشەوە باس كرد، چونكە لەسەرووی هەموو دروستكراوەكانەوەیە، دۆزەخیشمان لە كۆتاییەوە باس كرد، چونكە دەكەوێتە خوارەوەی دروستكراوەكان، وەك ئایەتی ژمارە (٧) لە سوورەتی (**المطففين**)

دەیگەیەنێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: نەخێر، وانیە (كە دەڵێن: ئەی بێبڕوایەكان!) لیستی كردەوەی تاوانباران لە (سجین)دایە.

تەفسیرەكان گوتوویانە: (سجین) (أسفل الخلق) ژێرەوەی دروستكراوەكان، هەروەك چۆن خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ ﴾ **المطففين**، وانیە (وەك ئێوە دەڵێن) نووسراوی چاكەكاران لە (علیین)دایە، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ ﴾ **المطففين**، چ شتێك بەتۆی زاناندوە (علیون) چییە؟ لیستێكی نووسراوە، یان نووسراوێكی نیشانەدار كراوە، زۆر نیزیكخراوەكان لەخوا دەیبینن. واتە: فریشتە زۆر لە خوا نیزیكەكان، ئەوانەی لەسەری سەرەوەن.

ڕاستیی دووەم: ئەو ماددەیەی خوا ئاسمانەكان و زەوی لێ دروستكردوون، بریتیە لە دووكەڵ.

وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ ﴾ **فصلت**، واتە: دوایی خوا مەبەستی بەرەو دروستكردنی ئاسمانی چوو، كە لەو كاتەدا دووكەڵ بوو.

ئێستاش نوێترین بیردۆزەی فیزیایی هەروا دەڵێ، دەڵێ: گەردوون بەر لەو حاڵەتەی ئێستای، لە شێوەی گازدا بووە، هەرچەندە ئەو ڕاستییانەی كتێبی خوا بەیانیان دەكات، پێویستییان بە پشتڕاستكردنەوەی هیچ شتێكی دیكە نیە.

ڕاستیی سێیەم: كە لە كتێبی خوادا لەبارەی دروستكراوەكانی خوادا هاتوە، ئاسمانەكان و زەوی كاتی خۆی پێكەوە لكاو بوون، دوایی لێك كراونەتەوە:

وەك خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَٰهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ **الأنبياء**، واتە: ئایا ئەوانەی بێبڕوان نازانن كە ئاسمانەكان و زەوی پێكەوە جۆشدراو بوون: لێكمان جیاكردنەوە، هەموو ژیاندارێكیشمان لە ئاوێ دروست كردوە، ئایا هەر بڕوا ناهێنن؟

ڕاستی چوارەم: خوا ئاسمانەكان و زەوی ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە، بە شەش قۆناغ هێناونە دی:

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ﴿٥٤﴾﴾ **الأعراف**، بە دڵنیاییەوە پەروەردگارتان ئەو خوایەیە كە ئاسمانەكان و زەوی لە شەش ڕۆژاندا هێناونە دی، دوایی چۆتە سەر عەڕش

(بێگومان مەبەست لە شەش ڕۆژ شەش قۆناغە، چونكە ڕۆژ لە زمانی عەرەبییدا بە ماوەیەك لە كات دەگوترێ، كەم بێ، یان زۆر بێ، وەك زاناكانی زمان گوتوویانەو، خواش لە قورئاندا ڕۆژی خۆی بە هەزار ساڵ داناوە، دەفەرمووێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾ **الحج**، ڕۆژێك لەلای پەروەردگارت بە ئەندازەی هەزار ساڵە لەوەی ئێوە دەیژمێرن.

بەڵكو ڕۆژێكی بە پەنجا هەزار ساڵ داناوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾ **المعارج**.

ڕاستیی پێنجەم: خوا هەمووو زیندەوەرەكانی لەئاو دروست كردوون: وەك دەفەرمووێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾﴾ **الأنبياء**. واتە: هەرچی ژیاندارە (بە نسبەت سەر زەوی) لە ئاوێوە وەدیمان هێناوە.

ئەمانە ئەو پێنج ڕاستییە مەزنەن، كە خوای پەروەردگار لەبارەی دروستكراوەكانیەوە باسی كردوون.

## تەوەری سێیەم: مرۆڤناسیی:

مرۆڤ جێنشینی خوای بەرزە لەسەر زەوی.

ئـەم تـەوەرە لەشـەش بڕگـەدا دەخەینـە ڕوو، بـەڵام بـەر لـەوە سـەرنجی هەمـوو لایـەك ڕادەكێشـم بـۆ ئـەوە كـە هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: دروسـت نیـە وشـەی جێنشـینی خـوا، بـۆ مـرۆڤ بەكاربـێ، لەبـەر ئـەوەی خەلیفـە كەسـێكە لەشـوێنی كەسـێك دەبـێ و خـواش شـوێنی نیـە.

هەندێكیـش گوتوویانـە: خەلیفـە یانـی: كەسـێك كـە لـە شـوێنی كەسـێك كارێـك دەكات، بێگومـان مرۆڤیـش لەبـری خـوا كار نـاكات! بـەڵام ئێمـە لـە شـوێنی دیكـەدا بەوردیـی باسـمان كـردوە، بەتایبەتـی لـە بەرگـی یەكەمـی مەوسـووعەی: (خواپەرسـتیی ئیسـلامیی)دا، هەروەهـا لەشـوێنی دیكەشـدا بـە تەفسـیلْ باسـی ئەوەمان كـردوە، مادام خــوای پــەروەردگار بۆخــۆی دەفەرمــوێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴿٣٠﴾﴾**البقـرة**، یادبكــەوە! كاتێــك پــەروەردگارت بــە فریشــتەكانی فەرمـوو: بەدڵنیایـی مـن، مـن گێـڕەری جێنشـینێكم لەسـەر زەوی، جێنشـینەكەش دوایی ئـادەم بـووە، كەواتـە: ئـادەم و حـەوواو وەچەكەیـان جێنشـینی خـوان لـە سـەر زەوی.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الأنعـام**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٖ دَرَجَٰتٖ ﴿١٦٥﴾﴾، واتــە: خــوا ئــەو كەســەیە كــە گێڕاونـی بـە جێنشـینانی زەوی و، بەچەنـدان پلـە هەندێكتانـی بەسـەر هەندێكتـان دا بـەرز كردوونـەوە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**فاطر**)[١]یشـدا هەمـان مەبەسـت دووبـارە بۆتـەوەو، لـە سـوورەتی (یونس)یشـدا بەهەمـان شـێوە[٢]، لەڕاسـتییدا هیـچ گـرێ و گۆتاڵێـك نامێنێ

---

(١) ﴿هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ... ﴿٣٩﴾﴾ **فاطر**.

(٢) ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾﴾ **یونس**.

لەسەر ئەوەی مرۆڤ جێنشینی خوایە، ئەو دوو ئیشکالەش کە باسکراون:

ئیشکالی یەکەم: خەلیفە کەسێکە لە شوێنی کەسێك دابنیشێ، خواش شوێنی نیە!

دەڵێین: بەڵێ، خوا شوێنی نیە وەك شوێنی دروستکراوەکان، بەڵام خوای بەرزی بێ وێنە لەدەرەوەی دروستکراوەکانی خۆیەتی، لەسەر عەرشی خۆیەتی، بەو شێوەیەی بۆ خوا شایستەیە، بەڵام جێنشینی خوا بوونی مرۆڤ، بەو واتایە نیە کە مرۆڤ لەشوێنی خوا دەبێ، بەڵکو بەو واتایەیە کە خوا دەستی مرۆڤی ئاوەڵا کردوە، چۆن هەڵسوکەوت دەکات لە زەویدا، بەمەبەستی تاقیکردنەوەی، وەك لە سووڕەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا ﴿٦١﴾ ﴾ **هود**، واتە: ئەو (خوا) لە زەویدا ئێوەی پێگەیاندوەو، ئاوەدانکردنەوەی زەویشی بەئێوە سپاردوە.

ئیشکالی دووەم: کە دەگوترێ: مرۆڤ لەجیاتی خوا کارناکات، ئەوەش دیسان وەك لە شوێنی دیکەشدا گوتوومە: قیاسکردنی خوای پەروەردگارە لەسەر دروستکراوەکانی، ئەگەرنا وەك چۆن هەموو سیفەتەکانی خوا، تایبەتن بەخواوە، ئەم سیفەتەش کە خوا مرۆڤی کردوە بە جێنشین، ئەویش دیارە بەچەمك و واتایەکە کە بۆ خوا شایستەیە، واتە: خوای پاك و تاك دەستی مرۆڤی کردۆتەوە لەسەر زەوی کار بکات، نەك لە جیاتی خوا، خوای کاربەجێ کارەکەی لەسەر زەویدا کە بە مرۆڤی سپاردوە، ئەوەیە ئاوەدانکردنەوەی پێسپاردوە، ئائەوە مانای بە جێنشینی خوا دانانی مرۆڤە.

ئێستاش دێینە سەر خستنەڕووی ئەم شەش بڕگەیەی ئەو تەوەرەیان لێ پێك دێت:

## بڕگەی یەکەم: پێگەی مرۆڤ لە ئیعڕابی دروستکراوەکاندا:

ئایا مرۆڤ چ پێگەیەکی هەیە لە نێو هەموو گەردووندا لە نێو دروستکراوەکانی خوادا؟ ئێمە لە دە خاڵاندا لەبەر تیشکی قورئاندا باسی پێگەی مرۆڤ دەکەین، زۆر بە پوختیی:

١)- جێنشین بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی مەبەست پێی ئەوەیە کە خوا مرۆڤی لەسەر زەوی داناوەو دەستی کردۆتەوە، چی دەیەوێ بیکات، وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾ **الأنعام**، واتە: خوا ئێوەی بەجێنشین گێڕاوە لەسەر زەوی، هەندێکیشتانی بەسەر هەندێکتاندا بەرزکردۆتەوە بەچەندان پلە، تاکو تاقیتان بکاتەوە لەوەدا کە پێیداون، بەدڵنیایی پەروەردگارت سزای زۆر خێرایە، زۆریش لێبوردەی بەبەزەییە.

٢)- ئینسان هەڵگری سپاردەی خوایە، ئەو ئەمانەتەی نە ئاسمان توانی هەڵیبگرێ، نە زەوی و نە چیایەکان. وەك خوای پاك و تاك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا عَرَضْنَا ٱلْأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلْجِبَالِ فَأَبَيْنَ أَن يَحْمِلْنَهَا وَأَشْفَقْنَ مِنْهَا وَحَمَلَهَا ٱلْإِنسَٰنُ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾ **الأحزاب**، واتە: ئێمە سپاردەمان بۆ ئاسمانەکان و زەوی و چیایەکان ڕانواند، (کە هەڵیبگرن)، بەڵام ئامادە نەبوون هەڵیبگرن و لێی ترسان، کەچی مرۆڤ هەڵیگرت، ئەویش زۆر ستەمکارو نەفامە (ئەگەر بە بەرنامەی خواوە پابەند نەبێ).

ئەو سپاردەیەش زانایان زۆریان قسە لەبارەوە کردوە، کە ئایا چییە؟ بەڵام کورتەی ئەوەی بەندە پێی ڕاستە ئەوەیە: کە ئینسان بە ویستی ئازادانەی خۆی بژی، نە ئاسمان وایە، نە زەوی وایە، نە چیایەکان، بەڵکو هەموویان مەحکوومی کۆمەڵێك یاسای گەردوونیین کە خوا بۆی داناون، بەڵام مرۆڤ دەتوانێ چاك بکات و خراپ بکات و، بەرز بێ و نزم بێ، بەولادابچێ و بەملادابچێ.

٣)- مرۆڤ لەباشترین شێوەدا هێنراوەتە دی، وەك لە سووڕەتی (التین)دا خوای زاڵی کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ **التين**، واتە: بەدڵنیاییەوە مرۆڤمان لە چاکترین شێوەدا دروستکردوە، شێوەی ماددیی و مەعنەویی چ لە ڕووی ڕووحییەوە کە چییەت و ناخی مرۆڤ لە ڕووحیدا شێردراوەیە، چ لەڕووی جەستەییەوە.

**٤)و٥):** مرۆڤ لەلایەن خواوە ڕێزی لێگیراوەو، هەڵبژێردراوە بەسەر زۆرێك لە دروستكراوانیدا، وەك لە سووڕەتی (**الإسراء**)دا ئایەتی (٧٠) خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ ﴾، واتە: بەدڵنیایی ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوەو، لە وشكانیی و دەریادا (بەهۆی ئامڕازەكانی هاتووچۆوە بارو سوارەوە) هەڵمان گرتوون و، لە بژیوە بەسوودو خۆشەكانمان بۆ ڕەخساندوون و، بەسەر زۆرێك لە دروستكراوەكانماندا هەڵمانبژاردوون.

**٦)-** ئادەم كە بابی مرۆڤانە، دوای ئەوەی خوا ناوەكانی فێركردن، بەهەموو فریشتەكانی فەرموو: كڕنووشی بۆ ببەن، كڕنووشی ڕێزگرتن، ئەوانیش فەرمانی خوایان جێبەجێ كرد، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾**البقرة**، واتە: یاد بكەوە كاتێك بە فریشتانمان فەرموو: كڕنووش بۆ ئادەم بەرن، یەكسەر هەموویان كڕنووشیان برد، جگە لە ئیبلیس سەرپێچیی كردو خۆی بەزلگرت و لە بێبڕوایان بوو.

كەواتە: دوای ئەوەی خوا ئادەمی كردوە بە مامۆستای فریشتان ناوەكانیان فێر بكات، ئنجا پێیان دەفەرموێ كڕنووشی بۆ ببەن.

**٧)-** خوای تاك و پاك ڕووحی مرۆڤی داوەتە پاڵ خۆی، وەك دروستكراوێكی تایبەت، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى ﴿٢٩﴾ ﴾ **الحجر**، واتە: لە ڕووحی خۆم فووم بەبەردا كرد.

هەندێك كەس بە نەزانیی، وا دەزانن ڕووح لەخوا جیا بۆتەوە! بەڵام نا، بەڵكو ﴿ مِن رُّوحِى ﴾ واتە: ئەو ڕووحەی بەتایبەت خوڵقاندوومە، جیا لە دروستكراوە ماددییە بەرهەستەكان.

**٨)-** خوای بەبەزەیی ئادەمی بەشێوەیەكی تایبەت دروستكردوە، وەك لە سووڕەتی (ص) ئایەتی (٧٥)دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ

كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ﴿٧٥﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: ئەی ئیبلیس! چ شتێك ڕێی لێ گرتی كڕنووش ببەی بۆ كەسێك كە بە دوو دەستی خۆم دروستم كردوە؟ ئایا خۆت بەزل گرت، یاخود هەر لە بڵیندان بووی؟ ئیبلیسیش عوزرێك دەهێنێتەوە زۆر لە قەباحەتەكەی خراپتر! كە خوا دەفەرموێ: ﴿لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾﴾ص، واتە: بەشێوەیەكی تایبەت دروستم كردوە، جیا لەدروستكراوەكان، كە خوای كاربەجێ بە گشتیی دروستی كردوون.

**٩)-** خوا بەهەموو فریشتانی فەرموو: كڕنووش بۆ ئادەم ببەن، كە لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ **الحجر**، فریشتەكان هەموویان وێكڕاو تێكڕا كڕنووشیان برد. واتە: فریشتەكان یەكێكیان لێ هەڵنەوێردراوەو هەموویان تێكڕاو وێكڕا، كڕنووشیان بۆ ئادەم برد، كە بە دڵنیاییەوە كڕنووشی ڕێزو حورمەت لێ گرتن و سڵاو لێكردن بووە.

**١٠)-** خوا هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدا هەیە بۆ مرۆڤی دەستەمۆ كردوە، كە لێیان بەهرەمەند بێ، وەك لە سوورەتی **(الجاثية)** ئایەتی (١٣)دا دەفەرموێ: ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: (خوا) هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە بۆ ئێوەی ڕام و دەستەمۆ كردوە، بەدڵنیاییەوە لەوەدا نیشانە هەن بۆ كەسانێك بیر بكەنەوە.

كەواتە: گەردوون هەمووی، چ جای ئەوەی مرۆڤ بچێ بۆ سەر مانگ، بگرە لەداهاتوودا بچێ بۆسەر مەرریخ و بچێ بۆ شوێنی دوورتریش، كە ئەوە زۆر زەحمەتە لە قەدەر تواناو ئیمكانیەتێك، مرۆڤ تاكو ئێستا بۆی ڕەخساوە، مەحاڵ نەبێ، بەڵام گریمان مرۆڤ چوو بۆ سەر هەندێك لە خڕۆكەكانی دیكەش، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئێمە هەرچی لە گەردووندایە، بگرە هەرچی لە ئاسمانەكان و زەویدایە، هەموویمان لەلایەن خۆمانەوە بۆ مرۆڤ ڕام و دەستەمۆ كردوە، كەواتە: ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بەهەموو گەردووندا بگەڕێ، لە بازنەو چوارچێوەی كۆمەڵەی خۆریش دەرچێ و، بچێ بۆ نێو كەهكەشانی كاكێشانیش،

بەڵكو لەوێش دەربچێ، هەر ئەو ئایەتە بەپێزە دەیگرێتەوە، كە خوای زاڵی كاربەجێ خۆی ئەو توانایەی داوە بە مرۆڤ.

## بڕگەی دووەم: پێكاتەی ئادەم و وەچەی ئادەم:

خوای پەروەردگار باسی كردوە، كە هەم ئادەم و هەم وەچەی ئادەمیش لەدوو پێكهاتەی سەرەكیی دروستكردوون، كە بریتین لە:

**١)** خاكی زەوی و ئاو، كە دەكاتە قوڕ، ئەمە بۆ جەستەیان.

**٢)-** ڕووح كە خوای بێوێنە بەتایبەتی دروستی كردوە، وەك لە سوورەتی (الحجر)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: یاد بكەوە! كاتێك خوا بە فریشتانی فەرمووو: من بەشەرێك لە قوڕێكی ڕەشهەڵگەڕاوی بۆگەنی وشكبووەوە دروست دەكەم، ئنجا هەركات جەستەكەیم ڕێكخست و لە ڕووحی خۆم فووم پێداكرد، یەكسەر بۆی بكەونە كڕنووش.

ئنجا بێگومان ئەمە مەبەست پێی ئادەمە، بەڵام خوای بە بەزەیی باب و دایكی مرۆڤانی لەچی دروستكردوە، وەچەكەشیانی هەر لەوە دروست كردوە، وەك لە سەرەتای سوورەتی (**المؤمنون**)دا خوای زۆر بەڕوونیی دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ﴾، بەدڵنیایی مرۆڤمان لە پوختەیەك لە قوڕێ دروستكردوە، (سُلَٰلَةٍ) واتە: گوشراوێك، پوختەیەك، كە مەبەست پێی ئەو تۆوەیە دوایی دەبێتە نوتفەو عەلەقەو موزغەو قۆناغەكان دەبڕێ و كۆرپەلەی لێ دروست دەبێ، ئەویش هەر لە قوڕێوە هاتوە، ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ﴾ **المؤمنون**.

کەواتـە: مـرۆڤ وەچـەی ئـادەم و حـەووا، بـە حـەوت قۆنـاغ دروسـت دەبـێ، کـە ئەویـش ڕیشـەکەی دیسـان وەك جەسـتە لـە قـوڕەوە هاتـوە، ڕووحەکەشـی فووێکـی خواییـە، دروسـتکراوێکی تایبەتـی خوایـە بەبـەر جەسـتەکەیدا کـراوە.

**بڕگـەی سـێیەم: مـرۆڤ خاوەنـی سرووشـتێکی دەگمەنـە، کـە لەنێـو هەمـوو گەردوونـدا تەنیـا مـرۆڤ و جنـد وان:**

خـوای پـەروەردگار لـە سـوورەتی (**التین**)دا دەفەرمـوێ: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ فِىٓ أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ ﴿٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٦﴾﴾، واتـە: بەدڵنیاییـەوە مرۆڤـمان لـە باشـترین شـێوە پێکهاتـەدا دروسـتکردوە، دوایـی گێڕامانـەوە خـواری هـەرە خـوارێ، بێجگـە لەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکان ئەنجـام دەدەن، ئەوانـە پاداشـتێکی نەبڕاوەیـان هەیـە.

ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ کـە مـرۆڤ بەهـۆی ئیـمان و کـردەوە چاکەکانـەوە، لـەوە دەپارێـزرێ کـە ئـاوا نـزم بێتـەوە بـۆ پلـەی ژێـری ژێـرەوە، ئەگەرنـا لـە هەمـوو گەردوونـدا تاکـە دروسـتکراوێك هەبـێ و ئێمـە پێـمان شـك بـێ، خـوا ئێمـەی لـێ ئاگادارکردبێتـەوە بتوانـێ یەکجـار بـەرز بێتـەوەو بچێتـە ئاسـتێکەوە شایسـتەی ئەوەبـێ فریشـتەکان کڕنووشـی بـۆ ببـەن، کڕنووشـی سـڵاو لێکـردن، هەروەهـا بەبـاری خراپەشـدا، هێنـدە نـزم بێتـەوە ببێتـە خراپتریـن دروسـتکراوی خـوا، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ثُمَّ رَدَدْنَـٰهُ أَسْفَلَ سَـٰفِلِينَ ﴿٥﴾﴾ **التین**، یـان لـە سـوورەتی (**البینـة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾﴾... ئەوانـە خراپترینـی دروسـتکراوانی خـوان.

تاکـە دروسـتکراوێك لـە توانـای دابـێ، هێنـدە بەرزبـێ و هێنـدە نـزم بـێ، تەنهـا مرۆڤـە، ئەگەرنـا دروسـتکراوەکانی دیکـە لەیـەك ئاسـتی دیارییکـراودان، وەك لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الصافـات**)دا گوتمـان، فریشـتەکان دەڵێـن: ﴿وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾﴾، واتـە: هەرکامێـك لـە ئێمـە پێگەیەکـی دیارییکـراوو زانـراوی هەیـە، نـە لێـی دەچێتـە سـەر، نـە دەچێتـە خـوار.

هەروەها ژیاندارانی دیکە، ئەگەر ئاژەڵن، ئەگەر درِندەن، ئاویین، خاکیین، هەواییین، هەموویان هەروەك خۆیانن، ماددەی بێ گیان و بێ ژیانیش، ڕووەك و دارودرەخت ئەوە دیارە، لەو نێوانەدا تەنیا مرۆڤە بتوانێ بەرز بێ و نزم بێ، هەڵکشێ و داکشێ، هەڵبەتە جندیش لەو خاڵەدا وەك مرۆڤن، وەك خوای پەروەردگار بۆی ڕوون کردووینەوە.

## بڕگەی چوارەم: حیکمەت لە دروستکرانی مرۆڤ، بریتیە لەوەی تاقی بکرێتەوە:

هەمیشە ئەم پرسیارە لە عەقڵ و دڵی هەموو کەسدا دێت و دەچێ: ئایا خوا مرۆڤی بۆچی دروست کردوە؟ چ کارێکی پێی بووە؟ خوای کاربەجێ لە سوورەتی (**الإنسان**)دا، دەفەرموێ: ﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَـٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾، واتە: ئێمە مرۆڤمان لە تنۆکەیەکی تێکەڵ دروستکردوە، تاقی دەکەینەوە بۆیە بیسەرو بینەرمان کردوە، ئێمە ڕێمان پێشانداوە، یان سوپاسگوزار دەبێ، یاخود سپڵەو ناسوپاس دەبێ.

ئنجا ئەگەر یەکێك بڵێ: بۆچی خوا مرۆڤ تاقی دەکاتەوە؟ خوای کاربەجێ لە سوورەتی (**الأنبیاء**)دا دەفەرموێ: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: ئەو لێی ناپرسرێ لەوەی دەیکات، ئەوان لێیان دەپرسرێتەوە.

چونکە خوای کاربەجێ هیچ شتێکی بێجێ ناکات، خوای خاوەنی ئەوپەڕی زانیاریی، ئەوپەڕی حیکمەت، ئەوپەڕی میهرەبانیی، ئەوپەڕی هەموو سیفەتە بەرزو چاکەکان، هیچ شتێك ناکات شایستەی ئەوەبێ خەڵك گلەیی لێی هەبێ، ڕەخنەی لێی هەبێ، بەڵکو ئەوانەی ڕەخنە دەگرن و گلەیی لە خوا دەکەن، لەبەر نەزانیی خۆیانە.

**بڕگەی پێنجەم: ئەركی مرۆڤ لەم ژیانی كاتیی سەر زەوی دا، بریتیە لە بەندایەتیی كردن بۆ خوا:**

وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتە: ئەی خەڵكینە! بەندایەتیی ئەو پەروەردگارەتان بكەن، كە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی هێناوەتە دی، بەڵكو پارێز بكەن، واتە: پارێز بكەن لە تووڕەیی و سزای خوا.

ئنجا لێرەدا دەپرسین: ئایا خوا پێویستیی بەبەندایەتیی ئێمە هەیە؟

بەدڵنیاییەوە نەخێر، خوا لە جگەلە خۆی بێنیازە، ئەدی بۆچی خوا بەندایەتیی كردنی ئێمەی بۆخۆی، لەسەر ئێمە پێویست كردوە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە ئێمە خۆمان پێویستییمان بەوە هەیە بەندایەتیی بۆ خوا بكەین، چونكە ئەگەر بەندەی خوا نەبین، دەبینە كۆیلەی دروستكراوەكان، زەلیل و زەبوون دەبین، بەڵام ئەگەر بەندەی خوا بین، ئازادو ئازا دەبین، سەربەرز دەبین، كێ لە پێغەمبەران صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ و، لەشوێنكەوتووانی پێغەمبەران سەربەرزتر بووە، ئازادترو ئازاتر بووە؟ بێگومان هیچكەس، چونكە لەهەموو كەس زیاتر بەندەی خوا بوون.

خوا مرۆڤی وا خوڵقاندوە، یان دەبێ شوێنكەوتەی هودا بێ، یان دەبێ شوێنكەوتەی هەوا بێ، یان دەبێ ڕوو لەخوا بێ و بەندەی خوا بێ، یان دەبێ كۆیلەی هەندێ لە دروستكراوەكانی خوا، یاخود هەواو ئارەزووی خۆی، یان جگەلە خۆی بێ.

كەواتە: ئەوە ئێمەین پێویستییمان بەوە هەیە بەندایەتیی بۆ خوا بكەین و خوا بپەرستین، نەك خوا پێویستیی بە ئێمە بێ، پێش ئەوەی ئێمەببین، خوا چۆن بوو، دوای ئەوەی ئێمەش نابین، خوا هەروەك خۆیەتی، خوای پەروەردگار گۆڕانی بەسەردا نایەت، بەڵام خوای بەرزو مەزن ویستوویەتی چاكە لەگەڵ

دروستکراوەکانی دا بکات و، بوونی پێداون، دوایی بەشێك لەو دروستکراوانە کە مرۆڤەکان و جندن، خستوونیە تاقیکردنەوەوە ڕێ و شوێنی بۆ داناون، پێغەمبەرانیشی بۆ ناردوون، هیدایەتیشی بۆ دابەزاندوون، هۆشدارییشی پێداون لەخۆیان وریابن و، ئەو ژیانی دنیایەیان بەشێوەیەك بگوزەرێنن، پێی سەربەرزبن، ئیدی خوای بەخشەر لەڕووی میهرەبانیی و چاکەکاریی خۆیەوە، ئێمەی پابەند کردوە بە بەندایەتیی کردن بۆی، هەروەك چۆن ئێمەی پابەند کردوە بەوەی تاقیمان بکاتەوە، چونکە قازانجی خۆمانی تێدایە، خواش ویستوویەتی ئێمە تووشی خێروبێرو چاکەو بەزەیی و بەخششی خۆی بکات.

## بڕگەی شەشەم: بەسەرهاتی مرۆڤ و ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی:

لێرەدا زۆر بە پوختەو گوشراویی، چونکە ئەوەی دەیخەمە ڕوو، پوختەی پوختەیە، گوشراوی گوشراوە، لە پازدە قۆناغدا باسی قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ دەکەین:

**١-** دروستکردنی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان، تاکو ببێتە شوێنی تێدا تاقیکردنەوەی مرۆڤ، وەك لە سوورەتی **(هود)**دا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی لەشەش ڕۆژان دا، بە شەش قۆناغ هێنانە دی و، عەرشی خوا لەسەر ئاو بوو، تاکو تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردەوەی باشترە!

**٢-** ئاگادار کردنەوەی خوا بۆ فریشتەکان، کە دەیەوێ ئادەم و وەچەکەی لەسەر زەوی بکاتە جێنشینی خۆی و، پرسیارکردنی فریشتان لەبارەی حیکمەتی ئەو کارەو، خستنەڕووی حیکمەتەکەی لەوەدا، کە ئادەم زانیارییەکی هەیە، ئەوان نیانە، وەك لە سوورەتی **(البقرة)**دا خوای زاڵی زانا ئەوەی خستۆتە ڕوو، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾

﴿ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَـٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٣١ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٣٢ قَالَ يَـٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ٣٣ ﴾.

٣- دروستکردنی خوای تاك بۆ ئادەم لەگڵ، ئنجا قوڕ، ئنجا قوڕێکی ڕەشهەڵگەڕاو، ئنجا قوڕێکی وشك بووەوەی وەك گۆزە، دوایی ڕێکخستن و وێنە کێشانی جەستەکەی، پاشان ڕووح بەبەردا کردنی، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ٢٨ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٢٩ ﴾ **الحجر**.

٤- فەرمانکردنی خوا بە فریشتان کە کڕنووشی ڕێزگرتن بۆ ئادەم ببەن، پاش دەرکەوتنی ئیمتیازی زانستیی ئادەم بە سەریانداو، جێبەجێکردنی دەستبەجێی فەرمانی خوا لەلایەن فریشتانەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ٧٢ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ٧٣ ﴾ **ص**.

٥- سەرپێچیی کردنی ئیبلیسی نەفرینلێکراو، لە فەرمانی خوا بەهۆی خۆ بەزلگریی و حەسوودییەوە بەرانبەر بە ئادەم، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤ ﴾ **البقرة**، واتە: یاد بکەوە! کاتێك بە فریشتەکانمان فەرموو: کڕنووش بۆ ئادەم ببەن، ئنجا هەموویان کڕنووشیان برد جگە لە ئیبلیس ئامادە نەبوو، خۆی بەزلگرت و لە بێبڕوایان بوو.

٦- لە سوورەتی (**الإسراء**)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ٦١ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ٦٢ ﴾ **الإسراء**.

قۆناغی نەفرینکردنی خوا لە ئیبلیس، بەهۆی سەرپێچییەوەو، دەرکردنی لە بەهەشت و دابەزاندنی بۆ سەر زەوی، یاخود دەرکردنی لەو باخەی تێیدا بوو و دەرپەڕاندن

و دەرکرانی بۆ خوارێ، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ ﴿٣٤﴾ ﴾ **الحجر**.

هەروەها لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: (خوا) فەرمووی: لێی دەرپەڕە خوارێ، بۆت نیە لەوێدا خۆت بەزل بگری، دەربچۆ تۆ لە زەبوونانی.

٧- داواکردنی ئیبلیس لە خوای بەرز، کە هەتا ڕۆژی هەڵسانەوە، دەرفەتی ژیان و مانەوەی بدات و، هەڕەشە کردنی گومڕاکردنیان لە ئادەم و وەچەکەی و، وەڵامدانەوەی خوا بۆ داواکارییەکەی، بەڵام تاکو کاتی دیارییکراو، لە سوورەتی (الحجر) ئایەتەکانی (٣٦-٤٤)دا خوای پەروەردگار ئەوەی خستۆتە ڕوو: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ ... ﴾.

٨- نیشتەجێکردنی خوا بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی لە بەهەشتداو، بەهەشت بۆ ڕەوا کردنییان جگە لە درەختێك و، هۆشداریی پێدانیشیان کە وریای کەوتنە تەڵەو داوی شەیتانی دوژمنی سەرسەختیان بن، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: گوتمان ئەی ئادەم! خۆت و هاوسەرەکەت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن، بەفراوانیی لێی بخۆن، لەهەر شوێنێك ویستتان، بەڵام توخنی ئەم درەختە مەکەون، ئەگەرنا لە ستەمکاران دەبن.

هەروەها هەمان مەبەست بە تەعبیرێکی دیکە لە سوورەتی (**طە**)ش دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ ﴾.

**٩-** خوتخوتەكردنی ئیبلیس بۆ ئادەم و هاوسەرەكەی و، بەدرۆو دەلەسە هەڵخەڵەتاندنی بۆیان، كە ئەگەر لە درەختە قەدەغە كراوەكە بخۆن، زۆر قازانجیانە! وەك لە سوورەتی (**طه**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: شەیتان خوتخوتەی بۆ كردو گوتی: ئەی ئادەم! ئایا درەختی هەمیشە مانت پێشان بدەم و، حوكمڕانییەك كە هەرگیز لە بەین نەچێ؟

هەروەها هەمان مەبەست لە ئایەتەكانی (٢٠- ٢١)دا لەسوورەتی (**الأعراف**) یشدا هاتووە، دەفەرموێ: ﴿ فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ ﴾.

**١٠-** فریو خواردنی ئادەم و هاوسەرەكەی بە خوتخوتەی ئیبلیس و، خواردنیان لە درەختە قەدەغەكەو، دەركەوتنی عەورەتیان، وەك لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ ﴾.

هەمان مەبەست هەر لە سوورەتی (**الأعراف**) ئایەتی (٢٧)یش دا هاتووە، دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾.

**١١-** سەرزەنشتكردنی خوای دادگەر بۆ ئادەم و ژنەكەی سەلامی خوایان لێبێ و، بیرخستنەوەو هۆشداریی پێدانی بۆیان، وەك لە سوورەتی (**الأعراف**)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: پەروەردگاریان بانگی كردن: ئایا ئەم درەختەم لێ قەدەغە نەكردبوون، پێم نەگوتبوون شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە؟!

**١٢-** دان پێداهێنانی ئادەم و هاوسەرەکەی بە هەڵەکەیان دا و، داوای لێبوردن کردنیان و، تۆبە لێ وەرگیرانیان لەلایەن خوای بەخشندەوە، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٣٧ ﴾، ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگای وەرگرتن، خواش گەڕایەوە سەری، بێگومان خوا زۆر گەڕاوەی میهرەبانە.

یانی: زۆر دەگەڕێتەوە سەر بەندەکەی و پەشێمان بوونەوەکەی لێ قبووڵ دەکات.

وشەکانیش لە سوورەتی (**الأعراف**)دا خراونە ڕوو، ئەوەی لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ئادەم چەند وشەیەکی لە پەروەردگاری وەرگرتن، لەوێ خراونە ڕوو: ﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٢٣ ﴾، گوتیان: پەروەردگارمان ستەممان لەخۆمان کردوە، ئەگەر لێمان نەبووری و بەزەییت پێماندا نەیەت، بە دڵنیایی ئێمە لەزیانباران دەبین.

**١٣-** سزادانی خوای دادگەر بۆ ئادەم و هاوسەرەکەی، بەدەرکردنیان لە بەهەشت (یان: باخە بەرزەکە) و دابەزاندنیان بۆ سەر زەوی، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا دەفەرموێ: ﴿ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٣٦ ﴾، واتە: شەیتان لەوێ هەڵیخلیسکاندن و لەو شوێنەی تێیدا بوون، وەدەری نان، ئێمەش پێمان گوتن: دابەزن هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنن، لەسەر زەویدا نشینگەو بەهرە وەرگرتنێکی کاتیی و کەهتان بۆ هەیە تاکو کاتێکی دیارییکراو.

لە سوورەتی (**الأعراف**)یش دا هەمان مەبەست هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ٢٤ قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ ٢٥ ﴾.

**١٤-** بەڵێندانی خوا بە جندو مرۆڤ کە وەحیی و ڕێنماییان بۆ دابەزێنێ و، ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە کە سەرەنجامی چاك، لە گرەوی خوا پەرستانی فەرمانبەر دایەو، ئاکامی

خراپ و شوومیش، یەخەی لادەران و سەرپێچییکاران دەگرێ، وەک لەسوورەتی (البقرة) ئایەتەکانی: (٣٨-٣٩)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾. واتە: گوتمان: تێکڕا لێی دابەزنە خوار، لێی دەرپەڕنە خوار، ئنجا ئەگەر لەلایەن منەوە ڕێنماییتان بۆ بێ، هەرکەسێك شوێن ڕێنمایی من بکەوێ، نە ترسیان لەسەر دەبێ، نە خەم و پەژارەش دادەگرن (نە ترسی داهاتوویان هەیەو نە خەم و پەژارەی ڕابردوویان دەبێ) ئەوانەش کە بێبڕوابوون و ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ داناون، ئا ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن تێیدا هەرماو دەبن.

هەمان مەبەست لە سوورەتی (طه)شدا هاتوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾.

١٥- قۆناغی پازدەیەم و کۆتایی لە ژیانی مرۆڤ، جێبەجێکردنی خوا بۆ بەڵێنەکەی بەناردنی پێغەمبەران و دابەزینی کتێب و بەرنامەکەی، وەك لە سوورەتی (النساء) دا دەفەرموێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾، خوا دوای ئەوەی ناوی دوازدە لە پێغەمبەران صەلات و سەلامی خوایان لێبێ، دەهێنێ، دەفەرموێ: ئەوانە پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرو ترسێنەر بوون، تاکو خەڵك لەدوای پێغەمبەران بەڵگەی لەسەر خوا نەبێ و، خوا باڵادەستی کارزانە.

هەروەها لە سوورەتی (فاطر)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئێمە تۆمان بە هەق ناردوە دڵخۆشکەرو

ترسێنەر بـی، هیـچ کۆمەڵگایـەك نەبـووە مەگـەر ترسـێنەرو وریاکەرەوەیەکـی تێـدا نێـردراوە.

**پوختەی ئەم پازدە قۆناغە:**

خـوای پـەروەردگار مرۆڤـی وەك جێنشـینی خـۆی و، هەڵگـری سـپاردەکەی بەمەبەسـتی تاقیکردنـەوە، لەسـەر زەوی دانـاوە، ئەویـش دوای ئـەوەی ئادەمـی دروسـتکرد، ئنجـا بـە فریشـتەکانی فەرمـوو: کڕنووشـی ڕێزگرتنـی بـۆ ببـەن، چونکـە بەپێـی حیکمەتـی خـوا، مـرۆڤ لـە ئەسـڵدا بـۆ سـەر زەوی دروسـتکراوە، بـەڵام وەك قۆناغێکـی ڕاگـوزەر (**مرحلـة إنتقاليـة**)، بەمەبەسـتی تاقیکردنـەوەی لـە بەهەشـتدا دانرابـوو.

هەندێـك لـە زانایانیـش گوتوویانـە: ئـەو بەهەشـتە هـەر باخێـك بـووە لـە سـەر زەوی، لەشـوێنێکی ئنجـا هەموویـان کڕنووشـیان بـرد جگـە لـە ئیبلیس، ئیبلیسـیش دیارە لـە جنـدەو بابـی جنـدە، ئنجـا ئیبلیـس کـە ڕێـز لـە ئـادەم ناگـرێ، خـوا نەفرینـی لـێ دەکات و لـە بەهەشـت دەردەکـرێ، ئەویـش داوا لـە خـوا دەکات بیهێڵێتـەوە، تاکـو ڕۆژی زیندووکرانەوەیـان، بـەڵام خـوای پـەروەردگار ئـەو بەڵێنـەی پێنـاداو، فەرمـووی: هەتـا کاتـی دیارییکـراو، واتـە: هەتـا ئـەو کاتـەی مـرۆڤ لەسـەر زەوی هەن، ئیبلیسـیش دەمێنـێ، ئیبلیـس وەچـەی هەیـە، بـۆ ئـەوەی مرۆڤـەکان بـە ئیبلیـس تاقـی بکرێنـەوە، کـە سـوێندی خـواردوە هەموویـان گومـڕا بـکات، ئنجـا ئـەوەی وا لـە مـرۆڤ دەکات، لـەو تاقیکردنەوەیـە دەربچـێ و شـەیتان زەفـەری پێنەبـات، بریتیـە لـە بەندایەتیـی بـۆ خـوا، چونکـە خـوا زۆر بـەڕوون و ڕاشـکاویی بـە ئیبلیسـی فەرمـووە: ﴿ إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ ﴾**الحجر**، واتـە: بەندەکانـی مـن تـۆ ناتوانـی بیانخەیـە ژێـر ڕکێفـی خـۆت و دەسـتەڵاتت بەسـەریان دا نیـە، مەگـەر ئـەو بێمـرادو سـەرگەردانانەی شـوێنت دەکـەون.

## تەوەری چوارەم: ژیانی دنیا جێی تاقیکردنەوەیەو، ژیانی دوارۆژ شوێنی مانەوەیە

ئەم پایەی چوارەمی بووناسیی ئیسلامیی، لە حەوت بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

**بڕگەی یەکەم: ژیانی دنیا قۆناغی تاقیکردنەوەیە بۆ مرۆڤ و جند:**

وشەی (دنیا) لە ئەسڵدا مێینەی (أدنی)یە، واتە: (أقرب) دنیا بەباری مێینەدا واتە: نزیکتر، چونکە ژیانی دنیا لەچاو ژیانی ڕۆژی دوایی، هەروەها قۆناغی بەرزەخیش، لە ئێمە نزیکترە، بۆیە پێی گوتراوە: **(الحياة الدنيا)**، بە قۆناغی کۆتاییش، واتە: بە بەهەشت گوتراوە: **(الدار الآخرة)** مەنزڵگای کۆتایی، لەبەر ئەوەی لە کۆتاییدا مرۆڤ پێی دەگات.

ئنجا خوا مرۆڤ و جندی لەسەر زەوی داناون، بۆ ئەوەی تاقییان بکاتەوە، لە سوورەتی **(الذاريات)**دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾، واتە: جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە دروستکردوون بەندایەتییم بۆ بکەن، بمپەرستن.

بەندایەتیی کردنی جندو مرۆڤ بۆ خوا، ئەوەیە کە پێی تاقی دەکرێنەوە، ئنجا لە سوورەتی **(الأنعام)**دا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ۚ قَالُوا شَهِدْنَا عَلَىٰ أَنفُسِنَا ۖ وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَشَهِدُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ أَنَّهُمْ كَانُوا كَافِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ﴾، واتە: ئەی کۆمەڵی جندو مرۆڤ! ئایا لە خۆتان ڕەوانەکراونێکتان بۆ نەهاتن، ئایەتەکانی منیان بەسەردا دەخوێندنەوەو لەم دیداری ئەمڕۆتان ئاگاداریان دەکردنەوە؟ گوتیان: شایەدییمان لەسەر خۆمان دا، ژیانی دنیاش فریوی دان و شایەدییان لەسەر خۆیان دا کە بێبڕوا بوون.

هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ ﴿١٣٠﴾ ﴾ زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە پێغەمبەران صەڵات سەلامی خوایان لێبێ، تەنیا لە مرۆڤان

بـوون، بـەڵام خـوای پـەروەردگار کـە هەردووکیـان دەدوێنـێ، لەبـەر ئەوەیـە جندیـش لەسـەریان پێویسـتە وەك مرۆڤـان بـەدوای پێغەمبـەران صـەڵات و سـەلامی خوایـان لێبـێ بکـەون، کـە لـە مرۆڤانـن.

ئێمـە لـە تەفسـیری سـووڕەتی (الجـن)دا، بـە درێژیـی باسـی جندمـان کـردو، پێمان وایـە جنـد، بەپێـی ئـەوەی لـە ئایەتـەکان وەردەگیـرێ و، لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، دروسـتکراوێکن لەخـوار مرۆڤـەوەن، دیـارە شایسـتەی ئـەوە نەبـوون، پێغەمبەرانیـان لـە نێـودا بنێردرێـن، بـەڵام ئەوانیـش وەك مـرۆڤ ئەرکـدار کـراون لەسـەر زەوی و، تاقـی دەکرێنـەوەو سـزاو پاداشـتیش چاوەڕێیانـە، وەك لـە تەفسـیری سـووڕەتی (الرحمن)یشـدا بـە درێژیـی باسـمان کـرد، خـوای پـەروەردگار سی و یـەك، (٣١) جـار جنـدو مـرۆڤ دەدوێنـێ و دەفەرمـوێ: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ ﴾ **الرحمـن**، واتـە: ئـەی کۆمەڵـی جنـدو مـرۆڤ! بـەکام لـە چاکەکانـی پەروەردگارتـان بێبـڕوان، بەدرۆیـان دادەنێـن؟

**بڕگـەی دووەم: ژیانـی دنیـا لـەڕووی تێـدا ڕابوادنـی و خۆشـییەکانی و تێـدا مانـەوەی و، بەبـەراورد لەگـەڵ ژیانـی ڕۆژی دوایـیدا، شـتێکی زۆر بچووکـەو، وەك گەمـەی منـداڵان وایـە:**

ئـەم ڕاسـتییانە زۆر گرنگـن بیانزانیـن، چونکـە هەندێـك لـە مامۆسـتایان، وتاربێژان، زۆرجـار ئـەو حەقیقەتانەیـان لـێ تێکـەڵ دەبن.

بـۆ وێنـە: خـوای لێبـوردەی زاڵ لـە سـووڕەتی (**الحدیـد**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتـە: بزانـن! ژیانـی دنیـا گەمەیـە، خافڵانـە، جوانییـە، خـۆ بەسـەریەکدا هەڵکێشـانە، زۆرکردنـی سـامان و منداڵانـە، وەك بارانێـك کـە جوتیـاران ئـەو ڕووەکـەی پێـی دەڕوێ سەرسـامیان دەکات، دوایـی پێـدەگات و دەگاتـە هەڕەتـی خـۆی، دوایـی دەبێتـە پـووش و پەڵاشی تێکشـکاو...

خـوای کاربەجێ کـە ئـاوا باسـی ژیانـی دنیا دەکات، هەروەهـا لـە چەنـد شـوێنی دیکەشـدا هـەر دەفەرمـوێ: ژیانـی دنیـا شـتێکی کەمـە، گەمەیـە، یارییـە، خافڵانـە، ئایـا ئـەوە مەبەسـت پێـی چییـە؟

بێگومـان مەبەسـت لێـی لایەنـە ماددییەکەیەتـی، لایەنـە ماددییەکـەی ژیانـی دنیا، وەك گەمـەی منداڵانـە، منـداڵ خانووچکەیـەك دروسـت دەكات، یـان شـتێك یاریـی پێـدەكات، دوایـی فڕێـی دەدا، تەنیـا کاتێکـی دیارییکـراوی لەگـەڵ دا بەسـەردەبات، پێـی دەخافڵـێ، لـەو ڕووەوە خـوای میهرەبـان ژیانـی دنیـای چوانـدوە بەگەمـەو یاریی منداڵانـەوە، بـە دڵنیاییـەوە دنیـاش لـەڕووە ماددییەکەیـەوە هەروایـە، هەروەهـا بەبـەراورد لەگـەڵ نـازو نیعمەتـی بەهەشـتدا، خـوا دەفەرمـوێ: شـتێکی کـەم بایەخـە، بچووکـە.

**بڕگـەی سـێیەم: ژیانـی دنیـا لـەو ڕووەوە کـە جێـی تێـدا تاقیکردنـەوەو جێنشـیانەیەتیی کردنـی خوایـە، پێگەیەکـی یەکجـار مـەزن و هەسـتیاری هەیـە:**

وەك لـە سـووڕەتی (**الأنعام**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾ ﴾، واتـە: خـوا ئـەو کەسـەیە ئێـوەی کردۆتـە جێنشـین لەسـەر زەوی، هەندێکتانـی بەسـەر هەندێکتـان بـەرزۆ کردۆتـەوە، بـە چەنـدان پلـە، تاکـو تاقیتـان بکاتـەوە، لـەوەدا کـە پێیـداون، بێگومـان پـەروەردگارت تۆڵـەی خێرایـەو زۆریـش لێبـوردەی بەبەزەییـە.

هەروەها لە سـووڕەتی (یونـس)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ٱلْقُرُونَ مِن قَبْلِكُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ ۙ وَجَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُوا۟ لِيُؤْمِنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ مِنۢ بَعْدِهِمْ لِنَنظُرَ كَيْفَ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، واتـە: لـە پێـش ئێـوەدا گەلێـك سـەدەمان فەوتانـدوون کاتێـك سـتەمیان کـرد پێغەمبەرانیـان بەڵگـە ئاشـکرایەکانیان بـۆ هێنـان، بـەڵام نەدەگونجـا ئیـمان بێنـن (لەبـەر ئـەوەی

ئەوەنـدە بـە سـتەم و خراپـەدا چوببوونـە خـوارێ، ڕێـی ئیـمان هێنانیـان لەخۆیـان گرتبـوو)، ئـاوا سـزای تاوانبـاران دەدەیـن، دوایـی ئێوەمـان کـردە جێنشـینی ئـەوان لەسـەر زەوی، تاکـو بزانیـن چـی دەکـەن!

کەواتــە: ئێمــە جێنشــینی خــوای پەروەردگاریــن و، ئێمــەی لــە دوای گەلــە پێشـووەکان دانـاوە لەسـەر ئـەم زەوییـە، بۆچـی؟ تاکـو تەماشـا بـکات چـی دەکەیـن! کەواتـە: ئێمـە لـە تاقیکردنـەوەی خـوا عـز وجـل دایـن، هـەر بۆیـەش خـوای کاربەجێ ژمارەیەکـی زۆر لـە پێغەمبەرانـی ناردوون صـەڵات و سـەلامی خوایـان لێبـێ، خـوا (١٢٤٠٠٠) پێغەمبــەری نــاردوە، وەك لــەم دەقــەدا دیــارە:

**{عَـنْ أَبِي أُمَامَـةَ، قَـالَ أَبُـو ذَرٍّ، قُلْـتُ يَـا رَسـُولَ اللـهِ! كَـمْ وَفَّى عِـدَّةُ الأَنْبياءِ؟ قَالَ: مَائَـةُ أَلْفٍ وَأَرْبَعَـةٌ وَعِـشْرُونَ أَلْفـاً، الرُّسُـلُ مِـن ذَلِـكَ ثلاَثْمِائَـةً وَخَمْسَـةَ عَشَرَ جَـمّاً غَفِـيراً} (أخرجه أحمد: ٢٢٣٤٢)، والطـبراني: (٧٨٧١)، قـال الهيثمـي (٨/ ٢١٠): رجالـه رجـال الصحيـح غـير أحمـد بـن خليـد، وهـو ثقـة، والحاكـم: (٣٠٣٩)، وقـال: صحيـح عـلى شرط مسـلم، وصححـه الألبـاني).**

واتــە: ئەبــوو ئومامــە (خــوا لێــی ڕازی بــێ) دەڵــێ: ئەبــوو زەڕ (خــوا لێــی ڕازی بــێ) گوتــی: گوتــم ئــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ! ژمــارەی پێغەمبــەران چەنــد بــووە؟ فەرمــووی: ســەدو بیســت و چــوار هــەزار: (١٢٤٠٠٠) پێغەمبــەر، لەوانــە سێســەدو پــازدە (٣١٥) یــان ڕەوانەکراوبــوون، ژمارەیەکــی زۆر بــوون.

هەروەها خوای کاربەجێ سەدو چوار (١٠٤) کتێبی دابەزاندوون.

هەڵبەتـە هەمـوو پێغەمبـەران صـەڵات و سـەلامی خوایـان لێبـێ پەیامـی خوایـان پێبـووە، بـەڵام (١٠٤) کتێـب دابەزیـون، لـەو بـارەوە بـا سـەیری ئـەم دەقـە بکەیـن: **{عَـنْ أَبِي ذَرٍّ رضي اللـه عنـه، قَـالَ: قُلْـتُ يَـا رَسُـولَ اللـه! كَـمْ كِتَابـاً أَنْزَلَـهُ اللـهُ؟ قَـالَ: مَائَـةَ كِتَـابٍ وَأَرْبَعَـةَ كُتُـبْ} (أخرجـه ابـن حبـان: ٣٦١)**، لـە ئەبـوو زەڕەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) هاتـوە، کـە پرسـیاری لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـردوە، دەڵـێ: گوتـم ئـەی پێغەمبــەری خــوا! خــوا چەنــد کتێبــی دابەزانــدوون؟ فەرمــووی: ســەدو چــوار.

کەواتـە: ژیانـی دنیـا لـەڕووە ماددییەکەیـەوەو بەبـەراورد لەگـەڵ ڕۆژی دواییـدا، شـتێکی کـەم بایەخـەو کەمـە، ئەگەرنـا لـەو ڕووەوە کـە شـوێنی تێدا تاقـی کرانەوەیە، زۆر گـەورەو گرنگـەو زۆر جێـگای مەترسییە، کـە ئینسـان نەزانێ چۆنـی دەگوزەرێنێ؟

بۆیە یەکێك لە شاعیرەکان دەڵێ:

**لَقَد خُلِقْتَ لِأَمْرٍ عَظِيمٍ لَوْ فَطِنْتَ لَهُ ... فَآرْبأْ بِنَفْسِكَ أَنْ تَرعَى مَعَ الهَمْلِ**

واتـە: بـۆ شـتێکی زۆر مـەزن خوڵقـاوی ئەگـەر عەقڵـت پێـی بشـکێ، لەخۆتـی مەوەشـێنەوە (خۆتـی ڕەوا مەبینـە)، لەگـەڵ ئاژەڵانـدا بلەوەڕێـی.

**برگـەی چـوارەم: بەهرەمەندبـوون لـە خۆشـییەکانی ژیانـی دنیـا، بەبـێ زێدەڕۆیـی، نـەك هـەر خـوا قەدەغـەی نەکـردوە، بەڵکو بـە ئەندازەی پێویسـت فەڕزیشـی کـردوە:**

زۆر لە ئایەتەکان ئەوە دەگەیەنن،

بـۆ وێنـە خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ ﴾**الأعـراف**، واتـە: ئـەی وەچـەی ئـادەم! لـەلای هەمـوو مزگەوتێـك خۆتـان بڕازێننـەوە، (ئنجا ئەگـەر لـەلای مزگـەوت خۆیـان بڕازێننـەوە، دەبـێ لـە بـازاڕو مەجلیسـدا چاکتر) بخـۆن و بخۆنـەوەش، بـەڵام زێدەڕۆیـی مەکـەن، بێگومـان خـوا زێدەڕۆییانـی خۆشـناوێن.

لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا خـوای باڵادەسـت دەفەرمـوێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ١٦٨ ﴾، واتـە: ئـەی خەڵکینـە! لـەوەی لەزەویـدا هەیـە لەشـتە خـۆش و پـاك و چاکـەکان بخـۆن، بـەڵام شـوێن هەنگاوەکانـی شـەیتان مەکـەون، بێگومـان ئـەو بـۆ ئێـوە دوژمنێکـی ئاشـکرایە.

کەواتــە: چێــژو لــەززەت وەرگرتــن لــە نیعمەتەکانــی دنیــا، کــە خــوا لەزەویــدا دایناون، نـەك هـەر قەدەغـە نیـە، بەڵکـو کەسـێك هەقـی جەسـتەی نـەداو، خزمەتـی

جەستەی خۆی نەکات، بەبەهرە وەرگرتن لە نیعمەتەکانی خوا، گوناهباریش دەبێ، بۆیە زانایان دەڵێن: ئەگەر کەسێك بە بیانووی دنیا بەکەمگرتن و، لە خوا نزیك بوونەوەو، تاعەت زۆر بۆ خوا ئەنجامدانەوە، زیان بە جەستەی خۆی بگەیەنێ، گوناهبار دەبێ، لە جیاتی ئەوەی پاداشتی هەبێ.

تەنانەت خوای کارزان و میهرەبان چوار لەو شتانەی قەدەغەی کردوون، لە کاتی ناچارییدا بۆ ئەوەی مرۆڤ نەمرێ، ڕەوای کردوون، کە بریتین لە: مردار، خوێن، گۆشتی بەراز، بۆ جگەلە خوا سەربڕاو، کە لە چوار ئایەت لە قورئاندا هاتوون، دووان لە سوورەتە مەدینەییەکان، کە (**البقرة**) و (**آل عمران**)ن، هەروەها لە دوو سوورەتی مەککەییش دا کە (**الأنعام**) و (**النحل**)ن.

**بڕگەی پێنجەم: خوای پەروەردگار مرۆڤی وریا کردۆتەوە لەوەی بەدوای ئارەزووەکانی بکەوێ و، پێیانەوە سەرقاڵ بێ، لەسەر حیسابی ژیانی ڕۆژی دوایی:**

خوا لە سوورەتی (**فاطر**)دا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ ﴾، واتە: ئەی خەڵکینە! بەڵێنی خوا ڕاستە (ئەم ژیانە دەپێچرێتەوەو ڕۆژی دوایی دێ) بۆیە با ژیانی دنیا فریوتان نەداو با فریودەر فریوتان نەدا، (لەبەرانبەر خوادا، کە مەبەست پێی شەیتانە).

**بڕگەی شەشەم: ژیانێك کە لە ڕۆژی دواییدا هەیە، تەنیا ئەو ژیانی ڕاستەقینەیە:**

وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ٦٤ ﴾ **العنکبوت**، واتە: ئەم ژیانی دنیایە تەنیا خافڵان و یارییە، ژیانی دوارۆژ هەر ئەو ژیانی ڕاستەقینەیە، ئەگەر بزانن.

**بڕگـەی حەوتـەم: خـوا عزوجـل بەشـێوەی جـۆراو جـۆر هۆشـداریی داوە بـە مرۆڤـەكان، هەروەهـا بـە جندیـش، كـە درەنـگ یـان زوو ژیانـی سـەرزەوی دەپێچرێتـەوەو بـەرەو قۆناغـی بـەرزەخ و، پاشـان ڕۆژی دوایـی دەگوازنـەوە:**

خـوا بـۆ تـاك بەتاكـی مرۆڤـان، فەرموویەتـی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾﴾ **العنكبـوت**، واتـە: هەمـوو نەفسـێك مـردن دەچێـژێ، دوایـی بـۆ لای ئێمـە دەگێڕدرێنـەوە، ئەمـە هـەم لـە سـوورەتی (الأنبیاء) ئایەتـی (٣٥)داو، هـەم لـە سـوورەتی (آل عمـران) ئایەتـی (١٨٥)داو، هـەم لـە سـوورەتی (العنكبـوت) ئایەتـی (٥٧)دا هاتـوە، كـە هەمـوو نەفسـێك دەبـێ تامـی مـردن بچێـژێ، ئەمـەش بـۆ ئەوەیـە هەمـوو كـەس بزانـێ مردنێـك قـەرزدارە.

بەنسـبەت ئەوەشـەوە كـە ئێمـە لـەم ژیانـی دنیایـەدا تاقـی دەكرێینـەوەو، لـە دوایيـدا دەگوازرێینـەوە بـۆ قۆناغێكـی دیكـە، تـاك بەتـاك دەگوازرێینـەوە بـۆ قۆناغـی بـەرزەخ، دواییـش هەمووـمان دەگوازرێینـەوە بـۆ قۆناغـی قیامـەت، خـوای پـەروەردگار لـە چەنـد شـوێن لـە قوڕئانـدا، ئـەو ڕاسـتییەی بەیـان كـردوە، بـۆ وێنـە لـە سـوورەتی (الزمـر)دا دەفەرمـوێ: ﴿وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾، واتـە: فـوو بەكەڕەنـادا كـرا، ئنجـا هەركـەس لـە ئاسـمانەكان و زەویدایـە مـردن (یـان بێهـۆش بـوون)، جگـە لەوانـەی خـوا بیـەوێ، (نەمـرن) دوایـی جارێكـی دیكـە فـووی پێـدا كـرا، هەموویـان هەڵسـابوونەوە چاوەڕێیـان دەكـرد.

ئەمەش قۆناغی قیامەت و هەڵسانەوەو زیندوبوونەوەیە.

ئەمـە پوختەیەكـی زۆر كـورت بـوو، لـە بووناسـیی ئیسـلامیی، كـە پەیوەندییەكـی زۆری هەیـە بـە پێنـج ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (العلـق)، هەروەهـا پەیوەندییشـی هەیـە بـە هەشـت (٨) ئایەتەكانـی سـوورەتی (التیـن)ەوە.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ (١٧)ی مانگـی (**ذي الحِجَّـة**) {مانگـی (١٢)}ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر: (٢٠٢٠/٨/٧)ی زاینییـە لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**القَـدْر**)، سـەرەتاش پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا، وەك عادەتـی خۆمـان دەخەینـەڕوو.

## پێناسەی سوورەتی (القدر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

نـاوی باوتـری ئـەم سـوورەتە بریتیـە لـە: (**سُـورَةُ القَـدْر**)، هەندێکیـش بـە: (**سُـورَةُ لَيْلَـةِ القَـدْر**) ناویـان هێنـاوە.

### دووەم: کات و شوێنی دابەزینی:

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ئـەم سـوورەتەیان بـە مەککەیـی دانـاوە، هەندێکیـش بە مەدینەیـی، بەبەڵگـەی باسـی شـەوی قـەدر، کـە لـە ڕەمەزانـی سـاڵی دووەمـی کۆچییـدا، گرتنـی ڕۆژووی مانگـی ڕەمـەزان فەڕزکـراوەو شـەوی قـەدری تێدایـە، بـەڵام ئـەو بەڵگەیە هیـچ نیـەو، مەککەیـی بوونیشـی زۆر ڕوونـە، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن:

(**عَـنْ عَبْدِاللـهِ بْـنِ عَبَّـاسٍ** ﵄، **قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ:** ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ **بِمَكَّة**)، (**أورده السـيوطي في الـدر المنثور: ج٨، ص٥٦٧، ونسـبه لابـن مردويـه وقـال: وأخـرج مِثْلَـهُ**

**ابـن مردويـه عـن عبـد اللـه بـن الزبـير وعائشـة رضي اللـه عنهـم، الإسـتيعاب فِي بَيـان الأسـباب: ج٣، ص٥٣٩).**

واتـە: عبدولّـلای كـوڕی عەببـاس ﷺ گوتوویەتـی: سـوورەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ ﴾، لـە مەككـە دابەزیـوە، هەمـان شـت پاڵدراوەتـە لای عبدولّـلای كـوڕی زوبەیـر (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ)، دایكـی ئیمانـداران عائیشـەی كچـی ئەبـوو بەكـری صیددیـق (خـوا لـە خـۆی و بابیشـی ڕازی بـێ).

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە موصحـەف دا ژمارەكـەی (٩٧)ەو، لـە دابەزینیشـدا (**جابـر بـن زيد**)، ژمـاره (٢٥) ی، بـۆ دانـاوه، واتـە: پێـش سـوورەتی (**الشـمس**)و، دوای سـوورەتی (**عبـس**) دابەزیوه.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

لـە سـەرژمێری زانایانـی مەدینەیـی و بەصڕایـی و كووفەییـدا، پێنـج (٥) و، لەهـی مەككەیـی و شـامییدا، شـەش (٦)ە، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی (٥) تەبەننیـی كـراوه.

## پێنجەم نێوەڕۆكی:

ئـەم سـوورەتە باسـی دابەزینـی قورئـان لـە شـەوی قـەدردا و، مەدحكـردنی ئـەو شـەوە بـە پێزەیـە، كـە لـە هـەزار مانـگ (٨٣ سـاڵ و ٤ مانـگ) باشـترەو جیبریـل و فریشـتەكان تێیـدا دادەبەزنـە سـەر زەوی و، هەمـوو كارێكـی گرنگـی تێـدا دیاریـی دەكـەن، هەتـا بەیانیـش هـەر سـەلامەتیی و خێـرو خۆشـییە.

## شەشەم تایبەتمەندییەکانی:

پێنج تایبەتمەندییمان تێیدا کەوتوونە بەرچاو:

١- ڕاگەیاندنی دابەزاندنی قورئان لە شەوی قەدردا، ئایەتی ژمارە (١).

٢- لە هەزار مانگ بە چاکتر دانانی شەوی قەدر، ئایەتی ژمارە (٣).

٣- ڕاگەیاندنی دابەزینی ڕووح و فریشتان تێیدا بۆ هەر کارێکی پێویست، ئایەتی ژمارە (٤).

٤- ڕاگەیاندنی سەلامەتیی و ئاشتیی و سەقامگیر بوون لەو شەوەدا هەتاك بەیانیی، ئایەتی ژمارە (٥).

٥- تایبەتمەندیی پێنجەم ئەوەیە کە وشەی: (لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ) لەم سوورەتە موبارەکەدا سێ جاران دووبارە بۆتەوەو، وشەی (لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ) تەنیا لێرەدا هاتووەو، سێ جاران دووبارە بۆتەوە.

## حەوتەم دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە:

ئێمە کۆی ئەو پێنج ئایەتە موبارەکەی ئەم سوورەتەیان لێ پێکدێ، دەکەینە دەرسێك.

## پێناسەی دەرسەکە

ئەم دەرسەمان لە هەر پێنج ئایەتەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە پێکدێ، کە وەك پێشتریش گوتمان: خوا ﷻ لەم سوورەتەدا چەند ڕاستییەکی یەکجار مەزن ڕادەگەیەنێ:

١- یەکسەر بەمجۆرە دەست پێدەکات: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾، ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوی قەدردا، ڕاناوی (هـ)، لە (إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ)دا، بە یەکدەنگیی هەموو زانایان بۆ قورئان دەچێتەوە، چونکە ئەمە وێڕای ئەوەی عادەتی قورئانە، بە سیاق و سەلیقەش دەزانرێ، کە مەبەست پێی قورئانە، واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندوە لە شەوی قەدردا.

(ٱلۡقَدۡرِ)یش، هەم بە مانای ئەندازەگیریی هاتوە، هەم بە مانای ڕێزو حورمەت و پێگەی بەرز هاتوە، دوایی خوا ﷻ بۆ زیاتر دەرخستنی پێگەی بەرزی ئەو شەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ ﴾، چ شتێك بە تۆی زانانـدوە شەوی قەدر چییە؟

٢- ئنجا خوا خۆی ڕوونی دەکاتەوە: ﴿ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣ ﴾ شەوی قەدر لە هەزار مانگ باشترە، زانایان لەوبارەوە کە دەفەرموێ: لە هەزار مانگ باشترە، ڕاجیاییان هەیە: ئایا لە چ ڕوویێکەوە؟

زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر ئەوە یەکدەنگن و دەڵێن: یانی: لە هەزار مانگ باشترە، کە خواپەرستیی تێدا بکرێ و، ئەو تاعەت و بەندایەتیی و چاکەیەی لەو شەوەدا دەکرێ، وەك خواپەرستیی و تاعەتی هەزار مانگ وایە، کە دەکاتە (٨٣ ساڵ و ٤ مانگ).

٣- دوایی خوا ﷻ لەسەر زیاتر ناساندنی ئەو شەوەو دەرخستنی پێگەی بەرزی بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ: ﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ﴾، (تَنَزَّلُ)، لە ئەسڵدا (تَتَنَزَّلُ)یە، ﴿ تَنَزَّلُ

ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا ﴾، فریشتەکان و ڕووح تێیدا دادەبەزن، ڕووح زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مەبەست پێی جیبریلە، چونکە خوا ﷻ لە چەند شوێنێکدا جیبریلی لە قورئاندا بە (روح) ناوهێناوە، یان بە: (ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ) یان: (رُوحُ ٱلْقُدُسِ ).

بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ **الشعراء**.

بۆشمان باس نەکراوە لە قورئاندا، جگە لە جیبریل و، جگە لەو ڕووحەی بەبەر مرۆڤدا دەکرێ و، خوا وشەی (روح)ی، بۆ بەکارهێناوە، بۆ دروستکراوێکی دیکە بەکارهێنرابێ، تاکو لێرەدا خوا ﷻ باسی بکات، کەواتە: مەبەست پێی جیبریلە عليه السلام.

٤- ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾، لەو شەوەدا فریشتەکان و ڕووح، یانی جیبریل دادەبەزن بە مۆڵەتی پەروەردگاریان بۆ هەر کارێك، واتە: بۆ هەر کارێك کە پەروەردگاریان پێیان دەسپێرێ، زۆربەی زانایان گوتوویانە: هەرکارێك کە لەسەر زەوی دەگوزەرێ، لەو شەوەوە تاکو ساڵێك تێوەردەسووڕێتەوە، تێیدا دیاری دەکرێ.

٥- لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾ ﴾، ئەم شەوە هەر خێرو خۆشیی و سەلامەتیی و ئاشتییە تاکو سپێدەی بەرەبەیان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. ئێمە دامانبەزاندوە (ئەم قورئانە) لە شەوی ڕێزو ئەندازەگیرییدا ﴿١﴾ ئایا چی بە تۆی زانادوە شەوی ڕێزو ئەندازەگیریی چییە؟ ﴿٢﴾ شەوی ڕێزو ئەندازەگیریی لە هەزار مانگ باشترە ﴿٣﴾ فریشتەكان و ڕووح (جیبریل) بە مۆڵەتی پەروەردگاریان بۆ هەموو كارێك تێیدا دادەبەزن ﴿٤﴾ ئەو (شەو)ە هەر سەلامەتیی و خێرو خۆشییە هەتا سپێدەی بەیانی ﴿٥﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلْقَدْرِ): (القَدْرُ وَالتَّقْدِيرُ: تَبيِينُ كَمِّيَّةِ الشَّيْءِ، قَدَّرْتُهُ وَقَدَرْتُهُ، وَالقَدْرُ: الحُرْمَةُ وَالوَقَارُ، يُقَالُ لَهُ عِنْدِي قَدْرٌ)، (قَدَر) و (تَقْدير): بە مانای دیارییكردن و ڕوونكردنەوەی قەبارەو ئەندازەی شتێكە، دەگوترێ: (قَدَّرْتُهُ وَقَدَرْتُهُ)، واتە: ئەندازەكەیم، قەبارەكەیم دیارغیكرد، بەڵام وشەی (قَدْر) بە زەننە (سكون)، بە مانای حورمەت و ڕێز دێ، دەگوترێ: (لَهُ عِنْدِي قَدْر) فلانكەس لە لای من قەدرو ڕێزو حورمەتی هەیە.

(خَيْرٌ): (الخَيْرُ: مَا يَرْغَبُ فِيهِ الكُلُّ، وَالخَيْرُ: الشَّيءِ النَّافِعُ، وَضِدُّهُ: الشَّرُّ)، (خَيْر): ئەوەیە هەموو لایەك بۆی ئارەزوومەندن، هەروەها (خَيْر) بە شتێكی سوودبەخش دەگوترێ، پێچەوانەو دژی (خَيْر)یش بریتیە لەشەڕ، كە زیان و خراپەو ناخۆشییە.

(أَمْرٍ): (الأَمْرُ: الشَّأْنُ وَجَمْعُهُ: أُمُور، وَمَصْدَرُهُ: أَمَرْتُهُ، إِذَا كَلَّفْتَهُ أَنْ يَفْعَلَ شَيْئاً، وَلاَ يُجْمَعُ، وَهُوَ لَفْظٌ عَامٌ لِلأَفْعَالِ وَالأَقْوَال)، (أَمْر): بە مانای حاڵ دێ و، بە (أُمور) كۆدەكرێتەوە، یانی: كارەكان، چاوگەكەی (أَمَرْتُهُ أَمْراً)ە، واتە: (أَمْراً) لە (أَمَرْتُهُ)ەوە هاتوە، واتە: فەرمانم پێكرد بە فەرمان پێكردن، كارێكم پێسپارد بە

کارپێسپاردن، ئەگەر ئەرکدارتکرد کارێك ئەنجامدا، وشەی (**أُمُور**) کە کۆی (**أَمْر**)ە، بریتیە لە کارێك کە ئەنجام بدرێ، بەڵام (**أَمْر**)، بە مانای حاڵ، کۆناکرێتەوە، بەڵکو بێژەیەکی گشتییە بۆ کردەوان و قسان.

(سَلَٰمٌ هِيَ): (**السَّلْمُ وَالسَّلاَمَةُ: التَّحَرِّي مِنَ الآفَاةِ الظَّاهِرَةِ وَالبَاطِنَةِ**)، (**سَلْمٌ**) و (**سَلاَم**) هەردووکیان واتە: دووریی لە دەردو بەڵا ڕواڵەتیی و پەنهانەکان.

(مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ): دەگوترێ: (**طَلَعَتِ الشَّمْسُ طُلُوعَاً وَمَطْلَعَاً**) خۆرەکە هەڵهات هەڵاتن، (**مَطْلَع**) و (**طُلُوع**) هەردووکیان بە مانای چاوگن، واتە: هەڵهاتن، کەواتە: (**مَطْلَع**) چاوگە واتە: هەڵهاتن، بەڵام (**مَطْلِع: مَوْضِع الطُّلُوع**)، شوێنی لێ هەڵهاتنە، کە بەو شێوەیەش هەندێکیان خوێندوویانەتەوە، بەڵام خوێندنەوەکەی دیکە بەهێزترەو، زانایان زیاتر بە (مَطْلَعِ) خوێندوویانەتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ )، بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە،زۆرجار گوتوومانەو لێرەش دووبارەی دەکەینەوە، واتە: ئەم کارە دەست پێدەکەم، ئەم قوڕئانخوێندنە دەست پێدەکەم، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە:

١- بەناوی خواوە دەستی پێدەکەم.

٢- بۆ خوا ئەنجامی دەدەم.

٣- بەپێی بەرنامەی خوا ئەنجامی دەدەم.

٤- بە تواناو بڕستێك کە خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەنجامی دەدەم.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە دامانبەزانـدوە لـە شـەوی قـەدردا، چـی دابەزانـدوە؟ بێگومـان ڕانـاوی (هـ)بـۆ قورئـان دەچێتـەوە، یـانی: (إِنَّـا أَنْزَلْنَـا القُـرآنَ فِي لَيْلَـةِ القَـدْرِ)، ئێمـە قورئانمـان لـە شـەوی قـەدردا دابەزانـدوە.

﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ ﴾، ئایـا چـی بـە تـۆی زانانـدوە شـەوی قـەدر چییـە؟ وەك پێشـتریش گوتمـان: (ٱلۡقَدۡرِ) بـە مانـای ئەندازەگیریـی دێ و، بـە مانـای ڕێـزو حورمەتیـش دێ.

﴿ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣ ﴾، شـەوی قـەدر لـە هـەزار مانـگ باشـترە، بێگومـان چاکتربـوونی شـەوی قـەدر لـە هـەزار مانـگ واتـە: چاکتربـوونی ئـەو تاعـەت و خـوا پەرسـتییەی تێیـدا ئەنجـام دەدرێ، چونکـە ڕێـزو حورمەتـی شـوێنەکان بـەو تاعەتەوەیـە کـە تێیانـدا دەکـرێ، ئەگەرنـا مەککـە بـۆ بابایەکـی بێبـڕوا، زەوییـەکی ئاساییە، بـەڵام بـۆ بابایەکـی بـڕوادار ئـەو ڕێـزو حورمەتـە تایبەتـەی هەیـە، هەروەهـا مزگەوتـی حـەڕام کـە نوێژێـك تێیـدا بـە سـەد هـەزار (١٠٠,٠٠٠) نوێـژەو، مزگـەوتی پێغەمبـەر ﷺ کـە نوێژێـك تێیـدا بـە هـەزار نوێـژەو، مزگەوتـی ئەقسـا کـە نوێژێـك تێیـدا بـە پێنجسـەد نوێـژە، بـۆ کەسـێکە کـە نوێژیـان تێـدا بـکات، بـەڵام کەسـێك هـەر ئـاوا تێییـان دا بێـت و بچـێ، یـان بچـێ لەوێـدا جاسووسـیی و سـیخوڕیی بـکات، هیچـی پـێ نابـڕێ و بگـرە زۆریـش گوناهبـارە.

کەواتـە: لێـرەش کـە دەفەرمـوێ: شـەوی قـەدر لـە هـەزار مانـگ باشـترە، واتـە: شـەوی قـەدر بـۆ کەسـێك، خواپەرسـتیی تێدا بـکات، خـوا پەرسـتییەکەی پاداشـتەکەی بـۆی بـە ئەنـدازەی پاداشـتی هـەزار مانـگ تاعەتـە، کـە لـەو مانگانـەدا شـەوی قەدریـان تێـدا نەبـێ.

﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا ﴾ وشـەی (تَنَزَّلُ)، لـە ئەصڵـدا (تَتَنَزَّلُ)یـە، فریشـتەکان و ڕووح تێیـدا دادەبـەزن، ﴿ بِإِذۡنِ رَبِّهِم ﴾ بـە مۆڵـەتی پەروەردگاریـان، بـە فەرمـانی پەروەردگاریـان، بـە ڕێپێدانـی پەروەردگاریـان، ﴿ مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ٤ ﴾، (مِّن)

لێرەدا یان بە مانای (ل)ە، یانی: (**لِكُلِّ أَمْر**) بۆ هەر كارێك، یان بە مانای (**ب**)ە، (**بِكُلِّ أَمْر**)، بۆ هەر فەرمانێك كە خوا پێی كردوون، دادەبەزن و، هەر فەرمانێك خوا پێی كردوون، پێی دادەبەزن، ئەو فەرمانانە چین؟

زۆربەی زانایان دەڵێن: (**أمر**) بریتیە لە ئەندازەگیریی كردن و نەخشەدانانی ئەو كارو كردەوانەی ئەو مرۆڤانە، هەموو هەڵسوكەوتیان لەسەر زەوی تاكو ساڵی تازە دێتەوە.

﴿ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ۝٥ ﴾، ئەو شەوەش هەر سەلامەتییە و خێرو خۆشییە، تاكو سپێدەی بەرەبەیان.

(مَطْلَعِ) واتە: هەڵهاتن، یانی: تاكو خۆر هەڵدێ و دەردەكەوێ، ئەو شەوە خێرو خۆشیی و سەلامەتیی و ئاشتییەكەی درێژەی هەیە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**باسی شەوی قەدر کە قورئانی تێدا دابەزێنراوەو، هێندە شەوێکی مەزنە، مەگەر بەس خوا بیناسێنێ و، لە هەزار مانگ چاکترە، واتە: چاکەو تاعەت تێیدا پاداشتی لە هەزار مانگ زیاترە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣﴾.

### شیکردنەوە ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ﴾ بە دڵنیایی ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوی قەدردا، ڕاناوەکە گومانی تێدانیە کە دەچێتەوە بۆ قورئان، ئەوەش وێڕای عادەتی قورئان، لە ڕەوتی ئایەتەکانەوەش دەزانرێ، ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان بەشەو دابەزیوە، یەکەمجار سەرەتای دابەزینی قورئان -وەك پێشتریش باسمانکرد لە کاتی تەفسیرکردنی پێنج ئایەتی سەرەتای سوورەتی (**العلق**)دا، کە بەشەو دابەزیون -واش پێدەچێ ئەو شەوە شەوی بیست و یەك (٢١)ی مانگی ڕەمەزانی چل و یەکەمین ساڵی مانگیی، تەمەنی پێغەمبەر ﷺ بووبێ، لە ئەشکەوتی حیرادا[1]، کە بەیانییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی ئەو پێنج ئایەتە موبارەکەی وەرگرتوون، چۆتەوە بۆ ماڵ و بە خەدیجەی فەرمووە: داماپۆشن، داماپۆشن، دوایی بەسەرهاتەکەی بۆ خەدیجە گێڕاوەتەوەو بردوویەتی بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل، کە کوڕە مامی بووە، لەکاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (**العلق**)دا، ئەوەمان باسکردو، ئەو فەرموودەیەی لە هەردوو صەحیحی بوخاریی و موسلیمدا هاتوە، هێنامان.

---

(١) بۆ درێژەی ئەو بابەتە وا باشە سەرنجی کتێبی: (ژیاننامەی پێغەمبەری خوا) بدرێ، بەرگی یەکەم، چاپی چوارەم/ ٢٠٢٢ز.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾، ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوی قەدردا، زانایان دوو ڕایان هەن:

ڕای یەکەم: ئەوەیە کە قورئان هەمووی لەو شەوەدا لەلای خوای پەروەردگارەوە دابەزیوە بۆ ئاسمانی دنیا -ئنجا هەندێك دەڵێن: لە ئاسمانی دنیاش دا بۆ (**بیت العزة**)، بەڵام بەڵگەیەکی ئەوتۆ لەسەر ئەوە نیە شتێکی وا هەبێ ئنجا دوایی خوا ﷻ لە ماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵدا لەوێوە بەهۆی جیبریلەوە دایبەزاندوە، بەپێی ڕووداو و پێشهاتەکان کە هاتوونە پێش، ئەمە لە ئیبنو عەبباسەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هاتوە، دەڵێ:

(**أُنْزِلَ القُرآنُ كُلُّهُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ القَدْرِ فِي رَمَضَانَ إِلَىَ السَّمَاءِ الدُّنيا، فَكَانَ اللهُ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْدِثَ فِي الأَرْضِ شَيْئَاً، أَنْزَلَهُ مِنْهُ حَتَّى جَمَعَهُ**)، (**جامع البيان: ٣٧٨١٩**)، واتە: قورئان هەمووی پێکەوە لە شەوی قەدردا لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ ئاسمانی نیزیکتر لە ئێمە (ئاسمانی یەکەم) دابەزیوە، دوایی خوا ﷻ هەرکاتێ ویستبی شتێکی لێ دابەزێنێ، لێی دابەزاندوە، هەتا هەمووی کۆکردۆتەوە (لە سینەو دڵی پێغەمبەردا ﷺ).

ڕای دووەم: ئەوەیە کە مەبەست دەستپێك و سەرەتای دابەزینی قورئانە لە شەوی قەدردا، نەك قورئان هەمووی دابەزیبێ بۆ ئاسمانی نزیك لە ئێمە، (ئاسمانی دنیا)، دواییش وردە وردە دابەزیبێ، بەڵکو مەبەست پێی دەستپێك و سەرەتای دابەزاندنی قورئانە، (**الشَّعْبي**) دەڵێ: (**نَزلَ أَوَّلُ القُرآنِ فِي لَيْلَةِ القَدْر**)، (**جامع البيان: ٣٧٨٢٢**)، واتە: قورئان سەرەتا لە شەوی قەدردا دابەزی.

٢- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢ ﴾، چی بە تۆی زانandوە شەوی قەدر چییە؟ واتە: شەوی قەدر شەوێکی هێندە بەڕێزەو، خاوەنی پایەیەکی هێندە بەرزە، مەگەر خوا پێت بناسێنێ، ئەگەرنا نازانی شەوی قەدر چییە؟

٣- ﴿لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ٣﴾، شەوی قەدر چاکترە لە هەزار مانگ.

لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا سێ جاران وشەی (لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ) دووبارە بۆتەوە، لە هەر کامێکیاندا، ئەوەش ناوێکە خوا لەو شەوەی ناوە کە قورئانی تێدا دابەزێنراوە بۆ یەکەم جارو، پێشتر نەزانراوە ئەو ناوە بەکارهاتبێ لە زمانی عەرەبییدا.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ٢﴾، ئایا چییش بە تۆی زانانـدوە شـەوی قـدەر چییـە؟!

ئەمە بۆ دەرخستنی پێگەو پایەی بەرزی ئەو شەوەیە، واتە: هیچ وەسفکەرێك ناتوانێ وەسفی بکات، زانایان گوتوویانە: (**كُلُّ مَا أَدْرَاكَ فِي القُرآنْ أَدْرَاهُ، وَكُلُّ مَا يُدرِكَ لَمْ يُدْرِهِ**)، واتە: هەموو (**وَمَا أَدْرَاكَ**)ەکان لە قورئاندا {یانی: چ شتێك بە تۆی زانانـدوە؟} دوایی خـوا ﷻ بە پێغەمبەری ﷺ زانانـدوون و پێی فەرمـوون، بەڵام هەمـوو (**وَمَا يُدرِيك**)ەکان (یانی: چووزانی؟) پێی نەفەرموون و پێی نەزانانـدوون.

وەك گوتمان: وشەی (ٱلۡقَدۡرِ)، دوو واتای هەن: یان بە مانای ئەندازەگیریی کردنە، یانی: شەوی ئەندازەگیریی، یاخود بە مانای شەڕەف و ڕێزو حورمەتە.

بەدڵنیایی کە دەفەرموێ: (خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ)، واتە: لەو ڕووەوە کە بەندایەتیی بۆ خـوا تێـدا ئەنجام دەدرێ و چاکەکاریـی تێـدا دەکـرێ، کـردەوەکان پاداشـتیان بەقـەدەر کـردەوەی چاکـی هـەزار مانگـە، کـە لـەو هـەزار مانگـەدا شـەوانی قـەدر نەبن، ئـەم مانایـە ڕێکتریـن واتایـە کـە زانایـان بـۆ ئـەم ئایەتـە موبارەکـە هێناویانـە.

(**الطَّبَرِي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**جامع البيان**)دا[1]، لەبارەی (خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ) ەوە، دەڵێ: (**وَأَشْبَهُ الأَقْوَالِ فِي ذَلِكَ بِظَاهِرِ التَّنْزِيلِ قَولُ مَن قَالَ: عَمَلٌ فِي لَيْلَةِ القَدْرِ، خيرٌ مِنْ عَمَلِ أَلْفِ شَهْرٍ لَيْسَ فيهَا لَيْلَةُ القَدْرِ، وَأَمَّا الأَقْوَالُ الأُخْرَى فَدَعَاوَى مَعَانٍ باطِلَةٍ لاَ دِلالَةَ عَلَيْهَا مِنَ الخَبَرِ وَلاَ عَقْلٍ، وَلاَ هِيَ مَوْجودَةٌ فِي التَّنْزِيلِ**).

---

(١) ج١٥، الجزء: ٣٠، ص٢٨٥.

واتـە: وێچوترینـی قسـان بەڕواڵـەتی قوڕئانـەوە -کـە مانـای بـێ- قسـەی ئـەو کەسـەیە کـە گوتوویـەتی: کردەوەیـەك لـە شـەوی قـەدردا باشـترە لـە کـردەوە لـە هـەزار مانگـدا کـە شـەوی قەدریـان تێدانیـە، بـەڵام قسـەکانی دیکـە هەموویـان لاف لێدانـن، بـۆ هەندێـك واتـای پـووچ کـە هیـچ بەڵگەیـان لەسـەر نیـە، نـە لـە هـەواڵ (دەقێکـی سـوننەت) و، نـە لـە عەقـڵ، هەروەهـا ئـەو مانایانـە لـە قوڕئانیشـدا نیـن.

چونکـە کۆمەڵێـك واتـای دیکـە هێـنراون، بـەڵام مـن نامـەوێ ئـەم تەفسـیرە بـە هەندێـك قسـانەوە قەڕەباڵـغ بکـەم، کـە بەڵگەیەکـی وایـان لەسـەر نیـە.

یەکێـك لـە قسـەکانیش ئەوەیـە کـە ئێسـتا دەیهێنـم لـە مالیکـەوە، بـەڵام هـەروەك بەرچـاو ڕوونیـی دەیهێنـم، ئەگەرنـا زۆر ناچێتـە عەقڵـەوە، مالیـك لـە (**المُوَطَّأ**)دا، وەك (**القُرْطبـي**)، لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (**الجامـع لإحـكام القـرآن**)دا[1]، لێیـەوە هێنـاوە دەڵـێ: (**وَقَـالَ مَالِـك فِي المُوَطَّأ مِـنْ رِوايَـةِ ابْـنِ القَاسِـم وَغَـيْرِهِ: سَـمِعْتُ مَـنْ أَثِـقُ بِـهِ يَقُـول: إِنَّ رَسـُولَ اللَّـهِ ﷺ أُرِيَ أَعْـمَار الأُمَـمِ قَبْلَـهُ، فَكَأَنَّـهُ تَقَـاصَرَ أَعْـمَارَ أُمَّتِـهِ أَلاَّ يَبْلُغُـوا مِـنَ العَمَـلِ مِثْـلَ مَـا بَلَـغَ غَيْرِهِـم فِي طُـولِ العُمُـرِ؛ فَأَعْطَـاهُ اللَّـهُ تَعَـالَى لَيْلَـةَ القَـدْرِ، وَجَعَلَهَـا خَـيْراً مِـنْ أَلْـفِ شَـهْر**).

واتـە: مالیـك گوتوویەتـی: گوێـم لـە کەسـێك بـوو کـە متمانـەم پێـی هەبـوو دەیگـوت: پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەمەنـەکانی کۆمەڵـگا پێشـووەکانی پێشـاندران، کـە لەپێـش ویـدا بـوون، وای هاتـە بەرچـاو تەمەنـەکانی ئۆممەتەکـەی کورتـن و، ناگەنـە ئـەو کردەوەیـەی ئـەوان لـەو تەمەنـە درێـژەدا کردوویانـە، بۆیـە خـوای بـەرز شـەوی قـەدری پێـداو گێڕاشـی بـە چاکـتر لـە هـەزار مانـگ، واتـە: کـردەوەی چـاك کـە لـەو شـەوەدا ئەنجـام بـدرێ، لـە هـەزار مانـگ کـە شـەوی قەدریـان تێدانیـە باشـترە.

---

(١) ج٢٠، الجزء: ٣٠، ص١٠٢، برقم: ٦٤١٤، مرسل.

**مەسەلەی دووەم:**

**دابەزینی فریشتەكان و ڕووح، لەو شەوە بەپێزەدا بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، بۆ هەر كارێك خوا پێیان بسپێرێ و، ئاشتیی و سەلامەتیی تێدا سەقامگیربوونی ئەو شەوە تاكو شەبەقی بەیان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەو دوو ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١- ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم ﴾، فریشتەكان و ڕووح، (جبریل) تێیدا دادەبەزن بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، یان: بە فەرمانی پەروەردگاریان، بەڕێپێدانی پەروەردگاریان، وشەی (إِذْن) بەو سێ واتایانە هاتوە، كە دەفەرموێ: دادەبەزن یانی: لە ئاسمانەوە دادەبەزن بۆ سەر زەوی بۆ لای مرۆڤەكان و، ئەو شوێنەی مرۆڤەكانی تێدا نیشتەجێن.

٢- ﴿ مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾، بۆ هەر كارێك.

(مِّن) لێرەدا سێ واتایان بۆ لێكداونەوە:

أ- هەندێكیان گوتوویانە: (مِّن)، (بَيَانِيَّةٌ يَعْنِي تُبَيِّنُ الإِذْنَ)، كە دەفەرموێ: (بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾)، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، ئنجا ڕوونی دەكاتەوە كە مۆڵەتی پەروەردگاریان بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك.

ب- بەڵام هەندێك گوتوویانە: (مِّن)، لێرەدا بە مانای (ب)ە، یانی: (بِكُلِّ أَمْرٍ)، بە هەر فەرمانێك كە پەروەردگاریان فەرمانیان پێ بكات.

ج- هەندێكیش گوتوویانە: (مِّن)، لێرەدا بۆ هۆكاردۆزیی (تَعْلِيل)ە، (أَيْ: مِنْ أَجْلِ كُلِّ أَمْرٍ أَرَادَ اللهُ قَضَاءَهُ بِتَسْخِيرِهِ)، واتە: لە پێناو هەر كارێكدا كە خوا ویستوویەتی ئەنجامی بدات بەهۆی مل پێكەچكردنی ئەو فریشتانەو ڕووحەوە.

پیتی (ب) لە (بِإِذۡنِ رَبِّهِم)دا، دوو واتایان بۆ لێکداوەنەوە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (**يَعْني يَتَنَزَّلُونَ بِسَبَبِ إِذْنِ رَبِّهِم لَهُم**) یانی: دادەبەزن بەهۆی مۆڵەتدانی پەروەردگاریانەوە بۆیان، یان فەرمانکردنی پەروەردگاریان پێیان، واتە: (**ب**)، لێرەدا هۆکاری (**سَبَبِيَّة**)یە.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: (**ب**)، لێرەدا بۆ هاوەڵایەتیی (**مُصَاحَبَة**)یە، یانی: (**مُصَاحِبِينَ لِمَا أَذِنَ بِهِ رَبُّهُم**)، واتە: ئەوەی پەروەردگاریان مۆڵەتی داوە لەگەڵ خۆیانی دێنن، (**فَالإِذْنُ بِمَعْنَى المَأْذُونِ مِنْ إِطْلَاقِ المَصْدَرِ عَلَى المَفْعولِ نَحْو: هَذا خَلْقُ الله**)، لێرەدا مۆڵەت (**إذن**) بە مانای مۆڵەتپێدراو (**مأذون**)ەو، بەکارهێنانی چاوگە بۆ بەرکار، وەك چۆن خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِي مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ ۝١١ ﴾ لقمان، (هَٰذَا خَلۡقُ ٱللَّهِ)، (خَلۡقُ)، بە مانای دروستکردنە، بەڵام لێرەدا بە مانای دروستکراوە و، چاوگە بەڵام بە مانای بەرکار (**مفعول به**)ە، یانی: ئەمە دروستکراوی خوایە پێشانم بدەن، ئەوانی دیکەی جیا لەو، چیان دروستکردوە؟ لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٣- ﴿ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥ ﴾، ئەو شەوە هەر ئاشتیی و سەلامەتییە، تاکو شەبەقی بەیانی، کە دەفەرموێ: ﴿ مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤ ﴾، تەنوینی (أمر) کە بە نەناسراو هاتوەو، تەنوینی خراوەتە سەر، تەنوینەکەی بۆ بە مەزنگرتن و، قەبەو گەورە پێشاندانە، یانی: هەر کارێکی گرنگ و گەورە.

کە دەفەرموێ: (سَلَٰمٌ هِيَ)، وشەی (سَلَٰمٌ)، (**مَصْدَرٌ أَوْ اسْمُ مَصْدَرٍ، بِمَعْنَى السَّلَامَةِ وَالخَيْرِ وَالتَّحِيَّةِ، وَتَنْكِيرُ السَّلامةِ للتَّعْظيم**)، (سَلَٰمٌ) چاوگە، یاخود ناوێکی چاوگە، بە مانای سەلامەتیی و چاکەو سڵاوکردن، بەو مانایانە هەموویان دێ، (سَلَٰمٌ)، بۆیە بە نەناسراو (**نَكِرة**) هاتوە، وەك گوترا: بۆ بە مەزنگرتنیەتی، پاشان کە فەرموویەتی: (سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥)، (**تَقْديمُ المُسْنَدِ وَهوَ سَلَامٌ، عَلَى المُسْنَدِ إِلَيْهِ، لِإِفَادَةِ الإِخْتِصَاصِ، أَي: مَا هِيَ إِلاَّ سَلَام**)، لە جیاتی بفەرموێ: (**هِيَ سَلامٌ**)، فەرموویەتی: (سَلَٰمٌ هِيَ)، پاڵدراو کە (سَلَٰمٌ)ە، پێش پاڵوەلادراو (**مُسْنَدٌ إِلَيْهِ**)

خراوە، تاكو تایبەتمەند بوون بگەیەنێ، واتە: ئەو شەوە تەنیا سەلامەتییە، (حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ﴿٥﴾)، (**غَايَةٌ لِمَا قَبْلَهُ، مِنْ قَوْلِهِ: تَنَزَّلُ المَلَائِكَةُ إلى: سَلَامٌ هِيَ**)، واتە: ئامانجی ئەوەی پێشەوەیەتی لە گوتراوی: [(**تَنَزَّلُ المَلَائِكَةُ**) هەتا (**سَلَامٌ هِيَ**)] دا، یانی: هەموو كاتەكانی ئەو شەوە بەدابەزینی فریشتەكان و ڕووح ئاوەدانن و، بە سەلامەتیی و لە خێرو خۆشیی پڕكراون.

واتە: ئەو شەوە هەمووی هەتا شەبەقی بەرەبەیان، هەر سەلامەتیی و، خێرو خۆشییەو، بەزەیی و میهرەبانیی خوای پەروەردگاری تێدا دەدرەوشێتەوە بۆ بەندەكان.

## کورتە باسێک لەبارەی شەوی قەدرەوە

خوا پشتیوان بێ ئەم کورتە باسە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:

**بڕگەی یەکەم: چەمك و واتای شەوی قەدر (لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ):**

(لَيْلَةُ) بە مانای یەك شەو دێ، (لَيْل) واتە: شەو، تاکەکەی بریتیە لە (لَيْلَةُ)و بە (لَيَالِ) کۆدەکرێتەوە، هەروەك چۆن (يَوْم)، بە (أَيَّام) کۆدەکرێتەوە، کەواتە: (لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ) شەوەکەی قەدر.

وشەی (ٱلْقَدْرِ)یش زانایان لێرەدا دوو واتایان بۆ هێناون:

١- (**القَدْرُ وَالتَّقْدِيرُ: تَبيينُ كَمِّيَّةِ الشَّيءِ يُقَالُ: قَدَرْتُهُ وَ قَدَّرْتُهُ**)، وشەی (**قَدَرْ**) و (**تَقْدير**)، بە مانای ڕوونکردنەوەی قەبارەو چەندێتیی شتێکە، دەگوترێ: (**قَدَرْتُهُ وَقَدَّرْتُهُ**) هەردووکیان، واتە: ئەندازەکەی و چەندێتییەکەیم دیارییکرد.

٢- (**القَدْرُ: الحُرْمَةُ وَالوَقَارُ يُقَال: لَهُ عِنْدِي قَدْرٌ أَيْ: حُرْمَةٌ وَوَقَار**)، ئەمە (**المُعْجَم الوَسيط**)، هێناویەتی، واتە: (**قَدْر**)، بە مانای ڕێزو حورمەت و، پێگەو پایە، دەگوترێ: فڵانکەس لە لای من قەدری هەیە، واتە: ڕێزو حورمەت و پێگەی هەیە.

ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ①﴾، ئێمە دامانبەزاندوە (قورئانمان دابەزاندوە)، لە شەوی قەدردا، یانی: لە شەوی ئەندازەگیریی کردندا، یاخود لە شەوی پڕ فەڕو ڕێزو حورمەت و قەدردا.

ئنجا وەك پێشتریش باسکرد زانایان دوو بۆچوونیان هەن لەبارەی دابەزینی قورئانەوە لە شەوی قەدردا:

**یەکەم:** ڕای ئیبنو عەبباسە (خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: (**أُنْزِلَ القُرْآنُ كُلُّهُ جُمْلَةً وَاحِدَةً فِي لَيْلَةِ القَدْرِ فِي رَمَضَانَ إِلى السَّمَاءِ الدُّنيا، فَكَانَ اللهُ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُحْدِثَ فِي الأَرْضِ شَيْئاً، أَنْزَلَهُ مِنْهُ حَتَّى جَمَعَهُ**) (**جامع البيان: ٣٧٨١٩، وقال المحقق: صَحيحٌ على شرط مسلم: ٣٧٨١٩**).

واتـە: قورئـان هەمـووی وێکـڕاو تێکـڕا لـە شـەوی قـەدر لـە مانگـی ڕەمەزانـدا (لەلایـەن خـوای پـەروەردگارەوە) بـۆ ئاسـمانی نیزیکـتر لـە ئێمـە دابەزێـنراوە، دوایـی خـوا ﷻ هـەر کاتێـك ویسـتبی کارێـك لەسـەر زەوی بـكات و ئەنجامبـدا، شـتێکی لـێ دابەزانـدوە، تاکـو هەمـوو قورئانـی کۆکردۆتـەوە (لـەدڵ و سـینەی پێغەمبـەردا ﷺو دوای ئەویـش لـە دڵ و سـینەی هاوەڵانیـدا، دوایـی لـە نێـو دوو توێـی دوو بەرگـدا کۆکراوەتـەوە).

**دووەم:** من ئەو ڕایەی دووەمم زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، **(الشَّعْبي)** دەڵێ: **(نَزَلَ القُرآنُ كُلُّهُ فِي لَيْلَةِ القَدْر) (جامع البيان: ٣٧٨٢٢)**، واتە: قورئان هەمووی لە شەوی قەدردا دابەزیوە، یانی: سەرەتاو دەستپێکی دابەزینی قورئان لە شەوی قەدردا بووە، ئەم دەقەش مورسەلە، واتە: یەکسەر زانایەکی جیلی شوێنکەوتووانی هاوەڵان (تابعين) هێناویەتی، بێ ئەوەی بەرزی بکاتەوە بۆ لای هاوەڵان.

پێـم وایـە ئـەو ڕایـەی دووەم ڕاسـترەو، ئـەوی دیکـە نادیـارو پەنهانـەو، پێویسـتیی بـە بەڵگەیـەك دەکات، هەرچەنـدە دەگونجـێ عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) ئـەوەی لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ بیسـتبێ، بـەڵام پاڵـی نەداوەتـە لای پێغەمبـەر ﷺو، خـۆی گوتوویـەتی، بـەڵام ڕایەکـەی دی کـە دەسـتپێکی دابەزینـی قورئـان لـە مانگـی ڕەمەزانـدا بـووەو لـە شـەوی قـەدردا بـووە، ئـەوە شـتێکی زانـراوو ڕوونـەو ئایەتەکـەی (القـدر)و ئایەتەکـەی (الدخان)یـش: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ٣ ﴾ **الدخـان**، بـە ئاشـکرا دەیگەیەنـن و دەقـن لەوبـارەوە کـە شـەوی قـەدر کاتـی دەسـتپێك و سـەرەتای دابەزینـی قورئانـە.

**بڕگەی دووەم: شەوی قەدر چ شەوێکەو لە چ مانگێکدا بووە؟**

لە حەوت (٧) خاڵدا وەڵامی ئەو پرسیارە دەدەینەوە:

١- بێگومان هاتنی وەحیی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لە چل و یەك (٤١) ەمین، ساڵی تەمەنیدا بووە بە ساڵی مانگیی، کە دەکاتە ساڵی (٦١٠)ی زایینی، چونکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە ساڵی (٥٧٠)ی زایینی دا لە دایك بووەو، ساڵی (٦١٠)ی زایینی دەستپێکی بۆ هاتنی وەحیی و سەرەتای بوونە پێغەمبەری بووە.

٢- ئەوەش دەقی قوڕئانە کە دابەزینی قوڕئان لە مانگی ڕەمەزاندا بووە، خوا ﷻ لە سووڕەتی (البَقرة)، ئایەتی (١٨٥)دا دەفەرمویّ: ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ١٨٥ ﴾، واتە: مانگی ڕەمەزان کە قوڕئانی تێدا دابەزێندراوە، ڕێنمایی بۆ خەڵك و بەڵگە ڕۆشنەکان لە ڕێنمایی و لە لێکجیاکردنەوە (ی هەق و ناهەق، حەڵاڵ و حەڕام، چاك و خراپ، ڕاست و چەوت).

٣- دەستپێکی هاتنی قوڕئانیش لە شەودا بووە، بەبەڵگەی ئەو ئایەتە موبارەکەی سووڕەتی (القدر): ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾القدر، هەروەها ئایەتەکانی (٣و ٥).

٤- لە سووڕەتی (الدخان)دا، کە خوا دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ٣ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ٤ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ٥ ﴾، واتە: ئێمە لە شەوێکی بەپیزدا دامانبەزاندوە {واتە: قوڕئانمان دابەزاندوە، چونکە پێشێ دەفەرمویّ: ﴿ حمٓ ١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢ ﴾، واتە: حا میم سوێند بە کتێبی ڕۆشن، [یاخود: ڕۆشنکەرەوە]، ئێمە وریاکەرەوەو ترسێنەرین، هەر کارێکی کار بەجێیانە لەوێدا ڕوون دەکرێتەوە، وەك فەرمانکارێك لەلایەن ئێمەوە، ئێمە خۆمان ڕەوانەکاربووین.

کەواتە: دەستپێکی دابەزینی وەحیی شەو بووە، هەم بەپێی دوو ئایەتەکەی سووڕەتی (الدخان): (٣و ٤)، هەم بەپێی ئایەتی یەکەمی سووڕەتی (القدر).

٤- ئنجا بە مسۆگەریی شەوی قەدریش لە مانگی ڕەمەزاندایە، چونکە خوا پێشتر دەفەرموێ: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ ﴿١٨٥﴾﴾البقرة، دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴿١﴾﴾القدر، هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ ﴿٣﴾﴾، کەواتە: ئەو شەوە بەپیزەو، ئەو شەوی قەدرە، لە مانگی ڕەمەزاندایە.

ئنجا ئەو شەوی قەدرەش لە دە (١٠) شەوەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندایە، بەپێی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێ: {**تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الوِتْرِ مِنَ العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِن رَمَضَانَ**} (**أخرجه أحمد: ٢٤٤٨٩، والبخاري: ١٩١٣، ومسلم: ١١٦٩، والترمذي: ٧٩٢، وقال: حديث حسن صحيح**) واتە: بۆ شەوی قەدر بگەڕێن لە دە شەوە تاکەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزان.

٥- پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لەڕۆژی دووشەممەدا لەدایك بووە، هەر لەو ڕۆژەشدا وەحیی بۆ هاتوە، واتە: لە بەیانی شەوەکەیدا، یاخود هەر لە شەوەکەیدا بەبەڵگەی ئەم دەقە:

{**عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صَوْمِ يَوْمِ الإِثْنَيْنِ؟ قَالَ: ذَاكَ يَوْمٌ وُلِدْتُ فِيهِ، وَيَوْمٌ بُعِثْتُ أَوْ أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهِ**} (**أخرجه أحمد: ٢٢٥٩٤، ومسلم: ١١٦٢، وأبو داود: ٢٤٢٦، وابن حبان: ٣٦٤٢، والحاكم: ٤١٧٩، وقال: صحيح على شرط الشيخين، والبيهقي في شعب الإيمان: ١٣٨٦**).

واتە: ئەبوو قەتادە (خوا لێی ڕازی بێ) یەکێکە لە هاوەڵان دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ڕۆژووگرتنی ڕۆژی دووشەممەوە پرسیاری لێکرا؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە ڕۆژێکە تێیدا لە دایك بووم و، ڕۆژێکیشە تێیدا ڕەوانکراوم، یاخود قورئانم تێیدا دابەزێنراوەتە سەر.

کەواتە: ئەو شەوەی قورئانی تێدا دابەزیوەو، بەیانییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕاوەتەوە بۆ لای خەدیجەی خێزانی و فەرموویەتی: (**زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي**)، داملپۆشن داملپۆشن، ڕۆژی دووشەممە بووە.

٦- بەپێی حیسابە گەردوونییەکان (**الحِسَابَاتُ الفَلَكِيَّة**)، دووشەممەکانی ڕەمەزانی ساڵی چل و یەك (٤١)ی تەمەنی پێغەمبەری خواﷺ، واتە: ئەو ساڵەی تێیدا کراوە بە پێغەمبەر، دەکەونە (٧)ی ڕەمەزان و (١٤)ی ڕەمەزان و (٢١)ی ڕەمەزان و (٢٨)ی ڕەمەزان.

ئنجا بە لەبەرچاوگرتنی خاڵە پێشووەکان کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: بۆ شەوی قەدر بگەڕێن لە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان دا، کەواتە حەوت و چواردە، کە لە نیوەی یەکەمی مانگی ڕەمەزاندان لێدەچنەدەر، دەمێننەوە، (٢١و ٢٨)، شەوی (٢٨)یشی لێ دەچێتەدەر لەبەر ئەوەی جووتەو، دەمێنێتەوە شەوی (٢١).

٧- کەواتە: شەوی بیست و یەك (٢١)ی ڕەمەزانی چل و یەك (٤١)ەمین ساڵی تەمەنی پێغەمبەری خوادا ﷺ، شەوی دابەزین و دەستپێکی هاتنی وەحیی بووە.

ئەوەی لێرەشدا گوتمان لە کتێبێکی خۆمدا بە ناوی (ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەرس و پەندەکانی)[1] هێناومانە.

## بڕگەی سێیەم: ئایا شەوی قەدر بەردەوامە، یان هەر شەوێك بووەو کۆتایی پێهاتوە؟

زانایان لەو بارەوە ڕاجیاییان هەیە، کەمێك گوتوویانە: شەوێك بووەو بڕاوەتەوە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان، ڕای بەردەوامیی ئەو شەوەیان هەیەو گوتوویانە:

شەوی قەدر لە هەموو ساڵەکاندا دووبارە دەبێتەوە، ئێمە لەو بارەوە وەك نموونەیەك لە قسەی ڕوونکەرەوانی قورئان ڕای (**مُحَمَّد الطَّاهر بن عاشور**)، دێنین لە تەفسیرەکەی خۆی (**التَّحرير وَالتَّنْوير**)دا[2]، کە دەقی قسەکانی بە عەرەبیی لەگەڵ تۆزێ کورتکردنەوەدا دێنم و، دوایی دەیکەم بە کوردیی، دەڵێ:

---

(١) بڕوانە: بەرگی یەکەم: لاپەڕە: (١٢٢-١٢٤)، چاپی چوارەم ٢٠٢٢ز.

(٢) ج١٢، الجزء: ٣٠، ص٤٦١.

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ﴿٢﴾ ﴾، پاشان دەفەرموێ: ﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ﴿٤﴾ ﴾، دواتر دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ﴿٥﴾ ﴾، ئنجا ئاوا ئەنجامگیریی لەو سێ ئایەتە دەکات و دەڵێ:

{مَا يَدُلُّ دَلاَلَةً بَيِّنَةً عَلَى أَنَّ اللهَ جَعَلَ مِثْلَ هَذِهِ الفَضِيلَةِ لِكُلِّ لَيْلَةٍ مِنْ لَيَالِي الأَعْوَامِ تَقَعُ فِي مِثْلِ اللَّيْلَةِ مِنْ شَهْرِ نُزُوْلِ القُرآنِ، كَرَامَةً لِلْقُرآنِ، وَلِمَنْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ، وَلِلدِّينِ الَّذي نَزَّلَ فِيه، وَلِلأُمَّةِ الَّتي تَتَّبِعُهُ، وَالتَّعْبِيرُ بِالفِعْلِ المُضَارِعِ بِقَوْلِه: (تَنَزَّلُ المَلائِكَةُ) مُؤْذِنٌ بِأَنَّ هَذا التَّنَزُّل مُتَكَرِّرٌ فِي المُسْتَقْبَلِ بَعْدَ نُزُولِ هَذِهِ السُّورَةِ. لاَ جَرَمَ أَنَّ لَيْلَةَ القَدْرِ الَّتي اِبْتُدِئَ فِيها نُزُوْلَ القُرآنِ، قَد اِنْقَضَتْ قَبْلَ أَنْ يَشْعُرَ بِهَا أَحَدٌ عَدَى مُحَمَّدٍ ﷺ، إِذْ كَانَ قَدْ تَحَنَّثَ فِيهَا، وَأُنْزِلَ عَلَيْهِ أَوَّلُ القُرْآنِ آخِرَهَا، وَانْقَلَبَ إِلَى أَهْلِهِ فِي صَبِيحَتِهَا، فَلَوْلاَ إِرَادَةُ التَّعْرِيفِ بِفَضْلِ اللَّيَالِي المُوَافِقَةِ فِي كُلِّ السَّنَواتِ، لاَقْتَصَرَ عَلى بَيَانِ فَضْلِ تِلْكَ اللَّيْلَةِ الأُولى، وَلَما كَانَتْ حَاجَةٌ إِلَى تَنَزُّلِ المَلاَئِكَةِ فِيهَا، وَلاَ إِلَى تَعيِينِ مُنْتَهَاهَا}.

**(ابن عاشور)** دەڵێ: ئەم سێ ڕستە ئایەتە موبارەکە:

**یەکەم:** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ﴿٢﴾ ﴾، چی بەتۆی زانادوە شەوی قەدر چییە؟

**دووەم:** ﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ﴿٤﴾ ﴾ کە بە کرداری ئێستاو بەردەوام (مُضارِع)، هێناویەتی ( تَنَزَّلُ )، یانی: (تَتَنَزَّلُ)، فریشتەکان و ڕووح لەوێدا (لەو شەوەدا) دادەبەزن بۆ هەرکارێك بە فەرمانی پەروەردگارت.

**سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ﴿٥﴾ ﴾، ئەو شەوە هەر خێرو خۆشیی و ئاشتیی و سەلامەتییە تاکو سپێدەی بەیانی، تاکو شەبەقی بەیانی.

زۆر بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنن کە خوا ﷻ لە وێنەی ئەو شەوەدا، لە هەموو شەوەکانی ساڵاندا، کە ئەو شەوەیان تێدا دێ، لە مانگی (ڕەمەزان)، دابەزینی قورئاندا، ئەو چاکیی و پلە بەرزییە هەیە، ئەمەش وەك ڕێزگرتن لە

قورئان، هەروەها ڕێزگرتن لەو کەسەی قورئانی دابەزێندراوەتە سەر، هەروەها بۆ ئەو ئایین و بەرنامەیەش کە لە قورئاندا دابەزێنراوە، (کە ئیسلامە)و، بۆ ئەو ئۆممەتەش کە شوێن ئەو قورئانە دەکەوێ، {کە ئۆممەتی ئیسلامەو ئۆممەتی پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ}، دەربڕینی ئەوەش بە کرداری ئێستا بە (**فعل المضارع**)، کە دەفەرموێ: ﴿ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ ﴾، گەیەنەری ئەوەیە کە ئەو دابەزینەی فریشتەکان، دووبارە دەبێتەوە لە داهاتوودا، دوای دابەزینی ئەو سوورەتە موبارەکەش.

بێگومان شەوی قەدر کە دابەزێنرانی قورئانی تێدا دەستپێکراوە، تێپەڕیوە، بەر لەوەی هیچکەس هەستی پێ بکات، جگە لە موحەممەد ﷺ کە لەو شەوەدا خواپەرستیی کردوە لە ئەشکەوتی حیراداو، سەرەتای قورئانی لە کۆتایی ئەو شەوەدا دابەزێنرایە سەرو، لە بەیانی ئەو شەوەدا گەڕایەوە بۆ لای خێزانی، ئنجا ئەگەر مەبەست ئەوە نەبووایە کە چاکیی و گەورەیی ئەو شەوانە لە هەموو ساڵەکاندایە کە دەکەونە بەرانبەر ئەو شەوە، ئەو کاتە پێویستیی بەوە نەدەکرد فریشتەکانی تێدا دابەزن، هەروەها کۆتاییەکەی دیاریی بکرێ.

بەڕاستیی بەڵگەکەشی بەهێزەو، بێگومان تێوەڕامانی سوورەتی (**القدر**)، وەك (**ابن عاشور**) کردوویەتی، زۆر جوان پێمان دەڵێ: کە ئەوە باسی ڕابردوو و، ئێستاو، داهاتووشە، نەك باسی شتێكی ڕابردووبێ و بڕابێتەوە.

### بڕگەی چوارەم: حیکمەتی شێردرانەوەی شەوی قەدر چییە؟

زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوە، چونکە شەوی قەدر تەنانەت لە پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ پەنهان بووەو، لەو بارەوەش فەرمووده زۆرن، لە یەکێك لە فەرمایشتەکاندا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: زانیم شەوی قەدر کامەیە، بەڵام دوایی لە بیرم چۆوە، یاخود دوو پیاو شەڕە قسەیان دەکرد بەهۆی ئەوەوە لەبیرم چۆوە[1]، یان هۆکارێکی دیکەی باسکرد، کە بووە

---

(١) {عن أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه، قَالَ: اعْتَكَفْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ،

هـۆی لەبیـر چوونـەوەی، گرنـگ ئەوەیـە پێغەمبەریـش ﷺ دڵنیـا نەبووە کام شـەوەیە.

بەڕای زۆربەی زانایان و منیش ئەوەم پێ ڕاستە:

حیکمەتەکـەی بریتیـە لـە هەوڵدانـی مسـوڵمانان بـۆ خواپەرسـتیی بـاش لـە شـەوانی زۆردا، چونکـە هەندێـك لـە زانایـان دەڵێـن: بـە مسـۆگەریی و دڵنیایـی شـەوی قـەدر لـە هەمـوو مانگـی ڕەمەزاندایـە، بۆیـە هەندێکیـان هـەر لـە سـەرەتای ڕەمەزانـەوە خواپەرسـتیی جیددیـی و چـاك دەکـەن، هەتـا کۆتایـی کـە هـەر چـۆن بـێ شـەوی قـەدر هـەر دەگرێتـەوە، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆریـان گوتوویانـە: لـە دە شـەوەکانی کۆتایـی مانگـی ڕەمـەزان دایـەو، لەوانیـش لـە تاکەکاندایـە، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی دیتنـی مانگـی یـەك شـەوە، ڕاجیایـی تێـدا دەبـێ، بۆیـە ئەگـەر مـرۆڤ بیەوێ بەمسـۆگەریی لـە دە شـەوەکانی کۆتایـی دا شـەوی قـەدر (لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ) ببینـێ و، بزانێ و خواپەرسـتیی باشـتری ئـەو شـەوەی بـە نسـیب بـێ، دەبـێ لەهـەر دە شـەوەکان دا بـە جیددیـی خواپەرسـتیی بـکات، ئەوکاتـەش هەرچـۆن بـێ، ئـەو شـەوەی هـەر بـە قسـمەت دەبـێ.

ئنجـا وەك چـۆن خـوا ﷻ ئـەو سـەعاتەی لـە ڕۆژی جومعـەدا، پاڕانـەوەی تێـدا گیرا دەکات، شـاردوویەتەوە، بـۆ ئـەوەی لـە هەمـوو ڕۆژەکـەدا مسـوڵمانان بپاڕێنـەوە لـە خـوای بەخشـەرو پـەروەردگارو، بـە جیددیـی داوای لـێ بکـەن و، ئەگـەر لـە هەمـوو سـەعاتەکانی ڕۆژی جومعـەدا داوا لـە خـوا بکـرێ، هەرچـۆن بـێ ئـەو سـەعاتە هـەر دەگرێتەوە.

---

فَخَـرَجَ صَبِيحَـةَ عِشْرِيـنَ، فَخَطَبَنـا، وَقَـالَ: إِنِّي أُرِيـتُ لَيْلَـةَ الْقَـدْرِ ثُـمَّ أُنْسِـيتُهَا أَوْ نُسِّـيتُهَا، فَالْتَمِسُـوهَا فِي الْعَـشْرِ الأَوَاخِـرِ فِي الْوِتْـرِ، وَإِنِّي رَأَيْـتُ أَنِّي أَسْجُدُ فِي مَـاءٍ وَطِـينٍ، فَمَـنْ كَانَ اعْتَكَـفَ مَـعَ رَسُـولِ اللـهِ ﷺ، فَلْيَرْجِـعْ فَرَجَعْنَـا وَمَـا نَـرَى فِي السَّـمَاءِ قَزَعَـةً؛ فَجَـاءَتْ سَـحَابَةٌ فَمَطَـرَتْ حَتَّـى سَـالَ سَـقْفُ المَسْجِدِ، وَكَانَ مِـنْ جَرِيـدِ النَّخْـلِ، وَأُقِيمَـتِ الصَّـلاَةُ، فَرَأَيْـتُ رَسُـولَ اللـهِ ﷺ يَسْـجُدُ فِي الْـمَاءِ وَالطِّينِ، حَتَّـى رَأَيْـتُ أَثَـرَ الطِّينِ فِي جَبْهَتِـهِ} (أخرجـه البخـاري برقـم: ١٩٣١).

**بڕگەی پێنجەم: ئایا هەر کەس پێی وابوو ئەو شەوە شەوی قەدرە، چی بڵێ باشەو چۆن بپاڕێتەوە؟**

لەو بارەشەوە ئەم دەقە دێنین:

{عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُول اللَّهِ ﷺ أَرَأَيْتَ إِنْ وَافَقْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، مَا أَدْعُو؟ قَالَ: تَقُولِينَ، اللَّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ الْعَفْوَ فَاعْفُ عَنِّي} (أخرجه الترمذي: ٣٥١٣، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٣٨٥٠، والحاكم: ١٩٤٢).

واتە: عائیشە رضي الله عنها دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەگەر شەوی قەدرم بینی، چ دوعایەك بكەم؟ ئەویش فەرمووی: بڵێ: ئەی خوایە! تۆ لێبوردەی و لێبوردنت خۆشدەوێ، لێم ببوورەو چاوپۆشییم لێ بكە.

**بڕگەی شەشەم: گەورەیی شەوی قەدر بۆ خواپەرستیی:**

لەوبارەوەش بەڵگە زۆرن، بەڵام ئێمە بەم دەقە وازدێنین، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: {مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ} (أخرجه أحمد: ٨٥٥٩، والبخاري: ١٨٠٢، وأبو داود: ١٣٧٢، والترمذي: ٦٨٣، والنسائي: ٥٠٢٧، وابن حبان: ٣٦٨٢. وأخرجه أيضًا: مسلم: ٧٦٠).

واتە: هەر كەسێك لە شەوی قەدردا هەڵسێتەوەو خواپەرستیی بكات بەبڕوا پێبوونەوەو بە چاوەڕێكردنی پاداشتەوە لە لای خوا، (بەحیساب كردنی پاداشتەكەی لەلای خوا)، لە هەرچی گوناهی ڕابردوویەتی لێی دەبووردرێ، (و خوا پاكی دەكاتەوە).

**بڕگەی حەوتەم: ئایا دەتوانین بە دڵنیایی بڵێین: شەوی قەدر كامەیە؟**

هەرچەندە باسمانكرد، كە ئەو شەوی قەدرەی دەكاتە بیست و یەك (٢١)ی ڕەمەزانی چل و یەكەمین ساڵی تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ، كە ڕۆژی دووشەممە دەگرێتەوە، ئەو ڕۆژەی تێیدا لەدایك بووە، بەدەقی فەرموودەی خۆی و، هەر

لەو شەوو ڕۆژەشدا وەحیی و سرووشی بۆ هاتوە بۆ یەکەمجار، وەك دەستپێکی دابەزینی قورئان ئەو شەوە بووە (٢١)ی مانگ ڕەمەزان بەڕای زۆربەی زانایان.

بەڵام ئایا بۆ ئێمەومانان شەوی قەدر چ شەوێکە؟ ئایا دەتوانین دیاریی بکەین؟ لەو بارەوە ئێمە سێ دەقی فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە تیشکی زیاترمان بۆ دەخەنە سەر دیارییکردنی ئەو شەوەو دواییش لەوبارەوە ڕای خۆمان دێنین:

١- پێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەرموویەتی: {**الْتَمِسُوهَا فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِن رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى**} (**أخرجه أحمد: ٢٥٢٠، والبخاري: ١٩١٧، وأبو داود: ١٣٨١**). واتە: بۆی بگەڕێن بۆ شەوی قەدر، لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزاندا لە شەوێکدا نۆ شەو ماون، (واتە: شەوی بیست و یەك)و، لە شەوێکدا حەوت شەو ماون، (شەوی بیست و سێ)و، لە شەوێکدا پێنج شەو ماون، (کە دەکاتە شەوی بیست و پێنج)، واتە: (٢١ و ٢٣ و ٢٥).

٢- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ كَانَ مُتَحَرِّيَهَا فَلْيَتَحَرَّهَا لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ**} (**أخرجه مسلم: ١١٦٥**)، واتە: هەر کەسێك لێی دەخەفتێ و، دەگەڕێ بۆ شەوی قەدر، با لە شەوی بیست و حەوتدا بۆی بخەفتێ، واتە: با بخەفتێ شەوی بیست و حەوت بێ.

هەڵبەتە زۆرێك لە زانایان ڕایان وابووە شەو قەدر شەوی بیست و حەوت (٢٧)ە، بەڵام شەوەکانی دیکەش هەر ڕای زانایانیان لەسەرن.

٣- پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی یەکێك لە هاوەڵان لە شەوی بیست و سێی ڕەمەزاندا، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! پێم وابوو ئەم شەو (واتە: شەوی بیست و سێ) شەوی قەدر بوو، هەروەها ژمارەیەك لە هاوەڵان وایان پێگوتوە، بۆیە ئەویش فەرمووی: { **أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ عَلَى ثَلاَث وَعِشْرِين فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يَقُومَ مِنَ الشَّهْرِ شَيْئًا فَلْيَقُم لَيْلَة ثَلاَث وَعِشْرِين**} (**أخرجه أحمد: ٤٥٤٧، والبخاري: ١١٠٥، ومسلم: ١١٦٥**)، واتە: وەك دەبینم خەونەکانتان لەسەر شەوی بیست و سێ دەکەونەوە سەر یەك، بۆیە هەر

کەسێك دەیەوێ لەو مانگەدا لە شەوێکیدا هەڵسێتەوەو خواپەرستیی بکات، با شەوی بیست و سێ هەڵسێتەوە.

هەڵبەتـە فەرمـوودەی دیکـەی پێغەمبەریـش ﷺ هەیـە باسـی شـەوی بیسـت و پێنـج دەکات و، فەرمـوودەی دیکـە هەیـە باسـی شـەوی بیسـت و چواریـش، دەکات کـە تاکیـش نیـە.

هەروەهـا لـە دەقێـکدا کـە لـە صەحیحـی موسـلیمدا هاتـوە یەکێـك لـە هـاوەڵان دەڵـێ: سـوێندی لەسـەر دەخـۆم: شـەوی قـەدر شـەوی بیسـت و حەوتـە، بـەڵام زانایـان بـە گشـتیی گوتوویانـە: دیـار نیـە و، لـە نێـوان بیسـت و یـەك تاکـو بیسـت و نۆیـە لـە دە شـەوە تاکەکانـدا، لـە دە شـەوی کۆتایـی هـەر مانگێکـی ڕەمەزانـدا.

ئنجا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش:

بێگومـان خڕۆکـەی زەوی کـە ئێمـە لەسـەرینی، هەمیشـە نیـوەی شـەوەو نیـوەی ڕۆژە، بـۆ وێنـە ئـەو کاتـەی لێـرە -لـەم ناوچانـەی ئێمە کـە پێیـان دەگوتـرێ ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتـی نێوەڕاسـت لـە ڕووی جوگرافییـەوە- ئەوکاتـەی لێـرە شـەوە، لـە ئەمریـکاو ئوسـتوڕاڵیا، ڕۆژە، ئنجـا لـە کاتێـکدا شـەوی قـەدرە لـە لای ئێمـە، ئنجا ئەگـەر شـەوی (٢١)ە، ئەگـەر (٢٣)یـە، ئەگـەر (٢٥)ە، ئەگـەر (٢٧)ە، ئەگـەر (٢٩)یـە، لـەلای ئـەوان ڕۆژە، ئایـا ئـەوان چـۆن شـەوی قەدریـان دەبـێ، هەروەهـا کاتێـك لـە لای ئـەوان شـەوە، لـە لای ئێمـە بۆتـە ڕۆژ؟

وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە شـەوی قـەدر لـە مـاوەی بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعاتدا هەمـوو گـۆی زەوی دەکات، چونکـە خڕۆکـەی زەوی لـە مـاوەی (٢٤) سـەعاتدا، شـەو بەسـەر هەموویـدا دابـەش دەبـێ، ئـەو شـەوی قـەدرەی لـە لای ئێمـەوە دەسـت پێـدەکات و، لـە لای ئوسـتوڕالیی و ئەمریکییـەکان کۆتایـی دێ، هـەر هەمـان شـەوە، چونکـە بێگومـان لـە هـەر (٢٤) سـەعاتدا گـۆی زەوی، خڕۆکـەی زەوی، نیـوەی دەبێتـە شـەوو، نیـوەی دەبێتـە ڕۆژ، یانـی: ئـەو شـوێنەی ڕۆژ بـووە دەبێتـە شـەوو، ئـەو

شـوێنەی شـەو بـووە دەبێتـە ڕۆژ، چونکـە وەك خـوا فەرموویەتـی: ﴿ يُكَوِّرُ ٱلَّيْلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيْلِ ۝٥ ﴾الزمـر، واتـە: شـەوگار بەدەوری ڕۆژگاردا دەپێچـێ و، ڕۆژگاریـش بـەدەوری شـەوگاردا دەپێچـێ.

ئەمـەش ڕێـك باسـی ئەوەیـە کـە زەوی خڕۆکەیـی هەڵکەوتـووەو، شـەو بـەو شـوێنەدا دەپێچـرێ کـە پێشـێ ڕۆژی لێبـووە، هەروەهـا دوایـی ڕۆژیـش دێتـە ئـەو شـوێنەی پێشـتر شـەوی لێبـووە، شـەوو ڕۆژ بـەردەوام بـەدوای یـەك دەکـەون، وەك خـوای پەنهانـزان لـە سـوورەتی (**الأعـراف**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا ۝٥٤ ﴾ واتـە: بـە شـەوگار ڕۆژگار دادەپۆشـێ بەخێرایـی شـوێنی دەکـەوێ، زۆرجاریـش باسـمانکردوە، ئێسـتاش زانسـتی گەردووناسـیی لـەلای بۆتـە شـتێکی زۆر ڕوون کـە زەوی لـە هـەر خولەکێکـدا دەوری (٣٠کـم) بـە دەوری خۆیـدا دەبـڕێ، واتـە: لـە سـووڕانەوەی بـە دەوری خۆیـدا لـە هـەر خولەکێکـدا (٣٠کـم) دەڕوا.

بـەڵام لـە سـووڕانەوەی بەدەوری خـۆردا، لەهـەر چرکەیەکـدا (٣٠کـم) دەڕوا، واتە: خێرایـی سـووڕانەوەی زەوی بـەدەوری خـۆردا، شەسـت (٦٠) هێنـدەی سـووڕانەوەی بـەدەوری خۆیدایە.

کەواتـە: شـەوو ڕۆژ بـەردەوام بـەدوای یەکدادێـن و، ئـەو کاتـەی لێـرە شـەوە، لەشـوێنێکی دیکـە ڕۆژە، بـەڵام لـە مـاوەی بیسـت و چـوار(٢٤) سـەعاتدا، شـەوگار هەمـوو گـۆی زەوی دادەپۆشـێ و، ڕۆژگاریـش بەهەمـان شـێوە.

کۆتا قسەش کە لەوبارەوە بەباشی دەزانم بیڵێم ئەوەیە:

بێگومـان خـوا ﷻ قورئانـی دابەزانـدووەو، کۆتایـی پێغەمبـەران موحەممـەد ﷺو سـەروەری پێغەمبەرانـی نـاردوە بـۆ تێکـڕای مرۆڤایەتیـی لـە هەمـوو سـەر خڕۆکـەی زەوی، ئنجـا لـە هەمـوو کاتـەکانی شـەوگارو ڕۆژگاردا، دەبـێ شـوێن قورئـان بکەویـن و، دوای پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بکەویـن، بـەڵام خـوای پـەروەردگار هەندێـك کات و هەندێـك شـوێنی کـردوون بەوێسـتگەیەکی تایبـەت، بـۆ وێنـە:

لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە کـە نوێژێـك لـە مزگەوتـی حەڕامـی دەوری کەعبـە بـە سـەد هـەزار (١٠٠٠٠٠) نوێـژە، واتـە: پاداشـتەکەی و خێرەکـەی زیاتـرە لـە هـی (١٠٠٠٠٠) نوێـژ.

هەروەهـا نوێژێـك لـە مزگـەوتی پێغەمبـەردا ﷺ بـە هـەزار (١٠٠٠) نوێـژە، واتـە: پاداشـتەکەی بەقـەدەر هـی (١٠٠٠) نوێـژەو، نوێژێـك لـە مزگـەوتی ئەقصـا لـە قـودس بـە پێنجسـەد (٥٠٠) نوێـژە[1].

هەڵبەتـە مانـای وانیـە کـە تـۆ نوێژێکـت لـە مزگـەوتی حـەڕام دا کـرد، کەلێنـی (١٠٠٠٠٠) نوێـژت بـۆ بگـرێ، نـا، بـەڵام پاداشـتی بـە ئەنـدازەی هـی (١٠٠٠٠٠)، نوێـژە، هـی مزگـەوتی پێغەمبەریـش پاداشـتەکەی بـە ئەنـدازەی (١٠٠٠)و، مزگـەوتی ئەقصـاش بـە ئەنـدازەی هـی (٥٠٠) نوێـژە، ئەمـە لـەڕووی جوگرافیـی و شـوێنەوە.

لـە ڕووی کاتـەوەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە بـارەی ڕۆژی جومعـەوە فەرموویەتی: گـەورەی ڕۆژەکانی هەفتەیە[2].

لەبارەی مانگی ڕەمەزانەوەش دیارە کە گەورەی مانگەکانی ساڵە.

لە نێو شەوەکانیش دا، ئەو دە شەوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، گەورەترو پاداشتدارترن.

هەروەها لە ڕۆژەکانی ساڵ دا دە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی (**ذي الحِجَّة**).

هەروەها ڕۆژی وەستان لە عەرەفات لە حەج دا ڕۆژێکی یەکجار بەرزو ناوازەیە.

---

(١) {صـلاة في المسـجد الحـرام مائـة ألـف صـلاة وصـلاة، في مسـجدي ألـف صـلاة، وصـلاة في بيـت المقـدس خمسـمائة صـلاة} أخرجـه أحمـد: ١٤٧٣٥، وابـن ماجـه: ١٤٠٦، قـال البوصـيري: هـذا إسـناد صحيـح رجالـه ثقـات، والطحـاوي (١٢٧/٣)، شـطر الأول رواه البخـاري في صحيحـه { صَـلاَةٌ فِي مَسْـجِدِي هـذَا خَـيْرٌ مِـنْ أَلْـفِ صَـلاَةٍ فِيـمَا سِـوَاهُ، إِلاَّ الْمَسْـجِدَ الْحَـرَامَ } برقـم: ١١٣٣.

(٢) { أفضـل الأيـام عنـد اللـه يـوم الجمعـة } أخرجـه البيهقـي في شـعب الإيمـان: ٣٧٦٠، قـال المنـاوي (٢٨/٢): إسـناده حسن.

ئەمانـە چەنـد وێسـتگەیەکی تایبەتـن، بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ لـەو وێسـتگانەدا زیاتـر خـۆی مانـدوو بـکات و زیاتـر هەوڵبـدات.

ئنجـا خـواش ﷻ زانـاو کاربەجێیـە، هەندێـك شـوێن و هەندێـك کات و، هەندێـك بۆنـەی زیاتـر گرنگیـی پێـداون، کـە ئەگـەر مـرۆڤ لـەو کات و بۆنـەو شـوێنانەدا زیاتر هەوڵبـدات، پاداشـتی زیاتـری هەیـە، یەکێـك لەوانـەش بریتیـە لـە شـەوی قـەدرو، شـەوی قەدریـش لـە مانگـی ڕەمەزاندایـە بـە مسـۆگەریی و، بـەڕای زۆر زاڵتریـش لـە دە شـەوەکانی کۆتایـی دایـەو، لـە دە شەوەکانیشـدا لـە تاکـەکان دایـە.

کەواتە: دەبێ وریابین! خواپەرستیی و دینداریی و مسـوڵمانەتیی، هەمووی خوڵاسـە نەکەینـەوە لـە مانگـی ڕەمەزانـدا، ئنجـا لەوێشـدا بگەڕێیـن بـۆ شـەوی قـەدر! نـا مانگی ڕەمـەزان هەمـووی بەرێـزە، دەبـێ هەمـووی بە خواپەرسـتیی ئـاوەدان بکرێتـەوە، دەبێ لـە هەموویـدا بەڕۆژووبیـن و، لـە هەمـوو شـەوەکانیدا شـەو نوێـژ بکەیـن، تەراویـح بکەیـن، هەروەهـا لـە مانگەکانـی سـاڵدا هەموویـان ڕۆژەکان و شـەوەکان تێکـڕا، بـەڵام هەندێـك کات و هەندێـك شـوێن و، هەندێـك بۆنـە، خـوای پـەروەردگار قـەدری زیاتـری پێـداون و، پاداشـتی کـردەوەکان لـەو شـەوو ڕۆژانـەدا زیاتـرە، هـەروەك لـەکاتی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الفَجـر**)دا، کـە خـوای بـەرز دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾ ﴾، سـوێند بـەکاتی بەرەبەیـان و، سـوێند بـە دە شـەوەکان، ئـەو فەرمایشـتەی پێغەمبەرمـان ﷺ هێنـا، کـە فەرموویەتـی: {**مَـا مِـنْ أَيَّـامٍ الْعَمَـلُ الصَّالِـحُ فِيهِـنَّ أَحَـبُّ إِلَى اللَّـهِ مِـنْ هَـذِهِ الْأَيَّـامِ الْعَشْرِ**} (**أخرجـه الترمـذي: ٧٥٧، وقـال: حسـن صحيـح غريـب، وابـن ماجـه: ١٧٢٧، وابـن حبـان: ٣٢٤، وابـن خزيمـة: ٢٨٦٥، وغيرهـم**).

واتـە: هیـچ ڕۆژانێـك نیـن کـردەوەی بـاش تێیانـدا لـە لای خـوا خۆشەویسـتتر بـێ لـە دە ڕۆژەکانی سـەرەتای مانگـی (**ذي الحِجَّـة**).

ئەویـش بـۆ ئەوەیـە کـە مـرۆڤ لـەو کاتانـەدا، زیاتـر هەوڵبـدات و زیاتـر خـۆی بـە چاکـەو خواپەرسـتییەوە خەریـك بـکات، نـەك تەنیـا دینداریـی و مسـوڵمانەتیی

لەو شەوو ڕۆژانەدا، یاخود لەو کات و بۆنانەدا ببینێ، چونکە ئیسلام بەرنامەی هەموو کات و تێکڕای شەوو ڕۆژەکانەو، هی هەموو شوێنەکانە، نەك تەنیا هی بۆنەو موناسەبەکان و چەند کات و شوێنێکی تایبەت و دیارییکراو.

ڕای بەندە لە بارەی شەوی قەدرەوە:

پێم وایە دەگونجێ شەوی قەدر لە یەك شەوی تایبەتدا نەبێ، لە دە شەوەکانی کۆتایی و لە تاکەکان یش، بەڵکو دەگونجێ ساڵێکیان بکەوێتە شەوی بیست و یەك (٢١)و، ساڵەکانی دیکەش شەوەکانی:

(٢٣ و ٢٥ و ٢٧)، دەشگونجێ -بەپێی هەندێ لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ- بشکەوێتە شەوە جووتەکانیشەوە، چونکە لە فەرمایشتێکدا هاتوە کە فەرموویەتی لە شەوی بیست و چوار (٢٤)دا یە، بەڵام ڕواڵەتی فەرموودەکان زیاتر ئەوە دەگەیەنێ کە لە تاکەکانی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندایەو، ڕەنگە لەو دە شەوانەشدا بێت و بچێ، زانیاریی ئەوەش تەنیا لە لای خوای زاناو شارەزایە و، تەنانەت پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ لێی دڵنیا نەبووە، بەڵێ، پێشانی دراوە، بەڵام دوایی لەبیری چۆتەوە، بۆ ئەوەی بۆ ئۆممەتەکەشی هەموو شەوەکان، شەوی هەوڵ و تێکۆشان و خۆ تێدا ماندووکردن بن.

لێرەش دا کۆتایی بەم کورتە باسەمان و کۆتایی بە تەفسیرکردنی سوورەتی **(القدر)**یش دێنین.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی یارمەتییمان بدات، کە مانگی ڕەمەزان بە گشتیی و، بە گشتییتر هەموو مانگەکان و، هەموو شەوو ڕۆژەکانی ساڵ، ئاوەدان بکەینەوە، بە خواپەرستیی، بە تاعەت و بۆ خوا صوڵحان، تاکو کە دەچینەوە خزمەت خوا، بەدەستی پڕو بە توێشووی چاك بچینەوە خزمەتی، هەروەها بەسەری بەرزو ڕووی گەشەوە بچینەوە خزمەت خۆی و پێغەمبەرەکەی ﷺ.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٨)ی مانگـی (**ذي الحجـة**) {واتـە: مانگـی (١٢)}ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبـەر: (٨)ی (٨)ی سـاڵی (٢٠٢٠)ی زایینـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێـزەکانی سـوورەتی (**البَيِّنَـة**)، سـەرەتاش لـە حـەوت بڕگـەدا پێناسـەی دەکەیـن:

## پێناسەی سووڕەتی (البينة)و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سووڕەته:

نـاوی باوتـری ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە بریتیـە لـە (**سُـورَة البَيِّنَـة**)، بـەڵام وێـڕای ئـەم نـاوە کـە لـە هەموویـان باوتـرە، پێنـج نـاوی دیکـەشی بـۆ بەکارهێـنراون:

١- (**سُورَةُ لَمْ يَكُن**).
٢- (**سُورَةُ القَيِّمَة**).
٣- (**سُورَةُ أَهْلِ الكِتاب**).
٤- (**سُورَةُ البريَّة**).
٥- (**سُورَةُ الإِنْفِكَاك**).

### ٢)- کات و شوێنی دابەزینی:

ڕاجیایـی زۆر لـەو بـارەوە هەیـە، بەشـێك لـە زانایـان گوتوویانـە: زۆربـەی زانایـان گوتوویانـە: ئـەم سـووڕەتە مەدینەییـە، لـە بەرانبەریشـدا بەشـێکی دیکـە گوتوویانـە:

زۆربەی زانایان گوتوویانە: ئەم سوورەتە مەککەیە، بەڵام ڕای مەدینەیی بوونی بەهێزترە، لەو بارەشەوە ئەم دەقە هەیە: (**عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ عَبَّاسٍ** ﵄ **قَال: نَزَلَتْ سُورَةُ لَمْ يَكُنْ بِالـمَدينَة**) (**أخرجه السيوطي في الدرّ المَنثور**: ج٨، ص٥٨٥، **وَنَسَبَهُ لابْنِ مَرْدَوَيه، وَقَال: وَأَخْرَجَ ابن مَرْدَوَيه عَن عائِشَةَ رضي الله عنها، قالَت: نَزَلَتْ سُورةُ** (لَمۡ يَكُنِ)، **بِمكّة**).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄ گوتوویەتی: ئەم سوورەتە لە مەدینە دابەزیوە، (**ابن مَرْدَوَيه**) گێڕدراوەیەکیشی لە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هێناوە گوتوویەتی: ئەم سوورەتە لە مەککە دابەزیوە.

## ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەفدا و دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە موصحەف دا ژمارە (٩٨)ەو، لە دابەزینیشدا ژمارە (١٠١)ە، پێش سوورەتی (**الحَشْر**) و دوای سوورەتی (**الطَّلاق**) دابەزیوە، واتە: ئەم سوورەتە دوای جەنگی بەنوو ننەزیر دابەزیوە، ئەوانیش تیرەیەك بوون لە جوولەکەکان لە دەوروبەری مەدینەو، دوای ئەو جەنگەش سەرەنجام بەنوو ننەزیر وەدەرنران، چونکە خاوەنی غەدرو پەیمانشکێنیی بوون، ئەویش لە ساڵی چوارەمی کۆچییدا بووە، مانای وایە ئەم سوورەتە موبارەکە یان لە کۆتایی ساڵی سێیەم، یاخود لە سەرەتای ساڵی چوارەمی کۆچییدا دابەزیوە.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئایەتەکانی ئەم سوورەتەیان بە هەشت (٨) ئایەت داناون، بەڵام زانایانی بەصرا بە (٩) ئایەتیان داناون و، زیاتریش ژمارە هەشت تەبەنیی کراوە.

## ٥)- نێوەڕۆکی:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە بـاسی بێبڕوایـان دەکات، هـەم لـە خـاوەن کتێبان، کـە کتێبی خوایـی و ئاسـمانییان پێـدراوەو، جوولەکـە و نەصرانییـەکان لـە پێشـەوەیانن، هەروەهـا صابیئـەو مەجـووس و، هەمـوو ئەوانـەی لافی ئـەوە لێـدەدەن کتێبـی ئاسـمانییان لەبـەر دەسـت دایـە، ئەوانیـش هـەر بە خـاوەن کتێـب دادەنرێن، هەروەهـا هاوبەشـدانەران، چ خـاوەن کتێبـەکان، چ هاوبـەش دانـەران هەموویـان بێبڕوابـوون و، بەبێ هاتنـی بەڵگەی ڕۆشـن، کـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ بـووە، دەسـتبەرداری ئـەوە نەدەبـوون کـە لەسـەری بـوون، لـە بتپەرسـتیی، بـە نسـبەت هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانەوەو، لـە ئایینـی تێکدراو شـێوێنراوی خۆیـان، بەنسـبەت خـاوەن کتێبەکانـەوە، کەچـی دوای هاتـن و ناسـینی واتە: هاتنـی بەڵگـەی ڕۆشـن کـە موحەممـەدە ﷺو، پـێ ئاشـنا بوونیـشی، کتێـب پێـدراوەکان لـە دەوری پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ پـرژان، جگـە لـە کەمێکیـان، هەرچەنـدە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ جگـە لـە بـە سـاغیی خواپەرسـتن و، نوێـژ ئەنجامـدان و زەکاتدان و، بـە پاکیی و بەسـاغیی بـەرەو لای خـواو هـەق گەڕانـەوە، هیـچ شـتێکی دیکـەی پـێ نەدەگوتـن، سـەرەنجامی بێبڕوایانیـش بـە هـەردوو جۆرەکانیانـەوە، ئەوانـەی کتێبیـان پێـدراوەو، هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانیـش، دۆزەخـەو، ئـەوان خراپتریـن دروسـتکراوی خـوان، بڕوادارانیـش جێیـان باخـە هەمیشـەییەکانە، کـە ڕووباریـان بـە ژێـردا دەڕۆن، ئەوانیـش باشـترین دروسـتکراوی خـوان، خـوا لێیـان ڕازییـەو ڕازییشـیان دەکات.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

چوار تایبەتمەندییمان لەم سووڕەتەدا ڕەچاو کردوون:

١- باسکردنی دەستبەردار نەبوونی بێبڕوایان لە ڕێچکەو بەرنامەکانیان، بەبێ هاتنی بەڵگەی ڕۆشن: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ ﴾.

٢- دوای هاتنی بەڵگەی ڕۆشنیش، پەرتەوازە بوونیان: ﴿ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ ﴾.

٣- بە خراپترین دروستکراودانانی بێبڕوایان و، بە باشترین دانانی بڕواداران: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ ﴾.

٤- چەند وشەو تەعبیرێك -كە بەپێی ئەوەی دێتەوە یادم- تەنیا لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوون:

١- ﴿ مُنفَكِّينَ ﴾، واز لێهێنەرو دەستبەرداربووان.

٢- ﴿ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ ﴾، پەڕە پاككراوەكان.

٣- ﴿ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ ﴾، نووسراوە ڕێك و ڕاستەكانیانلۆوْل تێدان.

٤- ﴿ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾، ئایینی ئۆممەتێك و میللەتێكی ڕێك و ڕاست.

٥- ﴿ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ ﴾، خراپترینی دروستكراوان.

٦- ﴿ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ ﴾، چاكترینی دروستكراوان.

## ٧)- دابەشكردنی ئایەتەكانی ئەم سوورەتە:

ئێمە كۆی هەشت ئایەتەكەی ئەم سوورەتە موبارەكە، دەكەینە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی هەموویان پێكەوە پەیوەستن و، هەمووشیان لە بارەی بابەتێكەوە دەدوێن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە کـۆی هەشـت ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێـك دێ ئایەتەکانـی: (١ - ٨)، خـوا ﷻ لـەو هەشـت ئایەتـەدا سـەرەتا ڕایدەگەیەنـێ: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ ﴾، ئەوانـەی بێبڕوابـوون لەوانـەی خـاوەن کتێبن و، لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانیـش، دەسـتبەردار نەدەبـوون، واتـە: دەسـتبەرداری ئـەوە نەدەبـوون، کـە لەسـەری بـوون، لـە پابەندیـی بـە ئایینـە شـێوێنراوەکانی خۆیـان، بەنسـبەت خـاوەن کتێبانـەوەو، لـە بتپەرسـتیی و هاوبـەش بـۆ خـوا پەیداکـردن، بـە نسـبەت هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـەوە، دەسـتبەرداری ئـەوە نەدەبـوون، (حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ)، تاکـو بەڵگەیـەکی ڕوون و ئاشـکرایان بـۆ دێ، دوای بەڵگـە ڕوون و ئاشـکرایەکەش بـەوە تەفسـیر دەکات، دەفەرمـوێ: (رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾)، ڕەوانەکراوێـك لـە خـواوە کـە پـەڕە پاککـراوەکان دەخوێنێتـەوە.

چییـان تێدایـە؟ (فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾)، چەنـد نووسراوێـکی زۆر ڕێـك و ڕاسـت و بەهـادارو بەنرخیـان تێـدان، دوایـی دەفەرمـوێ: (وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾)، واتـە: ئەوانـەی کتێبیـان پێدرابـوو پەرتـەوازە نەبـوون، مەگـەر دوای ئـەوەی بەڵگـەی ڕۆشـنیان بـۆ هـات، ئـەوە سەرزەنشـتکردنی خـاوەن کتێبانـە، چونکـە خـوا ﷻ لـەو ڕەوتانـەدا کـە بیـەوێ زەم و سەرزەنشـتی خـاوەن کتێبـان بـکات بـە: (ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ)، تەعبیریـان لـێ دەکات، ئەوانـەی کتێبیـان پێـدراوە، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـتی زەم نەبـێ بـە خـاوەن کتێـب (أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ)، تەعبیریـان لـێ دەکات.

سـەرەتا خـاوەن کتێبـەکان دەسـتبەرداری ئایینـە شـێوێنراوو تێکدراوەکـەی خۆیـان نەدەبـوون، هەتـا بەڵگـەی ڕوونیـان بـۆ نەهاتبایـە، کـە بەڵگـە ڕوونەکـەش

هـات، لـە دەوری پـرژان، کەمێکیـان بڕوایـان پێهێنـاو زۆربەیـان پێـی بێبـڕوا بـوون، لەبـەر حەسـەدو دەسـت پێوەگرتنـی ئـەو بـەزم و بـازاڕەی بەهـۆی ئاینـە تێکـدراوو شـێوێندراوەکەی خۆیانـەوە، بۆیـان دەسـتەبەر بـوو بـوو.

دوایـی دەفەرمـوێ: (وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعْبُدُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾)، یانـی: وەنەبـێ پاساوێکیشـیان بووبـێ بـۆ پەرتـەوازە بـوون لـە دەوری پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، دەفەرمـوێ: فەرمانیشـیان پـێ نەکرابـوو، مەگـەر بـەوەی خـوا بپەرسـتن بـە سـاغیی، ملکەچیـی خۆیـان بـۆ خـوا ساغ بکەنـەوە، خڵتـەی پێـوە نەهێڵـن، (حُنَفَآءَ) لابـدەن لـە هەرچـی هەڵـەو پوچییـە بـەرەو ڕاسـتیی، (وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ)، نوێـژ بەرپـا بکـەن و زەکات بـدەن، (وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾)، ئـا ئـەوەش ئاییـن و بەرنامـەی کۆمەڵێکـی ڕێـك و ڕاسـتە.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: (إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾)، بـە دڵنیایی ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـان و، لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، لـە ئاگـری دۆزەخـدان بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، ئـەوان خراپترینـی دروسـتکراوانی خـوان، هیـچ شـتێك لـەوان خراپـتر نیـە، بـە نسـبەت بڕوادارانیشـەوە، دەفەرمـوێ: (إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾) بـە دڵنیاییـەوە ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێنـرێ)و، کـردەوە باشەکانیشـیان ئەنجامـداون، ئەوانـە باشـترینی دروسـتکراوەکانی خـوان.

(جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا)، پاداشـتیان لـە لای پەروەردگاریـان لـە نیزیـك پەروەردگاریـان، لـە خزمـەت پەروەردگاریانـدا، باخـە هەمیشـەییەکانن، (تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ)، ڕووبـارو جۆگـەو جۆبارەکانیـان بـە ژێـردا دەڕۆن، (خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا)، تێیانـدا هەرمـاو دەبـن بـە هەمیشـەیی، بەبـێ برانـەوە، (رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُواْ عَنْهُ) خـوا لێیـان ڕازییـەو، ئەوانیـش لـە خـوا ڕازیـن، (ذَٰلِكَ لِمَنْ

خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾)، ئـا ئـەوەش -کـە باسـکرا- بـۆ کەسـێکە سـام و هەیبـەتی بەرانبـەر پـەروەردگاری هەبـێ.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە. ئەوانـەی بێبڕوابـوون لـە خـاوەن کتێبـان و هاوبەشـدانەران، دەسـتبەردار (ی ڕێچکەکانیـان) نەدەبـوون، مەگـەر دوای ئـەوەی بەڵگـەی ڕوونیـان بـۆ هـات ﴿١﴾ نێردراوێکـە لە خـواوە پـەڕە پاککراوەکانیان بەسـەردا دەخوێنێتـەوە ﴿٢﴾ (حوکـم و حیکمەتـە) نـووسراوە تێـرو تـەواو و ڕاسـتەکانیان تێـدان ﴿٣﴾ ئەوانـەی کتێبیشـیان پێدرابـوو، تەنیـا دوای ئـەوەی بەڵگـەی ڕۆشـنیان بـۆ هـات پەرتەوازەبـوون (و لـە دەوری پـرژان، لـە جیـاتی لـە دەور کۆبوونەوەییـان) ﴿٤﴾ فەرمانیشـیان پـێ نەکرابـوو، مەگـەر بـەوەی بـە ملکەچیـی سـاغکەرەوانە خـوا بپەرسـتن، (وازهێنـەر لـە ناهـەق و) بـەرەو هـەق گەڕاوەبـن و نوێـژ بەرپـا بکـەن و

زەكاتێ بدەن، ئا ئەوەش بەرنامەی (كۆمەڵێكی) ڕێك و ڕاستە ﴿٥﴾ بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن كتێبان و لە هاوبەشدانەران، لە ئاگری دۆزەخدان تێیدا هەرماون، ئەوانە خراپترین دروستكراون ﴿٦﴾ بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوە چاكەكانیان كردوون، ئەوانە باشترین دروستكراون ﴿٧﴾ پاداشتیان لە لای پەروەردگاریان باخە هەمیشەییەكانن، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا هەرماو دەبن، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لەخوا ڕازیین، ئەوەش بۆ كەسێكە -بە مەزنگرتنەوە- سام لە پەروەردگاری بكات ﴿٨﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(مُنفَكِّينَ): واتە: دەستبەرداربووان، وازلێهێنەران، (**الفَكُّ: التَّفرِيجُ، وَفَكُّ الرَّهْنِ تَخْلِيصُهُ، أَي: لَمْ يَكُونُوا مُتَفَرِّقِينَ بَلْ كَانُوا كُلُّهُم عَلَى الضَّلال**)، (فَكّ): یانی: دەرووڵێكردنەوە (**فَكَّ الرَّهْنَ**)، ڕەهنەكەی دەرباز كرد، ئەو شتەی بەبارمتە دانابوو، لە بەرانبەر پارەیەكدا كە وەریگرتبوو، دوای ئەوەی پارەكە دەباتەوە، بارمتەكەی خۆی وەردەگرێتەوە.

لێرەدا (مُنفَكِّينَ)، واتە: پرژوبڵاو نەدەبوون، یاخود وازلێهێنەر نەدەبوون، بەڵكو هەموویان لەسەر گومڕایی مابوونەوە، تاكو بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ هات.

(ٱلْبَيِّنَةُ): (**الدَّلَالَةُ الوَاضِحَةُ عَقْلِيَةً كَانَتْ أَوْ مَحْسُوسَةً، وَسُمِّيَ شَهَادَةُ الشَّاهِدَيْنِ بَيِّنَةً**)، (ٱلْبَيِّنَةُ): بە مانای گەیاندنێكی ڕۆشن، چ گەیاندن و بەڵگەكە عەقڵیی بێ، چ بەرهەست بێ، شایەدییدانی دوو شایەدانیش ناونراوە: (ٱلْبَيِّنَةُ) لەبەر ئەوەی بەڵگەیەكی ڕۆشنە بۆ ئیسپاتی ئەو داوایەی دەكرێ.

(صُحُفًا مُّطَهَّرَةً): (**الصُّحُفُ جَمْعُ الصَّحِيفَة: وَهِيَ المَبْسُوطُ مِنَ الشَّيء**)، (صحيفة) هەر شتێكە بڵاوكرابێتەوە دواییش خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێك تێیدا بنووسرێ،

ئنجا لـە كاغـەز بـێ، لـە چـەرم بـێ، لـە ڕووەك بـێ، لـە بـەردی تەنـك بـێ، هەرچـی بـێ، (**وَجَمْـع الصَّحيفَـةِ، الصَّحَائِـف وَالصُّحُـف**)، (**صَحيفَـة**) هـەم بـە (**صَحَائِـف**)، هـەم بـە (**صُحُـف**) كۆدەكرێتـەوە، (مُّطَهَّرَةً): واتـە: پاكڕاگیـراو، پاككـراوە لـە هەڵـەو پەڵـەو درۆو شـتی ناڕاسـت.

(فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ): واتـە: چەنـد نووسراوێـكی ڕێـك و ڕاسـتی تێـدان، (**سُـمِّيَ المَكْتـوبُ كِتَابـاً وَالْكِتَـابُ اسْـمٌ لِلصَّحيفَـةِ مَـعَ المَكْتـوبِ فِيـهِ**)، نـووسراو نـاوی نـراوە (**كِتَـاب**)، (**كِتَاب**)یـش، نـاوە بـۆ پەڕەیـەك ئـەوەی تێشـیدا نووسرابـێ.

(**وَالقَيِّمَـة: هَاهُنـا إِسْـم الأُمَّـةِ القَائِمَـةِ بِالقِسْـطِ**)، (**قيمـة**): لێـرەدا نـاوە بـۆ كۆمەڵێـك بـە دادگەریـی بەڕێـوە بچـێ، ئـەو وای گوتـوە، بـەڵام لێـرەدا (قَيِّمَةٌ) كـراوە بە سیفەتی (كُتُبٌ)، واتـە: چەنـد نووسراوێـكی ڕێـك و ڕاسـت، كـە هەقیـان لـە نێـو خۆیانـدا هەڵگرتـوە.

(مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ): واتـە: بـۆ وی ساغكەرەوەی ملكەچیین، ملكەچیـی خۆیـان بـۆ خـوا سـاغكردۆتەوەو، خڵتەیـان پێـوە نەهێشـتوە، (**الخَالِـصُ كَالصَّـافِي، إلاَّ أَنَّ الخَالِـصَ مَـازَالَ عَنْـهُ شَـوْبُهُ بَعْـدَ أَن كَانَ فِيـهِ، وَالصَّـافِي يُقَـالُ لِـما لا شَـوْبَ فِيـهِ**)، (**خالِـص**) وەك (**صـافِي**) وایـە، بـەڵام (**خالِـص**) بەشـتێك دەگوتـرێ كـە شـتێك تێكـەڵ و ئاوێتـەی بـووە، لێـی جیاكرابێتـەوە، پـووش و پەڵاشـێك، خڵتەیـەك، ماددەیەكـی نامـۆ، بـەڵام (**صَـافِي**): بریتیـە لـەوەی هـەر لـە ئەسڵدا هیچـی لەگـەڵ تێكـەڵ نەبووبـێ، بـە كوردییـش هـەر وشـەی سـاف بەكاردێنیـن، كەواتـە (**خالـص**)، واتـە: سـاغ و (**صـافِي**)، واتـە: بێگـەرد.

(حُنَفَآءَ): (**الحَنَـفُ: هُـوَ مَيْـلٌ عَـنِ الضَّـلالِ إلى الإِسْـتِقامة، والجَنَـفُ مَيْـلٌ عَـنِ الإِسْـتِقَامَةِ إلى الضَّـلال**)، (**حَنَـف**): لادانـە لـە گومڕاییـەوە بـەرەو ڕاسـتیی و دروسـتی، پێچەوانەكـەشی (**جَنَـفْ**)ە، كـە لادانـە لـە ڕێـك و ڕاسـتیی بـەرەو گومڕایـی و لاریـی.

(دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ): (**أَيْ: ديـنُ المِلَّـةِ أو الأمـة المُسْـتَقيمة**)، ئاییـن و بەرنامـەی كۆمەڵێـكی ڕێـك و ڕاسـت.

(شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ): (البَرِيَّةُ: الخَلْقُ، وَسُمِّيَ بَرِيَّة لِكَوْنِهِ مُبَرِيَّةً مِنَ البَرَى، وَالبَرَى: التُّرَابْ)، (بَرِيّة) واتە: دروستکراوەکان، بۆیەش دروستکراوەکان پێیان گوتراوە: (ٱلْبَرِيَّةِ) چونکە دروستکراون لە (بَرَى)، (بَرى)ش، واتە: گڵ و، لەگڵ دروستکراون.

( خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ): واتە: باشترینی دروستکراوەکان، بەڵام پێم وایە (ٱلْبَرِيَّةِ) تەنیا ئەوانە نین لەگڵ دروستکرابن، بەڵکو دروستکراوەکانی خوا ﷻ بە گشتیی، بۆیە ئەوانەی بێبڕوان لە هەموو دروستکراوەکانی خوا بە گشتیی خراپترن، ئەوانەش کە بڕوادارن لە هەموو دروستکراوەکانی خوا بەگشتیی چاکترن.

(عَدْنٍ ): (أَي: اسْتِقْرارٍ وَثَبَاتٍ، عَدَنَ بِالمَكَان: اسْتَقَرَّ، وَالمَعْدِنُ: مُسْتَقِرُّ الجَوَاهِرِ)، وشەی (عدن) واتە: نیشتەجێ و چەسپاو (جنات عدن) واتە: باخە چەسپاوەکان، (وَعَدَنَ بِالمَكَانِ، أَي: اسْتَقَرَّ)، لە شوێنەکەدا نیشتەجێ و، سەقامگیر بوو، (مَعْدِن) بەو شوێنە دەگوترێ کە کانزایەکانی لێ دەردەهێنرێن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ لەم سوورەتە بەپێزەدا دەفەرموێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ )، بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، واتە: ئەم سوورەتە بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەخوێنم، ئنجا پێویستە لە کاتی گوتنی: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ )دا، چ بۆ قورئان خوێندن، چ بۆ هەرکارێکی دیکە، مرۆڤ بەلای کەمەوە، چوار واتایان لە عەقڵ و دڵیدا ئامادە بکات:

١- ئەم کارە بەناوی خواوە ئەنجام دەدەم.

٢- ئەم کارە بۆ خوا ئەنجام دەدەم، تاکو لێم ڕازیی بێت و، پاداشتی لە بەرانبەردا وەربگرمەوە.

٣- ئەم کارە بەپێی بەرنامەی خواو، پێی ڕێنمایی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەم کارە بەو وزەو توانایەی خوا بۆی ڕەخساندووم، ئەنجام دەدەم، نەك بە شان و شەوکەت و تواناو برستی خۆم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿١﴾﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش دانەران دەستبەردار نەدەبوون، هەتا بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ نەیەت، زانایان لەبارەی ئەم ئایەتانەوە زۆر قسەیان کردوە، بەڵام من هەوڵدەدەم ئەوەی ڕێك و ڕاسترەو لەگەڵ بێژەی ئایەتە بە پێزەکاندا چاکتر دێتەوە، ئەوەیان بێنم، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەوە لێرەدا هەواڵدانی خوا ﷻ نیە لە بارەی بێبڕوایەکانەوە لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، بەڵکو گێڕانەوەی قسەی وانە، واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەران دەیانگوت: ئێمە دەستبەرداری ئەوەی لەسەرینی نابین، تاکو بەڵگەی ڕۆشنمان بۆ نەیەت، بەڵام بێگومان واتای یەکەم ڕاسترە کە ئەوە هەواڵەو خوای زاناو پەنهانزان، لەبارەی بێبڕوایەکان لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە دەیدات، یانی: دەستبەرداری ئەوەی لەسەرینی، لە ڕێچکەکانیان و، بەرنامەکانیان و، بەنسبەت خاوەن کتێبانەوە ئاینە تێکدراو شێوێنراوەکانیان و، بەنسبەت بتپەرست و هاوبەش بۆخوا دانەرەکانیشیانەوە، ڕێچکەی بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانان، دەستبەرداری ئەوانە نەدەبوون، (حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿١﴾)، هەتا بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ نەیەت، ﴿رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ﴾، (رَسُولٌ)، جێداری (الْبَيِّنَةُ)یە، ئەو بەڵگە ڕۆشنەش بریتی بوو لە ڕەوانەکراوێك لە خواوە، ئایا ئەو ڕەوانەکراوە لە خواوە چی دەکرد؟ ﴿يَتْلُوا صُحُفًا مُّطَهَّرَةً﴾، پەڕە پاککراوەکانی دەخوێندنەوە، بێگومان لێرەدا مەبەست لە (رَسُولٌ)، موحەممەدە ﷺ، چونکە پێش هاتنی موحەممەد ﷺ وەك کۆتا پێغەمبەری خواو، هەڵگری کۆتا پەیامی خوا بۆ مرۆڤایەتیی، هەموو مرۆڤایەتی چاوەڕێ بوون و، دنیا پڕ بوو بوو لە

کوفرو شیرك و ستەم و لادان وتاوان و خراپەو، لە هەموو ڕوویێکەوە مرۆڤایەتیی زۆر حاڵی تێکچوو بوو، کاری لە گرێژەنە چوو بوو، وەك (**أَبو الحَسَن النَّدْوي**)، ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبێکی ناوداریدا بە ناوی: (**مَاذا خَسِرَ العَالَم بانحِطاطِ المُسلمين؟**)، جیهان چ زیانێکی لێکەوت بەهۆی پاشەکشەکردن و هاتنەوە دوای مسوڵمانانەوە؟ لەوێدا لە بەشی یەکەمی کتێبەکەیدا باسی جیهان دەکات کە چۆن لە ڕووی فیکریی و عەقیدەیی و بووناسیی و پەرستشەکان و ڕەوشت و ئاکارو کۆمەڵایەتیی و سیاسیی و ئابووریی، لە هەموو ڕووەکانەوە، مرۆڤایەتیی کاری زۆر لە گرێژەنە چوو بوو، بۆیە هەموو چاوەڕێیان دەکرد و، خاوەن کتێبەکان دەیانزانی کە پێغەمبەری کۆتایی خوا ﷺ نەهاتوە، لەبەر ئەوەی لە کتێبەکانیان هەواڵ درابوو و ناوەکەشی دیاریی کرابوو، کە ناوی ئەحمەدەو موحەممەدە ﷺ، بەڵام جوولەکەکان چاوەڕێیان دەکرد لە خۆیان بێ، نەصڕانییەکانیش ئەوانەیان کە خوا بەیەکگربوون و لەسەر ڕێبازەکەی مەسیح عليه السلام مابوونەوەوە، هەر چاوەڕێی موحەممەدیان ﷺ دەکرد، بەڵام ئەوان کەمینە بوون و چەوسێنراوە بوون، ئەوانی دیکەش کە ڕێیان لێ تێکچووبوو، بە لاڕێدا برابوون و چاوەڕێیان دەکرد عیسا عليه السلام بێتە خوار، پێیان وابوو ئەو کۆتا پێغەمبەری خوایە، بتپەرست و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش خۆیان لەسەر ئایینی ئیبراهیم دەبینی و، بە جۆرێك لە جۆرەکان خوایان دەپەرست، بەڵام هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا، کەواتە: هەموویان چاوەڕێ بوون خوا سبحانه وتعالى ئەو فریادڕەسەیان بۆ بنێرێ، کە پێغەمبەری کۆتاییە.

﴿رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾، ڕەوانەکراوێك لە خواوە، چی دەکرد؟ ﴿يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾﴾ پەڕە پاککراوەکانی دەخوێندنەوە، ئەوەی تێیاندا بوو دەیخوێندەوە، چی لەو پەڕە پاککراوانەدا هەبوو؟ دوایی ڕوونی دەکاتەوە، (**صُحُف**)، کۆی (**صَحِيفَة**) یە، کە هەر شتێکە پانڕاخرابێ و شتی تێدا نووسرابێ، (**مُّطَهَّرَةً**) واتە: پاکڕاگیراوو، پاککراوە لە درۆ، لە هەڵە، لە کەم و کوڕیی، لە شتی باتیڵ و ناهەق، هەروەها لەوەی دەستی شەیتانەکانی بگاتێ، ئنجا چییان تێدابوو ئەو پەڕە پاککراوانە؟

﴿ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ ﴾، نووسراوانێکی ڕێك و ڕاست و بەهادارو زۆر پاك و چاکیان تێدابوون، (كُتُبٌ)، کۆی (كِتاب)ە، واتە: نووسراو، (قَيِّمَةٌ)ش، کۆی (قَيِّم)ە، واتە: ڕێك و ڕاست، وشەی (قَيِّم) لە بنەڕەت دابە مانای سەرپەرشتیارو مشوورخۆرێکی چاك و، چاودێرێکی چاك دێت، دوایی لەوەوە مانایەکەی خوازراوەتەوە بۆ هەر شتێك کە ڕێك و ڕاست و چاك بێ.

﴿ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴾، ئەوانەش کە کتێبیان پێدرابوو، پەرتەوازە نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشن و ئاشکرایەکەیان بۆ هات، لە سەرەتاوە خاوەن کتێبەکان و هاوبەش بۆخوا دانەران، چاوەڕێ بوون بەڵگەی ڕۆشن و ئاشکرایان بۆبێ، تاکو خاوەن کتێبەکان دەستبەرداری ئایینە تێکدراوو شێوێنراوەکەی خۆیان بن و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش دەستبەرداری ئەو ڕێچکە پووچەی خۆیان بن، کە بریتیە لە بتپەرستیی و هاوبەش بۆ خوا دانان، بەڵام دوای ئەوەی ئەو بەڵگە ڕۆشنەیان بۆ هات، ئەوانەی کتێبیان پێدراوە تەنیا ئەو کاتە پەرتەوازە بوون، کە بەڵگە ڕۆشنەکەیان بۆ هات، بۆیەش باسی هاوبەش بۆخوا دانەران ناکات، چونکە ئەوان هەر پەرتەوازە بوون، یاخود لەبەر ئەوەی پەرتەوازەبوونی خاوەن کتێبان، کە زانیاریی کتێبی خوایان لەبەر دەستدا بووە، با دەستکارییش کرابێ، پەرتەوازە بوونی ئەوان زۆر ناشیرینترو ناقۆڵاترە لە هی کەسانێك کە شارەزای کتێبەکانی خوا نەبوون.

بۆیەش خوا ﷻ لێرەدا بە خاوەن کتێب (أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ)، ناویان ناهێنێ بەڵکو بە: (ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ)، ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، لە سۆنگەی ئەوەوەی لەو ڕەوتانەدا، کە خوا بیەوێ بە ڕەخنە لێگرتنەوە باسی خاوەن کتێبان بکات، بە تەعبیری (ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ) دەیاندوێنێ، بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (النساء)دا، خوای بەرزومەزن دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ

نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾، واته: ئەی ئەوانەی کتێبتان پێدراوە! بڕوابێنن بەوەی دامانبەزاندوە، کە ئەوەی لەگەڵ ئێوەیەو پێشتر بۆ ئێوە دابەزێندراوە، بەڕاستی دەزانێ، بەرلەوەی دەم و چاوانێك بسڕینەوە، (بیانگێڕینەوە بەرەو دوایەو بیانسووڕێنین)، یاخود نەفرینیان لێ بکەین وەك چۆن نەفرینمان لە هاوەڵانی شەممە کرد، کاری خواش ئەنجامدراوە.

ب- هەر لە هەمان ڕەوت دا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ ﴾النساء، واته: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە؟ بڕوا بە جیبت و تاغووت دێنن و بەوانەی بێبڕوان دەڵێن: ئەوانە ڕاستە ڕێترن لەوانەی بڕوایان هێناوە!

ج- هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٤٤)دا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واته: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە، گومڕایی دەکڕن و، دەیانەوێ ئێوە لەڕێ لابدەن، گومڕاتان بکەن.

هەروەها لە زۆر شوێنی دیکەی قورئاندا خوا ﷻ بە تەعبیری ﴿ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، باسی خاوەن کتێبەکان، دەکات لە حاڵێکدا بیەوێ ڕەخنەیان لێ بگرێ و، سەرکۆنەو سەرزەنشتیان بکات.

لێرەدا ڕەنگە یەکێك پرسیار بکات: ئەوانە بۆچی دوای ئەوەی بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ هات، پرژان و پەرتەوازە بوون؟ ئایا لەبەر ئەوەی شتێکی تێدابوو شایستەی ئەوەبێ لە دەوری بپرژێن؟ خوادەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾، فەرمانیشیان پێ نەکرابوو مەگەر بەوەی بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و، ملکەچیی خۆیانی بۆ ساغ بکەنەوەو، خڵتەی پێوە نەهێڵن، (حُنَفَآءَ)، کۆی (حَنيف)ە، ئەویش یانی: (المَائِلُ مِنَ البَاطِلِ إلى الحَق)، لادەر لە ناهەقەوە

بـۆ هـەق، پێچەوانـەی (حَنَف)یـش، (جَنَـف)ە، کـە بریتیـە لـە لادان لـە هەقـەوە بـەرەو لای ناهـەق، کەواتـە: تەنیـا بـەوە فەرمانیـان پێکـراوە بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکـەن و، ملکەچیـی خۆیـان بۆخـوا سـاغ بکەنـەوەو خڵتـەی پێـوە نەهێڵـن، (حُنَفَآءَ)، لـە حاڵێکیشـدا کـە (حَنیـف) بـن، یانـی: وازیـان لـە پووچیـی هێنابـێ و بـۆ لای هـەق گەڕابنـەوە، وەك ئیبراهیـم ﷺ کـە لـە سـەردەم و ڕۆژگاری خۆیـدا، وازی لـە هەمـوو ڕێچکـە پووچـەکان و، لـە هەمـوو پەرسـتراوە سـاختەکان هێنـاو، خـوای تـاکی پـەروەردگاری پەرسـت، بۆیـەش (حَنیـف)، نازنـاوی ئیبراهیمـە لەبەرئـەوەی واز لێهێنـەری ناهـەق و پووچیـی بـوو، بـەرەو هـەق گەڕایـەوە، بـەڵام بێبڕوایـان لـە ڕۆژگاری خۆیـدا، ئیبراهیمیـان بـە لادەر دادەنـاو دەیانگـوت: (حَنیـف)ە، چونکـە لـە پـووچ لای دابـوو بـەرەو لای هـەق.

﴿ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، هەروەهـا فەرمانیـان پـێ نەکرابـوو مەگـەر بـەوەی نوێـژ بەرپـا بکـەن و زەکات بـدەن، ﴿ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ۝٥ ﴾، ئـەوەش ئایینـی کۆمەڵێـکی ڕێـك و ڕاسـتە، یاخـود: ئـەوەش ئایینێـکی ڕێـك و ڕاسـتە، لـە کۆتاییـدا بـاسی سـەرەنجامی هـەرکام لـە بێبڕوایـان، لـە خـاوەن کتێبـان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران دەکات، هەروەهـا بـاسی سـەرەنجامی بـڕوادارانی کـردار چاکیـش دەکات: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ﴾، بە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبڕوابـوون لـە خـاوەن کتێبـان و لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، لـە ئاگـری دۆزەخـدان تێیـدا هەرمـاو دەبـن، بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێنـەوە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾، ئـا ئەوانـە خراپترینـی دروسـتکراوەکانن، خراپتریـن دروسـتکراوی خـوا، بێبڕوایانـن.

وشـەی (مِنْ)، لێـرەدا: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، هەروەهـا وشـەی (مِنْ)، لە یەکەم ئایەتدا: ﴿ لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، لـە هەردووکیانـدا (مِنْ)، (مِـن البَيَانيَّة)یـە، واتـە: بـۆ ڕوونکردنەوەیـە، یانـی: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـان و لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، لێـرەش ئەوانـەی

بێبڕوابـوون لـە خـاوەن کتێبـان و لـە هاوبـەش بۆخـوا دانـەران، نـەك مەبەسـت ئەوەبێ: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە خـاوەن کتێبـان یـانی: بەشـێکیان بـڕوادار بـوون، لـە هاوبـەش بۆخـوا دانـەران بەشـێکیان بێبڕوابـوون، نـا، چونکـە خـاوەن کتێبـەکان لـەدوای هاتنـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، ئـەوەی بـڕوای پـێ نەهێنابـێ، هەموویـان بێبـڕوا بـوون، بێبـڕوا (**کافـر**) کەسـێکە هەقـی بـۆ دێ و دەیپۆشـێ، کەسـێك ئـەو هەقـەی بـە پێغەمبـەری خاتەمـدا ﷺ نێـردراوە پۆشـیبی و، بـڕوای پـێ نەهێنابـێ و، ڕەفـزی کردبـێ، کافـرە، چ پێشـتر خـاوەن کتێبـی ئاسـمانیی بووبـێ، چ بـێ کتێـب و ناشـارەزا بووبـێ لـە کتێبـە ئاسـمانییەکان، کـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و بتپەرسـتەکانن.

ئنجا ئەوانـە هەموویـان: ﴿ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ﴾ لـە ئاگـری دۆزەخـدان بـە هەمیشـەیی تێیـدا دەمێننـەوە، تێیـدا هەرمـاو دەبـن.

﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ۝٦ ﴾، ئـا ئەوانـەن خراپترینـی دروسـتکراوەکان، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ۝٧ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجامـداون، ئـا ئەوانـە باشـترینی دروسـتکراوەکانن، وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگـەکان بـاس دەکەیـن، کـە هەندێـك لـە زانایـان پێیـان وایـە ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی بـڕواداران، مرۆڤـە بـڕوادارەکان لـە فریشـتەکانیش چاکـترو بەرزتـرن.

﴿ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ ﴾، پاداشـتیان لـە لای پەروەردگاریـان باخـە هەمیشـەییەکانن، ڕووباریـان بەژێـردا دەڕۆن، یانـی: ڕووبـار بـە ژێـر درەختەکانیانـدا دەڕۆن، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ ﴾، بـەردەوام و هەتاهەتایە تێیانـدا دەمێنـەوە، تێیـان دا هەرمـاو دەبـن، ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾، خـوا لێیـان ڕازییـەو ئەوانیـش لـەو ڕازییـن، ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ۝٨ ﴾، ئـا ئـەوەش، ئـەو پێگـەو پلـە دوورو بـەرزە -کـە (ذَٰلِكَ) بەنـاوی ئامـاژەی دوور، ئامـاژەی بـۆ دەکات-

بۆ کەسێکە سام و هەیبەتی بەرانبەر بە پەروەردگاری هەبێ بە مەزنگرتنەوە، جیاوازیی نێوان (**خَشية و خَوْف**)، ئەوەیە کە (**خَوف**): بریتیە لە لێترسان، بەڵام (**خَشِيَة**): بریتیە لە ترسان و سام و هەیبەت هەبوون بە مەزنگرتنەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە وەبەر ئەو موژدەیە دەکەون و، ئێمەش لەو کەسانە بگێڕێ کە بە مەزنگرتنەوە سام و هەیبەتیان بەرانبەر بە پەروەردگاریان دەبێ و خوا لێیان ڕازی دەبێ، لە خوا ڕازی دەبن و، بێگومان خواش لە کەسێك ڕازی دەبێ لە دنیادا شوێن ئەو بەرنامەیە بکەوێ، کە لێی ڕازییە کە بریتیە لە ئیسلام، ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ٣﴾ **المائدة**، ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون، خوا لە پەیڕەوان و شوێنکەوتووانی ڕەسەن و ڕاستەقینەی ئەو ئایینە بەرزو پەسندەی خۆیمان بگێڕێ، کە بریتیە لە ئیسلام.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوایـان لـە خاوەن کتێبان و لە هاوبەشـدانەران، دەسـتبەرداری ئـەوە نەدەبوون کـە لەسـەری بـوون، هەتـا بەڵگەیـەکی ڕوونیـان بـۆ نەهاتبایـە، پێغەمبەرێـك لـە خـواوە، پـەڕە پاککـراوەکان، کـە چەنـدان کتێبـی ڕێـك و ڕاسـتیان تێـدان، بەسـەریدا دەخوێندنـەوە، ئەوانـەش لـە کتێـب پێـدراوەکان پەرتـەوازە نەبـوون، مەگـەر دوای هاتنـی بەڵگـەی ڕۆشـن، فەرمانیشـیان پـێ نەکرابـوو مەگـەر بـەوەی بەندایەتیـی ساغ و بـێ خەڵتـەو پـاك بـۆ خـوا بکـەن و، نوێـژ بەرپـا بکـەن و، زەکات بـدەن، هـەر ئـەوەش دینداریـی پـاك و ڕاسـتە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَتْهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ وَالْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ الْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبەکان و لە هاوبەشدانەران، دەستبەردار نەدەبوون، تاکو بەڵگەیەکی ڕۆشنیان بۆ نەیەت.

زانایـان -وەك پێشـتریش باسـمانکرد-، دەربـارەی ئـەم ئایەتـەو ئایەتـەکانی دوایـی زۆر ڕاجیاییـان بـووەو، هەندێکیـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتانـە قورسـترین ئایەتـن کـە مـرۆڤ بتوانـێ تێگەیشـتنێکی ڕێـك و ڕاسـتی لـە بارەیانـەوە هەبـێ لـە قورئانـدا.

بەڵام مـن وام نایەتـە بەرچـاوو، پێـم وایـە بـە سـەرنجدانی خـودی ئایەتـەکان، بەبـێ تێخوێندنـەوەی هەنـدێ حیکایـەت و بەسـەرهات و قسـەو قـاڵ، تێگەیشـتنی ئـەو ئایەتـە بـە پێزانـە هێنـدە قـورس نیـە.

خـوا ﷻ هەواڵـدەدا لەبـارەی خـاوەن کتێبەکانـەوە کـە بـە پلەی یەکـەم جوولەکەو نەصڕانییـەکان بـوون، دوای ئەوانیـش هـەم صابیئـە، هـەم مەجـووس کـە لـە قورئانـدا ناویـان هاتـوە، صابیئـە لـە چەنـد شـوێنێکدا ناویـان هاتـوە، بـەڵام مەجـووس تەنیـا لـە سـوورەتی **(الحـج)**دا ناویـان هاتـوە، هەروەهـا هەرکەسـێکی دیکە بچەسـپێ خاوەنی کتێبێـکی خوایـی بـووە، هەرچەنـدە هـی مەجـووس و هـی صابیئـەش بـە تەواویـی چەسـپاو نیـە، بـەڵام پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ لـە بـارەی مەجووسـەوە فەرموویـەتی: {**سُـنُّوا بِهِـمْ سُـنَّةَ أَهْـلِ الْكِتَـابِ**} **(أخرجـه مالـك: ٦١٦ ، وأبـو يعـلى: ٨٦٢، والبـزار: ٩٤٨)**، وەك خـاوەن کتێبـان مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـەن، صابیئـەش هـەر لـە سیاقی بـاسی جوولەکـەو نەصڕانیـی و ئەوانـەدا، ناویـان هاتـوە، خـوا ﷻ هەواڵـدەدا کـە ئەوانـە دەسـتبەرداری ئـەوە نەدەبـوون کـە خۆیـان لەسـەری بـوون لـە شـیرك و بێبڕوایـی و وازیـان لـێ نەدەهێنـا، تاکـو بەڵگەیـەکی ڕۆشـنیان بـۆ نەیـەت، چـاوەڕێ بـوون کـەی ئـەو پێغەمبـەرەی کۆتاییـە دێ، کـە پێغەمبـەران **(عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَامُ)**، هەواڵیـان پێـداوەو، هەموویـان ئوممەتـەکانی خۆیانیـان لـێ ئـاگادار کردوونـەوە، کـە ئەوانیـش بـە وەچـەکانی دوای خۆیـان ڕابگەیەنـن، کاتێـك دێ پێغەمبـەری کۆتایـی خـوا دێ، پەیامـی کۆتایـی خـواو، بەرنامـەی کۆتایـی خـوا بـۆ مرۆڤایەتیـی دێنـێ، ئـەو کاتـەش پێویسـتە هەمـوو لایـەك شـوێن ئـەو پێغەمبـەرەو، شـوێن ئـەو بەرنامـە کۆتاییـە بکـەون، وەك لـە سـوورەتی **(آل عمـران)**دا، خـوا ﷻ ئاماژەیـەك بـەوە دەکات و، دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ ۚ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِي ۖ قَالُوا أَقْرَرْنَا ۚ قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٨٢﴾﴾، واتـە: یـاد بکـەوە! کاتێـك خـوا پەیـمانی

پتەوی لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) وەرگرت، (فەرمووی:) من کە کتێبم پێداون و، حیکمەتم پێداون (بەرنامەو لێزانیی و کارامەییم پێداون)، دوایی پێغەمبەرێك بێ بەڕاستدانەری ئەوەبێ کە لەگەڵ ئێوەیە، دەبێ بڕوای پێ بێنن و سەری بخەن.

بێگومان خوا ﷻ دەزانێ کە ئەو پێغەمبەرانە نامێنن، بەڵکو ئەوانەی لەگەڵیشیاندان شوێنکەوتووشیانن نامێنن، کاتێك ئەو پێغەمبەرە دێ، پێغەمبەرێك سەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەموو پێغەمبەران بێ، پێغەمبەرێك کە بەڕاستدانەری پەیام و بەرنامەی تێکڕای پێغەمبەرانە، ئایا ئەو کەسە چ پێغەمبەرێك بووە، ئەوەی بە هەموو پێغەمبەراندا نێردراوە بە ڕاستی داناوە، بێگومان پێغەمبەری کۆتاییە، بۆیەش خوا بەڵێنی لێوەرگرتوون، (لَتُؤْمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥ)، بەدڵنیایی دەبێ بڕوای پێ بێنن و، سەریشی بخەن (قَالَ ءَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَىٰ ذَٰلِكُمْ إِصْرِى)، خوا فەرمووی: ئایا دانتان بەوەدا هێناو، لەسەر ئەوە پەیمانی منتان وەرگرت؟ (قَالُوٓا۟ أَقْرَرْنَا )، گوتیان: دانمان پێداهێنا، (قَالَ فَٱشْهَدُوا۟ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ )، فەرمووی: شایەدبن، منیش لەگەڵ ئێوەدا لە شایەدانم (فَمَن تَوَلَّىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ )، ئنجا هەر کەسێك دوای ئەوە پشتی هەڵکرد، هەر ئەوانەن لادەرو لاڕێ.

هەڵبەتە ئەو پەیمانەی لە پێغەمبەران وەرگیراوە واتە: لە شوێنکەوتووەکانیان وەرگیراوە، ئەگەرنا، بێگومان پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، پێویست بە پەیمان لێوەرگرتن ناکەن، مەبەست پێی شوێنکەوتووەکانیان و پەیڕەوانیانن، کە: ئێوە بزانن پابەند کراون لەسەر زمانی پێغەمبەرەکانی خۆتان، هەر کاتێك پێغەمبەری کۆتایی هات، کە هەموو پێغەمبەران بە ڕاست دادەنێ، دەبێ بڕوای پێ بێنن و، پشتی بگرن! لەسەر ئەوە بەڵێن و پەیمانتان لێوەرگیراوە لەسەر زمانی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام).

خـوا دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبڕوابـوون لـە خـاوەن كتێبـان و لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، دەسـتبەردار نەدەبـوون، (الإِنْفِـكاكُ: الإِقْـلاعُ وَهـوَ مُطَـاوِع فَكَّـهُ أَيْ: فَصَّلَـهُ وَفَرَّقَـهُ، وَيُسْتَعَارُ لِمَعْنـى: أَقْلَعَ عَنْـهُ، وَمُتَعَلَّـقُ مُنْفَكِّينَ مَحْذوفٌ دَلَّ عَلَيْـهِ وَصْفُ المُتَحَـدَّثِ عَنْهُـم (ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ )، أَيْ: عَـنْ كُفْرِهِـم وَتَارِكِـينَ لَـهُ)، (إِنْفِـكاك): بـە مانـای واز لێهێنـان و، دەسـتبەردار بوونـەو، (مُطَـاوِع)ی (فَكَّهُ)یـە، جیـای کـردەوەو، بڵاوی کـردەوە، دەخوازرێتـەوە بـۆ مانـای دەسـتبەرداری بـوو، وازی لێهێنـا، ئـەوەش کـە وشـەی (إِنْفِـكَاك)ی، پێـوە پەیوەسـت کـراوە، قرتێـنراوە، بـەڵام وەسـفی ئەوانـەی قسـەیان لەبـارەوە دەکـرێ، ئەوانـەی بێبڕوابـوون، دەیگەیەنـێ، واتـە: دەسـتبەرداری ئـەو کوفـرە نەدەبـوون و واز لێهێنـەری ئـەو ڕێچکـەو بەرنامانـەی خۆیـان نەدەبـوون، کـە بریتـی بـوون لـە ئاییـن و بەرنامـەی شـێوێندراو و تێکـدراوو کتێبـە گـۆڕدراوەکانی خـوا، بـە نسـبەت خـاوەن کتێبـان و، بەنسـبەت هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانیـش -کـە ئەوانیـش لـە ئەسـڵدا هەموویـان خواناسـن، بـەڵام لـە مامەڵـە لەگـەڵ خـوادا بـە هەڵەداچـوون، چونکـە هاوبەشـیان بـۆ دانـاوە- وازلێهێنـەری هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان و بتپەرسـتییەکەیان نەدەبـوون:

٢)- ﴿ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ﴾، (ئەوانە لەسەر ئەوەی لەسەری بوون دەستبەرداری نەدەبوون و وازیان لێ نەدەهێنا)، تاکو بەڵگەیەکی ڕۆشنیان بۆ نەیەت، (ٱلۡبَيِّنَةُ: الحُجَّةُ الوَاضِحَةُ وَالعَلاَمَةُ عَلَى الصِّدْقِ)، (ٱلۡبَيِّنَةُ)، واتە: بەڵگەیەکی ڕۆشن و، نیشانە لەسەر ڕاستگۆیی، (ٱلۡبَيِّنَةُ) (أل)ی ناساندنی لەسەرەو، بۆ (عهد)ە، واتە: تاکو بەڵگە ڕۆشنەکە، کە ئەوان پێی ئاشنان، بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی، تاکو ئەوەیان بۆ نەیەت، کەواتە: وشەی (مِنْ) بۆ ڕوونکردنەوەیە، نەك بۆ هەندێك (بعض)، چونکە هەموو ئەوانەی خاوەن کتێب بوون، بێبڕوابوون و بە بێبڕوا دانراون، دوای هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، ئەگەر بڕوای پێ نەهێنن، خوا دەفەرموێ: دەستبەرداری بێبڕواییەکەیان نەدەبوون، تاکو بەڵگەیەکی ڕۆشن و ئاشکرایان بۆ نەیەت، ئایا ئەو بەڵگە ڕوون و ئاشکرایە بریتی بوو لەچی؟

٣)- ﴿ رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ڕەوانەکراوێك لە خواوە (کە موحەممەدە ﷺ).

٤)- ﴿ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ ٢ فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ٣ ﴾، پەڕە پاككراوەكانی لە هەڵەو پەڵەو لادان بەسەردا دەخوێندنەوە، كە نووسراوە ڕێك و ڕاستەكانیان گرتوونە خۆیان.

كە دەفەرموێ: (رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ)، ئەمە دوو ئەگەری هەن:

**یەكەم:** یان (رَسُولٞ ) جێگرەوەی (ٱلۡبَيِّنَةُ)یە، واتە: ئەو بەڵگە ڕۆشنە بریتی بوو لە ڕەوانەكراوێك لە خواوە.

**دووەم:** یاخود (رَسُولٞ مِّنَ ٱللَّهِ يَتۡلُواْ صُحُفٗا مُّطَهَّرَةٗ)، هەر ڕستەیەكی دەستپێكەرە بۆ ڕوونكردنەوە، واتە: پێغەمبەرو ڕەوانەكراوێك لە خواوە كە پەڕە پاككراوەكانی -پاك لە هەڵەو كەم و كوڕیی لە دەستپێكەیاندنی شەیتانەكان- ئەو پەڕانەی بەسەردا دەخوێندنەوە كە چییان تێدا بوون؟

﴿ فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ ٣ ﴾، (**كُتُب**) كۆی (**كِتَاب**)ە، لەسەر كێشی (**فِعَال**)، بەڵام بە مانای نووسراو (**مَكْتُوب**)ە، (فِيهَا كُتُبٞ قَيِّمَةٞ)، واتە: نووسراوە ڕێك و ڕاستەكانیان گرتبوونە خۆیان، هەروەك چۆن (**صُحُفْ**)، كۆی (**صَحِيفَة**)یە، كە هەر شتێكە پان ڕابخرێ، بەڵام بە مانای پەڕو هەر شتێك تێیدا بنووسرێ، بەكاردێ.

(**التِّلاَوَةُ: إِعَادَةُ الكَلاَمِ دوُنَ زِيَادَةٍ وَلاَ نَقْصٍ سَوَاء كَان مَكْتُوباً أَوْ مَحْفوُظاً**)، (**تِلاوة**): بریتیە لە دووبارەكردنەوەی قسەیەك بەبێ لێ زیادكردن و لێ كەمكردن، ئنجا چ نووسراو بێ، چ لەبەركراو بێ، هەردووكیان پێیان دەگوترێ خوێندنەوە، ئەو ڕەوانكراوە پەڕە پاككراوەكان، كە نووسراوە ڕێك و ڕاستەكانیان گرتبوونە خۆیان، تێیاندا تۆماركرابوون، بەسەریدا دەخوێندنەوە، مەبەست لە (كُتُبٞ ) كۆی (**كِتَابَ**)ە، یانی: (**مَكْتُوب**) نووسراوو، مەبەست پێیان:

أ- بەشەكانی قوڕئانە.

ب- یاخود سووڕەتەكانی قوڕئانە.

ج- یاخود ئەو حوكم و یاساو بەها بەرزانەن كە قوڕئان گرتوونیە خۆی.

کـە دەفەرمـوێ: (كُتُبٌ قَيِّمَةٌ)، (القَيِّمَـةُ: المُسْـتَقيمَةُ أَي: شَـديدَةُ القِيـامِ الَّـذي هُـوَ هُنَا مَجَـازٌ فِي الكَمَالِ وَالصَّـواب)، (قَيِّـم) بـە مانـای سـەرپەرشـتییکار، ڕێژگـەی زێدەڕۆییـە لـە (قَائِـم)، واتـە: سەرپەرشـتیارو (قَيِّمَةٌ)ش، یانـی: زۆر سەرپەرشـتیار، کـە لێـرەدا مەجـازە بـۆ تێـرو تەواویـی و ڕێـك و ڕاسـتیی، کەواتـە: هـەم خـاوەن کتێبـەکان، هـەم هاوبەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، واتـە: تێکـڕای ئەهـلی کوفـر چ ئەوانـەی ئاشـنای کتێبـەکانی خـوا بـوون، چ ئەوانـەی نـا ئاشـنا بـوون بـە کتێبـەکانی خـوا، هەموویـان چـاوەڕێ بـوون پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ بـێ، تاکـو دەسـتبەرداری ئەوەبـن کـە خۆیـان لەسـەرینی، دەیانـزانی لادان و گـۆڕان و لەبیرچوونـەوەو ... هتـدی، تێـدا کـراوە بـە نسـبەت کتێبـی خـاوەن کتێبەکانـەوە، بـە نسـبەت هاوبەش بۆ خـوا دانەرەکانیشـەوە، دیـارە ئەوانەیان کـە عەقـڵ و ویژدانێـکی زیندوویـان هەبـوو، دەیانـزانی ئـەوان لەسـەر ڕێیـەکی هەڵـەن و، چـاوەڕێ بـوون پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ بـێ، ئـەو بەڵگـە ڕۆشـن و ئاشـکرایەیان لـە خـواوە بـۆ بـێ، کـە بریتـی بـوو لـە ڕەوانەکراوێـك لـە خـواوە، لاپـەڕە پاککـراوەکانی بەسـەردا دەخوێندنـەوە، کـە نـووسراوە ڕێـك و ڕاسـتەکانیان گرتبوونـە خۆیـان.

٦)- ﴿ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ ﴾، ئەوانەش کە کتێبیان پێدرابوو پەرتەوازە نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکەیان بۆ هات، پێشێ فەرمووی: (لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ)، ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبان وهاوبەش بۆ خوادانەران دەستبەردارنەدەبوون (هی ڕێچکەو بەرنامەکانیان)، هەتا بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ نەیەت، لێرەش دەفەرموێ: (وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ )، ئەوانەی کتێبیان پێدرابوو پەرتەوازە نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکەیان بۆ هات، (ئەویش پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺو ئەو قورئانەیە کە دابەزێندراوەتە سەری، واتە: لەجیاتی ئەوەی لە دەوری ئەو بەڵگە ڕۆشنە کۆببنەوە، کە پێغەمبەری کۆتاییەو ﷺ پەیامی کۆتایی خوای پێدا نێردراوە، دوا فەرمایشتی خوای بۆ سەر دابەزێندراوە، لەجیاتی ئەوەی لە دەوری کۆببنەوە، بە پێچەوانەوە لە دەوری پرژان، کەمێکیان بڕوایان پێهێناو، زۆریان

هەر لەسەر ڕێچکەو بەرنامەکانی خۆیان مانەوە، لە دەوری کتێبە گۆڕدراوەکانی خۆیان مانەوە، لەبەرچی؟ چونکە:

أ- بەزم و بازاڕێکیان لەسەر ئەو بناغەیە سازکردبوو، ئامادە نەبوون دەستبەرداری ئەو بەرژەوەندییە حەرام و بەزم و بازاڕەی خۆیان بن.

ب- هەیانبوو حەسەدی هەبوو بەرانبەر بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، یاخود بەرانبەر بەنەتەوەی عەرەب بە گشتیی.

ج- هەیانبوو چاوەڕوانی ئەوەی کردوە ئەو پێغەمبەرە لە خۆیان بێ، کە جوولەکەکان بوون.

د- هەشبووە بەهەڵەدا چووە وەك نەصرانییەکان و پێیان وابوو عیسا پێغەمبەری کۆتایی خوایە، لە کۆتایی ڕۆژگاردا بەس ئەو دێ، نەیاندەزانی کە لە پێش ئەودا پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دێ، ئنجا عیسا عليه السلام پێش هاتنی ئاخیر زەمان، جارێکی دیکە دێ، بەڵام کە دێتیش هەر لەسەر ئەو ڕێبازە دەبێ کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هێناویەتی.

واتایەکی دیکەی ئەم ئایەتە ئەوەیە کە مەبەست لە (ٱلْبَيِّنَةُ)، پێغەمبەری کۆتایی ﷺ نیە، بەڵکو مەبەست پێی عیساو ئینجیلەکەیەتی و، موعجیزەکانی.

**(إبن عاشور)** وای لێکداوەتەوە دەڵێ:

ئەوانەی کتێبیان پێدرابوو تەنیا دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکەیان بۆ هات، پرژان، بەڵگە ڕۆشنەکەش مەبەست پێی عیسایە عليه السلام، ئەوانەش کە کتێبیان پێدراوە مەبەست پێیان جوولەکەکانن، کە دوای ئەوەی بەڵگە ڕۆشنەکەیان بۆ هات کە عیسایەو، ئینجیلەکەیەتی و، پەیام و بەرنامەکەیەتی، لە دەوری پرژان، بەس کەمێکیان بڕوایان پێهێناو بوونە شوێنکەوتووی عیسا و نەصرانیی، هەڵبەتە دوایی ئەوانیش زۆربەیان بە لاڕێدابران، بەڵام هەر ئەو کاتەش زۆربەی جوولەکەکان بڕوایان پێ نەهێنا.

بێگومانیـش ڕای زۆربـەی زانایـان و زۆربـەی ڕوونکـەرەوانی قورئـان ڕاسـتترە، کـە مەبەسـت لـە (ٱلۡبَيِّنَةُ)، هەمـان (ٱلۡبَيِّنَةُ)ی پێشـێیە، بەڵگـە ڕۆشـنەکە کـە پێغەمبەرێکـە لـە خـواوە، پـەڕە پاککراوەکانیـان بەسـەردا دەخوێنێتـەوە، کـە کتێـب و یاسـا ڕێـك و ڕاسـتەکانیان گرتوونـە خۆیـان، پێغەمبەرەکـە موحەممـەدە ﷺو، ئـەوەش کـە بەسـەریاندا دەخوێنرێتـەوە قورئانـە.

لێـرە خـوا ﷻ وەڵامـی پرسـیارێك دەداتـەوە: ئایـا ئەوانـە بۆچـی لـە دەوری پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ پـرژان و بـڵاو بـوون، لەجیاتی ئـەوەی لـە دەوری کۆببنـەوە؟

ئایـا لەبـەر ئەوەبـوو کـە کـەم و کوڕیـی و نوقسـانییەك لـەو پەیـام و بەرنامـەی پێغەمبـەری کۆتاییـدا هەبـێ؟

یـان ئایـا لەوێـدا فەرمانێکیـان پێکرابـوو -لـەو بەڵگـە ڕۆشـنەدا کـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ هێناویـەتی- کـە لـە توانایانـدا نەبـێ؟

خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

٧)- ﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ ﴾، فەرمانیشیان پێنەکرابوو مەگەر بەوەی بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ملکەچیی خۆیانی بۆ ساغ بکەنەوەو، بێ خڵتەی بکەن، لە حاڵێکدا کە پاك و لادەرن لە ناهەق بەرەو هەق، (ٱلدِّينَ) لێرەدا بە مانای (**طاعة**)ە، واتە: ملکەچیی خۆیان بۆ خوا ساغ بکەنەوەو خڵتەی پێوە نەهێڵن، (مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ)، واتە: ساغکەرەوەی ملکەچییەکەیان بن بۆ وی.

(**إِخْلاص**)یـش بریتیـە لـە سـاغکردنەوەو بژارکـردن، تەنیا بـەوە فەرمانیـان پێکرابوو، لێـرەدا دەفەرمـوێ: (وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ)، (وَمَآ أُمِرُوٓاْ) جێـداری بکـەر (**نائـب فاعل**)ەکـەی، قرتێنـدراوە، واتـە: (**وَمَـا أُمِـرُوا بِشَـيْئٍ إِلاَّ بِـأَنْ يَعْبُـدُوا اللـهَ**)، (بۆیـە قرتێنـدراوە تاکـو گشـتیی بـێ)، یانـی: بـە هیـچ شـتێك فەرمانیـان پـێ نەکرابـوو، مەگـەر بـەوەی بەندایەتیـی بۆ خـوا بکـەن و خواپەرسـتن، (مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ) سـاغکەرەوەی ملکەچیـی خۆیـان بـن بـۆی، (حُنَفَآءَ) کـۆی (**حَنيـف**)ە، کـە نازنـاوی

کەسێکەو، سیفەتی کەسێکە، خوادەپەرستێ بێ ئەوەی هاوبەشی بۆ دابنێ، وشەی (حَنيفْ) لە بنچینەدا: (المائِلُ: مِنَ البَاطِلِ إلَى الحَق)، (حَنيف): کەسێکە لە باتیڵەوە لایدابێ بەرەو هەق.

پێغەمبەر ئیبراهیم (عليه الصلاة السلام) بۆیە بە حەنیف ناوبراوە، چونکە کاتی خۆی هەرچی بیرو بڕوای ڕۆژگاری خۆی بووە، چ بیروبڕوای ئەوانەی خۆریان پەرستوە، یان مانگیان پەرستوە، یان ئەستێرەکانیان پەرستوون، یان دارو بەردیان پەرستوون، یان کەسەکانیان پەرستوون، دەستبەرداری هەموو ئەو بیرو موعتەقەدانە بووەو، هەموو ئەو پووچییەی وازلێهێناوەو گەڕاوەتەوە بۆ تەنیا خواپەرستیی، بۆیە کاتی خۆی بە ئیبراهیمیان گوتوە: (حَنيفْ)، واتە: لادەر، چونکە لەبیرو بڕوای پووچی خەڵکی ڕۆژگاری خۆی بە هەموو جۆرەکانیانەوە لایداوە بەرەو تەنیا خواپەرستیی، بۆیە بە لادەریان داناوە، بەڵام لادەر لە باتیڵەوە بەرەو لای هەق.

(حُنَفَآءَ) کۆی (حَنيفَ)ە، واتە: بە جۆرێك خوابپەرستن، کە لابدەن لە هەرچی پووچیی و بەتاڵیی هەیە، کە کاتی خۆی لەسەری بوون، پێش هاتنی پێغەمبەری کۆتایی ﷺو، بێنە سەر ئەو ڕاستە ڕێیەی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هێناویەتی، کە تەنیا خواپەرستییەو شوێنپێ هەڵگرتنی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٨)- ﴿ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، هەروەها فەرمانیشیان بەوە پێکرابوو نوێژ بەرپا بکەن و زەکاتیش بدەن.

ئەمانە دوو پایە گەورەکەی دینداریین، پایەی ڕووحیی و پایەی ماددیی، هەقی خواو هەقی خەڵك.

٩)- ﴿ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴾، ئائەوەش ئایینی ئۆممەتێکی ڕێك و ڕاستە، یاخود: ئایینی کتێبە ڕێك و ڕاستەکانە کە لە پەڕە پاکەکانی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دان، (ٱلْقَيِّمَةِ) یانی: (الشَّديدَةُ الإسْتِقامَة)، یەکجار زۆر ڕێك و ڕاست و بێ گرێ و گۆڵ.

## سێ کورتە سەرنج

### سەرنجی یەکەم:

خـوا ﷻ لـە ئایـەتی یەکەمـدا بـاسی خـاوەن کتێبـانی کـرد لەگـەڵ هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران، کـە ئەوانـە دەستبەرداری ئـەوەی خۆیـان لەسـەری بـوون، نەدەبـوون تاکـو بەڵگـەی ڕۆشـنیان بـۆ نەیـەت، ڕەوانەکراوێـك لـە خـواوە پـەڕە پاککراوەکانیـان بەسـەردا بخوێنێتـەوە، کـە نـووسراوە ڕێـك و ڕاسـتەکانیان تێـدان، بـەڵام دوایـی لـە پەرتـەوازە بوونیانـدا، تەنیـا بـاسی ئەوانـە دەکات کـە کتێبیـان پێـدراوە!

هـی پێشـێ فەرموویـەتی: (مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ)، بـەڵام لێـرە دەفەرمـوێ: (وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ)، ئەگـەر سـەرنج بدەیـن وەك پێشـتریش باسـمان کـرد، لـەو شـوێنانەدا کـە خـوا ﷻ دەیـەوێ: جوولەکـەو نەصرانییـەکان و خـاوەن کتێبـەکانی دیکـەی، کـە خۆیـان بـە شـوێنکەوتووی کتێبـە ئاسـمانییەکان دەزانـن، دڵیـان ڕابگـرێ، بـە خـاوەن کتێـب (أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ) ناویـان دێنـێ، بـەڵام لـە کاتێکـدا ڕەخنـەو سەرزەنشـتیان ئاڕاسـتە دەکات، بـە: (أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ) کتێـب پێـدراوان، ناویـان دێنـێ، بـۆ نموونـە:

أ- لە سوورەتی (النساء)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَـٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی کتێبتان پێدراوە! بڕوابێنن، بەو هەقەی دامانبەزاندوە، بەڕاستدانەری ئەوەیە کە لەگەڵتانە، بەر لەوەی ڕووانێك هەڵگێڕینەوە بەرەو دوا، یاخود نەفرینیان لێ بکەین، وەك چۆن نەفرینمان لە هاوەڵانی شەممە کرد.

أ- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴿٢٣﴾ ﴾**آل عمران،** ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوە!

بەڵام لە کاتێکدا بانگ بکرێن بۆ وتوویێژ، کە دەبێ دڵیان ڕابگیرێ، هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ ﴿٦٤﴾﴾، واتە: بڵێ: ئەی خاوەن کتێبەکان! وەرن بۆ وشەیەك کە یەکسانە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا.

ب- هەروەها هەر لە سوورەتی (آل عمران)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾، لە خاوەن کتێبان، کۆمەڵێك هەن ڕاوەستاون -لەسەر هەق- لە کاتی شەودا ئایەتەکانی خوا دەخوێننەوەو ئەوان کڕنووش دەبەن.

ئەوە لە حاڵێکدا کە خوای بەرز بیەوێ دڵیان ڕابگرێ، یان سەرنجیان ڕا بکێشێ، بەڵام لە کاتێك کاتی سەرزەنشت و ڕەخنە لێگرتندا، بە (ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ) ناویان هێندراوە.

لێرەش دەفەرموێ، (وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ)، بە: (أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ) کتێب پێدراوان، ناوی هێناون.

ئنجا پرسیار دەکرێ: بۆچی پێشێ باسی هەردووکیان دەکا، کتێب پێدراوان و هاوبەش بۆ خوادانەران، بەڵام لێرە تەنیا باسی کتێب پێدراوانەو دەفەرموێ: (وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ﴿٤﴾)؟

وەڵامەکەی ئەوەیە:

لەبەرئەوەی پرژان و پەرتەوازەبوونی کتێب پێدراوان لە دەوری پێغەمبەری کۆتایی ﷺ، زۆر ناشیرینترە لە هی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، کە شارەزای کتێبە خواییەکان نەبوون، ئەو موژدانەی لە تەورات و ئینجیلدا دراون، کە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دێ و ناوی ئەحمەدە، ئەوان بەوە شارەزا نەبوون و، هەر بە گشتیی چاوەڕێبوون پێغەمبەرێك بێ.

## سەرنجی دووەم:

کـە دەفەرمـوێ: (مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ)، ئەمـە دوو واتـای هـەن، یەکـەم: ملکەچیـی خۆیـان بۆخـوا سـاغ بکەنـەوەو خڵتـەی پێـوە نەهێڵـن، وەك شـیرك و جگـە لـە خـوا پـێ مەبەسـت بـوون (ریـاء).

یاخـود (مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ) واتـە: خۆیـان سـاغبکەنەوە لـە ملکەچییـدا بـۆ خـواو خڵتـە بـە خۆیانـەوە نەهێڵـن.

## سەرنجی سێیەم:

کـە دەفەرمـوێ: (وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ)، بـە (وَذَٰلِكَ) کـە نـاوی ئاماژەیـە بـۆ دوور، دەگوتـرێ: (هَـذا، ذَاكَ، ذَلِـكَ)، (ذَلِـك) یانـی: ئەمـە، ئـەوە، هـۆوە، بۆیـەش بـە ئامـاژەی بـۆ دوور هێناویـەتی، تاکـو هەسـت بکـرێ بـە پلـەی بـەرزو بـاڵا و، دووری ئـەو جـۆرە دینداریيـە ڕێـك و ڕاسـتە، (وَذَٰلِكَ) ئـا ئـەوەی باسـکرا، کـە بریتیـە لـە بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـوا بـە سـاغیی و، بـە لادانـەوە لـە هەرچـی پووچیـی و بەتـاڵ هەیـەو، بـەرەو لای هـەق گەڕانـەوە، پاشـان نوێـژ بەرپاکـردن و زەکات دان، ئـا ئـەوە ئاییـن و دینداریيـەکی هەتـا بڵێـی ڕێـك و ڕاسـت و پـاك و چاکـە.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی سەرەنجامی هەرە خراپی بێبڕوایان لە خاوەن کتێب و هاوبەش دانەران، کە ئاگری دۆزەخەو بە هەمیشەی تێیدا دەمێننەوە، ئەوانیش خراپترین دروستکراوانی خوان، هەروەها بڕوادارانی کردار باشیش باشترین دروستکراوانی خوان، جێگایان باخە هەمیشەیی و نەبڕاوەکانە، خوا لێیان ڕازییەو ئەوانیش لە خوا ڕازین، ئەوەش پاداشتی هەر کەسێکە سام و هەیبەتی هەبێ بەرانبەر بە خوا ﷻ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾ جَزَآؤُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّـٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَآ ﴾، بەدڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە ئاگری دۆزەخدان، بە هەمیشەی تێیدا دەمێننەوە، لێرەدا خوا ﷻ (إِنَّ)ی خستۆتە سەرەتای ئەم ڕستەیە، کە بۆ جەختکردنەوەو دڵنیاکردنەوەیە، ئەمەش بۆ هەڵوەشاندنەوەی لافلێدانی خاوەن کتێبەکان کە دەیانگوت: ئێمە ناسووتێنرێین و، سزا نادرێین و، ئەگەر سزاش بدرێین، کەمێك سزا دەدرێین، بە تایبەتیی جوولەکەکان ئەو پڕوپاگەندانەیان دەکردن، هەروەها نەصرانییەکانیش، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا، خوا ﷻ بە نسبەت هەردووکیانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ۚ قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ۖ بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ ﴿١٨﴾ ﴾، جوولەکەکان و نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە خۆشەویستان و کوڕانی خواین، (خوا دەفەرموێ:) بڵێ: ئەدی بۆچی

بەهۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدا؟ (وەك لە کتێبەکانی خۆتاندا هەیە)، بەڵکو ئێوەش بەشەرن، مرۆڤن، وەك ئەو مرۆڤانەی خوا دروستیکردوون.

لێرەش کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ ﴾، وشەی (مِنْ)، بۆ ڕوونکردنەوەیە، نەك بۆ هەندێك، چونکە ئەوانەی بێبڕوان لە خاوەن کتێبان، هەموو ئەوانەی خاوەن کتێب بوون، هەروەها هەموو ئەوانەی هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، هەموویان بێبڕوان، نەك هەندێکیان بڕوادار بن، کەواتە: (مِنْ)، بۆ بەشکردن (تَبْعيض) نیە، بەڵکو بۆ ڕوونکردنەوەیە، وەك یەکێك ترێی کڕیوە دەڵێ: (إشْتَرَيْتُ كِيلوياً عِنَباً) کیلۆیەك ترێم کڕی و، تۆش دەچی هەر لە جۆری ئەو ترێیە ئەو دەکڕی، دەڵێی: (وَأَنَا اشْتَرَيْتُ مِنْهُ كِيلوياً)، منیش لەو ترێیە کیلۆیەکم کڕی، بێگومان (مِنْهُ) بۆ بەشکردن (تَبْعيضْ) نیە، چونکە ئەو کیلۆ ترێیەی تۆ لە کیلۆ ترێیەکەی وی جیانەبۆتەوە، بەڵکو هەر لە جۆری ئەوەو (مِن) بۆ ڕوونکردنەوەیە، واتە: هەر لەوجۆرە.

٢)- ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە خراپترینی دروستکراوانی خوان، (نافِع و إبْن ذَكْوان)، لە (إبْنُ عَامِر)ەوە، تەنیا ئەوان خوێندوویانەتەوە: (أُوْلائِكَ هُمْ شَرُّ البَرِيئَة)، هەم لێرە هەم لە ئایەتەکەی دوایی دا، بەڵام (ٱلْبَرِيَّةِ) هەموو قورئانخوێنەکان وایان خوێندۆتەوە، (شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ): (شَرُّ الخَليقَة مِنْ بَرَأَ اللهُ الخَلْقَ: صَوَّرَهُم)، (شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ)، واتە: خراپترینی دروستکراوان، لە چییەوە هاتوە؟ (مِنْ بَرَأَ اللهُ الخَلْقَ: أَيْ صَوَّرَهُم)، واتە: خوا دروستکراوەکانی وێنە کێشان، هەندێکیش گوتوویانە: (ٱلْبَرِيَّةِ) لەوەوە هاتوە کە (خَلَقَ اللهُ الخَلْقَ مِنَ البَرَىَ أَيْ: تُراب)، (تراب) بەمانای گڵ دێ، بەڵام ئەم مانایە ڕێکترە، چونکە جند لەگڵ دروست نەکراون و، فریشتەکانیش لە ڕووناکیی دروستکراون، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بەڵام بێبڕوایان لە هەموو دروستکراوانی خوا خراپترن، ئنجا لە هەرشتێك دروستکرابن، وەك لە سووڕەتی (الأنفال)یشدا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی خراپترین پێرۆیان لە لای خوا، ئەوانەن کە بێبڕوان، (خراپترین ژیانداران)، چونکە ئەوانە بڕواناهێنن.

ئەوە بە نسبەت بێبڕوایانەوە لە خاوەن كتێبان و هاوبەش بۆ خوا دانەران.

٣)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بڕوایان هێناوەو كردەوە باشەكانیان ئەنجامداون، ئا ئەوانە باشترینی دروستكراوانن، (خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ : أَيْ أَفْضَلُ الخَلْقِ)، باشترینی دروستكراوان (ی خوا ﷻ).

٤)- ﴿ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٍ ﴾، پاداشتیان لە لای پەروەردگاریان باخە هەمیشەییەكانن، (جَزَآؤُهُمۡ ) پاداشتیان، (عِندَ رَبِّهِمۡ)، (عِندَ ) تێخراو (ظَرْف)ەو، ئاماژەیە بۆ ئەوەی پاداشتەكە زۆر مەزنەو، لە نیزیك خوای پەروەردگارە، خوای بێ وێنە لە خزمەت خۆیدا دایاندەنێ، (جَنَّٰتُ عَدۡنٍ)، (جَنَّٰتُ) كۆی (جَنَّة)یە، واتە: باخ، (عَدۡنٍ : عَدَنَ بالمَكَانِ أَيْ: أَقَام)، لە شوێنەكە دا نیشتەجێ بوو، (عَدۡنٍ ) چاوگە بە مانای نیشتەجێبوون، یانی: لە باخە هەمیشەییە نەبڕاوەكان دا نیشتەجێن.

٥)- ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، ڕووباریان بەژێر دادەڕۆن، یانی: باخەكان ڕووبار بە ژێر دارو درەختەكانیاندا دەڕۆن، جۆگەو جۆباریان بە ژێر دادەڕۆن.

٦)- ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ ﴾، بە بێ كۆتایی تێیاندا هەر ماو دەبن، (خَٰلِدِينَ فِيهَآ)، واتە: هەرماو دەبن لەو باخانەدا، (أَبَدٗا)، بەبێ كۆتایی، ئەمە وەصفی چەسپاوو هەمیشەیی جێگاو ڕێگای بڕوادارانە، كە خوا لە ڕۆژی دواییدا بۆ دۆستەكانی خۆی كە بڕوادارانن ئامادەی كردوە، كە باخەكانن و ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن و بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوەو لێیان ناچنە دەرێ، چونكە سرووشتی هەموو مرۆڤەكان وایە كەیفیان بە باخ دێ، كەیفیان بە ڕووبارو كانیاوو سەرچاوە دێ، كەیفیان بەهەمیشە مانەوە دێ، كەیفیان بە گوڵ و گوڵزار دێ، كەیفیان بە سێبەرو شوێنی پشوودان و خۆشیی دێ، كەیفیان بە میوەو خواردن و خواردنەوە خۆش و بەچێژەكان دێ، تا كۆتایی هەموو ئەو نازو نیعمەتانەی دیكە، كە خوا بۆ بەهەشتییەكان باسی كردوون.

٧)- ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾، خوا لەوان ڕازییەو ئەوانیش لەو ڕازیین، (أَيْ: رَضِيَهُم وَأَرْضَاهُم)، خوا لێیان ڕازییەو، ڕازییشی كردوون.

٨)- ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴾، ئەوەش بۆ کەسێکە سام لە پەروەردگاری بکات، (ذَٰلِكَ)، دیسان بە ناوی ئاماژەی دوور هاتوە، لەبەرچی؟ (لِعُلُوِّ المَرْتَبَة وَبُعْدِ المَنزِلَة)، لەبەر بەرزیی پێگەو دووریی ئەو پلەیەی بەوان دراوە، کە یەکجار بەرزەو یەکجار دوورە، کە دەفەرموێ: (ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ)، واتە: ئەو پاداشتەی باسکرا بۆ کەسێکە سام و هەیبەتی بەرانبەر بە پەروەردگاری هەبێ، (خَوْفُ و خَشيَة)، جیاوازییەکەیان ئەوەیە (خَوْف): بریتیە لە ترسان، بەڵام (خَشية): بریتیە لە سام لێکردن و هەیبەت لێکردن لەبەر بە مەزنگرتن.

لە کۆتایی ئەم دەرسەماندا سەرەتا فەرموودەیەك دێنین لەبارەی کۆی ئەم سوورەتە موبارەکەوەو، دواییش چوار سەرنجی گرنگی زانایان دەخەینەڕوو:

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَال: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ لِأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ: إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ (لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ)، قَالَ: وَسَمَّانِي لَكَ؟ قَالَ: نَعَم، فَبَكَى} (أخرجه البخاري: ٣٨٠٨، ومسلم: ٧٩٩، والنسائي: ٧١١).

واتە: ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئوبەیی کوڕی کەعبی فەرموو: خوا فەرمانی پێکردووم سوورەتی: ﴿ لَمۡ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡبَيِّنَةُ ①﴾، [تاکو ئایەتی کۆتایی] بەسەر تۆدا بخوێنمەوە، ئەویش گوتی: ناوی منیشی بۆ تۆ هێنا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئیدی ئوبەیی کوڕی کەعب گریا، هەقیشی بووە بگریی، کە خوا ناوی بهێنێ و فەرمان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بکات، ئەو سوورەتەی بەسەردا بخوێنێتەوە.

# چوار سەرنجی گرنگ

## سەرنجی یەکەم:

پێشەوا (**فَخْرَالدِّين الرَّازي**)، لە تەفسیرەکەی خۆیدا قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: (**اعْلَمْ أَنَّ العَبْدَ مُرَكَّبٌ مِنْ جَسَدٍ وَروحٍ، فَجَنَّةُ الجَسَدِ هِيَ المَوْصُوفَة فِي القُرآن، وَجَنَّةُ الروُح هِيَ رِضا الرَّبّ، وَالأوْلى مَبْدَأُ أَمْرِهِ، وَالثَّانِيَةُ مُنْتَهَى أَمْرِهِ**)، واتە: بزانە کە بەندە (مرۆڤ) پێکهاتوە لە جەستەو لە ڕووح، ئنجا بەهەشتی جەستە ئەوەیە کە لە قورئاندا باسکراوە، بەڵام بەهەشتی ڕووح بریتیە لە ڕازیبوونی پەروەردگار، بەهەشتی یەکەم سەرەتای کارەکەیەتی و، بەهەشتی دووەم کۆتایی کاری خوای بەرزی مەزنە.

## سەرنجی دووەم:

خاوەنی تەفسیری (**البَحرُ المَديد فِي تَفْسيرِ القُرآنِ المَجيد**)، چەند قسەیەك لە لێکدانەوە و مانای ئەو ئایەتانەدا لە تەفسیرەکەیدا[1] دێنێ، دەڵێ: (**قَال بَعْضُهُم: المَلائِكَةُ عَقْلٌ بِلاَ شَهْوَةٍ، وَالبَهَائِمُ شَهْوَةٌ، بِلاَ عَقْل، وَالآدَمِيُّ فِيه عَقْلٌ وَشَهْوة، فَمَن غَلَبَ عَقْلُهُ عَلى شَهْوَتِهِ، كَانَ كَالمَلاَئِكَةِ أَوْ أَفْضَل، وَمَن غَلَبَتْ شَهْوَتُهُ عَلَى عَقْلِهِ، كَان كَالْبَهائِمِ أَوْ أَضَلّ**)، واتە: فریشتەکان عەقڵن، بەبێ ئارەزوو و، ئاژەڵەکان ئارەزوون بەبێ عەقڵ، مرۆڤ هەم عەقڵی هەیە، هەم ئارەزوو، ئنجا هەر کەسێك عەقڵەکەی بەسەر ئارەزووەکەیدا زاڵبێ وەك فریشتان، یان چاکتریشە لەوان، هەر کەسێکیش ئارەزووەکەی بەسەر عەقڵەکەیدا زاڵبێ وەك ئاژەڵانە، یان گومڕاتریشە.

---

(١) ج٨، ص٣٣٦.

### سەرنجی سێیەم:

ئەوەش قسەی هەندێك لە زانایانە:

**(الإِخْلاصُ ثَلاثُ دَرَجاتٍ: الأُوْلى: أَنْ يَعْبُدَ اللهَ لِطَلَبِ غَرَضٍ دُنْيَوي أَوِ أُخْرَويٍّ مِنْ غَيْرِ مُلاَحَظَةِ أَحَدٍ مِنَ الخَلْق، والثَّانية: أَن يَعْبُدُ اللهَ لِطَلَبِ الآخِرَةِ فَقَط، وَالثَّالِثَة: أن يَعْبُد اللهُ عُبُوديَّةً وَمَحَبَّةً)**، واتە: خۆ ساغكردنەوە، (كردەوە ساغكردنەوە بۆ خوا) سێ پلەی هەن:

**١-** كە مرۆڤ خوا بپەرستێ بۆ داواكردنی ئامانجێكی دنیایی یاخود دوارۆژیی، بەڵام بەبێ ڕەچاوكردنی هیچكەس (لە دروستكراوەكان و تەنیا مەبەستی خوا بێ).

**٢-** پلەی دووەمی ئیخلاس ئەوەیە كە مرۆڤ خوا بپەرستێ، تەنیا بۆ وەدەست هێنانی ڕۆژی دوایی.

**٣-** پلەی سێیەم و هەرە بەرزی ئیخلاس ئەوەیە كە مرۆڤ خوا بپەرستێ، تەنیا وەك بەندایەتیی و خۆشویستنی خوا، بەبێ لەبەرچاو گرتنی دنیاو دوارۆژ.

### سەرنجی چوارەم:

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: **(الأَعْمَال ثَلاَثَةُ أَنْواع: مَأْمورات، ومَنْهيَّات، وَمُبَاحَات، فَالْمَأْمورات: الإِخْلاصُ فيها، خُلوُصُ النِّيَّةِ لِوَجْهِ اللهِ بِلا شَوبٍ، وَالمَنْهيَّات: تَرْكُها دُونَ نِيَّةٍ، خُروجٌ عَنِ العُهْدَةِ وَلا أَجْرَ لَهُ، وَبِالنِّيَّةِ مُثابٌ عَلَيْها، وَالمُبَاحَات: فِعْلُهَا بِلاَ نِيَّةٍ لا أَجْرَ لَهُ فِيهَا، وَبِالنِّيَّةِ مَأجورُ مُثَابٌ)**، واتە: كردەوەكان سێ جۆرن: فەرمان پێكراوەكان و، قەدەغەكراوەكان و، ڕەواكراوەكان، فەرمان پێكراوەكان و ئەركەكان، خۆ ساغكردنەوە بۆ خوا تێیاندا ئەوەیە كە نیازو هاندەرەكە، تەنیا ئەوەبێ ڕووی خواو ڕەزامەندیی خوای پێ ببرێ، بێ ئەوەی هیچ خلتەی تێدا بێ، ئەوجار پاداشتی دەبێ، قەدەغەكراوەكانیش واز لێهێنانیان بەبێ نیەت، بێگومان كارێكی باشە، بەڵام پاداشتی نیە، بەڵام واز لێهێنانی گوناهەكان بە مەبەستەوە بۆ

ئـەوەی خـوا لێـی ڕازی بـێ، پاداشـتی لەسـەرە، ڕەواکراوەکانیـش ئەنجامدانیـان بەبـێ نیـەت هیـچ پاداشـتیان لەسـەر نیـە، (کەسـێك نـان دەخـوات، خـۆی دەشـوات، وەرزش دەکات، کاسـبییەك دەکات، بـەڵام هیـچ نیـەتی نیـە خـوا لـە خـۆی ڕازی بـکات، ئـەوە شـتێکی ڕەوایـەو کردوویـەتی و تـەواو)، بـەڵام بـە نیەتـەوە پاداشـتی هەیـە، (کەسـێك لەگـەڵ کەسـێکدا تەوقـە دەکات، یـان لەگـەڵ کەسـێکدا ڕووی خۆشـەو قسـەی خۆشـە، یـان دەچـێ کاسـبیی حـەڵاڵ دەکات، یـان کەسـێك سـەر خەوێـك دەشـکێنێ بـۆ ئەوەی جەسـتەی بەهێـز بـێ، تاکـو دوایـی باشـتر بتوانێ ئەرکـە شـەرعییەکانی جێبەجـێ بکات، بێگومـان لەسـەر هەمـوو ئـەو کـردەوە لـە ئەسـڵدا ڕەوایانـە، پاداشـتی هەیـە)، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا بـە هـاوەڵانی فەرمـوو:

{وَفِي بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَيَأْتِي أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ فَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِي الحَرَامِ، أَلَيْسَ كَانَ يَكُونُ عَلَيْهِ وِزْرٌ أَوْ الْوِزْرُ؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِي الْحَلَالِ يَكُونُ لَهُ الْأَجْرُ} (أخرجه مسلم: ١٠٠٦)، واتـە: یەکێـك لـە ئێـوە کـە لەگـەڵ هاوسـەریدا جـووت دەبـێ، پاداشـتی هەیـە، گوتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ئایـا یەکێـك لـە ئێمـە ئـارەزووی خـۆی جێبەجـێ دەکات و پاداشـتیشی دەبـێ؟ فەرمـووی: ئایا ئەگـەر ئارەزووەکـەی لـە حەرامـدا دابنـێ، گوناهی نـاگات؟ گوتیـان: بـا، فەرمـووی: ئەگـەر لـە شـوێنی خۆیـدا دایبنـێ -بـە نیەتـەوە-، بێگومـان ئـەوە پاداشـتی دەبـێ.

خـوا بەبەزەیـی و بەخششـی بـێ سـنووری خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ، لـە جێبەجێکـردنی ئەرکـەکان و، واز لـێ هێنـانی گوناهـەکان و، لـە مومارەسـەکردنی شـتە ڕەواو حەڵاڵـەکان لـە هەموویـدا نیـازو مەبەسـتمان ئـەوە بـێ خوامـان لـێ ڕازیـی بـێ، بـۆ ئـەوەی لـە هەموویانـدا تـووشی پاداشـتی شایسـتە ببیـن.

لێرەشدا کۆتایی بەتەفسیری سوورەتی (البَيِّنَة)، دێنین.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـــڕۆ کــە (١٩)ی مانگــی (**ذي الحجــة**)ی ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچییــە، بەرانبــەر: (٩/ ٨/ ٢٠٢٠)ی زایینــی، لــە شــاری هەولێــر، خــوا پشــتیوان بــێ دەســت دەکەیــن بــە تەفســیرکردنی ســوورەتی (**زَلْزَلَــة**)، ســەرەتاش پێناســەو نێوەڕۆکــی ئــەم ســوورەتە موبارەکــە لــە حــەوت بڕگــەدا دەخەینــە ڕوو.

## پێناسە سوورەتی (الزلزلة) و بابەتەکانی

### ١)- ناوی ئەم سوورەتە:

ئــەم ســوورەتە جگــە لــە نــاوی باوترینــی کــە بریتیــە لــە: (**سُــورة الزَّلْزَلــة**)، بــەم ناوانــەش نــاسراوە:

١- (**سورةُ إذا زُلْزِلَتْ**).

٢- (**سورةُ الزِّلْزال**).

٣- (**سورةُ زُلْزِلَتْ**).

### ٢)- کات و شوێنی دابەزینی:

زۆربــەی هــەرە زۆری زانایــان ئــەم ســوورەتە موبارەکــە بــە مەککەیــی دادەنێــن، هەندێکیــش بــە مەدینەیــی، بــەڵام مەککەیــی بــوونی لەگــەڵ سرووشــتی ئــەم ســوورەتە موبارەکــەدا گونجاوتــرە، ئەوەنــدە هەیــە ئەگــەر بەڵگــە هەبــێ لەســەر مەدینەیــی بوونی،

ئـەو کاتـە گونجاویـی سرووشـتی سـووڕەتەکە لەگـەڵ قورئـانی مەککەییـدا، وامـان لـێ نـاکات هـەر بڵێیـن مەککەییـە، مـادام بەڵگـە هەبـێ لەسـەر مەدینەیـی بـوونی، لـەو بـارەوەش چەنـد دەقێـك هـەن پێـمان دەڵێـن، ئـەم سـووڕەتە لـە مەدینـە دابەزیـوە.

یەکێك لە دەقەکانیش ئەمەیە:

**(عَـنْ عَبْـدِ اللهِ ابْـنِ عَبَّـاس ﵄ قَـال: نَزَلَـتْ سـورةُ إذا زُلْزِلَـتْ بِالمَدِينَة) (ذكره السيوطي في الـدر المنثـور:** ج٨ ص٥٩٠، **ونسـبه لابـن مَرْدَوَيـه، وَأَخـرج ابْـن مَردَوَيـه عَـن قَتَـادة: نَزَلَـتْ بِالمَدينَـة إذا زُلْزِلَـت)**[١].

واتــە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﵄ گوتوویـەتی: سـووڕەتی **(إذا زُلْزِلَـتْ)** لـە مەدینـە دابەزیـوە، هەروەهـا ئیبنـو مـوڕدەوەی لـە قەتـادەوە هێناویـەتی گوتوویـەتی: **(إذاَ زُلْزِلَـتْ)** لـە مەدینـە دابەزیـوە.

هەروەهـا لـەو بـارەوە دوو دەقـی دیکـەش هـەن، مەدینەیـی بـوونی زاڵ دەکـەن، کـە لـە باسـی هـۆی هاتنـە خـواردا، ئـەو دوو دەقـە دێنیـن، بـەڵام بێگومـان مـرۆڤ یەقینـی هـەر بـۆ پەیدانابـێ کـە ئـەم سـووڕەتە هـەر مەدینەییـەو، دەشـگونجێ مەککەییـش بـێ، بـا زۆرێـك لـە زانایانیـش بـە مەدینەییـان دانابـێ.

## ٣)- ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

لـە موصحــەف دا ژمارەکـەی، نـەوەدو نۆیەمیـن، لـە دابەزینیشـدا نـەوەدو چوارەمیـن (٩٤) سـووڕەتە، بەپێـی ڕای **(جابـر بـن زیـد)** و **(الجعفـري)**، کـە هۆنراوەیەکـی هەیـە بـاسی ڕیزبەندیـی سـووڕەتەکان دەکات لـە دابەزینیانـدا، ئەوانـە هەردووکیـان دەڵێـن (٩٤)ەمیـن، سـووڕەتە، پێـش سـووڕەتی **(الحدیـد)** دابەزیـوەو، دوای سـووڕەتی **(النسـاء)**.

---

(١) الإِسْتِيعاب فِي بَيان الأَسْباب: ج٣ ص٥٤٧.

## ٤)- ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربەی زانایان ژمارەی ئایەتەکانییان بە نۆ (٩) داناون، بەڵام هەندێکیان بە هەشت (٨)یان، داناون، بەهۆی لەتکردنی ئایەتی: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ۝٦ ﴾، کە ئەگەر لێرە بوەستی: (يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا)، دوایی (لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ) بێ، ئەوە مانای وایە دەبێ بەدوو ئایەت، بەڵام ئەگەر لەت نەکرێ و هەمووی بەسەر یەکەوە بێ، دەبێتە یەك ئایەت، بەڵام موصحەفەکانی کە لەبەر دەستی ئێمەدا هەن، بە زۆریی بە پێی خوێندنەوەی (حفص)ن و، ژمارەی هەشتیان تەبەنیی کردوە.

## ٥)- نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەته هەمووی باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردوو قۆناغی کۆتایی پێهاتنی گەردوون و، هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەی مرۆڤ و جند، واتە: ئاخیر زەمان و قیامەت، پێنج ئایەتی یەکەم باسی ئاخیر زەمانن، سێ ئایەتی دواییش باسی قیامەتن، ئەوەش بە ڕاو بۆچوونی بەندە، ئەگەرنا دەشگونجێ بگوترێ: ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ ﴾، وەك زۆرێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان وایان ماناکردوە، گوتوویانە: ئەوە مەبەست پێی قیامەتە، بەڵام من پێم وایە پێنج ئایەتی یەکەم، هەموویان باسی ئاخیر زەمان و کاتی تێکچوونی گەردوونن و، سێ ئایەتی کۆتایی باسی هەڵسانەوەو سزاو پاداشتدرانەوەو قیامەتن.

## ٦)- تایبەتمەندییەکانی:

دەتوانین ئەم چوار تایبەتمەندییە لەم سووڕەتەدا بخەینەڕوو:

١- باسی لەرزێنرانەوەی تایبەتی زەوی: ﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١ ﴾، لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا هاتوە، بەڵێ لە شوێنی دیکەدا بە تەعبیری دیکە هاتوە: ﴿ إِذَا رُجَّتِ

﴿ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥ ﴾**الواقعة**، هەروەها لە سوورەتی (**الإنشقاق**) دا ﴿ إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ١ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٢ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥ ﴾، بەڵام بەو تەعبیرەی ئێرە، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

٢- باسی هەواڵگێڕانەوەی زەوی کە خوا سرووشی بۆ کردوە وابکات: ﴿ يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ٤ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ٥ ﴾، لەو ڕۆژەدا (زەوی) هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، کە پەروەردگاری سرووشی بۆ کردوە (ئاوا بلەرزێتەوە)، بێگومان ئەو هەواڵگێڕانەوەیەی زەوییش بە زمانی حاڵە، وەك زۆربەی یاخود زۆرێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان وایانگوتوە، هەڵبەتە لەلای خوای باڵادەست ئاسانە زەوییش بێنێتە گۆ، بەڵام (**الطبري**)و زۆرێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست پێی زمانی حاڵە، وەك گوتراوە: (**قَالَ الجِدارُ لِلوَتَدِ لِمَ تَشُقُّنِي؟ قالَ إِسْأَلْ مَن يَدُقُّنِي**)، دیوار بە سینگی گوت: بۆچی لەتم دەکەی؟ سینگەکە گوتی: لەو کەسە بپرسە کە دامدەکوتێ! بەدڵنیایی ئەو وتوێژو دیالۆگەش بە زمانی حاڵە.

٣- باسی دەرچوونی خەڵك بە پرژوبڵاویی بۆ پیشاندرانی کردەوەکانیان: ﴿ يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٦ ﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵك بە پرژو بڵاویی دەردەچن (لە گۆڕەکانیان، یان لە شوێنێ کە جەستەیانیانی تێدابووە)، تاکو کردەوەکانیان پیشانبدرێن، بۆیانیان ڕابنوێنرێن.

٤- باسی دیتنی مرۆڤ بۆ کەمترین چاکەو خراپەی خۆی: ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨ ﴾، واتە: ئنجا هەر کەس بە گرانایی گەردێك چاکە بکات دەیبینێ و، هەر کەسێکیش بە گرانیی گەردێك خراپە بکات دەیبینێ، کە لە هەموو قورئاندا ئەم دوو تەعبیرە تەنیا لێرەدا هاتوون.

## ٧)- دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

ئێمە کۆی ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە دەکەینە دەرسێك، لەبەرئەوەی لە یەك بابەت دەدوێن، هەمووشیان پێکەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

پێشتریش باسمان کرد، ئەم سووڕەتە موبارەکە هەمووی باسی ڕۆژی دوایی دەکات، بە هەردووك قۆناغی ئاخیر زەمان و هەڵسانەوەو قیامەتەوە، پێنج ئایەتی یەکەم باسی ئاخیر زەمان دەکەن.

خوا فەرموویەتی: بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە:

﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١﴾، هەر کاتێك زەوی بە لەرزینەوە تایبەتەکەی خۆی، لەرزێندرایەوە، جووڵێندرا، تێکڕاشەقێندرا.

﴿وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ۝٢﴾، زەوییش قورساییەکانی خۆی، گرانابیەکانی خۆی دەرهاوێشت وەك لە سووڕەتی (**إنشقاق**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ۝٤﴾، هەرچی تێیدابوو دەریهاوێشت و خۆی خاڵیی کردەوە، خۆی بەتاڵ کرد.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ۝٣﴾، مرۆڤیش گوتی: ئەو (زەوی) چییەتی؟ ئەو مرۆڤانەی لەوێن، یان ئەگەر گریمان بکرێ مرۆڤی لێبن، دەڵێن: زەوی چییەتی چی بۆ وا دەکات؟ چی لێ هاتووە؟ چ شتێك لێی ڕوویداوە بەو شێوەیە دەلەرزێتەوە، تاکو ئێستا وا نەلەرزیوەتەوە؟

﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ۝٤﴾، لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس دەکات، دەگێڕێتەوە.

﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ۝٥﴾، ئنجا بەهۆی ئەوەوەیە کە پەروەردگارت سرووشی بۆ کردوە، فەرمانی پێکردوە، بۆیە بەو شێوەیە دەکات، ئەوە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی.

قۆناغی دووەم: خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵك كۆمەڵ كۆمەڵ بە پرژوبڵاویی دێنەدەر (لە شوێنەكانی خۆیان)، تاكو كردەوەكانی خۆیانیان پێشان بدرێن، ئنجا دەبن بەدوو بەش، یاخود كردەوەكانیان هەرچییەك بن بە گشتیی دوو جۆرن: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾، ئنجا هەر كەسێك هێندەی گرانایی گەردێك چاكەی كردبێ، دەیبینێتەوە، مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان، هەر كەس كردەوە چاكەكانی خۆی دەبینێتەوە.

﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾، هەروەها هەر كەسێك بە ئەندازەی گرانایی گەردێك خراپەی كردبێ، ئەویش دەیبینێتەوە، بڕوادار بێ، یان بێبڕوا، چاكەكار بێ، یان خراپەكار، ئەمە قسەی زۆر هەڵدەگرێ و دوایی قسەی لەسەر دەكەین، كە چۆن هەموو كەس چاكەو خراپەی خۆی دەبینێتەوە؟ ئایا بێبڕوایان ئەگەر لە دنیادا چاكەیەكیان كردبێ، لە ڕۆژی دوایی دا كە دەیبیننەوە، بەهرەمەند دەبن لەو چاكەیە؟ هەروەها ئایا بڕواداران لە خراپە گچكەكانیان زەرەرمەند دەبن، كە دەیانبیننەوە؟ دوایی قسە لەو بارەوە دەكەین.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا۟ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەر کات زەوی بەلەرزینەوە تایبەتەکەی لەرزێندرایەوە ﴿١﴾ زەویی قورساییەکانی خۆشی دەرهاویشتن ﴿٢﴾ مرۆڤیش گوتی: ئەوە زەوی چییەتی، بۆچی وا دەکات؟ ﴿٣﴾ لەو ڕۆژەدا زەوی باسی هەواڵەکانی خۆی دەکات ﴿٤﴾ کە بە هۆی ئەوەوەی پەروەردگارت سرووشی بۆ کردوە، (ڕاگەیاندوە) وا بکات (وا دەکات) ﴿٥﴾ لەو ڕۆژەدا خەڵك بە پرژوبڵاویی دەردەچن تاکو کردەوەکانیان پێشان بدرێن ﴿٦﴾ ئنجا هەر کەس هێندەی گرانایی گەردێك چاکەی کردبێ دەیبینێ ﴿٧﴾ هەر کەسیش هێندەی قورسایی گەردێك خراپەی کردبێ، دەیبینێ ﴿٨﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(زُلْزِلَتِ ): (**التَّزَلْـزُلُ: الإِضْطِـرابُ، وَتَكْرِيـرُ حُـرُوفِ لَفْظِـهِ، تَنْبِيـهٌ عَـلى تكْرِيرِ، مَعنـى الزَّلَلِ فِيـهِ**)، (**تَزَلْـزُل**): بە مانای لەرزینەوەو جووڵە جووڵ و هەژانە، پیتی بێژەکەی کە دووبارە کراوەتەوە (**التَّزَلْـزُل**)، ئەمە بۆ ئاگادارکردنەوەیە لەوەی مانای (**زَلَـلْ**)، لەو وشەیەدا دووبارە بۆتەوە، (**زَلَّ**)، واتە: لاچوو، (**زَلَـلْ**) واتە: خلیسکان و لاچوون، (**تَزَلْـزُل**) مانای هەژان و ڕاشڵەقێندران و جووڵێندران.

(أَثْقَالَهَا): (**الأَثْقـالُ جَمـع ثِقْـل، أَو ثَقَـلْ، والثِّقْـل: كُلُّ شَيء ثَقيـل، وَالثَّقَـل كُلُّ شَيء نَفيـس**)، (**أَثْقـال**) دەگونجێ کۆی (**ثِقْـل**) بێ، واتە: قورسایی، (**ثِقْـل**) هەر شتێکە قورسبێ و، چاوگە. (**ثَقَلْ**)یش هەر شتێکە بەنرخ بێ، (**الثَّقَـلان**) واتە: دوو قورسەکان، کە مەبەست پێی جندو مرۆڤن، لەسەر زەوی.

(تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا): (الحَديثُ: الكَلامُ، وَالتَّحَدّثُ: التَّكَلُّم)، (حَديث) بە مانای قسەیە (تَحَدُّث) بەمانای قسەکردنە، (التَّحْديثُ: صُدورُ كَلامٍ بِخَبَرٍ عَنْ حَدَث)، (تَحْديث)، بریتییە لە دەرچوونی قسە لەبارەی هەواڵدانێکەوە لە ڕووداوێك، هەواڵدانیش لەبارەی ڕووداوێکەوە، شتێکە کە پەیدابووە.

(أَوْحَىٰ لَهَا): (أَيْ: أَوْحى إِلَيْها وَتَعْدِيَتُهُ بِلام، لِتَضمُّن مَعْنى: قَال)، (أَوْحَىٰ لَهَا)، لە ئەسڵدا (أَوْحَى إِلَيْها)، سرووشی بۆ لاکرد، پەیامی بۆ لا نارد، بەڵام لێرە لەجیاتی بفەرمووێ: (أَوْحى إِلَيْها)، وەك: ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ ﴿١٢﴾﴾ الأنفال، واتە: کاتێك پەروەردگارت سرووشی بۆ لای فریشتەکان دەکرد کە من لەگەڵتانم، بەڵام لێرە دەفەرمووێ (أَوْحَىٰ لَهَا)، بۆیەش بە (ل) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای گوتی (قال)ی، بخرێتە نێو، وێڕای ئەوەی مانای سرووشی تێدایە، یانی: (أَوحى إِلَيْها وَقَالَ لَهَا)، پەروەردگارت سرووشی بۆ لا کردووەو پێشی فەرمووە.

(يَصْدُرُ النَّاسُ): (الصُّدورُ: الخُروجُ عَنْ مَكَانِ الإِجْتِماع)، (صُدُور): دەرچوونە لە شوێنی لێ کۆبوونەوە، (صَدَرَ عَنِ المَكانِ أَيْ: تَرَكَهُ وَخَرَجَ، وَعَكْسُهُ: وَرَدَ)، (صَدَرَ عَنِ المَكان)، واتە: لە شوێنەکە دەرچوو بەجێیهێشت، پێچەوانەکەی (وَرَدَ)یە، یانی: هات، بۆی هات، وەك لە سووڕەتی (القَصَص)دا، خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ ﴿٢٣﴾﴾، واتە: کاتێك مووسا چوو بۆ قەراغ و نیزیکی ئاوەکەی مەدیەن، کەواتە (يَصْدُرُ النَّاسُ)، یانی: خەڵك دەردەچن.

(أَشْتَاتًا): (أَشْتَاتْ جَمْعُ شَتٍّ، وَالشَّتُّ: المُتَفَرِّقُ أَي: يَخْرجونَ مُتَفَرِّقِينَ جَمَاعَاتٍ)، (أَشْتَات) کۆی (شَتٌّ)ە، بەمانای پرژوبڵاو، لێکبڵاو، کەواتە (يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا)، خەڵك دەردەچن لە گۆڕەکانیان دەردەچن، لە زەوی دەردەچن، بە پرژوبڵاویی، کۆمەڵ کۆمەڵ و پرژو بڵاو.

(مِثْقَالَ): (المِثْقالُ: مَا يُوزَنُ بِهِ، وَهوَ مِنَ الثِّقْل)، (مِثْقَالَ)، واتە: بارتەقای ئەو شتە لە گرانایی، (مَا يُوزَنُ بِهِ)، شتێك کە شتێکی پێ بکێشرێ بە ئەندازەی خۆی بێ، لە (ثِقْل)ەوە هاتوە، یانی: قورسایی.

(ذَرَّةٍ ): (الـذَّرَّةُ: النَّمْلَـةُ الصَّغـيرةُ فـي ابْتِـداءِ حَيَاتِها)، (ذَرَّةٍ ): بریتیـە لـە مێـرووی بچـووك، مێـرووە سـوورە بچووکـەکان لـە سـەرەتای دروسـتبوونیدا کـە زۆر بچووکـەو، (أَوِ الـذَّرَّةُ الغُبـارِ الَّـذي يُـرى فـي الشُّعَاعِ)، گـەردی بیـنراو لـە تیشـکدا، کاتێـك تیشـکی خـۆر دێتـە ژووری لـە پەنجەرەیەکـەوە، ئـەو شـتە وردانـەی بەهـۆی تیشـکی خـۆرەوە دەبیندرێـن، هەرکامێـکان پێـی دەگوتـرێ: (ذَرَّةٍ )، واتـە: تـۆزو گـەردی زۆر ورد، کـە لـە حاڵـەتی ئاسـاییدا نابیندرێـن، مەگـەر تیشـکی خـۆر لێیـان بـدات و دەربکـەون.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سووڕەتە

لە بارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سووڕەتە موبارەکەوە، سێ گێڕدراوان دێنین:

١- {عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرو بْنِ العَاص، رَضيَ اللهُ عَنْهُما، أَنَّهُ قَالَ: أُنْزِلَتْ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١﴾، وأَبو بَكرٍ الصِّدِّيق قَاعِدٌ رَضيَ اللهُ عَنْهُ، فَبَكى حِينَ أُنْزِلَتْ، فَقَال لَهُ رَسولُ اللهِ ﷺ: مَا يُبْكِيكَ يا أَبا بَكْرٍ؟ قَال: يُبْكيني هَذهِ السُّورَة، فَقَالَ لَهُ رَسولُ الله ﷺ: لَوْلاَ أَنَّكُم تُخْطِؤُنَ وَتُذْنِبونَ، فَيَغْفِرُ اللهُ لَكُمْ، لَخَلَقَ اللهُ أُمَّةً يُخْطِؤُنَ وَيُذْنِبونَ فَيَغْفِر لَهُم} (أخرجه الطبري في جامع البيان: ج٣٠، ص١٧٥، والواحدي في أسباب النزول: ص٣٠٤، وابن أبي الدنيا في الرِّقة والبُكاء، ص٧٥، والطبراني في الكبير: ٨٧، والبيهقي في شعب الإيمان: ٧١٠٣، قلنا: وهذا سندٌ حسنٌ رِجاله ثقاتٌ، رِجال الصَّحيح، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٤٩).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـڕی کـوڕی عـاص (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، گوتوویـەتی: کاتێـك ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۝١﴾ دابـەزی ئەبـوو بەکـری صیدیـق (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دانیشـتبوو، گریـا، پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێـی فەرمـوو: ئـەی ئەبـوو بەکـر چ شـتێك دەتگریەنـێ؟ گوتـی: ئـەم سـووڕەتە دەمگریەنـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ئەگـەر ئێـوە هەڵـەو گوناهتـان نەکردبایـە، کـە خـوا لێتـان ببـوورێ، خـوا کۆمەڵێـکی دیکـەی دروسـت دەکـردن، هەڵـە بکـەن و گونـاح بکـەن، ئەویـش لێیـان ببـوورێ.

٢- {عَن أَبِي أَيّوب الأَنْصاري رَضيَ اللهُ عَنْه، قَال: بَيْنَمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَبو بَكرٍ الصِّدّيق، إِذْ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَة: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾، فَأَمْسَكَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ عَنِ الطَّعام، ثُمَّ قَالَ: مَنْ عَمِلَ مِنْكُم خَيْراً فَجَزاهُ فِي الآخِرَة، وَمَن عَمِلَ مِنْكُم شَراً يَراهُ فِي الدُّنيا مُصيباتٍ وَأَمراض، وَمَن يَكُن فِي مِثْقالَ ذَرَّةٍ مِن خَيْرٍ دَخَلَ الجَنَّة} (ذكره السيوطي في الدُّرِّ المَنثور: ج٨، ص٥٩٤، وَنَسبه لابن مُرْدَوَيه، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٥٠).

واتە: ئەبوو ئەیيوبی ئەنصاریی (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبووبەکری صیددیق خوا لێی ڕازیبێ پێکەوەبوون، ئەم ئایەتە موبارەکە دابەزیە سەر پێغەمبەر ﷺ: [هەر کەسێك گرانایی گەردێك چاکە بکات، دەیبینێتەوەو، هەر کەسێك گرانایی گەردێك خراپە بکات دەیبینێتەوە]، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لە خواردنەکە ڕاگرت و کێشایەوە، دوایی فەرمووی: هەر کەسێك لە ئێوە چاکە بکات، پاداشتەکەی لە ڕۆژی دوایی دایەو، هەر کەسێك لە ئێوە خراپە بکات، لە دنیادا سزایەکەی لە شێوەی بەڵاو نەخۆشییدا دەبینێ و، پێی سزا دەدرێ، هەر کەسێك بە ئەندازەی گەردێك چاکەی تێدابێ دەچێتە بەهەشت، (واتە: دوای ئەوەی سزا دەدرێ و پاك دەبێتەوە، ئەگەر شایستەی سزادران بێ، دوای ئەوە هەر دەچێتە بەهەشت).

٣- {عَنْ سَعيدِ بْنِ جُبَيْرٍ رَحِمَهُ الله، قَالَ: لَمَا نَزَلَتْ: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ۝٨ ﴾ الإنسان، كَانَ المُسْلِمون يَرَوْنَ أَنَّهُم لا يُؤجَرونَ عَلى الشَّيء القَليل، إِذا أَعْطَوْهُ، وَكَانَ آخَرونَ يَرَوْنَ أَنَّهُم لا يُلامُونَ عَلَى الذَّنْبِ اليَسرِ؛ الكِذْبِ والنَّظْرَةِ وَالغيبَةِ، وَأَشْبَاهِ ذَلِك، وَيَقولونَ: إِنَّ مَوْعِدَ اللهُ النَّار عَلى الكَبَائِرِ، فَأَنْزَل الله: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾}، (ذكره السيوطي في لباب النقول، ص٢٣٣، وَالدرّ المَنثور: ج٨، ص٥٩٤ - ٥٩٥، ونسبه لابن أبي حاتم، قُلنا: وهو ضعيف لإرساله).

هەر سێك گێڕدراوەکەم لە (الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٤٩ - ٥٥٠) هێنان.

واتـە: سـەعیدی کـوڕی جوبەیـر ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، (کـە یەکێکـە لـە زانایانی گـەورەی جیـلی دوای هـاوەڵان، شـوێنکەوتووان)، دەڵـێ: کاتێـك ئـەم ئایەتـە موبارەکـە دابەزیـوە: ﴿ وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ﴿٨﴾ ﴾ الإنسـان، مسـوڵمانان پێیـان وابـوو لەسـەر شـتی کـەم ئەگـەر ببەخشـن، پاداشـتیان نابـێ، هەندێـکی دیکـەش پێیـان وابـوو لەسـەر گوناهێـکی کـەم وەك: درۆیـەك و، ڕوانینێـکی قەدەغـەوو باسـکردنێکی پـاش ملـەو، وێنـەی ئەوانـە، سەرزەنشـتیان ناکـرێ و، سـزایان نـادرێ، دەیانگـوت: خـوا لەسـەر گوناهـە گـەورەکان بەڵێنـی داوە کـە بـە ئاگـری دۆزەخ [بسـووتێنرێین]، ئیـدی خـوا ﷻ ئـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەی دابەزانـدن: هەرکەسـێك بەقـەدەر گرانایـی گەردێـك چاکـە بـکات دەیبینێتـەوەو، هـەر کەسـێك هێنـدەی گرانایـی گەردێـك خراپـە بـکات، دەیبینێتـەوە.

بـۆ ئـەوەی ئـەو بیروبۆچوونـە چەوتانەیـان نەبـن، کـە پێیـان وابـێ مەگـەر لەسـەر چاکـەو خێـری گـەورە، یاخـود لەسـەر گوناهـی گـەورە، ئەگەرنـا پاداشـت و سـزایان نابـێ، نەخێـر وانیـە، چاکـەو خراپـە هەرچەنـدە کەمیـش بـن، بـەڵام بـە ئەنـدازەی خۆیـان، ئەگـەر چاکەبـن پاداشـت و، ئەگـەر خراپەبـن، سـزایان لەسـەر دەبـێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسۡـمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بەنـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە، زۆرجـار گوتومانـە: کاتێـك مـرۆڤ دەڵـێ: (بِسۡـمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، چ بـۆ خوێنـدنی سـوورەتێکی وەك ئـەم سـوورەتە موبارەکـە بـێ، چ بـۆ هـەر کارێـکی دیکـە بـێ، پێویسـتە چـوار واتایـان لـە عەقـڵ و دڵـی خۆیـدا ئامـادە بـکات:

١- ئەم کارە بەناوی خوا ئەنجام دەدەم، نەك بەناوی خۆم، یان بەناوی نیشتیمان، یان بەناوی فڵان یان فیسارکەس، یان فڵان شت بەڵکو بەناوی خوا، چونکە هەموو

شتێك هی خوایەو، پێویستە هەركارێك دەكرێ ناوی خوای لێ بهێنرێ، ئەگەر بویسترێ بەرهەمدارو بەرەكەتدار بێ.

**٢-** ئەم كارە دەكەم بەپێی بەرنامەی خوا و، بەپێی ڕێ و شوێنك كە خوا دایناوەو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێیدا ڕۆیشتوە.

**٣-** ئەم كارە ئەنجام دەدەم بەمەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خواو پاداشتی خوا، نەك بۆ سەرنج ڕاكێشانی خەڵك و، خۆ مرۆڤ چاككردن، یان بۆ دەسكەوتێكی دنیایی، بەڵكو بۆ ئەوەی خوا لێم ڕازیبێ و پاداشتم بداتەوە، ئنجا شتێك كە بۆ خوا دەكرێ و، تەنیا بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا، مانای وانیە بەرهەمی دنیاییشی نابێ، بەڵكو بەرهەمی دنیاییشی دەبێ، بەڵام كارێك كە دەبێ بۆ خوا بكرێ، وەك بەندایەتیی بۆ خوا، مرۆڤ نابێ سەرنجی بەرهەمە دنیاییەكەی بدا، چونكە وەك پەرستشێك، ئەگەر پەرستش بێ، بەڵام ئەگەر كاروباری دنیایی بێ، وێڕای ئەوەی بۆ خوا ئەنجامی دەدەی، ئەگەر یارمەتییدانی لێقەوماوێكە، بەدەمەوەچوونی بابایەكی هاوار تێبەستووتە، یان چاكە كردنێكەو، قسەی خێر كردنێكە، وێڕای ئەوەی بۆ خوا ئەنجامی دەدەی، دەبێ تەماشای چۆنیەتی ئەنجامدانەكەی و بەرهەمە دنیاییەكەشی بكەی، بەڵام لە پەرستشەكاندا تەنیا تەماشا ئەوە دەكرێ، كە بۆخوا ئەنجامی دەدەی، بێگومان هیچ شتێكیش نیە خوا فەڕزی كردبێ لەسەر بەندەكانی خۆی، لە هەردوو بواری پەرستشەكان و هەڵسوكەوتەكاندا، مەگەر پڕە لە حیكمەت و سوود لە دنیاو دواڕۆژدا، بەڵام لە پەرستشەكاندا تەماشای بەرهەم و ئەنجامە دنیاییەكەی ناكەی و، دڵنیاشی كە بەرهەم و ئەنجامی ڕواڵەتیی و دنیاییشی هەیە، بەڵام تۆ ڕەچاوی ئەوە ناكەی و تەنیا ڕەچاوی ئەوە دەكەی خوا ئەوەی فەڕزكردوەیان، بە پەسندی داناوەو تۆش ئەنجامی دەدەی.

**٤-** مانای چوارەم كە دەبێ بە عەقڵ و دڵدا بهێنرێ ئەوەیە: من ئەم كارەی ئەنجامی دەدەم بە كارئاسانیی خواو، بە وزەو توانایەك كە خوا بۆی ڕەخساندووم ئەنجامی دەدەم، نەك بە شان و شەوكەتی خۆم، یان بەهۆی فڵان كەسەوە، یان پارەو سامان، یان بەهۆی قەڕەباڵغیی دەوروبەرمەوە، چونكە قەڕەباڵغیی دەوروبەر و، هۆكارەكانیش،

هەرچی بن، بەس خوا ڕەخساندوونی و، تۆ چاوت لە هۆکارسازەو، لەبەر هۆکارەکان ئاگات لە هۆکارساز نابڕێ، کە هۆکارەکانی ڕەخساندوون و سازاندوون.

خـوا دەفەرموێ: ﴿ إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ﴾، هـەر کات زەوی لەرزێندرایەوە بە لەرزێندرانـەوە تایبەتەکـەی خـۆی، ئـەو لەرزێندرانەوەیـەی بەتایبـەت بـۆی دانـدراوە، کـە مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە لـە قۆناغـی یەکەمیـدا، لـە دوای فـووی یەکـەم بـە کەڕەناداکـران، وەك دەفەرمـوێ: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ﴾الزمـر، واتـە: فـوو بـە کەڕەنـادا کـرا هـەر کەسـێك لـە ئاسـمانەکان و هـەر کەسـێك لـە زەویـدا هەیـە، هەموویـان مـردن، مەگـەر کەسـێك خـوا بیـەوێ، ﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ ﴾، دوایـی بـۆ جارێـکی دیکـە فووێـکی دیکـە بـە کەڕەنـادا کـرا ﴿ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ٦٨ ﴾، یەکسـەر هەموویـان ڕاوەسـتابوون چاوەڕێیـان دەکـرد، بەدڵنیایـی هـی یەکەمیـان ئاخیـر زەمانـەو، هـی دووەمیشـیان قیامـەت و هەڵسـێنرانەوەو زیندووکرانەوەیـە.

ڕوونکـەرەوانی قورئـان هەندێکیـان دەڵێـن: ئـەوە هەمووی لـە بـارەی قیامەتەوەیە، بـەڵام مـن وای تێدەگـەم لـە ئایـەتی یەکەمـەوە تاکـو ئایـەتی پێنجـەم، بـاسی ئاخیـر زەمـان و، کۆتایـی هاتنـی ژیـانی دنیـاو گەردوونـەو، ئایـەتی شەشـەم و حەوتـەم و هەشـتەمیش بـاسی قیامەتـن.

﴿ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ﴾، زەوییـش قورسـاییەکانی خـۆی دەرهاویشـتن، قورسـاییەکانی نێـو زەوی هەمـوو ئـەو شـتانەن کـە لـە زەوییـدان، وەك دوایـی لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر، (أَثْقـال) دەگونجـێ کـۆی (ثِقْـل) بـێ، واتـە: قورسـایی، دەشـگونجێ کـۆی (ثَقَـل) بـێ، واتـە: ماڵـی بـە قیمـەت و بەنرخ، گرنـگ ئەوەیـە زەوی هەرچـی تێیدایـە دەری داوێ، وەك لـە سـوورەتی (الإنشـقاق)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ٣ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ٤ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ٥ ﴾، واتـە: کاتێـك زەوی پـان ڕاکێـشرا، (وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ)، هەرچـی تێیدایـە فڕێیـداو،

خۆی خاڵیی کردەوە، خۆی بەتاڵکرد، (وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ)، بۆ پەروەردگاری ملکەچ بوو و شیاویش بوو ملکەچ بێ، لێرە کە دەفەرموێ: ﴿وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ٢﴾، هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە کە مەبەست پێی دەرهاویشتنی مردووەکانە، بەڵام بەدڵنیایی دەرهاویشتنی مردووەکان، ئەگەر مەبەست پێی زیندووکرانەوەیان بێ، ئەوە لە قۆناغی دووەمی ڕۆژی دواییدا دەبێ کە قیامەتەو، ئەگەر مەبەستیش هەر ئەوەبێ هەرچی لە نێو هەناویدایە دەریداوێ، ئێسك و پڕووسکە هەرچی هەیە، ئەوە لە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دواییدا دەبێ، کە ئاخیر زەمانە.

﴿وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ٣﴾، مرۆڤیش گوتی: (زەوی) چییەتی؟ مرۆڤ (ٱلۡإِنسَٰنُ)، (أل)ی ناساندنی لەسەرە واتە: تێکڕای مرۆڤ و، جینسی مرۆڤ، کە لەوێ هەبێ، لەو کاتەدا دەڵێ: (مَا لَهَا) زەوی چییەتی؟ بۆچی وا دەکات و چی لێقەوماوە؟ ﴿يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ٤﴾، لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس دەکات، قسەیان لەبارەوە دەکات، زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان دەڵێن: بەزمانی حاڵ زەوی هەواڵ و دەنگ و باسەکانی خۆی ڕادەگەیەنێ، وەك پێشتریش گوتمان، هەندێکیش گوتوویانە: زەوی خوای پەروەردگار توانایەکی دەداتێ قسە بکات، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسانە، بەڵام وا پێدەچێ مەبەست ئەوەبێ کە زەوی بە زمانی حاڵ باس و خواسی خۆی دەکات، کە هەر کەسێك تێوەیڕامێنێ، دەزانێ خوا فەرمانی پێکردووە، ﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ٥﴾، بە هۆی ئەوەوەی پەروەردگارت سرووشی بۆ کردووەو، پێی فەرمووە وابکات، هەواڵەکانی خۆی بگێڕێتەوە و دەنگوباسی خۆی بخاتە ڕوو، ئەمە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، کە ئاخیر زەمانە.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی قۆناغی دووەم: ﴿يَوۡمَئِذٖ﴾ لەو ڕۆژەدا، چونکە ڕۆژی دوایی هەمووی یەك ڕۆژە، نیوەی ئاخیر زەمانەو، نیوەشی قیامەتە، ئنجا ئایا چەندەیان دەکەوێتە بەین؟ لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، فەرموویەتی: چل (٤٠)، ئنجا ئایا (٤٠) ڕۆژە، (٤٠) مانگە، (٤٠) ساڵە، هەر خوا

دەزانێ، گرنگ ئەوەیە ماوەیەك دەكەوێتە نێوان كۆتایی پێهاتنی ژیانی دنیاو، دووبارە زیندووكرانەوەو هەڵسێندرانەوەی مرۆڤەكان، ماوەیەك دەكەوێتە بەینیانەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ ﴾ لەو ڕۆژەدا، ﴿ يَصْدُرُ ٱلنَّاسُ أَشْتَاتًا ﴾ خەڵك بە پرژوبڵاویی دەردەچن، لە زەوییەوە دەردەچن، (أَشْتَاتًا) كۆی (شَتّ)ە، (الشَّتُّ: المُتَفَرِّقُ)، پرژوبڵاو، واتە: خەڵك بە پرژوبڵاویی تاك تاك و، جووت جووت، یاخود بە پرژوبڵاویی یانی: كۆمەڵ كۆمەڵ بەڵام بە پرژوبڵاویی دەردەچن، ﴿ لِّيُرَوْا۟ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾، تاكو كردەوەكانی خۆیانیان بۆ ڕابنوێندرێن، پێشانیان بدرێن، بخرێنە بەرچاویان، هەندێكیش خوێندوویانەتەوە: (لِيَرَوْا أعمَالَهُم)، تاكو كردەوەكانی خۆیان ببینن، ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾، ئنجا هەركەس بەقەدەر گرانایی گەردێك چاكەی كردبێ، چاكە بكات، دەیبینێتەوە، بە كرداری ئێستا (مُضارع) هێناویەتی، یانی: هەر كەسێك بە ئەندازەی گرانایی گەردێك یاخود مێرووێكی بچووك، یاخود گەردێك كە لەبەر تیشكی خۆردا دەبینرێ، چاكە بكات دەیبینێتەوە، ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾، هەر كەسێكیش بە ئەندازەی گرانایی گەردێك خراپە بكات دەیبینێتەوە، خوا ﷻ لە هەردوو ڕستەكاندا (مَن)ی بەكارهێناوە، كە بۆ تاك و جووت و، بۆ نێرو مێ و، بۆ دووان و كۆ بەكاردێ، هەركەس بە ئەندازەی گرانایی گەردێك چاكە بكات، دەیبینێتەوە، هەركەس واتە: مسوڵمان بێ، یان نامسوڵمان، ئەمە بە ئاشكرا ئەوە دەگەیەنێ كە نامسوڵمانانیش ئەگەر چاكە بكەن، دەیبیننەوە لە ڕۆژی دوایی دا، بەڵام ئایا كە دەیبیننەوە پاداشتیان دەدرێتەوە؟ یان كە پاداشتیان دەدرێتەوە دەبێتە هۆی دەرباز بوونیان لە دۆزەخ؟ بە دڵنیایی نەخێر، مادام بێبڕوابن، بەڵام ئەو ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ كە جۆرێك لە بەهرەی لێوەردەگرن، بۆ وێنە: سزایان لەسەر سووك دەبێ، چونكە ئەو جۆرە سزایەی بێبڕوایەكان پێی سزا دەدرێن، هەر كامێكیان سزایەكەی بە ئەندازەی خۆیەتی، ئنجا كەسێك كە چاكەی كردوون هەرچەندە بێبڕواش بووە، سزایەكەی یەكسان نابێ لەگەڵ هی كەسێكدا، كە بێبڕوا بووەو خراپەكاریش بووە، هەروەك چۆن بڕوادارانێك

کـە چاکـەکار بـوون، لەگـەڵ بڕوادارانێـك دا کـە خراپـەکار بـوون، یەکسـان نابـن، بـە هەمـان شـێوە بێبڕوایـانی چاکـەکار لەگـەڵ بێبڕوایـانی خراپـەکاردا، ئەوانیـش یەکسـان نابـن، لـە دادگەریـی خـوا وادەخوێندرێتـەوە، دواییـش لـەو بـارەوە هەندێـك دەق دێنیـن کـە ئـەو مانایـە زیاتـر دەچەسـپێنن، ﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨ ﴾، هەروەهـا هـەر کەسێکیش هێنـدەی گرانایـی گەردێـك خراپـەی کردبـێ دەیبینێتـەوە، ئنجـا ئەبـوو بەکـری صیددیـق (خـوا لێـی ڕازی بـێ) -وەك لەهـۆی هاتنەخوارەوەیـدا هێناومانـە- کـە گریـاوە، بۆیـە گریـاوە چونکـە بیـری کردۆتـەوە: هەڵـەو کـەم و کوڕیـی بچـووك مـرۆڤ لێـی خاڵیـی نابـێ، ئنجـا بیـری لێکردۆتـەوە قورسـە بیبینێتـەوە، بۆیـە گریـاوە، پێغەمبەریـش ﷺ هەواڵیـداوە لـە یەکێـك لـە فەرموودەکانـدا کـە هێنامـان، فەرموویـەتی: هـەر کـەس خراپـە بـکات لـە بـڕواداران، سـزایەکەی بـۆ دەخرێتـە دنیـا، لـە نەخۆشـیی و بـەڵاو گرفتاریـی و ناڕەحەتییـەکان کـە دێنـە ڕێـی، بەوانـە لـەو خراپانـە پـاك دەبێتـەوە، کەواتـە: لـە ڕۆژی دوایـی دا دەیانبینێتـەوە، بـەڵام لـە کۆڵـی بوونـەوە.

یاخـود: پێشـانی دەدرێـن، بـەڵام لەسـەریان سـزا نـادرێ، واتـە: لەسـەر گوناهـی بچـووك، مـادام خـۆی لـە گوناهـە گـەورەکان پاراسـتبێ، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ٣١ ﴾النسـاء، واتـە: ئەگـەر خۆتـان لـە گوناهـە گـەورەکان بپارێـزن، خراپـە (بچووکە)کانتـان لـێ دەسـڕینەوەو، دەسشـتانخەینە نێـو شـوێنێکی پـڕ ڕێـزو حوڕمەتـەوە، بـە نسـبەت بێبڕوایانیشـەوە بێگومـان لەسـەر گوناهـی گـەورەو بچـووك سـزا دەدرێـن، بڕوادارانیـش، هـەر کامێکیـان بـە ئەنـدازەی خـۆی چاکـەکانی پاداشـتیان هەیـە، خراپەکانیـشی مـادام خـۆی لـە گوناهە گـەورەکان پاراسـتبێ، گوناهـە گچکەکانی لـە کۆڵبوونـەوە، بـەڵام بـۆ ئـەوەی دادگەریـی خـوا ﷻ بـە تەواویـی بچەسـپێ، دەبـێ خراپەکانیـش بخرێنـەوە بەرچـاوی و بیانبینێتـەوە، بـەڵام لەسـەریان سـزا نـادرێ، لـە مەسـەلە گرنگەکانیشـدا تیشـکی زیاتـر دەخەینـە سـەر ئـەو مەسـەلەیە.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**باسی لەرزاندنەوەی تایبەتی زەوی لە ئاخیر زەمانداو، وەدەرنانی زەوی بۆ گرانابییەکانی و، پرسیارکردنی سەرسوڕماوانەی مرۆڤ لە هۆکاری ئەوەو، هەواڵدانی زەوی کە ئەوە بەهۆی سرووش بۆکرانی لەلایەن پەروەردگاریەوەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾﴾، هەر کات زەوی بە لەرزینەوە (تایبەتە)کەی لەرزێنرایەوە، (إِذَا ): کاتێك دەچێتە سەر ڕستەیەك، مانای وایە ئەو شتە بە مسۆگەریی دەبێ، بەڵام (إن) کاتێك دەچێتە سەر ڕستەیەك دوودڵیی و گومانی تێدایە، ئەگەر گوتم: (**إذَا جَاءَ زَيدٌ أُكْرِمُهُ**)، هەر کات زەید هات ڕێزی دەگرم، مانای وایە ڕێز لێگرتنی من بۆ زەید کە دێ، شتێکی مسۆگەرە، بەڵام ئەگەر گوتم: (**إن جَاءَ زَيْدٌ أُكْرِمُهُ**)، ئەگەر زەید هات ڕێزی دەگرم، ئەوە ساغ نەکراوەتەوە کە ڕێزی لێ دەگرم یان نا، لێرە دەفەرموێ: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾﴾ هەرکاتێك زەوی لەرزێندرایەوە (زِلْزَالَهَا )، لێرەدا دەبێتە بەرکاری ڕەها (**مَفْعول مُطْلَق**)، بۆ (زُلْزِلَتِ )، واتە: کاتێك زەوی بە لەرزێندرانەوە تایبەتەکەی خۆی لەرزێندرایەوە، وشەی (**زِلْزال**) چاوگە، بەڵام (**زَلْزال**) ناوە، لێرەدا (**زِلْزَال**) چاوگە، بەڵام وەك سیفەتێك پاڵدراوەتە لای زەوی، وەك چۆن لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (**لَأُكْرِمَنَّكَ كَرَامَتَك**)، ڕێز لە تۆ دەگرم ڕێزگرتنەکەت، واتە: ڕێزگرتنێك کە تایبەتە بە تۆوە، ڕێزگرتنێك شایستەی تۆیە، لێرەش ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ﴿١﴾﴾، هەرکات

زەوی لەرزێنرایەوە، بە لەرزێندرانەوە تایبەتەکەی خۆی، کە بۆی دیارییکراوە لە ڕۆژی دواییدا، چونکە زەوی زۆرجاری دیکە تێکەوە ڕاشەقێنراوەو لەرزێنراوە، بەڵام بەشێکی و لایەکی، کەچی ئەوجارە کە ئاخیر زەمانە، هەموو زەوی دەلەرزێ و دەهەژێ، ئەوەی بەسەردێ، کە بەسەری دێ، وەک لە شوێنەکانی دیکەدا باسکراوە.

**٢)**- ﴿ وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا ﴿٢﴾ ﴾، هەروەها زەوی قورساییەکانی خۆی هاوێشتنە دەرێ، دەرهێنان، (**أَثْقالٌ: جَمْعُ ثِقْلٍ، أَوْ جَمع ثَقَلٍ**)، (**أَثْقال**): لە زمانی عەرەبییدا هەم کۆی (**ثِقْل**)ە، هەم کۆی (**ثَقَل**)ە، (**ثِقْل**)، واتە: (**حِمْل**) کۆڵ و بارێك شتێك کە قورس و گران بێ، بەڵام (**ثَقَل**) بە مانای کەلوپەلی ڕێبوارو، کەل وپەلێك کە بەنرخ و گران قیمەت بێ، لەو ڕۆژەدا زەوی هەموو ئەو شتانەی لە هەناوی دان، چ لە ڕووی کێشەوە قورس بن، چ لە ڕووی بایەخیانەوە گرانبەهابن، هەموویان فڕێدەداتە دەرێ، کەواتە: (**أَثْقَال**)، لێرەدا دەگونجێ کۆی (**ثِقْل**) بێ و، دەشگونجێ کۆی (**ثَقَل**) بێ، چونکە زەوی هەم کۆڵە گرانەکەی خۆی و شتە قورسەکانی کە هەڵیگرتوون، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر ئاسن و پۆڵاو مسن، ئەگەر کانزایەکانن، هەم ئەوانە فڕێدەداتە دەرێ، هەم شتە گرانبەهایەکانیش ئەو شتانەی گرانبەهان لەڕووی نرخ و بەهاوە بەقیمەتن، ئەوانەش فڕێدەداتە دەرێ، وەك لە سووڕەتی (**إنشِقاق**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ٱلْأَرْضُ مُدَّتْ ﴿٣﴾ ﴾، کاتێك زەوی لێککێشرایەوە درێژکرایەوە پان ڕاخرا، ﴿ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ ﴿٤﴾ ﴾، هەرچی تێیدایە فڕێیدا، خۆی بەتاڵکرد و، خاڵیی کردەوە.

**٣)**- ﴿ وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ ﴾، مرۆڤیش گوتی چییەتی؟ لێرەدا (أل)ی سەر (**ٱلْإِنسَٰنُ**)، بۆ ناساندنی جینسە واتە: هەموو کەس، هەموو مرۆڤێك کە لەوێ ئامادەبێ، دەڵێ: زەوی چییەتی؟ (**مَا لَهَا ؟**) (**إِسْتِفهامٌ عَنِ الشَّيْءِ الَّذي ثَبَتَ لِلأَرْضِ وَلَزِمَها، لِأَنَّ اللامَ لِلإِخْتِصاص**)، (**مَا لَهَا**)، پرسیارکردنە لەو شتەی بۆ زەوی چەسپاوەو، پێوەی پەیوەست بووە، چونکە (ل)، بۆ شتێکە بە شتێکەوە تایبەت بێ، دەگوترێ: (**الكِتابُ لِفُلانٍ**)، یانی: کتێبەکە هی فلانکەسە، (**مَا لَهَا: أَيْ ما لِلأَرضِ فِي هذا الزَّلْزال، أَوْ مَا لَهَا زُلْزِلَتْ هَذا الزِّلْزال؟**)، (**مَا لَهَا**) واتە: زەوی چییەتی لەم لەرزینەوەیە؟ یاخود زەوی بۆچی بەم جۆرە لەرزینەوەیە دەلەرزێتەوە؟ بێگومان هەر

کەسێك لەو کاتەدا هەبێ خراپترین کەسە، چونکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ فەرموویەتی: {لا تَقومُ السَّاعَةُ إلاَّ عَلى شِرَارِ أُمَّتِي} **(أخرجه أحمد: ٣٧٣٥، ومسلم: ٢٩٤٩، وابن حبان: ٦٨٥٠)**، واتە: ئاخیر زەمان بەسەر خراپترینی کەسانی ئوممەتم دادێ، کەسانێك کە زۆر خراپن، بە هەرحاڵ مرۆڤ لەو کاتەدا هەر کەسێك بێ، دەڵێ: زەوی بۆچی وا دەکات، چییەتی؟

٤)- ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾، لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی باس دەکات، **(التَّحْدِيثُ: صُدُور كَلَامٍ بِخَبَرٍ عَنْ حَدَثٍ)**، **(تَحْدِيث)**: بریتیە لە دەرچوونی قسەیەك بە هەواڵێکەوە لە بارەی ڕووداوێکەوە، کە دەفەرموێ: (أَخْبَارَهَا)، (أَخْبَارَهَا)، بەرکاری **(تُحَدِّث)**یە، واتە: هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، باس دەکات، بەڵام ئەوەی ژێرداری کردوە، لێی داڕنراوە و، بەوە **(مَنصُوب)** بووە، یانی: لە ئەسڵدا ئاوایە: **(يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ بِأَخْبَارِهَا)**، لەو ڕۆژەدا هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە، بەڵام **(ب)**ەکە، کە ژێردارکەری **(أخبار)**ە، لابردراوەو، بۆتە (أَخْبَارَهَا)، زانایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: **(مَنْصوب بِنَزعِ الخَافِضِ)**، واتە: سەری دراوەتێ، سەردارکراوە، بە هۆی لێ داڕنینی ژێردار کەرەکەیەوە.

٥)- ﴿ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ ﴾، کە پەروەردگارت سرووشی بۆ کردوە، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- زەوی هەواڵەکانی خۆی باس دەکات و، دەگێڕێتەوە بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگاری سرووشی بۆ کردوە، پەیامی بۆ ناردوە کە هەواڵەکانی باس بکات، .

ب- **(تُخْرِجُ الأَرْضُ أَثْقَالَهَا بِسَبَبِ إيحَاءِ اللهِ لَهَا)**، زەوی قورساییەکانی خۆی دەرداوێ و فڕێیان دەدا، بەهۆی سرووشکردنی خواوە سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ بۆی.

**(القاشاني)** یەکێکە لە زانایان و ڕوونکەرەوانی قورئان، دەڵێ: **(بِسَبَبِ الأَمْرِ التَّكوِينيِّ الرَّبَّانِيِّ لَها)**، بەهۆی ئەو فەرمانە تەکوینییەی پەروەردگار بۆی.

منیش ڕایەکەیم پێ پەسندەو مانای وایە مەبەست لە سرووش **(وحي)** کە دەفەرموێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ ﴾، مانا

زاراوەییەکەی نیەو مەبەست فەرمانی دروستکردن (**أمر تكويني**)ە، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە پەروەردگارت بەو جۆرەی لێکردوە، بۆیە هەواڵەکانی خۆی باس دەکات و دەگێڕێتەوە، زانایان لە بارەی هەواڵگێڕانەوەی زەوییەوە، دوو ڕایان هەن:

**أ-** هەندێکیان دەڵێن: زەوی خوای باڵادەست ئەو کاتە توانایەکی پێدەدا هەواڵەکانی خۆی باس بکات.

(**الطبري**) لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (خوا لێی ڕازی بێ) هێناویەتی دەڵێ: (**أَنْ تَتَكَلَّمَ فَتَقُولُ: إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي بِهَذا، وَأَوْحى إِلَيَّ بِهِ، وَأَذِنَ لِي فِيهِ**)، واتە: زەوی قسە دەکات، دەڵێ: خوا بەمە فەرمانی پێکردووم و، سرووشی بۆ کردووم و، مۆڵەتی داوم، کە هەواڵەکان باسبکەم.

**ب-** ڕای دووەم ئەوەیە کە مەبەست لە قسەکانی زەوی، بە زمانی حاڵ و کردارە نەك قسەو وتار.

سەعیدی کوڕی جوبەیر ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ، دەڵێ: (**تُبَيِّنُ الأَرْضُ أَخْبَارَها، بِالزَّلْزَلَةِ وَالرَّجَّةِ وَإِخراجِ المَوتى مِن بُطُونِها، إِلى ظُهُورِها**)، واتە: زەوی هەواڵەکانی خۆی، بەلەرزینەوەو هەژان و بە وەدەرخستنی مردووەکان، کە لە سکیدان بۆ سەر پشتی، ڕووندەکاتەوە.

(**الطبري**)یش ئەم ڕایەی هەڵبژاردوەو، منیش پێم وایە ئەم ڕایە پەسندترە، وەك پێشتریش باسمانکرد، کە هەواڵ باسکردنی زەوی، هەر بریتیە لەو گۆڕانکارییەی بەسەریدا دێ و، بە زمانی حاڵ دەڵێ: پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم و، پەیامی بۆ ناردووم بەو شێوەیە بکەم، بەدەست خۆم نیە، واتە: بەزمانی حاڵ هەواڵەکانی باس دەکات، هەروەك لە زمانی عەرەبییدا هاتوە: (**قالَ الجِدارُ لِلوَتَدِ لِمَ تَشُقُّنِي؟ قالَ اسْأَلْ مَن يَدُقُّنِي**)، دیوار بە سینگی گوت: بۆچی لەتم دەکەی، کونم دەکەی؟ ئەویش گوتی: لەو کەسە بپرسە کە دامدەکوتێ، هەڵبەتە ئەوە

بەزمانی حاڵە، کەواتە: (**أطْلِقَ الوَحْيُ عَلى أَمْرِ التَّكوينِ، أَيْ وُجِدَ فيهَا أَسْبَابُ تَزَلْزُلِها، وَإِخْراجُ أَثْقَالِها، وَضُمِّنَ أَوْحَى مَعْنَى قَالَ، بِسَبَبِ تَعديَتِهِ بِاللَّامِ بَدَلَ إِلى**)، لێرەدا وشەی (وەحیی) بەکارهێنراوە بۆ فەرمانی جێبەجێکردن، فەرمانی دروستکردن، واتە: هۆکارەکانی لەرزینەوەو هەژێندران وەدەرخستنی قورساییەکان لە زەویدا پەیداکراون، وشەی (**أَوْحَى**)ش، مانای (**قَالَ**)ی خراوتە نێو، بەهۆی ئەوەوە کە تێپەڕی کردوە بۆ بەرکار بەهۆی (ل)وە، نەك بەهۆی (**إلى**)وە، کە لە ئەسڵدا (**أَوْحَى**)، بە (**إلى**)، بەرکار دەخوازێ (**أَوْحَى إِلَيْهِ**)، ﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ ﴿١٢﴾﴾ **الأنفال**، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: (أَوۡحَىٰ لَهَا)، بۆ ئەوەی وشەی (أَوۡحَىٰ)، هەم پەیام بۆ ناردن و سرووش بۆ کردن بگەیەنێ، هەم گوتنیش بگەیەنێ، (أَوۡحَىٰ لَهَا)، یانی: (**أَوْحَى لَهَا وَقَالَ لَهَا**)، خوا سرووش بۆ کردوەو پێشی فەرمووە، بەو شێوەیە بکات.

**مەسەلەی دووەم:**

**لـە ڕۆژی قیامەتـدا خەڵـك بـە پرژوبڵاویـی دەردەچـن، تاكـو كردەوەكانیانیـان پێشـان بدرێـن، ئنجـا هەركـەس هێنـدەی گرانایـی گەردێـك چاكـەی كردبـێ، دەیبینێ و، هـەر كەسـێكیش هێنـدەی گرانایـی گەردێـك خراپـەی كردبـێ، دەیبینێتـەوە:**

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ﴿٦﴾ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ ﴿٧﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ ﴿٨﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا ﴾، لەو ڕۆژەدا خەڵك بە پرژوبڵاویی دەردەچن، وشەی (**أَشْتَات**) كۆی (**شَتٌّ**)ە، (**الشَتُّ: المُتَفَرِّق**) پرژوبڵاو، كەواتە: (أَشْتَاتًا)، واتە: خەڵك بە پرژوبڵاویی دەردەچن (**أَي: مُتَفَرِّقِينَ عَنِ اليَمِينِ وَعَنِ الشِّمَال**)، بەلای ڕاست و چەپدا پرژوبڵاو دەبن، (يَصْدُرُ) یانی: دەردەچن (**صُدُور**) پێچەوانەی (**وُرود**)، (**وُرودْ**) یانی: هاتن، بەڵام (**صُدُور**) واتە: دەرچوون، لەو شوێنەی لێیبوون لێی دەردەچن، بەڵام (**وُرُودْ**)، واتە: لەو شوێنەی لێی نەبووە، بۆی دێ، وەك خوا ﷻ لە سووڕەتی (**القصص**) دا، لەبارەی مووساوە فەرموویەتی: ﴿ وَلَمَّا وَرَدَ مَاءَ مَدْيَنَ ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: كاتێك چووە سەر ئاوەكەی مەدیەن.

ئنجـا ئایـا بۆچـی خەڵـك بـە پرژوبڵاویـی لـە گـۆڕەكانی خۆیـان لـەو شـوێنانەی پێشـتر جەسـتەكانیان تێیاندابـوون دەردەچـن؟

**٢)-** ﴿ لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾، تاكو كردەوەكانیان پێشان بدرێن.

زانایان سێ واتایان بۆ ئەم ڕستەیە داناون:

**١-** (**لِيُبْصَروا جَزاءَ أَعْمَالِهِم**)، بۆ ئەوەی پاداشتی كردەوەكانیان بخرێتە بەرچاو، پێشان بدرێ.

٢- (لِيُبْصَروا الأَعْمالَ، وَالأَعْمالُ تَتَجَسَّمُ نُورانيَّةً وَظلْمانيَّةً) تاكو خودی كردەوەكانیان پێشان بدرێن، كە لە شێوەی ڕووناكیی و تاریكییدا بەرجەستە دەبن، كردەوەی چاك لە شێوەی ڕووناكیی و، كردەوەی خراپ لە شێوەی تاریكیی دا.

٣- یاخود (لِّيُرَوْا : ليُعلموا)، واتە: بۆ ئەوەی پێیان بزانێنرێ، یانی: لە كردەوەكانیان ئاگادار بكرێنەوەو، كردەوەكانیان بزانن.

شایانی باسە: هەندێك لە زانایان گوتوویانە: كردەوەكان نابینرێن، بەڵام هیچ گومانی تێدانیە كە هەم لێرە، هەم لە سووڕەتی (الكهف)دا: ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴿٤٩﴾ ﴾، ئەوەی كردبوویان بە ئامادەكراویی بینییان، هەروەها لە سووڕەتی (الجاثية)دا: ﴿ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾، ئێمە ئەوەی دەتانكرد نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە.

هەموویان ئەوە دەگەیەنن، كە خودی كردەوەكانیان پێشان دەدرێن.

٣- ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ ﴾، ئنجا هەر كەسێك بە ئەندازەی گرانایی گەردێك چاكە بكات، دەیبینێتەوە.

٤- ﴿ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ﴿٨﴾ ﴾، هەروەها هەر كەسێك بە ئەندازەی گرانایی گەردێك خراپە بكات دەیبینێتەوە.

## كورتە لێكۆڵینەوەیەك لەبارەی ئەم دوو ئایەتەوە و دیتنی مرۆڤ بۆ چاكە و خراپەكانی

زانایان لە بارەی ئەم دوو ئایەتە موبارەكەوە زۆریان قسەكردوە، ئێمەش هەندێ لە قسەو ڕایەكانی ئەوان، دێنین و ئەوەی پێمان وایە ڕاسترە لە مانای ئەم دوو ئایەتە موبارەكە، دەیهێنین.

سەرەتاش با هەندێ لە قسەکانی ئەوان بێنین:

یەکەم: لە هەردوو ئایەتەکەدا وشەی (مِثْقَالَ)، هاتووە، یانی: بارتەقا لە کێشاندا، واتە: هەر کەسێك بارتەقای گرانیی گەردێك چاکەی کردبێ، دەیبینێتەوەو، هەر کەسێك بارتەقای گرانیی گەردێك خراپەی کردبێ، دەیبینێتەوە، وشەی (ذَرَّةٍ) ش زانایان هەندێکیان گوتوویانە: یانی: مێرووڵەی سووری گچکە، مێرووە سوورە بچووکەکان کە لە سەرەتاوە خوای پەروەردگار دەیانخوڵقێنێ، زۆر بچووکن بە ئاستەم بەچاو دەبینرێن، هەندێکیش گوتوویانە: (ذَرَّةٍ) ئەو تۆزو غوبارەیە کاتێك تیشکی خۆر بە پەنجەرەدا دێتە ژوورێ، بەهۆی تیشکی خۆرەوە دەبینرێ، ئنجا یەکێك لە تۆزو گەردەکان پێی دەگوترێ: (ذَرَّةٍ)، بێگومان (ذَرَّةٍ) بەو مانا زانستییەی نیە کە ئێستا زانست بۆی دەرکەوتوە، کە بە چاو نابینرێ، بەڵکو بە میکرۆسکۆبی ئەلیکترۆنیش کە (٦٠٠ - ٧٠٠) هەزار جار شت گەورە دەکات، هەر نابینرێ، بە عەرەبیی (ذَرَّةٍ)ی، پێ دەڵێن و، بە زمانە بیانییەکان ئەتۆم (Atom)ی پێدەڵێن، ئەویش بۆ خۆی لە سێ بەشی سەرەکیی پێك دێ، بەشەکانیش لە بەشی بچووکتر پێکدێن، ئنجا نەك هەر گەردیلە نابینرێ، بەڵکو گەرد (جُزَيء) مۆلکۆلیش نابینرێ، کە لە ملیۆنان گەردیلە پێکدێ، بەڵام لێرەدا قورئان بەو واتایە بەکاری نەهێناوە، چونکە قورئان بە واتایەك وشەکان بەکاردێنێ کە خەڵك تێیان بگات، بۆیە (ذَرَّةٍ) یان مێرووی بچووکی وردە، یاخود تۆزو غوبارێکە کە دەکەوێتە بەر تیشکی خۆرو دەبینرێ، هەرکەسێك بە گرانایی ئەوە چاکە بکات، یان خراپە بکات.

دووەم: زاناو ڕوونکەرەوانی قورئان لەبارەی مەبەستی ئەو ڕستە قورئانییەوە، پێنج ڕایان هێناون:

١- (يَرَهُ)، واتە: هەر کەسێك چاکەی کردبێ دەیبینێتەوەو، خراپەی کردبێ دەیبینێتەوە، بەڵام ئەمە مانای وانیە کە بڕواداران لەسەر گوناهی بچووکیش سزا دەدەرێن، ئەگەر خۆیان لە گوناهە گەورەکان پاراستبێ، هەروەها مانای وانیە کە بێبڕوایانیش بەهرەمەند

دەبن لە چاكەكانیان، لە حاڵێكدا كە بێبڕواشن، بەڵكو مەبەست ئەوەیە ئەوانەی بڕوادارن و ئەوانەی بێبڕوان، چاكەكاران و خراپەكاران، چاكەو خراپەكانی خۆیان لە ڕۆژی دواییدا دەبیننەوە، بەڵام خوا نەیفەرمووە: سزایان لەسەر دەدرێ، یاخود پاداشتیان لەسەر دەدرێتەوە.

٢- (يَرَه) یانی: مرۆڤ پاداشت و سزایەكەی دەبینێ، ئنجا بەنسبەت بێبڕوایانەوە، بە هۆی چاكەكانەوە كە ئەنجامیان داون، سزایان لەسەر سووك دەبێ، بەڵام لە دۆزەخ ناچنە دەرێ، وەك لەبارەی ئەبوو تاڵیبی مامی پێغەمبەرەوە ﷺ لە فەرموودەی سەنەدی ڕاست (صحيح) دا هاتوە، كە بەهۆی بەرگریی كردنی لە پێغەمبەرەوە ﷺ سوودی پێگەیشتوە، وەك لە پێغەمبەریان ﷺ پرسیوە: ئایا هیچت بۆ وی پێناكرێ؟ فەرموویەتی: بۆی پاڕاومەوەو خوا سزای لەسەر سووك كردوە، بەڵام لە دۆزەخ نایەتە دەرێ، چونكە ئیمانی نەبووە[١].

٣- واتایەكی دیكە كە هەندێك لە زانایان هەڵیانبژاردوە، بۆ (يَرَهُ) ئەوەیە كە بابای بێبڕوا كردەوە چاكەكانی خۆی، خێرو چاكەكانی خۆی دەبینێتەوە، ئەگەر هەڵنەوەشابانەوە، بەنسبەت بڕواداریشەوە خراپەكەی خۆی دەبینێتەوە، ئەگەر لێی نەسڕابایەوە، كەبەهۆی خۆ دوورگرتن لە گوناهە گەورەكان، گوناهە بچووكەكانی لێ دەسڕێنەوە، وەك لە سوورەتی (النساء)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِن تَجْتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ ﴾، ئەگەر خۆتان لە گوناهە گەورەكان كە لێتان قەدەغە كراون بپارێزن، (خۆتانیان لێ دوور بگرن)، خراپەكانتان لێ دەسڕینەوەو، دەتانخەینە شوێنێكی پڕ ڕێزو حورمەتەوە.

٤- مانایەكی دیكە بۆ (يَرَه)، ئەوەیە كە مرۆڤی بێبڕوا لە دنیادا پاداشتی چاكەكانی خۆی دەدرێتەوە، بابای بڕواداریش لە دنیادا لەسەر گوناهەكانی سزا دەدرێ، گرفت و كێشەو نەخۆشیی و ناڕەحەتی بەسەر دێن و، بەشێك لە گوناهە زلەكانی و سەرجەم گوناهە بچووكەكانی بەوە لە كۆڵ دەبنەوە.

---

(١) دوایی فەرموودەكە دێنین كە (بخاری) بەژمارە (٦٩٦١) هێناوییەتی.

٥- (يَرَهُ)، واتە: هەرکام لە بڕوادارو بێبڕوا بەقەدەر گەردێك چاکەیان کردبێ، یان خراپەیان کردبێ، دەیبیننەوە، ئنجا بڕوادار بەقەدەر گەردێك چاکە بکات، بیبینێتەوە، هیچ گرفت و ئیشکالی تێدانیەو لە ڕۆژی دوایدا دەیبینێتەوە، بێبڕواش بە قەدەر گەردێك خراپەی کردبێ، بیبینێتەوە، بە دڵنیایی ئەوەش هیچ گرفت و ئیشکالی تێدانیە، سێیەم: گرفت و ئیشکالێک و وەڵامەکەی: چۆن بڕوادار بە قەدەر گەردێك خراپەی کردبێ دەیبینێتەوەو لەسەری سزا دەدرێ و، چۆن بێبڕواش بە قەدەر گەردێك چاکەی کردبێ لە ڕۆژی دواییدا لە قیامەتدا لەسەری پاداشت وەردەگرێتەوە؟ گرفت و ئیشکالەکە لێرەدایە.

لە وەڵامی ئەو گرفت و ئیشکالەش دا گوتراوە:

(**الكَافِرُ يَرَى جَزَاءَ خَيْرِهِ فِي الدُّنيا، وَشَرِّهِ فِي الأَخِرَة**)، بابای بێبڕوا پاداشتی چاکەکەی لە دنیادا دەبینێ و، سزای خراپەکەشی لە ڕۆژی دواییدا دەبینێ، (**وَالمُؤْمِنُ يَرَى جَزَاءَ شَرِّهِ فِي الدُّنيا، وَجَزاءَ خَيْرِهِ فِي العُقْبَى**)، بڕوادار سزای خراپەکانی لە دنیادا دەبینێ و، پاداشتی چاکەکانیشی لە ڕۆژی دواییدا دەبینێ.

ئنجا با چەند دەقێکیش لەوبارەوە بێنین و، دوایی ئەنجامگیریی گشتیی لە هەموویان دەکەین:

١- (**الطبري**)، بە ژمارە: (٣٧٨٦٨)، هێناویەتی: (**عَنْ عَمْرو بنِ دينارٍ قَال: سَأَلْتُ مُحمَّد بن كَعْب القُرَظِي عَنْ هذِهِ الآية:** ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾، **قَالَ: مَنْ يَعْمَل مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ مِنْ كافِرٍ، يَرى ثَوابَها فِي نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ وَمَالِهِ، حَتَّى يَخْرُجَ مِنَ الدُّنيا وَلَيْسَ لَهُ خَيْر، وَمَن يَعْمَل مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِن شَرٍّ مِن مُؤْمِنٍ، يَرَى عُقُوبَتَها فِي نَفْسِهِ وَأَهْلِهِ وَمَالِهِ حَتى يَخْرُجَ وَلَيْسَ لَهُ شَرٌّ**).

واتە: عەمری کوڕی دینار دەڵێ: لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزییم لەبارەی ئەم ئایەتەوە، پرسی: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨ ﴾، گوتی: هەر کەسێك بەئەندازەی گرانایی گەردیلەیەك چاکە بکات، لە بێبڕوایان، پاداشتەکەی لە خودی خۆی و لەماڵ و

خێزانیی و لە سامانیدا دەبینێتەوە، هەتا کاتێك لە دنیادا دەردەچێ، هیچ خێرو چاکەی نەماوە، هەروەها هەرکەسێك لە بڕواداران بە ئەندازەی گرانایی گەردێك خراپە بکات، سزایەکەی لە خودی خۆیداو لە کەس و کاری و لە ماڵ و سامانیدا دەبینێ، هەتا کاتێك لە دنیا دەردەچێ، هیچ خراپەی لەسەر نەماوە.

**٢- {عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُول اللَّهِ ﷺ! ابْنُ جِدْعَانَ كَانَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيُطْعِمُ الْمِسْكِينَ، فَهَلْ ذَاكَ نَافِعُهُ قَالَ: لا يَنْفَعُهُ إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا (رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ) الشعراء} (أخرجه مسلم: ٢١٤، وابن حبان: ٣٣١، والطبري: ٣٧٨٧٢).**

واتە: عائیشە دایکی بڕواداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئیبنو جیدعان، (عەبدوڵڵای کوڕی جیدعان) لە سەردەمی نەفامییدا پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیاندو، ئاوای دەکردو ئاوای دەکرد (چاکەی دەکرد)، ئایا ئەوە سوود پێ بەخشەریەتی؟ فەرمووی: نەخێر، چونکە ڕۆژێك لەڕۆژان نەیگوتوە: پەروەردگارم! لەڕۆژی سزاو پاداشتدا لە گوناهەکەم ببوورە.

هەروەها چەندان ئایەتیش هەن کە خوا ﷻ زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی تێیاندا دەفەرموێ: بابای بێبڕوا کردەوە چاکەکانی هەڵوەشاونەوە، بۆ وێنە:

٣- لە سوورەتی **(النور)**دا، خوا دفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَسَرَابِۭ بِقِيعَةٖ يَحۡسَبُهُ ٱلظَّمۡـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمۡ يَجِدۡهُ شَيۡـٔٗا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٣٩﴾ ﴾. واتە: ئەوانەی بێبڕوان کردەوەکانیان وەك تراویلکەیەك وایە، لە گۆملاییەکدا، بابای تینوو بەئاوی تێدەگات، بەڵام کاتێك دەچێ هیچی لێ نیەو، خوا لەوێ دەبینێ، (سزای خوا دەبینێ)، خواش لێپرسینەوەی خێرایە.

٤- لە سوورەتی **(الفرقان)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾ ﴾، واتە: ڕوومان کردە ئەو کردەوە (چاك)انەی کردبوویانن، کردمانن تۆزو گەردی بڵاوبووەوە.

٥- هەروەها لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا، دەفەرمووێ: ﴿مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمْۖ أَعۡمَٰلُهُمۡ كَرَمَادٍ ٱشۡتَدَّتۡ بِهِ ٱلرِّيحُ فِي يَوۡمٍ عَاصِفٖۖ لَّا يَقۡدِرُونَ مِمَّا كَسَبُواْ عَلَىٰ شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلۡبَعِيدُ ١٨﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان بە پەروەردگاریان، کردەوەکانیان، (واتە: کردەوە باشەکانیان)، وەك خۆڵەمێشێکی بەربایەکی توند وایە لە ڕۆژێکی گەردەلوولاوییدا، (ڕۆژێك کە بایەکی توندی تێدا هەیە، لەو خۆڵەمێشە بدات، (اهەمووی پرژو بڵاودەکاتەوە)، توانایان بەسەر هیچ کام لە کردەوە چاکەکانیاندا نابێ، ئا ئەوەیە گومڕایی دوور.

ئەم ئایەتە موبارەکانەش زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن، کە بابای بێبڕوا لە کردەوە چاکەکانی لە ڕۆژی دواییدا بەهرەمەند نابێ.

٦- {**عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَا يَظْلِمُ الْمُؤْمِنَ حَسَنَةً، يُثَابُ عَلَيْهَا الرِّزْقَ فِي الدُّنْيَا، وَيُجْزَى بِهَا فِي الْآخِرَةِ، قَالَ: وَأَمَّا الكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِهِ فِي الدُّنْيَا، حَتَّى إِذَا أَفْضَى إِلَى الْآخِرَةِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُعْطَى بِهَا خَيْرًا**} (**أخرجه الطبري**: ٣٧٨٨٠، **ومسلم**: ٢٨٠٨).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە دڵنیایی خوا ستەم لە بڕوادارێك ناکات، چاکەیەکی کردبێ، بەڵکو لە دنیادا وەك بژیو پێدان پاداشتی دەداتەوەو، لە ڕۆژی دواییشدا پاداشتی دەداتەوە (بە بەهەشت)، بەڵام بابای بێبڕوا لە دنیادا بەهۆی چاکەکەیەوە خواردن و خۆراکی پێیدەدا، هەتا کاتێك لەڕۆژی هەڵسانەوەدا دێ، هیچ چاکەی نەماون، پێی پاداشت بدرێتەوە.

٧- هەر لەو بارەوە ئەو دەقەش دێنین کە (**الطبري**) بە ژمارە (٣٧٨٨١)، هێناویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**مَا أَحْسَنَ مِن مُحْسِنٍ مُؤْمِنٍ أَوْ كَافِرٍ، إلاَّ وَقَعَ ثَوابُهُ عَلَى اللهِ، فِي عاجِلِ الدُّنيا أَوْ آجِلِ آخِرَتِهِ**}، واتە: هیچ چاکەکارێك چاکەی نەکردوە، بڕواداربێ یان بێبڕوابێ، مەگەر پاداشتەکەی کەوتۆتە سەر خوا، چ لە دنیای بەپەلەدا، چ لە قۆناغی داهاتووی دواخراودا، (کە ڕۆژی دواییە)، ئەمەیان سەنەدەکەی مورسەلە.

٨- هەروەها (الطبري) بە ژمارە: (٣٧٨٧٩)، هێناویەتی: {أَنَّ سَلْمَانَ رضي الله عنه، جَاءَ رَسولَ اللهِ ﷺ فَقَال: إِنَّ أَبِي كَانَ يَصِلُ الرَّحِمَ، وَيَفي بِالذِّمَّةِ، وَيُكرِمُ الضَّيفة، قَالَ: مَاتَ قَبْلَ الإِسْلامِ؟ قالَ: نَعَم. قَال: لَنْ يَنْفَعَهُ ذَلِك فَوَلَّى، وَقَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ عَلَيَّ بِالشَّيْخِ، فَجَاءَ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِنَّها لَن تَنْفَعَهُ، وَلكِنَّها تكونُ في عَقِبِهِ، فَلن يُخْزَوْا أَبَداً، وَلَن تُذَلُّوا أَبَداً، وَلَن يَفْتَقِروا أَبَداً}.

واتە: سەلمان (یەكێكە لە هاوەڵان)، چۆتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوویەتی: بابم لە سەردەمی نەفامییدا پەیوەندیی خزمایەتیی دەگەیاند، بەڵێن و پەیمانی جێبەجێ دەكرد، ڕێزی لە میوان دەگرت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: پێش ئیسلام مردوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: هیچی سوودی پێ ناگەیەنێ، ئەو (سەلمان) ڕۆیشت (دیارە پیاوێكی بەتەمەن بووە) پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەو پیاوە بەتەمەنەم بۆ لا بگێڕنەوە، هاتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەڕۆژی دواییدا سوودی پێ ناگەیەنێ، بەڵام لە وەچەكەیدا دەبێت، (واتە: پاداشتەكەی لە وەچەكەیدا دەبێ لە دنیادا)، هەرگیز سەرشۆڕ نابن، هەرگیز زەبوون نابن، هەرگیز هەژار نابن.

مادام ئەو لە دنیادا ئەو جۆرە چاكانەی كردوون، خواش ئەو پاداشتەی بەو شێوەیە دەداتەوە.

(الطبري) دوای ئەوەی ژمارەیەك لەو دەقانە دێنێ، دەڵێ: (فَهذِهِ الأَخْبارُ عَنْ رَسولِ اللهِ ﷺ تُنْبِئُ عَن أَنَّ المُؤْمِنَ إِنَّما يَرَى عُقُوبَةَ سَيِّئَاتِهِ فِي الدُّنيا، وَثَوابَ حَسَنَاتِهِ فِي الآخِرة، وَأَنَّ الكَافِرَ يَرى ثَوابَ حَسَنَاتِهِ في الدُّنيا، وَعقوبَةَ سَيِّئَاتِهِ في الآخِرة، وَأَنَّ الكَافِرَ لا يَنْفَعُهُ في الآخِرَةِ ما سَلَفَ لَهُ مِن إِحْسانٍ في الدُّنيا مَعَ كُفْرِهِ) (جامع البيان: ج١٥، ص٢٩٧).

واتە: ئەم هەواڵانە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ هەواڵ بەوە دەدەن، كە بڕوادار سزای خراپەكانی لە دنیادا دەبینێ و، پاداشتی چاكەكانی لە ڕۆژی دواییدا دەبینێ، بەڵام بێبڕوا پاداشتی چاكەكانی لە دنیادا دەبینێ و، سزای خراپەكانیشی لە ڕۆژی دواییدا دەبینێ و، بێبڕوا لە ڕۆژی دواییدا ئەوەی لە چاكە لە دنیادا كردوویەتی، لێی بەهرەمەند نابێ، مادام بێبڕوا بووبێ.

**چوارەم: پوختەی ڕای بەندە لەوبارەوە:**

پوختەی ئەوەی من لە هەموو ئەوانە هەڵیدەهێنجم، بەمجۆرەیە:

چاکەکاران و خراپەکاران یەکسان نین، نە لە دنیاو نە لە دواڕۆژدا، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾﴾القلم، واتە: ئایا بۆ خوا ملکەچان وەك تاوانباران دادەنێین، چیتانە بۆچی بەوجۆرە دادوەریی دەکەن؟ بەدڵنیاییش وەك چۆن ئیمان پلە پلەیە، کوفریش هەر پلە پلەیە، ئیمان بەرەوسەرو کوفر بەرەو خوار، پاداشتێ کە خوا دەیداتە بڕواداران، پلە پلەیە بەرەو سەر، هەروەها سزای بێبڕوایانیش دیسان پلە پلەیە بەرەو خوار، خوای دادگەر لەبارەی مونافیقەکانەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾**النساء**، واتە: بە دڵنیایی مونافیقەکان لە پلەی خواری خوارەوەی ئاگردان و، هیچ یارمەتییدەرو سەرخەرت بۆیان چنگ ناکەوێ.

کەواتە: بەپێی ئەوەی ئایەتەکان دەفەرموون، کردەوە باشەکانی بابای بێبڕوا لە ڕۆژی دواییدا خوای کاربەجێ لێی هەڵدەوەشێنێتەوە، لەبەر ئەوەی ئیمانی نەبووەو، بێبڕوا بووە. هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی ئەوە دەگەیەنن، ئنجا کە خوا دەفەرموێ: هەرکەسێك تۆزقاڵێك چاکە بکات دەیبینێتەوەو، هەر کەسێك تۆزقاڵێك خراپە بکات دەیبینێتەوە، بە دڵنیایی مەبەست پێی ڕۆژی دواییە، چونکە هەموو سووڕەتەکە باسی ڕۆژی دوایی دەکات، کەواتە: مەبەست پێی ژیانی دنیا نیە، دەیبینێتەوە (يَرَهُ) یانی: لە ڕۆژی دواییدا، ئەمەش لێی وەردەگیرێ کە ئەو بێبڕوایانەی چاکەکار بوون، بەجۆرێك لە بەهرەمەند بوون لە چاکەکانیان بەهرەمەند دەبن لە ڕۆژی دواییدا، بەڵام نەك بەهرەمەندبوونێك پێی لە سزای دۆزەخ دەرباز بن، بەڵکو سزایان لەسەر سووك دەبێ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی ئەبوو تالیبەوە فەرموویەتی[1]، بەڵام

---

(١) {عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم، وَذُكِرَ عِنْدَهُ عَمُّهُ، فَقَالَ: لَعَلَّهُ تَنْفَعُهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُجْعَلُ فِي ضَحْضَاحٍ مِنَ النَّارِ يَبْلُغُ كَعْبَيْهِ يَغْلِي

بێگومـان بەهرەمەنـد بوونەکـە بایـی ئـەوە نیـە پێـی لـە دۆزەخ بێنـە دەرێ.

ئــەوەش کــە خــوا دەفەرمــوێ: چاکەکانیــان لــێ هەڵدەوەشــێنینەوە[1]، بێگومــان فەرمایشـتی خـوا ﷻ لـە سـەدا سـەد (١٠٠٪) ڕاسـتەو لـە جێـی خۆیدایـە، واتە: کـردەوە باشـەکانیان لـێ هەڵدەوەشـێنینەوەو بایـی ئـەوە نابـن پێیـان لـە دۆزەخ بێنـە دەرێ، بـەڵام بێگومـان لەوێـدا کەسـێك کـە لـە دنیـادا چاکـەی کـردوەو بێبـڕواش بـووە، لەگـەڵ کەسـێکدا کـە بێبـڕواش بـووەو خراپەشـی کـردوە، وەك یـەك نابـن، بێبـڕوا چاکەکارەکـە سـزایەکەی سـووکتر دەبـێ لە هـی بێبـڕوا خراپەکارەکە، بە نسـبەت بڕوادارانیشـەوە: خوا بـە دەقـی ئایـەت فەرموویـەتی: ئەگـەر خۆتـان لـە گوناهـە گـەورەکان بپارێـزن، خراپـە بچووکەکانتـان لـێ دەسـڕینەوە، بێـژەی گوناهـە گچکەکان (**صغائر**) بەکارنەهاتـوە، بەڵام وشـەی (**سـیِّئَات**) کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ ﴿٣١﴾﴾ **النسـاء**، واتـە: ئەگـەر خۆتـان لـەو گوناهـە گەورانـەی لێتـان قەدەغـە کـراون، دوور بگـرن، خراپەکانتـان لـێ دەسـڕینەوە، یانـی: خراپـە بچووکەکانتـان لـێ دەسـڕینەوە، چونکـە (**سـیِّئَات**) لەگـەڵ (**کبائـر**)دا بـەراورد کـراوە، کەواتـە: بەهـۆی خـۆ دوورگرتـن لـە گوناهـە گەورەکانـەوە، گوناهـە بچووکـەکان دەسـڕێنەوە، بـەڵام کەسـێك خـۆی لـە گوناهـە گـەورەکان نەپاراسـتبێ، گوناهـە بچووکـەکانی ناسـڕێنەوە، ئنجـا چ خوا ﷻ لـە بەرانبـەر گوناهـە بچووکەکانیـدا لـە ژیـانی دنیـادا سـزای بـدا، وەك لـە هەنـدێ لـە دەقەکانـدا ئامـاژەی پێکـراوە، چ بـۆی هەڵگیـرێ بـۆ ڕۆژی دوایـی، هەڵبەتـە خـوا فەرموویـەتی: ئـەوەی خـۆی لە گوناهـە گەورەکان بپارێـزێ، بچووکەکانی لێ دەسـڕینەوە، بـەڵام ئەگـەر خـۆی لـە گوناهـە گـەورەکان نەپارێـزێ، مانـا وایـە بچووکەکانیـشی هـەر لەسـەر دەبـن و، سـزای بچووکەکانیـش دەبینێتـەوە، بابـای بێبـڕواش ئاشـکرایە گوناهـی گـەورەو بچووکـی پێیـان سـزابار دەبـێ و، بـە نسـبەت چاکەکانیشـیەوە، ئەوپەڕەکـەی ئەوەیـە کـە ئەندازەیـەك سـزای لەسـەر سـووك دەبـێ، لەچـاو ئـەو بێبڕوایانـەدا کـە

---

مِنْهُ دِمَاغُهُ} أخرجه البخاري في: ٦٣ كتاب مناقب الأنصار: ٤٠ باب قصة أبي طالب: برقم: ٦١٩٦.

(١) {وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاْهُ هَبَاءً مَنْثُوراً} الفرقان: ٢٣.

بێبـڕواش بـوون و خراپەکاریـش بـوون، ئـەوان سـزایان سـووکتر دەبـێ، لە کـۆی دەقەکان ئـەوە وەردەگیـرێ.

گومانیشـی تێدانیـەو دەقـەکانی لەوبـارەوەش هاتـوون دەیگەیەنـن، کـە چاکەکاریی لـە دنیـادا مـرۆڤ لێـی بەهرەمەنـد دەبـێ: نـاوی چـاك، خەڵـك مەدحـی دەکات، ڕێزی دەگـرێ، سـتایشی دەکات، ڕێـز لـە کـەس و کاری دەگـرێ ... هتـد، وەك حەدیسـەکەی سـەلمان ئـەوە دەگەیەنـێ، ئـەوە شـتێکی دیـارو مسـۆگەرە، بـەڵام ئایەتەکـە لـە بـارەی ڕۆژی دواییـەوە دەدوێ.

خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی خـۆی لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ، کـە هەمیشـە تەمـەن و ژیانـی خۆیـان پڕدەکـەن لـە چاکەکاریـی و، خۆشـیان دەپارێـزن و دوور دەگـرن لـە خراپـەو تـاوان و لادان.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**الزَّلْزَلَة**)، دێنین.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

# دەستپێک

بەڕێــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٠)ی (**ذي الحجـة**)ی سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٨/١٠) زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر، دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیر کـردنی ئایەتـە بـە پێزەکانـی سـوورەتی (**العاديـات**)و، سـەرەتاش لـە حـەوت بڕگـەدا پێناسـەو نێوەڕۆکی سـوورەتەکە دە خەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (العاديات) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە نـاوی: (**سُـورَةُ العَادِيَـات**)ە، بـەڵام لـە هەندێـك موصحەف و لـە هەندێـك لـە تەفسیرانیشـدا واوەکەشـی خراوەتـە گـەڵ: (**سُـورَةُ وَالعَادِيَات**).

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ڕاجیایی زۆر هەیە لەبارەی شوێنی لێ دابەزینی ئەم سوورەتە موبارەکەوە:

أ- هەرکام لە ئیبنو مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)و جابیری کوڕی زەیدو عەتاو حەسەنی بەصرایی و عیکریمە (خوا لێیان خۆشبێ) گوتوویانە: ئەم سوورەتە مەککەییەو لە مەککە دابەزیوە.

ب- بەڵام هەرکام لە ئەنەسی کوڕی مالیك و ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) و قەتادە (خوا لێی خۆشبێ) گوتوویانە: ئەم سوورەتە مەدینەییەو لە مەدینە دابەزیوە.

لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە: (**عَنْ عَبْدِاللە ابْنِ عَبَّاس** رضي الله عنه، **قَالَ: نَزَلَتْ** ﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا﴾ **بِمَكَّة**) (**أخرجه السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٥٩٩، ونسبه لابن مردويه**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنه گوتوویەتی: سوورەتی ﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا﴾ لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لەدابەزیندا:

لە موصحەفدا ئەم سوورەتە ژمارە سەد (١٠٠)و، لە دابەزیندا ژمارە چواردە(١٤)یە، جابیری کوڕی زەید وای داناوە، پێش سوورەتی (**الكوثر**) و دوای سوورەتی (**العصر**) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بەڕای هەموو ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، ژمارەی ئایەتەکانی یازدە (١١) ئایەتە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

پوختەی نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە موبارەکە، ئەوەیە کە خوا سبحانه وتعالى سوێند دەخوات بە: ئەسپانی غاردەری، پڕمە لەزار هاتووە دەری، بە سمان بڵێسە پەیداکەری، بەرەبەیانان هێرشبەری، تۆزو خۆڵ بەرزکەرەوەی، هەڵکوتەرەسەر نێوەڕاستی کۆمەڵی دوژمن، خوا سوێندی بەوە خواردوە کە مرۆڤ سپڵەو، بێ نمەکە بەرانبەر پەروەردگاری، خۆشی لەسەر خۆی شایەدە لەو بارەوەو، زۆریش ماڵ و سامانی خۆشدەوێ.

دواتریش خوای بەرز هۆشداریی داوە بە مرۆڤ، کە پاش شکنرانەوەی گۆڕەکان و هەڵگێڕدرانەوەیان و، هاتنە دەری ئەوەی تێیاندایە کە مردووەکانن و،

دوای هێنەرانـەدەری نهێنیی نێـو سـینەکان و، کۆکردنـەوەی و لێـك جیاکردنـەوەی، خـوا زۆر پێیـان شـارەزایە.

کەواتـە: بـا خەڵك بزانـن چـی دەخەنـە نێـو دڵ و سـینەی خۆیانـەوەو، کاتێکیـش خـوا لـە گۆڕەکانیـان دەیانهێنێتـە دەر، چـۆن دێنـەوە دەر، چ تێلەکـەو کۆڵێکیـان لـە چاکـەو فەرمانبەریـی، یاخـود لـە گوناهـو تـاوان و لادان، پێیـە؟

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لەم سوورەتەدا، سێ تایبەتمەندییم کەوتوونەتە بەرچاو:

١- سوێندخواردن بە: ئەسپانی غاردەری هێرشبەری بە هۆی سم بەزەویی داکوتانەوە ئاوروچکە بڵندکەر.

٢- بە جەختکردنەوە باسی سپڵەیی مرۆڤ کردن بەرانبەر بە پەروەردگاری.

٣- چەند وشەو تەعبیرێك، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

**یەکەم:** ﴿ وَٱلْعَـٰدِيَـٰتِ ضَبْحًا ﴾ واتە: ئەسپە غاردەرەکان کە دەنرکێنن، پرمە و دەنگی هەناسەیان دێ.

**دووەم:** ﴿ فَٱلْمُورِيَـٰتِ قَدْحًا ﴾ ئەو ئەسپە غاردەرانەی ئاوروچکە بەهۆی سم بە زەوی داکوتانەوە، لە بەردان بڵێند دەکەن.

**سێیەم:** ﴿ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴾ ئەو ئەسپانەی بەرە بەیانان هێرش دەبەن، ئەو سوارچاکانەی لەسەریانن، هێرشیان پێ دەبەنە بەر سەر دوژمن.

**چوارەم:** ﴿ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴾ ئەو ئەسپانەی تەپ و تۆز و خۆڵ بەرز دەکەنەوە.

**پێنجەم:** ﴿ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴾ ئەو ئەسپانەی خۆیان دەکوتنە نێو کۆمەڵێکی دوژمنانەوە، بەبێ سام لێکردن و لێترسان، خۆیان دەکوتنە نێویان.

**شەشەم:** ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ﴾ بەدڵنیایی مرۆڤ بۆ پەروەردگاری سپڵەیە، بێ نمەکە.

**حەوتەم:** ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ﴾ بە دڵنیایی مرۆڤ بۆ خۆشویستنی ماڵ و سامان، زۆر سەخت و توندە.

**هەشتەم:** ﴿ بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ ﴾ ئەوەی لە گۆڕەکاندا هەیە هەڵگێڕدرایەوە، دەرهێنرایەوە.

**نۆیەم:** ﴿ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ١٠ ﴾ ئەوەی لە سینەکاندا هەیە پەیداکراو کۆکرایەوە، هەڵوێژێردراو پۆلێنکراو جیاکرایەوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە یازدە (١١) ئایەتە بەپێزەکەی ئەم سوورەتە موبارەکە، دەکەینە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی هەموویان باسی بابەتێکن و، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

لـەم سـوورەتەدا دوای ئـەوەی خـوا ﷻ سـوێند دەخـوات بـە ئەسـپانی غـاردەرو نرکێنـەرو، بـە هـۆی سـم بـە زەوی داکوتانـەوە، (کـە سـمەکانیان بـە توندیـی بـە زەوی دا دەدەن و لـە دارو بەردیـان دەدەن)، ئاوروچکـە بڵیندکـەرو، تـۆز و خـۆڵ پەیداکـەرو، شـەبەیخوونکەرو ، هێرشـبەرە سـەر دوژمـن و، خۆکوتـەرە نێـو جەرگـەی کۆمەڵیـان، ئنجـا باسـی خاڵـە بێهێزەکانـی مـرۆڤ دەکات بە گشـتیی، بـە تایبەت مرۆڤـی بێبـڕواو دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ ﴾ بەدڵنیایـی مـرۆڤ بـۆ پـەروەردگاری سپڵەیە، بێ نمەکـە، چاکەکانـی نادیـدە دەگرێ، (أل)ی سـەر (**الإنسان**) بـۆ ناسـاندنەو، زۆربەی هـەرە زۆری ڕوونکەرەوانـی قورئـان دەڵێـن: بـۆ جینسـە، واتـە: تێکـڕای مرۆڤـان وان، هەندێکیـش دەڵێـن: ناسـاندنەکە بـۆ عەهـدە، واتـە: مرۆڤـە بێبڕوایـەکان وان، چونکـە ئەگـەر بـۆ جینـس بـێ بەدڵنیایـی دەبـێ ئەوکاتـە پێغەمبـەران (**علیهـم الصلاة والسـلام**) هەڵباوێردرێـن، هەروەهـا ئەوانـەش کـە بـە ڕێـی پێغەمبەرانـدا دەڕۆن، چونکـە ئەوان سـپڵەو نادیدەگیـر نەبـوون بـۆ چاکەکانـی خـوا، بـەڵام ئەگـەر (أل)ەکـە بـۆ عەهـد بـێ، واتـە: مرۆڤـە بێبڕوایـەکان وان، ئەوکاتـەش بێگومـان هەمـوو مرۆڤـە بێبڕوایـەکان دەگرێتـەوەو، مرۆڤـە بـڕوادارەکان ناگرێتـەوە.

پێـم وایـە ئەگـەر بڵێیـن: بـۆ عەهـدە باشـترە، واتـە: مرۆڤـە بێبڕوایـەکان سـپڵەو بـێ ئەمەگـن بەرانبـەر بـە پەروەردگاریـان، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾سبأ، کەمێـك لـە بەندەکانـم سوپاسـگوزارن، کەواتـە کەمێکـی سوپاسـگوزار لـە مرۆڤـان هـەر هـەن، ئەوانـەی شـوێن پێغەمبـەرانی خـوا (**علیهـم الصلاة والسلام**) دەکـەون، بڕوایـان هەیـەو چاکـە و بەخشـش و نیعمەتەکانـی خوایـان لەبەرچـاوەو، وەفـادارن بەرانبـەر بـە خـوا، ئنجـا مـادام خـوا بـۆ خـۆی بفەرمـوێ: کەمێـك لـە بەندەکانـم سوپاسـگوزارن، کەواتـە هەموویـان ناسوپاسـگوزارو سـپڵەنین!

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ۝٧ ﴾، خۆیشـی لەسـەر ئـەوە چاودێـرە، شـایەدەو دەزانـێ.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ۝٨ ﴾، بەدڵنیایـی ئـەو بـۆ خۆشویسـتنی مـاڵ و سـامان زۆر تونـدو سـەختە، **(الخیر)** بەمانـای مـاڵ و سـامانە، وەك لـە سـوورەتی **(البقـرة)**دا هاتـوە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِن تَرَكَ خَيْرًا ۝١٨٠ ﴾ **البقـرة**، واتـە: ئەگـەر مـاڵ و سـامانی بەجێهێشـت، هەروەهـا ئێرەش: ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ۝٨ ﴾ هـەر دەچێتـەوە بـۆ سـەر ئـەو مرۆڤـەی بێبڕوایـە، چونكـە پێغەمبـەران **(علیهـم الصلاة والسلام)**و بـڕواداران، مـاڵ و سـامانیان خسـتۆتە گیرفانیان و نەیانخسـتۆتە نێـو دڵیـان و، زۆر خۆشـیان نەویسـتوە، بەڵكـو مـاڵ و سـامانیان وەك ئامرازێـك بـۆ ڕاییكردنـی تەمەنـی دنیاییـان و، بـۆ كاری خێـرو چاكـە بەكارهێنـاوە، كەواتـە: ئەویـش دیسـان هەمـوو مرۆڤـەكان ناگرێتـەوە.

دوایـی خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِى ٱلْقُبُورِ ۝٩ ﴾، ئایـا نازانـێ كاتێـك گـۆڕەكان شـكنرانەوەو، هەڵگێڕدرانـەوەو ئـەوەی تیایاندایـە، هێنرایـە دەرێ، ﴿ وَحُصِّلَ مَا فِى ٱلصُّدُورِ ۝١٠ ﴾، هەروەهـا ئـەوەی لـە سینەكانیش دایـە، پەیداكـراو كۆكرایـەوەو دەرخـرا.

لـە كۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ۝١١ ﴾، بـە دڵنیایـی پەروەردگاریـان لـەو ڕۆژەدا زۆر پێیـان شـارەزایە، بـە هەمـوو شـتێكیان ئـاگادارە.

یەكێـك لـە زانایـان قسـەیەكی جـوان دەكات، دەڵـێ: بۆیـە خـوا ﷻ سـوێندی بـەو ئەسـپە هێرشـبەرانە خـواردوە، چونكـە خەسـڵەتە خراپەكانـی مرۆڤیـش، وەك هێرشـبردنی ئەسـپانی سـەركێش، هێـرش بـۆ مـرۆڤ دێنـن و، دەیانـەوێ تووشـی لادان و تاوانـی بكـەن، ئنجـا قیامەتیـش كتوپـڕ دێ، وەك هێـرش و پەلامـاری ئـەو ئەسـپانەی سـوارەكانیان شـەبەیخوون دەكـەن و بەرەبەیانـان زوو هێـرش دەبەنـە سـەر نێوجەرگـەی كۆمەڵـی دوژمـن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿ وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَالْمُورِيَاتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ الْإِنسَانَ لِرَبِّهِ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُ لِحُبِّ الْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي الْقُبُورِ ﴿٩﴾ وَحُصِّلَ مَا فِي الصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . سوێند بە ئەسپە غاردەرە پڕمێنەرەکان بە پڕماندن ﴿١﴾ ئەسپانی ئاوروچکە هەڵگیرسێن (بە هۆی سم بەزەوی داکوتانەوە) ﴿٢﴾ ئەسپانی لە بەرەبەیاندا هێرشبەر ﴿٣﴾ (ئەسپانێ) تۆزو خۆڵیان پەیداکرد (بە هۆی بەپرتاو ڕاکردنەوە) ﴿٤﴾ خۆیان کوتایە نێوەڕاستی کۆمەڵێکەوە (لە دوژمنان) ﴿٥﴾ بەدڵنیایی مرۆڤ بەرانبەر پەروەردگاری سپڵەو پێنەزانە ﴿٦﴾ بێگومان خۆیشی لەسەر ئەوە شایەدە ﴿٧﴾ هەروەها زۆریش بە سەختیی ماڵ و سامان خۆشویستەرە ﴿٨﴾ ئایا نازانێ کاتێك گۆڕەکان هەڵگێڕدرانەوە ﴿٩﴾ ئەوەی لە سینەکانیش دایە خرایە گۆڕێ و جیاکرایەوە (چ کارەساتێکی مەزنی لێ دەقەومێ؟ ﴿١٠﴾ بە دڵنیایی پەروەردگاریان لەو ڕۆژەدا پێیان شارەزایە ﴿١١﴾}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ): (**جَمْعُ عَادِيَـة، مِـنَ العَـدْوِ، وَهُـوَ التَّجَـاوُزُ، وَمُنَافَـاةُ الإلْتِئَـامِ، فتـارةً يُعتـبرُ بالقَلْـبِ، فَيُقَـالُ: العَـدَاوَةُ، وَتَـارَةً بالْمَـشِي، يُقَـالُ العَـدُو**)، واتـە: (**عاديـات**) کـۆی (**عادية**)یـە، لـە (**عَدْو**)ەوە هاتـوە، (**عـدو**): بریتیـە لـە تێپەڕیـن و پێکـەوە نەگونجـان، ئنجـا جـاری وا هەیـە لـە ڕووی دڵ و دەروونـەوە، تەماشـای ئـەو وشـەیە دەکـرێ و دەگوتـرێ: (**عَـدَواةو مُعَـادَاة**) یانـی: دوژمنایەتیـی، جـاری واش هەیـە لـەڕووی ڕۆیشـتنەوە تەماشـای (عـدو) دەکـری یـانی: ڕاکـردن و ڕەتبـوون، کەواتـە: (وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ) یـانی: سـوێند بـەو کۆمەڵـە ئەسـپانەی بەخێرایـی ڕادەکـەن و غـاردەدەن.

(ضَبۡحٗا): (**الضَّبْـحُ: صَـوْتُ أَنْفَـاسِ الفَـرَسِ، تَشْـبيْهاً بالضُّبَـاحِ، وَهُـوَ صَـوْتُ الثَّعْلَـبِ**)، (**ضَبْـح**): بریتیـە لـە دەنگـی هەناسـەی ئەسـپ، چوێـنراوە بـە (**ضُبَـاح**) کـە دەنگـی ڕێوییـە، ڕێـوی کـە دەواقێنـێ.

(فَٱلۡمُورِيَٰتِ ): (**المُورِيَـاتُ: مِـنَ الـوَرِي، وَرِيَ الزَّنْـدُ، يُـوري ورْيَـاً، أي: خَرَجَـتْ نَـارُهُ**)، (موریـات) لـە (**وَرْي**)ەوە هاتـوە، یـانی: داگیرسـاندن، (**وَرِيَ الزَّنْـدُ، يُوري ورْيَاً**) زەندەکە پڕیشـکە ئاگـری هێنـا، دەیهێنـێ، ئاگـر هێنـان، بەکوردیـی پێـی دەڵێـن بەردەسـتێ، یـان بـەردو ئەسـتێ، کـە ئاسـنێك و بەردێکـن لێکیـان دەدەن، پووشـێکی زۆر تەنـك و باریـك ڕادەگـرن، کـە پووشـووی پێدەڵێـن، کـە پڕیشـکی ئاگرەکـەی لـێ بـەرز بـووەوە، پڕیشـکەکە بـەر پووشـووەکە دەکـەوێ، ئاگریـان بـەوە داگیرسـاندوە.

کاتـی خـۆی ئەوانـەی ئاگریـان بـە بـەردو ئەسـتێ هەڵکـردوە، ئەگـەر ئاگرەکەیـان بـۆ دەرچوێنرابـێ، گوتوویانـە: (**هـو مُنْجِـح**) واتـە: ئـەو سـەرکەوتوو بـوو، بەڵام کەسـێك ئاگرەکـەی بـۆ پەیدانەکرابـێ، گوتوویانـە: (**هـو كَاب**) واتـە: ئـەو شکسـتخواردوە لـە پەیداکردنـی ئاگرەکـەدا، کەواتـە (فَٱلۡمُورِيَٰتِ ) واتـە: سـوێند بـەو ئەسـپانەی ئاوروچکـە

بڵنید دەکەن، بە توندیی سمەکانیان بەر زەوی دەکەون، بەتایبەتی ئەگەر ناڵیان هەبن، ناڵەکان کە بەبەرد دەکەون، وەك بەردو ئەستێ ئاوروچکە بڵند دەکەن.

(قَدۡحٗا) (المَقْدَحَةُ، وَالقَدَّاحُ وَالقَدَّاحَةُ: الحَجَرُ الَّذِي يُورِي النَّارَ)، (مَقْدَحَةُو قَدَّاحُ و قَدَّاحَةُ): هەر سێکیان ئەو بەردەن کە ئاگر پەیدادەکات، بە کوردیی بەردو ئەستێی پێدەڵێن، بەردەکە دەبێ بەردێکی زۆر سەخت و ڕەق بێ، ئاسنێکیش بووە لێکیان داون و ئاگرەکەیان لێ پەیدابووە، (قَدَحَ النَّارَ) واتە: ئاگری پەیداکرد.

(فَٱلۡمُغِيرَٰتِ ): (المُغِيْرَاتُ: مَنْ أَغَارَ عَلَى العَدُوِّ إِغَارَةً وَمُغَاراً، أي: هَجَمَ) (مُغِيرَات) واتە: هێرشبەران و پەلاماردەران، لە (أغار)وە هاتوە (أَغَارَ عَلَى العَدُوِّ إِغَارَةً وَمُغَاراً) هێرشی کردە سەر دوژمن، هێرش بردن.

(فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا) ئنجا تۆز و خۆڵیان پێ پەیداکردوە ، (النَّقْعُ: الغُبَارُ)، (نَقْع): بە تۆز و خۆڵ دەگوترێ، هەروەها (نَقْع) بەو ئاوەش دەگوترێ کە لە بیردا دەمێنێتەوە.

(فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا) واتە: خۆیان کوتایە نێو نێوەڕاستی کۆمەڵێکەوە، (وسط الجمع وَسْطاً، أي: توسَّطهم) چووە نێوەڕاستی کۆمەڵێکەوە، خۆی کوتایە نێویان (التَّوْسِيطُ: جَعْلُ الشَّيءِ فِي الوَسَطِ)، (تَوْسِيط): ئەوەیە شتێك بخەیە نێوەڕاستی شتێکەوە.

(لَكَنُودٞ): (كَنَدَ أي: كَفَرَ النِّعْمَة، وَكَنَدَ أي: بَخِلَ، وَكَنَدَ أي: عَصَى)، (كَنود) لەسەر کێشی (فعول) لە (كَنَدَ)ە هاتوە، واتە: چاکەکەی نادیدە گرت، سپڵە و ناسوپاس بوو، بەڵام وێڕای ئەوە (كند) بە مانای (چرووکیی کردو)، بە مانای (سەرپێچیی کرد) یش هاتوە.

(بُعۡثِرَ) (أي: أُثِيرَ وَأُخْرِجَ) (بُعْثِرَ): هەروەها (بحثر)ش هەر هاتوە، بە (ح) نەك بە (ع)، واتە: هەڵگیرسێنرا، دەرهێنرا، پەیداکرا.

(**وَحُصِّلَ**): (**حَصَّلَ الشَّيءَ تَحْصِيلاً، وَحَاصِلُ الشَّيءِ وَمَحْصُولَه: بقِيَّتُهُ**)، (**حَصَّلَ الشَّيءَ تَحْصِيلاً**): شتەکەی پەیداکرد، کۆی کردەوە، ئەوەی لەو شتە دەمێنێتەوە، بەڵام لێرە بە مانای دەرهێنان و ئاشکرا کرا کردنی ئەوەیە کە لە نێو سینەکاندا هەیە و، مەبەست پێی ئەو سیفەتە نزم و پەستانەن کە لە سینەکاندا هەن و ئەوان دەبنە ڕەگ و ڕیشە و چاوگ و ماکی هەموو کردەوە خراپەکان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لە کاتی گوتنی: ئەم ڕستی موبارەکەدا، دەبێ بەلای کەمەوە ئەم چوار واتایە لە عەقڵ و دڵدا هەبن:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا دەفەرموێ:

﴿وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ۝١﴾، سوێند بە ڕاکردووەکان، کە بە توندیی هەناسە دەدەن، (**عادیات**) وەك ڕوونکەرەوانی قورئان گوتوویانە: سیفەتی وەسفکراوێکی قرتێنراوە، (**یعني: والخیلِ العادیاتِ**) سوێند بە ئەسپە ڕاکردووەکان، غاردەرەکان، (**ضَبْحَاً**) یانی: هەناسە دەدەن بە هەناسەدان، یاخود دەپڕمێنن بەپڕماندن، (**ضَبْح**): بریتیە لە دەرچوونی دەنگی هەناسەی ئەسپ کە زۆر ماندوویە، هەندێکیش دەڵێن: (**ضَبْح**) بریتیە لە نرکاندنی ئەسپ کە دەنرکێنێ، یان پڕماندنی کە

دەپرمێنێ، بۆ ئەوەی دەنگەکەی دەربخات، ئەگەر دەری بخات، پێی دەگوترێ: (صَهيل) حیلکاندن، بەڵام (ضبح): بریتیە لە پرماندن و نرکاندن، لە ئەنجامی ماندووبووندا دەنگی هەناسەی بە توندیی دێ، لە قورگیدا دێت و دەچێ.

﴿ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ ﴾، سوێند بە ئاوروچکە پەیداکەرەکان، لێرەدا (**مُوريات**) لە (**وري النَّار**) واتە: ئاگرەکەی پەیداکرد (**يُوري النار**) ئاگر پەیدا دەکات، ئنجا (**الموريات**) واتە: پەیداکەرانی ئاگر، ئاوروچکە هەڵگیرسێن.

(**قَدْحاً**) واتە: بە هۆی توند سم بەزەوی داکوتانەوە (**قَدَحَ يَقْدَحُ قَدْحاً**) واتە: پێ بەزەویدا کوتا، پێ بەزەویدا دەکوتێ، پێ بە زەوی داکوتان، ئەسپەکان سمەکانیان بە توندیی لە زەوی دەدەن، لە بەردو شتی ڕەقی دەدەن و ئاوروچکە پەیدا دەکات.

﴿ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ ﴾، ئەو کۆمەڵە ئەسپە دەمەو بەیانییان پەلاماردەرانە، یانی: شەبەیخوونیان کردوەو دەمەو بەیان پەلامار یان و هێرشیان کردوە، بێگومانیش ئەسپەکان سوارەکانیان لەسەرن.

﴿ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ ﴾، تۆز و غوبار یان هەڵگیرساندوە، یانی: بەو هێرش و پەلامارە تۆزو و گەردیان پەیداکردوە، (**الإثارة: التحريك والتهييج**) (**إثارة**): بە مانای جووڵاندن و پەیداکردن و هەڵگیرساندن دێ، (**نقع**) یش بەمانای تۆز و خۆڵ دێ، واتە: تۆز و خۆڵ هەڵدەگیرسێنن و پەیدای دەکەن.

﴿ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ ﴾، بەو تۆز و خۆڵەوە دەچنە نێو کۆمەڵێکەوە، یاخود بەو ڕاکردن و غاردانەوە دەچنە نێو جەرگەی کۆمەڵێکەوە لە دوژمنان، دەچنە نێوەڕاستیان (**وسَّطن يعني: توسطن**) دەچنە نێو نێوەڕاستی کۆمەڵێکەوە لە دوژمنانەوەو بە بوێریی خۆیانیان پێدادەدەن.

سوێند بەوە: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ بەرانبەر بە پەروەردگاری سپڵەو ناسوپاسە، چاکەکانی پەروەردگاری نادیدە دەگرێ و

سپڵەو ناسوپاسە، (**كَنَدَ النِّعْمَةَ: كَفَرَهَا**) چاكەكەی نادیدە گرت، سوپاسی خوای لەسەر نەكرد، سپڵە بوو.

﴿ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾، بە دڵنیایی لەسەر ئەو سپڵەیی و بێ وەفایی و بێ ئەمەگییەش بەرانبەر بە پەروەردگاری و چاكەكانی، شایەدو، چاودێرەو خۆی شایەدیی لەسەر خۆی دەدات.

پێشتریش ئاماژەیەكمان پێدا كە وشەی (**الإنسان**) لێرەدا كە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ناساندنەكە زۆربەی هەرە زۆری ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: بۆ جینسە واتە: هەموو مرۆڤەكان بەو شێوەیەن، بەڵام من وای تێدەگەم لێرەدا ناساندنەكە بۆ عەهدە، واتە: مرۆڤە بێبڕوایەكان بەو شێوەیەن، ئەوانەی ناسراون بە بێبڕوایی، بۆچی؟

چونكە خوا ﷻ لە سوورەتی (سبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: كەمێك لە بەندەكانم سوپاسگوزارن.

كەواتە: كەمێك لە بەندەكانی خوا سوپاسگوزارن، مانای وایە هەموویان سپڵەو بێ ئەمەگ نین، هەروەها پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)یش كە پارێزراو بوون لەهەرچی گوناهو تاوان و لادانە، ناگونجێ بە (كنود) ناسپاس وەسف بكرێن، هەروەها شوێنكەوتووانی ڕاستەقینەی پێغەمبەرانیش صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، بۆیە ئەگەر بڵێین: (أل)ەكە بۆ عەهدە، لە بەرانبەر (كە)ی كوردییدا، (الإنسان): مرۆڤەكە، لێرەدا یانی: مرۆڤەكان، چونكە (أل)ەكە بۆ كۆیە، یانی: كۆی مرۆڤە بێبڕوایەكان كە ناسراون و زانراون، لە بەرانبەر پەروەردگاریاندا سپڵەو بێ ئەمەكن.

﴿ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾، ئەو مرۆڤە، ئەو جۆرە لە مرۆڤ، كە بێبڕوایەكانن لەسەر ئەوەش شایەدن، بە زمانی حاڵ ئەگەر بە زمانی وتاریش نەبێ، بە زمانی كردارو حاڵ، شایەدیی لە سەر خۆیان دەدەن كە سپڵەو ناسوپاسن.

﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئەو مرۆڤە د(یسان مەبەست مرۆڤی بێبڕوایە) بۆ خۆشویستنی ماڵ و سامان زۆر سەختە، زۆر بەسەختیی ماڵ و سامانی دنیای خۆشدەوێ.

**(الخیر)**: لێرەدا بە مانای ماڵ و سامانە، ئەگەرنا **(الخیر)** لە ئەسڵدا بە مانای چاکە دێ **(الخَیْرُ: مَا یَرْغَبُ فیهِ الکُلّ)** (خیر) ئەوەیە هەموو لایەك بۆی ئارەزوومەندن، بەڵام لێرەدا بەپێی ڕەوتی ئایەتەكان، دەزانرێ كە مەبەست لە **(خَیْر)** ماڵ و سامانە، وەك لە سووڕەتی **(البقرة)**شدا خوا ﷻ **(الخیر)**ی بەماڵ و سامان بەكارهێناوە وەك دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيۡكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ إِن تَرَكَ خَيۡرًا ٱلۡوَصِيَّةُ لِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾، واتە: لەسەرتان پێویست كراوە، ئەگەر یەكێكتان مردنی گەیشتە سەر (كەوتە حاڵی گیانەڵاو مردن) ئەگەر ماڵ و سامانێكی بەجێدەهێشت وەسیەتتان لەسەر پێویست كراوە، بۆ باب و دایك و نزیكان (خزمان) بەشێوەیەكی پەسند، ئەوەش مافە لەسەر پارێزكاران.

بێگومان ئەم سیفەتەش دیسان لەگەڵ هەموو مرۆڤەكاندا ناگونجێ، هەموو مرۆڤەكان ماڵ و سامانی دونیایان زۆر خۆشناوێ، بەڵكو هەیانە پارەو سامان و، گڵ و خۆڵ و كەستەكی[1] پێ وەك و یەكن، بەڵام ئەوە بێبڕوایانن كە ماڵ و سامانی دنیایان زۆر خۆشدەوێ، هەڵبەتە ئەگەر بابای بڕواداریش ماڵ و سامانەكەی بە ئەندازەیەك خۆشبوێ، بە ئەندازەی ئەوەی هەڵدەگرێ و، پێداویستییەكانی ژیانی دنیای پێ دابین دەكات و، بە ئەندازەی ئەوەی لە ماڵ و خێزانی خۆی مەسرەف دەكات و، بە ئەندازەی ئەوەی چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ، بە ئەندازەی ئەوەی خێرو چاكەیەكی پێ دەكات و، هاوكاریی خەڵكی پێ دەكات، ئەوە پێی ناگوترێ خۆشویستنێكی زۆر، خۆشویستنی ماڵ و سامان بەسەختیی و بە زۆریی،

---

(١) كەستەك: پارچەگڵی بەستراو، تۆپە گڵی وەک قوڕ

ئەوەیە خوای لەسەر تووڕە بکات و، لەسەری گوێ نەداتە حەڵاڵ و حەڕام و سنوورەکانی شەرعی لە پێناودا ببەزێنێ، کە ئەوەش وەك گوتمان لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا ناگونجێ، بەڵکو تەنیا لەگەڵ مرۆڤە بێبڕوایەکان، یان مرۆڤە تاوانبارو لادەرو خەتابارەکاندا دەگونجێ، ئەگەر بڕواشیان هەبێ.

﴿ أَفَلَا يَعْلَمُ إِذَا بُعْثِرَ مَا فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٩﴾ ﴾، ئایا نازانێ کاتێك ئەوەی لە گۆڕەکاندایە هەڵگێڕدرایەوە، گۆڕەکان شکێنرانەوە، ئەوەی تێیان دایە هێندرایە دەرێ، (**بعثرة**): ئەوەیە شتێك خوارێی بخرێتە سەرێی و، سەرێی بخرێتە خوارەوەی هەڵبگێڕدرێتەوە، ئایا نازانێ کاتێك ئەوەی لە گۆڕەکان دایە هەڵگێڕدرایەوە.

﴿ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ ﴾، هەروەها ئەوەی لە سینەکانیشدایە پەیداکراو خرایە گۆڕێ، ئاشکرا کراو کۆکرایەوە، ئایا ئەوەی لە سینەکاندا هەیە چییە؟ ئەوەی لە سینەکاندا هەیە، لێرەدا مەبەست پێی ئەو سیفەت و خەسڵەتە خراپانەن کە کردەوە خراپەکان لە مرۆڤدا پەیدا دەکەن، مرۆڤ هاندەدەن بەرەو خراپەکاریی، وەك خۆبەزلگریی، (**كِبْر**)، ئیرەیی (**حسد**)، گومانی خراپ بەرانبەر بە خوا (**سوء الظن بالله**) زۆر خۆشویستنی ماڵ و سامانی دونیا، سپڵەیی بەرانبەر بە خوا، بێگومان ئەو سیفەتە پەنهانە خراپانەن، کە مرۆڤ تاو دەدەن بۆ تاوان و لادانی ڕواڵەتیی.

بۆیە خوا ﷻ تەنیا باسی ئەوەی کردوە ئەوەی لە سینەکاندا هەیە، پەیدادەکرێ و کۆدەکرێتەوە، چونکە ئەوەی لە سینەکاندا یە، وا لە مرۆڤ دەکات گوناحە ڕواڵەتییەکانیش ئەنجام بدات.

لێرەدا بەرکاری ( أَفَلَا يَعْلَمُ ) ئایە نازانێ؟ قرتێنراوە، (**يعني: أَفَلاَ يَعْلَمُ عَاقِبَةَ ذَلِكَ**) ئایا سەرەنجامی ئەوە نازانێ، هەڵبەتە هەمزەکەش بۆ پرسیارکردنی نکووڵیلێکردنی سەرزەنشتکارانەیە، ئایا نازانێ؟ بۆیەش بەرکارەکەی قرتێنراوە، تاکو زەین بەلای هەموو شتێکدا بچێ، واتە: دەبووایە بزانێ کاتێك گۆڕەکان

دەشکنرێنەوەو، ئـەوەی تێیاندایـە هەڵدەگێڕدرێتـەوە و، ئـەوەی لـە سـینەکان دایـە پەیدادەکـرێ و کۆدەکرێتـەوە، ئـەو مرۆڤـەی بەرانبـەر بـە پـەروەردگاری سـپڵەیەو، مـاڵ و سـامان پەرسـتەو زۆر خۆشـیدەوێ، دەبـێ بزانـێ سـزای سـەخت چاوەڕێـی دەکات.

لـە کۆتایـی دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ بـە دڵنیایـی پەروەردگاریـان لـەو ڕۆژەدا بەرانبـەر بـەوان زۆر زۆر شـارەزایە، هەمـوو شـتێکیان دەزانـێ، لـە هەمـوو حـاڵ و باڵیـان ئـاگادارە، هـەر کەسـە بـە پێـی ئـەوەی لـە سینەی دا هەبـووە لـە خراپـە، کـە ئـەوەی لـە سینەی دا بـووە، پاڵیپێوەنـاوە بـۆ خراپـەی ڕواڵەتییـش، بەپێـی ئـەوە سـزایان دەدات، کەسـێکیش خێـرو چاکـەی لـە سـینە دابووبـێ و، بـۆ چاکـە پاڵیپێوەنابـێ، بەدڵنیایـی ئەویـش خـوای پـەروەردگارو میهرەبـان پاداشـتی دەداتـەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە ئەسپانی غاردەری، نرکێنەری، ئاوروچکە بەسمان پەیداکەری، بەیانیان هێرشبەری، تۆز بەرزکەرەوەی، خۆکوتەرە نێو ئاوپۆرایی دوژمن، کە مرۆڤ بەرانبەر بە پەروەردگاری سپڵەیەو، خۆیشی شایەدەو سامانیشی زۆر خۆشدەوێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْعَـٰدِيَـٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَـٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٌ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلْعَـٰدِيَـٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ ﴾، سوێند بە (ئەسپە غاردەرە پڕمێنەرەکان)بە پڕماندن. **(عَادِيَات)** کۆی **(عَادِيَة)**یە، و ناوی بکەر (فاعل)ە، لە **(عدو)**وە هاتوە، **(عدو)**: واتە: غاردان و ڕاکردن، لێرەدا بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا، غاردان و، بەکاردەهێنرێ بۆ غاردانی ئەسپ و حوشتر بە تایبەت.

**(ضبح)**یش بریتیە لە دەنگی هەناسەی کە لە قوڕگیدا دێت و دەچێ، ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەح ئەح، واتە: ئەسپ کە هەناسە بڕکێی دەگاتێ لە ئەنجامی غاردان و خێرایی ڕۆیشتندا، دەنگێکی بەو شێوەیەی لێدێ.

وشەی (ضَبْحَا) **(منصوب بفعله المقدر أي يضبحن ضَبْحاً)**، **(ضَبْحَاً)** چاوگە و (منصوب)ە بە کردارێك کەبۆی ڕەچاوکراوەو ئەندازەگیریی کراوەو دیارنیە، بەم شێوەیە: **(يَضْبَحْن ضَبْحَاً)**، سوێند بەو وڵاخە بەرزە غارکردووانەی هەناسە دەدەن،

بە شێوەیەك كە لە قورگیاندا دێت و دەچێ، بە كوردیی وڵاخە بەرزە كە بەو شێوەیە هەناسەی دێ و دەچێ، پێی گوترێ: نركاندن، ئەو ئەسپە دەنركێنێ، یان پرماندن: ئەو ئەسپە دەپرمێنێ.

بەشێك لە زانایان و ڕوونكەرەوانیش گوتوویانە: **(العاديات)** لێرەدا مەبەست پێی حوشترەكانن، كە لە عەرەفاتەوە بەرەو موزدەلیفە دێن، كاتی خۆی حاجییەكان پێیان هاتوونەوە.

بەڵام زانایانی دیكە دەڵێن: وشەی **(ضبح)** ئەو جۆرە هەناسە دانەوەیە، تایبەتە بە ئەسپەوەو سیفەتەكانی دیكەش كە دوایی دێن، بێگومان هەر هی ئەسپانن.

**٢)**- ﴿ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ ﴾ سوێند بە ئاوروچكە بڵندكەران (بەهۆی لێدانەوە) لە ئەنجامی لێداندا، ئەو ئەسپانەی سمەكانیان لە بەردو شتی ڕەق دەدەن و ئاوروچكە بەرز دەكەنەوە، یەكێك لە زانایان لە تەفسیری ئەم ڕستەیەدا دەڵێ: واتە: سوێند بەو وڵاخە بەرزانەی ئاوروچكە بڵیند دەكەن، لە ئەنجامی بە توندیی سم بە زەوی و بە بەردان داكوتانیاندا، بەهۆی خێرا ڕۆیشتنەوە.

**(القدح)**، بریتیە لە لێدانی بەهێز.

**(الموريات: وَرِيَ الزَّنْدُ وريـاً)**: ئەستێیەكە ئاگری پەیداكرد بە پەیداكردن، زەند واتە: ئەستێ كە لە بەردی دەدەی ئاگری لێ بەرز دەكاتەوە، **(الموريات يعني الموقدات)** ئاگرپەیداكەران، دەگوترێ: **(قدح فأورى)**، واتە: ئەستێكەی لە بەردەكەداو ئاگری بەرز كردەوە، **(فالموريات قدحاً)** سێ واتایان بۆ داناون

أ- سوێند بەو وڵاخە بەرزانەی سم بە زەوی دا دەكوتن، لە ئەنجامی ئەوەدا ئاوروچكە بەرزدەكەنەوە.

ب- سوێند بەو ئەسپانەی سوارچاكەكانیان ئاگر هەڵدەكەن، كە شەو دادەبەزن بۆ پێویستیی خۆیان و خواردن سازكردنیان.

**ج-** هەندێکی دیکەش گوتوویانە: **(فالموريات قَدْحاً)** مەبەست پێی جەنگ هەڵگیرساندنە ئەو ئەسپانەی خۆیان دەکوتنە نێو دوژمنەوەو جەنگ هەڵدەگیرسێنن.

بەڵام لەڕاستییدا مانای یەکەمیان ڕاستە: ئەو ئەسپانەی بە سمەکانیان کە بەهێز بەزەوییان دا دەکوتن، دەبێتە هۆی پەیدابوونی ئاوروچکە، چونکە سمەکانیان ڕەقن، بەتایبەتی ئەگەر ناڵیان هەبن، کاتێك بە شتی ڕەق و، بەردو شاخیان دا دەکوتن، لە ئەنجامی ئەوەدا ئاوروچکە پەیدا دەبێ.

**٣)-** ﴿ فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا ٣ ﴾ سوێند بەو ئەسپانەی بەرە بەیانان هێرش دەکەن، **(المغيرات)** لە **(إغارة)**ەوە هاتوە کە بە دوو واتایان هاتوە:

**١-** هێرشکردنە سەر سوپایەك.

**٢-** زۆر خێرا ڕۆیشتن و بە پڕتاو ڕۆیشتن.

یەکێك لە زانایان ئاوای مانا لێداوەتەوە: **(الخَيْلُ: تغير على العَدو وَقْتَ الصباح وصبحاً منصوب على الظرفية)** واتە: سوێند بەو ئەسپانەی هێرش دەبەنە سەر دوژمن (یان زۆر بەخێرایی و بەپڕتاویی دەڕۆن) لە کاتی بەرەبەیاندا.

**٤)-** ﴿ فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ٤ ﴾ ئنجا تۆزو گەردیان پێ پەیداکرد.**(أثرن يعني هيَّجن)** واتە: بەو هێرش بردنە، یان بەو خێرا ڕۆیشتنە، تۆزو خۆڵیان پەیدا کرد. (نقع) واتە: تۆز و خۆڵ **(الإثَارَةُ: التَّحْرِيكُ والتَّهييجُ) (إثَارَة)**: بە مانای ورووژاندن و جووڵاندن لە شوێنی خۆی، **(نَقْع)**یش هەموو توێژەرەوان و شارەزایانی زمان لێرەدا گوتوویانە بە مانای تۆز و خۆڵ دێ، ئەگەرنا وەك پێشتریش باسمان کرد، (نقع): بەو ئاوەش دەگوترێ کە لە بیردا دەمێنێتەوە، بەڵام لێرەدا واتە: تۆز و خۆڵ هەڵدەگیرسێنن و پەیدا دەکەن.

**٥)-** ﴿ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا ٥ ﴾، هەر بەو تۆز و خۆڵەوە خۆیان بە نێو کۆمەڵێکداداو نێوەڕاستی کۆمەڵێکەوە، واتە: لەو کاتەدا خۆیان دەکوتنە نێو کۆمەڵێك لە کۆمەڵەکانی

دوژمنان، دەگوترێ: (**وَسَطْتُ القوَم أَسِطُهم، وسطاً وسِيطَةً**) واتە: چوومە نێوەڕاستیانەوە، خۆم بە نێوەڕاستیان داکرد.

وشـەی (**جمعاً**) نـاوە بـۆ کۆمەڵێـك لـە خەڵـك، وەك و پێشـتریش ئاماژەیەکـم پێـدا هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: لێـرەدا مەبەسـت لـە (**العاديـات**) ئـەو حوشـترانەن کاتـی خـۆی پێیـان چـوون بـۆ حـەج، یـان بـۆ عومـرەو، چـوون و هاتـوون.

بـەڵام ڕای ڕاسـتتر ئەوەیـە لێـرەدا خـوا باسـی وڵاخـە بـەرزان دەکات، کـە لـە کوردەواریـی خۆمانـدا یـەك سـمیان پـێ دەگوتـرێ، واتـە: ئەسـپ و ماین و هێسـتریش تـا ڕاددەیـەك.

(**الطـبري**) دەڵـێ: لێـرەدا مەبەسـت لـە (**العاديـات**) وڵاخـە بەرزەکانـن، چونکـە حوشـتر ئـەو دەنگـەی نیـە، کـە لێـرە خـوای پـەروەردگار باسـی کـردوە و بریتیـە لـە حەمحەمـە (**حَمْحَـمَ: صوَّت صوتـاً دون العـالي**) واتـە: دەنگـی لێهـات، بـەڵام نـەك وەك حیلکانـدن و دەنـگ بەرزکردنـەوە، بەڵکـو دەنگـی هەناسـەو، پڕمانـدن کـە خێـرا دەڕوات و دوایـی هەناسـە لـە قوڕگیـدا دێـت و دەچـێ.

سوێند بەو ئەسپانەی بەو شێوەیەن:

٦)- ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦ ﴾ بە دڵنیایی مرۆڤ بۆ پەروەردگاری سپڵەیە ناسوپاسە.

لەبارەی مانای (**كنود**) ەوە چەند ڕایەك هەین:

أ- (**الكَنُود: الكَفُورُ بالنِّعْمَة**) (**كنود**) چاکەی خوا نادیدە گرو سپڵە بەرانبەر بە چاکەکانی خوا.

ب- هەندێك گوتوویانە: (**الكَنُودُ: البَخِيْلُ**) واتە: چرووك و ڕژد.

ج- هەندێك گوتوویانە: (**الكَنُودُ: العَاصِي**) سەرپێچییکار.

**د-** هەندێكیش گوتوویانە: **(الكَنُودُ: الشَّدِيدُ الكُفْرَان)** زۆر سپڵەیە، بەڵام ڕای زیاتری شارەزایانی زمان، ئەوەیە كە **(كنود)** واتە: **(كفور)** سپڵەو ناسوپاس.

پیتی (ل)ی سەر **(لكنود)** پێی دەگوترێ: **(لام التقوية)** لامی بەهێزكردن و مانایەكەی بەهێزتر دەكات و بۆ جەختكردنەویە.

**٧)-** ﴿ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٌ ﴿٧﴾ ﴾ بە دڵنیایی (مرۆڤ) لەسەر ئەوەش شایەدە، واتە: مرۆڤی بێبڕوا بەزمانی حاڵ و، جاری واش هەیە بە زمانی وتاریش، شایەدیی لەسەر خۆی دەدات، كە بەرانبەر بە خوای پەروەردگارو چاكەكانی، سپڵەو ناسوپاس و پێنەزانە.

وشەی **(شهيد)**:

**١-** شایەد و گەواهیدەر.

**٢-** ئامادە **(حاضر)**.

**٣-** زانا و شارەزا.

**٤-** دانپێداهێنەر، لێرەدا واپێدەچێ مانای كۆتایی بەهێزتربێ واتە: دانی پێدادێنێ و شایەتیی لەسەر خۆی دەدات كە ناسوپاسە، بە زمانی حاڵ و كردار، جاری واش هەیە بە زمانی وتار.

**٨)-** ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾، بەدڵنیایی ئەو (مرۆڤە) ماڵ و سامانی زۆر خۆشدەوێ، ئەمیش دیسان ناگونجێ سیفەتی هەموو مرۆڤەكان بێ، لەنێویشیاندا پێغەمبەران **(عليهم الصلاة والسلام)**و بۆ خوا صوڵحاوان، كە تەماشای ماڵ و سامان دەكەن، وەك ئامڕاز و هۆكارێك، نەك زۆریان خۆشبوێ و بیخەنە نێو دڵیان و لە خۆشویستن و گرنگیی پێدانیدا تێبپەڕێنن، ئەوەش دیسان سیفەتی مرۆڤی بێبڕوایە، كە بێجگە لە دونیاو ماڵ و سامانی دونیا، شتێكی دیكە شك نابات، دڵی خۆی زۆر بخاتە سەر، بێگومان ناگونجێ ئەمە سیفەتی هەموو مرۆڤەكان بێ و، ئەمەش دیسان بەڵگەیەكی دیكەیە لەسەر ئەوەی (أل)ی سەر **(الإنسان)** بۆ عەهدە، عەهدیش لە زمانی

عەرەبییدا، دەكەوێتە بەرانبەر (كە) لە زمانی كوردییدا، ئەگەر گوتم:(كتێبم بۆ بێنە)، هەر كتێبێك دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر گوتم: (كتێبەكەم بۆ بێنە) یان (موصحەفەكەم وێدە)، داواكراوەكە لە نێوان هەردوولادا، شتێكی زانراوەو دەزانرێ كامەیە.

لێرەشدا مرۆڤەكە، واتە: مرۆڤە بێبڕوایەكە، ئنجا لێرەدا **(الإنسان)** هەرچەندە بە تاك هاتووە، بەڵام مانایەكەی كۆیە، واتە: مرۆڤە بێبڕوایەكان بەرانبەر بە پەروەردگاریان سپڵەو ناسوپاسن، خۆشیان لەسەر ئەوە شایەتیی دەدەن، ماڵ و سامانیشیان زۆر خۆشدەوێ.

وشەی **(خیر)** یانی: چاكەو، بە مانای هەر شتێك دێ كە مرۆڤ ئارەزووی دەكات و پێیخۆشە هەیبێ، بەڵام بەپێی سیاق جاری وایە مانایەكەی تایبەت دەبێتەوە بە ماڵ و سامانەوە، لێرەشدا مەبەست پێی ماڵ و سامانە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾البقرة، واتە: لەسەرتان پێویست كراوە وەسیەتكردن، هەر كاتێك یەكێكتان مردنی گەیشتە سەر، ئەگەر خەیرێكی بەجێدەهێشت (واتە ماڵ و سامان)...

كە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلْخَيْرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ﴾ (ل)ی **(لِحبّ الخیر)** لامی هۆكار دۆزیی **(لام التعلیل)**ە، واتە: لە پێناوی خۆشویستنی ماڵ و سامانداا، زۆر توندو سەختە، هەڵبەتە كەسێكیش ماڵ و سامانی لە ئەندازەی ئاسایی و سرووشتیی خۆی زیاتر خۆشبوێ، ئەوە وای لێ دەكات چرووكیی بنوێنێ و، وای لێ دەكات كاری چاكە نەكات، و وادەكات خاوەنەكەی تووشی كۆمەڵێك هەڵەو كەم و كوڕیی ببێ، لە ئەنجامی ئەوەدا كە ماڵ و سامانی زیاد لەوەی دەیهێنێ، خۆشویستوە، لە جیاتی ئەوەی لە دەستی و، لە گیرفانی دابێ، خستوویەتە نێو دڵیەوە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ئایا مرۆڤی بێبڕوا نازانێ کاتێك گۆڕەکان هەڵگێڕدرانەوەو، مردووان زیندووکرانەوەو، هی نێو سینەکان دەرهێنران و کۆکرانەوەو جیاکرانەوە (چی دەقەومێ؟) بەدڵنیایی پەروەردگاریان پێیان شارەزایە.**

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَعۡلَمُ إِذَا بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ ۝٩ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ۝١٠ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّخَبِيرُۢ ۝١١ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَلَا يَعۡلَمُ إِذَا بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ ۝٩ ﴾ ئایا نازانێ کاتێك ئەوەی لە نێو گۆڕەکاندا هەیە هەڵگێڕدرایەوە! بێگومان ئەوەی لە نێو گۆڕەکاندایە جەستەکانی مردووەکانن بۆ کەسێك گۆڕی بە قسمەت بووبێ، چونکە بە زۆریی وایە مرۆڤەکان جەنازەکانی خۆیان دەخەنە بن زەوی، بۆ مسوڵمانان و نامسوڵمانانیش هەروایە، خوا دەفەرموێ: ئایا نازانێ؟ دیسان ڕووی دواندن لەو مرۆڤەیە، کە پێشتر باسکرا، بێگومان ناگونجێ بڵێین: تێکڕای مرۆڤەکان مەبەستن، بەڵکو مەبەست مرۆڤی بێبڕوایەو، (أل)ەکە بۆ عەهدە، چونکە هەر مرۆڤی بێبڕوایە نکووڵیی لەوە دەکات، دوای ئەوەی زیندوو دەکرێتەوە - بگرە هەر نکووڵیی لە زیندووبوونەوەش دەکات - هی نێو سینەکان بهێندرێتە دەرو، نکووڵیی لەوەش دەکات پەروەردگاری پێی زاناو شارەزابێ، چونکە لێرەدا هەمزە (أ) بۆ پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، پیتی (ف)ش لە (**أَفَلَا**)دا بۆ (**تفريع**)ە، یانی: ئەم ڕستەیە هەڵدەچنرێ لەسەر ڕستەکانی پێشێ، (**أفلا يعلم**) ئایا نازانێ؟ چی نازانێ؟ لێرەدا (**يَعۡلَمُ**) بەرکارەکەی قرتێنراوە، تاکو زەین بۆ ئامادەکردنی بەملاولادا بێ وبچێ و، لەشتێکی دیارییکراودا قەتیش نەبێ هەروەها کە باسی هەڵگێڕانەوەی ئەوەی لەنێو گۆڕەکان دایە کردووەو، باسی دەرهێنانی شتەکانی نێو سینەکانی کردوە، بەنەزاندراو (**نكرة**) و پەی پێنەبراو (**مجهول**)، هێناویەتی و، دیاریی نەکردوە چی دەبێ و چی ڕوودەدات، بۆ مەزن

و بێڕەزا پێشاندانی، یانی: لەوکاتەدا شتێك ڕوودەدا زۆر بێڕەزاو گەورە لەوەسفکردن نایەت و، بەس خوا دەزانێ چییەو چۆنە؟

وشـەی (**بعـثرو بحـثر**) لـە زمانـی عەرەبییـدا یـەك واتایـان هەیـە، (**بعـثرة**) هەڵگێڕانـەوەی شـتێکە خوارێـی ببێتـە سـەرێ و سـەرێی بچێتـە خـوارێ، یانی: سـەرەو بـن کـردن و هەڵگێڕانـەوە، کـە لێـرەدا مەبەسـت پێـی زیندووکرانـەوەی ئەوانەیـە کـە لـە گـۆڕەکان دا هەیـە.

**٢)**- ﴿ وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ ﴾ هەروەها ئەوەی لە نێو سینەکانیش دایە کۆکرایەوە و سەرژمێرکرا، وشەی (**حُصِّلَ**) واتە: کۆکرایەوەو سەرژمێرکرا، وشەی (**تَحْصِيل**) لە بنەڕەتدا بە مانای جیاکردنەوەی کاکڵ و توێکڵە، ئنجا لە ئەنجامی  ئەوەدا کە کاکڵ و توێکڵ لێك جیادەکرێنەوە، بێگومان یەکێکیان دەخرێتە ئەملاو ئەوەی دیکەش دەخرێتە ئەولا.

زانایانیش وشەی (**حُصِّلَ**)یان بە شێوەیەك لێکداوەتەوە، کە لەم مانایە نیزیکە:

**أ**- بۆ وێنە ئیبنو عەبباس (**طبري**) بە ژمارە: (**٣٧٩٧٢**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا لێوەی هێناوە و گوتوویەتی: (**حُصِّلَ أي: بُرِزَ**) واتە: ئاشکراکرا، دەرهێنرا.

**ب**- سوفیانیش (**طبري**) بە ژمارە: (٣٧٩٧٣) لێوەی هێناوە و گوتوویەتی: (**حُصِّلَ: مُيِّزَ**) لێك جیاکرایەوە.

کەواتـە: خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا بەسەرزەنشـتکردن و ڕەخنـە لێگرتنـەوە پرسـیارێکی نکووڵییلێکەرانـە ئاڕاسـتەی ئـەو جـۆرە مرۆڤـە دەکات، کـە لـە ئایەتەکانـی پێشـێدا باسـی کـرد، دەفەرمـوێ: ئایـا نازانـێ لـە کاتێکـدا گـۆڕەکان هەڵدەگێڕدرێنـەوەو، ئـەوەی تێیـان دایـە دەهێنرێتـە دەرێ، واتـە: مرۆڤـەکان زینـدوو دەکرێنـەوە و، لـە کاتێکـدا ئـەوەی لـە سـینەکان دایـە کۆدەکرێتـەوەو جیادەکرێتـەوە پۆلێـن دەکـرێ، چـی دەقەومـێ؟ چونکـە بـەرکاری (**يعلـم**) قرتێنـدراوە بـۆ ئـەوەی زەینـی مـرۆڤ بـۆ هـەر شـتێك بچـێ کـە لەگەڵیـدا دەگونجـێ، واتـە:

أ- ئایا نازانێ لەوکاتەدا سزا چاوەڕێی دەکات؟

ب- ئایا نازانێ دادگەریی خوای بەسەردا دەچەسپێ؟

ج- ئایا نازانێ ئەو زۆر خۆشویستنی ماڵ و سامان و، ئەو بێ نمەکیی و سپڵەییەی بەرانبەر بە پەروەردگاری، بۆی دەبێتە مایەی مەینەتیی و ئازار؟!

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

١١)- ﴿ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌ ﴿١١﴾ ﴾ بەدڵنیایی لەو ڕۆژەدا پەروەردگاریان پێیان شارەزایە، ئەمە لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: (**جُمْلَةٌ إِسْتِئْنَافِيَّة**) ڕستەیەکی دەستپێکەرە، بۆ دەستپێکردنەو پەیوەست نیە بەوەی پێش خۆیەوە، ئەگەرنا ئەگەر پێوەی پەیوەست بووایە، دەبووایە فەرمووبای: (**أَنَّ رَبَّهُم**) کە پەروەردگاریان لەو ڕۆژەدا پێیان شارەزایە، بەڵام نا، وەڵامی پرسیارەکانی پێشێی قرتێندراوەو، ئەمە ڕستەیەکە لە نوێ دەست پێدەکات، بۆ ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە پەروەردگاریان بەو مرۆڤانە، لەو ڕۆژەدا زۆر شارەزایە.

لێرەدا جێی سەرنجە: خوا ﷻ بە تاك باسی مرۆڤی كردوە (**أفلا يعلم**) بەڵام دوایی بەكۆ دەیانهێنێ و دەفەرموێ: (**إِنَّ رَبَّهُم بِهِم**) لەبەرچی؟ چونكە هەرچەندە مرۆڤ لە ئایەتەكانی پێشتردا بە تاك هاتوە بێژەكەی تاكە بەڵام ماناكەی كۆیەو، كۆی مرۆڤان دەگرێتەوە، كۆی ئەو جۆرە مرۆڤانە.

هەروەها لەڕستەی: (**إِنَّ رَبَّهُم بِهِم**)دا، (**بهم**) پێشخراوەو، خوا نەیفەرمووە: (**إن ربهم لخبير يومئذ بهم**) بەدڵنیایی ئەوەش بۆ زێدە بایەخ پێدان و گرنگیی پێدانە، كە پەروەردگاریان بەوان لەو ڕۆژەدا زۆر شارەزایەو، هیچ شتێكی ئەوانی لێ پەنهان نیە.

شایانی باسە: (**الطبري**) بەژمارە (٣٧٩٠٣)، هێناویەتی و زۆربەی تەفسیرەكانیش هێناویانە، گوایە لە كاتێكدا عەلی كوڕی ئەبوو تاڵیب (خوا لێی ڕازی بێ) لەلای

ئـاوی زەمـزەم بـووە، کەسـێك پرسـیار لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس دەکات لەبـارەی ئەم ئایەتانـەوە: ﴿ وَٱلْعَـٰدِيَـٰتِ ضَبْحًا ۝١ فَٱلْمُورِيَـٰتِ قَدْحًا ۝٢ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ۝٣ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ۝٤ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ۝٥ ﴾ ئەویـش دەڵـێ: ئەمـە مەبەسـت پێی ئەسـپەکانە، ئـەو ئەسـپانەی سـوارچاکان سـواریان دەبـن و، بـەرەو دوژمـن هێرشـیان پـێ دەبـەن، ئـەو کەسـەش دەچێـت بـۆلای عەلـی کـوڕی ئەبـوو تاڵیبیـش (خـوا لێـی ڕازی بـێ) و، هەمـان پرسـیاری لێـدەکات، ئەویـش دەڵـێ: لـە پێـش منـدا لـە کەسـت پرسـیوە؟ دەڵـێ: بەڵـێ، دەڵـێ: لـە کـێ؟ دەڵـێ: لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس، دەڵـێ: چۆنـی وەڵامدایـەوە؟ دەڵـێ: ئـاوای وەڵام دامـەوە کـە مەبەسـت پێـی وڵاخـە بەرزەکانـە، ئەویـش دەڵـێ: بـۆم بانـگ بکـە، دیـارە ئامۆزابـوون، بـەڵام عەبدوڵـڵا بـە تەمـەن لـە عەلـی گچکەتـر بـووەو، لـە ڕووی زانیارییشـەوە عەلـی لـەو شـارەزاتر بـووە، دێ بـۆلای و دەڵـێ: چـۆن وەڵامـی ئـەم پرسـیارەت ئـاوا داوەتـەوە؟ شـتێك کـە نایزانـی بـۆ چـی دەیڵێـی، عبدوڵـڵا دەڵـێ: چـی بـۆ؟ عـەلی دەڵـێ: ئێمـە لـە جەنگـی بـەدردا تەنیا دوو ئەسـپمان پێبـوون، میقـداد و زوبەیـر، ئـەم ئایەتانـەش بەسـەر ئـەو ئەسـپانەدا ناچەسـپن، بەڵکـو ئـەوە مەبەسـت پێـی ئـەو حوشـترانەیە کـە لـە عەرەفاتـەوە بـەرەو موزدەلیفـە دێنـە خـوار، بەخێرایـی تـاو دەدرێـن و بەخێرایـی دەڕۆێنرێـن و، بـەو جـۆرە هەناسـە دەدەن، گوایـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس گوتوویەتـی: ئـەوە مـن لـە ڕای خـۆم هاتمـە خـوارو هاتمـە سـەر ڕای تـۆ.

بـەڵام مـن پێـم وایـە ئـەو گێڕدراوەیـە ڕاسـت نیـە، چونکـە شـێوازی دەربڕینەکـەی پاڵدراوەتـە لای عـەلی، گونجـاو نیـە و پێـم وایـە عەلـی (خـوا لێـی ڕازی بـێ) ئـاوا سـەرزەنشـتی عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس نـاکات: شـتێك کـە نایزانـی بۆچـی دەیڵێـی؟ هەروەهـا ئـەو سـیفەتانەش زیاتـر لەگـەڵ ئەسـپاندا گونجـاون، چونکـە حوشـتر سـمی نیـە، سـمەکانی ڕەق بـن و ئاوروچکـە پەیـدا بکـەن! بەڵکو وەك پێشـتر باسـمان کردوە، حوشـتر پێیەکانـی شـێوە ئیسـفینجیین و کاتێـك دایاندەنێ، پـان دەبنەوە بـە زەوییەوە، بۆیـە هەرگیـز ئاوروچکـە لـە بـن پێـی حوشـتران بـەرز نابێتـەوە، دیسـان حوشـتریش کەمـتر بەکارهێـنراوە بـۆ هێـرش بردنـە سـەر دوژمـن و ئەسـپ بەکاردەهێـنراوە بـۆ

ئەو مەبەستە، سەربارەش ئەم سووڕەتە وەك باسمان كرد سووڕەتێكی مەككەییە و ئەوكاتە جەنگی بەدر نەهاتۆتە پێش و، مەرجیش نیە مەبەست پێی جەنگی بەدر یان جەنگێكی دیاریكراو بێ، بەڵكو مەبەست پێی ئەو ئەسپانەیە كە سوارچاكان سواریان دەبن و، هێرشیان پێ دەبەنە سەر دوژمن، ئیدی جەنگی بەدر بێ، یان هەر جەنگێكی دیكە بێ، بۆیە ئەو گێڕدرایەوەم لە ڕووی سەنەدەوە پێ ڕاست نیەو، لە ڕووی نێوەڕۆكیشەوە، هەڵەیە، چونكە وەسفەكان لەگەڵ ئەسپاندا دەگونجێن نەك لەگەڵ حوشتراندا.

(طبري) لە ڕوونكردنەوەو واتاكردنی: ﴿ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ٢ ﴾دا، ئەو قسەیە دەكات و مانایەكەی گشتییتر لە ئەسپان دێنێ و دەڵێ: (**فَالمُورِياتِ قَدْحاً فَالْخَيْلُ تُورِي بِحَوَافِرِهَا، وَالنَّاسُ يُورُونَهَا بِالزَّنْدِ، وَاللِّسَانُ يُورِي بِالْمَنْطِقِ، وَالرِّجَالُ يُورُونَ بِالْمَكْرِ، وَكَذَلِكَ الْخَيْلُ تُهَيِّجُ الْحَرْبَ بَيْنَ أَهْلِهَا: إِذَا الْتَقَتْ فِي الْحَرْبِ؛ وَلَمْ يَضَعِ اللَّهُ دَلَالَةً عَلَى أَنَّ الْمُرَادَ مِنْ ذَلِكَ بَعْضٌ دُونَ بَعْضٍ، فَكُلُّ مَا أَوْرَتِ النَّار قَدْحًا، فَدَاخِلَةٌ فِيمَا أَقْسَمَ بِهِ، لِعُمُومِ ذَلِكَ بِالظَّاهِرِ**).[1]

واتە: ئاوروچكە بڵندكەران، ئاگر هەڵگیرسێنەران، ئەسپەكان بە سمەكانیان ئاوروچكە بڵند دەكەن، خەڵكیش بەبەرد و ئەستێ ئاگر دەكەنەوە، زمانیش (هەندێك لە زانایان وایانگوتوە) بەهۆی قسەكردنەوە جاری وایە شەڕ هەڵدەگیرسێنێ، پیاوانیش جاری وا هەیە بەهۆی فرت و فێڵ و نەخشە دانانەوە شەڕ هەڵدەگیرسێنن، هەروەها ئەسپەكانیش جاری وایە كە بەهۆی خۆكوتانە نێو دوژمنەوە، ئەوانیش شەڕ هەڵدەگیرسێنن، لە كاتێكدا كە جەنگ دروست دەبێ، خواش نیشانەیەكی دانەناوە كە مەبەست لە: ﴿ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ٢ ﴾ یەكێك لەوانە بێ جیا لەوانی دیكە، بۆیە هەموو ئەوانەی ئاگر هەڵدەگیرسێنن، دەكەونە نێو بازنەی ئەوەوە كە خوا سوێندی پێ خواردوە، چونكە خوا بە گشتیی فەرموویەتی.

---

(١) (جامع البيان: ج١٥، جزء٣٠، ص٣٢)

تەبەڕیی وا دەڵێ.

بەڵام من دەڵێم: لە ڕاستییدا ئەو سیفەتانە ئەگەر هەموو ئایەتەکان تەماشا بکەین: ﴿ وَٱلْعَٰدِيَٰتِ ضَبْحًا ﴿١﴾ فَٱلْمُورِيَٰتِ قَدْحًا ﴿٢﴾ فَٱلْمُغِيرَٰتِ صُبْحًا ﴿٣﴾ فَأَثَرْنَ بِهِۦ نَقْعًا ﴿٤﴾ فَوَسَطْنَ بِهِۦ جَمْعًا ﴿٥﴾ ﴾ هەموویان تەنیا بەسەر ئەسپاندا دەچەسپن، ئەگەرنا دەگونجێ کەسێك بە زمان شەڕێك دروست بکات، بەڵام دوایی تۆز و خۆڵ بە زمان دروست نابێ، هەروەها دەگونجێ کەسێك نەخشە بۆ شەڕ دابنێ، بەڵام تۆز و خۆڵی پێ دروست نابێ و، سیفەتەکانی دیکەش هەروا.

هەڵبەتە ئەم عادەتەی تەبەڕیی باشە، زۆرجار چەمك و واتای ئایەتەکان فراوان دەکات، چونکە زۆرێك لە زانایان تایبەتیان کردوە، بەشتێکی دیارییکراوەوە، بەڵام ئەویش واتاو چەمکەکەیان فراوان دەکات و، ئەویش لەوەدا وەك بنەماو بنچینە پێکاویەتی، بەڵام مەرج نیە ئەو بنچینەیە لە هەموو کاتێکدا ڕاست دەربچێ، لێرەدا ئەگەر تەماشای ئایەتەکان بکەین، دەزانین مەبەست پێیان ئەسپانێکن کە سوارچاکان بەکاریان دێنن بۆ هێرشکردنە سەر دوژمن.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خوا ﷻ چۆن لە قۆناغی مەککەدا باسی ئەو ئەسپانەی کردوە، ئایا حیکمەتەکەی چییە؟ بۆیە هەندێکیان گوتوویانە: ئەم سووڕەتە مەدینەییە و بۆیە خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە، چونکە لە مەدینەدا سوارچاکان هەبوون و مسوڵمانان سواری ئەسپ بوون و، هێرشیان کردۆتە سەر دوژمن؟ وەڵامی ئەم پرسیارەش بەوە دەدەمەوە کە خوا ﷻ ئەوەی لە مەککە فەرموویەتی، ئەوەش کە لە مەدینە فەرموویەتی، بۆ هەموو مرۆڤەکانی فەرمووە، خوا ﷻ ئەوەی لە مەککە فەرمووەو، ئەو کاتەش لەوێدا سوارچاك هەر هەبوون، بەڵێ مسوڵمانان سواری ئەسپ نەبوون، هێرش بکەنە سەر دوژمن، بەڵام هۆز و تیرەکانی عەرەب و، خەڵکی دیکەو کۆمەڵگایەکان بەگشتیی، ئەو حاڵەتی بەسواری ئەسپ هێرشکردنە سەر دوژمنانیان تێدا هەبووە، خوای

پەروەردگاریش باسی حاڵەتێکی گشتیی دەکات و، مەرجیش نیە تایبەت بێ بە نەتەوەی عەرەبەوە، یاخود بە واقیعی ئەو کاتەی مسوڵمانانەوە.

لە کۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتە موبارەکەدا بەباشم زانی عیبارەتێک لە شێخ (**محمد عبده**)وە بێنم لە (**الأعمال الكاملة**)دا، [1] گوتوویەتی:

خوا ﷻ لێرەدا سوێندی خواردوە بە ئەسپان و، بەو سیفەتانەی هەیانن، خوا باسیکردوون، هەروەها بەو کردەوانەی ئەو ئەسپانە ئەنجامیان دەدەن خوا ڕێزی کردوون، بۆچی؟ تاکو ستایشی ئەو ئەسپانە بکات و، قەدریان بەرز بکاتەوە لە دڵی بڕوادارانـدا، بڕوادارانێک کە خاوەنی هیمەتی بەرزبن، تاکو گرنگیی بدەن بەڕاگرتنی ئەسپان و مەشق پێکردنیان لەسەر هێرشبردن و لەسەر کشانەوە، بۆ ئەوەی دڵ و دەروونیان هان بدات کە گرنگیی بدەن بە سوارچاکیی و، مەشق و ڕاهێنان لەسەر سواربوونی ئەسپ و هێرشبردن، تاکو هەر کامێك لەو بڕوادارانە ئامادەبێ هەمیشەو بەردەوام بەشێك بێ لە هێزی ئۆممەتەکەی، ئۆممەتی ئیسلام، هەر کات ناچاربوو بۆ بەرپەرچ دانەوەی دوژمنێك و، دڕکی دوژمن بشکێنێ و بیبەزێنێ.

بەڕاستیی تێبینییەکەیم پێ جوانە، کە خوا ﷻ هەر لە قۆناغی مەککەوە، ئاوا ستایشی ئەو وڵاخە بەرزانەی کردوە، کە سوارچاکان سواریان دەبن و، غاریان پێدەدەن و، بەهۆی سمەکانیانەوە کە بەزەوییان دا دەکوتن، ئاوروچکەیان لە بن پێ بەرز دەبێتەوە، پاشان تۆز و خۆڵ هەڵدەگیرسێنن و، بەرە بەیانیان هێرش دەبەن، دوایی خۆیان بە نێو کۆمەڵ و ئاپۆرای دوژمن و ناحەزدا دەکەن، بۆیە خوا ﷻ سوێندی بەو ئەسپانە خواردوە، تاکو هەر لەو سەرەتایەوە مەشق و ڕاهێنانیان پێ بکات و، ڕووحی سوارچاکیی هێرشکردن و جوامێریی و ئازایەتیی و بوێریی لە مسوڵماناندا پەیدا بکات.

لێرەشدا کۆتایی بە تەفسیری ئەم سوورەتە موبارەکە دێنین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

(١) ج٥، ص٤٨٦.

## دەستپێک

بەڕێـــــــزان!

ئەمڕۆ کە (٢١)ی (**ذي الحجة**)ی ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٨/١١)ی زایینی لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین، بە تەفسیرکردنی سووڕەتی (**القَارِعَة**)، سەرەتاش وەك عادەتی خۆمان پێناسەو نێوەڕۆکیی ئەم سووڕەتی موبارەکە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (القارعە) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە تەنیا بە ناوی (**سُورَةُ القَارِعَة**) ناسراوە، هیچ ناوی دیکەی جیا لەم ناوەی بۆ بەکار نەهێنراون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـووڕەتە بـە یـەك دەنگـی زانایـان، سـووڕەتێکی مەککەییـە، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن:

**{عَنْ عَبْدِالله ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، قَالَ: نَزَلَتْ سُورَةُ القَارِعَة بِمَكَّةَ} (أورده السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٦٠٥، ونسبه لابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٥٥٢)**، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئەم سووڕەتی (**القَارِعَة**)، لە مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

ئەم سووڕەتە لە (مصحف)دا ژمارەکەی سەدو یەك (١٠١) و، لە دابەزینیشدا ژماە سی (٣٠)یە، پێش (**سورة القیامة**)و دوای (**سورة قریش**) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زانایان لە بارەی ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتەوە، ڕاجیاییان هەبووە و: سێ ژمارەیان بۆ داناون:

أ- (**أهل الشام والبصرة**): گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی هەشتە (٨).

ب- (**أهل المدینة ومكة**): گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی دەیە.

ج- (**أهل الكوفة**): گوتوویانە: ژمارەی ئایەتەکانی یازدەیە زیاتریش ژمارە (١١)یان تەبەنیی کراوە بە تایبەت لەو موصحەفانەدا کە لە ولآتی دەوروبەری ئێمەدا چاپکراون[1].

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە زۆر بە کورتیی ئاوایە: بە سەرنجڕاکێشانەوە باسی ئاخیر زەمانە، خەڵك شپرز و شێواو وەك پەپوولەی پرژو بڵاودەبن، حاڵی چیایان وەك خوری شکنراوە و پەڕەکراو لێك هەڵدەوەشێن، دوایی باسی سەرەنجامی بڕواداراني تەرازوو گران، کراوە کە ژیانێکی بە ڕەزامەندییان هەیە لە بەهەشتداو سەرەنجامی بێبڕوایانی تەرازوویان سووك خراوەتە کە جێگایان (هَاوِيَةٌ) واتە: دۆزەخە و، خوا بە ئاگرێکی گەرم پێناسەی دەکات، ئاگر هەر گەرمە بەڵام کە خوا دەفەرموێ: ﴿ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴿١١﴾ ﴾، واتە: ئەو ئاگرە گەرمییەکەی گەرمییەکی تایبەتەو وەك گەرمیی ئاگری دنیا نیە.

---

(١) کەواتە: ئەگەر موصحەفێکتان بینی بۆ وێنە جەزائیر یان مەغریب، لە ولآتێکی دیکەی ئەفریقیا یان شوێنێکی دیکە چاپکراوە و ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتەی بە هەشت، یان بە دە دانابوو، سەرتان سووڕ نەمێنێ.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

سێ تایبەتمەندی لێ دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** هاتنی هەرسێك ڕستەی کە بەدوای یەکدا هاتوون: (ٱلۡقَارِعَةُ ، مَا ٱلۡقَارِعَةُ ، وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ).

**دووەم:** هاتنی تەعبیری: ( يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ، وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ)، ئەم دوو تەعبیرە تەنها لەم سوورەتەدا هاتوون.

**سێیەم:** چەند وشەیەکی تایبەت:

١- (عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ)، ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی، یان ژیانێك خاوەنەکەی ڕازی دەکات بەخۆی.

٢- ( فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٞ )، (**الأم**): واتە: دایك، (**هَاوِيَة**): واتە: چاڵێکی قووڵ، دوایی وشەی دایك، بەو شوێنەش کە مرۆڤی بۆ لادەگەڕێتەوە، واتە: شوێن و مەئوای، هاتوە.

٣- ( نَارٌ حَامِيَةُۢ )، ئاگرێکی گەرم، هەموو ئاگرێك هەر گەرمە، بەڵام ئەو ئاگرەی دۆزەخ کە خوا بە گەرم پێناسەی کردوە، دیارە گەرمییەکەی نائاساییە، وەك گەرمیی دنیا نیە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی:

ئێمە تێکڕای یازدە ئایەتە موبارەکەکەی ئەم سوورەتە، هەموویان دەکەینە یەك دەرس.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە یازدە ئایەتی ئەم سوورەتە پێکدێ و، دوو تەوەران دەگرێتەخۆ:

**تەوەری یەکەم:** لە پێنج ئایەتی سەرەتادا باسی ئاخیر زەمان، کراوە، کە خوا ﷻ پێشێ دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡقَارِعَةُ ﴾ (قَارِعَة) لە (قَرْع)ەوە هاتوە، واتە: کوتان، یاخود شتێك بە شتێکی ڕەق دابدەی و دەنگ بداتەوەو دەنگێکی داچڵەکێنەر، بۆیەش من بە کوتەرو داچڵەکێنەر مانام کردوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، چی بە تۆی زانانـدووە کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ واتە: مەگەر خوا پێت بفەرموێ، ئەگەر نایزانی، ئنجا بەمجۆرە پێناسەی دەکات: ﴿ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴾، ڕۆژێکە خەڵك تێیدا پرژو بڵاو دەبن،وەك چۆن پەپوولە بە دەوری چرا ڕووناکییەك دا پرژو بڵاو دەبن، ﴿ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ﴾، چیا سەختەکانیش وەك خوریی شکراوە، خوریی کە دەشکرێتەوەو مووەکانی لێك جیادەکرێنەوە، ئەو چیایە سەختانەش بەو شێوەیان لێدێ.

**تەوەری دووەم:** لە شەش ئایەتی دوایی دا، باسی سەرەنجامی بڕوادارانی تەرازوو گران و بێبڕوایانی تەرازوو سووك، کراوە: ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٦ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴾ ئنجا هەر کەسی تەرازووەکانی قورس بوون، یاخود کێشراوەکانی قورس بوون، داکەوتن، ئەوە لە ژیانێکی ڕازیی دایە، واتە: لە ژیانێك دایە جێگای ڕەزامەندییە، یاخود لە ژیانێك دایە کە ئەو ژیانە خاوەنەکەی خۆی ڕازی دەکات، کە مەبەست پێی ژیانی بەهەشتە.

﴿ وَأَمَّا مَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ۝٨ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٞ ﴾، بەڵام کەسێك تەرازووەکانی سووك بن، (مَوَازِين) دەگونجێ کۆی (مِيْزَان) ، یان (مَوْزُون) بێ، ئەگەر کۆی (مِيْزَان)

بێ، واتە: تەرازووەکانی، ئەگەر کۆی (**مَوْزُون**) بێ، واتە: کێشراوەکانی، کردەوەکانی کە دەکێشرێن و هەڵدەسەنگێندرێن، سووك بن: ﴿ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴾، ئەو شوێنەی بۆ لای دەگەڕێتەوە بریتیە لە (**هَاوِيَةٌ**): واتە: چاڵێکی قووڵ کە هەر کەسێك تێی بکەوێ، دەربازی نابێ و دەفەوتێ، (**هَاوِيَة**): لە ئەصڵدا بە کەلێن و، دابڕاویی نێوان دوو چیایان دەگوترێ، کە مرۆڤ لێی بکەوێتە خوار، یان ئاژەڵ لێی بکەوێتە خوار و، بفەوتێ، وشەی (**الأم**) بە مانای دایك دێ، دوایی بە مانای تەپڵە سەریش هاتوە و، بە مانای شوێنی بۆلا گەڕانەوەش هاتوە.

﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ﴾، چی بە تۆی زاناندوە (**ئەو**) چییە؟ ﴿ نَارٌ حَامِيَةُۢ ﴾، ئاگرێکی یەکجار گەرم و داغە.

کەواتە: پێنج ئایەتی یەکەم باسی ئاخیر زەمانن و، شەش ئایەتی دووەمیش باسی قیامەتن، سووڕەتەکە کەواتە: هەموو باسی ڕۆژی دواییە، بە هەردووك قۆناغی ئاخیرزەمان (**سَاعَة**) و (**قِيَامَة**)وە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱلۡقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٞ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةُۢ ﴿١١﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . کوتەرو داچڵەکێنەر (١) کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ (٢) چی پێی زاناندووی کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ (٣) ڕۆژێکە (تێیدا) خەڵك وەك پەپوولە پرژو بڵاوەکان دەبن (٤) چیایەکانیش وەك خوریی ڕەنگاو ڕەنگی شکنراوە دەبن (٥) ئنجا هەر کەس تەرازووەکانی گران و داکەوتووبن (٦) ئەوە لە (بەهەشتدا) لە ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی دایە (٧) بەڵام کەسێك تەرازووەکانی سووك و سەرکردووبن (٨) ئەوە جێ و ماوای هاویەیە (٩) چی پێیزاناندووی هاویە چییە! (١٠) ئاگرێکی (یەکجار) گەرم (و سوتێنەر)ە (١١) }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْقَارِعَةُ ): (القَرْعُ: ضَرْبُ شَيء عَلَى شَيءٍ، قَرَعَ الشَّيءَ يَقْرَعُهُ قَرْعَاً، ضَرَبَهُ، قَرَعَ المُسِيءَ بِالعَصَى وَبالمِقْرِعَة)، (قَارِعَة): بە مانای کوتەر، داچڵەکێنەر، لە (قَرْع)ەوە هاتوە، (قَرْعُ)، بریتیە لەوەی شتێك لە شتێك بدەی، شتێکی ڕەق لە شتێکی دیکە بدەی، دەگوترێ: (قَرَعَ الشَّيء يَقْرَعُهُ قُرْعَاً)، شتەکەی کوتا دەیکوتێ بە کوتان، (ضَرَبَهُ) یانی: لێیدا بە شتێکی ڕەق، دوایی خوازاراوەتەوە بۆ لێدانی بابای خەتاکار، (قَرَعَ المُسِيءَ بِالعَصَى وَبالمِقْرِعَة)، لە بابای خراپەکاری دا بە گۆچان و بە قەمچییەك، یاخود بە چەکوشێك کە پێی لێدەدرێ.

(كَٱلْفَرَاشِ ): (جمع و فراشه) (فَرَاش)، ناوی کۆیە، واتە: کۆی پەپوولەکان، پەپوولەش دەزانین ئەوەی بە دەوری چراو ڕووناکییدا دەسووڕێتەوە، لە نێو گوڵ و باخ و باخچەکاندا هەن، زیندەوەرێکی زۆر پاك و بێ زەرە.

(ٱلْمَبْثُوثِ ): (أَصْلُ البَثِّ: التَّفْرِيْقُ وَإِثَارَةُ الشَّيءِ كَبَثِّ الريح التُّرَابِ)، وشەی (مَبْثُوث): لەسەر کێشی (مَفْعُوْل)ە، (بَثِ): بە مانای لێك جیاکردنەوەو بڵاوکردنەوەی شتێك وەك چۆن با گوڵ و خۆڵ بڵاودەکاتەوەو دەیپرژێنێ.

(كَٱلْعِهْنِ ): (العِهْنُ: الصُّوفُ المَصْبُوْغ)، (عِهْنْ): یانی: خوریی ڕەنگاو ڕەنگ، هەندێکیان دەڵێن: خوری سوور، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست خوریی ڕەنگاو ڕەنگ بێ، ڕەنگەکان بە تێکەڵی، چیایەکانیش ڕەش و سوور و سپیی و زەردو هەموو ڕەنگەکانیان تێدان.

(ٱلْمَنفُوشِ ): (النَّفْشُ: نَشْرُ الصُّوفِ)، خوریی ئەگەر پەڕە بکرێ و بشکنرێتەوە، پێی دەگوترێ: (نَفْش)، (وَنَفْشُ الغَنَمِ: انْتِشَارُهَا)، مەڕو بزنیش ئەگەر بە شەوێ بەرهەڵدابێ و، بڵاوبێتەوە، پێی دەگوترێ: (نَفْش)، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِذْ نَفَشَتْ فِيهِ غَنَمُ ٱلْقَوْمِ ﴿٧٨﴾﴾الأنبياء، واتە: کاتێك مەڕو بزنی خەڵکێك بەربووە نێو کشتوکاڵی خەڵکێکی دیکە.

(مَوَٰزِينُهُۥ ): (الوَزْنُ: مَعْرِفَةُ قَدْرِ الشَّيءِ)، (وَزْن): بە کوردی کێشان، بریتیە لە زانینی ئەندازەی شتێك، (وَمَوَازِين جَمْعُ مِيْزَان أو جَمْع مَوْزُون)، (مَوَازِين) کۆی (مِيْزَان)، تەرازووەکان، یاخود کۆی (مَوْزُون)ە، واتە: کێشراوەکان، هەر کەسێك تەرازووەکانی، یان کێشراوەکانی سووك بن.

(عِيشَةٍ ): (عَيْشُ أَهْلِ الجَنَّةِ، والعِيْشَةُ لِلنَّوْعِ مِثْلُ: الجِلْسَة)، (عِيْشَة)، ژیانی خەڵکی بەهەشت، ﴿عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾، واتە: ژیانێکی پڕ ڕەزامەندیی، ئەمە وەك (لَابِن، تَامِر)، وایە، (لَابِن)، واتە: خاوەن شیردەر، (تَامِر) خورما، (عِيْشَة)ش واتە: خاوەن ڕەزامەندیی، کەسێك ئەگەر ئەو ژیان و گوزەرانەی هەبێ، لێی ڕازی بێ، (عِيْشَة)، بۆ جۆرە، وەك (جِلْسَة)، واتە: جۆرێك لە دانیشتن، دەگوترێ (جِلْسَ مُتَرَبِعَاً) بە چوار مەشقیی دانیشت.

( فَأُمُّهُۥ ): (الأمُّ بِإزَاءِ الأبِّ وَهِيَ الوَالِدَةُ القَرِيْبَةُ الَّتِي وَلَدَتهُ وَالبَعِيْدَةُ الَّتِي وَلَدَتْ مَنْ وَلَدَتْهُ، والأمُّ: مَا كَانَ أَصْلاً لِوُجُودِ شَيءٍ أو تَرْبِيَةٍ، أو إِصْلاحِهِ، أو مَبْدَئِهِ)، وشەی (أم) لە

بەرانبەری (**أب**) دایە، (**أم**)، واتە: دایك، (**أب**)، واتە: باب، کە بریتیە لەو دایکە نیزیکەی کە ئەو منداڵەی ئەو کەسەی لێیی بووە و.

ئەو دایکە دوورەی دایکە نیزیکەکەی لێ بووە، واتە: نەنك، (**الأم**)، بۆ بنچینەو بنەڕەتی شتێکیش بەکاردێ (ڕەنگە ئەوە مانا ئەصڵیەکەی بێ، لەوەوە بۆ دایکیش بەکارهاتوە، لەبەر ئەوەی دایك دەبێتە بنەڕەت و ئەصڵ بۆ ڕۆڵەکانی) هەروەها (**الأم**): بریتیە لەوەی بنەڕەت بێ بۆ پەیدابوونی شتێك یان پەروەردەبوونی، یان چاکبوونی، یاخود سەرەتاو دەستپێکی.

(**هَاوِيَةٌ**): (**الهُوِيُ: ذَهَابٌ في انْحِدَارٍ وَسُقُوطٌ مِنْ عُلْوٍ إلى سُفْلٍ**)، (**هُوِي**): لێژبوونەوە و شۆڕبوونەوە، ڕۆیشتنە بەرەو خوار و کەوتنە خوارە لە سەرێوە بۆ خوارێ، لەسەرڕا داکەوتن بۆ خوارێ.

(**حَامِيَةٌ**): ئاگرێکی گەرم، (**الحَمِيُ: الحَرَارَةُ المُتَوَلِّدَةُ مِنَ الجَوَاهِرِ المُحمِيَّةِ كَالنَّارِ وَالشَّمْسِ، وَمِنَ القُوَّةِ الحَارَّةِ فِي البَدَنِ**)، (**حَمِي**): بەو گەرمییە دەگوترێ کە لە کانزا گەرمەکانی وەك ئاگرو خۆر پەیدادەبێ، هەروەها لەو هێزە گەرمەی لە جەستەدا هەیە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، ئەوەش مەبەستی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەرز و مەزن دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

﴿ ٱلْقَارِعَةُ ﴾، واتە: کوتەر، داچڵەکێنەر، لە (قَرْع)ەوە هاتوە، (قَرْع)یش واتە: پێدادانی شتێك بە شتێك، بەڵام بە مەرجێك ڕەق بێ و دەنگی لێ بێ، دەگوترێ: (قَرَعَ البَابَ)، لە دەرگاکەیدا، وەختی خۆی جەرەس نەبووە و، بە ئاسن لە دەرگایان داوە، ئێستاش هەندێك دەرگا هەروان، گرنگ ئەوەیە (قَرْع)، بە دەنگێگ دەگوترێ کە لە ئەنجامی بەرکەوتنی شتێکی ڕەق بە شتێکی دیکەی ڕەق دا پەیدادەبێ، دەنگێك کە مرۆڤ داچڵەکێنێ و ڕایچڵەکێنێ.

﴿ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴾ (ما) بۆ پرسیارکردنە، (ما الإستفهامية)یە، کورت و داچڵەکێنەر (قارعة) چییە؟

﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴾، چی بە تۆی زاناندووە کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ ئەمە وەك سوورەتی (الحاقة)یە کە خوا فەرمووی: ﴿ ٱلْحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلْحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ ﴾، (ٱلْحَآقَّةُ) واتە: چەسپاو، یان هەق چەسپێنەر، (مَا ٱلْحَآقَّةُ)، (ٱلْحَآقَّةُ) چییە؟ (وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحَآقَّةُ) چی بە تۆی زاناندوە (ٱلْحَآقَّةُ) چییە؟ لەوێ بە (ٱلْحَآقَّةُ) هاتوە، هەروەها بە (ٱلصَّآخَّةُ)و(ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ)و(ٱلرَّاجِفَةُ)و....هتد، لێرەش بە (ٱلْقَارِعَةُ) هاتوە، کە

ئەمانە هەموویان ناوی ڕۆژی دوایین، (ٱلْحَاقَّةُ) وا پێدەچێ ناوی ڕۆژی قیامەت بێ، چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا هەق دەچەسپێ، ئەگەر مەبەست پێی چەسپانی هەق بێ، ئەگەر مەبەستیش پێی هاتنە دی ئەو ڕووداوە بێ، قۆناغی یەکەمیش کە ئاخیر زەمانە دەیگرێتەوە، لێرەشدا ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾ زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ چونکە لە ئاخیر زەماندا ئەو دەنگە داچڵەکێنەرە دێت، کە گەردوون هەمووی بەسەر یەکدا تێکدەچێ و، ئەو گۆڕنکارییە بێڕەزا و گەورانەدەبن کە خوای باڵادەست لە سوورەتەکانی دیکەدا باسی کردووون.

هەڵبەتە ڕوونکەرەوانی قوڕئان زۆربەیان وایان لێکداوەتەوە، کە ئەمە هەمووی مەبەست پێی قیامەتە، بەڵام من وای تێدەگەم کە پێنج ئایەتیب سەرەتان مەبەست پێیان قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایییە کە بریتیە لە ئاخیر زەمان، تێکچوونی دنیاو گەردوون و، شەش ئایەتی دواییش باسی قیامەت دەکەن، ئاشکرایە شەش ئایەتی (٦-١١) باسی سەرەنجام و سزاو پاداشت درانەوە دەکەن، کە پەیوەندییان بە قیامەتەوە هەیە، بەڵام پێنج ئایەتی سەرەتا وا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێیان ئاخیر زەمان بێت، ئەو کاتەی ژیانی دنیای تێدا کۆتایی دێ و، لاپەڕەی ئەم گەردوونەی بەو شێوەیەی ئێستای تێدا دەپێچرێتەوەو، لە قۆناغی دیکەدا بە شێوەیەکی دیکە ساز دەکرێتەوە، وەك خوای کاربەجێ لە سوورەتی (إبراهیم)دا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ ۖ وَبَرَزُوا۟ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی زەوی جیا لەم زەوییە دەبێ، ئاسمانەکانیش جیا لەم ئاسمانانە دەبن و، هەموویان بۆ خوای تاکی ملپێکەچکەر دێنە گۆڕێ و ئاشکرا دەبن.

جا خوا ﷻ پێناسەی ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾مان بۆ دەکات، دوای ئەوەی کە زۆر بە مەزنی باسی دەکات، ﴿ٱلْقَارِعَةُ﴾، کوتەر، داچڵەکێنەر چییە؟ چی بە تۆی زانیوە کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ واتە: شتێکە کە وەسف دەوری نادات، هیچ کەسێك ناتوانێ پێی پێ ببات، جگە لە خوا ﷻ.

ئنجا هەندێك شت كە لەو ڕۆژەدا ڕوودەدەن بەوە پێناسەی داچڵەكێنەر ﴿ ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، دەكات، نەك بە خودی خۆی، چونكە خودی خۆی لە سەووری ئەوەیە مرۆڤ تێی بگات چۆنە؟ ئێمە لێرە لەم ژیانی سەر زەوی دا مەحكوومی ئەو یاسایانەین كە خوا بۆ ژیانی دنیا هەڵیخستوون، یاساكانی دیكەی كە لە قۆناغی بەرزەخدا جێ بەجێ دەبن،یان لە قۆناغی ڕۆژی دواییدا جێ بەجێ دەبن، لێیان تێناگەین وەك پێویست، بە گشتیی سەرەدەرێكیان لێ ردەكەین لەبەر ڕۆشنایی وەحیی خوای پەروەردگاردا، بەڵام ئەوەكە بە وردیی لێیان تێبگەین، ئەوە شتێكی مەحاڵە، چونكە ئەو حاڵ و بارودۆخانەی دێنە پێش چ لە قۆناغی بەرزەخ و، چ لە قۆناغی ڕۆژی دواییدا، سەدا سەد(١٠٠/١٠٠) لە هی ئێرە جیاوازن، بۆ وێنە: لێرە كات دەڕوات، بەڵام لەوێ كات ناڕوات، هەروەها خوا دەفەرموێ: نە زەوی وەك خۆی دەمێنێ، نە ئاسمانەكان وەك خۆی دەمێنن، بە جۆرێكی دیكە خوا ئەم بوونە هەڵدەخاتەوە و، گەردوونێكی دیكە، و عالەمێكی دیكە ساز دەكات، لەوێ دوو عالەمی جیاوازن: عالەمێك كە بەهەشتەو بڕوادارانی چاكەكار تێیدان و، عالەمێكی دیكە كە دۆزەخەو بێبڕوایانی خراپەكار تێیدان، هەروەها بڕوادارانی خراپەكار لەوێدا سزا دەدرێن، تاكو پاك دەبنەوەو سزای خۆیان وەردەگرن و دوایی دەربازیان دەبێ.

خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴾، كوتەرو داچڵەكێنەر سەرەتای ڕۆژێكە كە خەڵك تێیدا وەك پەپولەی پڕژو بڵاو دەبن، ئەمە قۆناغی ئاخیر زەمانە و خەڵك لە چۆن پەپوولە بە دەوی چراو ڕووناكیدا دەپڕژێن و تێكەوە داوێن، دێن و دەچن، بە بێ ئەوەی دیاربێ بۆ كوێ دەچن؟ هەروەها سەراسیمەو سەرگەردانن، لەو ڕۆژەشدا كە گەردوون تێكدەچێ، زەوی ئەو لەرزینەوەی كە بۆی دیاریكراوە دەلەرزێتەوەو دەهەژێ و، چیاكان، زەوی، پێك دادەرێن، ئەوەندە مرۆڤەی ئەوكاتی لەسەر زەوی دەبن وەك پەپوولەی پڕژو بڵاویان لێدێ.

﴿ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ﴾، چیایەكانیش وەك خوری پەڕەكراویان لێدێ، خوری ڕەنگاو ڕەنگ كە پەڕە دەكرێ و، دەشكنرێتەوە، خوریی پێشێ هەمووی پێكەوە نوساوە و چەسپاوە و ئەگەر بیانەوێ شتێكی لێ دروست بكەن دەبێ

شیبکەنەوە، کە بە کوردی شکنرانەوە و، پێ دەڵێن، شیکرانەوەشی هەر پێ دەگوترێ، دەبێ لە پەڕەی بکەن، بە عەرەبی پێی دەگوترێ: (ندف) شیی و ئەو ئامێرەی، ئەو ئامڕازەی خوری پێ شیدەکەنەوە، (منداف)ە، خورییەکە پێشێ دەبی شیبکرێتەوەو ئنجا دوایی ئەو خورییە بهۆنرێتەوەو ئەوەی کە دەویسترێ لێی دروست بکرێ، ئنجا چیاکان وەك خوریی شنکراوەو شیکراوەیان لێدێ، خوریەکی ڕەنگاو ڕەنگی شیکراوەو شنکراوە.

ئەم پێنج ئایەتە قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی کە ئاخیر زەمانە باس دەکەن.

ئنجا دێتە سەر باسی قۆناغی قیامەت و زیندووکرانەوەو سزاو پاداشت:

﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾، زۆرجاران گووتومانە: (**أمَّا**) وشەیەکە بۆ تەفصیلّ پێدان و ڕوونکردنەوەی شتێك، کە پێشتر بە کورتی باسکراوە، یان ئاماژەی پێدراوەو دواتر ڕووندەکرێتەوە، پیتی (ف)ی سەر (أفا)ش بۆ (تفریع)ە، یانی: ئەم ڕستەیە هەڵدەچنرێ لەسەر ڕستەکانی پێشێ هاتن، واتە: ئنجا هەر کەس تەرازووەکانی قورس بن، یاخود کێشراوەکانی قورس بن، (**مَوَازِين**) دەگونجێ کۆی (**مِيْزَان**) بێ، واتە: تەرازوو، یاخود کۆی (**مَوْزُون**) بێ، واتە: کێشراو، هەر کەسێك تەرازووەکانی قورس بن، یاخود کێشراوەکانی قورس بن، ﴿ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾، ئەوە لە ژیانێکی ڕازی دایە، لە ژیانێك دایە کە خۆی لێی ڕازییە، یاخود لە ژیانێك دایە ئەو ژیانە خاوەنەکەی خۆی ڕازیی دەکات، چونکە هەرچی پێویستی بێ و دڵی بیخوازێ، بەڵکو ئەوەی بە خەیاڵیشیدا نەهاتوە بۆ ئەو لەوێدا هەیە، کە مەبەست پێی ژیانی بەهەشتە.

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾، بەڵام کەسێك تەرازووەکانی سووك بن، یاخود کێشراوەکانی سووك بن، ﴿ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴾، دایکی وی دەبێتە (**هَاوِيَة**)، یاخود ئەو جێ و ماوایەی کە بۆی دەگەڕێتەوە، یان ئەو ئەصڵ و بنەڕەتەی کە بۆی دەچێتەوە، بریتیە لە (**هَاوِيَة**)، یاخود: بەسەر سەریدا دادەکەوێ و تەپڵەسەری دەکەوێتە نێو (**هَاوِيَة**)ەوە، (**هَاوِيَة**) بە دابڕاوەیی و کەلێنی نێوان دوو چیایان دەگوترێ، کە هەرکەسێك بکەوێتە خوارو بکەوێتە نێوی دەفەوتێ.

﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ﴾، چی بە تۆی زاناندوە (**هاویة**) چییە؟ های سەر (**مَاهِيَة**)، (ه)ی کۆتاییە و بۆ وەستانە و، زۆربەی زانایان چەسپاندوویانە، بەڵام هەندێکیان گوتویانە: ئەگەر نەوەستین، بەم شێوەیە: (**وَمَا أَدْرَاكَ مَاهِيَ نَارٌ حَامِيَة**)، (ه)کەیان دانەناوە.

﴿ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴾، ئاگرێکی گەرمە، جا بەدڵنیاییش هەموو ئاگرێك هەر گەرمە، بەڵام لێرە خوا ﷻ ئاگری دۆزەخ بە ئاگرێکی گەرم دەناسێنێ، واتە: گەرمییەکەی گەرمییەکی نائاساییە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە فەرموویەتی: {**أَنَّ نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تُوقِدُونَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنَّمَ**} (**أخرجه البخاري: ٣٠٩٢، ومسلم: ٢٨٤٣، والترمذي: ٢٥٨٩، وقال: حسن صحيح**)، ئەم ئاگرەی ئێوە دایدەگیرسێنن، بەشێکە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخ، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ هەر ئەم ئاگرەی ئێرەش بەس بوو بۆ سزادان، فەرمووی: ئەو ئاگرەی ئەوێ شەست و نۆ هێندەی بەسەر ئەم ئاگرەی دنیاوە هەیە، دەگونجێ مەبەست لەو حەفتایە بۆ دیارییکردن (تحریر) بێ، دەشگونجێ بۆ نیزیکخستنەوە بێ، ئەگەرنا خوا دەزانێ ڕەنگە ئاگری دۆزەخ هەزاران و ملیۆنان پلە لە ئاگری دونیا کە ئێمە بەکاری دەهێنین، گەرمتر بێ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی حەفتا (**سَبْعِينَ**)ی بەکارهێناوە بۆ زۆری و نیزیکخستنەوە لە عەقڵی ئێمەو.

بەڵام ئێستا کە زانست بەرەو پێشەوە چووە، دەزانین نێو جەرگەی زەویدا هەزاران پلە لە ئاگری دنیا گەرمترە و، نێو خۆریش ملیۆنان جار لە ئاگری دونیا گەرمترە، بەدڵنیایی خوا دۆزەخێك کە دەیرەخسێنێ بۆ سزادانی بێبڕوایان و تاوانباران، هەر لە دەسەڵاتی بێسنوری خۆیدایە، کە ئەوەندەی بیەوێ، گەرمی بکات، بۆیە لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴾، ئاگرێکی یەکجار گەرم و سووتێنەرە، دەبێ بەو شێوەیە لێی تێبگەین، کە خوا ﷻ دەیەوێ پێمان بفەرموێ: ئەو ئاگرەی دۆزەخ هێندە گەرمە، وەك ئاگری ئێستای دنیای ئێوە هەر هیچ گەرمیی تێدانەبێ!!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سوێند خواردنی خوا ﷻ بە کوتەری داچڵەکێنەرو، بە مەزن پێشاندانی و وەسفکردنی بە تێدا بڵاوبوونەوەی خەڵك وەك پەپوولە پرژ و بڵاوەکان و، وردوو خاش بوونی چیایەکان، وەك خوریی پەڕەکراوو شکنراوە.**

خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡقَارِعَةُ ۝١ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ۝٣ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ۝٤ وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ ۝٥﴾

### لە پێنج بڕگەدا ئەم مەسەلەی یەکەمە شی دەکەینەوە:

١)- ﴿ٱلۡقَارِعَةُ﴾، واتە: کوتەر، داچڵەکێنەر، پێشتریش گوتمان: **(القَارِعَةُ: وَصْفٌ مِنَ القَرْعِ، وَهُوَ ضَرْبُ الجِسْمِ بآخَرَ بشِدَّةٍ لَهَا صَوْتٌ)**، (قَرع): بریتیە لە پێدادانی شتێك بە شتێکی دیکەدا بە توونديی و، کە دەنگی لێ بێت، بەتایبەت ئەگەر شتێکی ڕەق بێت، یان دوو شتی ڕەق بن بەیەك بکەون.

بێگومان لێرەدا (قارِعَة) خوازراوەتەوە بۆ ڕووداوێکی مەزن، کە هاتنی ڕۆژی دواییە، بە تایبەت ئاخیر زەمان، قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، وشەی **(قارِعَة)** لە زمانی عەرەبییدا بەڵاو گرفتاریی گەورە، بەکاردێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿...وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبًا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ۝٣١﴾**الرعد**، واتە: ئەوانەی بێبڕوان بەردەوام بەڵایان بەسەر دێ، یاخود لە نیزیك ماڵەکانیان دەکەوێت، هەتا بەڵێنی خوا دێ، بەدڵنیایی خوا بەڵێنی خۆی دوا ناخات.

﴿ ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، لەڕووی ڕێزمانییەوە زانایان چەند ئەگەرێکیان بۆ داناون.

**یەکەم:** (قارِعَة) بۆ خۆی نیهادە (مبتدأ)ە، ﴿ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴾ کە لە ئایەتی دوایی دێ، دەبێتە گوزارە (خبر)ی.

**دووەم:** ﴿ ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، بۆخۆی سەربەخۆیە، خەبەرێکی قرتێنراوی لە دوایەوە بۆ دادەنرێ، وەك: (**القَارِعَةُ قَرِيبَةٌ**)، قاریعە نیزیکە.

**سێیەم:** (القارعة) کردارێکی قرتێنراوی لە پێشەوە بۆ مەزەندە دەکرێ، وەك (**أَتَتِ القَارِعَة، جاءت القَارِعَة**)، داچڵەکێنەر هات، بێگومان (**قارعة**) یەکێکە لەناوەکانی ڕۆژی دوایی، لەبەر ئەوەی ڕووداوێکە دەنگ و سەداو هاڕژنێکی زۆر گەورەی، قۆناغی ئاخیر زەمانە.

هەروەها عەرەب وشەی (**قارعة**)یان بەکارهێناوە بۆ بەڵاو گرفتاریی، بۆ وێنە: دەگوترێ: (**قَرَعَت القومَ قَارِعَةٌ**)، ئەو کۆمەڵە بەڵایەکی گەورەیان بەسەر هاتوە، هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان وایان داناوە (**القارعة**) لێرەدا مەبەست پێی قیامەتە، واتە: هاتنی قۆناغی دووەمی ڕۆژی دوایی، هەڵسانەوەو زیندووکرانەوە.

بەڵام من وای تێدەگەم مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، قۆناغی یەکەمی ڕۆژی دوایی، چونکە ئەو ڕووداوانەی دوایی باسیان دەکات لە کاتی ئاخیر زەماندا ڕوودەدەن.

**٢)**- ﴿ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، قاریعە چییە؟ ئەم شێوە پرسیار کردنە وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الحاقة**)شدا گوتمان: ﴿ ٱلۡحَآقَّةُ ۝١ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٢ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ۝٣ ﴾، بۆ زەبەلاح و مەزن و بێڕەزا پیشاندانی ئەوەیە کە باسی لێوە دەکرێ.

**٣)**- ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ ﴾، چی بە تۆی زانادوە کوتەرو داچڵەکێنەر چییە؟ لێرەدا (ما)ی بۆ پرسیارکردنە (**ما الإستفهامِيّة**)، بۆ بەگەورە و زەبەلاح پیشاندانی ئەو ڕووداوە، واتە: ئەگەر خوا پێت نەفەرموێ و پێت نەناسێنێ و نەزانێنێ، ناتوانی بیزانی.

**٤)**- ئنجا خوا خۆی وەسف و پێناسەی دەکات: ﴿ يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ ﴾، ئەو ڕۆژەیە کە خەڵك وەك پەپوولە پرژو بڵاوەکان دەبن، (**فَرَاش**)کۆی

(فَراشَة)یە و، ئەو زیندەوەرەیە کە بەکوردیی پێی دەڵێین: پەپوولە و بەباڵان دەفڕێ، لە (**المعجم الوسيط**:[١])دا ئاوا پێناسەی (**فَرَاش**) دەکاتن، دەڵێ: (**الفراش: جنس حشراتٍ من الفصيلة الفراشية من رتبة حرشفيات الأجنحة تتهافت حول السراج فتحترق واحدته فراشة، ومنه المثل أَطْيَشُ مِنْ فَرَاشَة**)، واتە: (**فَرَاش**) جۆرێکە لە زیندەوەرەکان، لە فەسیلەی (**الفَراشِيَة**)، جۆری پەپوولەیی، لە ڕیزی باڵ پوولەکەدارەکان (**حَرشَف**) بە (**حَراشِف**) کۆدەکرێتەوە، (**حَرشَف**) دەڵێ: (**فُلُسُ السَّمَك**)، پوولەکەی باڵی پەپوولەش پوولەکەی پێوەن و، دەستی بگەیەنێ پوولەکەکانی لێدەبنەوە، لە دەوری چرا دێت و دەچێ دەسووتێ، تاکی (**فَرَاش**)یش (**فَراشة**)یەو، ئەو پەندە عەرەبییەش لە پەپوولەوە هێناویانە: (**أَطيَشُ مِنْ فَرَاشَة**)، فلان کەس لە پەپوولە سەرکێشترە (نەفامترە)، هەر خۆی پێدادەدات، وەك چۆن پەپوولە خۆ بە ئاگر دادەدات و دەسووتێ.

﴿ ٱلْمَبْثُوثِ ﴾، (**المَبثوثُ: المُتفَرِّقُ عَلَى وَجهِ الأَرض**)، بڵاو بۆوە بەڕووی زەوییدا.

٥)- ﴿ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴾، چیایەکانیش وەك خوریی پەڕەکراویان لێدێ، یان وەك خوریی شکنراوەیان لێدێ، خوری کاتێك شی دەکرێتەوەو هەڵدەوەشێنرێتەوە، (**العِهْنُ: الصُّوفُ، الصُوفُ: ذُو الألوان**)، (**عِهن**) یانی: خوریی ڕەنگاو ڕەنگ.

هەندێکیش گوتوویانە: بە خوری کە ڕەنگەکەی سوور بێ، (**المَنفُوشُ: المُفَرَّقُ بَعْدَ أَجزائِهِ عَن بَعضٍ يُغزَلُ أَو تُغشَى بِهِ العَشَايَة**)، (**مَنفُوش**) واتە: بەشەکانی لێك جیاکرابنەوە، لە پەڕە کرابێ، شی کرابێتەوە، وەك ئەوەی کە بڕێسرێ، یان بەوەی کە شتێکی دیکەی بخرێتە نێو، یان بخرێتە نێو شتێکەوە، سەرینێك، دۆشەکەڵەیەك.

جا ڕووی وێچواندن لە نێوانی چیایەکان و خوری پەڕەکراودا بریتیە: لە پارچە پارچە بوون، چونکە چیایەکانیش بەهۆی بوومە لەرزەکان و وێنەی ئەوانەوە کە لە ئاخیر زەماندا دەقەومن، دەهاڕدرێن، دەبنە تۆزو گەردو پارچەکانیان لێك جیادەبنەوە.

---

(١) ص ٦٨١

(**ابن عاشور**) لە تەفسیرکەی خۆیدا (**التحرير والتنوير**) بەرگی (١٢) جوزئی (٣٠) لاپەڕە (٥١٢)دا، دەڵێ: لە زەبەلاح پیشاندانی ئەو کوتەری داچڵکێنەر دەڵێ:

(**تَهْوِيلٌ شَدِيدٌ بِثَمَانِيَةِ طُرُقٍ: وَهِيَ الِابْتِدَاءُ بِاسْمِ الْقَارِعَةِ، الْمُؤْذِنِ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَالِاسْتِفْهَامُ الْمُسْتَعْمَلُ فِي التَّهْوِيلِ، وَالْإِظْهَارُ فِي مَقَامِ الْإِضْمَارِ أَوَّلَ مَرَّةٍ، والاستفهام عَمَّا ينبىء بِكُنْهِ الْقَارِعَةِ، وَتَوْجِيهُ الْخِطَابِ إِلَى غَيْرِ مُعَيَّنٍ، وَالْإِظْهَارُ فِي مَقَامِ الْإِضْمَارِ ثَانِيَ مَرَّةٍ، وَالتَّوْقِيتُ بِزَمَانٍ مَجْهُولٍ حُصُولِهِ وَتَعْرِيفُ ذَلِكَ الْوَقْتِ بِأَحْوَالٍ مَهُولَةٍ**)، زەبەلاح پێشاندان و مەزن پێشاندانە بە هەشت ڕێگا لەڕووی ڕەوانبێژییەوە، هەشت ڕێگاکان ئاوا دەژمێرێ دەڵێ:

**یەك:** ئەوەیە کە یەکسەر دەست پێدەکات دەفەرموێ: (**القَارِعَة**)، دەستپێکردن بە ناوی (**القَارِعَة**)، واتە: ئەمە گەیێنەری کارێکی مەزنە.

**دوو:** پرسیارکردنی بەکارهێنراو لە بە زەبەلاح و مەزن پێشاندندا.

**سێ:** لە جیاتی بفەرموێ: (**القارِعَةُ ما هِيَ**)، دەفەرموێ: ﴿ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴾، ئەمە دەرخستنە لە شوێنی پەنهانکردن بۆ جاری یەکەم، کە ئەمیش دیسان زەبەلاح پێشاندانی ئەو بابەتەیە.

**چوار:** پرسیارکردن لە شتێك کە هەواڵبدات لەبارەی چیەتی (**قارِعَ**)ەوە، ﴿ ٱلْقَارِعَةُ ۝١ مَا ٱلْقَارِعَةُ ۝٢ ﴾، (**قارِعَة**)، (**قارِعَة**) چییە؟ پرسیارکردنە لەبارەی ئەوە کە هەواڵدانە لەبارەی چیەتی (**قارِعَ**)ەوە.

**پێنج:** ئەمە ڕوو پێکردنی دواندنە بۆ کەسێکی دیاری نەکراو، ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ ﴾، ئەی هەر کەسێ کە دەگونجێ بدوێنرێی! تۆ چی بەتۆی زاناندووە ئەو کوتەرو داچڵەکێنەرە چییە؟

**شەش:** دەرخستن لە شوێنی شاردنەوەدا بۆ جاری دووەم، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴾، لەجیاتی بفەرموێ: (**وما أدراكَ ما هِيَ**)، فەرموویەتی: دیسان ناوی قاریعەی دەرخستووە لەجیاتی ئەوەی بە ڕاناو و بەشێردراوەیی بیهێنێ.

**حەوت:** بەستنەوەی بە کاتێکەوە کە نازانێ کەی پەیدادەبێ، ﴿ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ ﴾، ﴿ يَوْمَ ﴾، ڕۆژێك، بەڵام نازانین ئەو ڕۆژە کەنگییە، ئەو ڕۆژەیە کە خەڵك تێیدا وەك پەپوولەی پرژو بڵاو دەبن، چیایەکانیش وەك خوری شکندراوە دەبن.

هەشت: ناساندنی ئەو کاتە بە هەندێك حاڵی زۆر سامناك، کە خەڵك دەبنە پەپوولەی پرژو بڵاو، بڵاویان لێ دێ وە چیاکان، وەك: خوری شیکراوەو شکنراوەیان لێ دێ.

(محی الدین درویش)یش لە تەفسیرەکەی خۆی (**إعراب القرآن**)[1]، ئەویش چواندنی خەڵك بە پەپوولان، چواندنی چیایەکان بە خوری پەڕەکراو، دەڵێ:

**أ-** چواندنی خەڵك بە پەپوولان: لە شەش ڕووەوە خەڵك ، لە ڕۆژی دوایی و لە قۆناغی ئاخیر زەماندا، لەگەڵ ئەو پەپوولانەی پرژو بڵاو دەبنەوە وێك دەچن.

**یەك:** (**الطَّيشُ الَّذي لَحِقَهُم**)، ئەو سەراسیمەییەی سەراسیمە بوون، (کە بە پرتاو ڕاکردن و ڕۆیشتنە).

**دوو:** (**إنتِشَارُهُم فِي الأَرض**)، بڵاو بوونەوەیان بە زەویدا، وەك چۆن پەپوولەکان بڵاو دەبنەوە، خەڵکیش بڵاو دەبێتەوە.

**سێ:** (**رُكُوبُ بَعْضِهِم بَعْضَاً**)، هەندێکیان کەوتنە نێو هەندێکیان، وەك چۆن پەپوولەش دەکەونە نێو یەکدیی و بێ ئەوەی دیاربێ بۆ کوێ دەچن!

**چوار:** (**الكَثْرَةُ الَّتي لا غَنَاءَ فِيهَا**)، زۆرییەك کە سوود ناگەیەنێ، زۆری پرژو بڵاو، سوود ناگەیەنێ.

**پێنج:** (**الضَّعْفُ وَالتَّذَلُّلُ وَإِجابَةُ الدَّاعِي مِنْ كُلِّ جِهَة**)، بێهێزیی و زەبوونیی و وەڵامدانەوەی کەسێك کە بانگ دەکات، لە هەر لایەکەوە بانگ بکات.

---

(١) ج ١ص٥٦٥

**شەش:** (**التَّطايرُ، الإحتِراق مِنْ حَيْثُ لا تُريدُ الإحتِرَاق**)، فڕین بۆ ئەوەی سەرەنجام بسووتێ بێ ئەوەی بیەوێ بسووتێ، خەڵك لەو ڕۆژەدا لەو شەش ڕووەوە لەگەڵ ئەو پەپوولانە وێکدەچن.

**ب-** چوواندنی چیایەکان بە خوریی شکنراو:

چیایەکانیش بە خوریی شکنراوە دەچن لە سێ ڕووەوە:

**یەك:** (**تَفَتُّتُهَا وَانهِيارُهَا**)، هەڵوەشان و ڕووخانی چیایەکان.

**دوو:** (**سَيْرُورَتُهَا كَالْعِهْنِ**)، وەك خوریی لێهاتنیان.

**سێ:** (**ثُمَّ صيرَتُهَا هَباء**)، دواییش وەك تۆزو گەردی پڕژو بلاو لێهاتنیان.

**مەسەلەی دووەم:**

**سەرەنجامی تەرازوو قورسان، ژیانی پڕ ڕەزامەندیی بەهەشتەو، سەرەنجامی تەرازوو سووکانیش (هاویە)یە، ئەویش ئاگرێکی یەکجار گەرمە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾ ﴾

## ئەم چەند ئایەتە لە شەش بڕگەدا شیدەکەینەوە:

١)- ﴿ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴾، پیتی (ف) لێرەدا بۆ لق لێکردنەوە (**تَفرِيع**)ە، واتە: ئەمە بنیات دەنرێ لەسەر ئەوەی کە لە ڕابردوودا باسکرا و لقێکە لێی دەبێتەوە، لە ئەنجامی ئەوەدا کە باسکرا، ئنجا هەر کەسێك تەرازووەکانی گران بوون، (**مَوازِين**) کۆی (**مِيزان**)ە، واتە: تەرازوو، یاخود کۆی (**مَوزُون**)ە، واتە: کێشراو.

کە دەفەرموێ: هەر کەس تەرازووەکانی، یاخود کێشراوەکانی گران بوون، واتە: کردەوەکانی کە دەکێشرێن، یان تەرازووەکانی کە کردوەکانی ئەویان دەخرێتە نێو، پەسند بن لای خوای پەروەردگار، چونکە ئەو شتانەی ئارەزوو بۆ کراون، دەویسترێ کە هەڵبگیرێن، ئەوانەن کە دەکێشرێن، کەسێك دەچێ زێر دەکڕێ، زیو دەکڕێ، شتێکی دیکە دەکڕێ، شتێکی بە نرخ، دەکڕێ، ئەوەیە کە دەیکێشێ، ئنجا کەسێك تەرازووەکانی کە کردەوەکانی ئەویان پێ هەڵدەسێنگێدرێن یاخود خودی کێشراوەکانی کە کردەوەکانن، قورس بن.

٢)- ﴿ فَهُوَ فِى عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴾، ئەوە لە ژیانێکی ڕازیی دایە، دیارە (راضية) لە ئەصڵدا ئەمە لێرەدا (فاعل)ە، بەڵام بە مانای بەرکار (مفعول)ە، یانی: (**فِي عَيْشَةٍ مَرضِيَّة**)، لە ژیانێکدا کە خاوەنی ئەو ژیانەی دەیچێتێ، لێی ڕازییە، واتە: ژیانێکی پەسندکراوە، ژیانێکی لێ ڕازی بوویە، وەك (لابن) و (تامر) لە زمانی عەرەبییدا (**لابن**)، واتە: ئاژەڵێکی شیردەر و، (**تامِر**)، واتە: کەسێك کە خورمای هەیە، لێرەشدا (**راضِية**) واتە:

١- شوێنێك كە جێی ڕەزامەندییە.

٢- واتایەكی دیكەی ئەوەیە: (رَاضِيَة: فاعِلَةٌ لِرِّضَا وَالإنقِياده لأَهلِها)، ژیانێكی ڕازیی واتە: ژیانێك كە بكەری ڕازی بوون نەرمی و گونجان، جێبەجێ كەری داواكارییەكانی ئەو كەسەیە كە دەچێتە نێو ئەو جۆرە ژیانەوە.

وشەی (عِيشَةٍ )ش ناوی چاوگە و لە (عَيش)ەوە هاتوە، وەك (خِيفَة) ناوی چاوگە بۆ (خَوف) واتە: ترس، (عيشة)س واتە: ژیان و گوزەران (أَي: فـي حَياةٍ راضِيَةٍ صاحِبُها يَرضاها)، ژیانێكی ڕازیی، واتە: خاوەنەكەی لێی ڕازیە (فَوَصِفَت بالرِضَى لأَنَّها سَبَبُ الرِّضَى أو زَمانُ الرِّضَى)، ژیانەكە بە ڕەزامەندیی وەسف كراوە، چونكە هۆی لێ ڕازی بوونی خاوەنەكەیەتی،، یاخود كاتی لێ ڕازی بوونی خاوەنەكەیەتی.

٣- هەندێكی دیكەش گوتوویانە: ﴿فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ﴾، (أَي فى عِيشَةٍ ذَاتِ رِضَى)، ژیانێك كە خاوەنی ڕازیبوونە، ژیانێك كە ڕەزامەندی تێدایە، كەسێك بچێتە ئەوێ پەسندی دەكاو لێی ڕازی دەبێ.

٣)- ﴿وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ﴾، بەڵام هەر كەسێك تەرازووەكانی سووك بن، یاخود كێشراوەكانی سووك بن.

٤)- ﴿فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ﴾، دایكی وی هاویەیە، وشەی (أُم) بۆچی لێرەدا هاتوە؟ واتە:
١- وەك چۆن منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ لای دایكی ئەو كەسەش كە كردەوەكانی سووك بن تەرازووی كردەوەباشەكانی یاخود كێشراوەكانی سووك بن، ئەو شوێنەی بۆلای دەچێتەوە، وەك چۆن منداڵ بۆ لای دایكی دەچێتەوە، ئەو شوێن و دایكەی بۆ لای دەچێتەوە، بریتیە لە هاویە.

٢- یاخود (أُم) لێرەدا بەمانای ئەصڵ و بنەڕەت دێت، ئەو ئەصل و بنەڕەتە بۆی دەچێتەوە بریتیە لە هاویە، ئەو شوێنەی دەبێتە بنەڕەت و ئەصڵ و شوێنی بۆ لا گەڕاوەی نشینگەی تێدا نیشتەجێ بوونی، هاویەیە.

**٣-** هەندێکیش گوتوویانە: (**أُمُّهُ**)، یانی: ئەو جێگەو مەئوایەی پەنای پێ، دەبات وەك چۆن منداڵ پەنا بە دایکی دەبات.

**٤-** هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ﴿ فَأُمُّهُۥ ﴾، (**أُم**) بەمانای تەپڵە سەر ، (**أُمُّ الرَّأس**)ە، واتە: ئەو دەکەوێتە هاویەوە، تەپڵە سەری بەردەبێتەوە چاڵی دۆزەخ.

بەڵام مانای یەکەمیان پەسندترە، کە ئەو جێگەو بنەچەو نشینگەیەی بۆلای دەگەڕێتەوە بریتیە لە هاویە.

**٥)-** ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ﴾، چی بەتۆی زانادوە ئەو (هاویة) چییە؟

**٦)-** ﴿ نَارٌ حَامِيَةُۢ ﴾، ئاگرێکی گەرمە، (**هاویة**): لەبنەڕەتی زمان دا: ئەو شوێنە نزمەیە کە لەنێوان دوو چیایان دوو گردۆلکاندایە، شوێنێکی قووڵی دابڕاوایی کە ئەگەر مرۆڤ یان ئاژەڵ لێی بکەوێتە خوارێ، لە بەین بچێ، هەر لەوەوەش ئەو تەعبیرەیان هێناوە: (**سَقَطَ فِي الهَاوِيَة**)، فلآنکەس کەوتە نێو چاڵەوە، چاڵی مەرگەوە (فەوتا).

لێرە خوا کە دەفەرموێ: ﴿ نَارٌ حَامِيَةُۢ ﴾، ئاگرێکی گەرمە، (**أي: نارٌ حارَةٌ غايَةُ الحَرارَة، كأنَّ نار الأُخرى ليست حارة بالنسبة إليهم**)، واتە: ئاگرێکی یەکجار گەرمە، ئەوپەڕی گەرم، وەك ئاگری دیکە کە ئەصڵەن هەر گەرمایی تێدا نەبێ، ئەمە وەك ئەو تەعبیرەی سووڕەتی (**الهمزة**) وایە کە دەفەرموێ: ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ﴾، واتە: ئاگری داگیرسێنراوی خوایە.

لە کۆتایی تەفسیری ئەم سووڕەتە موبارەکەدا چەن دەقێکی سوننەت لەبارەی چەمك و واتای ئەم سووڕەتەوە تیشکی زیاترمان بۆ دەخەنە سەر چەمك و واتای ئایەتە بەپێزەکانی:

### فەرمایشتی یەکەم:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**مَثَلِي وَمَثَلُكُمْ كَمَثَلِ رَجُلٍ أَوْقَدَ نَارًا، فَجَعَلَ الْجَنَادِبُ وَالْفَرَاشُ يَقَعْنَ فِيهَا، وَهُوَ يَذُبُّهُنَّ عَنْهَا، وَأَنَا آخِذٌ بِحُجَزِكُمْ عَنِ النَّارِ، وَأَنْتُمْ تَفَلَّتُونَ مِنْ يَدِي**} (**أخرجه مسلم: ٦٠٢٢**).

واتە: وێنەی من و وێنەی ئێوە وەك وێنەی پیاوێکە ئاگرێکی کردۆتەوە، جا سیسرکەو پەپوولە دەکەونە نێوی، ئەویش دەریان دەکات بۆ ئەوەی نەکەونە نێو ئاگرەکەو نەسووتێن، منیش پشتێنی ئێوە دەگرم کە نەچنە نێو ئاگر، بەڵام ئێوە لە دەستم بەر دەبن و خۆ دەخەنە نێو ئاگرەکە.

## فەرمایشتی دووەم:

پێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەرموویەتی: {**نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا، مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ، قَالُوا: وَاللهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً، يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ: فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا، كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا**} **(أخرجه أحمد: ١٠٢٠٤، والبخاري: ٣٠٩٢، ومسلم: ٢٨٤٣، والترمذي: ٢٥٨٩، وقال: حسن صحيح).**

واتە: ئاگرەکەتان ئەم ئاگرەتان کە ڕۆڵەی ئادەم هەڵیدەکات بەشێکە لە حەفتا بەش لە گەرمیی دۆزەخ، گوتیان: (هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ)، سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا، هەر ئەم ئاگرەی دنیاش بەس بوو، (بۆ سزادان)، فەرمووی: ئاگری دۆزەخ بە (٦٩) بەش بەسەر ئاگری دنیادا زیاد کراوە، هەرکام لەو بەئەندازەی گەرمیی ئاگری دنیایە.

کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿نَارٌ حَامِيَةٌۢ﴾، ئەم فەرمایشتە چەمك و واتاکەیمان بۆ نیزیك دەخاتەوە، کە ئەویش مەرج نیە بەسەرپێی حەفتای دیارییکراو بێ، دەگونجێ حەفتا لێرەدا بۆ زۆریی بێ، ئەگەرنا دەگونجێ زیاتر بێ و دەگونجێ کەمتر بێ، کە ئێستا لە نێو خۆردا، پلەی گەرمی ملیۆنان پلەیە، ملیۆنان پلەی سەنتیگراتە، ئنجا ئەگەر دۆزەخ شوێنێکی ئاوابێت، ئەوکاتە مانای وایە کار لە حەفتا پلەو حەفتا هێندەو شتی وادا نامێنێ.

## فەرمایشتی سێیەم:

{ «**إِنَّ نَفْسَ الْمُؤْمِنِ إِذَا قُبِضَتْ تَلَقَّاهَا أَهْلُ الرَّحْمَةِ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ، كَمَا تَلَقَّوْنَ الْبَشِيرَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا، فَيَقُولُونَ: أَنْظِرُوا صَاحِبَكُمْ يَسْتَرِيحُ، فَإِنَّهُ فِي كَرْبٍ شَدِيدٍ، ثُمَّ يَسْأَلُونَهُ: مَا فَعَلَ فُلَانٌ، وَفُلَانَةٌ هَلْ تَزَوَّجَتْ؟ فَإِذَا سَأَلُوهُ عَنِ الرَّجُلِ قَدْ مَاتَ قَبْلَهُ، فَيَقُولُ: أَيْهَاتَ، قَدْ مَاتَ ذَاكَ قَبْلِي.**

فَيَقُولُونَ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، ذُهِبَ بِهِ إِلَى أُمِّهِ الْهَاوِيَةِ، بِئْسَتِ الْأُمُّ، وَبِئْسَتِ الْمُرَبِّيَةُ»} (أخرجه الحاكم: ٣٩٦٨، وقال: مرسل صحيح الإسناد، أخرجه الطبراني في الكبير: ٣٨٨٧، وفي الأوسط: ١٤٨، قال الهيثمي (٣٢٧/٢): فيه مسلمة بن على وهو ضعيف).

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ڕووحی بڕوادار کە دەکێشرێ ئەو بەندانەی خوا کە خاوەنی بەزەیین وەك چۆن ئێوە لەدنیادا پێشوازی موژدەدەر دەکەن، دەڵێن: چاوەڕێ بکە با پشووبدات چونکە لەخەم و گرفتارییەکانی سەخت دابووە، ئنجا لێی دەپرسن: فلان پیاوە چی کرد؟ فلاَن ئافرەتە مێردی کرد؟ ئنجا لەبارەی پیاوێکەوە دەپرسن کە لە پێش ئەودا مردوە، ئەویش دەڵێ: هەیهوو لە پێش مندا مردووە، ئایا بەلاتاندا تێنەپەڕی؟ نەهات بۆ بەهەشت؟ (یان لە عالەمی بەرزەخدا؟ ئەو شوێنە خۆشەی کە لێینی بەهەشتە، یاخود شوێنێکە وەك بەهەشت، یان بەهەشتێکی ڕاگوزەرە)، دەڵێن: (**إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيهِ الرَّاجِعون**)، (ئەمە بۆ کاتی بەلآ دەگوترێ) هی خواین و ئێمە هەر بۆ لای ئەو گەڕاوەین، دیارە براوە بۆ لای دایکەکەی کە هاویەیە، خراپترین دایکەو خراپترین بەخێوکەرە.

## دەقی چوارەم:

لە ئەبوو بەکری صیددیقەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەمە گێڕدراوەتەوە:

**(وَرُوِيَ عَنْ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: إِنَّمَا ثَقُلَ مِيْزَانُ مَنْ ثَقُلَ مِيْزَانُهُ ، لأَنَّهُ وُضِعَ فِيهِ الحَقُّ، وَحُقَّ لِمِيزَانٍ يَكُونُ فِيهِ الحَقُّ أَنْ يَكُونَ ثَقِيْلاً، وَإِنَّمَا خَفَّ مِيزْانُ مَنْ خفَّ مِيْزَانُهُ، لأَنَّهُ وُضِعَ فِيهِ البَاطِلُ، وَحُقَّ لِمِيزَانٍ يَكُونُ فِيهِ البَاطِلُ أَنْ يَكُونَ خَفِيْفَاً) (الجامع لأحكام القرآن: ج٢٠، ص١٣١).**

واتە: بە دڵنیایی تا تەرازووی ئەو کەسەی تەرازووەکەی قورس بووە، بۆیە قورس بووە، چونکە هەقی خراوەتە نێو و، تەرازوویەك هەقی تێدابێت شایستەیە دابکەوێ و، قورس بێ، بێگومان تەرازووی کەسێك کە تەرازووەکەی سووك بووە، بۆیە سووك بووە، چونکە ناهەقی تێدایە، تەرازوویەك کە ناهەقی تێدابێت شایستەی ئەوەیە سووك بێ و، هەڵبچێ بەرەو سەر.

## دەقی پێنجەم:

ئەم شوێنەوارەش لە موقاتیل (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) گێڕدراوەتەوە:

(**إِنَّمَا كَانَ كَذَلِكَ، لأَنَّ الحَقّ ثَقِيلٌ والبَاطِل خَفِيْف**) (**التفسير الكبير: ج١٦، ص٧٥**)، واتە: بۆیە بەو شێوەیە (هەندێکیان تەرازووەکەیان قورسە و هەندێکیان تەرازووەکەیان سووکە) چونکە هەق قورسە، ناهەق سووکە، ئەوانەی تەرازووەکەیان قورسە شوێنکەوتووی هەق بوون، هەڵگری هەق بوون، ئەوانەی دیکەش شوێنکەوتنی بەتاك پووچ بوون.

لەبارەی تەرازوو و کێشرانی کردەوانەوە ڕاجیایی زانایان لەوبارەوە زۆرە، بەڵام ئێمە تەفسیری سووڕەتی (**الأعراف**)دا، کورتە باسێکمان لەوبارەوە کردوە، لێرەشدا ئەوەی لە وەك خوڵاصەو پوختەی مەبەست بیهێنین ئەوەیە:

خوا ﷻ بە پێی عەقڵی ئێمە دەماندوێنێ، ئەگەرنا مەعقووڵ نیە خوا ﷻ شێوەی شتێکی دیاریی نەکردبێ و، ئێمە لە خۆمانەوە دیاری بکەین، مەبەستم ئەوەیە کە دوایی دەیهێنم، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: تەرازوویێك کە خوا شتی پێ هەڵدەسەنگێنێ، دوو تا تەرازووی هەن و، زمانێکی هەیە، (ئەوەی دەسکەکەی پێ دەگیرێ) ئەگەر ئاسمانەکانی تێ بهاویشترێن جێیان دەبێتەوە لەو تەرازووەدا!!

لەڕاستییدا ئائەو وێنا کردنە بە عەقڵ و مەزندەی خۆمانە، بۆ شتێك کە خوا ﷻ وێنای نەکردوە، تەنیا خوا باسی تەرزاوو (میزان) و کێشراو (**مَوزون**)ی، کردوە، بۆیە شتێکی بێ جێیە، ئێمە بێنین بەپێی کلتورو باوی خۆمان بەپێی ئەو ئامڕازی کێشرانەی لە ڕۆژگاری ئێمەدا هەیە، بێنین ئەوەی کە خوا باسی کردووە وێنای بکەین، بەوە بێگومان ستەم دەکەین لە ئایەتەکانی قورئان، چونکە کاتی خۆی تەرازوو دوو لای هەبوون و دەسکەکەیان یان زمانەکەیان گرتوە، ئنجا شتیان پێ کێشاوە، شتێك کە ویستوویانە بیکێشن، لە تایەکیان دا دایاننـاوە، لە تایەکەی دیکەیان قورسایی بووە، کیلۆ بووە چوار کیلۆ بووە چەند بووە، دایان ناوە، بەڵام ئێستا چەندان جۆرە تەرازوو هەن و تەرازوو هەر پێویست ناکات دوو تای هەبن، شتێك مەبەست بێ بیکێشێ، دەیخەیە سەر

ئامێرەکەو دەیکێشێ و بە ژمارە پێت دەڵێ، ئێستا تەرازووی زۆر وورد هەیە، پاشان تەنیا تەرازووی کێشرانی شت نیە ئێستا، تەرازووی پێوانی گەرمی هەیە، هی پێوانی هەوا هەیە، تەرازووی لێدانی دڵی مرۆڤ هەیە، هی سووری خوێن و گوشاری خوێن هەیە، ئێستا مرۆڤ چەندان جۆرە تەرازووی دروست کردوون، وردەکارییەکانی قیامەتیش، ئەو ئامرازی ئامێرانەی خوا ﷻ لە قیامەتدا بەکاریان دێنێ، بەس خوا بۆخۆی دەیزانێ، شتێك کە باس کرابێ ئێمە پابەند دەبین بە دەقەوە بەڵام شتێك باس نەکرابێ، شتێکی خراپە ئێمە لەخۆمانەوە وێنەی بۆ دابتاشین بەپێی کلتوورو فەرهەنگ و ئەو ئامێرو ئامرازانەی کە لە ڕۆژگاری ئێمەدا هەن، کە دوایی کە ڕۆژگارەکە بەرەو پێشەوە چوو، شتی پەرەسەندو و ترو گەشەسەندو ترو چاکتر پەیدابوو، کەسێك وایدابنێ خوا هەر بە ئامرازە کۆنەکە، شت هەڵدەسەنگێنێ!

بۆیە لێرەدا قسەیەکی (**محمد عبده**) ڕەحمەتی خوای لێبێ، پێم جوانە کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی دەڵێ:[١]

**(وَمِنَ العَجِيبِ مَا قَالَهُ بعض المفسرين أَنَّهُ ميزانٌ بلسانٍ وَكَفَّتَيْنِ كأطباق السموات والأرض ولا يَعْلَمُ مَاهِيَتَهُ إلاَّ الله، فَمَاذَا بَقِيَ من مَاهِيَتِهِ بَعْدَ لِسَانِهِ وَكَفَتَيهِ حَتَّى يُفَوِّضُ العِلْمُ فِيهِ إلى الله).**

واتە: لە قسەی سەرسووڕهێنەری هەندێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان ئەوەیە: گوتوویانە: ئەو تەرازووە تەرازوویەکە زمانەیەکی هەیە، دوو تای تەرازووی هەن، کە دوو تا تەرازووەکانی بەقەدەر چینەکانی ئاسمان و زەوین، بەڵام چییەتی ئەو تەرازووە تەنیا خوا دەیزانێ، دەڵێ: ئنجا چی ماوەتەوە لە چییەتەکەی دوای ئەوەی کە گوترا: زمانەی هەیەو دوو تای هەن، تاکو زانیارییەکەی حەواڵەی خوا بکرێ!!

بەڵام گرنگ ئەوەیە ئێمە بزانین کە خوا ﷻ دادگەریی بە تەواویی دەچەسپێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ

---

(١) الآعمال الكاملة ج٥ ص٤٩٢

﴿مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧﴾ الأنبياء، واتە: تەرازووەكانی دادگەریی دادەنێین، هیچ كەس ستەمی لێ ناكرێ، ئەگەر بە قەدەر قورسایی دەنكە خەرتەلەیەكیش بێ دەیهێنین، ئێمە بەسین بۆ ژماردن.

هەروەها پێویستە بزانین مەرج نیە تەنیا كردەوە بكێشرێن، بەڵكو مرۆڤەكان خۆشیان دەكێشرێن، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەرەوە ﷺ دیارە:

**دەقی شەشەم:**

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: إِنَّهُ لَيَأْتِي الرَّجُلُ العَظِيمُ السَّمِينُ يَوْمَ القِيَامَةِ، لاَ يَزِنُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ، وَقَالَ: اقْرَءُوا: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥﴾ الكهف} (أخرجه البخاري: ٤٧٢٩، ومسلم: ٢٧٨٥)**،

واتە: ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پیاوی مەزنی قەڵەو لەڕۆژی قیامەتدا دەهێنرێ، بەڵام لەلای خوا بە ئەندازەی باڵە مێشوولەیەك سەنگی نیە، گوتی: بخوێننەوە: ﴿فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ١٠٥﴾ **الكهف**.

كەواتە: مرۆڤەكانیش دەكێشرێن، هەر خوا دەزانێ ئەو كێشانە، ئەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنەی خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی دا ئەنجامی دەدات ئامرازەكانی و چۆنیەتیدەكەی تەنیا خوا بۆخۆی دەزانێ، جگە لەوەی كە خوا باسی كردوە و پێغەمبەرش ﷺ ئەگەر شتێكی باس كردبێ، بە سەنەدێكی صەحیح بچێتەوە سەری، ئەگەرنا ئەویدیكە كە زانایان بە بۆچوونی خۆیان هەندێك شتیان گوتوە، ئەوە بەس بۆچوونی خۆیانە و ناگونجێ لەسەر ئیسلام وە لەسەر قورئان حیساب بكرێ.

لێرەشدا دێینە كۆتایی سوورەتی **(القارعة)**.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ (٢٢)ی (**ذي الحجـة**)ی سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچیـی، بەرانبـەر (١٢/ ٨/ ٢٠٢٠) زاینییـە، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (**التكاثـر**) و، سـەرەتاش لـە حـەوت برگـەدا پێناسـەو نێـوەڕۆکی بـە کورتیـی دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (التكاثر) و بابەتەكانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر بـە: (**سـورةُ التَّكاثُـر**) نـاسراوە، بـەڵام هـەرکام لـە نـاوەکانی: سـوورەتی (**أَلْهاكُـم**)و، سـوورەتی (**مَقْبَرَة**)شـی بـۆ بەکارهێـنراون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە بـەلای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایانـەوە، سـوورەتێکی مەککەییـە، هەندێکیشـیان بـە مەدینەییـان دانـاوە، بەهـۆی ئـەوەوە کـە گوایـە: دوو هـۆزی پشـتیوانان، شـانازیی زۆریـان بەسـەر یەکدیـدا کـردوە، وەك (**إبـن أبي حاتـم**) گێڕاویەتـەوەو (**الشَّـوكاني**) لـە (**الفَتْـح القَدير**)ەکـەی خـۆی دا[1] هێناویەتـی:

گوایـە: دوو هـۆز لـە پشـتیوانان شـانازییان بـە سـەریەکدیدا کـردوەو، پێشـبڕکێیان کـردوە، کامیـان ژمارەیـان زیاتـرە؟ سـەرەتا زیندووەکانیـان ژمـاردوون، یەکێکیـان زیاتـر

---

(١) بەرگی (٥)، لاپەڕە (٦٠٧)دا.

بـووە، دوایـی ئەوەیـان کـە تێشـکاوە لـە ژمـارەی زیندووانـدا، گوتوویەتـی: بـا بچیـن مردووانیـش بژمێریـن، ئیـدی چوونەتـە سـەر گۆڕسـتان و مردووەکانیشـیان ژمـاردوون، ئەوجـار ئـەوەی لـە ژمـارەی زینـدووان دا تێشـکاوە، ژمـارەی مردووانیـان زیاتـر بـووە!.

بـەڵام لـە حاڵەتـی ڕاسـتبوونی سـەنەدی ئـەم گێڕدراوەیەشـدا، بـە بەڵگـەی مەدینەیـی بـوونی ناشێ و، مەککەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە زۆر ئاشـکرایە، بـە سـەرنجدانی سرووشـتی، وێـڕای ئـەوەی لـە ڕیزبەندیـی دابەزینیشـدا زانایـان ژمـارەی شـازدە (١٦)یـان بـۆ دانـاوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە ڕیزبەندیـی موصحـەف دا ژمارەکـەی سـەدو دوو (١٠٢)یـەو، لـە دابەزینیشـدا ژمارەکـەی شـازدە (١٦)یـە، پێـش سـوورەتی (**الماعـون**) و، دوای سـوورەتی (**الكَوثـر**) دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، بـە یەکدەنگیـی ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قورئـان، هەشـت (٨) ئایەتـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە نێوەڕۆکەکـەی بریتیـە لـە سەرزەنشـتکردنی خـوا ﷻ بـۆ کەسـانی خافـڵاو لـە خـواو لـە ڕۆژی دوایـی و، سـەرقاڵ بـە زۆرکردنـی مـاڵ و سـامان، یـان ژمـارەی خـزم و کـەس و دەوروبـەر، یـان نیعمەتەکانـی دنیـا، هەتـا دەچنـە سـەر گۆڕسـتان، واتـە: هەتـا دەمـرن و، هەڕەشـە لێکردنیـان بـەوەی دڵنیابـن لەمـەودوا

دەزانن چەند بە هەڵە داچوون! پاشان دڵنیاکردنەوەیان کە ئەگەر زانیاریی دڵنیاکەریان ببووایە، وایان نەدەکرد.

هەروەها دڵنیاکردنەوەیان لە دیتنی کڵپەی ئاگری دۆزەخ بەچاوی دڵنیایی، پاشان لێپرسینەوە لەگەڵدا کردنیان، لەسەر ئەو نازو نیعمەتانەی خوا لە ژیانی دنیایاندا پێیداون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتەم وا هاتنە بەرچاو، کە بریتین لە هاتنی چەند تەعبیرێك، تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون:

١- (أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ): واتە: زۆر کردن، یاخود: پێشبڕکە کردن لە زۆر کردندا، ئێوەی خافڵاندو بێئاگا کرد.

٢- (حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ): هەتا سەردانی گۆڕستانەکانتان کرد، (ٱلْمَقَابِرَ) کۆی (مَقْبِرَة) و (مَقْبَرَة) و (مَقْبُرَة)یەو، هەرسێکیان، واتە: شوێنێ کە گۆڕی لێ بن.

٣- (لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ): بە دڵنیایی کڵپەی دۆزەخ دەبینن.

٤- (عَيْنَ ٱلْيَقِينِ): چاوی دڵنیایی، یاخود دیتنی دڵنیایی.

٥- (ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ): دوایی بە دڵنیایی لێتان دەپرسێتەوە.

٦- (يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ): لەو ڕۆژەدا لەو نازو نیعمەتەی پێتاندراوە، لێتان دەپرسرێتەوە.

## حەوتەم و کۆتایی: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئەم هەشت (٨) ئایەتە دەکەین بە یەك دەرس، لەبەر ئەوەی هەموویان تێکهەڵکێش و پێکەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەر (٨) ئایەتەکەی ئەم سووڕەتە موبارەکە پێکدێ (١-٨)، وەك پێشتریش گوتمان: ئەم سووڕەتە موبارەکە بریتیە لە هەواڵدانێك بە خافڵانی خەڵك: ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾، ئێوە خافڵاون بە پێشبڕکە کردەوە لە زۆر کردندا، ئنجا خوا ﷻ نەیفەرمووە: زۆرکردنی چی؟ ماڵ و سامان، خزمان و نزیکان، خانووبەرە، زەوی و زار، ... هتد، هەمووی دەگرێتەوە، هەڵبەتە کەسێکیش هەر خەریکی پێشبڕکە بێ لە زۆرکردنی ماڵ و سامان و، خزم و کەس و قەڕەباڵغیی دەوروبەری و زیادکردنی نازو نیعمەتەکانی ژیانی دنیادا، زیاد لەوەی پێویستیی پێیان هەیە، بێگومان ئەوە لەسەر حیسابی پەیوەندیی لەگەڵ خواو ژیانی ڕۆژی دواییەتی، وشەی (لَهو)ش هەر ئەو واتایە دەگەیەنێ، کە بریتیە لە خافڵان بە شتێکەوە بایەخی زۆر نەبێ، لەسەر حیسابی شتێکی دیکە، کە بایەخی زۆرە، وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

دوایی هەڕەشەکردنی خوا ﷻ کە لەمەودوا دەزانن: ﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، نەخێر (وازبێنن) لەمەودوا دەزانن، واتە: دەزانن کە ئەو خافڵانەتان بە پێشبڕکە کردن لە زۆرکردنی ماڵ و سامان و سەروەت و..هتد لە دنیادا، لەسەر حیسابی پەیوەندییتان لەگەڵ خواو ڕۆژی دوایی، تووشی سزاو جەزرەبەتان دەکات و لەسەری پەشێمان دەبنەوە، ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴾، نەخێر (واز بێنن) ئەگەر زانیاریی جێی دڵنیاییتان ببوایە، زانیارییەکی دڵنیاکەر، وەڵامی (لو) قرتێنراوە، واتە: ئەگەر زانیاریی دڵنیاکەرەوەتان ببوایە، واتان نەدەکرد، یاخود وازتان لەو حاڵەتان دەهێنا.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴾، بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوە، ئێوە ئاگری کڵپەسەندووی دۆزەخ دەبینن، ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴾، دوایی

بـە چـاوی دڵنیایـی دەیبینـن، ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيـمِ ﴾، ئنجا بەمسۆگەریی لـەو ڕۆژەدا، لـەو نـازو نیعمـەت و خێـرو خۆشـییانەی لـە دنیـادا پێتـان دراون، لێتـان دەپرسرێتەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ١ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ٢ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ٣ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ٤ كَلَّا لَوۡ تَعۡلَمُونَ عِلۡمَ ٱلۡيَقِينِ ٥ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ٦ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ٧ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ٨ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە . پێشـبڕکەی زۆرکـردن (ی سـامان و نیعمەتەکانـی دیکـەی دنیـا) ئێـوەی خافڵانـد (١) تاکـو مـردن و سـەردانی گۆڕسـتانانتان کـرد (٢) وازبێـن (لـە زۆر کـردن و خـۆ پێـوە بـادان و پێـوە خافڵانـی) لەمـەودوا دەزانـن (چەنـدە بـە هەڵـە داچـوون) (٣) دیسـان وازبێنـن (لـەو خافڵانـە) لەمـەودوا دەزانـن (گەلێـك بـە هەڵـەدا چـوون) (٤) وازبێنـن ئەگـەر زانیاریـی دڵنیاییتـان زانیبایـە (واتـان نەدەکـرد) (٥) بـە دڵنیایـی کڵپـەی دۆزەخ دەبینـن (٦) دیسـان بـە دڵنیایـی بـە چـاوی دڵنیایـی دەیبینـن (٧) دوایـی لـەو ڕۆژەدا مسـۆگەر لـە بـارەی نـازو نیعمەتـەوە لێتـان دەپرسرێتـەوە (٨)}.

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(أَلْهَىٰكُمُ): (أَي: شَغَلَكُم)، ئێوەی خافڵاندو سەرقاڵ كرد، ئێوەی بێئاگا كرد، (اللَّهْو: مَا يَشْغَلُ الإِنْسَانَ عَمَّا يَعْنيهِ ويُهِمُّهُ)، (لَهو): هەر شتێكە مرۆڤ دەخافڵێنێ و سەرقاڵی دەكات لە شتێك كە بەلایەوە گرنگەو مەبەستە، دەگوترێ: (لَهَوْتُ بِكَذا، وَلَهَيْتُ عَنْ كَذا، أَي: اشْتَغَلْتُ عَنْهُ بِلَهْوٍ)، (لَهَوتُ بِكَذا)، واتە: بەو شتە خافڵام، (وَلَهَيْتُ عَن كَذا)، بەهۆی سەرقاڵییەوە ئاگام لێی نەماو لێی بێئاگا بووم و خافڵام.

(ٱلتَّكَاثُرُ): (المُكَاثَرَةُ وَالتَّكَاثُرُ: التَّبَاري بكَثْرَةِ المَالِ والعِزِّ)، (تَكاثُر و مُكَاثَرة)، هەردووكیان واتە: پێشبڕكە كردن لە زۆریی سامان و دەسەڵاتدا.

(زُرْتُمُ): واتە: سەردانتان كرد، (زُرْتُ فُلاَنَاً: تَلَقَّيْتُهُ بِزَوْرِي، أَوْ قَصَدْتُ زَوْرَهُ، وَرَجُلٌ زَائِرٌ وَقَوْمٌ زَوْرٌ، نَحو: سافِر وَسَفر، زَارَهُ يَزورُهُ زَوْراً، فَهوَ زَائِرٌ، أَتَاهُ فِي دارِهِ لِأُنسٍ أَو لِحَاجَةٍ إِلَيْه)، وشەی: (زُرْتُمُ)، دەگوترێ: (زُرْتُ فُلاناً، تَلَقَّيْتُهُ بِزَوري، أَوْ قَصَدْتُ زَوْرَهُ)، (زَور)، ئەو قۆپچانەت كە لە پێشی پۆشاك دەدرێن، یاخود هەر شتێك كە لە پۆشاك دەدرێ، واتە: ئەو قۆپچانەی خۆمم ئاڕاستە كردن، یاخود ڕووم كردە قۆپچەكانی كە لەسەر سنگی ئەون، ڕووم تێكرد، (وَرَجُلٌ زَائِرٌ وَقَوْمٌ زَوْرٌ)، پیاوێكی سەردانكەرو كۆمەڵێكی سەردانكەر، وەك (سافِر، سَفَر)، ڕێبوار و ڕێبوارەكان، (زَارَهُ يَزُورُهُ زَوْراً، فَهُوَ زَائِرٌ)، سەردانی كرد، سەردانی دەكات، سەردانكردن، ئەو سەردانكەرە، واتە: لە ماڵی خۆی چوو بۆ لای، لەبەر خۆشویستن و ئولفەت پێوەگرتن، یاخود لەبەر ئەوەی كارو پێویستییەكی هەیە.

(ٱلْمَقَابِرَ): (جَمعُ مَقْبَرَة وَمَقْبِرَة ومَقْبُرَة، مَوْضِعُ قَبْرٍ)، (ٱلْمَقَابِرَ) كۆی (مَقْبرَة)، یان (مَقْبِرَة) یان (مَقْبُرَة)یە، هەرسێكیان بە شوێنی گۆڕان دەگوترێن، (مَقَرُّ المَيِّت)، نشینگەی مردوو كە لەوێ نێژراوە، دەگوترێ: (قَبَرْتُهُ، أَي: جَعَلْتُهُ فِي قَبْرٍ، وَأَقْبَرْتُهُ أَي:

جَعَلْتُ لَهُ مَكَاناً يُقْبَرُ فِيهِ)، (قَبَرْتُهُ)، واتە: خستمە نێو گۆڕ، بەڵام (أَقْبَرْتُهُ)، واتە: شوێنێکم بۆ دانا لەوێدا بنێژرێ و بخرێتە گۆڕەوە.

( كَلَّا ): (رَدْعٌ وَزَجْرٌ وَإِبْطَالٌ لقَوْلِ قَائِلِ، نَقِيضُ إِي: فِي الإِثْبَات)، وشەی: (كلاّ): وەك زۆر جاران باسمان کردوە، بۆ تێخوڕین و سەرزەنشتکردن و هەڵوەشانەوەیە، بۆ قسەی بێژەرێك کە گوتوویەتی (یاخود بۆ ڕەفتاری کەسێك کە ڕەفتارێکی نواندوەو دەتەوێ هەڵیوەشێنیەوە)، یان پێی بڵێی: وامەڵێ، یان وامەکە، ئەمە دژو پێچەوانەی وشەی: (إِي)ە، بۆ چەسپاندن (إثبات)ە، بۆ باری ئەرێنیی وەك لە سوورەتی (یونس)دا هاتوە: ﴿ إِي وَرَبِّيٓ ﴿٥٣﴾ ﴾، تەنیا لەوێشدا هاتوە، (إِي)، واتە: (ئا)، یان (بەڵێ)، یان (با)، بەڵام ( كَلَّا )، یانی: نەخێر، یان واز بێنە، یان دەستهەڵبگرە.

(عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ): (اليَقِينُ: مِنَ صِفَةِ العِلم فَوق المَعْرِفَةِ وَالدِّرايَة)، (يَقِيْن): لە سیفەتی زانیارییە لەسەرووی زانست و زانینەوەیە، (عِلْمَ ٱلْيَقِينِ )، (عِلْمُ اليَقْيِن: هُوَ سُكُون الفَهْمِ مَعَ ثَبَاتِ الحُكْمِ)، زانیارییەکی جێی دڵنیایی، بریتیە لەوەی مرۆڤ تێگەیشتنی بچەسپێ و، حوکم و بڕیارێك کە لە بارەی شتێکەوە دەیدات، چەسپاو بێ و لەرەلەری تێدا نەبێ.

(ٱلْجَحِيمَ ): (الجَحْمَةُ: شِدَّةُ تَأَجُّج النَّارِ، جَحَّمَ وَجْهَهُ مِنْ شِدَّةِ الغَضَبِ)، (جَحْمَة): بریتیە لە بڵێسەی ئاگر، کە کڵپە دەستێنێ، دەگوترێ: (جَحْمَةُ النَّار)، (جَحيم): ئاگرێکی بڵێسە سەندوویە، کڵپە سەندوو، لەوەشەوە دوایی خوازراوەتەوە، دەگوترێ: (جَحَّمَ وَجْهَهُ، مِنْ شِدَّةِ الغَضَب)، ئەو مرۆڤە لە ئەنجامی زۆر تووڕەییدا، دەم و چاوی خۆی گرژو مۆن و ئاڵۆز کرد.

(عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ): چاوی دڵنیایی، وەك دوایی باس دەکەین، خوا ﷻ لە قورئاندا سێ وشەی بەکارهێناون: (عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ) و (عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ) و (حَقُّ ٱلْيَقِينِ )، هەر کامێکیان پلەیەکە لە پلەکانی پەیبردن بە شتان و زانینی شتان:

(عِلْمَ ٱلْيَقِينِ )، ئەوەیە زانیارییت لە بارەی شتێکەوە هەبێ و، لەرەلەرت لە بارەیەوە نەمابێ، حوکمێکی چەسپاوت لەدڵدا هەبێ بەرانبەری.

( عَيْنَ ٱلْيَقِينِ )، ئەوەیە بەچاو، چاوی سەر ببینی.

(حق ٱلْيَقِينِ )، ئەوەیە بچیە نێوی، یاخود دەستی لێبدەی.

دواییش زیاتر ڕوونیان دەکەینەوە.

(ٱلنَّعِيمِ ): (**النِّعْمَةُ: الحَالَةُ الحَسَنَةُ، وَبِنَاؤُها بِنَاءُ الحَالَةِ الَّتِي يَكُونُ عَلَيْهَا الإِنْسَانُ كَالجِلْسَةِ وَالرِّكْبَةِ**)، (**نِعْمَة**): بریتیە لە حاڵەتی باش، وشەی نیعمەت بە شێوەی حاڵەت دروستکراوە، ئەو حاڵەتەی مرۆڤ لەسەری دەبێ، دەگوترێ: (**جَلَسَ جِلْسَةً**)، دانیشت، بەدانیشتنێك، (**رِكْبَة**)ش، یانی: سوار بوون بەسوار بوونێك، کەواتە: (**نِعْمَة**)، واتە: حاڵەتێکی باش.

وشەی (**نَعْمَة**)ش هەیە: (**النَّعْمةُ: التَّنَعُّم**)، (**نَعْمَة**)، واتە: خۆشگوزەرانیی (**وَبِنَاؤها بِنَاءُ المَرَّةِ مِنَ الفِعْلِ كالضَّرْبَةِ والشَّتْمَةِ**)، بەڵام دروستکردنی وشەی (**نَعْمَة**)، وەك دروستکردنی جارێك و کردارێکە لە شتێك وەك: (**الضَّرْبَةِ والشَّتْمَةِ**)، لێدانێك و قسە پێگوتنێك.

بەڵام (ٱلنَّعِيمِ ): (**النِّعْمَةُ الكَثِيْرَة**)، واتە: نازو نیعمەتی زۆر.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، کـە مەبەسـت پێـی ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای زاناو توانا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

دەبـێ بـەلای کەمـەوە ئـەو چـوار واتایـە لـە عەقـڵ و دڵـدا ئامـادە بـن، لـە کاتـی گوتنـی ئـەم ڕسـتە موبارەکـەدا، کـە خـوای بـەرزو مـەزن سـەدو چـواردە (١١٤) جـار لـە کۆتـا فەرمایشـتی دا دووبـارەی کردۆتـەوە، بۆیـە ئێمـەش هەمیشـە کـە دەیهێنیـن، ئـەوەی پێویسـتە مـرۆڤ لـە عەقـڵ و دڵیـدا ئامـادەی بـکات، لـە کاتـی گوتنـی ئـەم ڕسـتەیەدا، هەمـوو جـارێ دووبـارەی دەکەینـەوە.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾، زۆر کـردن ئێـوەی خافڵانـد، یاخـود پێشـبڕکە کـردن لـە زۆرکردنـدا ئێـوەی خافڵانـد، ئێـوەی بێئـاگا کـرد، ئایـا لـە چـی خافڵاندنـی؟ لێـرەدا خـوا ﷻ دەری نەخسـتوە: ئێـوەی خافڵانـد لـە خـوا ﷻ، ئێـوەی خافڵانـد لـە ڕۆژی دوایـی، ئێـوەی خافڵانـد لـە شـوێنکەوتنی پێغەمبەرەکـەی ﷺ، ئێـوەی خافڵانـد لـە تێوەڕامانـی قوڕئـان، ئێـوەی خافڵانـد لـەوەدا کـە ژیانـی دنیاتـان چـۆن بـە شـێوەیەك بگوزەرێنـن جێـی پەسـندیی و ڕەزامەندیـی خـوا بـێ، ئـەو واتایانـەو وێنـەی ئـەو واتایانـە، هەموویـان دەگرێتـەوە، بـەڵام ئەگـەر خـوا ﷻ فەرمووبـای: (**أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ عَـنِ اللـهِ، عَـنِ القيامَـة عَـنِ النَّبـيِّ، عَـنِ القُـرآنِ**)، ئـەو کاتـە لێخافـڵاو دیارییکـراو دەبـوو، بـەڵام ئێسـتا مانایەکـەی بـە گشـتیی دەمێنێتـەوە:

﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾، یانی: خۆ هەڵکێشان، یاخود: پێشبڕکە کردن لە زۆر کردندا، ئێوەی خافڵاند، لە هەموو ئەو شتانەی نابێ مرۆڤ لێیان بێ ئاگاو خافڵاوبێ.

هەروەها: ﴿ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾، زۆر کردن، یاخود پێشبڕکە کردن لە زۆر کردندا، زۆرکردنی چی؟ دیسان خوا ﷻ ئەویشی دیاریی نەکردوە، بەڵام بە زۆریی وایە خەڵك پێشبڕکە دەکات لە زۆرکردنی ماڵ و ساماندا، چ ماڵ و سامانی نەقدینە، کە کاتی خۆی زێڕو زیو بووە، ئێستاش دینارو یۆرۆ و دۆلارو ئەو دراوانەن کە هەن، هەروەها هەردوو کانزای زێڕو زیویش، بەڵکو کانزای لەوانیش بەنرختر، وەك ئەڵماس و گەوهەرو ... هتدیش هەر هەن، دوای ماڵ و سامانی نەقدینە، ئنجا ماڵ و سامانی زەوی، هەیە کەیفی بە زەوی دێ، زەوییان زۆر دەکڕێ، هەیە کەیفی بە خانووان دێ، خانووان زۆر دەکڕێ، هەیە کەیفی بە سەیاران دێ، سەیاران زۆر دەکڕێ، کاتی خۆی حوشتر هەبووە، ئەسپ هەبووە، هەیە ئێستاشی لەگەڵدا بێ کەیفی بە ئاژەڵان دێ، ئەسپی هەن، گاو مانگاو گامێشی هەن، مەڕو بزنی هەن، بەخێویان دەکات، یان بۆی بەخێو دەکرێن.

هەروەها (**تكاثر**) زۆرکردنی قەڕەباڵغیی بە دەوری خۆتەوە، خزم و کەس و قەوم و حیزب و شوێنکەوتووان و ئەوانەی هاوکارت دەبن و تێیانڕادەبینی دەفریات بێن، هەموو ئەوانە دەگرێتەوەو جگە لە ئەوانەش، دەگرێتەوە، یانی: پێشبڕکە کردن لە زۆرکردنی ماڵ و سامان و نازو نیعمەتەکانی دیکەی ژیانی دنیادا، ئێوەی خافڵاندو بێئاگا کرد، ئایا لەچی بێئاگای کردن؟ لە خوای پەروەردگارو، لە ڕۆژی دوایی و، لەو ژیانەی ئێوەی تێخراون و، ئێوە لە تاقیکردنەوەدان، کەچی لێتان تێکچووەو وا دەزانن خوا بۆ ئەوە ئێوەی لێرە داناوە، کە هەر خەریکی سەروەت و سامان و موڵك و ماڵ زۆر کردن و، قەڕەباڵغ کردنی دەوری خۆو، خانوو و سەیارەو کەل و پەل زۆرکردن بن!! ﴿ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴾، ئێوە هەر خافڵان و بێ ئاگاو سەرقاڵ بوون، تاکو سەردانی گۆڕستانەکانتان کرد، (**مَقَابِر**) کۆی (**مَقْبَرَة**)، یان (**مَقْبُرَة**) یان (**مَقْبِرَة**)یە، واتە: شوێنی گۆڕەکان، گۆڕستانەکان.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴾، ئاماژەیـە بـەوەی ئێـوە لـە گۆڕسـتاندا، وەك چـۆن کەسـێك سـەردانی کەسـێك دەکات، ماوەیـەکی کـەم لـە لای دادەنیشـێ، دوایـی هەڵدەسـتێ و بەجێـی دێڵـێ، نەچـووە ماڵـێ لـەوێ دابنـێ! کەواتـە: ئێـوەش کـە دەچنـە گۆڕسـتان و جەسـتەکەتان دەخرێتـە نێـو گـۆڕەوە، بزانـن ئـەوە بـۆ ماوەیەکـی کاتییـەو، وەك سـەردانی دۆسـت و نزیکێکتـان کردبـێ وایـە، بۆیـە ئـەو تەعبیـرەی بەکاردەهێـنرێ: (**نُقِـل فُـلانٌ إلى مَثْـواهُ الأَخـير**)، {فڵانکـەس گوازرایـەوە بـۆ نشـینگەی کۆتایـی}، هەڵەیـە، چونکـە لـە ڕاسـتییدا ئـەوێ نشـینگەی کۆتایـی نیـە، گـۆڕ قۆناغێکـی ڕاگـوزەرەو تەنیـا جەسـتەکە لەوێدایـە، بـەڵام ڕووحەکـە وەك لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دا هاتـووەوم ئایەتەکانیـش ئامـاژەی پـێ دەکـەن، یـان لـە بەهەشـتە یـان لـە دۆزەخـە، ڕووحەکـە بـەرز دەکرێتـەوەو ناچێتـەوە نێـو ئـەو جەسـتەیەی لێـی هاتۆتـەدەر، کـە تـازە بـە کەڵکـی تێدامـان نەمـاوە، جەسـتەکان سـەرەنجام هەڵدەوەشـێن و هەندێکیـان دەسـووتێن، هەندێکیـان هـەر گۆڕیشـیان بـە نیسـب نابـێ و، پارچـە پارچـە دەبـن، هەیانـە بـە جـۆرە ماددەیـەك هـەر دەیتوێننـەوەو نامێنـێ و، دەبێتـە ئـاو، یـان دەبێتـە تـۆزو گـەردو دووکـەڵ و بـە هـەوادا دەچـێ، هەڵبەتـە لـە لای خـوای پـەروەردگار ئاسـانە، ئـەو ڕووحـە جۆرێـك لـە پەیوەندیـی بمێنـێ بـە ئێسـك و پرووسـك، یـان دووکـەڵ و تـۆزو خـۆڵ و پارچـە پارچەکانـی جەسـتەکەیەوە، بـەڵام ئـەوەی سـزاو جەزرەبـەی دەکەوێتـە سـەر، لـە قۆناغـی بەرزەخـدا، یاخـود نـازو نیعمەتـی دەبـێ، بـە پلـەی یەکـەم ڕووحەکەیـە.

﴿ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٤ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴾، ﴿كَلَّا﴾، وشـەیەکە بـۆ تێوەخوڕیـن و هەڵوەشـاندنەوە (**كَلِمـةُ رَدْعٍ وَإبْطـال**)، واتـە: وامەکـەن، لەمـەودوا دەزانـن، دیسـان وامەکـەن لەمـەودوا دەزانـن، چـی دەزانـن؟ خـوا نەیفەرمـووە، چـی دەزانـن و بـەرکاری: ﴿ تَعۡلَمُونَ ﴾، قرتێـنراوە، چونکـە بـە ڕەوت و سـەلیقە دیـارە، واتـە: دەزانـن زۆر بـە هەڵەداچـوون، ئەگـەر هـەر خەریکـی پێشـبڕکە کـردن بـن لـە زۆر کردنـدا، هـەر خەریکـی خافـڵان بـن، بـە دنیـاوەو ئاگاتـان لـەوە نەبـێ کـە

ئێوە بۆ کاتێکی دیارییکراو لێرە دانراون، ماوەی چەند ساڵێك کە کۆتاییەکەشی دیار نیە، ژیانی دنیاتان، ژیانێکی کاتیی و ڕاگوزەرو دیارییکراوە، بۆیە لێرە دانەنراوی هەر خەریکی ئەوەبی سەروەت و سامان وەسەر یەك بنێی، بایی ئەوەندەی پێویستییت پێیەتی کۆی بکەوە، نەك لە دوای خۆتەوە بەشی نەوەی بیستەمیشت بکات! تۆ چەند ملیارێك دۆلارت بۆ چییە؟ بە تایبەت ئەوانەی ناشیبەخشن لە ڕێی خوادا، هی وا هەیە هێندەی هەیە ئەگەر هەر دابنیشێ و لاق لەسەر لاق دابنێ و هیچ کارێك نەکات، هەموو مانگان دە دەفتەریش خەرج بکات، ئنجا بەشی هەزار ساڵی دەکات و، بێگومان تەمەنەکەشی هێندە نیە، بۆیە خوای میهرەبان دوو جاران دووبارەی کردۆتەوە: ﴿كَلَّا﴾، وازبێنن، هەڵە دەکەن کە بەو شێوەیە خافڵاون، ﴿سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، لەمەودوا دەزانن، یاخود بە دڵنیایی دەزانن.

﴿ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، جارێکی دیکەش دیسان وازبێنن، بە دڵنیایی دەزانن، دەزانن بە هەڵەداچوونەو نەدەبووایە وابکەن.

﴿كَلَّا﴾، هەروەها جارێکی دیکەش خوا ﷻ وشەی: ﴿كَلَّا﴾، دووبارە دەکاتەوە، واتە: سێ جاران لێرەدا، یانی: دەستبەرداری ئەو حاڵەتانە بن کە ئێستا لەسەرینی و، بریتیە لە خافڵان و سەرقاڵبوون، بە پێشبڕکە کردنەوە لە زۆر کردنی ئەو شتانەدا کە لە دنیادا خوا ئێوەیان پێ تاقی دەکاتەوە، ﴿لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ﴾، ئەگەر زانیاریی جێی دڵنیاییتان ببووایە.

لێرەدا وەڵامی: ﴿لَوْ﴾، ئەگەر، قرتێنراوە، یانی: وازبێنن، ئەگەر زانیارییەکی دڵنیاییتان ببووایە، واتان نەدەکرد، یاخود: بە جۆرێکی دیکە ژیانی خۆتان بەڕێدەکرد، نەك بەو شێوەیەی ئێستا کە هەموو تواناو وزەی خۆتان خەرجی ئەوە کردوە، چۆن سەروەت و سامانی زیاتر، دەسەڵاتی زیاتر، نازو نیعمەتی زیاتر، لە دەستی خۆتاندا کۆ بکەنەوە، کە پێویستییشتان پێی نیە، بەڵکو لەسەرتان بارە.

ئنجا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ﴾، بـە دڵنیایـی کڵپـە(ی دۆزەخ) دەبینـن، بێگومـان ئەمـە وەڵامـی: ﴿لَوۡ﴾ نیـە، چونکـە دەفەرمـوێ: ئەگـەر بزانـن زانیاریـی جێـی دڵنیاییتـان هەبـێ، بـەڵام ئەگـەر بزانـن و نەزانـن دۆزەخ هـەر دەبینـن، بۆیـە ئەمـە وەڵامـی ﴿لَوۡ﴾ نیـەو ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلۡجَحِيمَ ﴾، لـە ڕێزمانـی عەرەبییـدا پێـی دەگوتـرێ: (**جُمْلَـةٌ إِسْتِئْنافية**)، ڕستەیەکی دەستپێکەرە، ڕستەیەکە لە نـوێ دەسـتی پێکـردوەو پەیوەسـت نیـە بـە ڕسـتەی پێـش ئـەوە، واتـە: بـە دڵنیایـی و سـوێند بـە خـوا، چونکـە (ل)ی (**لَـترونَّ**)، (**مُمَهِّـدَةٌ لِلْقَسَـم**)، زەمینەخۆشـکەرە بـۆ سـوێند، یانـی: سـوێند بەخـوا ئێـوە کڵپـەی دۆزەخ دەبینـن، ئاگـری بڵێسـەداری دۆزەخ دەبینـن، هەندێکیـش لـە زانایـان گوتوویانـە: ئەمـە پەیوەسـتە، بـە ڕسـتەی پێـش خۆیـەوە، بـەڵام نـەك بـەو واتایـەی ئەگـەر ئێـوە زانیاریـی جێـی دڵنیاییتـان هەبـێ، دۆزەخ دەبینـن، مانـای وایـە ئەگـەر زانیاریـی جێـی دڵنیاییـان نەبـێ، کڵپـەی دۆزەخ نابینـن! بەڵکـو بـەو واتایـەی ئەگـەر ئێـوە زانیاریـی جێـی دڵنیاییتـان هەبووایـە، هـەر ئێسـتا لـەم ژیانـە دنیاییـەدا، دۆزەختـان بەچـاوی عەقـڵ و دڵ دەبینـی، کـە ئـەو واتایـەش ڕێـی تێدەچـێ، بـەڵام ئـەوەی زۆربـەی ڕوونکەرەوانـی قورئـان لەسـەرنی و لەگـەڵ ڕەوتـی ئایەتەکانیشـدا باشـتر دەگونجـێ، هـەر ئەوەیـە کـە وەڵامـی (**لَـو**) قرتێـنراوەو، لـە زۆر شـوێنی دیکـەش دا وەڵامـی (**لَـو**)، قرتێـنراوە، چونکـە بـە سـیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، بۆیـە ئـەم ڕسـتەیە ڕسـتەیەکی تازەیـە، یـانی: بـە دڵنیایـی ئێـوە کڵپـەی دۆزەخ دەبنیـن، ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ﴾، دواییـش بـە مسـۆگەریی دەیبینـن بـە چـاوی دڵنیایـی، لێـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيۡنَ ٱلۡيَقِينِ ﴾، هـەر بـۆ جەختکردنـەوەی ئـەوەی پێشـێیە، پێشـێ دەفەرمـوێ: کڵپـەی دۆزەخ دەبینـن بـە دڵنیایـی، دوایـی دەفەرمـوێ: دیسـان دەیبینـن (کڵپـەی دۆزەخ) بـە چـاوی دڵنیایـی، کەواتـە: بـەس بـۆ جەختکردنەوەیـە، یاخـود: ئـەوەی پێشـێیان مەبەسـت پێـی قۆناغێکـەو، ئەمەشـیان مەبەسـت پێـی قۆناغێکـی دیکەیـە، هـەردوو واتایەکـە زانایـان هێناویانـن.

دەشـگونجێ بگوتـرێ: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴾، واتـە: ئێـوە دوای ئـەوەی دەمـرن، ئەوانـەی بێبـڕوان، دۆزەخ دەبینـن لـە قۆناغـی بەرزەخـدا، جۆرێـك لـە دۆزەخ و جۆرێـك لـە سـزادان دەبینـن، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە فەرمایشـتەکانیدا ئامـاژەی پێـداوە، کـە هـەر کەسـێك بمـرێ نشـینگەی خـۆی لـە بەهەشـت یـان لـە دۆزەخـدا دەبینـێ[1]، ئـەوەی دیکەشـیان: ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴾، دواییـش ئێـوە کڵپـەی دۆزەخ دەبینـن بـە چـاوی دڵنیایـی، یـانی: کاتێـك کـە دەچنـە نێـو دۆزەخـەوە، لـەوێ بـە چـاوی خۆتـان دەیبینـن.

﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، ئنجا لـەو ڕۆژەدا لێتـان دەپرسرێتـەوە لەو نازو نیعمـەت و خێـرو خۆشـییەی لـە دنیـادا بۆتـان ڕەخسـێنراوە، لێتـان دەپرسرێتـەوە لـە وردو درشـتی، ئایا چـۆن مامەڵەتـان بـە نـازو نیعمەتەکانـەوە کـردوە؟ ئایـا کردووتانـن بەهـۆکاری خـۆ پێبـادان و خـۆ پێهەڵکێشـان بەسـەر ئـەم و ئـەوداو، لـە خۆتانـدا قەتیسـتان کـردوون و، بەشـی خەڵکـی دیکەتـان لێنـەداون، وەك کرمەگڵخۆرکـە هـەر خۆتـان بـە تەنیـا دەمتـان لـەو نـازو نیعمەتانـەوە نـاوەو، ئاوڕتـان لـە خەڵکـی دیکـە نەداوەتـەوەو، سـەرتان بـەرەو ئاسـمان هەڵنەبڕیـوە! یاخـود مـافی خـواو خەڵکیشـتان تێـدا ڕەچـاو کـردوون و وەك سـپاردەیەکی خوایـی لـە دەسـتتان دا تەماشـاتان کـردوون؟!

لە کۆتایی ئەم مانایە گشتییەدا، بە باشم زانی ئەم دەقە بێنم[2]:

**{عَنْ زَيدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ أَبيهِ ﷺ، قَالَ: قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ» يَعْنِي عَنِ الطَّاعَةِ، «حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ» يَقُولُ: حَتَّى يَأْتِيَكُمُ الْمَوْتُ، { كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ }**

---

(١) لـە چەنـد شـوێنێکی ئـەم تەفسـیرەدا بـاسی نیعمـەت و سـزای گـۆڕو قۆناغـی بەرزەخـمان کـردوەو، دەقـەکانی سوننەتیشـمان لـە بارەیـەوە هێنـاون بـۆ وێنـە: تەفسـیری سـوورەتی: (المؤمنـون)، ئایـەتی: ﴿ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾، هەروەهـا تەفسـیری سـوورەتی: (الواقعـة) ئایەتـەکانی: ﴿ فَلَوْلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ ﴾، هەتـا کۆتایـی سـوورەتەکە.

(٢) تفسير القرآن العظيم: ج٤، ص٦٥٢، فتح القدير: ج٥، ص١٠٧-١٠٨، موقوفاً.

يَعْنـي: لَـوْ قَـد دَخَلْتُـم قُبُورَكُـم « ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ » يَقُـولُ: لَـوْ قَـدْ خَرَجْتُـم مِـن قُبورِكُـم إِلى مَحْشَرِكُـم، « كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ » قَـالَ: لَـوْ قَـدْ وَقَفْتُـم عَـلَى أَعْمَالِكُـم بَـيْنَ يَـدَيْ رَبِّكُـم، « لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ » وَذَلِـكَ أَنَّ الـصِّراطَ يُوضَـعُ وَسَـطَ جَهَنَّـمَ، فَنَـاجٍ مُسَـلَّمٌ، وَمَخْـدوشٌ مُسَـلَّمٌ، وَمَكْـدوسٌ فِي نَـارِ جَهَنَّـم. « ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ » يَعْنـي: شَـبَعِ البُطـوُنِ، وَبـارِدِ الـشُّرْبِ، وَظِـلاَلِ المَسَـاكِنِ، وَاعْتِـدَالِ الخَلْـقِ، وَلَـذَّة النَّـوم}.

واتـە: زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم لـە بابیـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەم سـوورەتەی خوێنـدەوە: {ئەگـەر واشـهێنرابێ، بـەڵام ئەمـە قسـەی زەیـدی کـوڕی ئەسـلەمە لـە بابیـەوە ﵁ هێناویەتـی}، ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾، زۆرکـردن، یاخـود پێشـبڕکە کـردن لـە زۆر کـردن دا، ئێـوەی بێئـاگا کـرد، لـە فەرمانبەریـی، (چەمکەکـەی زۆر لـەوە فراوانـترە، واتـە: لـە خـوا، لـە ڕۆژی دوایـی، لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە قوڕئـان... بێئـاگای کـردوون)، ﴿حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴾، هەتـا (مردنتـان بـۆ هـات و)، بردیانـن بـۆ گۆڕسـتان، ﴿كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، وازبێنـن، ئەگـەر چوونـە نێـو گۆڕەکانتانـەوە، دەزانـن، ﴿ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ﴾، جارێکـی دیکـەش واز بێنـن، لەمـەودوا بـە دڵنیایـی دەزانـن، واتـە: ئـەو کاتـەی لـە گۆڕەکانتـان دەردەچـن بـەرەو شـوێنی لـێ کۆکرانـەوەو خڕکرانـەوە لـە ڕۆژی دواییـدا، دەزانـن، ﴿كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ﴾، {وازبێنـن ئەگـەر زانیارییەکـی جێـی دڵنیاییتـان هەبووایـە}، ئەگـەر کردەوەکانتـان بینیـن کاتێـك لـە بەردەمـی پەروەردگاتـان ڕادەگیرێـن، ﴿لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ﴾، (بـە دڵنیایـی کڵپـەی دۆزەخ دەبینـن)، ئـەو پـردەی بەسـەر نێوەڕاسـتی دۆزەخ ڕادەهێڵـدرێ، (دەبـێ خەڵـك لێیـەوە بپەڕێتـەوە بـۆ ئەوبـەر ئنجـا دەچێتـە بەهەشـت)، (فَنَـاجٍ مُسَـلَّمٌ)، ئنجـا هەیـە دەربـازی دەبـێ و سـەلامەتکراوە، (وَمَخْـدوشٌ مُسَـلَّم)، هەروەهـا هەیـە بریـندار دەبـێ و دەڕووشـێ، بـەڵام سـەلامەت دەبـێ، (وَمَكْـدوسٌ فِي نَـارِ جَهَنَّـم)، هەشـن بەسـەریەکدا دەکـەون لـە ئاگـری دۆزەخـدا، ﴿ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ﴾، دوایـی لـەو ڕۆژەدا لـە نـازو نیعمـەت لێتـان دەپرسرێتـەوە (ئـەو پێنـج شـتی هێنـاون و پێـم جوانـن)، (شَـبَع

**البُطـوُنِ، وَبـارِدِ الـشُّرْبِ، وَظِـلالُ المَسـاكِنِ، وَاعْتِـدال الخَلْـقِ، وَلَـذَّة النَّـوم)**، تێربوونـی سـكان بـە خـواردن و خـۆراك و، خواردنـەوەی سـاردو فێنـك و، سـێبەری خانـوو و جێـگاو ڕێگایـان و، جەسـتە ڕێكـەكان، (كـە خـوا بـە ڕێـك و پێكیـی دروسـتیكردوون) و چێـژی خەوتـن.

بێگومـان ئـەم پێنجـە هەندێكـن لـەو نیعمەتانـەی خـوا لێیـان دەپرسـێتەوە، بـەڵام سـەرەكییەكانیانن: خـواردن و خواردنـەوە، جێـگاو ڕێگـە، تەندروسـتیی و سـەلامەتیی و، خـەوو پشـوودان و ئیسـڕاحەت.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**سەرزەنشتکردنی خوا ﷻ بۆ پێشبڕکەکاران لە زۆر کردنی سامان و دەستەڵات و نیعمەتەکانی دیکەدا، هەتا چوونە گۆڕستان و، دووجاران بەرپەرچدانەوەیان لەو ڕەفتارەیان و، ئاگادار کردنەوەیان کە لەمەودوا دەزانن بە هەڵەداچوون و، ئەگەر زانیاریی دڵنیاکەریان ببوایە، بەو جۆرەیان نەدەکرد:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾، ئێوەی خافڵاندو سەرقاڵکرد، زۆرکردن، یاخود: پێشبڕکە لە زۆرکردندا.

ڕووی دواندن دەگونجێ لە بێبڕوایان بێ، کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ بوون و لە هەموو ڕۆژگارەکانی دیکەش دا کە دێن، دەبن دەشگونجێ ڕووی دواندن لە هەموو لایەك بێ و دیارە ئەو کاتەش کۆمەڵگا بە زۆریی لەو جۆرە بووە کە بێبڕوا بوون، بەڵام بڕوادارانیشیان لە نێودا بوون، واتە: خوای پەروەردگار لێرەدا ڕووی کردۆتە خەڵك و مرۆڤەکان بە گشتیی، ئەو مانایەیان زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، چونکە خەڵك بە گشتیی، خافڵان و سەرقاڵ بوونیان هەیە، بە زۆر کردنی سەروەت و سامان و دەستەڵات و نازو نیعمەتەکانی دیکەوە، ڕۆژی دوایی و، لەسەر حیسابی پەیوەندییان لەگەڵ خوادا ﷻ.

﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ﴾، (أَي: شَغَلَكُم عَمَّا يَجِبُ عَلَيْكُمُ الإِشْتِغَالُ بِهِ)، واتە: ئێوەی خافڵاندو سەرقاڵکرد لەوەی لەسەرتان پێویستە پێیەوە سەرگەرم بن، پێیەوە خەریك بن، (اللَّهو: مَا يَشْغَلُ الإِنْسَانَ عَنْ أَمْرٍ مُهِمٍّ)، (لَهْو): بریتییە لەوەی مرۆڤ دەخافڵێنێ لە شتێك بۆی گرنگ و جێی بایەخ بێ.

﴿ ٱلتَّكَاثُرُ ﴾، (تَفَاعُلٌ مِنَ الكَثْرَةِ، أَيَ: التَّبَارِي فِي الإِكْثَارِ مِن شَيءٍ مَرْغُوبٍ فِي كَثْرَتِهِ، فَمِنْهُ: التَّكَاثُرُ فِي الأَمْوالِ، وَمِنْهُ: التَّكَاثُرُ فِي الأَعْوان و وَالأَوْلَادِ لِلْإِعْتِزَازِ بِهِم)، (تكَاثُر): لەسەر كێشی (تَفَاعُل)ە، لە (كَثْرَة)ەوە هاتووە، (كَثْرَة) واتە: زۆر، (التَّكَاثُر) واتە: پێشبڕكەكردن لە زۆركردن لە شتێكدا زۆرییەكەی جێگای ئارەزووبێ، پێشبڕكە بكەی لەوەدا كە ئەندازەیەكی زیاتری لێ وەدەست بێنی، وەك زۆركردنی ماڵ و سامان و، زۆركردنی ژمارەی هاوكاران و منداڵان، بۆ ئەوەی بە هۆیانەوە باڵادەست و بە هێزبێ و، دەوری قەڕەباڵغ بێ.

ڕووی دواندن دەگونجێ بە تایبەت لە بێبڕوایان بێ، خاوەنانی شیرك و كوفر، بە تایبەت ئەوانەیان كە ساماندارو دەسەڵاتدارن، یانی: ئەوانەی لە كۆمەڵگای شیرك و كوفردا باڵادەستن، بەهۆی ماڵ و سامان و دەسەڵاتەوە، دەشگونجێ ڕوو لە خەڵكی گشتیی بێ، بەڵام ئەو كاتەش بە تایبەت ئەوان - ساماندارو دەستەڵاتداران - دەگرێتەوە.

٢)- ﴿ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴾، هەتا سەردانی گۆڕستانانتان كرد، كۆی (قَبْر) و (قبور) و (أَقْبُر)ە، ﴿ ٱلۡمَقَابِرَ ﴾، كۆی (مَقْبِرَة) و (مَقْبَرَة) و (مَقْبُرَة)یە، هەرسێكیان بە (مَقَابر)، كۆ دەكرێنەوە، (الأَرْضُ الَّتِي فِيهَا قُبُورٌ كَثِيْرَة)، ئەو سەر زەمینەی گۆڕی زۆری تێدان، واتە: گۆڕستان، كە دەفەرمویّ: ﴿ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ٢ ﴾، (حَتَّىٰ: لِبُلُوغِ الغَايَةِ)، (حتّى) بۆ گەیشتنە ئامانجێكە وەك: (أَكَلْتُ السَّمَكَةَ حَتَّى رَأْسَهَا)، ماسییەكەم خوارد هەتا سەریشی، یان (سِرْتُ مِنْ بَغْدَاد حَتَّى البَصْرَة)، لە بەغداوە چووم هەتا بەصرا.

﴿ حَتَّىٰ ﴾، بۆ گەیشتنە ئامانجێکە، ئنجا ئایا لێرەدا ئەو ئامانجە چییە؟ واتە: خافڵانی ئێوە بەردەوام بوو هەتا سەردانی گۆڕستانتان کرد، یانی: ﴿ حَتَّىٰ ﴾، بۆ گەیشتنە ئەنجامی کۆتایی خافڵان و سەرقاڵبوون و سەرگەرمبوونە، واتە: خافڵان هەتا سەردانی گۆڕستانتان کرد، بۆچی بەسەردان ناوی دەبات؟ لەبەر ئەوەی مرۆڤ کە دەمرێ،چوونە نێوگۆڕی لە ڕاستییدا قۆناغێکی ڕاگوزارەو، مرۆڤ جەستەکەی ماوەیەکی دیارییکراو لە گۆڕدا دەمێنێتەوە، ئەگەر گۆڕی بەنسیب بێ، دوایی قیامەتی بەسەردادێ و زیندوو دەکرێتەوەو، جەستەو ڕووح پێکەوە یەکدەگرنەوە لە ڕۆژی دوایی دا، بۆیە بەکرداری ڕابردوو هێناویەتی: ﴿ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ۝٢ ﴾، کە ئەمە بۆ ڕابردوویەو مەبەست پێی ئەوەیە: ئەو داهاتووەی لەڕێیان دایە، وەك ڕابردوویەکە، کە ڕوودانەکەی و هاتنەکەی بۆتە شتێکی جێی دڵنیایی و، مسۆگەر بووە بۆیە ئاوای پێشان دەدات، چونکە ڕوودانەکەی شتێکی حەتمیی و مسۆگەرە، هەروەك خوا عزوجل لە سەرەتای سووڕەتی (النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۝١ ﴾، واتە: فەرمانی خوا هات پەلەی لێ مەکەن، کە جارێ نەهاتوە، ئەگەر مەبەست پێی ئاخیر زەمان، یان ڕۆژی قیامەت بێ، جارێ نەهاتوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەموو شتێ لەبەر دەستی خوای باڵا دەستەو، خواش بۆ خۆی هەموو شتێکی ئەندازەگیریی کردوەو، دەزانێ ڕۆژی ئاخیر زەمان و ڕۆژی قیامەتیش هەر دێن، بۆیە بە هاتوو وەسفی کردوە، هەروەها لەبەر ئەوەش کە مانەوە لە گۆڕدا، هەتا ئەو کاتەیە کە ئاخیر زەمان دێ و قیامەت دێ، بۆیە بە تەعبیری چوونە گۆڕستان باسیکردوە، ئەگەرنا مەبەست پێی مردن و برانە گۆڕستانی ئەو کەسانەیە.

پێشتریش ئاماژەم پێدا، کە هەندێك وایان لێکداوەتەوە کە ئەو پێشبڕکەکارانە لە زۆرکردن دا، دوو هۆزی مەککەیی بوون، بەڕای ئەوانەی دەڵێن: ئەم سووڕەتە مەککەییە، یاخود دوو هۆزی مەدینەیی بوون، بەڕای ئەوانەی دەڵێن: ئەم سووڕەتە مەدینەییە.

بەڵام ئێمە مەككەیی بوونیمان هەڵبژارد، ئنجا لە هەردووك حاڵان دا، گوتراوە: ئەوانە پێشبڕكێیان بووە ئایا كامیان ژمارەی زیاترە؟ ئیدی سەرژمێری زیندووانیان كردووەو یەكێكیان لە یەكێكیان زیاتر بووە، ئنجا ئەوەی دۆڕاوە گوتوویەتی: با مردووانیش بژمێرین، بۆیە چوونە سەر گۆڕستانیش و مردووەكانیشیان ژماردوون، ئنجا دۆڕاوەكە بردوویەتەوە! دەڵێم: بێگومان دەشگونجێ ئەو ڕووداوە بووبێ، چ لە مەككە، چ لە مەدینەو خەڵك خۆی بەزۆرییەوە هەڵكێشابێ، بەڵام ئەم سووڕەتە موبارەكە لەو بارەوە نەهاتووە، ئەگەر ئەوەش بگرێتەوە، مەبەستی بنەڕەتیی سووڕەتە موبارەكەكە ئەوە نیە، بەڵكو خافڵانی خەڵك و سەرقاڵبوونیان بە ژیانی دنیاو سەروەت و سامان و دەستەڵاتەوەو، بە قەرەباڵغیی دەوریانەوە، بە كورتیی: بە نازو نیعمەتە ماددییەكانەوە لەسەر حیسابی ڕۆژی دواییان و، ژیانی مەعنەوییان و ئەو حیكمەت و هەقەی بۆی دروستكراون، كە بریتیە لە تاقیكردنەوەیان، كە ئەوەش دیاردەیەكی گشتییەو نەخۆشییەكی گشتگیرە بۆ هەموو مرۆڤەكان.

ئنجا خوا عزوجل دەفەرموێ:

٣)- ﴿ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، نەخێر (با وازبێنن) لەمەودوا دەزانن.

٤)- ﴿ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، دیسان نەخێر (با وازبێنن) لەمەودوا دەزانن، (**كَلَّا**): وشەیەكە بۆ تێخوڕین و بەرپەرچدانەوەو هەڵوەشاندنەوە، واتە: وازبێنن لە پێشبڕكەكردن لە زۆركردنی سەروەت و سامان و دەستەڵات و چی و چییدا، باوازبێنن لەمەو دوا دەزانن، ﴿ سَوْفَ ﴾، بۆ لەمەو دوایە، جاری واش هەیە ﴿ سَوْفَ ﴾، بۆ شتێكە كە دڵنیابی هەر دەبێ، (**لِتَحْقِيقِ وُصُولِ العِلْمِ**)، بە دڵنیایی دەزانن، ﴿ ثُمَّ كَلَّا ﴾، دیسان با وازبێنن، لە پێشبڕكەكردن لەزۆركردنی سەروەت و سامان و دەستەڵات و نازو نیعمەتەكانی دیكەدا، ﴿ سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾، بەدڵنیایی دەزانن، چی دەزانن؟

هەردوو ڕستەكە: ﴿ سَوْفَ تَعْلَمُونَ ③ ﴾، ﴿ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ④ ﴾، بەركار(**مفعول**)ەكەیان قرتێندراوە، چونكە ئاشكراو زانراوە: (**سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَغَبَّةَ**

لهيكـم بالتكاثـر)، لەمـەودوا سـەرەنجامی خافڵانتـان بـە پێشـبڕكەكردنەوە لـە زۆركردنی سـەروەت و سـامان و دەسـتەڵات و چـی و چییـدا، دەزانـن، یاخود: دەزانن چ سـزایەك چاوەڕێتـان دەكات، چ سـەرەنجامێكی شـووم چاوەڕێتـان دەكات.

(**ثُـمَّ: للتَّرتِيـبِ والتَّراخِـي**)، (ثـم) بـۆ ڕیزبەندیـی و بـە دوای یـەك دا هاتنـی بـەكاوە خۆیـە، ڕسـتەی دووەمیـش جەختكـەرەوەی ڕسـتەی پێشـەوەیە.

٥)- ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴾، نەخێر (وازبێنن لە پێشبڕكەكردن لە زۆركردنی سەروەت و سامان و دەستەڵات و چی و چییدا)، ئەگەر زانیاریی دڵنیاییتان ببوایە، دیسان وەڵامی ﴿لَوْ﴾، قرتێنراوە، لێرەدا وشەی تێخوڕین (كلاّ) بۆ جاری سێیەم دووبارە بۆتەوە، تاكو ئەوەی ئەوان لەسەرینی زۆر هەڵیبووەشێنێتەوە، كە بریتیە لە خافڵان بەهۆی زۆركردنی لایەنی مادديیەوە، لە تێوەڕامانی كتێبی خوا، یاخود: خافڵان لەو حیكمەتەی بۆی دروستكراون، یاخود: خافڵان لە چاودێریی كردنی خوا بۆیان، یاخود: خافڵان لەو سەرەنجامەی چاوەڕێیان دەكات.

هەڵبەتـە ئـەم ڕسـتەیە: ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ۝٥ ﴾، بـۆ زەبـەلاح و گـەورە پێشـاندانە، بۆیـەش وەڵامـی ﴿لَوْ﴾، (ئەگـەر)، قرتێـنراوە، تاكـو هـۆش و زەینـی مـرۆڤ بەهەرلایەكـدا بـڕوا، یانـی: ئەگـەر ئێـوە زانیاریـی دڵنیاییتـان ببوایـە، واتـان نەدەكـرد، ئەگـەر زانیاریـی دڵنیاییتـان ببوایـە، دەتانزانـی سـەرەنجامی شـووم چاوەڕێتـان دەكا، ئەگـەر زانیاریـی دڵنیاییتـان ببوایـە، خۆتـان ئامادەدەكـرد بـۆ دیـداری خـوا، هەمـوو ئـەو وەڵامانـەو هاووێنەكانیـان دەگونجـێ دابندرێـن.

(**الطبري**) لە ڕوونكردنەوەی چەمك و واتای ئەم ئایەتانەدا دەڵێ:

(**مَـا هَكَـذَا يَنْبَغِـي أَنْ تَفْعَلُـوا، أَنْ يُلْهِيَكُـمُ التَّكَاثُـرُ أَيُّهَـا النَّـاسُ، لَـوْ تَعْلَمُـونَ أَيُّهَـا النَّـاسُ عِلْـمًا يَقِينًـا، أَنَّ اللَّـهَ بَاعِثُكُـمْ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ مِـنْ بَعْـدِ مَمَاتِكُـمْ، مِـنْ قُبُورِكُـمْ، مَـا أَلْهَاكُـمُ التَّكَاثُـرُ عَـنْ طَاعَـةِ اللَّـهِ رَبِّكُـمْ، وَلَسَـارَعْتُمْ إِلَى عِبَادَتِـهِ، وَالإِنْتِهَـاءِ إِلَى أَمْـرِهِ وَنَهْيِـهِ، وَرَفْـضِ الدُّنْيَـا إِشْـفَاقًا عَـلَى أَنْفُسِـكُمْ مِـنْ عُقُوبَتِـهِ**) (**جامـع البيـان: ج١٥، ص٣١٣ و ٣١٤**).

واتــە: ئــەی خەڵكینــە، نەدەبــوو وابكــەن، پێشــبڕكە كــردن لــە زۆركردنــدا بتانخافڵێنــێ، ئــەی خەڵكینــە، ئەگــەر زانیارییەكــی جێــی دڵنیاییتــان ببووایــە، كــە خــوا ﷺ لــە ڕۆژی هەڵســانەوەدا، ئێــوە زینــدوو دەكاتــەوە دوای مردنتــان، لــە گۆڕەكانتــان دەرتاندێنێتــەوە، ئــەو كاتــە پێشــبڕكەكردن لــە زۆركردنــدا، ئێــوەی بێئــاگا نەدەكــرد لــە فەرمانبەریــی پەروەردگارتــان، بەڵكــو خێراییتــان دەكــرد بــۆ پەرســتنی و پابەندیــی بــە فەرمــان و قەدەغــەی خــواو، واز لێهێنانــی دنیــا لەبــەر مەترســیی لــە خۆتــان و پەرۆشــبوونی خۆتــان، لــەوەی ســزا بدرێــن.

ڕەتكردنــەوەی دنیــا (**رَفْضِ الدُّنيَا**)، -بەتەعبیــری تەبەریــی- مەگــەر دنیــای حەڕام و ناشــەرعیی مەبەســت بــێ، ئەگەرنــا ئیســلام نەهاتــوە بــە مســوڵمانان بڵــێ: ژیــانی دونیــا ڕەفــز بكــەن، بەڵكــو بــە پێچەوانــەوە خــوای پــەروەردگار فێــری مســوڵمانانی كــردوە، داوای چاكــەی دنیــا بكــەن: ﴿ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْأَخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ ﴾**البقرة**، پەروەردگارمــان! لــە دنیــادا چاكــەو لــە ڕۆژی دوایــی دا چاكەمــان پێبــدەو لــە ئــازاری ئاگــر بمانپارێــزە.

هەروەهــا لــە ســوورەتی (**القصص**)دا: ﴿ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ﴿٧٧﴾ ﴾، واتــە: بــەشی خۆشــت لــە ژیانــی دنیــا فەرامــۆش مەكــە، بــەڵام بــە دڵنیاییــەوە (**الطبري**) مەبەســتی دنیایەكــە بــە حەڕامیــی و لەســەر حیســابی قیامــەت بــێ، دنیایــەك لەســەر حیســابی ئــەو ســەرەنجامە مســۆگەرە بــێ، كــە چاوەڕێــی هەمــوو مرۆڤــەكان دەكات، كــە ســزاو پاداشــتی خوایــە، ئائــەو دنیایەیــە دەبــێ وازی لــێ بهێنــرێ و ڕەت بكرێتــەوە.

كــە دەفەرمــوێ: ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ ﴾، نەخێــر، ئەگــەر زانیاریــی دڵنیاییتــان ببووایــە، گومانــی تێــدا نیــە وەڵامــی ﴿ لَوْ ﴾، (ئەگــەر) قرتێنــراوەو، ئــەو ڕســتەیەی دوایــی دێ كــە دەفەرمــوێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ﴾، بــە جەختكردنــەوەوە كڵپــە (ی دۆزەخ) دەبینــن، ناگونجــێ وەڵامــی ﴿ لَوْ ﴾ بــێ، چونكــە ئەگــەر زانیاریــی جێــی دڵنیاییشــیان نەبــێ، دۆزەخ هــەر دەبینــن ئەوانــەی بێبــڕوا بــن، بۆیــە ناگونجــێ ئــەو ڕســتەیە وەڵامــی (لــو) بــێ، بەڵكــو وەڵامەكــەی قرتێنــراوە، كــە

بریتیە لە: ئەگەر ئێوە زانیاریی جێی دڵنیاییتان ببوایە، واتان نەدەكرد، یاخود: خۆتان بۆ دیداری خوا ئامادە دەكرد، یاخود: دەتانزانی كە سەرەنجامێكی شووم و سزایەكی سەخت چاوەڕێتانە.

## مانای (عِلْمَ ٱلْيَقِينِ)

زانایان لە بارەی وشەی: ﴿ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴾ەوە، ڕاجیاییان هەیە:

١- هەندێك گووتویانە: (**عِلْمُ الأَمْرِ المُتَيَقَّن، أي: كَعِلْمِكُمْ مَا تَسْتَيْقَنُونَهُ مِنَ الأُمُور**)، واتە: زانیاریی كارێكی جێی دڵنیایی، یانی: وەك زانیارییتان بە شتێكی جێی دڵنیایی، ئەگەر زانیارییەكی واتان ببوایە، بەو شێوەیەتان نەدەكرد.

٢- هەندێك گوتوویانە: (**اليَقِيْنُ: صِفَةٌ لِمُقَدَّر**)، (**يقين**) سیفەتی مەزەنەكراوێكە، وەك (**أمر**)، (**عِلْمُ الأَمْرِ اليَقِين**)، زانیاریی كارێكی مسۆگەرو جێی دڵنیایی، ئەمە لە هی یەكەمەوە نیزیكە.

٣- هەندێكیش گووتویانە: (**مِنْ إِضَافَةِ المَوْصُوفِ إِلى صِفَتِهِ**)، پاڵدرانی وەسفكراوە بۆ لای ئاوەڵناوەكەی: (عِلْمَ ٱلْيَقِينِ : **العِلْمُ اليَقِيْن**)، زانیارییەكی جێی دڵنیایی.

٤- هەندێكیش گوتوویانە: ﴿ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴾، واتە: زانیارییتان بە مردن هەبووایە، چونكە خوا مردنی ناو ناوە (**يقين**): ﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلْيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾**المدثر**، یانی: ئەگەر زانیارییتان بە مردن هەبووایەو، زانیباتان چۆن دەمرن و چیتان لێدێ، واتان نەدەكرد!

بەڵام من مانای چوارەمم پێ بەهێز نیەو، یان بە مانای: (**علم الأمر المتيقن**)، زانیاریی كارێكی مسۆگەرە، یاخود: وەسفكراو پاڵدراوەتە لای ئاوەڵناو (**صفة**) ەكەی، یانی: (**العلم اليقين**)، زانیارییەك كە جێی دڵنیاییە.

**مەسەلەی دووەم:**

**ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە هەموو لایەك (بە تایبەت بێبڕوایەکان) کڵپەی دۆزەخ دەبینن و، دوایی بە چاوی دڵنیایی دەیبینن، پاشان لە نازو نیعمەتی بۆ ڕەخسێنراویان لێیان دەپرسرێتەوە:**

خوا عزوجل دەفەرموێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ ﴾.

## ئەم مەسەلەیەش لە سێ بڕگەدا شی دەکەینەوە:

١)- ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴾، بە دڵنیایی کڵپە (ی دۆزەخ) دەبینن، (ل) لێرەدا زەمینەخۆشکەرە بۆ سوێند: **(والله لترونَّ الجحيم)**، سوێند بە خوا ئێوە کڵپەی دۆزەخ دەبینن، بەڵام بە دڵنیایی ڕستەی: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ﴾، وەڵامی ڕستەی پێشێ نیە، کە دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ ﴾، وازبێنن ئەگەر زانیاریی جێی دڵنیاییتان ببووایە، ئنجا دوایی بفەرموێ: بە دڵنیایی ئێوە کڵپەی دۆزەخ دەبینن، چونکە ئەگەر زانیاریی دڵنیاییشیان نەبێ، دۆزەخ هەر دەبینن، بۆیە ناگونجێ وەڵامی ئەوێ بێ، لەبەر ئەوەش واباشە بگرە پێویستە، لە کاتی خوێندندا، لەسەر: ﴿ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ ﴾، بوەستین، ئنجا: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ﴾، بەسەریەکەوە بخوێندرێتەوە، کە دەفەرموێ:

٢)- ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴾، دوایی بە دڵنیایی بە چاوی دڵنیایی دەیبینن، ئەمە بۆ جەختکردنەوەی ڕستەی پێشێیە، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە دوایی بەچاوی دڵنیایی دەیبینن، پێشێ دەفەرموێ: کڵپەی دۆزەخ دەبینن، دوایی دەفەرموێ: دواتر بەچاوی دڵنیایی دەیبینن، ﴿ عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئەو بینینەی کە خودی دڵنیاییە، لێرەدا **(عین)**، بە مانای خود **(نفس)**ە، دەگوترێ: **(جاء زيدٌ نَفْسُهُ)**، یان **(عَيْنُهُ)**، واتە: خودی خۆی هات.

کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ﴾، دوای ئەوەی فەرموویەتی: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ﴾.

واتایەکەی دوو ئەگەری هەن:

أ- زانایان هەندێکیان گووتویانە: بینینی یەکەم کاتێکە کە لە دوورەوە دۆزەخ دەبینن و، بینینی دووەم کاتێکە لە نیزیکەوە دەیبینن.

ب- هەندێکیش گوتوویانە: بینینی یەکەم لە کاتێکدایە دەچنە سوێی دۆزەخ، بەڵام بینینی دووەم کاتێکە دەچنە نێو دۆزەخەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ﴾، ئایا ڕووی دواندن لە بێبڕوایانە بە تایبەت، یاخود بۆ تێکڕایە هەم بێبڕوایان، هەم جگە لە بێبڕوایان؟ هەردوو ئەگەرەکەی هەن، چونکە بێگومان هەموو کەس دۆزەخ دەبینێ، بڕوادارو بێبڕوا، بڕوادارانیش چ گوناهباربن پێویست بکات، بچنە دۆزەخەوە تاکو پاك دەبنەوەو سزا دەدرێن، یاخود نەچنە نێو دۆزەخەوە هەموویان دۆزەخ هەر دەبینن و، فەرمایشتی خوا لە سوورەتی (مريم)دا زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾ ﴾ **مريم**.

**(الجرجاني)**، لە کتێبە ناودارەکەی خۆی **(التعريفات)**[1]دا، ئاوا پێناسەی **(يقين)** دەکات: **(اليقينُ: العِلْمُ الَّذي لاَ شَكَّ مَعَهُ، وَفِي الإصطِلاَح: اعْتِقَادُ الشَّيءِ بَأَنَّهُ كَذَا مَعَ اعتِقَادِ أَنَّهُ لاَ يمكن إلاَّ كذا، مُطَابِقاً للواقِعِ غَيْرَ مُمْكِن الزَّوَالِ)**، واتە: (يَقِيْن): ئەو زانیارییەیە کە دوودڵیی لەگەڵدا نیە، (ئەوە لە ڕووی زمانەوە)، لە ڕووی زاراوەییەوەش بریتیە لە بڕوا هەبوون بە شتێك بەو شێوەیەی هەیە، لەگەڵ بڕوا هەبوون بەوەدا کە ناگونجێ بەو شێوەیە نەبێ، ڕێ بەپێستی واقیش بێ و، ناشگونجێ ئەو زانیارییە لە عەقڵ و دڵی مرۆڤ لابچێ.

---

(١) ص ٢٥١.

**(وَعِنْدَ أَهْلِ الحَقِيقَة: رُؤيَة العيان بقوَّة الإيمان لا بالحُجَّة والبُرْهَان، وقيل مشاهدة الغيوب بصفاء القلوب)**، لەلای **(أهل الحقيقة)**ش، (مەبەستی پێ ئەوانەیە کە زیاتر سەرگەرمی تەزکیەی نەفس و تەصەووف بوون)، **(يقين)**: بریتیە لە دیتنی ئاشکرا بەهۆی هێزی ئیمانەوە، نەك بەهۆی هێزی بەڵگەوە، گوتراویشە: **(يقين)** بریتیە لە دیتنی نادیارەکان بە هۆی سافیی دڵانەوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾، دوایی بە دڵنیایی لە بارەی نازو نیعمەتەوە لێتان دەپرسرێتەوە.

بۆ شیکردنەوەی چەمك و واتای ئەم ئایەتەی کۆتایی سوورەتی **(التكاثر)**، دەڵێین:

بە دڵنیایی لێپرسرانەوەمان لە بارەی نازو نیعمەتەکانی خواوە، کە لەم ژیانە دنیاییەدا پێیداوین، تاکو بتوانین ژیانی ڕاگوزەرو کاتیی دنیامان بەشێوەیەکی شایستە بگوزەرێنین، شتێکی یەکجار مەترسییدارو هەستیارو گرنگەو، پێویستیی بە وریاییەکی زۆر دەکات، تاکو لەسەر چاکەو نیعمەتەکانی خوا کە لە ژمێرە نایەن: ﴿ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ ﴾، **إبراهيم - ٣٤ -**، قەرزدارو شەرمەزارنەبینەوە.

**(القرطبي)**، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: **(لَم يَأتِ فِي التَّنْزِيل ذِكْرُ المقَابِرِ إلاَّ فِي هَذِهِ السُّورَة)**، لە قورئاندا باسی گۆڕستانەکان نەکراوە، جگە لەم سوورەتەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ① حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ② ﴾.

لە کۆتایی ئەم دەرسەدا بەباشی دەزانم چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ژمارەیان نۆ (٩)یە، بهێنمەوە کە جگە لە یەکەم و دووەمیان، سەرجەمیان لە بارەی چەمك و واتای ئایەتی: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ⑧ ﴾ن و، تیشکی زۆرمان بۆ دەخەنە سەر چەمك و واتای ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە بە پێزە:

---

(١) ج ٢٠، الجزء: ٣٠، ص ١٣٣.

## نۆ فەرموودە لەبارەی لێپرسرانەوە لەسەر نیعمەتەکان

### فەرموودەی یەکەم:

{عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَهُوَ يَقْرَأُ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ التَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ۝٢﴾ التكاثر، قَالَ: «ابْنَ آدَمَ، لَيْسَ لَكَ مِنْ مَالِكِ إِلَّا مَا أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ، أَوْ تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ»} (جامع البيان: ٣٧٩٩٣، وقال المخرج: إسناده صحيح، ومسلم: ٢٩٥٨، والترمذي: ٢٣٤٩).

واتە: موتەڕڕیفی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شیخخیر لە بابیەوە گێڕاویەتەوە کە چوو بووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە حاڵێکدا ئەم سوورەتەی خوێندۆتەوە: ﴿أَلْهَىٰكُمُ التَّكَاثُرُ ۝١ حَتَّىٰ زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ۝٢﴾، دوایی فەرموویەتی: ڕۆڵەی ئادەم! لە ماڵ و سامانەکەت هیچی بۆ تۆ نیە، مەگەر ئەوەی خواردووتەو لەبەینت بردوە، یاخود پۆشیوتەو شڕتکردوە، یاخود چاکەت پێکردوەو تێپەڕیوەو ڕابردوە.

### فەرموودەی دووەم:

(عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: كُنَّا نَرَى أَنَّ هَذَا الْحَدِيثَ مِنَ الْقُرْآنِ: «لَوْ أَنَّ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَيْنِ مِنْ مَالٍ، لَتَمَنَّى وَادِيًا ثَالِثًا، وَلَا يَمْلَأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلَّا التُّرَابُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ» حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ السُّورَةُ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ التَّكَاثُرُ ۝١﴾ التكاثر، إِلَى آخِرِهَا} (جامع البيان: ٣٧٠٩٤، والترمذي: ٣٨١٨، قال الحافظ ابن الحجر في فتح الباري: ج١١، ص٢٦٢، وسنده جيد، صححه الألباني في صحيح السنن الترمذي).

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك لە ئوبەیی کوڕی کەعب (خوا لێیان ڕازی بێ) دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمە پێمان وابوو ئەم فەرموودەیە هەر بەشێکە لە قورئان، (ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی:) ئەگەر ڕۆڵەی ئادەم دوو شیوو دۆڵ ماڵ و سامانی ببوونایە، دۆڵێکی سێیەمیشی بە ئاوات دەخواست و، تەنیا گڵ هەناوی ڕۆڵەی ئادەم پڕ دەکا، دوایش هەر کەسێك بگەڕێتەوە

لای خـوا، خـوا دەگەڕێتـەوە لای و تەوبـەی لێوەردەگـرێ، (هەروامـان دەزانـی ئـەوە بەشـێکە لـە قوڕئـان) هەتـا ئـەم سـووڕەتە دابـەزی: ﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١﴾، تـا کۆتایـی.

(ئنجـا زانیـمان کـە ئـەوەی پێشـیّ فەرمایشـتی پێغەمبـەرە ﷺ چەمـك و واتـای فەرمایشـتەکەش لەگـەڵ هـی سـووڕەتە موبارەکەکـەدا زۆر لێـك نیزیکـن).

**فەرمموودەی سێیەم:**

**{عَـنْ جَابِـرِ بْـنِ عَبْـدِ اللَّـهِ رضي الله عنهما، يَقُـولُ: «أَتَانَـا النَّبِـيُّ ﷺ وَأَبُـو بَكْـرٍ وَعُمَـرُ رضي الله عنهما فَأَطْعَمْنَاهُـمْ رُطَبًـا، وَسَـقَيْنَاهُمْ مَـاءً، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ » هَـذَا مِـنَ النَّعِيـمِ الَّـذِي تُسْـأَلُونَ عَنْـهُ} (جامـع البيـان: ٣٨٠١٢ و ٣٨٠١٣، قـال المخـرج: إسـناده صحيـح، وأخرجـه النسـائي: ج٦، ص٢٤٦، وصححـه الألبـاني في صحيـح سـنن النسـائي).**

واتـە: جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا رضي الله عنهما دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺو ئەبـوو بەکـرو عومــەر رضي الله عنهما هاتــن بــۆ لامــان، ئێمــەش فەریکــە خورمامــان پێیانــدا، هەروەهــا ئاویشــمان دانــێ، پێغەمبــەری خــواش ﷺ فەرمــووی: ئەمــە لــەو نــازو نیعمەتەیــە کــە لەبارەیــەوە لێتــان دەپرسرێتــەوە.

**فەرمموودەی چوارەم:**

**{عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه، قَـالَ: بَيْنَـمَا أَبُـو بَكْـرٍ وَعُمَـرُ رضي الله عنهما جَالِسَـانِ، إِذْ جَـاءَ النَّبِـيُّ ﷺ، فَقَـالَ: «مَـا أَجْلَسَـكُمَا هَاهُنَـا؟» قَـالاَ: الْجُـوعُ، قَـالَ: «وَالَّـذِي بَعَثَنِـي بِالْحَـقِّ مَـا أَخْرَجَنِـي غَـيْرُهُ»، فَانْطَلَقُـوا حَتَّـى أَتَـوْا بَيْـتَ رَجُـلٍ مِـنَ الأَنْصَـارِ، فَاسْـتَقْبَلَتْهُمُ الْمَـرْأَةُ، فَقَـالَ لَهَـا النَّبِـيُّ ﷺ: «أَيْـنَ فُـلاَنٌ؟» فَقَالَـتْ: ذَهَـبَ يَسْـتَعْذِبُ لَنَـا مَـاءً، فَجَـاءَ صَاحِبُهُـمْ يَحْمِـلُ قِرْبَتَـهُ، فَقَـالَ: مَرْحَبـاً، مَـا زَارَ الْعِبَـادَ شَيْءٌ أَفْضَـلَ مِـنْ شَيْءٍ زَارَنِي الْيَـوْمَ، فَعَلَّـقَ قِرْبَتَـهُ بِكَـرَبِ نَخْلَـةٍ، وَانْطَلَـقَ فَجَاءَهُـمْ بِعِـذْقٍ، فَقَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: «أَلَا كُنْـتَ اجْتَنَيْـتَ؟» فَقَـالَ: أَحْبَبْـتُ أَنْ تَكُونُـوا الَّذِيـنَ تَخْتَـارُونَ عَـلَى أَعْيُنِكُـمْ، ثُـمَّ أَخَـذَ الشَّـفْرَةَ، فَقَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: «إِيَّـاكَ وَالْحَلُـوبَ»، فَذَبَـحَ لَهُـمْ يَوْمَئِـذٍ، فَأَكَلُـوا، فَقَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ: «لَتُسْـأَلُنَّ عَـنْ هَـذَا يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، أَخْرَجَكُـمْ**

مِنْ بُيُوتِكُمُ الْجُوعُ، فَلَمْ تَرْجِعُوا حَتَّى أَصَبْتُمْ هَذَا، فَهَذَا مِنَ النَّعِيمِ»} (جامع البيان: ٣٨٠١٤، قال المخرج: إسناده صحيح، وأخرجه مسلم في صحيحه: ٢٠٣٨).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: لە کاتێکدا ئەبوو بەکرو عومەر (خوا لێیان ڕازی بێ) دانیشتبوون. پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لایان و پێی فەرموون: چ شتێك ئێوەی لێرە دانیشتاندوە؟ گوتیان: برسیەتیی، ئەویش فەرمووی: سوێند بەو کەسەی بەهەق منی ناردوە، هەر ئەوەش منی هێناوەتە دەر، (واتە: منیش هەر برسییم)، ئنجا ڕۆیشتن تاکو چوونە ماڵی یەکێك لە پشتیوانەکان، ئافرەتەکە پێشوازیی لێکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: فڵانکەس لە کوێیە (خاوەن ماڵ)؟، گوتی: چووە ئاوی شیرینمان بۆ بێنێ، ئیدی هاوەڵەکەیان هاتەوە، ئەو مەشکەو کوندەیەی ئاوە شیرینەکەی تێدابوو، هەڵیگرتبوو، گوتی: بەخێربێن، باشتر لەو کەسانەی ئەمڕۆ سەردانی منیان کردوە، سەردانی بەندەکانی نەکردوە، دوایی کوندەو مەشکەکەی هەڵواسی بە لقێکی دارخورماوەو، چوو هێشوە خورمایەکی بۆ هێنان، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بۆچی بۆت لێنەکردینەوە؟ (واتە: خورمایەکانت بۆ لێکردباینەوە)، ئەویش گوتی: ویستم لەبەر چاوی خۆتان هەڵیبژێرن، (هەیە پێی خۆشە زیاتر گەییبێ، هەیە پێی خۆشە زۆر نەگەیبێ)، دوایی چەقۆی دەستدایە، (بچێ ئاژەڵێکیان بۆ سەرببڕێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: خۆت لەهی شیردەر بپارێزە، (واتە: هی شیردەرمان بۆ سەرمەبڕە)، ئنجا ئاژەڵێکی بۆ سەربڕین (دیارە مەڕدار یان بزندار بووە)، خوارديان، دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لە ڕۆژی قیامەتدا لەمە لێتان دەپرسرێتەوە، برسیەتیی لە ماڵی خۆتان دەری هێنان، بەڵام نەگەڕانەوە تاکو لەوەتان دەستکەوت، لەو نازو نیعمەتە (خوا لە بارەیەوە لێتان دەپرسێتەوە).

**فەرموودەی پێنجەم:**

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ: «انْطَلِقُوا بِنَا إِلَى أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيْهَانِ الْأَنْصَارِيِّ»، فَانْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى ظِلِّ حَدِيقَتِهِ، فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطًا، ثُمَّ انْطَلَقَ

إِلَى نَخْلَةٍ، فَجَاءَ بِقِنْوٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فَهَلَّا تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ؟» فَقَالَ: أَرَدْتُ أَنْ تُخَيِّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنَ الْمَاءِ؛ فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ، الَّذِي أَنْتُمْ فِيهِ مَسْئُولُونَ عَنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، هَذَا الظِّلُّ الْبَارِدُ، وَالرُّطَبُ الْبَارِدُ، عَلَيْهِ الْمَاءُ الْبَارِدُ»} (جامع البيان: ٣٨٠١٥، قال المخرج: إسناد صحيح، وأخرجه الترمذي: ٢٣٧٦، وصححه الألباني).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ گێڕاویەتەوە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبوو بەکرو عومەری (خوا لێیان ڕازی بێ) فەرموو: وەرن با بچین بۆ لای ئەبوو هەیسەم (یەکێك بووە لە هاوەڵان و لە پەیمانی دووەمی عەقەبەشدا بەشدار بووە)، پێکەوە چوون بۆ سێبەری باخە دارخورمایەکەی، ئەویش ڕایەخێکی بۆ ڕاخستن، دوایی خۆی ڕۆیشت بۆ لای دارخورمایەك هێشووە خورمایەکی بۆ هێنان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بۆچی لە خورما گەیوەکانی بۆت لێ نەدەکردینەوەو بۆت هەڵبژاردباین؟ ئەویش گوتی: حەزم کرد بۆ خۆتان لە گەیوەکەی و لە چاك نەگەیوەکەی تێیدا هەڵبژێرن، ئیدی خواردیان و ئاویشیان لەسەر خواردەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەوەی لێ بۆوە، فەرمووی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەمە لەو نازو نعمەتەیە کە ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا لەبارەیەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، ئەم سێبەرە خۆشە، (دیارە ڕۆژ بووە)، ئەم خورما گەیوە خۆشەو، ئەو ئاوە ساردو شیرینەی لەسەر بخورێتەوە.

### فەرموودەی شەشەم:

{عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ مَحْمُودِ بْنِ لَبِيدٍ ﷺ، قَالَ: « لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١﴾ فَقَرَأَهَا حَتَّى بَلَغَ: ﴿لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨﴾ التكاثر، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَنْ أَيِّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ؛ وَإِنَّمَا هُوَ الْأَسْوَدَانِ: الْمَاءُ، وَالتَّمْرُ، وَسُيُوفُنَا عَلَى عَوَاتِقِنَا، وَالْعَدُوُّ حَاضِرٌ؟ قَالَ: «إِنَّ ذَلِكَ سَيَكُونُ»} (جامع البيان: ٣٨٠٢٠، قال المخرج: إسنادُهُ حسنٌ، وأخرجهُ الترمذي: ٣٣٦٧، وابن ماجه: ٤١٥٨، وَحَسَّنَهُ الألباني في صحيح سنن ابن ماجه: ٤١٥٨).

واتە: موحەممەدی کوڕی مەحموودی کوڕی لەبید ﵁ دەڵێ: کاتێك ﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ١﴾، دابەزی، پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندیەوە تاکو گەیشتە ئایەتی کۆتایی: ﴿ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ٨﴾، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! لە کام نازو نیعمەت لێمان دەپرسرێتەوە؟ تەنیا دوو شتە ڕەشەکانن: ئاوو خورما، شمشێرەکانیشمان لەسەر ملمانن، دوژمنیش ئامادەیە، چۆن لێمان دەپرسرێتەوە؟ فەرمووی: ئەوە دەبێت.

واتە: بەڵێ لە تەنگژەو ناڕەحەتییدان، هەمیشە شمشێرتان بە ملەوەیە لە ترسی دوژمن، بەڵام لە بارەی نعمەتەکانیشەوە، ئنجا ئاوو خورما یان هەر شتێکی دیکەیە، لێتان دەپرسرێتەوە.

## فەرموودەی حەوتەم:

{عَنِ الضَّحَّاكِ بْنِ عَـزْرَبٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: قَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِنَّ أَوَّلَ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنَ النَّعِيمِ، أَنْ يُقَالَ لَهُ: أَلَمْ نُصِحَّ لَكَ جِسْمَكَ، وَنُرْوِ مِنَ الْمَاءِ الْبَارِدِ؟} (جامع البيان: ٣٨٠٢١، قال المخرج: إسنادُ صحيحٌ، وأخرجهُ الترمذي: ٣٦٦٩، وصححه الألباني في صحيح الجامع: ٢٠٢٢).

واتە: زەحاکی کوڕی عەزرەب، دەڵێ: گوێم لە ئەبوو هورەیرە ﵁ بوو دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: یەکەمین شتێك کە بەندە لە ڕۆژی قیامەتدا لێی دەپرسرێتەوە لە نازو نیعمەت، ئەوەیە پێی دەگوترێ: ئایا جەستەتمان بۆ ساغ نەکردی؟ لە ئاوی ساردیش تێر ئاو نەبووی؟

## فەرموودەی هەشتەم:

{عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ: عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ مَا فَعَلَ بِهِ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ

**أَيْـنَ اكْتَسَـبَهُ وَفِيـمَا أَنْفَقَـهُ، وَعَـنْ جِسْـمِهِ فِيـمَا أَبْـلَاهُ} (أخرجـه الترمـذي: ٢٤١٧، وقـال حديـث حسـن صحيـح، والدارمـي: ٥٥٤، وصححـه الألبـاني).**

واتـە: ئەبـوو بـەڕەزەی ئەسـلەمیی ﵁ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: دوو پێـی بەنـدە نـاڕۆن بەملاوملادا لـە ڕۆژی قیامەتـدا، هەتـا لە چوار شـتان پرسـیاری لـێ دەكـرێ: لـە تەمـەنی لـە چییـدا بەڕێـی كـردوە؟ لـە زانیارییەكـەی چەنـدەی كار پێكـردوە؟ لـە ماڵەكـەی چـۆنی پەیداكـردوەو چۆنیـشی خـەرج كـردوە؟ لـە جەسـتەی لـە چیـدا پیـری كـردوەو تەمەنـداری كـردوە؟

## فەرموودەی نۆیەم و كۆتایی:

**{عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ: «نِعْمَتَـانِ مَغْبُـونٌ فِيهِـمَا كَثِـيرٌ مِـنَ النَّـاسِ: الصِّحَّـةُ، وَالْفَـرَاغُ»} (أخرجـه البخـاري: ٦٠٤٩، والترمـذي: ٢٣٠٤، وابـن ماجـه: ٤١٧٠ وغيرهـم).**

واتـە: ئیبنـو عەببـاس ﵄ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: دوو نیعمەت زۆربـەی خەڵـكی تێیانـدا زیانبارن: تەندروسـتیی و دەسـتبەتاڵیی و بـوار هەبوون.

یانـی: زۆربـەی خەڵـكی لەسـەر لەشسـاغیی و تەندروسـتیی زیانبـارن، چونكـە خـوا لـەشی سـاغكردوون، بـەڵام ئـەو جەسـتەیان لـە چاكـەدا بەكارناهێنـن، هەروەهـا لـە بـارەی كاتیشـیانەوە، كات و بواریـان هەیـەو دەسـت بەتاڵـن، بـەڵام بەهـرە وەرناگـرن لـە كاتەكەیـان، لەوەشـدا زۆربـەی خەڵـكی تـووشی پەشـێمانیی و زیانباریـی دەبـن.

كۆتـا قسـەمان لـە بـارەی نێـوەڕۆكی ئـەم سـوورەتە مووبارەكـەوە، قسـەیەكی (الطبري)یـە، كـە لـە كۆتایـی تەفسـیری ئـەم سـوورەتە مووبارەكـەدا هێناویـەتی، دەڵێ:

**(وَكَانَ الْحَسَـنُ وَقَتَـادَةُ يَقُـولَانِ: ثَـلَاثٌ لَا يُسْـأَلُ عَنْهُـنَّ ابْـنُ آدَمَ، وَمَـا خَلَاهُـنَّ فِيـهِ الْمَسْـأَلَةُ وَالْحِسَـابُ، إِلَّا مَـا شَـاءَ اللَّـهُ: كِسْـوَةٌ يُـوَارِي بِهَـا سَـوْءَتَهُ، وَكِسْـرَةٌ يَشُـدُّ بِهَـا صُلْبَـهُ، وَبَيْـتٌ يُظِلُّـهُ.**

وَالصَّوَابُ مِنَ الْقَوْلِ فِي ذَلِكَ: أَنْ يُقَالَ: إِنَّ اللَّهَ أَخْبَرَ أَنَّهُ سَائِلٌ هَؤُلَاءِ الْقَوْمَ عَنِ النَّعِيمِ، وَلَمْ يُخَصِّصْ فِي خَبَرِهِ أَنَّهُ سَائِلُهُمْ عَنْ نَوْعٍ مِنَ النَّعِيمِ دُونَ نَوْعٍ، بَلْ عَمَّ بِالْخَبَرِ فِي ذَلِكَ عَنِ الْجَمِيعِ، فَهُوَ سَائِلُهُمْ، كَمَا قَالَ عَنْ جَمِيعِ النَّعِيمِ، لَا عَنْ بَعْضٍ دُونَ بَعْضٍ)، (جامع البيان: ج٢٤، ص٦١٠).

واتە: حەسەنی بەصرایی و قەتادە (ڕەحمەتی خوایان لێ بێ) گوتوویانە: سێ نیعمەت ڕۆڵەی ئادەم لە بارەیانەوە لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام جگە لەو سێیانە هەمووی لێپرسینەوەی لەسەرە، مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ لێپرسینەوەی لەسەر نەبێ، ئەو سێیەی لێپرسینەوەیان لەسەر نیە: پۆشاکێك عەورەتی خۆی پێ داپۆشێ، خواردنێك پشتی پێوە ڕابوەستێ، ماڵێك سێبەری لێ بکات، ئەو سێیە لێپرسینەوەیان لەسەر نیە. **(الطبري)** دەڵێ: بەڵام ڕای ڕاست لەو بارەوە ئەوەیە بگوترێ: خوا هەواڵیداوە لەو خەڵکە دەپرسێتەوە لە بارەی نازو نیعەتەکانەوە، لە هەواڵەکەی خۆیدا خوا ﷻ تایبەتی نەکردوە لە فلان جۆرە نازو نیعمەتە لێیان دەپرسێتەوە، بەلام لەوەی دیکە لێیان ناپرسێتەوە، بەڵکو هەواڵەکەی گشتاندوە لە بارەی هەموویانەوە، بۆیە وەك خۆی فەرموویەتی، لە هەموو نازو نیعمەتەکان لێیان دەپرسێتەوە، نەك لە هەندێکیان لێیان بپرسێتەوەو، لە هەندێکیان لێیان نەپرسێتەوە.

هەڵبەتە ڕایەکەی **(الطبري)**، سەدا سەد ڕاستەو، فەرمایشتەکانیش کە خوێندمانەوە، پشگیریی دەکەن.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی **(التكاثر)** دێنین و دەڵێین:

خوا بە لوتف و کەڕەمی بێ سنووری خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە هەموو وردو درشتی ژیانیاندا پابەند دەبن بە ئایین و ڕاستە ڕێی خواوەو، نازو نیعمەتەکانی خوا بەو شێوەیە بەکاردێنن، کە شەریعەتی خوای پەروەردگار ڕێی پێداوەو دیاریی کردوەو، خوا بمانپارێزێ لەوەی زێدەڕۆیی بکەین لە ژیان و

گوزەرانداو، پێشبڕکێ بکەین لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و قەڕەباڵغیی بە دەوری خۆماندا، بۆ خۆ پێهەڵکێشان بەسەر خەڵکدا، خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هەموو نیعمەتەکانی خوا لە ڕەزامەندیی خوادا بەکاردێنن.

## کورتە باسێک دەربارەی مامەڵە لەگەڵ مردوواندا

ئەم کورتە باسە لە دوو توێی بیست و یەك بڕگەداو، لە ژێر ڕۆشنایی چل دەقی سوننەت دا، دەکەین، کە زۆربەیان فەرمایشتی پێغەمبەری خاتەمن ﷺ، ئەویش ڕاستەخۆ لە (صحيح مسلم) وەری دەگرم[1]:

### یەکەم: تەڵقینی مردوو[2]:

**{عَـنْ سَـعِيدٍ الْخُـدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ: لَقِّنُـوا مَوْتَاكُـمْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ} (أخرجـه مسـلم: ٢١٢٠، وأبـو داود: ٣١١٧، والترمـذي: ٩٧٦، والنسـائي: ١٢٥، ابـن ماجـه: ١٤٤٥).**

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: مردووەکانتان (ئەوانەتان کە خەریکن دەمرن)، (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ)یان پێ بڵێن و دووبارەی بکەنەوە.

ئەوەش بۆ ئەوەی دوا وشەو وتەی کە دەیڵێن، لە کاتی گیان سپاردنیاندا، بریتی بێ لە: (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ)، چونکە لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: **{مَـنْ كَانَ آخِـرَ كَلَامِـهِ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ، دَخَـلَ الْجَنَّـةَ} (أخرجـه أحمـد: ٢٢١٨٠، وأبـو داود: ٢٩٤٥، والحاكـم: ١٢٩٩، وقـال: صحيـح الإسـناد، ابـن خزيمـة: ٢٣٧٠)**، واتە: هەر کەسێك

---

(١) كتاب الجنائز، ص: ٤١٣-٤٣٦

(٢) تەڵقینی کەسێك کە لەسەرە مەرگدایە، لە گیانەڵا دایە.

دوا قسـەی کـە لـە دەمـی دەردەچـێ (لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّـهُ) بـێ، یـانی: جگـە لـە خـوا هیچ پەرسـتراوێك نیـە، دەچێتـە بەهەشـت.

## دووەم: لە کاتی مردوو لێ مردندا، چی بگوترێ؟

ئایا کەسێك خۆشەویستێکی نیزیکێکی خەریکە دەمرێ، چی بڵێ باشە؟

لـەو بـارەوە ئـەم فەرموودەیـە دەهێنیـن: {**عَـنْ سَعْدِ بـنِ سَعِيدٍ، قَـالَ: أَخْبَرَنِي عُمَرُ بنُ كَثِيرِ بنِ أَفْلَحَ، قَـالَ: سَمِعْتُ ابـنَ سَفِينَةَ يُحَدِّثُ أَنَّـهُ سَمِعَ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ عَبْدٍ تُصِيبُهُ مُصِيبَةٌ، فَيَقُولُ: إِنَّا لِلَّـهِ وَإِنَّـا إِلَيْـهِ رَاجِعُونَ، أَللَّهُـمَّ أْجُـرْنِي فِي مُصِيبَتِـي وَأَخْلِـفْ لِي خَيْرًا مِنْهَـا، إِلاَّ أَجَـرَهُ اللَّـهُ فِي مُصِيبَتِهِ، وَأَخْلَفَ لَـهُ خَيْرًا مِنْهَـا، قَالَـتْ: فَلَمَّا تُوُفِّيَ أَبُـو سَلَمَةَ، قُلْتُ: كَمَا أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّـهِ ﷺ فَأَخْلَـفَ اللَّـهُ لِي خَيْرًا مِنْـهُ: رَسُولَ اللَّـهِ ﷺ**} (**أخرجـه مسـلم: ٢١٢٤**).

واتـە: ئـەو پیـاوە دەڵـێ: گوێـم لـە ئیبنـو سـەفینە بـوو، دەیگـوت: ئوممـو سـەلەمە ﵂ هاوسـەری پێغەمبـەر ﷺ دەیگـوت: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو دەیفەرمـوو: هـەر بەندەیـەك بەڵایەکـی تـووش بـوو، (واتـە: خۆشەویسـتێکی بمـرێ، بـە پێـی سـیاق دەزانیـن کـە مەبەسـتی پـێ ئەوەیـە)، بڵـێ: ئێمـە هـی خوایـن و بـۆ لای ئەویـش دەچینـەوە، خوایـە! لەسـەر ئـەم بەڵایـەم پاداشـتم بـدەوەو، چاکـتر لـەوەی لێـت وەرگرتـووم، پێـم ببەخشـە، (هـەر کەسـێ وابڵـێ)، بـە دڵنیایـی خـوا پاداشـتی دەداتـەوە لەسـەر بەڵایەکـەی بەسـەری هێنـاوەو، قەرەبـووی باشتریشـی پێـدەدا، دەڵـێ: کاتێك ئەبـوو سـەلەمە (واتـە: هاوسـەری) کۆچـی دوایـی کـرد، ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمانـی پێکـردم، گوتـم، خـواش ﷻ لـەو باشـتری بـە قسـمەت کـردم کـە بریتـی بـوو لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ، (کـە دەبێتـە بێـوەژن، پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاوسـەرگیریی لەگەڵـدا دەکات).

## سێیەم: لە کاتی مردن و گیانەڵادا چی بگوترێ باشە؟

لەو بارەوە ئەمە هاتوە: {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَرِيضَ، أَوِ الْمَيِّتَ، فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ، قَالَتْ: فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سَلَمَةَ قَدْ مَاتَ، قَالَ: قُولِي: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ، وَأَعْقِبْنِي مِنْهُ عُقْبَى حَسَنَةً، قَالَتْ: فَقُلْتُ، فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ مَنْ هُوَ خَيْرٌ لِي مِنْهُ مُحَمَّدًا ﷺ} (أخرجه مسلم: ٢١٢٦، وأبو داود: ٣١١٥، والترمذي: ١٧٧، والنسائي: ١٨٢٤، وابن ماجه: ٤٤٧).

واتە: ئوممو سەلەمە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەگەر ئامادەی نەخۆش بوون، یان ئامادەی مردوو بوون، (کەسێك خەریکە بمرێ و لە گیانەڵادایە) قسەی باش بکەن، چونکە فریشتەکان هەرچی ئێوە بیڵێن، ئەوانیش ئامینی لەسەر دەکەن، (دەڵێن: خوایە گیرای بکە)، دەڵێ: کاتێك ئەبوو سەلەمە وەفاتی کرد، چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوو سەلەمە وەفاتی کرد، ئەویش فەرمووی: بڵێ: ئەی خوایە! لە منیش و لەویش ببوورەو، سەرەنجامی چاکیشم لە دوای ئەو بە نسیب بکە، منیش وام گوت، خواش سەرەنجامی چاکتر لەوی بە نسیب کردم، موحەممەد ﷺ.

## چوارەم: نووقاندنی چاوی مردوو و دوعا بۆ کردنی:

{عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ وَقَدْ شَقَّ بَصَرُهُ، فَأَغْمَضَهُ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ الرُّوحَ إِذَا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ، فَضَجَّ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ، فَقَالَ: لا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلَّا بخَيْرٍ؛ فَإِنَّ المَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ على ما تَقُولونَ، ثُمَّ قالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَبِي سَلَمَةَ، وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي المَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ يا رَبَّ العَالَمِينَ، وَافْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ}، (أخرجه مسلم: ٢١٢٧، وأبو داود: ٣١١٨، وابن ماجه: ٤٥٤)،

واتـە: ئوممـو سـەلەمە ﵂ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـە لای ئەبـوو سـەلەمە، لـە کاتێکـدا چـاوی ئەبڵـەق بـوو بـوو، (واتـە: گیانـی سـپاردبوو، بـەڵام چـاوی هـەر کـراوە بـوو)، چـاوی نووقانـدن، (دەسـتی بـە چاویـدا هێنـاو چاوەکانـی نووقانـدن)، دوایـی فەرمـووی: کاتێـك ڕووح دەکێـشرێ، چـاو شـوێنی دەکـەوێ، خەڵکێـك لـە کەسـوکاری (ئەبـوو سـەلەمە) هـاوراو دەنگـە دەنگیـان کـرد، (پێغەمبـەری خـواش ﷺ) فەرمـووی: دوعـای خێـرو پاڕانـەوەی خێـر نەبـێ مەکـەن، چونکـە هەرچـی ئێـوە بیڵێـن، فریشـتەکانیش دەڵێـن: خوایـە گیـرای بکـە، دوایـی فەرمـووی: ئـەی خوایـە! لـە ئەبـوو سـەلەمە خۆشـبەو، پلەکـەی لـە نێـو هیدایەتدراوانـدا بـەرز بکـەوەو، ئەوانـەی دەمێنـن لـە وەچەکـەی چاکەیـان بـۆ قەرەبـوو بکـەوە، لـە ئێمـەو ئەویـش خۆشـبە، ئـەی پـەروەردگاری جیهانییـان و، گۆڕەکـەی فـراوان و ڕۆشـن بکـە.

هـەر لـەو بـارەوە ئـەم دەقـەش هەیـە: {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ ﵁ يَقُـولُ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ: أَلَـمْ تَـرَوْا الإِنْسَـانَ إِذَا مَـاتَ شَـخَصَ بَـصَرُهُ؟ قالـوا: بَـلَى، قـالَ: فَذلِـكَ حِـينَ يَتْبَـعُ بَـصَرُهُ نَفْسَـهُ} (أخرجـه مسـلم: ٢١٢٩).

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﵁ گوتوویەتـی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: ئایـا سـەرەنجتان نـەداوە مـرۆڤ کـە دەمـرێ، چـاوی ئەبڵـەق دەبـێ (چـاوی دەکرێتـەوە)؟ گوتیـان: بـا، فەرمـووی: بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە چـاوی شـوێن ڕووحەکـەی دەکـەوێ (کـە ڕووحەکـە بـەرز دەبێتـەوە، چـاوی تەماشـای دەکات و، چاوەکـەی بـە کراوەیـی دەمێنێتـەوە، بۆیـە سـوننەتە چـاوی بنووقێنـرێ).

## پێنجەم: گریان لەسەر مردوو:

لەو بارەوەش ئەم سێ دەقە دێنین:

١- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ: غَرِيبٌ، وَفِي أَرْضِ غُرْبَةٍ، لَأَبْكِيَنَّهُ بُكَاءً يُتَحَدَّثُ عَنْهُ، فَكُنْتُ قَدْ تَهَيَّأْتُ لِلْبُكَاءِ عَلَيْهِ، إِذْ أَقْبَلَتِ امْرَأَةٌ تُرِيدُ أَنْ تُسْعِدَنِي فَاسْتَقْبَلَهَا رَسُولُ

اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: أَتُرِيدِينَ أَنْ تُدْخِلِي الشَّيْطَانَ بَيْتاً أَخْرَجَهُ اللَّهُ مِنْهُ؟ مَرَّتَيْنِ، وَكَفَفْتُ عَنِ الْبُكَاءِ فَلَمْ أبك} (أخرجه مسلم: ٩٢٢).

واتە: ئوممو سەلەمە رضي الله عنها دەڵێ: کاتێك ئەبوو سەلەمە (واتە: هاوسەری) کۆچی دوایی کرد، گوتم: بابایەکی نەناسراو، لەسەر زەمینێك کە نامانناسن، دەبێ بە جۆرێك بۆی بگریەم باسبکرێ، ئیدی خۆم ئامادەکرد بۆ گریان، ئافرەتێك هات ویستی من بەختەوەر بکات، (کاتی خۆی ئوممو سەلەمە لەسەر مردووی ئەو گریاوە، ویستی ئەویش چاکەی بداتەوەو بۆی بگری)، پێغەمبەری خواش ﷺ رووی تێکردو فەرمووی: ئایا دەتەوێ شەیتان بخەیە نێو ماڵێکەوە کە خوا شەیتانی لێ دەرکردوە؟ دووجاران وای پێ فەرموو، منیش وازم لە گریان هێنا.

٢- {عَنْ أُسَامَةَ بنِ زَيْدٍ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَأَرْسَلَتْ إِلَيْهِ إِحْدَى بَنَاتِهِ تَدْعُوهُ، وَتُخْبِرُهُ أَنَّ صَبِيًّا لَهَا، أَوِ ابْنَاً لَهَا فِي المَوْتِ، فَقَالَ لِلرَّسُولِ: ارْجِعْ إِلَيْهَا، فأَخْبِرْهَا: أَنَّ لِلَّهِ ما أَخَذَ وَلَهُ ما أَعْطَى، وَكُلُّ شيءٍ عِنْدَهُ بِأَجَلٍ مُسَمًّى، فَمُرْهَا فَلْتَصْبِرْ وَلْتَحْتَسِبْ، فَعَادَ الرَّسُولُ، فَقالَ: إِنَّهَا قدْ أَقْسَمَتْ لَتَأْتِيَنَّهَا، قَالَ: فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، وَقَامَ مَعَهُ سَعْدُ بنُ عُبَادَةَ، وَمُعَاذُ بنُ جَبَلٍ، وَانْطَلَقْتُ معهُمْ، فَرُفِعَ إِلَيْهِ الصَّبِيُّ وَنَفْسُهُ تَقَعْقَعُ كَأَنَّهَا فِي شَنَّةٍ، فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ، فَقَالَ لَهُ سَعْدٌ: مَا هَذَا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قالَ: هَذِهِ رَحْمَةٌ جَعَلَهَا اللَّهُ فِي قُلُوبِ عِبَادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللَّهُ مِن عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ} (أخرجه مسلم: ٢١٣٢، والبخاري: ٧٣٧٧، وَأبو داود: ٣١٢٥، والنسائي: ١٨٦٧، وابن ماجه: ٥٨٨).

واتە: ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، یەکێك لە کچەکانی کەسێکی نارده لای، بانگی دەکردو هەواڵی پێدەدا کە منداڵێکی، یاخود کوڕێکی لە حاڵەتی مردن دایە، ئەویش (پێغەمبەر ﷺ) بە نێردراوەکەی فەرموو: بگەڕێوە بۆ لای، خوا هەرچی بیەوێ وەری دەگرێ و هەرچی بیەوێ دەیبەخشێ و، هەموو شت لە لای خوا کاتێکی دیارییکراوی هەیە، فەرمانی پێ بکە با خۆڕاگربێ و پاداشتەکەی لەلای خوا حیساب بکات،

دووبـارە نێردراوەکـەی کچەکـەی هاتـەوەو گوتـی: سـوێندی خـواردوە هـەر دەبـێ بچـی، پێغەمبـەری خـواش ﷺ هەڵسـا، سـەعدی کـوڕی عوبـادەو موعـازی کـوڕی جەبـەل و منیـش لەگەڵیـان چـووم، منداڵەکـە بـۆ لای بەرزکراوەیـە، وەك مەشـکەیەك چـۆن دەهـەژێ، ئـاوا ڕادەوەشـا (لـە کاتـی گیانـەڵادا بـوو)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ چاوەکانـی فرمێسـکیان پێداهـات، سـەعد پێـی گـوت: ئەمـە چییـە ئـەی پێغەمبـەری خـوا؟ فەرمـووی: بەزەییـە، خـوا خسـتوویەتە نێـو دڵـی بەندەکانیـەوەو، خـواش تەنیا بەزەیـی بـە بەنـدە بـە بەزەییەکانیـدا دێتـەوە.

**٣- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما، قَالَ: اشْتَكَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ شَكْوَى لَهُ، فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ مَعَ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَيْهِ، وَجَدَهُ فِي غَاشِيَةِ أَهْلِهِ، فَقَالَ: «قَدْ قَضَى؟» قَالُوا: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ، فَبَكَى النَّبِيُّ ﷺ، فَلَمَّا رَأَى القَوْمُ بُكَاءَ النَّبِيِّ ﷺ بَكَوْا، فَقَالَ: أَلاَ تَسْمَعُونَ! إِنَّ اللَّهَ لاَ يُعَذِّبُ بِدَمْعِ العَيْنِ، وَلاَ بِحُزْنِ القَلْبِ، وَلَكِنْ يُعَذِّبُ بِهَذَا، وَأَشَارَ إِلَى لِسَانِهِ أَوْ يَرْحَمُ} (أخرجه مسلم: ٢١٣٤، والبخاري: ١٣٠٤).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر رضي الله عنهما دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: سـەعدی کـوڕی عوبـادە نەخـۆش کـەوت، پێغەمبـەری خـواش ﷺ چـوو بـۆ لای و سـەردانی کـرد، عەبدوڕرەحـمانی کـوڕی عـەوف و سـەعدی کـوڕی ئەبـی وەققـاص و عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود لـە خزمەتیـدا بـوون، کاتێـك لێـی وەژوور کـەوت، کـەس و کارەکەی دەوریـان دابـوو، فەرمـووی: تـەواو بـووە؟ گوتیـان: نەخێـر ئـەی پێغەمبـەری خـوا، پێغەمبـەری خـواش ﷺ گریـا، کاتێـك خەڵکەکـە گریانـی پێغەمبـەری خوایـان ﷺ بینـی، ئەوانیـش گریـان، ئەویـش فەرمـووی: ئایـا نابیسـتن! بێگومـان خـوا بەهـۆی فرمێسـکی چـاوو و پـەژارەو خەمـی نێـو دڵـەوە سـزا نـادات، بەڵکـو بەهـۆی ئەمـەوە سـزا دەدات - ئامـاژەی کـرد بـۆ زمانـی - یاخـود بەزەیـی دەنوێنـێ (ئەگـەر مـرۆڤ بـە زمـان قسـەی خـراپ بـکات، سـزای دەدات و، ئەگـەر قسـەی بـاش بـکات، خـوا بەزەیـی لەگەڵـدا دەنوێنـێ).

## شەشەم: خۆڕاگریی و شین نەگێڕان:

لەو بارەوەش پێنج دەقان دێنین:

**١- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ أَنَّ رَسُول اللهِ ﷺ رَأَى امْرَأَةً تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: اتَّقِي اللَّهَ وَاصْبِرِي، فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِي أَنْتَ بِمُصِيبَتِي! فَلَمَّا ذَهَبَ، قِيْلَ لَهَا: إِنَّه رَسُولُ اللهِ، فَأَخَذَهَا مِثْلُ الْمَوْتِ، فَأَتَت بَابَهُ فَلَمْ تَجِد عَلَيْهِ بَوَّابَيْنِ، فَقَالَت: لَمْ أَعْرِفْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُوْلَى}(أخرجه مسلم: ٢١٣٧)**

واتـە: ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ﵁ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە لای ئافرەتێکـدا تێپـەڕی بـۆ منداڵێکـی دەگریـا (بـۆ کوڕێکـی گچکـەی)، ئەویـش پێـی فەرمـوو: پارێـز لـە خـوا بکـەو خـۆت ڕابگـرە، ئەویـش پێیگـوت: ئنجـا تـۆ چ باکـی بەڵایەکتـە کـە بەسـەر منـدا هاتـوە! کاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆیـی، پێـی گوتـرا: ئـەوە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو، ئیـدی حاڵەتێکـی بەسـەردا هـات وەك مـردن، (واتـە: زۆر دڵتەنـگ بـوو)، هاتـە دەرگای پێغەمبـەر ﷺ هیـچ دەرگاوانـی لەبـەردەم دەرگاکەیـدا نەبینـی، گوتـی: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! مـن تـۆم نەناسـی، ئەویـش فەرمـووی: خۆڕاگریـی لـە کاتـی یەکـەم تـووش بووندایـە.

واتـە: سـەرەتای بـەڵا کـە بەسـەرت دێ، ئـەو کاتـە دەبـێ خـۆت ڕابگـری، ئەگەرنـا دوایـی وردە وردە فەرامۆشـییت بـۆ دێ.

**٢- {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عُمَرَ ﵄ أَنَّ حَفْصَةَ بَكَتْ عَلَى عُمَرَ، فَقالَ: مَهْلًا يا بُنَيَّةُ؛ أَلَمْ تَعْلَمِي أَنَّ رَسولَ اللهِ ﷺ قالَ: إنَّ المَيِّتَ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ} (أخرجه مسلم: ٢١٣٩، والنسائي: ١٨٤٧).**

واتـە: لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەرەوە ﵄ گێڕدراوەتـەوە، کـە حەفصـە ﵄ بـۆ عومـەر گریـاوە (کاتێـك عومـەری کـوڕی خەتتاب پێکـراوە. پێـش مردنی بـۆی گریاوە)، ئەویـش گوتـی: ئـەی کچەکـەی خـۆم! لەسـەرەخۆبە، ئایـا نازانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: مـردوو بـە هـۆی لەسـەر گریانـی کەسـوکارەکەیەوە ئـازار دەدرێ؟!.

**٣-** هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین: {**قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما: **فَلَمَّا مَاتَ عُمَرُ** رضي الله عنه، **ذَكَرْتُ ذَلِكَ لِعائِشَةَ** رضي الله عنها، **فَقَالَتْ: رَحِمَ اللهُ عُمَرَ، واللهِ ما حَدَّثَ رَسُولُ اللهِ** ﷺ **بقولِ: إِنَّ اللهَ لَيُعَذِّبُ المُؤْمِنَ بِبُكَاءِ أَحَد، ولَكِنَّ رَسولَ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ: إِنَّ اللَّهَ لَيَزِيدُ الكَافِرَ عَذَابًا بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عَلَيْهِ، وَقَالَتْ عَائِشَةُ: حَسْبُكُمُ القُرْآنُ:** ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾﴾ **الأنعام}** (**أخرجه مسلم: ٢١٤٧**).

واتــە: ئیبنــو عەببــاس رضي الله عنهما دەڵــێ: کاتــێ عومــەر رضي الله عنه وەفاتــی کــرد، ئــەوەم بــۆ عائیشــە رضي الله عنها باسـکرد، ئەویـش گوتـی: خـوا بەزەیـی بێتـەوە بـە عومـەردا رضي الله عنه، بـە خـوا پێغەمبــەری خــوا ﷺ نەیفەرمــووە: بــڕوادار ئەگــەر کەســێك لەســەری گریــا، بەهــۆی ئــەوەوە ئــازار دەدرێ، بەڵکــو فەرمــووی: خــوا بــۆ مرۆڤــی کافــر ســزا زیــاد دەکات، بەهــۆی کــەس و کاری کــە لەســەری دەگریــەن، عائیشــە رضي الله عنها گوتــی: قوڕئانتــان بەســە کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٦٤﴾﴾ **الأنعام**، واتــە: هیــچ کەســێك گوناهــی کەســی دیکــە هەڵناگــرێ.

**٤-** هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین: {**ذُكِرَ عِنْدَ عَائِشَةَ** رضي الله عنها **قَوْلُ ابْنِ عُمَرَ** رضي الله عنهما: **المَيِّتُ يُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِهِ عليه، فقالَتْ: رَحِمَ اللَّهُ أَبَا عبدِ الرَّحْمَنِ، سَمِعَ شيئًا فَلَمْ يَحْفَظْهُ، إِنَّمَا مَرَّتْ علَى رَسولِ اللهِ** ﷺ **جِنَازَةُ يَهُودِيّ، وَهُمْ يَبْكُونَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: أَنْتُمْ تَبْكُونَ، وإنَّه لَيُعَذَّبُ**} (**أخرجه مسلم: ٢١٥٠، والبخاري: ٣١٧٨، وأبو داود: ٣١٢٩، والنسائي: ٩٥٤**).

واتــە: لــە لای عائیشــە رضي الله عنها قســەی عەبدوڵــڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما باســکرا کــە دەڵێ: مــردوو بــە هــۆی ئــەوەوەی کــەس و کاری لەســەری دەگریــەن، ســزا دەدرێ، ئەویــش گوتــی: خــوا بەزەیــی بێتــەوە بــە ئەبــوو عەبدوڕڕەحمانــدا (واتــە: عەبدوڵــڵای کــوڕی عومــەر)دا شــتێکی بیســتوە بــەڵام چاکــی لەبــەر نەکــردوە، پێغەمبــەری خــوا ﷺ جەنــازەی جوولەکەیەکــی بــەلادا هــات، لەســەری دەگریــان، فەرمــووی: ئێــوە لەســەری دەگریــن، ئەویــش ئــەوە ســزا دەدرێ.

**٥-** هەر لەوبارەیەوە ئەم دەقەش دێنین: {**عَنْ أَبِي مَالِكٍ** رضي الله عنه **أَنَّ النَّبِيَّ** ﷺ **قَالَ: أَرْبَعٌ مِنْ أُمَّتِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ لاَ يَتْرُكُونَهُنَّ: الْفَخْرُ فِي الأَحْسَابِ، وَالطَّعْنُ فِي الأَنْسَابِ، وَالإِسْتِسْقَاءُ بِ**

النُّجُومِ، وَالنِّيَاحَةُ، وَإِنَّ النَّائِحَةَ إِذَا لَمْ تَتُبْ قَبْلَ مَوْتِهَا، تُقَامُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَعَلَيْهَا سِرْبَالٌ مِنْ قَطِرَانٍ، وَدِرْعٌ مِنْ جَرَبٍ} (أخرجه: مسلم: ٢١٥٧).

واتە: ئەبوو مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: چوار شت لە ئوممەتەكەم دا لە نەرێتی نەفامیین، وازیان لێ ناهێنن: شانازییكردن بە حەسەبەوە (من لە تۆ چاكترم ... هتد)و، تانەدان لە نەسەب و ڕەچەڵەك و، داوای بارانكردن بەهۆی ئەستێرانەوەو، شین گێڕان، (فەرمووی:) ئافرەتی شینگێڕ ئەگەر پێش مردنی تەوبە نەكات و نەگەڕێتەوە، لە ڕۆژی قیامەتدا هەڵدەستێنرێ كە پۆشاكێكی قەترانی لەبەرەو لەچكێكی گەڕیی لەسەرە، (واتە: پێیان سزا دەدرێ).

زانایان زۆریان قسە لە بارەی ئەو دەقە: (**إن الميِّت ليُعَذَّب ببكاء أهله عليه**) كردوە، بەڵام پێم وایە باشترین لێكدانەوە بۆی ئەوەیە كە بگوترێ، مەبەست لە: (**ليُعذّب**)، نارەحەتیی و ئازار چێژتنی مردووەكەیە، بەهۆی گریانی خزمەكانیەوە، كە دەزانی گوناهكارو سزابارن.

## حەوتەم: شۆردنی مردوو:

**{عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: تُوُفِّيَتْ إِحْدَى بَنَاتِ النَّبِيِّ ﷺ فَخَرَجَ فَقَالَ: اغْسِلْنَهَا ثَلَاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ، إِنْ رَأَيْتُنَّ، بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَاجْعَلْنَ فِي الآخِرَةِ كَافُورًا، أَوْ شَيْئًا مِنْ كَافُورٍ، فَإِذَا فَرَغْتُنَّ فَآذِنَّنِي، قَالَتْ: فَلَمَّا فَرَغْنَا، آذَنَّاهُ، فَأَلْقَى إِلَيْنَا حِقْوَهُ، فَقَالَ: أَشْعِرْنَهَا إِيَّاهُ} (أخرجه مسلم: ٢١٦٥، والبُخاري: ١٢٦٠، وأبو داود: ٣١٤٦، والنسائي: ١٨٩٢، وابن ماجه: ١٤٥٩).**

واتە: ئوممو عەتییە ﷺ دەڵێ: كچێكی پێغەمبەر ﷺ وەفاتی كرد، هاتەدەرو فەرمووی: سێ جاران بیشۆن، یان پێنج جار، یان زیاتر لەوەش، ئەگەر بە چاكتان زانی، بە ئاوو و سیدر بیشۆن، (سیدر: جۆرە گیایەكی بۆنخۆشە) و، جاری كۆتاییان با كافووریشی تێدابێ و، هەر كاتێك تەواو بوون ئاگادارم

بکەنەوە، کاتێك تەواوبووین ئاگادارمان کردەوە، ئەویش پۆشاکی خوار پشتێندی (بیجامەکەی) خۆی بۆ هەڵداین (وێیداین)، فەرمووی: با ئەمە لە لای پێستیەوە بێ، واتە: لە ژێر کفنەکەیەوە لەسەر پێستی ئەم پۆشاکەی بەسەردا بدەن.

کەواتە: مردوو سێ جار، پێنج جار، حەوت جار، دەشۆررێ و گرنگ ئەوەیە بە شێوەی تاك بشۆررێ.

## هەشتەم: کفنکردنی مردوو:

لەو بارەوەش دوو دەق دێنین:

**١- {عَنْ خَبَّابِ بْنِ الأَرَتِّ رضي الله عنه قَالَ: هَاجَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَبِيلِ اللَّهِ نَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ، فَوَجَبَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَضَى لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا، مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ، قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ فَلَمْ يُوجَدْ لَهُ شَيْءٌ يُكَفَّنُ فِيهِ إِلاَّ نَمِرَةٌ، فَكُنَّا إِذَا وَضَعْنَاهَا عَلَى رَأْسِهِ خَرَجَتْ رِجْلاَهُ، وَإِذَا وَضَعْنَاهَا عَلَى رِجْلَيْهِ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ضَعُوهَا مِمَّا يَلِي رَأْسَهُ، وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلَيْهِ الإِذْخِرَ»، وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهُوَ يَهْدِبُهَا } (أخرجه مسلم: ٢١٧٤، والبخاري: ٦٤٤٨، وأبو داود: ٢٨٧٦، والترمذي: ٣٨٥٣، والنسائي: ١٩٠٢).**

واتە: خەبابی کوڕی ئەڕەت رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە کۆچمان کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو لە پێناوی خوادا، مەبەستمان ڕەزامەندیی خوا بوو، ئنجا پاداشتمان لەسەر خوا پێویست بوو، هەمانە تێپەڕی و هیچ لە پاداشتەکەی نەخوارد لە دنیا (لە دنیادا هیچی نەبینی)، لەوانە: موصعەبی کوڕی عومەیر، کە لە جەنگی ئوحوددا کوژرا، هیچ شتێك نەبوو پێی کفن بکەین، مەگەر پۆشاکێك {(نَمِرَةٌ) جۆرە پۆشاکێکە} ئەگەر لە لای سەریمان دانابایە، لاقی دەردەکەوتن و، ئەگەر لە لای لاقەکانیمان دانابایە، سەری دەردەکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لای سەری داپۆشن و لای لاقیشی گیای (الإِذْخِرَ)ی بخەنە سەر، خەبباب دەڵێ: هەشمانە میوەکەی بۆی پێگەیوەو ئێستا دەیچنێ، (واتە: لە دنیاشدا لێی بەهرەمەند بووە).

٢- {وَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: إِذَا كفَّنَ أَحَدُكُم أَخَاهُ، فَلْيُحسِّنْ كَفَنَهُ} (أخرجه مسلم: ٢١٨٢، وأبو داود: ٣١٤٨، والنسائي: ٢٠١٣).

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کات یەکێکتان برایەکەی خۆی کفن کرد، با کفنێکی باشی بکات، بە ڕێکیی کفنی بکات.

## نۆیەم: داپۆشینی مردوو:

سوننەتە کەسێك کە دەکەوێتە حاڵەتی مەرگ و مردنەوەو گیان دەسپێرێ، داپۆشرێ:

{عَنْ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله عنها قَالَتْ: سُجِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حِينَ مَاتَ بِثَوْبِ حِبَرَةٍ} (أخرجه مسلم: ٢١٨٠، والبخاري: ٥٨١٤، وأبو داود: ٣١٢٠).

واتە: عائیشە دایکی بڕواداران رضي الله عنها گوتوویەتی: کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردوە، بە بەرگێکی (حِبَرَةٍ) (جۆرە بەرگێکە) داپۆشراوە، (پەشتەماڵێك، پۆشاکێکیان بەسەر دەم و چاوی داداوە).

## دەیەم: بەخێرایی بردنی مردوو بۆ گۆڕستان:

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَسْرِعُواْ بالجَنَازَةِ، فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا، وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ، فَشَرٌّ تَضعونَهُ عَنْ رِقَابكُمْ} (أخرجه مسلم: ٢١٨٣، والبخاري: ١٣١٥، وأبو داود: ٣١٨١، والترمذي: ١٠١٥، والنسائي: ١٠٩٩).

واتە: ئەبوو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە خێرایی تەرم بە خاك بسپێرن، ئەگەر چاك بێ (ئەو جەنازەیە کەسێکی باش بووبێ)، بەرەو لای خێرو چاکە دەیبەن و، ئەگەر جگە لەوەش بێ، خراپەیەکە زوو لەسەر ملی خۆتانی لادەبەن.

## یازدەیەم: نوێژی سەر مردوو و ناشتنی مردوو:

لەو بارەشەوە چوار دەقان دێنین:

**١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: مَنْ شَهِدَ الْجِنَازَةَ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا، فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ شَهِدَهَا حَتَّى تُدْفَنَ، فَلَهُ قِيرَاطَانِ، قِيلَ: وَمَا الْقِيرَاطَانِ؟ قَالَ: مِثْلُ الجَبَلَينِ العَظِيْمِين} (أخرجه مسلم: ٢١٨٦، والبخاري: ١٣٢٥، والنسائي: ١٩٩٤).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﵁ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك ئامادەی جەنازە بوو، هەتا نوێژی لەسەر دەکرێ، قیراتێك پاداشتی هەیەو، هەر کەسێك ئامادەی بوو تاکو بە خاك دەسپێردرێ، دوو قیراتی هەن، گوترا: دوو قیراتەکان چین؟ فەرمووی: (پاداشتن) بە ئەندازەی دوو چیای مەزن.

**٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁، أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ خَرَجَ مَعَ جَنَازَةٍ مِنْ بَيْتِهَا، وَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ تَبِعَهَا حَتَّى تُدْفَنَ، كَانَ لَهُ قِيرَاطَانِ مِنْ أَجْرٍ، كُلُّ قِيرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ، وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ رَجَعَ، كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُحُدٍ} (أخرجه مسلم: ٢١٩٢، وأبو داود: ١٣٢٥).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﵁ گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، فەرموویەتی: هەر کەسێك لەگەڵ جەنازەیەك لە ماڵەوەی بچێتە دەرێ و، شوێنی بکەوێ، تاکو نوێژی لەسەر دەکات، دوایی شوێنی بکەوێ، تاکو دەشاردرێتەوەو بە خاك دەسپێردرێ، دوو قیرات پاداشتی هەن، هەر کام لەو قیراتانە هێندەی چیای ئوحودن و، هەر کەسێك نوێژی لەسەر بکات و بگەڕێتەوە، بە ئەندازەی چیای ئوحود، پاداشتی هەیە.

کەواتە: ئەگەر ئینسان بۆی بکرێ، لەگەڵ مردوودا بچێت بۆ سەر گۆڕستان، بۆ بە خاك سپاردنی، جگە لەوەی نوێژیشی لەسەر کردوە، مانای وایە پاداشتەکەی زۆر زیاترو گەورەترە.

٣- {عَن عَائِشَة رضي الله عنها عَنِ النَّبِي ﷺ قَالَ: مَا مِنْ ميِّتٍ يُصَلِّي عليْهِ أُمَّةٌ مِنَ المُسْلِمِيْنَ، يبْلُغُونَ أنْ يَكُونُوا مَائَةً، فَيَشْفَعونَ لَهُ، إلاَّ شُفِّعُوا فِيهِ} (أخرجه مسلم: ٢١٩٥، والترمذي: ١٠٢٩، والنسائي: ١٩٩١).

واتـە: دایکـمان عائیشــە رضي الله عنها لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ گێڕاویەتـەوە، فەرموویەتـی: هیـچ مردوویـەك نامـرێ، كۆمەڵێـك لـە مسـوڵمانان بگەنـە سـەد (١٠٠) كـەس نوێـژی لەسـەر بكـەن، تـكای بـۆ بكـەن، مەگـەر دەكرێـن بـە تـكاكاری، واتـە: تـكای ئـەوان لەبـارەی ئـەو كەسـەوەی تـكای بـۆ دەكـەن، وەردەگیـرێ و خـوا لێـی خـۆش دەبـێ.

٤-{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعتُ النَّبيَّ ﷺ يَقُولُ: مَا مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ يَمُوتُ ، فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلاً ، لاَ يُشْرِكُونَ باللهِ شَيْئاً ، إلاَّ شَفَّعَهُم اللهُ فِيهِ} (أخرجه مسلم: ٢١٩٦، وأبو داود: ٣١٧٠، وابن ماجه: ١٤٤٩)

واتـە: ئیبنـو عەبـاس رضي الله عنهما دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو، دەیفەرموو: هیـچ پیاوێكـی مسـوڵمان نیـە كـە دەمـرێ، چـل پیـاو لەسـەر جەنازەكـەی بوەسـتن، هاوبـەش بـۆ خـوا دانەنێـن، مەگـەر خـوا دەیانكاتـە تـكاكار بـۆی.

واتە: تكای ئەوان لەبارەی ئەو كەسەوە قبووڵ دەفەرموێ و لێی دەبووری.

### دوازدەیەم: ئەو مردووەی ستایش یاخود زەم دەكرێ لەلایەن خەڵكەوە:

لەو بارەشەوە دوو دەقان دێنین:

١- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مُرَّ بِجِنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا خَيْراً، فَقَالَ النَّبِيّ ﷺ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجِنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّاً، فَقَالَ نَبِيّ اللَّهِ ﷺ: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، فَقَالَ عُمَر رضي الله عنه: فِدَىً لَكَ أَبِي وَأُمِّي، مُرَّ بِجِنَازَةٍ فَأُثْنِي عَلَيْهَا خَيْراً فَقُلْت: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ، وَمُرَّ بِجِنَازَةٍ فَأُثْنِيَ عَلَيْهَا شَرًّا فَقُلْت: وَجَبَتْ وَجَبَتْ وَجَبَتْ؟ فَقَالَ رَسُول اللَّه ﷺ: مَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ خَيْراً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّة، وَمَنْ أَثْنَيْتُمْ عَلَيْهِ شَرّاً وَجَبَتْ لَهُ النَّار، أَنْتُمْ شُهَدَاء اللَّه فِي الْأَرْض، أَنْتُمْ شُهَدَاء اللَّه فِي الْأَرْض، أَنْتُمْ شُهَدَاء اللَّه فِي الْأَرْض} (أخرجه مسلم: ٢١٩٧، والنسائي: ١٩٣١).

واتــە: ئەنەســی کــوڕی مالیــك ﷺ دەگێڕێتــەوە، دەڵــێ: جەنازەیــەك تێپەڕێــنرا بــە لای پێغەمبــەردا ﷺو (هاوەڵانیــش لــەوێ بــوون)، باســی چاکــەکاری پێغەمبــەری خــوا ﷺ ســێ جــاران فەرمــووی: پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، دوایــی جەنازەیەکــی دیکــە تێپەڕێــنرا، خەڵــك بــە خــراپ باســی کــرد، پێغەمبەریــش ﷺ فەرمــووی: پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، عومــەر ﷺ گوتــی: بــاب و دایکــم بــە قوربانــت بــن، جەنازەیــەك تێپەڕێــنرا، بــە چاکــە باســی کــرا، ســێ جــاران فەرمــووت: پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، جەنازەیەکیــش تێپەڕێــنرا، بــە خراپــە باســی کــرا، ســێ جــاران فەرمــووت: پێویســت بــوو، پێویســت بــوو، پێویســت بــوو؟، پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمــووی: هــەر کەســێك لــە ئێــوە بــە چاکــە باســی بکــەن، (ســتایش و مەدحــی بکــەن)، بەهەشــت بــۆی پێویســت دەبــێ و، هــەر کەســێك ئێــوە بــە خراپــە باســی بکــەن، ئاگــر بــۆی پێویســت دەبــێ، ئێــوە شــایەدەکانی خــوان لەســەر زەوی، ئێــوە شــایەدەکانی خــوان لەســەر زەوی، ئێــوە شــایەدەکانی خــوان لەســەر زەوی.

**٢-{عَنْ أَبِي قَتَادَةَ بْنِ رِبْعِيّ ﷺ أَنَّهُ كَانَ يُحَدِّثُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ مُرَّ عَلَيْهِ بِجِنَازَةٍ، فَقَالَ: مُسْتَرِيحٌ، وَمُسْتَرَاحٌ مِنْهُ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ مَا الْمُسْتَرِيحُ وَالْمُسْتَرَاحُ مِنْهُ؟ قَالَ: الْعَبْدُ الْمُؤْمِنُ يَسْتَرِيحُ مِنْ نَصَبِ الدُّنْيَا وَأَذَاهَا إِلَى رَحْمَةِ اللهِ، وَالْعَبْدُ الْفَاجِرُ يَسْتَرِيحُ مِنْهُ العِبَادُ وَالْبِلادُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُ} (أخرجه مسلم: ٢١٩٩، والبخاري:٦٥١٣ ، والنسائي:١٩٣٠).**

واتــە: ئەبــوو قەتــادەی کــوڕی ڕیبعیــی ﷺ، باســی کــردوە کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ جەنازەیەکــی بــەلادا تێپەڕیــوە، فەرموویەتــی: ئاســوودەیەو، خەڵکیــش لــە دەســتی ئاســوودەن، گوتیــان: ئــەی پێغەمبــەری خــوا ﷺ! ئاســوودەو خەڵــك لــە دەســت ئاســوودەبوو، چییــە؟ فەرمــووی: بەنــدەی بــڕوادار کــە دەمــرێ لــە ناڕەحەتیــی دنیــا ئاســوودە دەبــێ و، بەنــدەی تاوانباریــش کــە دەمــرێ، بەنــدەکان و وڵات و دارو درەخــت و ئــاژەڵان لــە دەســتی ڕزگاریــان دەبــێ و ئاســوودە دەبــن.

## سێزدەیەم: نوێژی مردوو:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، فَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ} (أخرجه مسلم: ٢٢٠١، والبخاري: ١٣٣٣ ، وأبو داود: ٣٢٠٤، والنسائي: ١٩٧٩).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی مردنی نەجاشیی کرد لەو ڕۆژەدا کە تێیدا مرد، ئیدی خەڵکی بردە نوێژگەو، چوار (**أَللە أَكْبَر**)ی کردن لە نوێژی مردوودا.

وردەکارییەکانی نوێژی مردوو لە کتێبە شەرعییەکاندا هاتوون:

١- دوای (**ألله أكْبَر**)ی یەکەم سووڕەتی فاتیحە دەخوێنرێ.

٢- دوای (**ألله أكْبَر**)ی دووەم صەڵاوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ دەدرێ.

٣- دوای هی سێیەم دووعا بۆ مردووەکە دەکرێ.

٤- دوای چوارەمیش دووعا بە گشتیی و بۆ مردووەکەش دەکرێ.

## چواردەیەم: نوێژ لەسەر گۆڕ:

ئایا دروستە نوێژ لەسەر گۆڕ بکرێ؟

لەو بارەوەش دوو دەقان دێنین:

**١- {عَنِ الشَّعْبِي رحمه الله: «أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ صَلَّى عَلَى قَبْرٍ بَعْدَمَا دُفِنَ، فَكَبَّرَ عَلَيْهِ أَرْبَعاً} (أخرجه مسلم: ٢٢٠٨، والبخاري:١٣٤٠، وأبو داود: ٣١٩٦، والترمذي: ١٠٧٣، والنسائي: ٢٠٢٣، وابن ماجة: ١٥٣٠).**

واتە: لە شەعبییەوە هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر گۆڕێك کردوە، دوای ئەوەی (خاوەنەکەی تێیدا) شێردراوەتەوە، چوار (**أَللە أَكْبَر**)ی لەسەر کردوون (و نوێژەکەی لەسەر کردوە).

**٢-{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ، كَانَتْ تَقُمُّ الْمَسْجِدَ «أَوْ شَابًّا»، فَفَقَدَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَأَلَ عَنْهَا «أَوْ عَنْهُ» فَقَالُوا: مَاتَ، قَالَ: «أَفَلاَ كُنْتُمْ آذَنْتُمُونِي»؟ قَالَ: فَكَأَنَّهُمْ صَغَّرُوا أَمْرَهَا «أَوْ أَمْرَهُ» فَقَالَ: «دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ»، فَدَلُّوهُ، فَصَلَّى عَلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذِهِ الْقُبُورَ مَمْلُوءَةٌ ظُلْمَةً عَلَى أَهْلِهَا، وَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنَوِّرُهَا لَهُمْ بِصَلاَتِي عَلَيْهِمْ»} (أخرجه مسلم: ٢٢١٢، والبخاري: ١٣٣٧ ، وأبو داود: ٣٢٠٣، وابن ماجه: ١٥٢٧).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﵁ دەڵێ: ئافرەتێکی ڕەش کە مزگەوتی خاوێن دەکردەوە، یان «گەنجێکی ڕەش» وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیبینی، لەبارەیەوە پرسی (لەبارەی ئافرەتەکە یان گەنجەکە)، گوتیان: مردووە، فەرمووی: بۆچی ئاگادارتان نەدەکردمەوە؟ دەڵێ: وەك لەوە بە بچووکتریان زانیبێ کە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار بکەنەوە! فەرمووی: گۆڕەکەیم پیشان بدەن، پیشانیان داو نوێژی لەسەر کرد، فەرمووی: ئەم گۆڕانە پڕن لە تاریکیی لەسەر ئەوانەی تێیان دان، خوای زاڵی پایەداریش ڕووناکیان دەکاتەوە بۆیان بەهۆی پاڕانەوەو نوێژی منەوە.

## پازدەیەم: هەڵسان بۆ جەنازە:

**{عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ الْعَدَوِيِّ ﵁، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ} (أخرجه مسلم: ٢٢١٤، والبخاري: ١٣٠٨، وأبو داود: ٣١٧٢، والترمذي: ٢٠٤٢، والنسائي: ١٩١٥، وابن ماجه: ١٥٤٢).**

واتە: عامیری کوڕی ڕەبیعەی عەدەویی ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێك جەنازەتان بینی لەبەری هەڵسن، تاکو لێتان تێدەپەڕێ، یاخود دادەنرێ.

## شازدەیەم: پاڕانەوە بۆ مردوو لە نوێژدا:

{عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الْأَشْجَعِيِّ رضي الله عنه قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَصَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ، يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، وَاعْفُ عَنْهُ، وَعَافِهِ، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بِمَاءٍ وَثَلْجٍ وَبَرَدٍ، وَنَقِّهِ مِنَ الْخَطَايَا كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الْأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ، وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ، وَقِهِ فِتْنَةَ الْقَبْرِ وَعَذَابَ النَّارِ»، قَالَ عَوْفٌ: فَتَمَنَّيْتُ أَنْ لَوْ كُنْتُ أَنَا الْمَيِّتَ، لِدُعَاءِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَلَى ذَلِكَ الْمَيِّتِ} (أخرجه مسلم: ٢٢٢٩، والترمذي: ٢٠٢٥، والنسائي: ١٩٨٣)

واتە: عەوفی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر جەنازەیەك كرد (لە نوێژەكەیدا)، دەیفەرموو: ئەی خوایە! لێی ببوورەو بەزەییت پێیدابێ، سەلامەتی بكەو چاوپۆشیی لێ بكە، ڕێز لە هاتنی بگرە وەك میوان، شوێنەكەی بۆ فراوان بكە، بە ئاوو بەفرو تەرزە بیشۆو، پاكی بكەوە لە گوناهان وەك چۆن پۆشاكی سپی پاك دەكرێتەوە لە چڵك، مەنزڵگایەكی بۆ قەرەبوو بكەوە، باشتر لە مەنزڵگای خۆی لە دنیاو، كەس و كارێك باشتر لە كەس و كارەكەی و، هاوسەرێك باشتر لە هاوسەرەكەی، بیخە بەهەشتەوەو لە بەڵای گۆڕو سزای ئاگر بیپارێزە، عەوف دەڵێ: خۆزگەم خواست من ئەو مردووە بوومایە، بە هۆی پاڕانەوەی پێغەمبەری خواوە بۆ ئەو مردووە.

## حەڤدەیەم: ئایا لە كاتی نوێژی مردوودا، ئیمام لە كوێ دەوەستێ؟

{عَنْ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ وَسَطَهَا} (أخرجه مسلم: ٢٢٣١، والبخاري: ١٣٣٢، وأبو داود: ٣١٩٥، والترمذي: ١٠٣٥، والنسائي: ١٩٧٨، وابن ماجه: ١٤٠٣).

واتە: سەمورە رضي الله عنه دەڵێ: لە پشت پێغەمبەری خواوە ﷺ وەستام، نوێژی

لەسەر ئافرەتێك كرد بە زەیستانیی مردبوو لەسەر منداڵ، پێغەمبەر ﷺ لە لای نێوەڕاستی وەستا.

بەڵام بۆ پیاوان لە لای سەریەوە دەوەستێ.

## هەژدەیەم: ڕێگریی كردن لە گەچكاریی و بینا دروست كردن لەسەر گـۆڕ:

**{عَـنْ جَابِـرٍ رضي الله عنه، قَـالَ: نَهَـى رَسُـولُ اللـهِ ﷺ أَنْ يُجَصَّـصَ القَـبْرُ، وَأَنْ يُقْعَـدَ عَلَيْـهِ، وَأَنْ يُبْنَـى عَلَيْـهِ} (أخرجـه مسـلم: ٢٢٤٢، وأبـو داود: ٣٢٢٥، والترمـذي: ١٠٥٢، والنسـائي: ٢٠٢٧، وابـن ماجـه: ٢٥٦٣).**

واتـە: جابیـر رضي الله عنه دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕێگریـی كـردوە كـە گـۆڕ گەچكاریی بكـرێ، یاخـود لەسـەری دابنیشـتێنرێ، یاخـود بینـای لەسـەر بكرێ.

## نۆزدەیەم: دانیشتن لەسەر گۆڕ:

### لەو بارەوەش دوو دەقان دێنین:

**١- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتَحْرِقَ ثِيَابَهُ، فَتَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ؛ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ} (أخرجه مسلم: ٢٢٤٥).**

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی: ئەگـەر یەكێكتـان لەسـەر پشـۆكەیەك دابنیشـێ، پۆشـاكەكەی بسـووتێنێ، دوایـی پێستەكەشـی بسـووتێنێ، باشـترە بـۆی لـەوەی لەسـەر گۆڕێـك دابنیشـێ.

**٢- {عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: لاَ تُصَلُّوا إِلَى الْقُبُورِ، وَلَا تَجْلِسُوا عَلَيْهَا} (أخرجه مسلم: ٢٢٤٨).**

واتـە: ئەبـوو مەرسـەدی غەنەویـی ﷺ دەڵـێ: گوێـم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوو، دەیفەرمـوو: نوێـژ بـەرەو گـۆڕ مەکەن و، لەسەریشـیان دامەنیشـن.

## بیستەم: نوێژ لەسەر جەنازە لە مزگەوت:

**{عَنْ عَبْدِ اللَّـهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، أَنَّ عَائِشَـةَ ﷺ، أَمَـرَتْ أَنْ يُمَـرَّ، بِجَنَـازَةِ سَـعْدِ بْـنِ أَبِي وَقَّـاصٍ فِي الْمَسْـجِدِ، فَتُصَـلِّيَ عَلَيْـهِ، فَأَنْكَـرَ النَّـاسُ ذَلِـكَ عَلَيْهَـا، فَقَالَـتْ، مَـا أَسْرَعَ مَـا نَـسِيَ النَّـاسُ، مَـا صَـلَّى رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ عَـلَى سُـهَيْلِ ابْـنِ الْبَيْضَـاءِ إِلاَّ فِي الْمَسْـجِدِ} (أخرجـه مسـلم: ٢٢٤٩، والترمـذي: ١٠٣٣، والنسـائي: ١٩٦٧).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـر دەڵـێ: عائیشـە ﷺ فەرمانـی کـرد جەنـازەی سـەعدی کـوڕی ئەبـی وەققـاص بـە لایـدا تێبپەڕێنرێ بـە مزگـەوت دا، (چونکـە ئـەو ماڵەکـەی بەسـەر مزگەوتـەوە بـوون)، بـۆ ئـەوەی نوێـژی لەسـەر بـکات، خەڵـك نکووڵییـان لێیکـرد، ئەویـش گوتـی: خەڵـك چەنـد زوو شـتی لـە بیـر دەچێتـەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەسـەر سـوهەیلی کـوڕی بەیـزا لـە مزگـەوت نوێـژی کـرد.

## بیست و یەکەم: چوونە سەر گۆڕستان:

### لەو بارەوەش سێ دەقان دێنین:

**١- {عَنْ عَائِشَةَ ﷺ، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كُلَّمَا كَانَ لَيْلَتها مِنْ رَسُول اللَّه ﷺ يَخْرُجُ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ إِلى البَقِيعِ، فَيَقُولُ: السَّلامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤمنِينَ، وأَتَاكُمْ مَا تُوعَدُونَ، غَدَاً مُؤَجَّلُونَ، وإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لاحِقُونَ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لأَهْلِ بَقِيعِ الغَرْقَدِ} (أخرجه مسلم: ٢٢٥٢، والنسائي: ٢٠٣٨).**

واتـە: دایکـمان عائیشـە ﷺ، دەڵـێ: هـەر کاتێـك پێغەمبـەری خوا ﷺ نۆرە شـەوی منـی بووایـە، لـە کۆتایـی شـەودا دەچـوو بـۆ (گۆڕسـتانی) بەقیـع و دەیفەرمـوو: سـەلامتان لێبـێ مەنزڵـگای کۆمەڵـی بـڕواداران، ئـەوەی بەڵێنتـان پێـدراوە بۆتـان هـات، ئێمـەش بـۆ بەیانیـی دواخراویـن، ئێمـەش هـەر کاتێـك خـوا بیـەوێ پێتـان دەگەیـن، خوایـە! لـە دانیشـتوانی بەقیعـی غەرقـەد ببـوورە.

**٢-** {**عَنْ بُرَيْدَةَ** ﷺ **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: «**نَهَيْتُكُمْ عَنْ زِيَارَةِ الْقُبُورِ، فَزُورُوهَا فإنّها تذكّركم الأخرة**} (**أخرجه مسلم: ٢٢٥٧، وأبو داود: ٣٦٩٨، والنسائي: ٢٦٦٩**).

واتە: بورەیدە ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ (کە سەرەتا نەهی لێکردوون سەردانی گۆڕستان بکەن و دوایی فەرمانی پێ کردوون سەردان بکەن)، فەرمووی: سەردانکردنی گۆڕستانم لێ قەدەغە کردبوون، ئێستا سەردان بکەن، (دوارۆژتان دەخاتەوە بیر، یاخود: (مردنتان دەخاتەوە بیر).

**٣-** بەڵام بە نسبەت ئافرەتانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی باش نەبووە ئافرەتان بەدوای جەنازەدا بچن، چونکە ئوممو عەتییە ﷺ، دەڵێ: {**نُهِينَا عَنِ اتِّبَاعِ الجَنَائِزِ، ولَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا**} (**أخرجه مسلم: ٢٢٦٤، والبخاري: ٣١٣، وابن ماجه: ٥٧٧**).

واتە: ڕێگەمان لێگیرا شوێن جەنازان بکەوین، بەڵام بە جەختکردنەوە ڕێمان لێ نەگیرا.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەدوای جەنازەدا مەچن، بەڵام زۆر بە جەختکردنەوە وای نەفەرمووە، بێگومان شوێن جەنازەکەوتن و سەردانی گۆڕستانیش لەیەک جیان و حوکمیان جیاوازە.

ئەمە کورتە باسێك بوو لە بارەی مامەڵە کردنەوە لەگەڵ جەنازەو مردووواندا، هیوادارم توانیبمان لە قەدەر ئەو کاتە کەمەی ئەو هەموو فەرمایشتانەمان تێدا هێنان، لە کاتی وەرگێڕاندا مافی فەرموودەکانمان دابێ.

لێرەش کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**التکاثر**) دێنین.

# دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٢٤)ی (**ذي الحجة**)ی (سـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٨/١٤) ی زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن، بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**العَـصْر**)، سـەرەتا وەك عادەتـی خۆمـان، پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئەم سـوورەتە موبارەکـە لـە حـەوت بڕگـەدا دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (العصر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە تەنیـا بـە نـاوەکانی: (**سُـوَرَةُ الْعَـصْر**) و (**سُـوَرَةُ وَالعَـصْر**) نـاسراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ئـەم سـوورەتەیان بـە مەککەیـی دانـاوە، هەندێکیشـیان وەك: قەتـادە و، موجاهیـد و، موقاتیـل، کـە سـێ لـە زانایـانی جیـلی شـوێنکەوتووان دوای هاوەڵانـن، (**تابعین**)، بـە مەدینەییـان دانـاوە، بـەڵام مەککەیـی بـوونی ئاشـکرایەو، لـەو بارەشـەوە ئـەم دەقـە دێنیـن: (**عَـنْ عَبْـدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُـمَا، قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ وَالْعَـصْرِ بِـمَكَّةَ**} (**ذكـره السيوطي في «الـدر المنثـور»: ج٨، ص٦٢١، وَنَسَـبَهُ لابـن مردويـه، الإسـتيعاب فــي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥٥٥**).

واتــە: عەبــدوڵای کــوڕی عەبــاس خــوا لێیــان ڕازی بــێ گوتوویەتــی: ســوورەتی (**والعــصر**) لەمەککــە دابەزیــوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لــە موصحــەف دا، ئــەم ســوورەتە موبارەکــە ژمارەکــەی ســەدو ســێ (١٠٣)یــەو، لــە دابەزینــدا ژمارەکــەی ســێزدە (١٣)یــە، پێــش ســوورەتی (**العادیــات**)و، دوایــی ســوورەتی (**الإنــشراح**)، دابەزیــوە، هەڵبەتــە ئەوانــەش کــە گوتوویانــە: مەدینەییــە، ژمارەکەیــان زیاتــر دانــاوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ئــەم ســوورەتە موبارەکــە بــە یەکدەنگیــی زانایــان، ژمــارەی ئایەتــەکانی ســێیە، کــە کورتتریــن ســوورەتە لــە ڕووی ژمــارەی ئایەتەکانــەوە، ئــەم ســوورەتە و هــەردوو ســوورەتی (**الکوثــر**)و (**النــصر**)، یــەکی ســێ ئایــەت ســێ ئایەتــن.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئــەم ســوورەتە موبارەکــە خــوا ﷻ ســوێند دەخــوات بــە (**عَــصْر**)، کــە زۆربــەی زانایــان دەڵێــن: مەبەســت پێــی ڕۆژگارە بــە گشــتیی، لەســەر ئــەوەی مرۆڤــەکان زیانبــارن بــە گشــتیی، بێجگــە لەوانــەی ئــەو چــوار سســیفەتەیان تێــدان: ئیــمان و، کــرداری بــاش و یەکــدی ڕاســپاردن بــە هــەق و، یەکــدی ڕاســپاردن بــە خۆڕاگریــی.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

پێم وایە ئەم سوورەتە ئەو سێ تایبەتمەندییەی هەن:

**١)**- خوا ﷻ سوێندی خواردوە بە (**عَصْر**)، تەنیا لەم سووڕەتەدا وشەی (**عَصْر**) بە مانای کات هاتوە.

**٢)**- خوای بەرز لەم سووڕەتەدا زیانباریی تێکڕای مرۆڤانی ڕاگەیاندوە، بێجگە لە کەسانێك کە بڕوادارو، کردار باش و، یەکدی ڕاسپێرن بە هەق و، بە خۆڕاگریی، تەنیا لەم سووڕەتەشدا بەم شێوەیە هاتوە.

**٣)**- پێکهاتنی لە کەمترین ژمارەی ئایەتەکان، کە سێ ئایەتن، وێڕای هەردووك سووڕەتی: (**الکوثر**)و (**النصر**)یش.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە موبارەکە سێ ئایەتییە، دەکەین بە یەك دەرس.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە هەرسێ ئایەتی سوورەتی (عَصْر) پێکدێ، خوا ﷻ لە سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکەدا، سوێند دەخوات بە (عَصْر)، کە دەگونجێ بە چەند واتایەك بێ، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: (عَصْر) بە مانای ڕۆژگارە بە گشتیی، دەشگونجێ بە مانای ڕۆژگارێکی تایبەت بێ، واتە: ڕۆژگاری پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ یاخود ئەو کاتەی نوێژی ئێوارە (عصر)ی تێدا دەکرێ، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی ڕۆژگاربێ بە گشتیی، خوا سوێند دەخوات بە عەسر لەسەر ئەوەی مرۆڤ زیانبارە، ئەلیف و لامی سەر (**الإِنْسَان**)یش بۆ ناساندنە، ناساندنەکەش بۆ جینسە، واتە: تێکڕای مرۆڤان زیانبارن، لە زیانبارییدا نغرۆ بوون، دوایی کەسانێك هەڵداوێرێ لەو حوکمەو، جیایان دەکاتەوە، کە چوار سیفەتیان تێدان: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾﴾، هەموو مرۆڤەکان لە زیانبارییدان، بێجگە لەو کەسانەی: بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن و، یەکدی ڕادەسپێرن بە هەق (شوێنکەوتنی هەق و گرتنی هەق)و، یەکدی ڕادەسپێرن بە خۆڕاگریی، واتە: خۆڕاگریی لەسەر ڕێبازی هەق.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿وَٱلْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْاْ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. سوێند بە ڕۆژگار ﴿١﴾ بێگومان مرۆڤ لە زیانباریی دایە ﴿٢﴾ بێجگە لەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو، چاکەکانیان ئەنجام داون و، یەکدییان ڕاسپاردوە بە هەق و، یەکدییان ڕاسپاردوە بە خۆڕاگریی ﴿٣﴾}.

## شیکردنەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلۡعَصۡرِ): (**العَصْرُ وَالعِصْرُ: الدَّهْرُ، وَالجَمْعُ العُصُورُ، والعَصْرُ: العَشِيُّ وَمِنْه صَلاَةُ العَصْرِ**)، وشەی (**عَصْر**) و (**عِصْر**)، واتە: ڕۆژگار کە بە (**عُصُور**) کۆدەکرێتەوە، واتە: ڕۆژگارەکان، (**عَصْر**) بە مانای ئێوارە دێ، دوای ئەوەی خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لادەدا بەرەو خۆرئاوا، پێی دەگوترێ: (**عَشِيّ**)، وەك چۆن کاتێك خۆر دەردەکەوێ تاکو دەگاتە نێوەڕاستی ئاسمان، پێی دەگوترێ: (**غَدَاة**)، یان (**غُدُوّ**)، هەروەها (**عَصْر**) بە مانای نوێژی ئێوارەش دێت، کە ئەویش لەو کاتەدا دەکرێ کە خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان بەرەو ئاوا بوون لادەدات.

(لَفِي خُسۡرٍ): (**الخُسْرُ والخُسْرَانُ: انْتِقَاصُ رَأْسِ المَالِ**)، وشەی (**خُسْر**)و (**خُسْرَان**)، هەردووکیان بە مانای لەدەستدانی دەستمایەن، کەسێك دەستمایە و، سەرمایەیەکی بە دەستەوەیەو، هیچ قازانجی نەکردوە، ئنجا ئەگەر دەستمایەکەش لە دەست بدات، پێی دەگوترێ: بابایەکی زیانبارە، کە خوا دەفەرموێ: مرۆڤ لە زیانباریی دایە، واتە: مرۆڤ دەستمایەکەی لەدەست چووە، تەمەنەکەی زایە بووە، ئەگەر ئەو چوار مەرجەی باسی کردن، تێیدا نەبن.

(وَتَوَاصَوۡاْ): (**تَواصَوا**)، لەسەر کێشی (**تَفَاعُل**)ەو، لە (**وَصِيَّة**)وە هاتوە، (**الوَصِيَّةُ: التَّقَدُّمُ إِلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَل بِهِ يُقْتَرِنَاً بِوَعْظٍ، مِنْ قَوْلِهِمْ أَرْضٌ وَاصِيَةٌ أَي: مُتَصِلَةُ**

**النَّبَاتِ، وَأَوْصَاهُ وَوَصَّاهُ**)، (**وَصِيَّة**): بریتیە لە ڕووكردنە كەسێك و ڕاسپاردنی كەسێك بەوەی كاری پێ بكات، بەڵام قسەكە كە ڕایدەسپێرێ ئامۆژگارییشی لەگەڵدابێ، (**وَصِيَّة**) لە بنەڕەتی زمانی عەرەبییدا لە (**أَرْضٌ واصِيَة**)یەوە هاتوە، (**أَرْضٌ واصِيَة**) واتە: ڕووەكەكەی هەموو پێكەوە پەیوەستە، (ئەگەر كەسێكیش قسەی خێرو ئامۆژگاریی خێر بۆ كەسێك پەیوەست بكات بەردەوام، مانای وایە وەسیەتی بۆ كردوە)، ئنجا بە هەردوو كرداری (**أَوصَاهُ**) و (**ووَصَّاهُ**)، دێ، {(**أَوْصَاهُ وَصِيَّةً**) و (**وَصَّاهُ وَصِيَّةً**)}.

(**بِٱلْحَقِّ** ): (**أَصْلُ الحَقِّ: المُطَابَقَةُ والمُوَافَقَةُ**)، (**حَقّ**): لە ڕیشە زمانەوانییەكەیدا بە مانای پێكەوە تێكەڵبوون و پێكەوە گونجانە، دوایی وشەی هەق بەكاردەهێنرێ بۆ: (**المـوجِد: وَالمُوجَدُ بِالْحِكْمَة، وَالإِعْتِقَادُ الصَّحِيْح، وَالفِعْلُ وَالقَوْلُ الصَّحِيْح**)، هەق هەم بۆ پەیداكەر بەكاردەهێنرێ: ﴿أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ ٱلْمُبِينُ ﴿٢٥﴾﴾ **النور**، كە خوای بێ وێنەیە، هەم بۆ پەیداكراوێك بە حیكمەت بەكاردەهێنرێ: ﴿خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴿٧٣﴾﴾ **الأنعام**، هەم بۆ بڕوا پێبوونێكی ڕاست و دروست، هەروەها بە قسەو كردارێكی ڕاست و دروستیش هەر دەگوترێ: (**حَقّ**).

(**بِٱلصَّبْرِ**): (**الصَّبْرُ: الإِمْسَاكُ فِي ضِيْقٍ، وَالصَّبْرُ: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا يَقْتَضِيهِ العَقْلُ وَالشَّرْعُ، أَو عَمَّا يَقْتَضِيَانِ حَبْسَهَا عَنْهُ**)، وشەی (**صَبْر**) بە مانای خۆگرتنەوە دێ لەگەڵ سەغڵەتییدا، (**صَبْر**): بریتیە لە خۆ حەپسكردن لەسەر خوازیاری عەقڵ و شەرع، یاخود خۆگرتنەوە لە شتێكدا كە عەقڵ و شەرع دەخوازن خۆی لێ بگریەوە.

هەندێكیش دەڵێن: (**الصَّبْرُ: حَبْسُ النَّفْسِ عَلَى مَا تَكْرَه**)، (صبر) ئەوەیە خۆت حەپس بكەی لەسەر شتێك كە پێی ناخۆشە، یانی: هەرچەندە پێی ناخۆشە، بەڵام هەر حەپسی بكەی لەسەری، كە ئەنجامی بدات، هەروەها (**الصَّبْرُ: حَبْسُ النَّفسِ عَمَّا تَكْرَه**)، خۆگرتنەوە لە شتێك كە نەفس پێی ناخۆشە، نەفس پێی ناخۆشە لێی بگریەوە، بەڵام جڵەوی بۆ توند بكەی و نەهێڵی بیكات، یان توخنی بكەوێ.

## سێ دەق لەبارەی ئەم سوورەتە

### لێرەدا سێ دەقان دێنین دەربارەی ئەم سوورەتە موبارەکە:

**یەکەم:** {عَنْ أَبِي حُذَيْفَة وَكَان لَهُ صُحْبَة قَالَ: كَانَ الرَّجُلانِ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ إِذَا الْتَقَيَا لَمْ يَفْتَرِقَا حَتَّى يَقْرَأَ أَحَدُهُمَا عَلَى الآخَرِ: سُورَةَ الْعَصْرِ، ثُمَّ يُسَلِّمَ أَحَدُهُمَا عَلَى الآخَرِ} **(أخرجه البيهقي في شعب الايمان: ٩٠٥٧، والمناوي في فيض القدير: ج١، ص٣٣٦، وقال المخرج لتفسير روح المعاني: ضعيف).**

واتە: ئەبوو حوزەیفە کە هاوەڵایەتیی هەبووە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ، دەڵێ: دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بە یەکدەگەیشتن، لە یەك جیا نەدەبوونەوە تاکو یەکێکیان سوورەتی **(العصْرِ)**ی بەسەر ئەوی دیکەدا نەخوێندبایە، دوایی یەکێکیان سڵاوی لەوی دیکە دەکرد، {دەیگوت: **(السَّلامُ عَلَيكُم وَرَحمَةُ اللهِ وَبَرَكَاتُهُ)**}، ئنجا لە یەك جیادەبوونەوە.

**دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەندەقدا ڕۆژێکیان کە زۆر سەغڵەتیی بوو و نوێژی (عەسر)یان چوو، لە کاتی خۆیدا بۆیان نەکرا، لەبەر ئەوەی دوژمنان بارودۆخەکەیان زۆر سەغڵەت کردبوو لە خەڵکی ئیسلام، نە پێغەمبەرو ﷺ نە هاوەڵان نەیانتوانی نوێژەکەیان لە کاتی خۆیدا بکەن، کە نوێژەکەیان بە کۆمەڵ دەکرد، لەو بارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: {**شَغَلُونَا عَنْ الصَّلَاةِ الْوُسْطَى صَلَاةِ العَصْرِ**} **(أخرجه البخاري: ٦٠٣٣، ومسلم: ٥٢٧)**، واتە: ئێمەیان بێئاگا کرد، یان ئێمەیان سەرقاڵ کرد لە نوێژی نێوەڕاست (نوێژی عەسر)، یاخود چاکترین نوێژ، کە نوێژی ئێوارەیە، (نوێژی عەسر).

**سێیەم:** هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺلە بارەی نوێژی عەسرەوە، فەرموویەتی: {**مَنْ فَاتَتْهُ صَلَاةُ العَصْرِ، كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ ومَالَهُ**} **(أخرجه البخاري: ٥٢٧، ومسلم: ٦٢٦).**

واتە: هەر کەسێك نوێژی ئێوارەی بچێ (نوێژی عەسر) وەك کەس و کاری و ماڵ و سامانی هەمووی لە دەست دابێ.

لـە دەقـی یەكەمـەوە بۆمـان دەردەكـەوێ، كـە هـاوەڵان زۆر گرنگییـان بـەم سـوورەتە موبارەكـە داوەو، لـە دوو دەقـی دواییـش بۆمـان دەردەكـەوێ كـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، خـوا كـە لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا دەفەرمـوێ: ﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴿٢٣٨﴾ ﴾، واتـە: پارێزگاریـی لـە نوێـژەكان و نوێـژی نێوەڕاسـت بكـەن، ﴿ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ ﴾ی بـە نوێـژی عـەسر لێكداوەتـەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەكان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْــــــــمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێكردنم بـە نـاوی خوایـە، ئـەوەش مەبەسـتی ئەوەیـە:

١- ئەم كارە تەنیا بۆ خوا دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوا دەكەم.

٣- ئەم كارە بە تواناو یارمەتیی خوا دەكەم.

٤- ئەم كارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱلْعَصْرِ ﴾،واوەكـە واوی سـوێند پـێ خـواردن (واو القسـم)ە، واتـە: سـوێند بـە عـەصر، (**عَصر**)یـش، زانایـان چەنـد واتایەكیـان بـۆ هینـاون:

١- ڕۆژگار بە گشتیی.

٢- ڕۆژگارێكی تایبەت، بەبێ دیارییكردن و دەستنیشانكردن.

٣- ئەو ڕۆژگارو كاتەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ تێیدا، وەحیی لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بۆ دابەزیوەو، كۆمەڵ و كۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیی بنیات ناوە، كەواتە: (**والعصر**)، واتە: سوێند بەو ڕۆژگارەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ تێیدا پێغەمبەرایەتیی كردوە،

کە ماوەی بیست و سێ ساڵە، سێزدە ساڵ لە مەککەو، دە ساڵ و چەند مانگێکیش لە مەدینە (**يثرب**).

٤- هەروەها (**عَصر**) بە ئەو کاتەش دەگوترێ، کە ڕۆژ (خۆر) لە نێوەڕاستی ئاسمان لادەدا بەرەو ئاوابوون و، هەتا ئاوا بوون، پێی دەگوترێ: (**عَصر**) ئێوارە، ئەو نوێژەش کە لەو کاتەدا دەکرێ، پێی دەگوترێ: نوێژی ئێوارە، نوێژی عەصر.

خوا سوێند دەخوات بە (**عَصر**)، کە ڕای ڕاستتر ئەوەیە، مەبەست پێی ڕۆژگارە بە گشتیی، لەسەر چی سوێند دەخوات؟

﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ لە زیانباریی دایە، (**ال**)ی سەر ﴿ ٱلْإِنسَـٰنَ ﴾، بۆ ناساندنە، ناساندنەکەشی بۆ ڕەگەز (**جنس**)ە، واتە: تێکڕای مرۆڤان لە زیانبارییدان، بەڵام لێرەدا: (**لِلجِنسِ الإستِغراقِيِّ العُرْفِيِّ**)، واتە: بە پێی باوی ئەو کاتەو، ئەو مرۆڤانەی لەو ڕۆژگارە دابوون هەموویان لە زیانبارییدان، جگە لەوانەی دوایی خوا ﷻ جیایان دەکاتەوەو هەڵیانداوێرێ، هەروەها ئەو مرۆڤانەی لە هەموو ڕۆژگارەکاندا دێن، هەموویان لە زیانبارییدان، جگە لەوانەی خوا جیای کردوونەوە، بەو چوار سیفەتەی دوایی باسیان دەکات.

کە دەفەرموێ: ﴿ لَفِى خُسْرٍ ﴾، ﴿ خُسْرٍ ﴾، (**مَصدَرٌ ضِدُّ رِبحٍ فِي التِّجارَة**)، (**خُسر**) و (**خُسران**): چاوگن، دژی قازانج کردنن لە بازرگانییدا، بەڵام لێرە خوازراوەتە بۆ سەرەنجامی خراپ، (ل)ی سەر ﴿ لَفِى خُسْرٍ ﴾یش، بێگومان بۆ جەختکردنەوەیەو، کە دەفەرموێ: (**فِي خُسْرٍ**)، لە زیانبارییدایە، مرۆڤ چوێنراوە بە کەسێك، کە دەکەوێتە نێو باتلاغێکەوە، نێو چاڵێکی قووڵەوەو تێیدا نقووم دەبێ.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، جگە لەوانەی بڕوایان هێناوە، واتە: (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێی بهێنرێ)، ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجامداون، ﴿ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴾، یەکدییان ڕاسپاردوە بە هەق، یەکدییان ڕاسپاردوە بە خۆڕاگریی.

بەدڵنیاییش ئەگەر ئیمان ئیمان بێ، کردەوەی باش پەلکێش دەکات، بۆیە هەمیشە لە قورئاندا لە دوای ئیمان، باسی کردەوەی باش کراوە، ئنجا بەشێك لە کردەوەی باش، خەڵك ڕاسپاردنە بە شوێنکەوتنی هەق و، هەڵگرتنی هەق و بڕوا پێ بوونی هەق، هەروەك بەشێکی دیکە لە کردەوەی چاك، بریتییە لە یەکدی ڕاسپاردن بە خۆڕاگریی و پشوو درێژیی وو لەسەر پابەندیی بە هەقەوە، بەڵام خوا ﷻ ئەوانەی باداوەتەوە سەر یەکدی، کە لەڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: (**عَطْفُ الخَاصِّ عَلَى العَام**)، بادانەوەو گێڕانەوەی تایبەت بۆ سەر گشتیی، پێشێ خوا شتێك بە گشتیی دەفەرموێ، دوایی چەند، تاکێکی لێ جیا دەکاتەوەو دەیانگێڕێتەوە بۆ سەر ئەو حاڵەتە گشتییە، تاکو بزانرێ کە ئەوانە جێی بایەخ و گرنگیی تایبەتن، وەك لە سووڕەتی (**البقرة**)دا، هاتووە زانایان بە زۆریی نموونە بەوە دێننەوە، خوا دەفەرموێ: ﴿مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ ...﴿٩٨﴾﴾، واتە: هەر کەسێك دوژمنی خواو فریشتەکانی و هی پێغەمبەرانی بێ و (دوژمنی) جیبریل و میکال بێ، دیارە جبریل و میکائیل، هەردووکیان لە نێو فریشتەکاندان، بەڵام لەبەر ئەوەی پێگەیەکی تایبەتیان هەیە لە نێو فریشتەکاندا، خوا ﷻ وێڕای ئەوەی بە گشتیی باسی فریشتانی کردوە، بە تایبەتی باسی ئەو دووانە دەکات، ئەوەش پێی دەگوترێ: (**ذِكْرُ الخَاصِّ بَعدَ العَام**)، باسکردنی تایبەت دوای گشتیی.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**کە لە هەردوو ئایەتی یەکەم و دووەم وەردەگیرێ، سوێند خواردنی خوا بە ڕۆژگار کە مرۆڤ بە گشتیی لە زیانبارییدایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ١ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ٢﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾، سوێند بە ڕۆژگار، کە وەك پێشتر گوتمان: زانایان (عصر)یان لێرەدا بە پێنج واتایان هێناوە:

١- ڕۆژگار بە گشتیی.

٢- ئەو کاتەی دەکەوێتە نێوان نیوەڕۆو زەردەی ئێوارێ.

٣- نوێژی ئێوارە، نوێژی عەصر.

٤- هەر ماوەیەکی زاندراو، کە جیلێك لە خەڵك تێیدا دەژین.

٥- ڕۆژگاری ئیسلام، ئەو ڕۆژگارەی خوای پەروەدگار وەحیی تێدا ڕەوانە کردوە بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ.

بەڵام مانای دیارتری هەر ئەوەیە کە مەبەست پێی ڕۆژگارە بە گشتیی و، خوا سوێند دەخوات بە ڕۆژگار، خواش لە قورئاندا سوێندی بە زۆر شتان خواردوە.

٢)- ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ لە زیانبارییدایە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ، یانی: تێکڕای مرۆڤان، چونکە (ال) بۆ ناساندنە،

ناساندنەکەش بۆ جینسە، یانی: مرۆڤەکان هەموویان لە زیانباریی دان، زیانباریی مرۆڤیش ئەوەیە لەسەر تەمەنەکەی خۆی قەرزار بێتەوەو، تەمەنەکەی لە دەست بچێ و بە فیڕۆ بچێ، (**الخُسْرُ والخُسرانُ: مَصْدَرٌ ضِدُّ الرِّبح فِي التِّجَارَة**)، واتە: (**خُسر و خُسران**)، چاوگن هەردووکیان دژی قازانج کردنن لە بازرگانییدا، کەسێکی بازرگان ئەگەر قازانج بکات، بە هۆی دەستمایەکەیەوە، قازانجی دێتە دەست، یانی: دەستمایەکەی پارێزراوەو قازانجیش دەکات، بەڵام ئەگەر زیان بکات، جاری وایە دەستمایەکەشی لە دەستدەچێ، ئەوە هیچ قازانجی نەکردوە، بگرە دەستمایەکەشی دەدۆڕێنێ، خوا دەفەرموێ: مرۆڤەکان هەموویان دۆڕاون، لەسەر ژیانێ کە خوا تێیدا دایناون، قەرزدار دەبنەوە، تەمەنەکەیان بەفیڕۆ دەڕوات و لە دەستیان دەچێ، بێگومان لێرە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴾، بە دڵنیایی مرۆڤ زۆر لە زیانباریی دایە، لە زیانبارییدا نغرۆ بووە، لە جیاتی بفەرموێ: (**لَخَاسِرٌ**) یان: (**يَخسَروا**)، فەرموویەتی: ﴿ لَفِى خُسْرٍ ﴾، واتە: لە زیانباریی دا نقووم بوون، وەك چۆن شتێك دەخەیە نێو گۆماوێکەوە، مرۆڤیش ئاوا نغرۆ بووە لە زیانبارییداو تێیدا غەرق بووە، بێگومان ئەمەش ترساندن و وریاکردنەوەو هۆشدارییەکی زۆر گەورەیە.

کە دەشفەرموێ: ﴿ لَفِى خُسْرٍ ﴾، وشەی (**خُسْرٍ**) کە بە نەزانراو (**نكرة**) هاتوە هیچ هۆکارێکی ناساندنی لەسەر نیە، دەگونجێ بۆ جۆر بێ، یاخود بۆ گشتاندن و مەزن پێشاندان بێ و، ئەوەی دووەمیشیان زیاتر گونجاوە لەگەڵ ڕەوت (**سیاق**) دا.

ئێمە کاتی خۆی لە سەرەتای سووڕەتی (**النازعات**)دا، کورتە باسێکمان کردوە لە بارەی سوێندەکانی خوا ﷻ لە قورئاندا، سوێندەکانی خوای پەروەردگار بە هەندێك لە دروستکراوەکانی و، جاری واش هەیە خوا سوێند بە خۆی دەخوات: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ ﴿٦٥﴾ ﴾**النساء**، سوێند خواردنی خواش بە هەندێك لە دروستکراوەکانی بە گشتیی دوو حیکمەتی تێدان:

**یەکەم:** بۆ سەرنج ڕاکێشانی مرۆڤانە، بۆ گرنگیی و بایەخی ئەو دروستکراوانەو، هاندانیان بۆ تێوەڕامان و لێوردبوونەوەیان و، پەیبردن بە نهێنییەکانیان و بەهرە لێوەرگرتنیان.

**دووەم:** بۆ زانین و پەیپێبردنی پێگەو حورمەتی ئەو دروستکراوانەیە، بۆ وێنە: خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ١﴾ **القلم**، سوێند بە قەڵەم و بەوەی دەینووسن، ئەمە بۆ دەرخستنی پێگەو گرنگیی و بایەخی نووسین و قەڵەمە، لە ژیانی مرۆڤ دا کە هۆکارێکی گەورەو گرنگی بەرەو پێشچوون و گەشەسەندنی ژیان و گوزەرانیەتی، بەڵام سوێند خواردنی خوا بە هەنجیرو زەیتوون: ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ١﴾ **التين**، بۆ سەرنجڕاکێشانی مرۆڤەو هاندانیەتی بۆ تێوەڕامان لەو دوو جۆرە خۆراکەو سوودو قازانجەکانی لێیان وەردەگیرێن.

گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا سوێند دەخوات بە ڕۆژگار، (عصر) ئەو ڕۆژگارەی ئێمە تێیدا دەژین لەم سەر زەوییە، کە بۆ ئێمە ئەو واتا زاندراوەی هەیە کە دەیزانین و، بریتیە لەوەی تەمەنی هەر کامێك لە ئێمە، چەند ساڵێکە، هەر ساڵێك دوازدە مانگەو، هەر مانگێك چوار هەفتەیەو، هەر هەفتەیەك، حەوت شەوو حەوت ڕۆژەو، هەر شەوو ڕۆژێك بیست و چوار سەعاتن و، بە هاوکۆیی (مُعدَّل)، دابەش دەبن بۆ دوازدە بە دوازدە، بەڵام کورت و درێژییان هەیەو، جاری وا هەیە لەم وڵاتانەی ئێمە -ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست- ڕۆژ دەبێتە شازدە سەعات یان شتێك زیاتر، هەروەها شەویش لە هەندێك کاتاندا دەبێتە شازدە سەعات، یان شتێك زیاترو، ئەو هەشت سەعاتە، یان شتێك کەمترەی دەمێنێتەوە بۆ ئەوی دیکەیە، بەڵام لە هەندێك شوێنی دنیا، (خڕۆکەی زەوی) شەو یان ڕۆژ ماوەکەیان زۆر زیاتر دەبێ و، دەگەنە هەژدە سەعات و، بیست سەعات، بەڵکو لە هەندێك شوێنی خڕۆکەی زەوی، شەش مانگ شەوەو، شەش مانگ ڕۆژە، بەڵام نە شەوەکە شەوی تەواوەو، نە ڕۆژەکە ڕۆژی تەواوە.

بەڵێ ئێمە لەم سەر زەوییە، لە ڕۆژگار واتێدەگەین، کە بریتیە لە چەند ساڵێك و بە دوای یەکدا دێن، ساڵەکان لە مانگ و مانگ لە هەفتە، هەفتەکان

لـە شـەوو ڕۆژ، شـەوو ڕۆژەکان لـە سـەعات و سـەعاتەکان لـە خولـەك و، ئەوانیـش لـە چرکـە پێـك دێـن، بـەڵام ئایـا ئـەو چەمـك و واتایـەی بـۆ کات و ڕۆژگار، کـە بـۆ ئێمـەی خەڵکـی سـەر زەوی هەیـە، شـتێکی گشـتییە؟ بـە دڵنیایـی نەخێـر، ئنجـا بـا سـەرنج بدەیـن و ئـەو مەسـەلەیە تۆزێـك ڕوون بکەینـەوە:

زەوی ئێمـە هـەر بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعات جارێـك خولێـك بـە دەوری خۆیـدا دەخـوات، لـە بەرانبـەر خـۆردا، بـە خێرایـی سـی (٣٠)کـم لـە خولەکێـك داو، لـە ئەنجامـی ئـەوەش دا دیوەکـەی کـە دەکەوێتـە لای خـۆر، دەبێتـە ڕۆژو، دیوەکـەی دیکەشـی دەبێتـە شـەو، هەروەهـا لـە مـاوەی ساڵێکدا، لـە مـاوەی سێسـەدو شەسـت و پێنـج (٣٦٥) ڕۆژو شـتێکدا خولێـك، سـووڕێك بـە دەوری خـۆردا دەدات، بـە خێرایـی سـی (٣٠) کـم لـە چرکەیەکـدا، واتـە: شەسـت ئەوەنـدەی خێرایـی سـووڕانەوەی بـە دەوری خۆیـدا خێراتـرو، لـە ئەنجامـی ئەوەشـدا چـوار کەشـەکانی سـاڵ بەهـارو هاویـن و پایـزو زسـتان، پەیدادەبـن، بـەڵام لـە هەمـوو شـوێنەکانی گـۆی زەوی دا ئـەو چـوار کەشـانە ئـاوا دیـار نیـن، وەك لـە لای ئێمـە دیـارن، بـەڵام خڕۆکـەی وا هەیـە، لە ماوەیەکـی کەمـتر یـان زیاتـردا بـە دەوری خۆیـدا دەخولێتـەوە، هـەر لـە کۆمەڵـەی خـۆرو لـە بەرانبـەر خـۆردا، بۆیـەش شـەوو ڕۆژەکەیـان جیـاواز دەبـێ، کورتـتر یـان درێژتـر دەبـێ، بەڵکـو لـە دەرەوەی کۆمەڵـەی خـۆر خڕۆکـەی وا هەیـە، لەوانەیـە بـە یـەك ملیـۆن سـاڵ جارێـك خولێـك بـە دەوری خۆیـدا بخولێتـەوە، یـان بە چەنـد ملیۆن سـاڵ جارێـك بـە دەوری ئـەو ئەسـتێرەیەی بـە دەوری دا دەخولێتـەوە، بخولێتـەوە، ۆری ئێمـەش هـەر ئەسـتێرەیەکە لـە ئەسـتێرەکانی کەهکەشـانی کاکێشـان کـە بـە مەزەنـنـە، دوو سـەد ملیـارو هەندێـك گوتوویانـە: تریلیـۆن (١٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠)ێـك زیاتـرن!

کەواتـە: چەمـك و واتـای کات و ڕۆژگار ڕێژەییـە، بـە نسـبەت ئێمـەی دانیشـتووانی سـەر خڕۆکـەی زەوی، ئـەم چەمـك و واتایـەی هەیـە، کـە ئێمـە دەیزانیـن، بـەڵام بـا پێـمان وانەبـێ لـە هەمـوو شـوێنەکانی دیکـەش، هـەر ئـەو چەمـك و واتایـەی

هەیـە، خـواش ﷻ سـەرنجی ئێمـەی بـۆ ئـەو ڕاسـتییە وجوودییـە ڕاكێشـاوە، كـە دەفەرمـوێ: ﴿وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾﴾الحـج، واتـە: ڕۆژێـك لـە لای پـەروەردگارت بـە ئەنـدازەی هـەزار سـاڵە لـەوەی ئێـوە دەیژمێـرن، بەڵكـو لـە سـوورەتی (المعـارج)دا، دەفەرمـوێ: ﴿تَعْرُجُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾﴾، واتـە: فریشـتەكان و ڕووح، (جیبریـل)، بـەرەو لای و (خـوا) بـەرز دەبنـەوە، لـە ڕۆژێكـدا ماوەكـەی پەنجا هـەزار (٥٠،٠٠٠) سـاڵە، كـە مەبەسـت پێـی ڕۆژی دواییـە، كەواتـە: كاتێـك لـە بازنـەی ئـەم زەوییـەی خۆمـان دەچینـەدەر، چەمـك و واتـای كات دەگـۆڕێ و مانـاو نێوەڕۆكێكـی دیكە پەیـدادەكات، ئـەوە بەنسـبەت ئێسـتای گەردوونـەوە.

بـەڵام بـە نسـبەت قۆناغـی دوایـی گـەردوون، قیامـەت، یـان قۆناغـی عالەمـی بـەرزەخ، لـەوێ كات (زمـن) چەمـك و واتایەكـی دیكـەی هەیـە، لـەوێ كات (زَمَـن) دەوەسـتێ، بۆیـەش مرۆڤـەكان لـە یـەك تەمەنـدا دەمێننـەوە، چ لـە بەهەشـت دا بـن، چ لـە دۆزەخ داو، چ لـە قۆناغـی بـەرزەخ دا، چ لـە قۆناغـی قیامـەت دا، لـەوێ پیـر بـوون نیـە، چونكـە كات وەك لێـرە تێدەپـەڕێ، لـەوێ تێناپـەڕێ، ئـەوەش زانسـت دەریخسـتوەو، بـە پێـی بیـردۆزەی ڕێژەیـی (**النظریـة النسـبیّة**)، ئانیشـتاین، ئەگـەر مـرۆڤ بتوانـێ ڕۆكێتێـك هەڵـدا بـە خێرایـی تیشـك بـڕوا، واتـە: (٣٠٠,٠٠٠)كـم لـە چركەیەكـدا، كات دەوەسـتێ، واتـە: ڕۆكێتـك هەڵبـدەی بـۆ نێـو فـەزا، دوای سـەد (١٠٠) سـاڵ كـە دێتـەوە، لێـرە سـەد ساڵی بەسـەردا تێپەڕیـوە، بـەڵام لـە نێـو ئـەو ڕۆكێتـەدا، شـتێكی زۆر كـەم كات تێپەڕیـوە!

**مەسەلەی دووەم:**

**هەڵاواردنی بڕواداران کردار باشی، ڕاسپێرەر بە هەق و، ڕاسپێرەر بە خۆڕاگریی، لە حوکمی نغرۆ بوون لە زیانبارییدا:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، (هەموو مرۆڤەکان لە زیانبارییدان)، بێجگە لەو کەسانەی بڕوایان هێناوە، کەواتە: بناغەی سەرفرازیی و دەرباز بوون لە دۆڕان و لە تەمەن لە دەستچوون، بریتیە لە ئیمان، ئیمانیش زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئاوایان پێناسە کردوە: (**الإيمان: قولٌ وَعَمَل، يَزِيد بِالطَّاعَةِ وَيَنقُصُ بِالمَعصِيَة**)، ئیمان قسەیەو کردەوەیە، بە فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بە سەرپێچیی کەم دەکات، کە گوتووشیانە: قسەیەو کردەوەیە، مەبەستیان لە قسە دوو شتە:

أ- بەڕاست زانینی عەقڵ و دڵ.

ب- دان پێداهێنانی بە زمان، ئەوە قسەی دوو ئەندامان:

أ- قسەی عەقڵ و دڵ، ب- لەگەڵ قسەی زمـان، کە گوتووشیانە: کردەوە، دیسان کردەوەش مەبەستیان پێی دوو جۆرە کردەوەیە.

أ- کردەوەی دڵ، کە بریتیە لە پەسند کردن و خۆشویستن و ویستن و قبووڵ کردن و مل بۆ کەچ کردن وڕادەست بوون، ب- کردەوەی ئەندامەکانیش جێبەجێ کردنە.

کەواتە: ئیمان چوار پێکهاتەی هەن ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بێجگە لەوانەی بڕوایان هێناوە، هەمیشە لە قورئاندا مەگەر بە دەگمەن، ئەگەرنا بەرکار (مفعول)ی ﴿ ءَامَنُوا۟ ﴾، قرتێنراوە، ئایا بڕوایان بەچی هێناوە؟ بڕوایان بە هەموو

ئـەو شـتانە هێنـاوە کـە دەبـێ بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، بڕوایـان بـە خـوا هێنـاوە ﷻ، بـە فریشـتەکانی، بـە کتێبـەکانی و بـە پێغەمبـەرانی و، بـە ڕۆژی دوایـی و بـە نەخـش و ئەندازەگیریـی خـوا.

٢)- ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾، هەروەها کردەوە چاکەکانیشیان کردوون، مەرجی دووەمی دەربازبوون لە زیانباریی و دۆڕان و سەر بە فەتارەت چوونی مرۆڤان، بریتیە لەوەی کردەوە باشەکان ئەنجام بدەن، ﴿وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾، واتە: (**وَعَمِلُوا الخِصالَ الصَّالِحات**)، خەسڵەت و کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، ﴿ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾یش، (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ئەویش هەموو کردەوە چاکەکان دەگرێتەوە.

٣)- ﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ﴾، هەروەها یەکدییان ڕاسپاردوە بە هەق، ئەویش هەر بەشێکە لە کردەوەی باش، بەڵام ئەوە لێرەدا -وەك پێشتریش گوتمان- بادانەوەی تایبەتە بۆ سەر گشتیی. (**عَطفُ الخاصِ عَلَى العام**)، بە مەبەستی بایەخ و گرنگیی پێدان و، دەرخستنی پێگەو پلەی بەرزی، ئەوەی بادراوەتەوە بۆ سەر هی پێشێ.

٤)- ﴿وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾، هەروەها یەکدییشیان ڕادەسپاردوە بە خۆڕاگریی، واتاو چەمکی (**تَواصِي**) یەکدی ڕاسپاردن، فراوانترە لە ماناو چەمکی فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند، فەرمان بە پەسند و ڕێگریی لە ناپەسند، زیاتر کردەوەکان دەگرێتەوە، بەڵام یەکدی ڕاسپاردن بە هەق و یەکدی ڕاسپاردن بە خۆڕاگریی، هەم بواری ئیمان و عەقیدە دەگرێتەوە، هەم لایەنی فیکریی دەگرێتەوە، هەم لایەنی دەروون دەگرێتەوە، هەم لایەنی ڕواڵەت دەگرێتەوە، هەروەها لایەنەکانی تاکیی، خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی ....، هەمووان دەگرێتەوە، ئنجا کە خوا ﷻ هەر چوار سیفەتەکەی بە کۆ هێناون: ﴿ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ﴾، کەواتە: دەبێ کۆمەڵ و کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، ڕازاوەبێ بەو چوار سیفەتانە، ئنجا لە زیانباریی و دۆڕان سەلامەت دەبێ، ئیمان و کردەوەی دەبێ باش لە خودی خۆیاندا ئەنجامیان بدەن، بەڵام یەکدی ڕاسپاردن بە هەق و یەکدی ڕاسپاردن بە پشوو درێژیی و خۆڕاگریی، دەبێ لەگەڵ دەرەوەی خۆیاندا، ئەنجامیان بدەن.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی رەهـای خـۆی، ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە بـەو چـوار سـیفەتە بـەرزو گـەورەو گرنگـە دەڕازێنـەوەو، لـە دژو پێچەوانەکانیـان بـژار دەکرێـن و پـاك دەبنـەوە

## کورتە باسێک لە بارەی ڕوونکردنەوەی ئیمانەوە(١)

بەڕێـــزان!

ئـەم کورتـە باسـە لەژێـر ناوونیشـانی: (ڕوونکردنـەوەی ئیـمان)دا، لـە شـەش تـەوەردا دەخەینـە ڕوو:

تەوەری یەکەم: پێناسەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی.

تەوەری دووەم: بنەڕەتەکانی ئیمان (**أركانُ الإيمان**).

تەوەری سێیەم: پێکهاتەکانی ئیمان (**مُكَوِّناتُ الإيمان**).

تەوەری چوارەم: بڕوادار (**مُؤمن**) کێیە؟

تەوەری پێنجەم: ئایا کردەوە بەشێکە لە ئیمان یان نا؟

تەوەری شەشەم: پلەکانی ئیمان (**دَرَجاتُ الإيمان**).

شـایانی باسیشـە: بۆیـە لـە کۆتایـی تەفسـیر سـوورەتی (**العـصر**)دا، ئێمـە کورتـە باسێك لەبـارەی ئیمانـەوە دەکەیـن، چونکـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**العـصر**)دا، دوای

---

(١) ئـەم کورتـە باسـە، ڕاستەوخۆ لـە مەوسـووعەی: (بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی لـە نێـوان وەحیـی و واقیعـدا) وەردەگریـن، بەشـی دووەمـی کتێبـی چـوارەم: (پایـەکانی بیرکردنـەوەی ئیسـلامیی)، بـە ناوونیشـانی: (ڕوونکردنـەوەی ئیـمان) کـە ئەویـش لـە ئەصڵدا لـە مەوسـووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، (الكتاب الثاني: مفهوم الايمان والكفر وثمارهما) وەرگیـراوە. کەواتـە: ئەم کورتـە باسـەی لێـرەدا لەبـارەی ڕوونکردنـەوەی ئیمانـەوە دەیخەینـەڕوو، دەبێتـە پوختـەی پوختە، گـوشراوی گـوشراو.

ئـــەوەی حوکمـــی زیانباریـــی دۆڕان و خەســـارەتمەندیی بەســـەر تێکـــڕای مرۆڤانـــدا داوە، فەرموویـــەتی: ﴿ وَٱلْعَصْرِ ﴾، ســـوێند بـــە عـــەسر (واتـــە: ڕۆژگار)، ﴿ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ لَفِى خُسْرٍ ﴾، بـــە دڵنیایـــی و مســـۆگەر مرۆڤـــەکان تێکـــڕا لـــە زیانباریـــی و دۆڕان و دەســـخەڕۆبوون دان، بـــەڵام دوایـــی خـــوا کۆمەڵێـــك لەنێـــو مرۆڤـــان دا جیادەکاتـــەوەو لـــەو حوکـــم و بڕیـــارە هەڵیانداوێـــرێ، کـــە چـــوار سیفەتیان تێـــدان: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴾، واتـــە: بێجگـــە لـــەو مرۆڤانـــەی بڕوایـــان هێنـــاوەو، کـــردەوە باشـــەکانیان ئەنجـــام داون و، یەکدییـــان ڕاســـپاردوە بـــە هـــەق و، یەکدییشـــیان ڕاســـپاردوە بـــە خۆڕاگریـــی و پشـــوو درێژیـــی، ئنجـــا ئێمـــە بـــۆ ئـــەوەی یەکـــەم ئـــەو ئیمانـــەی خـــوا ﷻ کردوویـــەتی بـــە بناغـــەی ڕزگاریـــی و ســـەرفرازیی و دەربازبـــوون لـــە زیانباریـــی و دۆڕان، ڕوونبکەینـــەوە، کـــە ئایـــا چییـــەو چۆنـــە؟ لێـــرە ئـــەم کورتـــە باســـە دەخەینـــەڕوو: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴿٣﴾ ﴾، وەك دەبینیـــن: دوای باســـکردنی ئیـــمان وەك بناغـــە، ئـــەو ســـێیەی دیکـــە هـــەر ســـێکیان بادراونـــەوە ســـەر ئیـــمان، بـــە (و)ی بادانـــەوە، ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئیـــمان بناغەیـــە: بێجگـــە لەوانـــەی بڕوایـــان هێنـــاوە، تەنیـــا خـــاوەن ئیمانـــان دۆڕاوو ڕەنـــج بـــە زایـــە چـــوو و دەســـتخەڕۆ نیـــن، ئنجـــا: ﴿ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، کـــردەوە باشەکانیشـــیان ئەنجـــام داون، بێگومـــان کـــردەوەی باشـــیش هـــەر دەکەوێتـــەوە نێـــو جوغـــزی ئیـــمان، ئنجـــا ﴿ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ ﴾، هەروەهـــا یەکدییـــان ڕاســـپاردوە بـــە هـــەق و یەکدییشـــیان ڕاســـپاردوە بـــە خۆڕاگریـــی، هەڵبەتـــە یەکـــدی ڕاســـپاردن بـــە هـــەق و یەکـــدی ڕاســـپاردن بـــە خۆڕاگرییـــش، هـــەر دەچنـــەوە نێـــو بازنـــەی کـــردەوە باشـــەکان و، کـــردەوە باشـــەکانیش پێکهێنـــەری ئیمانـــن، کەواتـــە: ئـــەم چـــوارە هەموویـــان تێکهەڵکێشـــن.

لەڕاســـتییدا ئیـــمان ســـەرچاوەی کـــردەوەی باشـــە، هەروەهـــا ئیـــمان ســـەرچاوەی شـــوێن کەوتنـــی هەقـــە و، ئیـــمان ســـەرچاوەی خۆڕاگریـــی و پشـــوو درێژیـــی و نەلەخشـــاویی و دامەزراوییـــە.

## تەوەری یەکەم/ پێناسەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی:

سەرەتا پێویستە هەموومان ئەوە بزانین کە خوا لە قورئاندا پێناسەی هیچ شتێکی بەشێوەیەکی تیۆریی (نظري) نەکردوە، وەك ئێستا باوە، بەڵکو خوا ﷻ لە قورئاندا هەمیشە بە شێوەی کردەیی پێناسەی شتەکان دەکات، بۆ وێنە: ئێمە دەڵێین: ئیمان بریتیە لە فڵان شت و فڵان شت، بەڵام خوای کاربەجێ لە قورئاندا پێناسەی ئیمان و پێناسەی تەقواو پێناسەی صەبرو پێناسەی ئیحسان و چاکەکاریی و ... هتدی، وا نەکردوە، بەڵکو خوا بەمجۆرە پێناسەی بڕواداران دەکات: ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۝١ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۝٢ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۝٣ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ۝٤ وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ ۝٥﴾ **المؤمنون**، تا کۆتایی.

هەروەها: ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ۝٦٣﴾ **الفرقان**، تا کۆتایی.

چونکە لەڕاستییدا کاتێك ئێمە بە شێوەیەکی تیۆریی و زەینیی بۆ یەکدی حاڵییکردن پێناسەی ئیمان دەکەین، پێناسەی شتێك دەکەین کە دامانڕنیوە لە واقیع و لە واقیعدا نیە، تەنیا لە مێشك و خەیاڵی ئێمەدا هەیە، لە واقیع دا ئیمان بە ڕووتیی نیە، ئیمان دەبێ مرۆڤێك هەڵگیرێ و، تەقوا دەبێ مرۆڤێك هەڵیگرێ، لەسەر ئەرزی واقیع بڕوادار هەیە، پارێزکار هەیە، چاکەکار هەیە، خۆڕاگر هەیە، بەڵام ئیمان و پارێزکاریی و خۆڕاگریی و چاکەکاریی لە دنیای واقیعدا بوونیان نیە، بەڵکو ئەو سیفەتانە دەبێ مرۆڤەکان هەڵیانبگرن، بۆیەش خوا ﷻ هەمیشە کە پێناسەی شتە باشەکان دەکات، پێناسەی خاوەنەکانیان دەکات، ئەوانەی ئەو شتە باشانەیان هەڵگرتوون،چونکە لە دنیای واقیعدا هەر ئەوە هەیە[1]، ئێمە سەرەتا لە پێناسەی ئیماندا هەر ئەوە دەڵێین کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لە سەری ڕێککەوتوون:

---

(١) واتە: کەسەکان هەن، کە هەڵگری ئیمان و تەقواو صەبرو چاکەکاریی ... هتدن.

## پێناسەی ئیمان

(**الإيمَانُ: قَولٌ وَعَمَلٌ، قَول القَلبِ واللِّسانِ، وعَمَل القَلبِ والجَوَارحِ، يَزِيدُ بِالطَّاعَةِ وَيَنقُصُ بِالمَعصِيَةِ**)، واتە: ئیمان قسەو کردەوەیە، قسەی دڵ و زمان و، کردەوەی دڵ و ئەندامەکان، بە چاکەو فەرمانبەریی زیاد دەکات و، بە سەرپێچیی و گوناهو تاوان کەم دەکات.

ئێستاش با لە پێنج بڕگەدا، ئەم پێناسەیەی ئیمان شی بکەینەوە:

**١)**- ئیمان وەك چییەت و هەقیقەتی خۆی تەنیا لە ڕێی وەحییەوە دەزاندرێ.

تەنیا لەڕێی وەحییەوە دەزانین ئیمان چییە؟ ئیمان کەی پەیدادەبێ؟ ئیمان بە چی و چی پێویستە؟ ئەو شتانەی زیان بە ئیمان دەگەیەنن و ئیمان هەڵدەوەشێننەوە، چین؟ لە سوورەتی (**الشورى**)دا، خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی فەرموویەتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾﴾، واتە: وەك چۆن وەحییمان بۆ پێغەمبەرانی دیکە نارد (صەڵات و سەلامی خوایان لێ بێ)، بەو شێوەیەش ڕووحێکمان لەلایەن خۆمانەوە بۆ لای تۆ ناردوە (کە مەبەست پێی قورئانە)، پێشتر نەتدەزانی نە بەرنامە چییە {(**کتاب**) واتە: بەرنامە}، نە ئیمانیش چییە، بەڵام ئێمە گێڕامان بە ڕووناکییەك، هەر کەسێك بمانەوێ لە بەندەکانمان پێی ڕاستەڕێ دەکەین و، بە دڵنیایی تۆش خەڵك دەخەیە سەر ڕاستە ڕێ، واتە: ڕێنماییان دەکەی و ڕێیان پێشان دەدەی، کەواتە: ئیمان لەڕێی وەحییەوە دەزاندرێ، بەڵام ئایا کەسێك کە دەزانێ: خوا ﷻ هەقەو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەقە، ڕۆژی دوایی هەقەو، فریشتەکان و، هەقن، کتێبەکان، ئایا ئەوانەی ئەو ڕاستییانە دەزانن بە ئیماندار لە قەڵەم دادەدنرێن؟ بێگومان نەخێر، چونکە زانینی شتێك جیایە لە ئیمان بەو شتە، زانینی ئەو شتە ئەوەیە دەزانی ئەو شتە چۆنە؟ بەڵام ئیمان پێی واتە: تۆ ئەو شتەت عەقڵ و هۆش بەڕاستت زانیبێ و، بە دڵ قبووڵ و پەسندت کردبێ، ئنجا بە زمان دانت پێدا هێنابێ و، بە کردەوەش بەو شێوەیە ڕەفتار بکەی کە ئیمانەکەت دەیخوازێ.

ئەگەر یەکێك بڵێ: جوولەکەکان و نەصرانییەکانیش ئەوەیان هەیە، دەڵێین: ڕاستە، بەڵام دەبێ زانین و دەرککردنی ئیمان بە عەقڵ و، پەسند کردنەکەی بە دڵ، بەو شێوەیە بێ کە خوای پەروەردگار ویستوویەتی، چونکە ئەو مرۆڤایەتییەی دوای ڕەوانەکرانی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دێ، دەبێ هەمووی ئیمان و خواپەرستییەکەی لە ڕێی پێغەمبەری خاتەمەوە بێ، لەڕێی ئەو پەیام و بەرنامەیەوەی خوا بە کۆتا پێغەمبەری خۆیدا ناردوویەتی، بەو شێوەیە خوا بناسێ و بەندایەتیی بۆ خوا بکات و، شوێن پێغەمبەرانی خوا بکەوێ و، شوێن حەڵاڵ و حەرامی خوا بکەوێ و، هەموو لایەنەکانی دینداریی دنیاداریی جێ بەجێ بکات بە کردەوەو، بە زمانیش دانی پێدابنێ، بە هەمان شێوە.

**٢)-** شوێنی سەرەکیی ئیمان بریتیە لە دڵ.

خوا ﷻ لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەو ڕاستییەی بەیانکردوە، بۆ وێنە:

**أ-** لە سوورەتی (**الحجرات**)دا، دەفەرموێ: ﴿قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ...﴿١٤﴾﴾، واتە: عەرەبە خێڵەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، بفەرموو: ئیمانتان نەهیناوە بەڵکو بڵێن: مسوڵمان بووین، (واتە: بە ڕواڵەت و ڕووکەشیی هاتووینە نێو ئیسلامەوە)و، جارێ ئیمان نەچۆتە نێو دڵتانەوە، کەواتە: ئیمان دەچێتە نێو دڵەوە.

**ب-** هەروەها لە سوورەتی (**المجادلة**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ ...﴿٢٢﴾﴾، (خوا) ئیمانی لە دڵدا نووسیون، واتە: ئیمانی لە دڵدا چەسپاندوون، ئنجا ئایا ئیمان تەنیا ئەوەیە کە تەنیا لە دڵدایە؟ نەخێر، بەڵکو وەك دوایی باسی دەکەین، کردەوەکانیش بەشێکن لە ئیمان و، دانپێداهێنانی زمانیش بەشێکە لە ئیمان، بەڵام بەشی سەرەکیی و بنەڕەتیی ئیمان، لە دڵدا دەچەسپێ، ئەگەرنا ئەوەی بە زمانیش تەعبیر دەکرێ، هەر ئیمانەو، ئەوەش کە بە عەقڵ دەرك دەکرێ، هەر ئیمانەو، ئەوەی دواییش پراکتیزە دەکرێ بە ئەندامەکان، ئەویش هەر ئیمانە، بەڵام بەشی سەرەکیی ئیمان ئەوەیە

کە لە دڵ و دەروونی‌دا جێگیر دەبێ، چونکە ئەوانی دیکە، دەگونجێ کەسێك کە بە ئیمانداریش دانانرێ هەبن، بۆ نموونە: ئیبلیس زۆر چاك خوای ناسیوەو، دەرکی ئەو ڕاستییانەی کردوە، بەڵام بە ئیماندار دانانرێ، چونکە بە دڵ قبووڵی نەکردوون، هەروەها مونافیق و دەغەڵەکان، وێڕای دەرککردنی ڕاستییەکان، بە کردەوەش جێبەجێیان کردوەو، بە زمانیش دانیان پێدا هێناوە، بەڵام چونکە بە دڵ پەسندو قبووڵیان نەکردوەو، لە دڵدا ئیمانیان نەبووە، بە بڕوادار دانانرێن، کەواتە: ئەوەی بڕوادارو و دەغەڵ (**مؤمن و منافق**) لە یەك جیادەکاتەوە، بریتیە لەو حاڵەتە دڵ و دەروونییە پەنهانەی کەسی ئیماندار بە دڵ شتەکانی قبووڵ کردوون، بەڵام بابای مونافیق هەروا بە زمان دەیانڵێ و، بەڕووکەشیی بە ئەندامەکان جێبەجێی دەکات، بەڵام لە دڵیدا ڕاستییەکانی ئیمان جێگیر نەبوون و، پەسندی نەکردوون.

**٣)**- ئیمان زیاد دەکات بە هەر شتێك کە بە چاکەو تاعەت دادەنرێ:

واتە: بە هەموو ئەو چالاکی و جم و جۆڵە پەنهان و ئاشکرایانەی بە فەرمانبەریی بۆ خوا دادەنرێن، ئیمان زیاد دەکات، خوا ﷻ ئاوا پێناسەی ئیمانداران دەکات، کە بە هۆی فەرمانبەریی و چاکەو تاعەتەوە ئیمانیان زیاد دەکات:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾الأنفال.

واتە: ئیمانداران تەنیا ئەوانەن کاتێك یادی خوا دەکرێ، دڵیان ڕادەچڵەکێ و، کاتێك ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ئیمانیان زیاد دەکات و، تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، ئا ئەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، لە لای پەروەردگاریان چەندان پلەیان هەن، وێڕای بژیوێکی پەسندو بژاردە.

ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین: هەموو ئەو شتە چاکانەی چ پەیوەندییان بە دڵ و دەروونەوە هەیە، وەك ترس و سام و هەیبەت بەرانبەر بە خوا، یان پەیوەندییان بە عەقڵەوە هەیە، وەك تێگەیشتن لە ئایەتەکانی خوا، یان پەیوەندییان بە جەستەو ڕواڵەت و دەروونی مرۆڤەوە هەیە، وەك بەرپاکردنی نوێژو، ماڵ بەخشین و، ... هتد، خوا ﷻ بە سیفەتەکانی بڕواداران ڕاستەقینەیان لە قەڵەم دەدات.

بۆ وێنـــە:

**١-** خوا ﷻ لە باسی گۆڕانی ڕووگە (**قبلة**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٣﴾ ﴾**البقرة**، واتە: خوا ناگونجێ ئیمانەکەتان زایە بکات، بە دڵنیایی خوا بەرانبەر خەڵك میهرەبان و بە بەزەییە، ڕوونکەرەوانی قوڕئان لە سەر ئەوە یەکدەنگن کە لێرەدا ﴿ إِيمَـٰنَكُمْ ﴾، (**أي: صَلاتَكُم**)، واتە: نوێژەکەتان، چونکە کاتێك مسوڵمانان فەرمانیان پێکرا لە (**بيت المقديس**)ەوە ڕوویان وەرگێڕن بۆ لای کەعبە، هەندێکیان کە خزمانیان شەهید بوو بوون، یان وەفاتیان کردبوو، لە نوێژەکانیشیاندا ڕوویان کردبووە (**بيت المقدس**)، بۆیان نیگەران بوون و گوتیان: ئەو خزمانەمان نوێژەکانیان ڕوو بە (**بيت المقدس**) کردوون و، خوای بەرزو مەزنیش ئێستا ڕووی پێ وەرسووڕاندووین بەرەو کەعبە، کەواتە دەبێ نوێژو تاعەتەکەیان زایە بووبێ!! خواش فەرمووی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَـٰنَكُمْ ... ﴿١٤٣﴾ ﴾**البقرة**، خوا ئیمانەکەتانی زایە ناکردوەو زایەی ناکات، کە مەبەست پێی نوێژە، واتە: خوا ئەو نوێژانەی ڕوو بە (**بيت المقدس**) کردوویانن، ناوی لێناون: ئیمان، ئەمە لە صەحیحی بوخارییدا بە ژمارە: (٢٣٤٠) هاتوە: (**إيمانَكُم: أي صَلاتَكُم**).

**ب-** هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾ ﴾**المائدة**.

واتـە: ئەمـڕۆ شـتە چـاك و خۆشـەكانتان بـۆ حـەڵاڵ كـراون و، خـۆراكی خـاوەن كتێبـان بـۆ ئێـوە حەڵاڵـەو، خـۆراكی ئێـوەش بـۆ ئـەوان حەڵاڵـە، هەروەهـا ئافرەتـانی پاكیـزە لـە بـڕواداران و، ئافرەتـانی پاكیـزە لەوانـەی لـە پێـش ئێـوەدا كتێبیـان پێدراوە، ئەگـەر مارەییەكانتـان دانـێ، لـە حاڵێكـدا خـۆ پاكڕاگـرن و بـە پەنهانیـی دۆسـتان ناگـرن، (یـانی: بەئاشـكراو بـە پەنهانیـی زینـا ناكـەن)، هـەر كەسـێكیش كوفـر بـە ئیـمان بـكات، كردەوەكـەی هەڵوەشـاوەتەوەو لـە دواڕۆژیشـدا لـە زیانبارانـە.

وەك دەبینیـن ئـەوەی باسـكراوە، هەمـووی پابەنـد بوونـە بـە حـەڵاڵ و حـەڕام و شــەریعەتەوە، كەچــی دوایــی خــوا دەفەرمــوێ: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾، هــەر كەسـێك كوفـر بـە ئیـمان بـكات، كردەوەكـەی هەڵوەشـاوەتەوەو، لـە دواڕۆژیشـدا لـە زیانبارانـە، ئنجـا مەبەسـت لـە ئیـمان لـەو سـیاقەدا، پابەنـد بوونـە بـە حـەڵاڵ و حەڕامێكـەوە كـە خـوا ناردوویـەتی، لــە بــواری هاوســەرگیریی و، بــواری خــواردن و خواردنــەوەدا.

أ- وەك لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانی ئیمانداران كە دەپاڕێنەوە، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ... ﴿٤٣﴾﴾**الأعراف**، واتە: گوتیان: ستاییش بۆ ئەو خوایەی ڕێنمایی كردین بۆ ئەم (ڕێباز)ەو، ئەگەر ئەو ڕێنمایی نەكردباین، ئێمە ڕێمان پێ نەدەزانی.

ب- هەروەهـا لـە سـوورەتی (**آل عمـران**)دا خوا لەسـەر زمـانی بـڕواداران دەفەرموێ: ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّا... ﴿١٩٣﴾﴾، واتــە: پەروەردگارمـان! ئێمـە گوێـمان لـە بانگەرێـك بـوو بانگـی دەكردیـن: ئیـمان بێنیـن بـە پەروەردگارتـان، ئێمـەش ئیمانـمان هێنـا.

لێـرەدا یەكێـك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئایـا پێغەمبـەری كۆتاییـش موحەمـد ﷺ پێـش ئـەوەی وەحیـی بۆبـێ ئیـمانی نەبـووە؟! دەڵێیـن: ئیـمان مەبەسـتت پێـی چییـە؟ ئەگـەر مەبەسـتت پێـی خـوا ناسـییە، بێگومـان خـوای ناسـیوەو، بـڕوای بـە ڕۆژی دوایی بـووەو،

بڕوای بەوە بووە کە ئەم ژیانە دنیاییە هەوەنتە نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ خواناس بووە، چونکە هەموو مرۆڤەکان، خوا لەسەر زگماکی خواناسیی دەیانخوڵقێنێ، بەڵام ئەگەر بڵێین: ئیمانی نەبووە، بەو واتایە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەوەی لەڕێی وەحییەوە دەزانرێ، نەیزانیوە، ئەوە شتێکی ڕاستمان گوتوە، وەك لە سووڕەتی (الضحى)شدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ﴿٧﴾ ﴾الضحى، واتە: (خوا) تۆی بە گومڕا بینی، ئنجا تۆی ڕێنمایی کرد، ئنجا بێگومان پێغەمبەری خاتەم ﷺو پێغەمبەرانی دیکەش، ئەگەر ئەوەی دوای بوونە پێغەمبەر، زانیویانە، پێش بوونە پێغەمبەریش هەر زانیبیان، ئایا ئازایەتیی وەحیی لە چیدایە؟ لەڕاستییدا ئەوەی بەهۆی وەحییەوە دەزاندرێ، بەبێ وەحیی نازانرێ، خوای پەروەردگاریش بە دەقی ئایەت دەفەرموێ: ﴿ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ ...﴿٥٢﴾ ﴾الشورى، واتە: نەتدەزانی نە بەرنامە چییەو نە ئیمانیش چییە، بەڵام ئەمە مانای وانیە کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ خوای نەناسیوە، چونکە خواناسیی شتێکەو، بڕوابوون بە خواو بەڕۆژی دوایی، شتێکی دیکەیە، ئیمانیش بەو شێوەیەی وەحیی خوا نوختەی تێدا دەخاتە سەر پیت، پێش هاتنی وەحیی و پەیامی خوا نازانرێ.

## پێناسەی بەندە بۆ ئیمان

بە عەرەبیی لەو موسووعە عەرەبییەدا[1] کە باسم کرد، پێناسەی ئیمانم کردوە، دەڵێم:

**(الإِيْمَان: هُوَ النُّورُ الَّذِي يَكْتَسِبُهُ الإنْسَان بِتَوْفِيقِ اللهِ وَتَيْسِيْرِهِ وَهِدَايَتِه، وَمُسْتَقَرُّهُ القَلْبُ، وَلَكِنْ يَنْعَكِسُ ضِيَاؤهُ عَلَى بَاطِنِ الإنْسَانِ، فَيُثْمِر فِيْه اليقِيْن وَالطُّمَأْنِيْنَة وَالتَّصْدِيْق وَكَذَلِكَ يَنْعَكِسُ عَلَى ظَاهِرِه، فَيُزَيِّنه بالإقْرَار وَالسَّمْعِ وَالطَّاعِة، والإتبَاع، وَيَجْعَلُه مُتحلِّياً بالفَضَائل النفْسِيَّة وَالخُلُقيَّة، كَالشَّمْسِ الَّتي تُضِيءُ بأشعَّتِها مَا حَوْلَهَا وَمَا بَعُدَ عَنْهَا).**

---

(١) موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله.

واتـە: ئیـمان ئـەو ڕۆشـناییەیە کـە مـرۆڤ بـە ئاسـانکاریی و ڕێنمایـی و بـە دەستگرتنی خـوا وەدەسـتی دێنـێ، شـوێنی سـەرەکیی ئیمانیـش دڵـە، بـەڵام ڕۆشـنایی ئیـمان هەمـوو دەروونی ئینسـان ڕوونـاك دەکاتـەوەو، دڵنیایـی و ئارامیـی و بەڕاسـت زانینـی تێـدا دەچەسـپێنێ، هەروەهـا ئیـمان لەسـەر ڕواڵـەتی ئینسـانیش دەردەکـەوێ و، ڕواڵەتەکـەشی بـە دانپێـدا هێنـانی زمـان و، گوێگرتـن و، فەرمانبەریـی و شـوێنکەوتن جـوان دەکات و، وا لـە مـرۆڤ دەکات ڕازاوە بـێ بـە سـیفەتە بـەرزە دەروونیـی و ڕەوشـتیەکان، وەك خـۆر کـە بـە تیشـکەکەی دەوروبـەری خـۆی ڕوونـاك دەکاتەوەو، ئـەوەشی کـە لێـی دوورەو ڕوونـاکی دەکاتـەوە.

## تەوەری دووەم/ پایەکانی ئیمان:

خـوای پـەروەردگار لـە قورئانـدا بـاسی پێنـج بنەڕەتـان دەکات بـۆ ئیـمان، بـەڵام لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ بنـەڕەتی شەشەمیشـیان خراوەتـە گـەڵ، واتە: ئـەو پێنجەو ئـەو یەکـە دەبـن بـە شـەش، لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا، خـوا ئـاوا بـاسی بنەڕەتـەکانی ئیـمان دەکات: ﴿ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ...﴿١٧٧﴾ ﴾، واتـە: چاکەکاریـی ئـەوە نیـە ڕوو بکەنـە خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا، بەڵکـو چاکەکاریـی (سـیفەتی) کەسێکە بـڕوای هێنـاوە بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی و بـە فریشـتەکان و بـە کتێـب(ی خـوا)و بـە پێغەمبـەران، صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ، کەواتـە: پایـەکانی ئیـمان، لەقورئانـدا بریتیـن لـە ئیـمان بـە خـواو، بـە فریشـتەکانی و، بـە کتێبـەکانی و، بـە پێغەمبـەران و، بـە ڕۆژی دوایـی.

لـە سـوورەتی (**النسـاء**)یش دا، دیسـان خـوا بـاسی ئـەو پێنـج بنەڕەتـە دەکات، بـەڵام بـەو شـێوازە کـە کوفـر بریتیـە لـە نکوولیکـردن لـەو پێنـج بنەڕەتـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِن قَبۡلُۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ

﴿ضَلَـٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦﴾، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بڕوابێنـن بـە خـواو بـە پێغەمبەرەکـەی و بـەو کتێبـەی ناردوویەتـە سـەر پێغەمبەرەکـەی و، بـەو کتێبـەی پێشـتر دایبەزانـدوە، (کـۆی ئـەو کتێبانـەی پێشـتر دایبەزانـدوون)، هـەر کەسـێك بێبڕوابـێ بـە خـواو بـە فریشـتەکانی و بـە کتێبـەکانی و بـە پێغەمبـەرانی و بـە ڕۆژی دوایـی، بـە گومڕاییـەکی دوور گومـڕا بـووە.

جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە لـە ئایـەتی ژمـارە (١٧٧)ی سـوورەتی (**البقـرة**)دا، یەکسـەر لـە دوای ئیمان بـە خـوا، بـاسی ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی کـراوە، کـە بنـەڕەتی دووەمـە لـە ڕووی گرنگییـەوە، چونکـە لـە ڕووی گرنگییـەوە، ئیـمان بـە خـوا بناغەیـەو، دوای ئـەوە یەکسـەر ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی دێ، ئنجـا ئیـمان بـە فریشـەکان و کتێبـەکان و پێغەمبـەران، بـەڵام لـە ئایـەتی (١٣٦)ی سـوورەتی (**النسـاء**)دا، چونکـە بـاس بـاسی کوفـرە و، لـە سـۆنگەی ئـەوەوەی دوایـین شـت کـە بابـای بێبـڕوا بیـری لـێ دەکاتـەوە بریتیـە لـە ڕۆژی دوایـی، بۆیـە خـوا ﷻ ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی خسـتۆتە کۆتایـی، دوا شـت بابـای بێبـڕوا بیـری لێدەکاتـەوە ڕۆژی دواییـە، بـەڵام یەکەمیـن شـت کـە بـڕوادار بیـری لێدەکاتـەوە لـە دوای ئیـمان بـە خـوا، بریتیـە لـە ئیـمان بـە ڕۆژی دوایـی.

لـە فەرمایشـتی پێغەمبەریشـدا ﷺ وێـڕای ئـەو پێنـج بنەڕەتـە، بنەڕەتێـکی دیکـەی شەشـەمیش باسـکراوە، کـە ئـەو فەرموودەیـەی بـە فەرمـوودەی جیریـل (**حَدیـثُ جِبريـل**) نـاسراوە، کـە جیبریـل لـە شـێوەی پیاوێکـدا بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: {«**فَأَخْـبِرْنِي عَـنِ الإِيمَـانِ**»، **قَـالَ: أَنْ تُؤْمِـنَ بِاللـهِ وَمَلَائِكَتِـهِ وَكُتُبِـهِ وَرُسُـلِهِ وَالْيَـوْمِ الآخِـرِ، وَتُؤْمِـنَ بِالْقَـدَرِ خَـيْرِهِ وَشَرِّهِ**} (**أخرجـه البخـاري: ٥٠، ومسـلم: ١**) واتـە: هەواڵـم پێبـدە دەربـارەی ئیـمان، ئەویـش فەرمـووی: ئیـمان ئەوەیـە: بڕوابێنـی بـە خـوا، بـە فریشـتەکانی خـواو، بـە کتێبـەکانی خـواو، بـە پێغەمبـەرانی خـواو، بـە ڕۆژی دوایـی و بڕوابێنـی بـە قـەدەر (ئەندازەگیریـی و نەخشـەی خـوا)، کـە چـاکی و خراپـی (بـە نسـبەت ئێمـەوە، ئـەوەی پێـمان خۆشـەو، ئـەوەی پێـمان ناخۆشـە و ئـەوەی لـە

بەرژەوەندیی خۆمانی دەزانین و ئەوەش لە زیانی خۆمانی دەزانین)، هەمووی لە لایەن خواوەیە.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو پایەی بۆ ئیمان زیاد کردوە؟ دەڵێین: بێگومان ئەوە یەکێکە لەو شتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴿٤٤﴾﴾ النحل، پێغەمبەری خوا ﷺ زانیویەتی ئۆممەتەکەی دوایی مشتومڕیان دەبێ لە بارەی قەدەرەوە، بۆیە ئیمان بە قەدەریشی خستۆتە پاڵ ئەو پێنج بنەڕەتە، بەڵام ئایا بۆچی لە ئایەتەکاندا نەهاتوە؟ چونکە لەڕاستییدا ئیمان بە قەدەر و ئەندازەگیریی خوا هەر دەچێتەوەو نێو ئیمان بە خوا، چونکە ئیمان بە قەدەر واتە: ئیمان بێنی بە زانیاریی گشتگیری خواو، ویستی ڕەهای خواو، توانای بێ سنووری خواو، حیکمەتی خوا، کەواتە: ئیمان بە قەدەر هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بە خوا، یانی: خوا نەخشەی بۆ ئەم بوونە داناوەو، پێش ئەوەی دروستییکات، هەموو شتێکی لەوبارەوە زانیوەو، هەموو شتێکی لە بارەوە دەزانێ، هیچ شتێك بەبێ ویستی خوا نابێت و، هیچ شتێك دروست نەبووە و بەڕێوەناچێ بەبێ خوا، ئیمان بە قەدەر ئەوەیە، بەڵام خوا ﷻ دادگەرەو خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتەو، ستەم لە هیچ کەس ناکات.

هەروەها لە چەند شوێنێکی قورئاندا، خوای زاناو کارزان باسی قەدەری کردوە، بۆ وێنە:

**١)-** ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ **القمر**، واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەگیریی دروستکردوە.

**٢)-** هەروەها لە سوورەتی **(الفرقان)**دا، دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ **الفرقان**، واتە: (خوا) هەموو شتێکی هێناوەتە دی و ئەندازەگیریی بۆ داناوە بە ئەندازەگیرییەك (هەر شایستەی خۆیەتی).

## تەوەری سێیەم/ پێکهاتەکانی ئیمان:

ئەوانەی تەوەری ڕابردوو پایەکانی ئیمان بوون، بەڵام پێکهاتەکانی ئایا ئیمان چین ئیمان لەچی پێکدێ؟ پێشتر لە پێناسەکەیدا تیشکێکمان خستە سەر، بەڵام ئێستا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، کە ئیمان لە چوار شتان پێك دێ، بەپێی پێناسەی هەرە باوی زۆربەی هەرە زۆری زانایان، کە دەڵێن: (**الإِيمانُ: قَولٌ وَعَمَل، قَولُ القَلبِ وَاللِّسان، وَعَمَلُ القَلبِ وَالجَوارِح**).

١)- (**قَولُ القَلبِ**): قسەی دڵ، واتە: زانینی دڵ، ئەوە کە مرۆڤ بە عەقڵ و دڵ و دەروون ئەو شتانە بزانێ کە دەبێ ئیمانیان پێ بهێنێ، واتە: زانین و پەیپێبردنی عەقڵ.

٢)- (**قَولُ اللِّسان**): قسەی زمان، ئەوەیە، مرۆڤ دان بەو شتانەدا بنێ، کە لە بارەی ئیمانەوە زانیونی.

٣)- (**عَمَلُ القَلبِ**): کردەوەی دڵ، ئەوەیە کە مرۆڤ ئەو شتانەی لە بارەی ئیمانەوە زانیونی، بەڕاستیان بزانێ و خۆشیبوێن و قبووڵ و پەسندیان بکات.

٤)- (**عَمَلُ الجَوارِح**): کردەوەی ئەندامەکان، واتە: مرۆڤ دەبێ بەپێی خواست و داخوازی ئەو حەقیقەتانەی بە عەقڵ دەرکی کردوون و، لە دڵدا جێگیر بوون و، بە زمان دانی پێدا هێناون، ئەندامەکانیشی بەو پێیە ڕەفتار بکەن.

کەواتە: ئیمان چوار پێکهێنەری هەن، چونکە مرۆڤ چوار هێزی هەن:

١- هێزی عەقڵی هەیە، شتی پێ دەزانێ.

٢- هێزی دڵی هەیە، شتی پێ دەوێ، یاخود ڕەفز دەکات.

٣- هێزی دەربڕینی هەیە، کە زمانە.

٤- هێزی جێبەجێکردنی هەیە، کە جەستەو ئەندامەکانن، ئیمانیش پەیوەندیی بە هەر چوار هێزەکەی مرۆڤەوە هەیە، ١- مرۆڤ دەبێ بە هێزی عەقڵ و ئیدراك ڕاستییەکانی

ئیمان دەرك بكات، ٢- ئنجا بەهێزی دڵ و ویستن، ئەو ڕاستییانەی بوێن و پەسندیان بكات، ٣- ئنجا بەهێزی دەربڕین، تەعبیر بكات لەو ڕاستییانە، ٤- بەهێزی جێبەجێ كردنیش، بەو پێیە بەڕێوە بچێ و جێبەجێیان بكات.

بەڵام ئایا بۆچی خوا ﷻ زیاتر باسی دڵ دەكات؟ لەبەر ئەوەی وەك پێشتریش گوتمان: دڵ جیاكەرەوەی خاوەنانی كوفرو خاوەنانی ئیسلامەو، جیاكەرەەی خاوەنانی ئیمان و خاوەنانی نیفاقە، ئەگەرنا بێبڕواش جاری وایە هەق دەناسێ بە عەقڵ و، بە زمانیش دانی پێدا دێنێ و، جاری وا هەیە بە جەستەشی هەندێك لە كردەوەكانی مسوڵمانان جیبەجێ دەكات، بەڵام ئەگەر دڵەكەی هەقی تێدا نەبوو، بە دڵ ئیمان و ئیسلامی خۆشنەویست و لە دڵ و دەروونیدا ئیمان نەبوو، بە بڕوادار دانانرێ، بەڵێ بە ڕواڵەت بە مسوڵمان ئەژمار دەكرێ، وەك مونافیقەكان، بەڵام بە ئیماندار دانانرێ، كەسانێك كە خوای كارزان و پەروەردگار مەدح و ستایشیان دەكات و، بەڵێنی بەهەشت و ڕەزامەندیی خۆی پێداون.

## تەوەری چوارەم/ بڕوادار كێیە؟

هەرچەندە دوای ئەو باسانەی ڕابردن، ئێستا دەزانین بڕوادار كێیە، بەڵام بۆ زیاتر تیشك زیاتر خستنە سەری، با تەماشای چەند ئایەتێكی قورئان بكەین:

١- لە سوورەتی (الأنفال)دا كە پێشتریش هێنامان، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾.

لێرەدا خوا پێنج شتی كردوون بە پێناسە بۆ بڕواداران.

واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن كاتێك باسی خوا بكرێ دڵیان ڕادەچڵەكێ و، كاتێك ئایەتەكانی وییان بەسەردا بخوێنرێنەوە، ئیمانیان پێیان زیاد دەكات و،

تەنیا پشت بە پەروەردگاریان دەبەستن، ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن و، لەوەی پێمان داون دەبەخشن، ئا ئەوانە بەڕاستیی بڕوادارن، چەندان پلەیان هەن لە لای پەروەردگاریان و لێبوردنێك و بژیوێكی پڕ ڕێزو حورمەت و پەسندو چاك.

٢- لە سووڕەتی (**الحجرات**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾﴾، واتە: بڕواداران تەنیا ئەوانەن كە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەكەی هێناوە، دواییش هیچ دوو دڵییان نیەو، لەپێناوی خوادا تێدەكۆشن بە سامان و گیانیان، ئا ئەوانە ڕاستن، (كە بڕوایان هێناوە).

٣- لە سووڕەتی (**النور**)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾.

واتە: بێگومان قسەی بڕواداران كاتێك بانگ بكرێن بۆ لای خواو ڕەوانەكراوەكەی، تاكو دادوەرییان لە نێواندا بكات، هەر ئەوەیە كە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەریین، ئا ئەوانەش سەرفرازن.

٤- هەر لە سووڕەتی (**النور**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ...﴿٦٢﴾﴾، واتە: تەنیا ئەوانە بڕوایان بە خواو بە پێغەمبەرەكەی هێناوە، كە كاتێك لە خزمەتیدا دەبن بۆ كارێكی كۆكەرەوە (هەرەوەزیی)، ناڕۆن تاكو مۆڵەتی لێ وەرنەگرن.

٥- دیسان لە سووڕەتی (**الحجرات**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ...﴿١٠﴾﴾، واتە: تەنیا بڕوادران بران، یاخود: بڕواداران تەنیا بران.

كەواتە: بڕوادار كەسێكە بە تەواویی بۆ خوا ملكەچە، هەم لە ڕووی مەعنەوییەوە، هەم لە ڕووی جەستەییەوە، هەم دەروونی و هەم دەری، هەم لە ژیانی تاكیی، هەم لە ژیانی خێزانیی، هەم لە ژیانی كۆمەڵایەتیی، هەم لە ژیانی سیاسیی و... هتد دا ڕادەست و ملكەچی خواو ئایینەكەیەتی.

٦- هەروەها با تەماشای ئەم دەقەش بکەین، لە سوورەتی (النساء)دا: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾﴾.

واتە: ئایا سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە پێیان وایە ئیمانیان هێناوە بەوەی بۆ تۆ نێردراوەتە خوارو، بەوەش کە پێش تۆ دابەزێنراوە، لە کاتێکدا دەشیانەوێ دادوەریی خۆیان ببەنە لای **طاغووت**، کە فەرمانیشیان پێکراوە پێی بێبڕوابن، شەیتانیش دەیەوێ زۆر دووریان بخاتەوەو گومڕایان بکات.

کەواتە: کەسێك هەر بە دڵیشی دابێ و بەس بیەوێ دادوەریی خۆی ببات بۆ لای **طاغووت**، بۆ لای کەسێك و حوکمێك کە پێچەوانەی شەریعەتی خوایەو، پێی وابێ لەوێ کێشەکەی بۆ چارەسەر دەبێ و، قەناعەتی پێی بێ، بێگومان لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەچێتە دەرێ.

## تەوەری پێنجەم/ ئایا کردەوە بەشێکە لە ئیمان، یان نا؟:

لەو بارەوە مشتومڕی زۆر بووە لە نێوان زانایانداو، بە گشتیی بوونە سێ بەش:

١- هەندێکیان کە دەگونجێ ناویان بنێین: کەمتەرخەمان و زایەکەران (**المُفَرِّطون**) کە جەهمییەو مورجیئەن، ئەوانە گوتوویانە: کردەوە پێکهێنەری ئیمان نیە، یانی: دەگونجێ ئینسان هیچ کردەوەیەکی نەبێ و، هیچ پابەندییەکی نەبێ و، ئیمانداریش بێ!

٢- بەشی دووەمیان کە دەگونجێ پێیان بڵێین: تێپەڕێنەران و زێدەڕۆییکەران (**المُفرِطون**) کە خەواریج و موعتەزیلەن، گوتوویانە: هەموو کردەوەیەك پێکهێنەری ئیمانە، کەواتە: ئەگەر ئینسان ئەرکێکی پێویست بچوێنێ، پێی کافر دەبێ، هەروەها هەر گوناهێکیش بکات، هەر پێی کافر دەبێ، ئەوانەش تێیانپەڕاندوە، پێچەوانەی ئەوانەی پێشێ.

٣- بەڵام زۆربەی هەرە زۆری ئوممەت، ئەوانەن کە خەتی نێوەڕاستیان گرتوە (**المُتَوَسِّطون**)، کە گوتوویانە: جینسی کردەوە بەشێکی ئیمانە، ئنجا یان پێکهێنەرێکیەتی، یاخود

تەواوکەریەتی، واتە: گوتوویانە: جینسی کردەوە پێکهێنەری ئیمانە، یاخود تەواوکەری ئیمانە، واتە: ئیمان بەبێ کردەوە نابێ، بەڵام جینسی کردەوە، نەك هەموو کردەوەیەك ئیمان بێ، بۆ وێنە: لە بارەی نوێژەوە عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەگێڕێتەوە:

**{عَنْ عَبْدِ اللهِ بنِ شَقِيق، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ لا يَرَوْنَ شَيْئاً مِنَ الأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ، غَيْرَ الصَّلاَةِ} (أخرجه الترمذي: ٢٦٢٢، وَصَحَّحَهُ الألباني).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق (یەکێکە لە زانایانی تابیعین)، دەڵێ: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ وازهێنان لە هیچ کردەوەیەکیان بە کوفر داناوە، جگە لە نوێژ، واتە: کەسێك نوێژی نەکردبێ، خاوەنەکەیان بە کافر دانەناوە، بەڵام وەك ئەمانەتی زانستیی دەبێ ئەوە بڵێین: کە ئێستا زانایانی چوار مەزهەبەکان، سێیان: ئەبوو حەنیفەو مالیك و شافیعیی، ڕایان وایە کەسێك نوێژ نەکات، لەبەر تەنبەڵیی، هەر بە مسوڵمان لە قەڵەم دەدرێ، بەڵام تاوانێکی گەورەی کردوە، بەڵام ئەحمەد ڕەحمەتی خوا لە هەر چواریان بێ، ڕای وایە کە کەسێك نوێژی هەر نەبێ، بە هەر بیانوویێکەوە بێ، بە بێبڕواو نامسوڵمان لە قەڵەم دەدرێ.

هەڵبەتە ئێمە ئەو باسەمان لە مەوسووعەی (خواپەرستیی ئیسلامیی) لە بەرگی دووەمدا، بە درێژیی باسکردوە و، لە ڕاستییدا ئەو ڕایەی دەڵێ: نوێژ مەرجە بۆ بە مسوڵمان دانران، جگە لە ئایەتەکان، بۆ وێنە:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾﴾ القيامة، واتە: ئنجا بەڕاستی نەزانی و نوێژی نەکرد، بەڵکو بە درۆی داناو پشتی تێکرد.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**التوبة**)شدا خوا دەفەرموێ: ﴿فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِى ٱلدِّينِ ...﴿١١﴾﴾ **التوبة**، واتە: ئنجا ئەگەر گەڕانەوەو نوێژیان بەرپا کردو زەکاتیان دا، براتانن لە ئایین دا، کەواتە: ئەگەر وایان نەکرد، لە ئایین دا براتان نین.

لەوبارەوە فەرمایشتی پێغەمبەریش ﷺ زۆر ڕوونن، بۆ وێنە:

**١)**- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفر**} (**أخرجه ابن أبي شيبه: ٣٣٩٦، وأحمد: ٢٩٨٧، والترمذي: ٢٦٢١، والنسائي: ٤٦٣، وابن ماجه: ١٠٧٩، وابن حبان: ١٤٥٤، والحاكم: ١١**).

واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا، (واتە: نامسوڵماناندا) هەیە نوێژە، هەر کەسێك وازی لێ هێنا، بێبڕوا بووە.

**٢)**- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**ما بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ: تَرْكُ الصَّلَاةِ**} (**أخرجه مسلم: ٨٢، وأبو داود: ٤٨٧٨، والترمذي: ٢٦١٩، وابن ماجه: ١٠٧٨، والبيهقي: ٦٢٨٧**) واتە: لە نێوان پیاوو شیرك و کوفردا، واز لێ هێنانی نوێژە.

یانی: هەر کەسێك نوێژی واز لێهێنا، لە بازنەی ئیسلام دەرچووە.

دەقی دیکەش لەو بارەوە زۆرن، بەڵام بە هەر حاڵ زانایان کە وردیان کردۆتەوە، بوونە ئەو دوو ڕایەی خستمانەڕوو.

## تەوەری شەشەم و کۆتایی/ پلەکانی ئیمان:

بێگومان ئیمان یەك پلە نیە، بەڵکو بە لای کەمەوە سێ پلەی سەرەکیی هەن:

**١**- پلەی یەکەم: ئیمانی سەرەتا، یان بنەڕەتی ئیمان (**مُطلَقُ الإيمان أَو أَصلُ الإِيمان**):

ئەویش بریتیە لە لای کەمی ئیمان، لای کەمی ئیمانیش ئەوەیە کە ئینسانی پێ دەبێتە بڕوادار، پێی دەبێتە مسوڵمان لە لای خواو لە لای خەڵك.

**٢**- پلەی دووەم: ئیمانی پێویست (**الإيمانُ الواجِب**) ئەویش ئەو ئیمانەیە کە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە گوناهی گەورە، گوناهی گەورەش یان چواندنی ئەرکێکە، یاخود شکاندنی قەدەغەیەکە، بۆ وێنە: نوێژ نەکردن گوناهی گەورەیە، هەروەها زەکات نەدان و ڕۆژوو

نەگرتن، دیسان هەر کام لە قەتڵ و دزیی و زیناو غەیبەت و درۆو ئەوانە، هەموویان گوناهی گەورەن، ئنجا ئیمانی پێویست ئەوەیە کە مرۆڤ لە گوناهە گەورەکان بپارێزێ، گوناهی گەورەش ئەوەیە: یان سزای دنیایی لەسەر بێ، یاخود هەڕەشەی ڕۆژی دوایی.

٣- پلەی سێیەمی ئیمان: ئیمانی پەسند (**الإيمانُ المُستَحَبّ**) ئەویش ئەو ئیمانەیە کە خاوەنەکەی دەگێڕێتەوە لە گوناهە گچکەکانیش و وای لێدەکات ببێتە بەندەیەکی چاك و بۆ خوا صوڵحاوو ئیمان دامەزراو.

هەڵبەتە لە بەینی ئەو سێ پلەیەشدا، پلەی زۆر هەن، بەڵام ئەو سێیە پلە سەرەکییەکانن، ئەوە ڕوونکردنەوەیەك بوو لە بارەی ئیمانەوەو، بە هۆی ئیمانێکی ساغ و ڕاست و چاکەوەش، کردەوەی باش چاك لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێن، ئیمان کانیی و سەرچاوەیەکە ئاوی زوڵاڵی کردەوە باشەکان لەوێوە هەڵدەقوڵی و، یەکدی ڕاسپاردن بە هەق و یەکدی ڕاسپاردن بە خۆڕاگرییش، دەچنەوە نێو بازنەی کردەوە باشەکان.

کەواتە: ئەگەر کەسێك ئیمانێکی باشی هەبێ، کردەوە باشەکانی دەبن و، لە نێو کردەوە باشەکانیشدا خەڵك ڕادەسپێرێ بە هەق و، خەڵکیش ڕادەسپێرێ بە خۆڕاگریی، خۆشی لەسەر هەق دەبێ و، خۆڕاگریش دەبێ لەسەر شوێنکەوتنی هەق.

لێرەش کۆتایی بە تەفسیری سووڕەتی (**العصر**) دێنین.

**سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.**

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمــڕۆ (٢٨) مانگــی (**ذي الحجــة**)ی ســاڵی (١٤٤١)ی کۆچییــە، بەرانبــەر (١٨/ ٨/ ٢٠٢٠) زاینیــی، لــە شــاری هەولێــر، خــوا پشــتیوان بــێ دەســت دەکەیــن بــە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (**الهمـزة**)، سـەرەتاش لـە حـەوت بڕگـەدا بـە کورتیی پێناسـەو نێـوەڕۆکی سـووڕەتەکە دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (الهمزة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە زیاتـر نـاوی (**سـورة الهمـزة**)ی بـۆ بەکارهێـنراوە، بـەڵام بـە هـەر کام لـە: (**سـورة ویـل لـکل مـزة لمـزة**) و (**سـورة الحطمـة**)ش، ناونـراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان ئـەم سـووڕەتە مەککەییـەو لـە مەککـە دابەزیـوە، لـەو بارەشـەوە ئـەم گێڕدراوەیـە هاتـوە:

(**عَـنْ عَبْـدِ اللـهِ بْـنِ عَبَّـاس رَضِيَ اللـهُ تَعَـالَى عَنْهُـمَا قَـالَ: أُنْزِلَـتْ: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١﴾، بِمَكَّـةَ**)، (**أورده السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٨، ص٦٢٣)دا، ونسـبه لابـن مردويـه، الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب: ج٣، ص١٥٦**).

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سووڕەتە لە موصحەفدا ژمارەکەی سەدو چوار (١٠٤)ەو، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی سی و دوو (٣٢)یە، پێش سووڕەتی (**المرسلات**)و، دوای سووڕەتی (**القيامة**)، دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی ژمێرەرانی ئایەتەکانی قورئان، ئەم سووڕەتە نۆ (٩) ئایەتە، نە کەس زیاتری گوتوەو نەکەمتر.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سووڕەتە موبارەکە هەر نۆ (٩) ئایەتە بە پێزەکەی، باسی جۆرە مرۆڤێکی خەڵك شکێنەری تانە لێدەر، یان بە خراپە باسی خەڵککەری پاشملەو ڕووبەڕوو دەکات، کە هەر سەر گەرمی سامان کۆکردنەوەو ژماردنیەتی و پێی وایە ماڵ و سامانەکەی لە مردن ڕزگاری دەکات و دەیهێڵێ، دوایی هەواڵدان بەوەی دەخرێتە نێو ئاگرێکی تێکشکێنەری داگیرسێنراوەوە لەلایەن خواوە، کە هەناوی مرۆڤ دەسووتێنێ و، ئەو شوێنەی ئاگرەکەی تێداکراوەتەوە، دەرگاکایەنیشیان لەسەر گاڵە دەدرێن، لەوێشدا لە نێو لوولەی درێژکراودا، سزاو ئەشکەنجە دەدرێن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئەم سووڕەتە سێ تایبەتمەندیی هەن:

١)- هەردوو سیفەتی: ﴿هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾، تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون، کە وەك دوایی باسیان دەکەین: (هُمَزَةٍ) زیاتر پاشملە بە خراپە باسکەری خەڵکەو،

هەوڵدەرە بۆ شكاندنیان و، ناشیرین كردنیان، (لُمَزَةٍ)ش، لە (لَمْز)ەوە هاتوە و مەبەست پێی شكێنەری خەڵكە ڕووبەڕوو و تانە لێدەریانە، هەردووكیان لەسەر كێشی (فُعَلَة) ن و ئەو كێش (وزن)ەش گەیەنەری ئەوەیە، كە ئەو كەسە ئەو سیفەتەی تێدا بۆتە عادەتێكی ڕۆچوو، واتە: كەسێك كە زۆر خەڵك دەشكێنێ پاشملەو بەرەو ڕوو.

٢)- هەروەها هەردوو سیفەتی: ﴿جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣﴾)، ئەم دووەش تەنیا لەم سووڕەتە موبارەكەدا بەم شێوەیە هاتوون، واتە: ماڵ و سامانێكی كۆكردەوەو ژماردی، یاخود ئامادەی كردو، پێشی وایە ماڵ و سامانەكەی هێشتوویەتەوەو دەیهێڵێتەوە.

٣)- چەند وشەو تەعبیرێكی تایبەتی ئەم سووڕەتە موبارەكە:

١- ﴿ٱلْحُطَمَةِ﴾، واتە: ئاگرێكی تێكشكێنەر.

٢- ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ﴾، ئاگری داگیرسێنراوی خوا.

٣- ﴿ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ﴾، ئەو ئاگرەی دەچێتە سەر دڵەكان، دەچێتە سەر عەقڵەكان، دەچێتە سەر هەناوی ئینسان.

٤- ﴿فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ﴾، لە لوولە درێژكراوەكاندا.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكانی:

ئێمە هەر نۆ (٩) ئایەتەكە دەكەینە دەرسێك، چونكە هەموویان باسی یەك بابەت دەكەن و، هەمووشیان پێكەوە پەیوەستن.

## پێناسە ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە نـۆ (٩) ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە پێـك دێ، کـە خـوا ﷻ هـەر لـە سـەرەتایەوە بـە سـزاو هەڕەشـە دەسـت پێـدەکات:

دەفەرمـوێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١﴾، هـاوار بـۆ هەمـوو خەڵـك شـكێنەرێكی پاشـملەو، خەڵك شـكێن و تانـە لێدەرێكـی ڕووبەڕوو.

﴿ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢﴾، ئـەو كەسـەی مـاڵ و سـامانێكی زۆر (یاخـود بـە حەڕامیـی) كۆكـردەوەو ژمـاردی، (**مـالاً**) كـە بـە نەزانـراو (**نكِـرة**) هاتـوە، دەگونجـێ بـۆ زۆریـی بـێ و، دەشـگونجێ بـۆ خراپیـی بـێ، واتـە: گـوێ ناداتـە ئـەوەی چ جـۆرە مـاڵ و سـامانێكە، بـە حـەڕام و حـەڵاڵ، هـەر جـۆرێ بـێ و هـەر چـۆن لێـی هەڵكـەوێ، كـۆی دەكاتـەوە سـەر یـەك و دەیژمێـرێ.

﴿يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣﴾، پێـی وایـە مـاڵ و سـامانەكەی هێشـتوویەتەوە یاخـود لـە داهاتـوودا دەیهێڵێتـەوە، دوایـی خـوا ﷻ بەرپەرچـی ئـەو ڕەفتـارەی دەداتـەوەو، بەرپەرچـی ئـەو جـۆرە بیـرو بۆچوونەشـی دەداتـەوە، كـە ئـەوە خەیـاڵ پـڵاوەو دەفەرمـوێ: ﴿كَلَّا لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ۝٤﴾ نەخێـر، بـا دەسـت هەڵبگـرێ لـەو جـۆرە ڕەفتـارە، یاخـود لـەو جـۆرە بیركردنەوەیـە، بـە دڵنیایـی بـە نابوودیـی و بـێ بایەخیـی فـڕێ دەدرێتـە نێـو تێكشـكێنەرەكەوە.

﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ۝٥﴾، ئایـا چـی بـە تـۆی زانانـدوە تێكشـكێنەرەكە چییـە؟

﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ۝٦﴾، ئاگـری داگیرسـێنراوی خوایـە، ئاگرێكـی تایبەتـی خوایـە دایگیرسـاندوە.

﴿ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ ﴾، ئـەو (ئاگـر)ەی دەچێتـە سـەر دڵـەکان، دەچێتـە سـەر عەقڵـەکان، دەچێتـە سـەر هەنـاوو جەوهـەری ئینسـان و دەیسـووتێنێ.

﴿ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ ﴾، ئـەو ئاگـر (ی دۆزەخ)ەش دەرگایەکانییـان لەسـەر گاڵـە دراون و پێـوەدراون، داخـراون.

﴿ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾ ﴾، ئەوانیـش لـە نێـو لوولـەی ڕاکێشراوو درێژکـراوەکان دان، ئایا ئـەو لوولانـە ئاسـنن، یـان چ جـۆرە کانزایەکـن؟ هـەر خـوا دەزانـێ، گرنـگ ئەوەیە لـە ژووری داخـراودا، ئاگرێکـی بەهێـزو ترسـێنەر دەچێتـە سـەر دڵ و هەناویـان، ئنجا لـە ئاگرەکەشـدا، لـە نێـو تابـووت و لوولـەی درێژکـراودان و، دەرگایەکانیشـان لەسـەر گاڵە دراون!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّا لَيُنۢبَذَنَّ فِى ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِى تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِى عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ ﴿٩﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بـە نـاوی خـوای بەبەزەیـی بەخشـندە . سـزای سـەخت و هـاوار بـۆ هەمـوو کەسـێکی پاشـملە ڕووخێنـەرو بـەرەوڕوو عەیبگـر ﴿١﴾ ئـەو کەسـەی سـامانەکەی کۆکـردەوەو ژماردیـی ﴿٢﴾ پێـی وایـە سـامانەکەی لـە مـردن دەربـازی کـردو هێشـتیەوە ﴿٣﴾ نەخێـر (وانیـە، بـا وازبێنـێ) بـە دڵنیایـی بەبـێ بایەخیـی فڕێدەدرێتە نێـو ئاگرێکـی تێکشـکێنەرەوە ﴿٤﴾ چیـش بەتـۆی زانانـدوە تێکشـکێنەرەکە چییـە؟

﴿٥﴾ ئاگری داگیرساوی خوایە ﴿٦﴾ دەچێتە سەر دڵ و عەقڵ و هەناوان ﴿٧﴾ ئنجا ئەو ئاگرە دەرگایەكانی لەسەریشیان داخراون و گاڵەدراون ﴿٨﴾ لە نێو لوولە درێژكراوەكاندا (سزاو جەزرەبە دەدرێن) ﴿٩﴾}

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَيۡلٌ): **(الوَيْلُ: القُبْحُ وَيُسْتَعْمَلُ فِي التَّحَسُّر، وَالوَيْلُ سُوءُ العَذَابِ، وَالوَيْلُ قِيْلَ: وَادٍ فِي جَهَنَّم)**، **(وَيْل)**: بە مانای ناقۆڵایی و ناشیرینیی دێ، بەكاردەهێنرێ بۆ پەشێمانیی، هەروەها **(وَيْل)** بە مانای سزای خراپ و سەخت دێ، **(وَيْل)**: گوتراوە: بە مانای شیوو دۆڵێك لە دۆزەخیشدا، دێ.

(هُمَزَةٍ): **(الهَمْزُ كَالعَصْرِ، هَمَزْتُ الشَّيءَ فِي الكَفِّ، وَهَمْزُ الإِنْسَانِ اغْتِيَابُهُ)**، **(هَمْز)** وەك **(عَصْر)** وایە، **(عَصْر)**، واتە: گوشین، دەگوترێ: **(هَمَزْتُ الشَّيءَ فِي الكَفِّ)**، شتەكەم لە لەپەدەستی خۆمدا گوشیی، **(وَهَمْزُ الإِنْسَانِ إِغْتِيَابُهُ)**، بە خراپە باسكردنی كەسێك پاشملە پێی دەگوترێ: **(همز)**، واتە: لە غەیبەت كردنەوە نیزیكە، بەڵام بابای **(هامز)**، دەیەوێ ئەو كەسەی بە خراپە باسی دەكات، بیشكێنێ، وشەی **(هُمَزَة)**، لەسەر كێشی **(فُعَلَة)**یەو بۆ زێدەڕۆییە واتە: زۆر دەیەوێ خەڵك پاشملە بشكێنێ و بە خراپە باسیان بكات.

(لُّمَزَةٍ): **(اللَّمْزُ: الإِغْتِيَاب وتَتَبُّعُ المَعَايِب، واللَّمْزُ العَيْبُ فِي الوَجْهِ)**، **(لُمَزَة)**ش، لەسەر كێشی **(فُعَلَة)**یەو لە **(لَمْز)**ەوە هاتوە، **(لَمْز)**: بە واتای بە خراپە باسكردن و شوێن عەیب و عار كەوتنی كەسێكەو، ڕەخنەگرتنەو تانەدانە لە كەسێك ڕووبەڕوو، جیاوازییەكەیان ئەوەیە **(همزة)**: كەسێكە پاشملە باسی كەسێك دەكات و، خراپەی باس دەكات و دەیەوێ بیشكێنێ، بەڵام **(لمزة)**: كەسێكە ڕووبەڕوو تانە لە خەڵك دەدات و بیانوویان پێ دەگری و دەیەوێ بیانشكێنێ.

(وَعَدَّدَهُۥ): (الإعْدَادُ مِنَ العَدِّ كَالإسْقَاءِ مِنَ السقي)، (إعْدَاد) لە (عَدّ)ەوە هاتووە، (عَدّ)، واتە: ژماردن، وەك (إسقاء)، لە (سَقِي)یەوە هاتووە، واتە: ئاو پێدان، کەواتە: (وعدَّدهُ)، واتە: هەر خەریکی ژماردنی ماڵ و سامانەکەی بوو، یاخود: (عَدَّدَه: عَدَّهُ لِكَذَا: هَيَّأَهُ)، واتە: ئامادەی کرد بۆ ئەوە، هەر خەریکی ژماردنی ماڵ و سامانەکەیەتی، سەر ژمێری دەکات و ئامادەی دەکات.

(أَخْلَدَهُۥ): (الخُلُودُ: تَبَرِّي الشيء مِنَ اعتراضِ الفَسَادِ وَبَقَاؤهُ عَلَى الحَالَةِ التي هُوَ عَلَيْهَا)، (خُلُود): بریتیە لەوەی شتێك دووربێ لە حاڵەتی تێکچوون و لەو حاڵەتەدای لە سەریەتی، بمێنێتەوە.

(لَيُنۢبَذَنَّ): واتە: بەبێ بایەخیی فڕێ دەدرێ، (النَّبْذُ: إلقَاءُ الشَّيءِ وَطَرْحُهُ لِقِلَّةِ الإعْتِدَادِ بهِ، وَنَبَذْتُهُ نَبْذَ النَّعْلِ الخَلَقِ)، (نَبْذ): بریتیە لە فڕێدانی شتێك و هاویشتنی لەبەر بایەخ پێنەدانی، یان کەم بایەخی پێدانی، دەگوترێ: (نَبَذْتُهُ بَذْتُهُ نَبْذَ النَّعْلِ الخَلَقِ)، فڕێمدا وەك پێڵاوی شڕ، پێڵاوێك کە دەدڕێ و شڕ دەبێ، بە کەڵکی خاوەنەکەی نامێنێ و فڕێی دەدات.

(ٱلْحُطَمَةُ): (الحَطْمُ: كَسْرُ الشَّيءِ، مِثْلُ الهَشْمِ وَنَحْوِهِ، ثُمَّ اسْتُعْمِلَ لِكَسْرٍ مُتَنَاهٍ)، (حَطْم): بە مانای شکاندنی شتێك و وردکردن و هاڕینیەتی، وەك (هَشْم)و وێنەوی، دوایی بەکارهێنراوە بۆ هەر شتێك کە زۆر بشکێنرێ و وردبکرێ و بهاڕدرێ.

(ٱلْمُوقَدَةُ): دەگوترێ: (وَقَدَتِ النَّار تَقِدُ وُقُوداً وَوَقُوداً)، واتە: ئاگرەکە داگیرسا، دادەگیرسێ، داگیرسان، کەواتە: (الموقدة)، واتە: داگیرساو، یاخود داگیرسێنراو.

(تَطَّلِعُ): (أي: تَتَسَلَّطُ)، واتە: زاڵدەبێ، دەچێتە سەر، یاخود (تَطَّلِعُ) یانی: (تَعْرِفُ وَتُدْرِكُ)، پەی پێدەبات و دەزانێت، (تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ)، دەزانێ عەقڵەکان و دڵەکان چییان تێدایە، بۆیە دەیانسووتێنێ، یاخود دەچێتە سەریان و بەسەریاندا زاڵ دەبێ.

(ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ): (جَمْـعُ فُـؤاد: وَالفُـؤَادُ كَالقَلْـبِ)، لـە زۆربـەی فەرهەنگەکانـی زمانـدا دەڵێـن: (أفئـدة) جمـع فـؤاد، وهـو القلـب)، (أفئـدة) کـۆی (فـؤاد)ەو، بـە مانـای دڵـە، بـەڵام بەتێگەیشـتنی مـن (فـؤاد)، لـە قورئانـدا زیاتـر بـۆ عەقـڵ بەکارهێـنراوە، وەك لـە سـوورەتی (إبراهیـم)دا، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ٤٣﴾، واتـە: عەقڵیـان بەتـاڵ بـوو، خاڵیـی بـوو، هەروەهـا لـە سـوورەتی (القصـص)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَأَصۡبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَٰرِغًاۖ إِن كَادَتۡ لَتُبۡدِي بِهِۦ لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٠﴾، واتـە: عەقڵـی دایکـی مووسـا عليه السلام خاڵیـی بـوو، (واتـە: وەك گوتـراوە: هـۆش لـە کەڵلـەی دا نەمابـووە، هەمـوو فکـرو هۆشـی چـوو بـووە سـەر مووسـا عليه السلام کـە بـە مەلۆتکەیـی خسـتوویەتە صنـدووق و تابووتێکـەوەو بـە ڕووبـاری نیلـی داداوە، بـە ئیلهامێـك کـەوا خـوا خسـتوویوتو دڵـی)، خەریـك بـوو ئاشـکرای بـکات، ﴿لَوۡلَآ أَن رَّبَطۡنَا عَلَىٰ قَلۡبِهَا ١٠﴾، ئەگـەر دڵیـمان بەهێـز نەکردبایـە، کەواتـە: دڵ شـوێنی بڕیـاردان و ویسـتن و نەویسـتنەو، عەقـڵ شـوێنی بیرکردنـەوەو هـۆش و گۆشـە، خـوای پەروەردگاریـش هەردووکیانـی بەکارهێنـاوە دەفەرمـوێ: عەقڵـی دایکـی مووسـا عليه السلام خاڵیـی بـوو بـوو، ئەگـەر دڵیـمان بەهێـز نەکردبایـە، خەریـك بـوو ئاشـکرای بـکات، (بڵـێ: مـن ئـەو جگـەر گۆشـەیەی خـۆم خسـتە تابووتێکـەوەو بـە ڕووبـاری نیلمـدادا).

(مُّؤۡصَدَةُۢ): (أَصَـدَ البَـابَ يَأْصُـدُ أَصْـداً وَإِصَـاداً أي: أَغْلَقَـهُ، وَآصَـدَهُ إِيصَـاداً أي: أغلقـه)، (أَصَـدَ البَـابَ يَأْصُـدُ أَصْـداً وَإِصَـاداً)، دەرگایەکـەی پێـوەدا، پێـوەی دەدا، پێـوەدان (أي: أَغْلَقَـهُ)، واتـە: دەرگایەکـەی داخسـت و پێـوەی دا، هەروەهـا (آصَـدَه)ش هـەر هاتـوە، (آصَـدَ البَـابَ)، یانـی: (أغلـق)، هـەم بـە (أصـد) هاتـوە، هـەم بـە (آصَـدَ) هاتـوە، (آصَـدَ)، چاوگەکـەی (إِيصَـاد)ەو، چاوگـی (أَصَـدَ)ش، بریتیـە لـە (إِصَـاد) بـە بـێ (ي).

(عَمَدٖ): (جَمْـعُ عَمُـود، جَمْعُـهُ فِي القِلَّـة أَعْمِـدَة، وَفِي الكَـثْرَةِ: عَمَـد وعُمُـد)، (عَمَـد)، کـۆی (عَمُـود)ە، واتـە: لوولـە بـە زۆریـی بـە لوولـەی تەختـەو دار دەگوتـرێ و، بـە لوولـەی ئاسـنیش دەگوتـرێ، کـۆی کەمـی (عمـود)، بریتیـە لـە (أعمـدة)، ئەگـەر چەنـد

کۆڵەکەیەکی کەم بن، دەڵێی: (هذه الأَعْمِدَة)، ئەو کۆڵەکە یاخود ئەو لوولە کەمانە، بەڵام ئەگەر زۆربن بە: (عَمَد و عُمُد)، کۆ دەکرێتەوە.

(مُّمَدَّدَةِۭ): (مَدَّهُ فَامْتَدَّ، المادَّةُ الزِّيَادَةُ المُتَّصِلَة، وَمَدَّهُ فِي غَيِّهِ أي: أَمْهَلَهُ وَطَوَّلَ لَهُ، مديد القام، أي: طَوِيلُ القَامِ)، (مُمَدَّدة)، لە (مَدَّ)وە هاتوە، (مَدَّهُ فَامْتَدَّ) درێژی کرد ئەویش درێژ بوو، (والمادَّة: الزِّيَادَةُ المتَّصِلَةُ)، (مَادّة): بە زیادەیەکی پەیوەست دەگوترێ بۆ هەر شتێك ئەگەر سوپایە، ئەگەر ماڵ و سامانە، هەر شتێك ئەو زیادەیەی بەدوایدا ڕەوان دەکرێ، پێی دەگوترێ: (مادة)، دەگوترێ (مَدَّهُ فِي غَيِّهِ)، واتە: لە سەرگەردانییدا ڕستی بۆ درێژکرد، (أي: أَمْهَلَهُ وَطَوَّلَ لَهُ)، واتە: مۆڵەتی داو ڕستی بۆ درێژکرد، هەروەها دەگوترێ: (فُلان مَدِيدُ القَامِ)، واتە: بە ژن و باڵای بڵندو بەرزە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةِۭ ٩﴾، واتە: ئەو کەسانە بەوجۆرە سزاو ئەشکەنجە دەدرێن لە نێو ئەو ئاگرە تێکشکێنەرەدا، کە دەرگایەکانیشیان لەسەر داخراون و لەنێو لوولە درێژکراوەکاندان، لە نێو تابووت و لوولە درێژکراوەکان دان. (مُمَدَّده)، یانی: شتێك کە لێککێشراوەتەوە، یاخود: ڕاکێشراوەو دانراوە بە درێژیی، هەردووك واتایەکەی هەن، بەڵام (مُمَدَّدة)، زیاتر بۆ شتانێکە کە درێژ کراونەوەو لێککێشراونەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای زاناو شارەزا لەم سووڕەتەدا باسی جۆرە مرۆڤێکمان بۆ دەکات کە هەمیشە عادەتی وایە بەرانبەرەکانی، ئەو خەڵکە بە نە یاری خۆییان دەزانێ و ڕقی لێیانە، چ پاشملە بۆی هەڵکەوێ، چ ڕووبەڕوو، بیانشکێنێ و بێ بایەخیان بکات و سووکیان بکات و عەیبداریان بکات، ئنجا ئەو جۆرە کەسە، کەسێکیشە

هەمیشـە خەریکـی کۆکردنـەوەی مـاڵ و سـامان و ژماردنیەتـی، بـەردەوام سـەرگەرمی ژماردنـی مـاڵ و سـامانەکەی و ئامادەکردنیەتـی و، پێشـی وایـە مـاڵ و سـامانەکەیەتی هێشـتوویەتەوە لـە ژیانـداو دەیهێڵێتـەوە، دوایـی خـوا باسـی سـزایەکەی دەکات، کـە یەکجـار بەئێـش و سـەختە.

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، لـە کاتی گوتنـی: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)دا، دەبـێ بـەلای کەمـەوە ئـەم چـوار واتایـە لـە عەقـڵ و دڵـدا ئامـادە بـن:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بێ هاوتا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١﴾، وشـەی (ویـل) زۆرجـار باسـمانکردوە، لـە زمـانی کوردیـی دا بـە مانـای هـاوار دێ، یـانی: هـاوار بـۆ ئـەو کەسـە، چونکـە کەسـێك کـە تینـی بـۆ دێ و تووشـی گرفتاریـی و ناڕەحەتییەکـی گـەورە دێ، کـە بـۆ خـۆی ناتوانـێ لێـی دەربـاز بـێ، هـاوار دەکات، کەواتـە: هـاوار بـۆ فلانکـەس، واتـە: شایسـتەی ئەوەیـە خەڵـك بـە هاواریـەوە بچـێ، چونکـە لـە مەینەتیـی و گرفتارییـەك دایـە، خـۆی ناتوانـێ لێـی دەربـاز بـێ، ئەمـە ئەصڵـی واتایەکەیەتـی، بـەڵام دوایـی بـە چەنـد واتایـەکی دیکـەش بەکارهێـنراوە:

١- هەندێك لە زانایان گوتوویانە: (ويل) بە مانای (قبح) دێ، واتە: ناشیرینیی و بەدفەڕیی.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: بە مانای (سوء العذاب) دێ واتە: سزای سەخت.

٣- هەندێك گوتوویانە: (وێل) شیوو دۆڵێکە لە دۆزەخ دا.

بەڵام وەك چۆن لە زمانی کوردییدا دەڵێین: هاوار بۆ فڵانکەس، واتە: کەوتۆتە مەینەتیی و بارو دۆخێکی پڕ ئازارەوە، شایستەی ئەوەیە خەڵك بە هاوارو هانایەوە بچێ و دەربازی بکات، لێرەش خوا دەفەرموێ: ﴿وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ۝١﴾، هاوار، یاخود سزای سەخت بۆ هەموو تێکشکێنەرێکی پاشملەو تێکشکێنەرێکی ڕووبەڕوو، بۆ هەر کەسێك کە بە پاشملە بە خراپە باسی خەڵك دەکات، بە مەبەستی شکاندنیان، یاخود ڕووبەڕوو تانەیان لێ دەدات و هەوڵدەدا بیانشکێنێ و عەیبداریان بکات، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم دوو وشەیە، پێشتریش گوتمان: وشەی: **(همزة)**، لە **(همز)** ەوە هاتووە، **(همز)**یش وەك **(عصر)**وایە، واتە: گوشین، **(همزْتُ الشَّيء فِي الكفِّ)** واتە: شتەکەم لە دەستم دا گوشیی، کەسێکیش کە دەیەوێ پاشملە کەسێك بشکێنێ، وەك ئەوە وایە ڕاییگوشێ و ئەزیەتی بدات، **(لمزة)**، **(لَمَزهُ أي عابه)**، واتە: عەیبی لێگرت، بە خراپە باسی کرد، بەڵام بەپێی ئایەتەکەی سووڕەتی **(الحجرات)**: ﴿وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ۝١١﴾، واتە: عەیب لە خۆتان مەگرن، **(لَمْز)** بریتیە لە عەیب لێگرتن، چ عەیبەکەی تێدابێ و بۆ ئەوە باس بکرێ پێی بشکێ و ناشیرین بێ، چ عەیبی تێدا نەبێ و عەیبی لێ پەیدا بکرێ، هەردوو حاڵەتەکە دەگرێتەوە، هەر کام لە **(همزة و لمزة)**، لەسەر کێشی **(فُعَلَة)**ن، کە یەکێکە لە ڕێژگەکانی زێدەڕۆیی، ئەگەر بمانەوێ زێدەڕۆیی لە شتێکدا بکەین، یەکێك لە ڕێژگەکانی ئەمەیە، وەك چۆن **(فعَّال)**یش، یەکێکە لە ڕێژگەکانی، کەواتە: **(همزة)**، واتە: زۆر تێکشکێنەری خەڵك پاشملەو، **(لمزة)**، واتە: زۆر عەیب لێگریان و ڕەخنە لێگریان بەرەو ڕوو بە مەبەستی شکاندن و ناشیرینکردنیان، خوا دەفەرموێ: سزای سەخت بۆ هەر کەسێك کە بەو شێوەیە.

﴿ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢﴾، ئەو کەسەی ماڵ و سامانێکی کۆ کردەوەو ژماردیی، بە ڕێژگەی ڕابردوو هێناویەتی، بەڵام هەم ڕابردووو هەم ئێستاو هەم داهاتوو، دەگرێتەوە، لێرەدا **(مالاً)**ی بە نەزانراو **(نكرة)**، هێناوە، واتە: هەر جۆرە

ماڵ و سامانێك كۆ دەكاتەوە، گوێ ناداتە حەڵاڵ و حەڕامیی، چاكیی و خراپیی، پیسیی و پاكیی، ﴿ وَعَدَّدَهُۥ ﴾، ژماردیشی، خەریكی سەرژمێریەتی هەمیشە دەیژمێرێ و ئامادەی دەكات، ﴿ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾ ﴾، پێی وایە ماڵ و سامانەكەی هێشتوویەتەوە، ئەمیشی بە ڕابردوو هێناوەو دەڵوێ مەبەست پێی ڕابردوو بێ، واتە: پێی وایە لە ڕابردوودا ماڵ و سامانەكەی هێشتوویەتەوە، یاخود: پێی وایە ماڵ و سامانەكەی دەیهێڵێتەوە، واتە: دەربازی دەكات لە مردن و لە لەبەین چوون، ئەگەر سەرنج بدەین خوا ﷻ لێرەدا چوار ڕەفتاری زۆر خراپ و بیرو بۆچوونێكی زۆر كەوودەنانەی، بۆ ئەو جۆرە مرۆڤە باسكردوە، كە دەفەرموێ سزای سەختی بۆ هەیە:

سیفەتی یەكەم: پاشملە خەڵك دەشكێنێ.

سیفەتی دووەم: ڕووبەڕوو خەڵك دەشكێنێ و عەیبیان لێدەگرێ.

سیفەتی سێیەم: بەردەوام ماڵ و سامان كۆدەكاتەوە.

سیفەتی چوارەم: هەر خەریكی ژماردن و ئامادەكردنی ماڵ و سامانیەتی.

سەربارەش بیرو بۆچوونێكی زۆر كەوودەن و نەفامانەی هەیە، كە بریتیە لەوەی پێی وایە ماڵ و سامانەكەی هێشتوویەتەوە، یاخود دەیهێڵێتەوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ﴾، با وازبێنێ، واتە: وازبێنێ لە شكاندنی خەڵك پاشملەو ڕووبەڕوو، هەروەها كۆكردنەوەو پەزمەندەكردنی ماڵ و سامان هەر جۆرێكی بێ و، ئامادەكردنی و ژماردنی و، با واز بێنێ لەو جۆرە بیرو خەیاڵە، كە پێی وایە ماڵ و سامانەكەی هێشتوویەتەوە و دەیهێڵێتەوەو لە مردن دەربازی دەكات.

ئەگەر ئەوەی باسكرا وازی لێ نەهێنێ و دەستبەرداری نەبێ:

﴿ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ ﴾، بەدڵنیایی فڕێ دەدرێتە نێو تێكشكێنەرەوە. ﴿ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ ﴾، (ل)ی (لَیُنبذن) هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی پێی دەڵێن: **(اللام الممهِّدَة للقسم)**، لامی ڕێخۆشكەرو زەمینە خۆشكەر

بۆ سوێند، واتە: هەر کاتێك ئەو لامەمان بینی، بابزانین زەمینەی بۆ سوێندێك خۆشكردوە، یانی: (وَاللهِ لَيُنبَذَنَّ فِي الحطمة)، سوێند بە خوا فڕێ دەدرێتە نێو ئاگرێكی تێكشكێنەرەوە.

هەندێكیش دەڵێن: ئەو لامە هەر بۆ جەختكردنەوەیەو مانای وانیە سوێندێكی لەپێشەوەیە، هەڵبەتە بۆ جەختكردنەوە بوونی (ن)ی كۆتایی لە (لَيُنبَذَنَّ)دا، شتێكی ئاشكرایە، یانی: بەدڵنیایی فڕێ دەدرێتە نێو (**حطمة**) وە، (**حطمة**)ش، هەر لەسەر كێشی (**فُعلة**)یە، (**حاطم**)، یانی: (**كاسر**)، شكێنەر، بەڵام شكاندنێك كە وردو خاشكردن و هاڕینی لەگەڵدابێ و، (**حَطْم**) شكاندنی شتێكە لەگەڵ هاڕینی دا، تاكو لە كۆتایی دا، ببێتە بەشی زۆر بچووك بچووك، وەك چۆن ئارد دەهاڕدرێ، (**حُطَمَة**) یانی: زۆر تێكشكێنەر، فڕێدەدرێتە نێو زۆر تێكشكێنەرەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ۝٥ ﴾، چی بەتۆی زانانەوەو زۆر تێكشكێنەر چییە؟ واتە: شتێكی هێندە گەورەیەو هێندە سامناك و بێڕەزایە، مەگەر ناسێنەرێك پێت بناسێنێ، كە خوای پەروەردگارەو خۆی دەزانێ ئەو ئاگرەی ڕۆژی دوایی چۆنە! مەگەر ئەو پێت بناسێنێ، ئەگەرنا، عەقڵ و زانیاریی تۆ دەوری نادات و ناتوانێ پەی پێ ببات، هێندە ترسناك و زەبەلاحە.

ئنجا خوا خۆی پێناسەی دەكات و دەفەرموێ: ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ۝٦ ﴾، ئاگری هەڵگیرسێنراوی خوایە، ئاگرێكە داگیرسێنراوەو هی خوایە، هەموو شتەكان بەس هی خوان، بەڵام ئەم ئاگرە ئاگرێكی تایبەتی خوای بەرزومەزنە، واتە: خوا بە تایبەت دایگیرساندوەو هەڵیگرساندوە، بۆ ئازاردان و ئەشكەنجە و سزاو جەزرەبەدانی كەسانێك كە بەو شێوەیەن.

﴿ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ۝٧ ﴾، ئەو ئاگرە دەچێتە سەر عەقڵەكان، یان دەچێتە سەر دڵ و دەروون و هەناوەكان، پێشتر باسمانكرد (**إطِّلاع**) لێرەدا هەم بە مانای چوونە سەر دێ، یانی: (**تَتَسَلَّط**)، یانی: دەچێتە سەر، هەم بە مانای پەیپێبردن و زانین، دێ، یانی: ئەو ئاگرە بە دڵ و دەروونەكان و بە عەقڵەكان دەزانێ، ئایا

چـی خراپیـان تێدایـە، پەییـان پـێ دەبـات، یاخـود دەچێتـە سـەریان و ئەوێـش دەسـووتێنێ، (ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ)ش کـۆی (فـؤاد)ە، کـە زۆربـەی ڕوونکەرەوانـی قوڕئـان بـە مانـای دڵ لێکیانداوەتـەوە، بـەڵام بـە بۆچوونـی بەنـدە، بـە سـەرنجدانی ئایەتەکانـی قوڕئـان، بۆمـان دەردەکـەوێ کـە (فـؤاد)، چ بـە تەنیـا هاتبـێ، چ بـە کـۆ، لـە قوڕئانـدا زیاتـر بەمانـای عەقـڵ هاتـوە، بەڵـێ جـاری وا هەیـە بـۆ دڵیـش بەکارهێـنراوە، چونکـە عەقـڵ و هـۆش و پەیپێبردنـی مـرۆڤ، وەك چـۆن پەیوەندیـی بـە مێشـك (دمـاغ)ەوە هەیـە، پەیوەندیـی بـە دڵیشـەوە هەیـەو، زانسـت تـازە پـەی بـەوە بـردوە، بەڵگـەش لـە سـەر ئـەوەی لـە قوڕئانـدا وشـەی (فـؤاد)، بـە مانـای دڵ نیـە، ئەوەیـە کـە دڵ (قلـب)، چەقـی ویسـتن و نەویسـتن و، خۆشویسـتن و ڕەفزکـردن و، بڕیاردانـە، بۆیـە لـە قوڕئانـدا دڵ زەمکـراوە ئەگـەر خـراپ بـێ و، مـەدح کـراوە، ئەگـەر چـاك بـێ، باسـەرنج بدەیـن:

**یەکەم: دڵ (قلب):**

أ- ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ ﴿٧﴾ ﴾**البقرة**، لێرەدا دڵ زەمکراوە.

ب- ﴿أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾الرعد، لێرەش دا دڵ مەدحکراوە، کەواتە: دڵ دەگونجێ بڕیاری چاکی تێدا بدرێ و، شتێکی چاکی بوێ، دەشگونجێ شتی خراپی بوێ.

**دووەم: عەقـڵ (فـؤاد):** (فـؤاد) لـە قوڕئانـدا نـە زەمکـراوەو نـە مـەدح کـراوە، چ بـە تـاك هاتبـێ، چ بـە کـۆ هاتبـێ کـە بـە زۆریـی بـە کـۆ هاتـوە، وەك: ﴿ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ **النحـل**. هەروەهـا بەتاکیـش هاتـوە، وەك خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ ﴾**الإسراء**، واتـە: هـەر کامێـك لـە بیسـتن و چـاوو عەقـڵ لێیـان دەپرسرێتـەوە، واتـە: لـە خاوەنەکەیـان دەپرسرێتـەوە ئایـا ئـەو ئامڕازانـەی چـۆن بەکارهێنـاون، ئـەو چـاوو عەقـڵ و گوێیـەی لـە چییـدا بەکارهێنـاون؟ کەواتـە: لێـرەدا

﴿ تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴾ یانی: ئەو ئاگرەی دەچێتە سەر عەقڵەکان، بەڵام لێرەدا دەشگونجێ (**فؤاد**) بە مانای دەروون و دڵیش هاتبێ، یانی: دیوی نێوەوەی مرۆڤ، ﴿ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴿٨﴾ ﴾، بە دڵنیایی ئەو ئاگرە لەسەریان داخراوە، واتە: دەرگایەکانی لەسەریان داخراون، دەرگایەکانی ئەو شوێنەی ئەو ئاگرەی تێدایە، گاڵەدراون و داخراون.

﴿ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ﴿٩﴾ ﴾، ئەوانە لە نێو لوولە درێژکراوەکاندان، ئنجا ئایا لوولەکان ئاسنن، صندووق و تابووتی ئاسنن، یاخود جۆرە کانزایەکی دیکەن؟ گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرمووێ: لە نێو لوولەکاندا درێژکراون، ئەوانە لەنێو لوولەکاندان و، لوولەکانیش لە نێو ژووری داخراوو گاڵە دراودان و، ئەو ئاگرەش کە لەوێ دایە دەچێتە سەر دڵ و دەروونیان و، دەچێتە سەر عەقڵ و هۆشیان و، وێڕای جەستەیان، ناخیشیان دەسووتێنێ!

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خوای دادگەر ڕایدەگەیەنێ کە سزای سەخت و دژواری داناوە، بۆ هەر کەسێکی پاشملە خەڵك شکێنەرو، بەرەو ڕوو تانە لێدەریان، کە هەردەم سەرگەرمی کۆ کردنەوەو ژماردنی پارەو ماڵ و سامانەکەیەتی و، پێی وایە دەربازکەریەتی لە مردن:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ٱلَّذِى جَمَعَ مَالًا وَعَدَّدَهُۥ ۝٢ يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخْلَدَهُۥ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ﴾، سزای سەخت، بۆ هەموو زۆر خەڵك شکێنەرێکی زۆر تانەدەر.

هەروەها (وَيْـل) بەمانای:

أ- دۆڵ و شیوێکی بە ئازاری نێو دۆزەخ.

ب- یاخود: ناشیرینیی و ناقۆڵایی. ج- یاخود: هاوار، بۆ هەر کەسێك کە ئەو دوو سیفەتەی تێدان: (**هَمْز و لَمْز**)، (**همز**) بە مانای ڕاگوشینی شتێك دێ، (**الهَمْزُ كَالعَصْرِ، هَمَزْتُ الشَّيء بالكَفِّ**)، شتەکەم بەدەست ڕاگوشیی ڕامپازنیی، بۆ شکاندنی پاشملە بەکاردێ، (**لمز**)یش بە مانای تانەلێدان و ڕەخنە لێگرتنی ڕوو بەڕوویە، هەردووکیشیان لەسەر کێشی (**فُعَلَة**)ن، کە ڕێژگەیەکە بۆ زێدەڕۆیی واتە: کەسێك کە زۆر حاڵەتی شکاندن (**هَمْز**)ی هەیەو، کەسێك کە زۆر حاڵەتی تانەلێدان (**لمز**)ی هەیە.

واتـە: هـاوارو سـزای سـەخت بـۆ هەمـوو زۆر خەڵـك شـكێنەرێكی پاشملەو، تانـە لێدەرێكـی خەڵـك بـەرەو ڕوو، كەسـانێك كـە هێنـدە سـەرگەرمی خەڵـك شـكاندنن، تییانـدا بۆتـە نەریتێـك و بۆتـە سـیفەتێكی ڕۆچـوو كـە بـەرەو ڕوو، یاخـود پاشـملە خەڵـك دەشـكێنن و، هەوڵـدەدەن بـێ بایەخیـان پێشـان بـدەن و عەیبداریـان بكـەن.

پێشـتریش گوتمـان: (**الهمـزة: مُشْـتَقٌّ مِـنَ الهَمْـزِ، وَهُـوَ الكَسْرُ وَالهَشْـمُ**)، (**هُمَـزَة**) لـە (**هَمْز**)ەوەیـە كـە لـە ئەسـڵ دا شـكاندن و هاڕیـن و وردكردنـە، بـەڵام (**لُمَـزَة: مشـتق مـن اللّمـز والمواجهـة بالعيـب**)، (**لُمَـزَة**) لـە (**لَمْز**)ەوەیـەو بریتیـە لـەوەی ڕووبـەڕوو ڕەخنـە لـە كەسـێك بگـری و عەیبـداری بكـەی و تانـەی لـێ بـدەی، پێشـتریش لـە مانـای گشـتییدا باسـمان كـرد، كـە ڕوونكەرەوانـی قوڕئـان زۆریـان لـەو بـارەوە مشـتومڕ كـردوە.

زۆرێكیـان گوتوویانـە: هەردووكیـان یـەك واتایـان هەیـە، كـە ئـەوە بـە دڵنیایـی وانیـەو، خـوا ﷻ هیـچ دوو وشـەیەكی لـە قوڕئانـدا نەهێنـاون، یـەك واتایـان هەبـێ، چونكـە ئـەوە پێچەوانـەی ڕەوانبێژییـە، ڕەوانبێژیـی یەكێـك لـە گرنگتریـن پایەكانـی ئەوەیـە ئـەو قسـەیەی دەكـرێ، وشـەكانی كـەم بـن و مانایـان زۆربێـت، نـەك وشـەكانی زۆر بـن و یـەك واتاشیان هەبێـت، بۆیـە ئـەو ڕایـەی زانایـان ڕاسـتە كـە وشـەی هاوواتـا (**مترادف**) لـە قوڕئانـدا نیـن، واتـە: دوو وشـە یـەك واتایـان هەبـێ، بەڵكـو جیاوازییەكـی وردیـان هەیـەو، ئەوانـەی ورد دەبنـەوەو زۆر شـارەزاو پسـپۆڕن، ئـەو جیاوازییـە وردانـە دەبینـن، كەواتـە: بـە دڵنیایـی مانایەكەیـان لێـك جیایـەو، ڕاسـترین مانـاش ئەوەیـە كـە (**همـزة**)، كەسـێكە پاشـملە زۆر خەڵـك دەشـكێنێ، (**لمـزة**)ش كەسـێكە زۆر ڕووبـەڕوو دەیانشـكێنێ، بەڵگەشـمان لەسـەر ئـەوە، وێـڕای دەلالەتیـان لـە زمانـی عەرەبییـدا، ئـەو ئایەتـە موبارەكـەی سـوورەتی (**الحجـرات**)ە، كـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ١١﴾، وەك لـە تەفسـیری

سـووڕەتی (**الحجرات**)دا، بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە، لێـرەدا خـوا بانگـی بـڕواداران دەکات و، لـە سـێ گوناهـی گـەورەی کـە بەئاشـکرا دەکرێـن، ئاگاداریـان دەکاتـەوە، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! بـا هیـچ کات کۆمەڵێـك لـە پیـاوان گاڵتـە بـە کۆمەڵێکـی دیکەیـان نەکـەن، نزیکـە گاڵتـە پێکـراوەکان لـە گاڵتـە پێکەرەکان باشـتربن، هەروەهـا بـا کۆمەڵێـك لـە ئافرەتـان گاڵتـە بـە کۆمەڵێکـی دیکەیـان نەکـەن، نیزیکـە گاڵتەپێکـراوەکان لـە گاڵتـە پێکـەرەکان چاکـتر بـن.

﴿ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ﴾، هەروەهـا عەیـب لـە خۆتـان مەگـرن کـە دەفەرمـوێ: لـە خۆتـان، واتـە: برایـە مسـوڵمانەکەو خوشـکە مسوڵمانەکەشـت وەك خۆتـە، بەڵکـو برایـە مرۆڤەکـەو خوشـکە مرۆڤەکەشـت وەك خۆتـە، ئەگـەر عەیـب لـەو بگـری، لـە خۆتـت گرتـوە!

لێـرەدا خـوا سـەرەتا گاڵتـە پێکردنـی باسـکردوە، دوایـی عەیـب لێگرتـن، دواییـش دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِ ﴾، نـاوو ناتـۆرەش لـە یەکـدی هەڵمـەدەن، (**نبـز**) بـە مانـای نـاو و ناتـۆرە هەڵدانـە لـە کەسـێك کـە پێـی ناخۆشـبێت، بـا ئـەو سیفەتەشـی تێدابـێ، بـۆ وێنـە: (گۆجـە، شـەلە، کوێـرە، کـەڕە)، تـۆ بـۆی بکـەی بـە نازناوێـك، ئـەوە بـە دڵنیایـی گوناهـە، زانایـان لـەو بارەیـەوە هەڵاواردنێکیـان کـردوە، کـە ئەگـەر وا نەبـێ نەنـاسرێ، هەتـا نەڵێـی فڵانکەسـە کوێـر یـان شـەل، نەنـاسرێ، ئـەوە حوکمەکـەی جیایـە، بـەڵام بـەلای کەمـەوە نابێـت ڕووبەڕووی خـۆی بڵێـی: فڵانکەسـە شـەل، یـان فڵانکەسـە کوێـر، یـان فڵانکەسـە کـەڕ، یـان گـۆج، چونکـە پەکـت لەسـەر ئـەوە نەکەوتـوە، فڵانکـەس نـاوی بەڕێـزەوە بێنـە، بـەڵام ئەگـەر لـە حاڵـەتی پاشـملەدا وانەڵێـی، خەڵـك نەیناسـێ، ئـەوە ناچارییـە، هەڵبەتـە ئەگـەر ناچاریـی نەبـێ، نابـێ بگوتـرێ.

کەواتـە: خـوا ﷻ ئـەو سـێ گوناهـەی لـە قورسـترەوە بـۆ کەمـتر قـورس هێنـاون، گاڵتەپێکـردن زۆر قورسـە، دوایـی عەیـب لێگرتـن، دوایـی نـاوو ناتـۆرە لێهەڵـدان.

دوایـی سـێ گوناهــی پەنهانیــش بــاس دەكات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًا ﴿١٢﴾ ﴾الحجـرات، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! خۆتـان لـە زۆر گومانـان بپارێـزن، هەندێـك لـە گومانـان گوناهـن و، جاسووسـیی مەكـەن و، پاشـملە بـە خراپـە باسـی یەكـدی مەكـەن (غەیبەتـی یەكـدی مەكـەن)، ئەوانیـش سـێ گوناهــی پەنهانــن: گومانــی خـراپ پێـبردن و، جاسووسـیی كـردن و، بـە خراپـە پاشـملە باسـكردن.

لێـرەش خـوا دەفەرمـوێ: سـزای سـەخت، یاخـود هـاوار بـۆ هەمـوو ئەوانـەی ئـەو دوو سـیفەتەیان تێـدان: پاشـملە بـە خراپـە باسـی خەڵكـی دەكـەن، یاخـود ڕووبـەڕوو دەیانشـكێنن و تانەیـان لـێ دەدەن.

**٢)-** ﴿ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ﴾، ئەو كەسەی ماڵ و سامانێكی كۆكردەوەو ژماردی، یاخود كۆی كردەوەو ئامادەی كرد، وشەی **(جَمَع)** خوێنراویشەتەوە: **(جَمَّعَ)**، واتە: هەم بە گیرە **(شدَّة)** خوێندراوەتەوە، هەم بە بێ گیرە، واتاشیان هەریەكە، بەڵام **(جمَّع)** واتایەكەی تۆختر دەكات، واتە: زۆری ماڵ و سامان كۆكردۆتەوە، **(المال: مَكَاسِبُ الإنْسَانِ الَّتِي تَنْفَعهُ وَتَكْفِي مُؤْنَةَ حَاجَتِهِ مِنْ طَعَامٍ وَلِبَاسٍ وَغَيْرِهِمَا)**، (مال): بریتیە لەو وەدەستهێنراوەی مرۆڤ كە سوودی پێدەگەیەنێ و، پێداویستییەكانی لە خواردن و پۆشاك و جگە لەمانیش بەهۆیەوە ئامادە دەكات.

بـەڵام كـە لێـرەدا **(مـالاً)** بـە نەنـاسراو **(نكـرة)** هاتـوەو نەیفەرمـووە: **(الـذي جمـع المـال)**، فەرموویەتــی: ﴿ جَمَعَ مَالٗا ﴾، هــەر ناوێــك كــە بــە نەناسراویــی دێ، یــان مەبەسـت پێـی زەبـەلاح و زۆر پێشـاندانە، یان مەبەسـت پێـی بێبایەخ پێشـاندانە، واتە: مـاڵ و سـامانێكی زۆر كۆدەكاتـەوە، یاخـود: هەرجـۆرە مـاڵ و سـامانێك كـۆ دەكاتـەوە، حـەڵاڵ یـان حـەڕام، ﴿ وَعَدَّدَهُۥ ﴾ ژمـاردی، بۆیـەش ئـەم ڕسـتەیە بانەدراوەتـەوە بە (و) ی بادانـەوە، یـان بـە **(ثُمَّ)**، بـۆ سـەری ڕسـتەی پێشـێ، چونكـە هەموویـان وەسـفن بـۆ یـەك وەسـفكراو، ﴿ وَعَدَّدَهُۥ ﴾، دیسـان وەك چـۆن بـە گیـرە **(شـدَّة)** خوێندراوەتـەوە، بـە بـێ گیـرەش خوێندراوەتـەوە: **(وعَـدَدَه)**، هەردووكیـان، واتـە:

١- زۆری ژمارد، گیرەدارکردنەکەی بۆ زێدەڕۆییە، بۆ دووبارە ژماردنەوەی، یانی: جار لە دوای جار لە ئەنجامی زۆر خۆشویستنی بۆ ئەو ماڵ و سامانەیداو، دڵ پێوە بەستنی دا، هەر خەریکی ژماردنیەتی.

٢- یاخود: زۆری ئامادە کرد، بە هەموو جۆرەکانی ئامادە دەکردن بۆ کاتی لێقەومان و ڕۆژانی سەخت.

٣- یاخود: ژمارەکانی زۆر دەکردن و پارێزگاریی لە ژمارەکەی دەکرد، بۆ ئەوەی کەم نەکات.

٣)- ﴿يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ﴾، پێی وایە سامانەکەی هێشتوویەتەوە، هەرماوی کردوە، (يَحْسَبُ)، پێی وایە، وا دەزانێ، ﴿أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣﴾، کە ماڵ و سامانەکەی هێشتوویەتەوە. (**يَظنُّ أَنَّهُ مُخَلِّدُهُ، أَخْلَدَهُ، أي: جَعَلَهُ خَالِداً يُبْقِيهِ حَيًّا لاَ يَمُوتُ**)، پێی وایە ماڵ و سامانەکەی هێڵەرەوەیەتی، واتە: وای کردوە هەرماو بێ و بمێنێ، بە زیندوویی بیهێڵێ و نەمرێ.

لێرەدا ئەم فەرمایشتە دێنین کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِشِرَارِكُمْ؟ قَالُوا: بَلَى، (قال:) المَشَّاءُونَ بِالنَّمِيمَةِ، المُفْسِدُونَ بَيْنَ الأَحِبَّةِ، البَاغُونَ لِلْبُرَآءِ العَنَتَ**} (**أخرجه أحمد: ٢٧٦٤٠، وعبد بن حميد: ١٥٨٠، والبخاري في الأدب المفرد: ٣٢٣، وابن أبي الدنيا في الصمت: ٢٥٥، وَحَسَّنَهُ كُلٌّ مِنَ الألباني وشعيب الأنؤوط**).

واتە: ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی خراپترینتان؟ (هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ) گوتیان: با، (فەرمووی:) ئەوانەن کە قسە لە نێوان خەڵکدا دێنن و دەبەن و، بەینی خۆشەویستان تێکدەدەن، ئەوانەی عەیب بۆ کەسانی بێ عەیب دەدۆزنەوەو، دەیانەوێ عەیبدارو ناشیرینیان بکەن.

پێشتریش گوتمان: وشەی: (**هُمَزة و لُمَزة**)، هەردووکیان ناوێکن دانراون بۆ زێدەڕۆییکردن لەو واتایەدا، وەك دەگوترێ: (**سُخَرَة وضُحَكَة**)، (**سخرة**)، کەسێکە

زۆر گاڵتـە بـە خەڵـك دەكات، (**ضحكـة**)ش كەسـێكە زۆر بـە خەڵـك پێدەكەنـێ، (**هُمَزَة**) ش كەسـێكە دەیـەوێ پاشـملە زۆر خەڵـك بشـكێنێتەوەو عەیبداریـان بـكات و، (**لُمَـزَة**) ش كەسـێكە دەیـەوێ ڕووبـەڕوو زۆر تانـە لـە خەڵـك بـدات و ناشـیرینیان بـكات.

(**همز**): بریتیە لە شكاندن و گرتن، یاخود گازگرتن لە شتێك بە توندیی.

(**لَـمز**): بریتیـە لـە عەیـب لێگرتنـی ڕووبـەڕوو، ئنجـا ئـەم دوو وشـەیە لەسـەر كێشـی (**فُعَلَـة**)ن و، ئـەو ڕێژگەیـەش دەلالـەت لەسـەر لـە سـنوور دەرچوونـی ئـەو كـردارە دەكات، لـەو كەسـەی پاڵیدراوەتـە لا.

لـەو بـارەوە كـە ئایـا ئـەوە كەسـێكی تایبـەت و دیارییكـراو بـووە، ئـەو ئایەتانـەی لـە بـارەوە دابەزیـون، یاخـود مەبەسـت پێیـان گشـتییە؟ دوو ڕا هـەن:

١- (**الطبري**)، لە تەفسیرەكەی خۆیدا هەردووكیانی هێناون و دەڵێ: (**فقال بعضهم: عُنِيَ بذلك رجل من أهل الشرك بعينه، وهو جميل بن عامل الجمحي، أو الأخنس بن شريق**).

واتـە: مەبەسـت لێـرەدا پیاوێكـی تایبـەت بـووە لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكان كـە (جەمیلـی كـوڕی عامیـری جومەحییـە)، یاخـود: (ئەخنەسـی كـوڕی شـوڕەیق)ە.

(**القرطبـي**)، دەڵـێ: (وەلیـدی كـوڕی موغیرەیـە، یـان ئومەییـەی كـوڕی خەڵـەف)ە، هـەر چواریـان لـە زلەزلەكانـی قوڕەیـش بـوون و لەوانـە بـوون، كـە لەسـەر شـیرك و بێبڕوایـی ماونـەوە تاكـو مـردوون و بـە هیـلاك چـوون.

٢- ڕایەكی دیكەش ئەوەیە - (**طبري**) ئەویشی هێناوە - كە گشتییەو هەركەسێك ئەو سیفەتەی تێدا بێ، بەو وەسفە وەسف كراوەو، بێگومان ئەگەر گریمان لە بارەی كەسێكی دیارییكراویشەوە هاتبێتە خوار، یان چەند كەسێكی دیارییكراویش، بەڵام چەمك و واتایەكەی هەر گشتییە، چونكە زانایان بنچینەیەكیان داناوە: (**إنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُول المَعْنَى**)، تایبەت بوونی هۆكاری دابەزینی ئایەتێك، ڕێ لە گشتگیربوونی واتایەكەی ناگرێ.

## مەسەلەی دووەم:

**هەڕەشەلێکرانی ئەو جۆرە کەسە، بە فڕێدرانیە دۆزەخی تێکشکێنەرەوە، کە ئاگرێکی داگیرسێنراوی خوایی دەچێتە سەر عەقڵ و دڵی و، دەرگاکانی ئاگرەکەشیان لەسەر گاڵە دراون و، لە نێو تابووت و لوولاندا درێژکراون:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلْحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلْمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍۭ ﴿٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ كَلَّا ﴾، با وازبێنێ واتە: وازبێنێ لەو جۆرە بیرکردنەوەیە، یاخود: وازبێنێ لەو ڕەفتارە، یاخود: وازبێنێ لەو جۆرە بیرکردنەوە سەقەتەکەی و، لە ڕەوشت و ڕەفتارە خراپەکەشی.

٢)- ﴿لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلْحُطَمَةِ﴾، بەدڵنیایی فڕێدەدرێتە نێو تێکشکێنەرەکەوە، ئەمە وەڵامی سوێندێکی قرتێنراوە، یانی: سوێند بە خوا، بە جەختکردنەوەوە: فڕێ دەدرێتە نێو تێکشکێنەرەوە، وشەی (كلاّ)ش (**كَلِمَةُ رَدْعٍ وَإِبْطَالٍ لِمَا تَوَهَّمَهُ الكَافِرُ، أَي: لاَ يَخْلُد وَلاَ يَبْقَى لَهُ مَالٌ، بَلْ يُطْرَحَنَّ وَيُلْقَيَنَّ فِي النَّارِ الكَاسِرَةِ المُحَطِّمَةِ لَهُ**)، (كَلّاَ) وشەیەکە بۆ تێخوڕین و هەڵوەشاندنەوەی ئەوەی ئەو بێبڕوایە خەیاڵپلاوی پێوە پێکردوە، لەماڵ و سامانەکەی دەمێنێ و، خۆشی بەهۆی ماڵ و سامانەکەیەوە دەمێنێتەوە، واتە: نە خۆی دەمێنێتەوە، نە ماڵ و سامانەکەشی دەمێنێ، بەڵکو فڕێ دەدرێتە نێو ئاگرێکی تێکشکێنەر و وردو خاشکەرەوە.

٣)- ﴿وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْحُطَمَةُ ﴾، چی بە تۆی زاناندوە، ئەو (ئاگرە) تێکشکێنەرە چییە؟ (**أَي: أَي شيء أَشْعَرَكَ يَا مُحَمَّد مَا الحُطَمَة؟**)، ئەی موحەممەد! چ شتێك وای لە تۆ کردوە، بزانی و هەست پێ بکەی تێکشکێنەرەکە چییە؟ واتە: ئەو ئاگرە تێکشکێنەرە حاڵەکەی

وایە، مەگەر خوا خۆی بۆت پێناسە بکات و پێت بناسێنێ، ئەگەرنا زۆر لە سەرووی ئەوەیە عەقڵ و هۆشی مرۆڤ پەی پێببات، دواتریش خوا ﷻ خۆی دەیناسێنێ و دەفەرموێ:

٤)- ﴿نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ﴾، ئاگرێکی داگیرسێنراوی خوایە، یانی: ئاگرێکە هەڵکراوەو تایبەتە بە خواوە، مانایەکەی ئاواى لێ دێتەوە، وەك (**الطبري**)، دەڵێ: (**نَارُ اللهِ الَّتِي أَوْقَدَهَا وَالَّتِي يَطَّلِعُ أَلَمُهَا وَوَهْجُهَا الْقُلُوبَ، والإِطِّلَاعُ وَالبُلُوغُ قَدْ يُكَونَانِ بِمَعْنى**)، واتە: ئاگرێکی تایبەتی خوایە، خوا هەڵیگیرساندوە، ئازارەکەی و بڵێسەو کڵپەکەی دەچێتە سەر دڵەکان، یان دەچێتە سەر عەقڵ و هۆشەکان، (**إطِّلاع**) و (**بلوغ**)یش بەیەک مانا دێن.

٥)- ﴿ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ﴾، ئەو (ئاگر)ەی دەچێتە سەر عەقڵ و دڵەکان، (**تطَّلِع: أي تعلو أوساط القلوب، وتَغشاها وتُحيط بها**)، دەچێتە سەر نێوەندی دڵ و دەروونەکان، (دەچێتە سەر عەقڵ و هۆشەکان) و، دایاندەپۆشێ و دەوریان دەدات.

وشەی (**إطِّلاع**)، بە دوو واتایان هاتوە:

أ- (**الإطِّلاع مبالغة فِي اطَّلع، أي: أَتَى سَرِيْعَاً**)، (**إطِّلاع**) زێدەڕۆییە لە (**إطلع**) یانی: بەخێرایی هات چووە سەر عەقڵ و دڵەکانیان.

ب- (**الإطِّلاع: الكَشْفُ وَالمشَاهَدَةُ**)، (**إطلاع**) یانی: دەرخستن و بینین، واتە: ئەو ئاگرە، ئەو عەقڵ و دڵ و هۆشانە دەبینێ و دەزانێ چییان تێدایەو، بە ئەندازەی ئەو بیرۆکەو نیاز و مەبەستە خراپانەی تێیاندا سەقامگیر بوون، ئەو ئاگرە دەیانسووتێنێ و سزایان دەدات.

(**الأفئدة**)، پێشتریش باسمان کرد کە کۆی (**فؤاد**)ە، بە مانای عەقڵ دێ و، بە مانای دڵیش بەکارهێنراوە جاروبار، بەڵام زیاتر بە مانای عەقڵ و هۆش بەکاردێ.

٦)- ﴿إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ﴾، بە دڵنیایی (دەرگایەکانی) ئەو ئاگرە لەسەریان داخراون، (**مؤصدة**) خوێندرایشەتەوە: (**موصدة**)، واتە: بەبێ هەمزە (أ)ش خوێنراوەتەوە.

٧)- ﴿فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ﴾، لە نێو لوولە درێژکراوەکان دا، (**عَمَد**)، خوێندراویشەتەوە: (**عُمُد**)، پێشتریش باسمان کردن، کە هەردووکیان کۆی (**عَمُود**)ن، وەك (**إهاب**)، کە بە

(**أَهَب وأُهُب**)، کۆدەکرێتەوە، (**إِهَاب**)، واتە: پێست، پێستی وڵاخ کە دەگروێ و لێی دادەنڕدرێ، دەشگونجێ (**عُمُد**) و (**عَمَد**)، هەردووکیان کۆی (**عِمَاد**) بن، ئەویش بە مانای تاکی لوولەو کۆڵەکەیە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿مُّمَدَّدَةِۭ﴾، یـانی: درێژکـراوو ڕاکێـشراون، (**أي: مجعولـة طويـلاً جـدًا، اسـم مفعـول مِـنْ مَـدَّدَهُ، أي: بَالَـغَ فِي مَـدِّهِ**)، (**مُمَـدَّة**) واتـە: زۆر درێژکـراون، نـاوی بـەرکارە لـە (**مَـدَّدَهُ**)ەوە، هاتـوە، واتـە: زۆر درێـژی کـردەوە، درێژکردنیـش بـە مانـای داینـاوە بـە درێژیـی، یـان بـە مانـای لێکیکێشـاوەتەوەو ڕایکێشـاوە.

(**الطـبري**) ئـاوا مانـای ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی کـردوە، دەڵـێ: (**مَعْنَـاهُ أَنَّهُـمْ يُعَذَّبُـونَ بعَمَـدٍ فِي النَّـارِ، وَاللـه أَعْلَـم كَيْـفَ تعذيبُـهُ إيّـاه بهـا**)، واتـە: خـوا لـە نێـو ئاگـری دۆزەخـدا بـە چەنـد لوولـەو کۆڵەکەیـەك ئـازارو ئەشـکەنجەیان دەدات، بـەڵام هـەر خـۆی دەزانـێ چۆنیـان بـەو لوولـەو کۆڵەکانـە ئـازارو ئەشـکەنجە دەدا!

(**قتـادة**)، کـە (**الطـبري**) لێیـەوە هێنـاوە بـە ژمـارە: (٣٨٠٧٠)، دەڵـێ: (**كُنّا نُحَـدَّث أنها عمـد يُعَذَّبـون بهـا في النـار**)، واتـە: ئێمـە بۆمـان بـاس دەکـرا کـە لوولـە درێژکـراوەکان ﴿عَمَدٍ مُّمَدَّدَةِۭ ۝٩﴾، چەنـد لوولەیەکـن لـە دۆزەخـدا، بەهـۆی ئـەو لوولانـەوە ئـازار دەدرێن.

ئنجـا ئایـا دەخرێنـە نێـو لوولـەکان، ئەگـەر لوولـەی ئاسـن بـن، یاخـود هـەر کانزایەکـی دیکـە بـن، یاخـود مەبەسـت ئەوەیـە: کۆڵەکـەو لوولـەکان بـە پشـت دەرگایەکانـەوە نـراون، بـۆ ئـەوەی نەکرێنـەوە لەسـەریان، هـەردوو واتایـەکان هەڵدەگـرێ، بـەڵام زیاتـر وا پـێ دەچـێ مەبەسـت پێـی ئـەوە بـێ، کـە ئەوانـە دەخرێنـە نێـو لوولـە ئاسـنەکانەوە.

لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن: {**أُوقِـدَ عَلَيهـا النَّـارُ أَلْـفَ سَـنَةٍ حَتَّـى احْمَـرَّتْ، ثُـمَّ أُوقِـدَ عَلَيْهَـا أَلْـفَ سَـنَةٍ حَتَّـى ابْيَضَّـتْ، ثُـمَّ أُوقِـدَ عَلَيْهَـا أَلْـفَ سَـنَةٍ حَتَّـى اسْوَدَّتْ، فَهِـيَ سَـوْدَاءُ مُظْلِمَـةٌ**} (**حديـث أبي هريـرة المرفـوع: أخرجـه الترمـذي: ٢٥٩١، وابـن ماجـه: ٤٣٢٠،**

حدیث أبي هریرة الموقوف: أخرجه الترمذي عقب الحدیث المرفوع، وقال: الموقوف أصح).

واتە: ئەو ئاگرەی دۆزەخ کە دەفەرمووێ: ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ﴾، ئاگری هەڵگیرسێنراو، داگیرسێنراوی خوایە، هەزار ساڵ سووتەمەنیی دراوەتە بە ڕێ و داگیرسێنراوە تاکو سوور بۆتەوە، دوایی هەزار ساڵی دیکە سووتەمەنیی دراوەتە بەر تاکو سپی بووە، دوایی هەزار ساڵی دیکە سووتەمەنیی دراوەتە بەڕێ و داگیرسێنراوە تاکو ڕەش بووەو، ئێستا ڕەش و تاریکە.

وەك چۆن باسی تونێڵە ڕەشەکان (**الثقوب السوداء**)، دەکرێ، کە ماددەی یەکجار چڕوخەست و بەهێزیان تێدایە، هۆی دروستبوونیشیان ئەوەیە: ئەو ئەستێرانەی کۆتاییان دێ، ئەو تونێڵە ڕەشانە ماددە پاشماوەکەیان هەمووی لە خۆیاندا کۆدەکەنەوەو، قورسایی و بارستایی ئەو ماددەیەش کە لە نێو تونێڵە ڕەشەکاندایە، یەکجار زیاترە لەوەی لە ئەستێرەکان و خڕۆکەکاندا هەیەو، هەر ئەستێرەو خڕۆکەیەك بە لایان دابچێ، هەڵیدەلووشن و، لە چەند چرکەیەکدا تێکیدەشکێنن و دەیکەن بە بەشێکی بەقەبارە بچووك لە خۆیان.

لە کۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتە موبارەکەدا دەڵێم:

خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەکەدا، بۆمان باسی جۆرە مرۆڤێك دەکات، کە زۆری لێ توورەیەو ڕقی لێیە، چونکە لە سەرەتاوە دەفەرمووێ: سزای سەخت بۆوی، لە کۆتاییشدا دەفەرمووێ: ئەوانە بەبێ بایەخیی فڕێ دەدرێنە نێو ئاگرێکی تێکشکێنەرەوە، دوایی دەفەرمووێ: چی بە تۆی زانانەوە ئەو ئاگرە تێکشکێنەرە چییە؟، واتە: زۆر بێزراو زەبەلاحەو تۆ ناتوانی پەی پێ ببەی، دوایی خۆی پێناسەی دەکات: ﴿ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ٦ ﴾، ئاگری داگیرسێنراوی خوایە، کە بە پێی ئەو دەقەی پێشتر هێنامان: هەزار ساڵ داگیرسێنراوەو سوور بووە، هەزار ساڵی دیکە داگیرساوەو سپی بووەو، هەزار ساڵی دیکە داگیرساوەو ڕەش بووە!

ئنجا دەفەرموێ:﴿ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلْأَفْـِٔدَةِ ﴾، ئەو ئاگرە دەچێتە سەر عەقڵ و دڵەکان، دەچێتە سەر هەناو و ناخەکان، یاخود پەی بە عەقڵ و هەناو و ناخیان دەبات چی تێدایە! ئنجا هەر ئەوەندەش نا، بەڵکو دەرگایەکانیشیان لەسەر داخراون، بەس ئەوەندەش نا، بەڵکو لەوێشدا لە نێو تابووت و لوولەی درێژکراو دان، لوولەو تابووتی ئاسن، یاخود هەر کانزایەکی دیکە کە بەس خوا دەیزانێ، لە نێو ئەو تابووت و لوولانەدا درێژکراون، یانی: لوولەکان کە درێژکراون و ڕاکێشراون، ئەوانیش لە نێو ئەو لوولە ئاسنانەدا سزاو ئازار و ئەشکەنجە دەدرێن، لەبەرچی؟ چونکە ئەو جۆرە کەسانە عادەتیان وابووە خەڵك بشکێنن، چ پاشملە بە خراپە باسیان بکەن، چ بەرەو ڕوو تانەیان لێ بدەن و بیانەوێ ناشیرینیان بکەن.

هەروەها ئەو جۆرە کەسانە هەر خەریکی پەیداکردنی ماڵ و سامانن، هەر جۆرە ماڵ و سامانێك بێ و، بەردەوام سەرگەرمی کۆکردنەوەو پەزمەندە کردنینی: ﴿ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالًا ﴾، (مالاً) کە بە نەناسراو (**نكرة**)، هاتوە، واتە: هەر جۆرە ماڵێك بێ، بێ گوێدانە حەڵاڵ و حەڕام، وەك لە سووڕەتی (**البقرة**)دا، خوا لە بارەی جوولەکەکان و موشریکەکانەوە دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ ﴿٩٦﴾ ﴾، دەشیابنینی سوورترین کەسن لەسەر هەر جۆرە ژیانێك، ئەوانەش هەر جۆرە ماڵ و سامانێك، بە هەر شێوەیەك بۆیان کۆببێتەوە، کۆی دەکەنەوە، ﴿ وَعَدَّدَهُۥ ﴾، هەروەها هەر خەریکی ژماردنینی، یاخود خەریکی ئامادەکردنینی.

ئنجا خەیاڵیشیان وایە ئەو ماڵ و سامانە، هێڵەرەوەی ئەوانەو وا دەکات ئەوان بمێننەوەو لە بەین نەچن، واتە: ماڵ و سامانەکە دەبێتە مایەی هێشتنەوەیان لە ژیاندا، خۆیان یاخود دوای خۆیان، کەس و کاریان و وەچەیان، پێیان وایە ئەو ماڵ و سامانە، دەبێتە هۆکاری دەستەبەرکردنی ژیانێکی نەبڕاوە بۆیان!

کەواتــە: لێــرەدا خــوای دادگــەر ئــەوەی بــۆ کەســانێکی دیارییکــراو فەرمــووە، کــە پێشــتریش باســمان کــرد، **(الطـبري)**، دەڵــێ: لەبــارەی جەمیلــی کــوڕی عامیــری جومەحییــەوە، یاخــود: لەبــارەی ئەخنەســی کــوڕی شــوڕەیقەوە هاتەخــوار، **(القرطبـي)** یــش دەڵــێ: لەبــارەی: وەلیــدی کــوڕی موغیــرە، یــان ئومەییــەی کــوڕی خەڵەفــەوە، هاتەخــوار، هەندێــکی دیکەشــیان هەندێــك کــەسی دیکــە دەڵێــن، بــەڵام چ لــە بــارەی ئەوانــەوە بووبــێ کــە ناویــان هێنــرا، چ لــە بــارەی بێبڕوایەکانــەوە بــە گشــتیی، ئەوانــە تەنیــا چەنــد نموونەیەکیــان بــوون.

بــەڵام پێویســتە لــەوەش وریابیــن کــە دەگونجــێ مســوڵمانانیش گرفتاربــن بــە هەندێــك لــە خەســڵەت و ســیفەتی خراپــی هاوبــەش بــۆ خــوا دانــەرەکان، یاخــود بێبڕوایــەکان، یــان دەغــەڵ و مونافیقەکانــەوە، نابــێ هیــچ گومانمــان لــەوەدا هەبــێ، بۆیــەش خــوا ﷻ هۆشــداریی دەدات بــە ئێمــەو، بــەو شــێوەیە بــاسی ســزای ســەختی ئەوانــە دەکات کــە خــاوەنی ئــەو ســیفەتانەن، واتــە: ئێــوەش خۆتــان لــەو ســیفەت و خەســڵەت و بیــرو بۆچــوون و خولیــا خراپانــە، دوور بگــرن و بپارێــزن، چونکــە خــاوەنی ئــەو ســیفەتە خراپانــە بــەو شــێوەیە ســزا دەدرێــن!

لــە ڕاســتییدا شــکاندنی خەڵــك و بــە بــێ بایــەخ تەماشــاکردنیان پاشــملە، یاخــود بــەرەو ڕوو، لەگــەڵ مــاڵ و ســامان کــۆ کردنــەوە و ژمــاردن و پەزمەنــدە کــردنی دا زۆر لێــك نیزیکــن، ئەوانــە پاشــملەو بــەرەو ڕوو زیاتــر خەڵــك دەشــکێنن، کــە مــاڵ و ســامانیان هەیــە و بــە مــاڵ و ســامانەکانیان بوغڕابــوون و، لــە کــەوڵ دەرچــوون و یاخیــی بــوون، ئەوانــە خۆیانیــان پــێ لــە خەڵــك زیــادە و، بــە چــاوی ســووك تەماشــایان دەکــەن و، چ پاشــملە چ بــەرەو ڕوو، هەوڵــی شــکاندن و ســووککردن و لــە پێــش چــاو خســتنیان دەدەن.

خــوا بــە لوتــف و کەڕەمــی ڕەهــای خــۆی، هەمــوو لایەکمان بــە ســیفەتە بــەرز و جوانــەکان بڕازێنێتــەوەو، بمانپارێــزێ لــە خــوو و خــدە و ســیفەتە خراپــەکان، کــە

ئەوانیش لە بیرو بۆچوون و خولیا خراپەکانەوە هەڵدەقوڵن، بۆیە لە خوای بەرزی مەزن دەپاڕێینەوە: پێشێ لە خولیاو بیرو بۆچوون و نیازو مەبەستە خراپەکان چەپاڵەمان بدات و بمانپارێزێ، کە دەبنە بنك و ڕیشەو، جێی گەراتێدا دانان و شوێنی تێدا ترووکانی ماك و میکرۆبی ئەو خوو و خدەو سیفەت و ڕەفتارە خراپانە.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی ناخمان پاك بکاتەوە لە بیروخولیای خراپ و، ڕواڵەتیشمان پاك بکاتەوە لە ئاکارو ڕفتاری خراپ و، دەروون دەرمان بڕازێنێتەوە بە بیرو خولیای باش و کاروئاکاری پەسند، چونکە هەرچی بیرو خولیای باشە، لە خوا بە یەکگرتن و تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا کردنەوە، سەرچاوە دەگرێ و، بیر و خولیا خراپەکانش لە لە خوا دووریی و، هاوبەش بۆ خوا دانان و، بڕوانەبوون بە خواو، نکووڵییکردن لە پایەکانی دیکەی ئیمان کە سەرجەمیان پەیوەندییان بە خوای پەروەردگارەوەیە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا، ڕۆژی دوایی و دیداری خوا، بیرو خولیا خراپەکان و ڕەفتارە خراپەکان لە وێوە سەرچاوە دەگرن، خوا بە بەزەیی و میهرەبانیی خۆی ئیمان لە دڵماندا بە هێزتر بکات، بە جۆرێك ڕەگ و ڕیشەی هەرچی سیفەتی خراپە، بیسووتێنێ و دڵ و دەروونمان وا پاك بێ، نەگونجێ هیچ بیروخولیاو ڕەوشت و ڕەفتارێکی خراپ چەکەرەی تێدا بدات و، ماك و میکرۆب و گەرای هیچ سیفەتێکی خراپی تێدا دابنرێ.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێك

بەڕێـــــزان!

ئەمڕۆ کە (٢٩ / ١٢ (ذو الحجة) ١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٨/١٩) زایینی، لە شاری دێرینی هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (**الفیل**)، سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکی سوورەتەکە لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو.

## پێناسەی سوورەتی (الفیل) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە زیاتر بە (**سورةُ الفیل**)، ناسراوە، بەڵام هەردووك ناوی: (**سورةُ ألم تر**) و (**سورةُ القُریش**)یش بۆ بەکارهاتوون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئەم سوورەتە بە یەکدەنگیی زانایان، سوورەتێکی مەککەییەو، لە مەککە هاتۆتەخوار، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

(عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِيَ اللـهُ عَنْهُـمَا قَـالَ: أُنْزِلَـتْ سُـورَةُ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١﴾، بِمَكَّـةَ)، (ذَكَـرَهُ السـيوطي فِي الـدر المنثـور: ج٨، ص٦٢٧، ونسـبه لابـن مردويـه، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥٥٨).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازیـی بـێ)، گوتوویەتی: سـوورەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ١﴾، لـە مەککە هاتۆتەخوار.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە موصحـەف دا ژمارەکـەی سـەدو پێنـج (١٠٥)ەو، لـە دابەزینیشـدا ژمارەکـەی نـۆزدە (١٩)یـە، پێـش سـوورەتی (**الفلـق**)و، دوای سـوورەتی ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾، دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، بەیەکدەنگیی ژمێرەران پێنج (٥) ئایەتە.

## پێنجەم: ماناو نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە نێوەڕۆکەکـەی بریتیـە لـە خسـتنەڕووی چاکەیەکـی یەکجـار مەزنـی خـوا ﷻ بـۆ پێغەمبـەرو هاوەڵانـی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)و بـڕواداران بـە گشـتیی، هەروەهـا بـۆ خەڵکـی مەککـە، بـە هەمـوو جۆرەکانیانـەوە، بـە بـڕوادارو بێبـڕواوە، بـە گشـتییتر، کـە خـوای کاربەجـێ و توانـا کاتـی خـۆی سـوپایەك کـە بـە خاوەنانـی فیـل (**أصحـاب الفیـل**) نـاوی بـردوون، هاتـوون کەعبـە بڕووخێنن، بـەڵام خوا ﷻ فەوتاندوونـی بەهـۆی بەسـەردا بارێنرانـی قـوڕی بەردییـن لەلایـەن باڵندانێکـەوە کـە بـە (**أبابیـل**) نـاوی هێنـاون، کـە سـەرەنجام وەك کاو ئاڵفـی خوراویـان لـێ هاتـوەو قڕەبـڕ بـوون.

هەڵبەتـە ئـەوەش چاکەیەکـی خوایـە ﷻ دەیخاتـە بەرچـاوی پێغەمبـەری خـۆی موحەممـەد ﷺو هـاوەڵان و شـوێنکەوتووانی (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بـە پلـەی یەکـەم، هـاوکات بیـری بێبڕوایەکانـی مەککەشـی دەخاتـەوە، کـە ئێمـە لـە پەنـای ئەم

یەکەمین و گەورەترین و گرنگترین ماڵی خوادا کە کەعبەیە، ئێوەشمان پاراستوە، هەروەها دڵدانەوەی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانیشیەتی، کە ئەو خوا بەرزو مەزن و باڵادەستەیان لە پشتەو سەریان دەخات، دیسان لە بەرانبەریشدا: ترساندن و هۆشداریی پێدانی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوادانەرانیشە، کە ئەو خوایەی ئاوا سزای خاوەنانی فیلی داو سوپایەکەی بەرباد کردن، ئێستاش پشتیوانیی بڕواداران دەکات، پشتیوانیی پێغەمبەری کۆتایی خۆی و ئەو هاوەڵانەی ﷺ شوێنی کەوتوون دەکات و، ئێوەش دەبێ لە سزاو تۆڵەو جەزرەبەی بترسێن و، ئەگەر هەر سووربن لەسەر دژایەتییکردنی پێغەمبەری خوا ﷺو پەیام و بەرنامەکەی و، هاوەڵان و شوێنکەوتووانی.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

دەتوانین چوار تایبەتمەندیی لەم سووڕەتە موبارەکەدا ببینین:

١- وشەی ﴿ٱلۡفِيلِ﴾، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٢- وشەی ﴿طَيۡرًا أَبَابِيلَ﴾یش، دیسان تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٣- وشەی: ﴿كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ﴾، وەك ئاڵف و کای خوراو، تایبەتە بەم سووڕەتەوە، وشەی: ﴿ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ١٢﴾الرحمن، هاتوە، بەڵام ئەوەی ئەوێ جیایە، لەوێ خوا ﷻ باسی ڕووەك دەكات، ئەو ڕووەکانەی خاوەن گەڵان و دوایی دەبن بە گیاو ئاڵف.

٤- بەسەرهاتی **(أصحاب الفيل)** بە پێچەوانەی بەسەرهاتەکانی دیکەی قوڕئانەوە، لە قوڕئاندا دووبارە نەبۆتەوەو بەس لێرەدا هاتوە، پێم وایە ئەویش دوو هۆکاری بنەڕەتیی هەن:

**یەکەم:** بە دڕۆدانانی هیچ پێغەمبەرێکی تێدا نیە، تاکو پێویست بە دووبارە کردنەوە بکات.

**دووەم:** تاكو هاوبەشدانەران خۆی پێوە هەڵنەكێشن و، پێیان وابێ ئەوە ئیمتیازێكە بۆ ئەوان.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكانی:

ئێمە هەر پێنج (٥) ئایەتەكەی ئەم سوورەتە دەكەینە دەرسێك، چونكە هەموویان لە یەك تەوەردا دەسوورێنەوەو، لە بارەی یەك بابەتەوەن كە باسمانكرد.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هـەر پێنـج ئایەتەکـەی سـوورەتی (الفیـل) پێـك دێ، وەك پێشـتریش گوتمـان: لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، خـوا ﷻ سـەرنجی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ ڕادەکێشـێ و، دەشـگونجێ وشـەی: ﴿ أَلَمْ تَرَ ﴾، ئایـا نەتبینـی؟ دواندنـی هـەر کەسـێك بـێ کـە شایسـتەی دوێنرانـە، واتـە: ڕووی دوانـدن تەنیـا لـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ نەبـێ، بەڵکـو ڕووی دوانـدن لـە هـەر کەسـێك بـێ خاوەنـی هەسـت و هـۆش بـێ و، بگونجـێ بدوێـنرێ، خـوا دەفەرمـوێ: ئایا نەتبینـی؟ واتـە: بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ، چونکـە ئەوانـەی دوێـنراون، جگـە لـە کەمێکیـان، ئەگەرنـا لـەو کاتـەدا کـە چـل پەنجا سـاڵ لـەوەو پێـش بـووە، لـە مەککـەدا ئامادە نەبـوون، واتـە: ئایا بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ نەتانبینـی، بەنسـبەت ئەوانەشـەوە کـە بینیویانـەو لـەوێ مـاون، وەك دوایـی نـاوی هەندێکیـان دێنیـن، بـۆ ئـەوان دەگونجـێ مەبەسـت لەبینیـن، بینینـی چـاوی سـەر بـێ، ئایـا بەچـاوی سـەر نەتانبینـی؟ ﴿ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ۝١ ﴾، پـەروەردگارت چـی کـرد، چۆنـی کـردو بـە خاوەنانـی فیـل!

﴿ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ۝٢ ﴾، ئایا پیلانەکـەی زایـە نەکـردن، بێئـاکام و بـێ ئەنجامـی نەکرد؟!

﴿ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣ ﴾، باڵندەی پۆل پۆلی ناردە سەریان.

﴿ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤ ﴾، بـەردی لـە قـوڕی وشـکبووەوەی، قـوڕی بـووە بەردیـان بەسـەردا دەبارانـدن، پێیانـدا دەدان!

﴿ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ۝٥ ﴾، خـوا ﷻ لـە ئەنجامـی ئـەوەدا گێڕانـی بـە ئاڵـف و کای خـوراو.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە}.

{ئایا نەتدی (بە چاوی عەقڵ و دڵ)؟ پەروەردگارت چۆنی بە خاوەنانی فیلەکە کرد! ﴿١﴾ ئایا فێڵ و پیلانەکەیانی نەخستە (چاڵی) زایە بوون (و بێ ئاکامیی)ەوە ﴿٢﴾ ئنجا پۆلە باڵندەکانی ناردە سەریان ﴿٣﴾ بەردی قوڕینە بەردیان تێدەگرتن ﴿٤﴾ سەرەنجام گێڕانی بەکا (و ئاڵف)ی خوراو ﴿٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ): (أَصْحَاب)، کۆی (صَاحِبَ)ە و، بە مانای هاوەڵە، بە مانای خاوەنیش دێ، بەڵام زیاتر بە مانای هاوەڵ دێ، خاوەنیش بۆیە پێی دەگوترێ: (صاحب)، لەبەر ئەوەی هەمیشە لەگەڵ ئەو شتەدایە کە خۆی خاوەنیەتی.

(فیل)یش ئاژەڵێکە خاوەنی (المعجم الوسيط)[1]، ئاوا پێناسەی دەکات: (**الفِيلُ: حَيْوَانٌ ضَخْمُ الجِسْمِ مِنَ العَوَاشِب الثديية، ذُو خُرطُوم طَوِيل، يَتَنَاوَلُ بِهِ الأَشْيَاءَ كَاليدِ، لَهُ نَابَانِ بَارِزَانِ كَبِيرَانِ، يُتَّخَذُ مِنْهُمَا العَاجُ، وَالجَمْعُ أَفْيَالُ و فِيَلَة**)، (**فِيل**): ئاژەڵێکی زەبەلاحە لە ڕووی جەستەوە، لەو ئاژەڵانەیە کە گواندارە، لەسەر

---

(١) ص ٧٠٩.

گژوگیا خواردن دەژی، لووتێکی درێژی هەیە شتی پێ دەست دەداتێ، وەك چۆن مرۆڤ بە دەست شت دەگرێ، ئەو بەو لووتە دەیگرێ، (نێرەکەی) دوو ددانی گەورەی دەرچووی هەن، (عَاج)یان، لێ دروست دەکرێ، [بۆ دەسکی چەقۆو خەنجەرو هاووێنەکانیان کە ماددەیەکی قایم و بەهێزە، سپییەو جوان و بریقەدارە] وشەی (فیل)، بە (أَفيَال و فِيَلَة)، کۆدەکرێتەوە، واتە: فیلەکان.

(كَيْدَهُمْ ): (**الكَيْدُ: ضَرْبٌ مِنَ الإِحْتِيَالِ، وَقَدْ يَكُونُ مَذْمُوماً وَمَمْدُوحاً، وَيُسْتَعْمَلُ فِي المذْمُومِ أَكْثَر**)، (**كَيْد**): جۆرێکە لە فێڵ، جاری وا هەیە سەرزەنشتکراوەو جاری واش هەیە ستایشکراوە، بەڵام بە زۆریی بۆ حاڵەتی سەرزەنشتکردن و خراپیی بەکاردەهێنرێ.

(تَضْلِيلٍ ): (**أي: تَضِييع**)، واتە: بەزایەدان، زایەکردن، بێ بەرهەم و ئاکام کردن.

(طَيْرًا أَبَابِيلَ ): (**طير**)، ناوی کۆیە بۆ (**طائر**) باڵندە، (**طير**)، واتە: باڵندەکان، (**أبابيل: أي مُتَفَرِّقَةٌ كَقِطْعَاتِ إِبِلٍ، الوَاحِدَ: إِبِّيل**)، (**أبابيل**)، واتە: پرژوبڵاو وەك ڕەوەوکۆمەڵە حوشترەکان، تاکی (**أبابيل**)، بریتیە لە (**إِبِّيل**)، هەندێکیش گوتوویانە: تاکی نیەو ناوێکە وەك (**عباديد و أباطيل**).

(سِجِّيلٍ ): (**حَجَرُ وَطِينٌ مُخْتَلِطٌ، وَأَصْلُهُ فِيمَا قِيلَ: فَارِسِيٌّ مُعَرَّبٌ: سَنْجِ جل**) (سنگ گل) **حَجَرٌ طِينِيٌّ**)، (سِجِّيلٍ ) بەردو قوڕی تێکەڵە وەك گوتراوە: لە زمانی (فارسیی) یەوە هاتوە، بەڵام عەرەبێنراوە، ڕیشەکەی بریتیە لە (**سنج جل**) لە ئەسڵ دا (سنگ گل)ە، (سنگ)، واتە: بەرد (گل)، واتە: قوڕ، یانی: (**حَجَرٌ طِينِيٌّ**)، بەڵام لەبەر ئەوەی لە زمانی عەرەبییدا پیتی (گ) نیە، بۆیە (گ)، بووە بە (**ج**)و لە جیاتی بڵێن: (سنگ گل)، گوتوویانە: (**سنج جل**)، دواییش ئەو دوو وشەیە تێکدا دەغم کراون و بووە بە: (سِجِّيلٍ )، واتە: بەردێکی قوڕیین، بۆیەش من گوتوومە: قوڕینە بەرد.

(كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ): (**العَصْفُ وَالعَصِيفَةُ: الَّذِي يُعْصَفُ مِنَ الزَّرْعِ، وَيُقَالُ لِحُطَامِ النَّبْتِ المتَكَسِّرِ: عَصْف**)، (**عَصْفُ وعَصِيفَة**): بریتیە لەو جۆرە کشتوکاڵەی دوایی

پـووش و گیـای لـێ پەیدادەبـێ، هەروەهـا ڕووەکێـك کـە وشـك بووبـێ و تێکشـکابێ، پێـی دەگوتـرێ: (**عَصْـف**)، دەگوتـرێ: (**رِيـحٌ عَاصِـفٌ وَعَاصِفَـةٌ وَمُعْصِفَـةٌ: تَكْسِرِ الـشَّيء فَتَجْعَلـهُ كَعَصْـفٍ**)، بایەکـی (**عَاصِـف وعَاصِفَـة ومُعْصِفَـة**)، هـەر سـێکیان نـاوی بکـەر (**إسـم فاعـل**)ن، واتـە: ئـەو بایـەی شـت تێـك دەشـکێنێی و وەك (**عصـف**)ی، لـێ دەکات، واتـە: وەك پـووش و پـەڵاش و ئاڵفێـك کـە ئـاژەڵ دەیخـوات.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئێمـە دوایـی لەبـەر ڕۆشـنایی کتێبـی نـاوداری: (**السـيرة النبويـة لابـن هشـام**)دا، لـە پـازدە (**١٥**) خاڵـدا پوختـەی بەسـەرهاتی هاوەڵانـی فیـل، کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکـە بـە کورتیـی ئامـاژەی پـێ دەکات، دەخەینـەڕوو.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنی خوێندنـی ئـەم سـوورەتەم بـە نـاوی خـوای بەبەزەیی بەخشـندەیە، لـە کاتـی گوتنـی: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) (بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیی بەخشـندە)دا، پێویسـتە بـەلای کەمـەو ئـەم چـوار مانـاو مەبەسـتە لـە عەقڵ و دڵ دا ئامـادە بکرێـن:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای میهرەبان دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجـا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَٰبِ ٱلْفِيلِ ①﴾، ئایـا نەتبینـی پـەروەردگارت چـی بـە خاوەنانـی فیلەکـە کـرد، چۆنـی پێکـردن؟ ئنجـا خـوا خـۆی چـۆن پێکردنـەی و چـی بەسـەر هێنـاون، ڕوونـی دەکاتـەوە:

﴿أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ۝٢﴾، ئایا پیلانەکەیانی نەخستە زایە دانەوە، ئایا نەخشەو پیلانەکەیانی نەخستە بێ ئاکامییەوە؟ (تَضْلِيل)، یانی: (تَضْيِيع، ضَلَّ الشَّيء أي: فُقِدَ وَضَاعَ)، (تضليل) زایەکردنە، (ضلَّ الشَّيءُ) شتەکە، ون بوو، زایەبوو، نەما، خوا نەخشەو پیلانێك کە خاوەنانی فیل دایاننابوو، کە بریتی بوو لەوەی کەعبە بڕووخێنن و ڕوو بەخەڵك وەرسووڕێنن بەرەو ئەو پەرستگایەی دروستیانکردبوو لە حەبەشە، خوا ئەو پیلانەی پووچەڵ کردنەوەو بێ ئاکام بوو، ئنجا خوا ڕوونی دەکاتەوە: چۆن ئەو پیلانەی لێ بێ ئاکام کردن و هەڵیوەشاندەوەو، خستیە زبڵدانی زایەبوون و بێ ئاکامییەوە؟

﴿وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ۝٣﴾، باڵندە پۆل پۆلەکانی ناردە سەریان، (طير)، ناوی کۆیە بۆ باڵندە (طائر)، واتە: باڵندەکان، (أبابيل) یان لە تاکی (إبّيل) ەوە، هاتوە، یاخود (أبابيل)، هەر بۆ خۆی ناوێکەو تاکی نیە، واتە: کۆمەڵ کۆمەڵ باڵندەکانی ناردنە سەریان، ئەو پۆلە باڵندانەی ناردنە سەریان.

﴿تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ۝٤﴾، بەردی (سجّيل)یان، پێدادەدان، یانی: بەردێکیان پێدادەدان کە لە (سجّيل) پێکهاتبوو، (سجّيل)یش هەموو ڕوونکەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەکدەنگن دەڵێن: (الطِّين المتحجِّر)، واتە: قوڕێکی بەبەردبوو، یانی: بەردی قوڕینیان بەسەردا دەباراندن، کە ئەصڵی خۆی لە (سنگ گل)ی فارسیی یاخود کوردییەوە هاتوە، (سنگ)، واتە: بەرد، (گل)، واتە: قوڕ (طين)، ئنجا لەبەر ئەوەی پیتی (گ)، لە زمانی عەرەبییدا نیە، (گ) بۆتە (ج)، (سَنْج جل)، سەنگی گڵ بۆتە (سنج جل)و، دواییش تێکدا دەغم کراون و بۆتە (سجّيلَ)، بۆ کورتکردنەوە.

﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ۝٥﴾، ئەو بەردە لە قوڕ دروست بووانەیان کە بەسەردا دەباراندن و، پێیاندا دەدان و دەیانهاویشتن، سەرەنجام خوا گێڕانی بە کاو ئاڵفی خوراو، واتە: وەك کاو ئاڵفی خوراوی لێکردن، ئنجا ئایا مەبەست لە کاو ئاڵفی خوراو: چەوەڵە؟ ئاڵف و کاو گیاو گوڵ کە دادەنرێ بۆ وڵاخ، هەندێکی

دەخـوات و ئـەوەی دیکـەی دەبێتـە بەرمـاوەو پێـی دەڵێـن: چـەوەڵ، ئایـا مەبەسـت پێـی ئەوەیـە؟ یـان مەبەسـت پێـی ئـەو پاشـەڕۆکەیە کـە ئـاژەڵ دایدەنـێ؟ لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە ئـاژەڵ پـووش و گیـاو ئاڵـف دەخـوات، پاشـەڕۆکێك دادەنـێ، کـە ڕیخـە بەنسـبەت ڕەشـەوڵاخەوەو، قشـپلە بەنسـبەت مـەڕو بزنـەوە، هەروەهـا بەنسـبەت حوشـترەوەو، تەرسـە بەنسـبەت کـەرو ئێسـترو وڵاخـە بەرزەکانـەوە؟ هـەردوو واتایەکـە دەگرێتـەوە، گرنـگ ئەوەیـە خـوا ﷻ فەرمایشـتە هـەرە بەرزەکـەی خـۆی لـە ئـەوە پاراسـتوە وشـەیەکی تێدابـێ شایسـتەی نەبـێ، لـە جیاتـی بفەرمـوێ: گێڕانـی بـە پاشـەڕۆك، یـانی: تـەرس و ڕیـخ و قشـپل، فەرموویـەتی: وەك کای خـوراوی لێکـردن.

دەشـگونجێ مەبەسـت ئـەوە بـێ کـە ئـەو ئاڵـف و گژوگیـاو کایـەی دەخـورێ، ئـەوەی دەمێنێتـەوە دەبێتـە چـەوەڵ.

یاخـود: ﴿ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ﴿٥﴾ ﴾، ئـەو ڕووەکانـەی کـە گەڵایـان هەیـە، کاتێـك دانەکەیـان لێدەبێتـەوە، هـەر پـووش و پـەڵاش دەمێنێتـەوە، خـوا ﷻ بـەو شێوەیەی گێـڕان، بـەو جـۆرەی لێکـردن، کەواتـە: ئـەی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و، ئـەی هـاوەڵان و شـوێنکەوتووانی لـە ڕۆژگاری خۆیـداو، شـوێنکەوتووانی بـە درێژایـی کات و بـە پانایـی شـوێنەکان بزانـن! ئـەو خـوا پـەروەردگارەی کاتـی خـۆی ئـاوای لـە کەسـانێك کـرد کـە هاتبـوون کابـە بڕووخێنـن، ئـەو پەروەردگارەیـە سەرپەرشـتیی ئێوە دەکات و خاوەنـی ئێوەیـە، مشـوورخۆری ئێوەیـە، بۆیـە ئێـوەش پشـتی پـێ ببەسـتن و پشـتتان پێـی قاییـم بـێ، لـە بەرانبـەر کۆسـپ و تەگـەرەکان دا کـە دێنـە ڕێتـان و، لـە بەرانبـەر ناحەزانێکـدا کـە سـەنگەرتان لێدەگـرن و دژایەتییتـان دەکـەن.

هەروەهـا لـەو لاشـەوە: ئـەی بێبڕوایـەکان! بزانـن ئـەو پـەروەردگارەی بـەو شـێوەیە کابـەی پاراسـت، لـە پێناوی ئـەوەدا کە دەبێتە یەکەمین نشـینگەو مەڵبەنـدی پێغەمبەری کۆتایـی ﷺ - ئەگەرنـا لەبەرچـاوی کاڵـی بێبڕوایـەکان نەبـووە - ئـەو پـەروەردگارەی پێـش ئـەوەی موحەممـەد ببێتـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەڵکـو لـە ساڵـی لـە دایـك بوونـی دا، کە ساڵی فیلـە، بـەو شـێوەیەی کـرد، ئـەو خـوا پـەروەردگارە ئێسـتاش خەمـی لـێ دەخـوات

و مشووری لێ دەخوات و پشتگیریی دەکات و سەرپەرشتیی دەکات و، هەر کەسێك دژایەتیی بکات، خوای دادگەرو پەروەردگار بۆی لە بۆسە دایە.

## پوختەی بەسەرهاتی هاوەڵانی فیل

ئنجا با پوختەی ئەو بەسەرهاتە لەبەر ڕۆشنایی کتێبە ناودارەکەی (**السيرة النبوية لابن هشام**)[1]، لە پازدە (١٥) بڕگەدا بە کورتیی و بە گوشراویی بێنین:

(**إبن هشام**)، سەرەتا لە (**إبن إسحاق**)ەوە دەیهێنێ، کە یەکێك لە حوکمڕانەکانی یەمەن بە ناوی (**أرياط**)،ساڵانێك حوکمڕانیی کرد لە یەمەندا، دوایی سەبارەت بە کاروباری حەبەشە - چونکە یەمەن لەلایەن حەبەشەییەکانەوە سەرپەرشتیی دەکرا - ئەبرەهە لێی ڕاست بۆوە کە یەکێك بوو لە سەربازەکانی و، سەرەنجام ئەبرەهە توانی (**أرياط**) بکوژێ.

**بڕگەی یەکەم:** کە (**إبن هشام**)، لە ژێر ناوونیشانی: (**أَمْرُ الفيل وَقِصَّة النَّسَأ**)، کاروباری فیل و چیرۆکی (**نسأ**)دا، ئەوانەی ساڵیان دوا دەخست، یاخود مانگی حەڕامیان دەگۆڕی بۆ مانگی دیکە، لەبەر ئەوەی پێویستیان دەبوو لەو مانگەدا شەڕو شۆڕ بکەن، دەڵێ:

دوایی ئەبرەهە لە صەنعاء پەرستگایەکی دروستکرد بە ناوی (**القُلَّيْس**)، کڵێسایەکی دروستکرد کە لەڕۆژگاری ئەودا لەسەر زەوی کڵێسای لەو شێوەیە نەبوو، نامەیەکیشی نووسی بۆ (**النجاشي**)، کە لە حەبەشە حوکمڕان بوو، (یەمەن ویلایەتێك بووە سەر بە حەبەشەو ئەبرەهە لەوێ، دوای ئەوەی (**أرياط**)ی کوشت بۆ خۆی بوو بە حوکمڕان) گوتی: ئەی پادشا! کڵێسایەکم بۆ دروستکردووی کە

---

[1] ( ) تحقيق جودة محمد جودة، دار الهيثم، السنة (١٤٢٧) هـ (٢٠٠٦) م، الطبعة الأولى ص(٢٩ - ٣٦).

لە پێش تۆدا هیچ حوكمڕانێك ئەو جۆرە كڵێسایەی نەبووە، وازیش ناهێنم تاكو حەجی عەرەبەكان وەرنەسووڕێنم بۆ ئەم كڵێسایە بە ناوی (**القُلَّيْس**).

**بڕگەی دووەم:** كاتێك عەرەبەكان زانییان ئەبرەهە نامەیەكی ئاوای بۆ نەجاشیی نووسیوە كە لە حەبەشە حوكمڕان بووە، یەكێك لەو پیاوانەی (النَّسَأ)، ئەوانەی مانگیان دەگۆڕی، تووڕە بوو، ئەویش لە: (**بني فقيم بني عدي بن عامر بن ثعلبة بن الحارث بن مالك بن كنانة بن خزيمة بن مدركة بن إلياس بن مضر**) بوو، (نَسَأ)، ئەوانە بوون كە مانگەكانیان لە سەردەمی نەفامییدا دوادەخست، مانگێكیان لە شوێنی مانگی حەرام دادەناو، مانگی حەرامیان دەگواستەوە بۆ مانگێكی دیكە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ ﴿٣٧﴾﴾ **التوبة**، ئنجا پیاوێك لە هۆزی كینانە تووڕە دەبێ و، دەچێ لەو پەرستگایەدا (لە قولەیسدا) دادەنیشێ، (پیسایی تێدا دەكات) دواییش دەڕواو دەچێتەوە بۆ سەر زەمینی خۆی، كاتێك هەواڵ بە ئەبرەهە دەدرێ لەوبارەوە، دەڵێ: كێ وایكردوە؟ دەڵێن: پیاوێك لە عەرەب، لەوانەی دەچن بۆ سەردانی ئەو كابەیەی لە مەككەیە، كاتێك بیستوویەتی تۆ بە تەمای ڕوو بە عەرەبان وەربسووڕێنی، بەرەو ئەم پەرستگایە (قولەیس)، تووڕە بووەو، بەو شێوەیەی لە پەرستگایەكەت كردوەو گوتوویەتی: ئەو پەرستگایە شایستەی ئەوەنیە خەڵك ڕێزی لێ بگرێ و بە دەوریدا بێ و بچێ و، خوای تێدا یان لە دەورەدا بپەرسترێ.

**بڕگەی سێیەم:** ئەبرەهەش لەوە تووڕە دەبێ و سوێند دەخوات: دەبێ بچێ ئەو ماڵە، ئەو كابەیە برووخێنێ، ئیدی فەرمان دەكات بە حەبەشەو سوپایەك سوپایەك ساز دەكات و دەڕواو لەگەڵ خۆشیدا فیلێك دەبات، كە هەندێك گوتوویانە: زیاتر لە فیلێك بووە، بەڵام وا پێدەچێ یەك فیلی گەورە بووبێ، لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە فیلەكە ناوی مەحموود (**فيل محمود**) بووە.

**بڕگـەی چـوارەم:** کاتێـك عـەرەب ئـەو خـۆ ئامادەکـردن و جموجۆڵـەی ئەبرەهـە - بـە سـوپایەکی گـەورەی حەبەشـەوەو کـە فیلێکیـان لەپێشـدایە - دەبیسـتن ئەوەیـان زۆر لـەلا مـەزن دەبـێ و دەترسـێن و، پێشـیان وادەبـێ پێویسـتە لەسـەریان دژی بجەنگـن، چونکـە دەبیسـتن کـە دەیـەوێ کابـە بڕووخێنـێ، واتـە: ماڵـی حەڕامکـراوی خـوا، ئیـدی پیاوێـك لـە شـەرەیفەکانی مەککـەو، لـە حوکمڕانەکانـی کـە نـاوی **(ذو نفـر)** بـووە، لەگـەڵ هۆزەکـەی خۆیـدا دەڕوات و هـەر کەسـێك لـە عەرەبـان کـە بەدەنگیـەوە دێ، دەردەچـن بـۆ جەنگکـردن لـە دژی ئەبرەهـەو، بەرگرییکـردن لـە ماڵـی حەڕامکـراوی خـوا، لەبـەر ئـەوەی دەیـەوێ بیڕووخێنـێ و تێکـی بـدات، ئیـدی خەڵکێـك کـە وەڵامـی دەداتـەوەو وەڵامـی دەداتـەوە، ئەویـش دەچێتـە پێشـی و لـە دژی دەجەنگـێ، بـەڵام سـەرەنجام **(ذو نفـر)** خـۆی و هاوەڵەکانـی تێکدەشـکێن و **(ذو نفر)**یـش، بـە دیـل دەگیـرێ، کاتێـك ئەبرەهـە دەیـەوێ بیکـوژێ **(ذو نفـر)**، پێـی دەڵـێ: ئـەی پادشـا! مەمکـوژە ڕەنگـە مانـەوەی مـن لەگـەڵ تـۆدا باشـتربێ لـە کوژرانـم، ئەویـش وازی لێدێنـێ و نایکـوژێ، بـەڵام لـە لای خـۆی کەلەبچـەی دەکات و، ئەبرەهـە پیاوێکـی هێدیـی و مەنـد بـووە، دوایـی ئەبرەهـە بـەرەو ئـەو مەبەسـتە دەچـێ کـە بـۆی هاتـوە.

**بڕگـەی پێنجـەم:** دوایـی **(نُفیـل بـن حبیـب الخَثْعَمـي)**، لەگـەڵ هـەردوو هـۆزی **(خَثْعـم)**، کـە بریتیـن لـە: **(شـهران و ناهیـس)**، و هەمـوو ئەوانـەی لـە هۆزەکانـی عـەرەب دوایـان دەکـەون، دەچێتـە پێـش سـوپای ئەبرەهـەو، لەگەڵیـدا دەجەنگـێ، بـەڵام سـەرەنجام ئەبرەهـە ئەویـش دەشـکێنێ و نوفەیلیـش وەك **(ذو نفـر)**، بـە دیـل دەگیـرێ، کاتێـك دەیـەوێ بیکـوژێ، نوفەیلیـش پێـی دەڵـێ: ئـەی پادشـا! مەمکـوژە چونکـە مـن ڕێ پیشـاندەری تـۆم لەسـەر زەمینـی عەرەبـداو، ئـەوەش دوو دەستەکەمن لـە هۆزەکـەم: **(خَثْعَـم)**، شـەهران و ناهیـس، ئامـادەن گوێـت بـۆ بگـرن و فەرمانبەرییـت بـۆ بکـەن، ئەبرەهـەش وەك چـۆن **(ذو نفـر)** ناکـوژێ، ئەویـش ناکـوژێ و دەیهێڵێتـەوە.

**بڕگەی شەشەم:** دوایی ئەبرەهەو سوپایەکەی دەڕۆن لەگەڵ کەسێکدا کە ڕێیان پیشان دەدات، هەتا بە لای تائیفدا تێدەپەڕن، مەسعوودی کوڕی موعەتتیبی، کوڕی مالیکی، کوڕی کەعبی، کوڕی عەمری، کوڕی سەعدی، کوڕی عەوفی، کوڕی سەقیف، لەگەڵ پیاوانێکدا لە هۆزی سەقیفدا، دەچنە پێشی پێی دەڵێن: ئەی پادشا! ئێمە کۆیلەی تۆین و گوێگرین و فەرمانبەریین بۆ تۆو، لەگەڵ تۆدا هیچ دژایەتییەکمان نیەو، ئەوماڵەی تۆ دەتەوێ بیڕووخێنی، ماڵەکەی ئێمە نیە، کە مەبەستیان پێی (**اللات**)ەو، ئەوانیش پەرستگایەکیان هەبووە بە ناوی (**اللات**)، بەڵکو تۆ دەتەوێ ئەو ماڵە بڕووخێنی کە لە مەککەیە، ئێمەش کەسێك کە ڕێت پیشاندەدات لەگەڵت دەنێرین، ئیدی ئەویش چاو پۆشییان لێ دەکات و هەقی بەسەر تائیفەوە نابێ، (لات)یش بریتی بووە لە ماڵێك لە تائیف، بە مەزنیان گرتوە، هەروەك چۆن کابە بە مەزن گیراوە.

**بڕگەی حەوتەم:** هۆزی (**ثقيف**) لە تائیف (**أبو رُغال**)ی، لەگەڵ دەنێرن کە ڕێیان پیشان بدات، بەرەو مەککە، ئەبرەهە دەڕواو (**أبو رُغال**)یشی، لەگەڵدایە، تاکو دەچنە (**المغمس**)، کاتێك لەوێ دادەبەزن، (**أبو رُغال**) لەوێ دەمرێ، بۆیە دوایی عەرەبەکان گۆڕی (**أبو أرغال**) بەردباران دەکەن کە ئێستا لە (**المغمس**)ە، خەڵك بەردی پێدادەدات، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی پێش سوپای ئەبرەهە کەوتوە کە ڕێیان پیشان بدات و بگەنە کەعبەو بیڕووخێنن.

**بڕگەی هەشتەم:** کاتێك ئەبرەهە لە (**مغمس**) دادەبەزێ، پیاوێك لە حەبەشە دەنێرێ پێی گوتراوە: (**الأسود بن المقصود**)، بە سواری ئەسپێك دەینێرێ تاکو دەچێتە مەککە، ئیدی لەوێ هەرچی ماڵ و سامانی ئەهلی تیهامە هەبووە، لە قورەیش و جگەلە قورەیش بۆی کۆدەکاتەوە، واتە: حوشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزنیان، لە نێو ئەو ئاژەڵانەدا کە دەیانبات، دوو سەد (٢٠٠) حوشتری عەبدولموتتەلیبی کوڕی هاشیمیش واتە: باپیری پێغەمبەر ﷺ لە نێویاندا دەبن، کە ئەو کاتە عەبدولموتتەلیب گەورەو حوکمڕانی هۆزی قورەیش بووە، ئنجا

هـۆزی قوڕەیـش و کینانـەو هوزەیـل، هەروەهـا هەمـوو ئەوانـەی لـە چوارچێـوەی حەڕەمـدان، لـە خەڵکـی دیکـە، دەیانـەوێ لـە دژی ئەبرەهـە بجەنگـن، بـەڵام دوایـی تەماشـا دەکـەن ئـەو سـوپایەی ئەبرەهـە پێیەتـی - کـە وەك دوایـی باسـی دەکەیـن لـە هەندێـك لـە شـیعرەکاندا هاتـوە شەسـت هـەزار (٦٠٠٠٠) کـەس بـووە - دەزانـن توانایـان بەسـەریدا ناشـکێ، بۆیـە واز لـەو بیرۆکەیـە دێنـن و دەڵێـن: بـا شـەڕێك نەکەیـن دەرەنجامەکـەی تێکشـکان و دۆڕانـی تێدابـێ.

**بڕگـەی نۆیـەم:** ئەبرەهـە (**حِنَاطَـةُ العُمـيري**)، دەنێـرێ بـۆ مەککـەو پێـی دەڵـێ: بپرسـە حوکمـڕان و سەرپەرشـتیاری ئـەم وڵاتـە، کێیـە؟ ئنجـا پێـی بڵـێ: پادشـا پێـت دەڵـێ: مـن نەهاتـووم بـۆ جەنـگ لـە دژی ئێـوە، بەڵکـو هاتـووم ئـەم کابەیـە بڕووخێنـم، ئنجـا ئەگـەر جەنگـم لـە دژ نەکـەن، مـن هەقـم نیـە بەسـەر خوێنـی ئێـوەوەو ناتانکـوژم، ئنجـا ئەگـەر نەیویسـت لـە دژی ئێمـە بجەنگـێ، بیهێنـە بـۆ لام، کاتێـك (**حناطـة**)، دەچێتـە مەککـە لـە سـەرۆکی هـۆزی قوڕەیـش و شـەریفی قوڕەیـش دەپرسـێ، پێـی دەڵێـن: عەبدوڵموتتەلیبـی کـوڕی هاشـیمی کـوڕی عەبدوملەنافـی کـوڕی قوصەییـە، دەچـێ بـۆ لای و ئـەوەی ئەبرەهـە پێـی ڕاگەیانـدوە پێـی دەڵـێ، عەبدوملوتتەڵیبیـش دەڵـێ: ئێمـە نامانـەوێ دژی بجەنگیـن و توانـای ئەوەمـان نیـەو، ئـەوەش ماڵـی حەڕامکـراوی خوایـە، خـوا ﷻ قەدەغـەی کـردوە خراپـەی تێـدا بکـرێ و، ماڵـی دۆسـت و خۆشەویسـتی خوایـە کـە ئیبڕاهیمـە (علیـه السلام)، یـان وێنـەی ئـەوەی گـوت، ئنجـا ئەگـەر خـوا بیـەوێ بەرگریـی لـێ بـکات، ئـەوە ماڵـی خـۆی و حەڕەمـی خۆیەتـی و، ئەگـەر لێشـی بگـەڕێ، ئێمـە توانامـان نیـە، مەگـەر خـوا بـۆ خـۆی بیپارێـزێ، (**حُنَاطَـة**)، پێـی دەڵـێ: وەرە لەگەڵـم، چونکـە پادشـا (ئەبرەهـە) پێـی گوتـووم، لەگەڵـم دا بێـی بـۆ لای.

**بڕگـەی دەیـەم:** عەبدوملوتتەڵیـب لەگەڵـی دەچـێ و هەندێـك لـە کوڕەکانـی خۆشـی لەگەڵیـدا دەبـن و دەچێتـە لای سـوپایەکە، بـەر لـەوەی بچـێ بـۆ لای ئەبرەهـەش لـە (**ذو نفـر**)، دەپرسـێ - ئەوکەسـەی پێشـتر ئەبرەهـە بـە دیلـی گرتبـوو،

بەڵام نەیكوشتبوو، پێشتر برادەری عەبدولموتتەلیب بووە - دەچێتە لای لەو شوێنەدا كە تێیدا بەدیل گیراوە، پێی دەڵێ: ئەی (ذو نفر)، ئایا هیچ سوودێكت هەیە پێمان بگەیەنی لەو بەڵایەی بەسەرمان هاتووە، (ذو نفر)یش، دەڵێ: بابایەكی دیل بە دەستی حوكمڕان و پاشایەكەوە كە چاوەڕێیە بەیانی یان ئێوارە بیكوژێ، چ سوودێكت پێ بگەیەنم! نەخێر من هیچ شتێكم لە دەست نایەت، بەڵام (أُنَیس)، كە فیلەوانە ئەو سەرپەرشتیی فیلەكە دەكات، برادەرمەو كەسێك دەنێرمە لای لە بارەی تۆوە ڕای دەسپێرم كە لەگەڵت چی لە دەست دێ، هاوكارییت بكات، پێی دەڵێم خۆی مۆڵەتت بۆ لەپادشا وەربگرێ و، بەو شێوەیەی خۆت دەتەوێ، ئاوا لەگەڵ پادشا (ئەبرەهە)دا بدوێی، پێشی دەڵێم تكات بۆ بكات لەلای ئەگەر بتوانێ، عەبدولموتتەلیبیش دەڵێ: دەجا ئەوەندەم بەسە، ئیدی (ذو نفر)، دەنێرێ بۆ لای ئونەیس، پێی دەڵێ: عەبدولموتتەلیب سەرۆك و گەورەی هۆزی قورەیشەو خاوەنی كاروانە لە نێو مەككەداو، خەڵك لە دەشت و، دڕندانیش لەسەر چیایەكان بژیو دەدات، ئێستاش دوو سەد حوشتری كەوتۆتە لای پادشا، لەگەڵ ئاژەڵ و وڵاخی خەڵكی دیكەدا گرتوویەتی، بۆیە مۆڵەتی بۆ وەربگرەو سوودی پێ بگەیەنە بەوەندەی دەتوانی، (أُنَیس)یش، دەڵێ: وادەكەم، ئیدی لەگەڵ ئەبرەهەدا قسە دەكات و دەڵێ: ئەی پادشا! ئەمە سەرۆكی هۆزی قورەیشە لەلات وەستاوەو داوای مۆڵەت دەكات و، هەر ئەوە خاوەنی كاروانی مەككە بێ و، ئەوە خواردن دەدات بە خەڵك لە دەشت و، هەروەها بە دڕندەكان لەسەر لووتكەی چیایەكان، بۆیە مۆڵەتی بدە با بێتە لات، لە بارەی كارێكی خۆیەوە قسەت لەگەڵ دەكات و لەگەڵیشیدا چاك بە، ئەبرەهەش مۆڵەتی دەدات، عەبدولموتتەلیبیش پیاوێكی زۆر جوان و بەشان و شەوكەت و بەدیمەن بوو، كاتێك ئەبرەهە دەیبینێ زۆر ڕێزی دەگرێ، پێی ناخۆش دەبێ عەبدولموتتەلیب لە خوارێ دابنێ و خۆی لەسەر تەختەكە دابنیشێ و، پێشی ناخۆش دەبێ حەبەشەییەكان ببینن لەگەڵ خۆی دا بردوویەتی بۆ سەر تەختی حوكمڕانیی، بۆیە ئەبرەهە لە تەختەكەی دێتە خوارو پێكەوە لەسەر

بەرەیەك دادەنیشن و ئەویش لە تەنیشت خۆی دادەنێ، ئنجا بە وەرگێڕەکەی دەڵێ: پێی بڵێ: ئیشت چییەو بۆچی هاتووی؟ وەرگێڕەکەش پێی دەڵێ، ئەویش دەڵێ: ئیشم ئەوەیە پادشا ئەو دوو سەد سەر حوشترەکەم کە گرتوونی بمداتەوە، کاتێك ئەوە دەڵێ، ئەبرەهە بە وەرگێڕەکە دەڵێ: بڵێ: کاتێ بینیمی تۆم بە مەزنگرت و بە تۆ سەرسام بووم، بەڵام کاتێك منت دواند لەبەر چاوم کەم بایەخ بووی، ئایا لە بارەی دوو سەد حوشترەوە دەودوێنی کە گرتوومن، کەچی ماڵێك کە دینی تۆیەو دینی باب و باپیرانتە هاتووم، بیڕووخێنم، لەو بارەوە قسەم لەگەڵ ناکەی؟ عەبدولموتتەلیب دەڵێ: **(أَنَا رَبُّ الإبلِ وإنَّ للبَيْتِ رَبًّا سَيَمْنَعُهُ)**، واتە: من خاوەنی حوشترەکانم، ئەم ماڵەش پەروەردگارو خاوەنێکی هەیە، بەرگریی لێ دەکات و دەیپارێزی، ئەبرەهە دەڵێ: ناتوانێ ڕێگریی لە من بکات بیڕووخێنم، عەبدولموتتەلیب دەڵێ: ئنجا تۆو ئەو ماڵە، بزانم داخۆ چی دەکەی! هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لەگەڵ عەبدولموتتەلیبدا کە چووە بۆ لای ئەبرەهە کاتێك **(حناطة)**ی ناردوە بۆ لای: **(يعمر بن نفاثة بن عدي بن دئل بن بِكْر بن عبدالمناد بن كنانة)**، کە لەو کاتەدا سەرۆکی بەنی بەکر بووە لەگەڵی بووە، هەروەها **(خويلد بن واثلة الهذلي)**، کە سەرۆکی هوزەیل بووە ئەویشی لەگەڵدا بووە، ئەو دووانەش پێشنیار دەکەن بۆ ئەبرەهە کە یەك لەسەر سێی ماڵی تیهامەی بدەنێ، کە ناوچەیەکی زۆر فراوانە بەڵام بگەڕێتەوەو، ئەو ماڵی خوایە نەڕووخێنێ، بەڵام ئەو ڕازی نابێ، **(إبن هشام)**، دەڵێ: خواش زاناترە کە ئایا ئەمە بووە یان نەبووە، بەڵام دوایی ئەبرەهە دووسەد حوشترەکە دەداتەوە بە عەبدولموتتەلیب.

**برگەی یازدەیەم:** دوای ئەوەی عەبدولموتتەلیب ئەبرەهەی بەجێهێشت، چووە لای هۆزی قورەیش و هەواڵەکەی پێڕاگەیاندن، فەرمانیشی پێکردن لە شاری مەککە بچنە دەرێ، لەسەر لووتکەی چیاو، لە دۆڵ و شیواندا خۆیان پەنا بدەن، تاکو لە زیانی سوپایەکەی ئەبرەهە دوورو سەلامەت بن، دوایی عەبدولموتتەلیب

هەڵساو کۆمەڵێك لە سەرانی قورەیشی لەگەڵ دابوون، لە خوا دەپاڕانەوەو داوای سەرکەوتنیان لێ دەکرد بەسەر ئەبرەهەو سەربازەکانیدا، ئنجا عەبدولموتتەلیب ئاڵقەی دەرگای کەعبەی گرت و گوتی:

**لَاهُم إنَّ العَبْدَ يَمْنَعُ رَحْلَهُ فَامْنَع حَلَالَكَ ... لايَغْلِبَنَ صَلِيْبُهُمْ، وَمُحَالُهُمْ غُدُوّاً مَحَالَكَ**

واتە: ئەی خوایە! بەندە بەرگریی لە هەوارو شوێنی خۆی دەکات، تۆش بەرگریی لە حەڵاڵی خۆت بکە (لە شوێنەکەی خۆت بکە)، با بەیانی خاچەکەیان و سوپاکەیان بەسەر شوێنەکەتدا زاڵ نەبن، (لەبەر ئەوەی ئەبرەهەو سوپایەی لە حەبەشەوە هاتوون و، ئەو کاتە نەصرانیی بوون).

**بڕگەی دوازدەیەم:** دوایی عەبدولموتتەلیب ئاڵقەی دەرگای کەعبەی بەرداو، خۆی و ئەوانەی لە (قورەیش) لەگەڵیدا بوون، چوونە سەر لووتکەی چیایان و خۆیان تێدا پەنادان و، چاوەڕێیان دەکرد ئایا ئەبرەهە کە چووە مەککەوە چی دەکات؟ بەیانیش ئەبرەهە خۆی سازکردو فیلەکەی کە ناوی (**محمود**) بوو ئامادەی کرد، بۆ چوونە نێو مەککەو وێرانکردنی کەعبەو دوایی گەڕانەوە بۆ یەمەن، لەو کاتەدا (**نفیل بن حبیب الخَثْعَمِي**) چووە تەنیشت فیلەکەو گوێی گرت و پێیگوت: مەحمموودا! یەخبە، (واتە: دابنیشە) یان بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی لێیەوە هاتووی، تۆ لە وڵاتی حەرامی خوادای، دوایی گوێی بەرداو فیلەکەش لە شوێنی خۆی یەخبوو، ئیدی هەرچەندە فیلەکەیان دەنگداو، بە زەبر لێیانداو تێیانەوە ژەنی کە هەڵسێ، بەڵام هەڵنەستا، بەرەو هەر شوێنێك دەنگیان دەداو لێیان دەخوڕی، بەرەو شام، بەرەو یەمەن، بەرەو ڕۆژهەڵات، دەڕۆیی، بەڵام بەرەو مەککە نەدەڕۆیی و جەنەی دەگرت.

**بڕگەی سێزدەیەم:** خوای بەرزو مەزنیش لە دەریاوە جۆرە باڵندەیەکی ناردە سەریان، هەر کامێکیان سێ بەردی گچکەی پێ بوون، بەردەکان لە شێوەی نیسك و نۆکدا بوون، هەرکامیان، یەکیانی بە دەندووکی هەڵگرتبوو، دووانیشیان

بـە دووپێیـەکان، هـەر کامێکیـان لـە سـوپای ئەبرەهـە بەردێکـی وێ کەوتبایـە، دەفەوتـا، بـەڵام هەموویـان لـەو بەردەیـان پـێ نەکـەوت، ئیـدی شـکان و ڕایانکـرد بـەرەو یەمـەن و، هەواڵـی (**نفیـل بـن حبيب**)یـان دەپرسـی کـە ئـەو ڕێنیشـاندەریان بـووە، بـە حیسـاب دەلیلیـان بـوو، تاکـو ڕێـی گەڕانـەوە بـەرەو یەمەنیـان پێشـان بـدات .

**بڕگـەی چواردەیـەم:** سـەرەنجام ئەبرەهـە بـە خـۆی و سـوپاکەیەوە ڕایانکـرد، لـە هەمـوو ڕێیانـدا دەکەوتـن و دەمـردن، ئەبرەهـەش جەسـتەی بـەری کەوتبـوو بۆیـە پارچـە پارچـە لێـی بەردەبـۆوەو، هەتـا گەیشـتنەوە صەنعـا، هـەر کێـم و زووخـاوی لـێ دەهـات، سـەرەنجام وەك بەچکـە باڵندەیەکـی لێهاتـەوە واتـە: زۆر بـێ پەڕووبـاڵ و نابـووت بـوو بـوو، دڵـی لـە سینەیەوە هاتـە دەرێ و مـرد .

**بڕگـەی پازدەیـەم و کۆتایـی:** ئنجـا کاتێـك خـوا بەرپەرچـی حەبەشـەی دایـەوە، واتـە: سـوپایەکەی ئەبرەهـەو لـە مەککـە دووری خسـتنەوەو ئـەو بەڵایەیـان تـووش بـوو (واتـە: سـوپای ئەبرەهـە تووشـی ئـەو بەڵایـە بـوون)، گەلـی عـەرەب قورەیشـیان بـە مەزنگرتـو گوتیـان: ئەوانـە خەڵکـی خـوان (**هَـؤاء أهْـلُ اللـه**)، خـوا شـەڕی لەسـەر کـردن و پاراسـتنی و دوژمنـی لـە کۆڵکردنـەوە، ئیـدی لـەو بـارەوە شـیعری زۆریـان گوتـن، لـەو بـارەوە کـە خـوا چـی بەسـەر حەبەشـە هێنـا، ئـەو سـوپایەی لـە حەبەشـەوە هاتبـوو، چـۆن خـوا پیلانـی وانـی لـە قورەیـش بەرپـەرچ دایـەوەو، قورەیشـی سـەلامەت کـرد، بـۆ نموونـە: یەکێـك لـە شـیعرەکان دێنـم: (**عبداللـه بـن الزبعـري**) گوتوویەتـی:

**تَـنَـكَّـلُوا عَـــنْ بَطْنِ مَـكَّـةَ إنَّـهَـا ... كَانَتْ قَـدِيمًا لَا يُرَامُ حَرِيمُـهَـا**

**لَـمْ تُخْلَقْ الشِّـعْـرَى لَيَالِيَ حُـرِّمَتْ ... إذْ لَا عَـزِيزَ مِـنْ الْأَنَامِ يَـرُومُـهَا**

**سَـائِلْ أَمِـيرَ الْجَـيْشِ عَنْهَا مَا رَأَى ... وَلَسَوْفَ يُنْبِي الْجَاهِـلِينَ عَلِيمُهَا**

سِتّونَ أَلْفاً لَمْ يَئُوبُوا أَرْضَهُمْ ... وَلَمْ يَعِشْ بَعْدَ الْإِيَابِ سَقِيمُهَا

كَانَتْ بِهَا عَادٌ وَجُرْهُمُ قَبْلَهُمْ ... وَاللَّهُ مِنْ فَوْقِ الْعِبَادِ يُقِيمُهَا

واتە: خۆتان لەسەر زەمینی مەککە دوور بخەنەوە، چونکە لە دێر زەمانەوە حەڕەمی نەشکێنراوە، جارێ ئەستێرەی گەلاوێژ دروست نەبووە، کە قەدەغەکراوەو، هیچ دەسەڵاتدارێك لە مرۆڤان توخنی نەکەوتوە (بە مەبەستی زیان پێگەیاندن)، لە فەرماندەی سوپایەکە بپرسە: چی دی؟ ئەو کاتە زانای ئەو بەسەرهاتە هەواڵ بە نەزانان دەدا، چییان بەسەر هاتوە؟ شەست هەزار کەس نەگەڕانەوە وڵاتیان و، نەخۆشەکەشیان دوای گەڕانەوە نەژیا، لە پێش وانیش (**عادو جورهوم**) هەبوون، خواش لە سەرووی بەندەکانەوە ئەوماڵەی ڕاگرتوەو پاراستوویەتی.

ئەمە کورتە و پوختەیەك بوو، لە بەسەرهاتی فیلداران (هاوەڵانی فیل)، کە لە قورئاندا بە (**أَصْحَاب الفيل**) ناویان هێنراوە.

## مەسەلە گرنگەکان

ئـەم پێنـج ئایەتـە موبارەکـە، لـە یـەك مەسـەلەی گرنگـدا مانـاو واتایەکەیـان پوخـت دەکەینـەوە، ئەویـش بـەو شـێوەیە دایدەڕێژیـن:

**سـەرنج ڕاکێشـانی خـوا ﷻ بۆ پێغەمبەرەکـەی موحەممـەد ﷺ کـە چـۆن سـزای خاوەنانـی فیلەکـەی داو، نەخشـەو پیلانەکـەی وانـی پووچـەڵ کـردەوەو، چەنـد پۆلێـك باڵنـدەی نـاردە سـەریان، بـەرد بارانیـان کـردن بـە قوڕینـە بـەرد، سـەرەنجام وەك کاو ئاڵفـی خوراویـان لێهـات:**

وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ۞١ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ۞٢ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ۞٣ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ۞٤ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ۞٥﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ﴾، ئایا نەتبینی پەروەردگارت چۆنی بە هاوەڵانی فیلەکەکە کرد؟ ئەم پرسیارکردنە (أَلَمْ) (أ) هەمزەکە بۆ پرسیار کردنەو، پرسیارکردنی دانپێداهێنان (**الإِسْتِفْهَام للتَّقْرِيْر**)ە، ئەویش ئەوەیە تۆ بەرانبەرەکەت ناچاربکەی دانی پێدابێنێ، ئەگەرنا پرسیارکردنی داوای وەڵام نیە، (**أَلَمْ تَرَ كَيْفَ**) ئایا تۆ نەتبینی؟ واتە: دەبێ ببینی و دەبێ بینیبێت، پەروەردگارت چۆنی بە هاوەڵانی فیلەکە کرد، لێرەدا کە دەفەرموێ: (**أَلَمْ تَرَ**) وەك یەکێك لە ڕوونکەرەوانی قورئان گووتویەتی: (**الرُّؤيَةُ عَلْمِيّةٌ للْعِلْمِ البَالِغِ مِنَ اليَقِيْنِ مِنَ الأَمْرِ حَدّ الأَمْرِ المرئِيِّ**)، واتە: لێرەدا مەبەست لە بینین، بینینی زانینە، بەڵام ئەو زانینە لە دڵنیاییدا گەیشتۆتە سنوورێك وەك، بە چاو ببینی، (**أَلَمْ تَرَ**) ئایا بە چاوی عەقڵ و دڵ نەتبینی، پەروەردگارت چی بە هاوەڵانی فیلەکە کرد، بە فیلدارەکان کرد؟

وشـەی (**كَيْـفَ**) لـە زمانـی عەڕەبییـدا، پرسـیاری پـێ دەكـرێ لـە بـارەی چۆنیەتییـەوەو، ڕووی دوانـدن لـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ، واتـە: چـۆن (**كَيْـفَ**) پرسـیاری پێكـراوە لـە چۆنیەتییكـی سەرسـووڕهێنەر بـۆ كاری خـوا ﷻ، بـەو بێبڕوایانـەی عەزمـی ڕووخاندنـی كەعبەیـان هەبـووە، (**أَصْحَـاب**) پێشـتریش گوتـراوە: كـۆی (**صَاحِـبْ**)ە، واتـە: خـاوەن، (**فيل**)یـش دەگونجـێ مەبەسـت یـەك فیـل بـێ، كـە فیـل مەحمـوود بـووە، دەشـگونجێ مەبەسـت پێـی جینسـی فیـل بێـت، چونكـە هەندێـك لـە مێژوونووسـان گوتوویانـە: سـوپایەكە زیاتـر لـە فیلێكیـان پـێ بـووە، بەڵام فیلـە گەورەكـە نـاوی مەحمـوود بـووە، بەهـەر حـاڵ ئـەوەی زیاتـر زانـراوە ئەوەیـە كـە فیلێكـی گەورەیـان پـێ بـووە بەنـاوی فیـل مەحمـوود لـە بەسەرهاتەكەشـیدا باسـمان كـرد .

٢)- ﴿ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴾، ئایا (پەروەردگارت) پیلان و فێڵی ئەوانی نەخستە زایە بوونەوە؟ (**التَّضْلِيْلُ: جَعْلُ الغَيْرِ ضَالاًّ، أَيْ: لا يَهْتَدِي لِمُرادِهِ، وهُنا مَجازٌ فِي الإِبْطالِ وعَدَمِ نَوالِ المَقْصُودِ**) وشەی (**تَضْلِيْل**): ئەوەیە تۆ ئەوی دیكە والێ بكەی گومڕابێ و بەڕێ نەزانێ، واتە: مەبەستەكەی نەهێنێتەدی، لێرەشدا مەجازە بۆ هەڵوەشاندنەوەو، دەست نەگەیشتنە مەبەست.

كـە دەفەرمـوێ: (**أَلَـمْ يَجْعَـلْ كَيْدَهُـمْ**)، (**الكَيْـدُ: الإِحْتِيـالُ عَـلَى إلْحَـاقِ شَرٍّ بِالغَـيْرِ ومُعالَجَـةِ إيقاعِـهِ**) (**كَيْـدَ**): بریتیـە لـە پەنهانكاریـی بـۆ زیانگەیانـدن بـەوی دیكـەو، چۆنیەتیـی پراكتیزەكردنـی ئـەو زیـان پێگەیاندنـەش.

دیسـان پرسـیاركردنەكەش پرسـیاركردنی دان پێداهێنانـە، چونكـە هـەر دیـارە كـە خـوا پیـلان و فێڵـی ئەوانـەی هاتبـوون كابـە بڕووخێنـن، لەبەینـی بـردو، پیلانەكـەی پووچـەڵ كردنـەوەو، ئـەو ئامانجـەی بـۆی هاتبـوون، وەدەسـتیان نەهێنـا، بەڵكـو خۆشـیان سـەلامەت نەبـوون و، هەموویـان بـە فەوتاویـی شـەول و شكسـتیی گەڕانـەوە .

٣)- ﴿ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ﴾، باڵندەی پۆل پۆلیشی نارده سەریان، (**إرسال**) بە مانای ناردنە، (**أَرْسَلَ عَلَيْهِمْ**) (**عَلَى**) لە زمانی عەرەبیدا زیاتر بۆ زیانە، (**أَرْسَلَ عَلَيْهِ**) بە پێی سیاق و مەقامیش دەزانرێ، کە ئەمە بۆ زیان پێگەیاندنە، ناردیە سەریان، چی؟ (**طَيْرًا أَبَابِيْلَ**)، (**الطَّيْرُ: اسْمٌ جَمْعِ طَائِرٍ، وَهُوَ الحَيَوانُ الَّذِي يَرْتَفِعُ فِي الجَوِّ بِعَمَلِ جَناحَيْهِ**) (**طَيْر**) ناوی کۆی (**طائِر**)ە، واتە: باڵندە کە بریتیە لەو ژیاندارەی بەرز دەبێتەوە بە هەوادا، بەهۆی ڕاوەشاندنی باڵەکانیەوە، (**وتَنْكِيرُهُ لِلنَّوْعِيَّةِ؛ لِأَنَّهُ نَوْعٌ لَمْ يَكُنْ مَعْرُوفاً لِلْعَرَبِ**)، (**طَيْرًا أَبَابِيْلَ**) بەنەزاندراو (**نكرة**) هاتوە، چونکە ئەو جۆرە باڵندەیە بۆ عەرەبان ناسراوو زاندراو نەبووە.

لەو بارەشەوە لە دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گێڕدراوەتەوە کە گوتوویەتی: (**أَنَّهَا أَشْبَهُ شَيْءٍ بِالخَطَاطِيفِ**)، ئەو باڵندانە زۆر وەك (**خَطاطِيفِ**) دەچوون، (**خَطاطِيفِ**) کۆی (**خُطَّافَ**)ە، کە جۆرە باڵندەیەکە شت دەڕفێنێ، هەروەها لە جگە لە دایکمان عائیشەوە هاتوە کە گوتوویەتی: (**تُشْبِهُ الوَطْواطَ وَالخُفَّاشَ**) واتە: وەك شەمشەمە کوێرە دەچێ، لە هەندێ شوێن (چەکچەکیلە)ی پێدەڵێن، وەك پەڕەسێلکە باڵندەیەکی لەو جۆرە بووە گەورەتر لە چۆلەکە پاساریی و،لە کۆترو کەو ئەوانە گچکەتر، وشەی (**أَبَابِيْلَ**)ش بە مانای کۆمەڵەکان دێ و بۆ زۆرییە، (**أَبَابِيلُ: مثل عبابيد، الْجَمَاعَات وَيَجِيء فِي مَوضِع التَّكْثِيْر**) (**أَبَابِيْلَ**)، وەك (عبابيد)، یانی: کۆمەڵەکان، لە شوێنێك دێ مەبەست پێی زۆریی بێ، کۆمەڵێکی زۆر، واتە: کۆمەڵانێکی زۆر باڵندەی ناردە سەریان کەواتە ئەوەی لە کوردەواریی خۆماندا زاندراوەو باوە کە بەیەك دانە باڵندە دەگوترێ: (**طَيْرَ أَبَابِيْلَ**)، ڕاست نیە، چونکە (**طَيْر**) ناوی کۆی (**طائِر**)ە، واتە: باڵندەکان، (**أَبَابِيْلَ**)یش یانی: کۆمەڵ کۆمەڵ، واتە: خوا باڵندەی کۆمەڵ کۆمەڵی ناردە سەریان.

ئنجا ئەو باڵندانەش کە زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: لە لای دەریاوە هاتوون، واتە: لە دەریای سوورەوە، ئایا چییان کردو، چ ئەرکێکیان پێسپێردراوە؟

٤)- ﴿ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ﴾، بەردە قوڕینەکانیان پێدادەدان، دوایی ڕوونکراوەتەوە **چییان لی هاتوە؟** (**الحِجَارَةُ: اسْمُ جَمْعِ حَجَرٍ**) (**حِجارة**) ناوی کۆیە بۆ بەرد، (**حَجَر**)، یانی: بەردێك و (**حِجارَة**) ناوی کۆیە، واتە: بەردەکان، (**مِنْ سِجِّيْلٍ**)، (**سِجيل**): پێشتریش لە شیکردنەوەکانی وشەکاندا باسمان کردوە، لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: (السجِّيل **الطِّيْنٌ المُتَحَجِّر**) قوڕێکی بەبەرد بوو، قوڕێك کە ڕەق بووبێ و بووبێتە بەرد.

بەڵام لە ڕاستییدا (**سِجِّيْل**) لە ئەسڵدا (**سَنْج جِل**)ە، (**سَنْج**) واتە: بەرد (**جِل**) واتە: قوڕ، ئایا ئەوە لە چییەوە هاتوە؟ لە (سەنگی گڵ)ەوە هاتوە؟ (سەنگی گڵ) یش یان فارسییە، یان کوردییە، (سەنگ)، یانی: بەردو (گڵ) یانی: قوڕ، بەردی قوڕ، بۆیەش بە:(قوڕینە بەرد) یان (گڵینە بەرد) مانام کردوە، لە زمانی عەرەبییدا پیتی (گ) نیە، بۆیە (سەنگ) بۆتە سەنج و، (گڵ یش) بۆتە جل، (**سَنْج جِلْ**)، دوایی تێکیاندا دەغمکردوەو بۆتە (**سِجِّيْل**)، ئەگەر تەماشای قامووسەکانی زمانیش بکەی، دەڵێن: ئەم وشەیە (**فارسي مُعَرَّب**) لە ئەسڵدا فارسییە، بەڵام عەرەبێنراوە، کراوە بە عەرەبیی، ئەگەرنا لە ئەصڵدا وشەیەکی فارسییە، ئەو باڵندانەش وەك پێشتر باسمان کرد لە بەسەرهاتەکەدا هەر کامێکیان سێ بەردی پێ بوون، یەکیان بە دەندووکی هەڵیگرتوەو، دووشیان بە هەردوو پێیەکانی، هەر کام لە سەربازەکانی ئەبرەهە یەکێك لەو بەردانەی پێکەوتبێ، وەك تێزاب پێیدا چۆتە خوارو لەبەینی بردوە، ئنجا ئایا سەرەنجام چییان لێهات؟

٥)- ﴿ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ﴾، ئنجا (خوا) گێڕانی بە کای خوراو، یان: بە پووش و ئاڵفی خوراو، (**العَصْفُ: جمع عَصْفَة، ورَقُ الزَّرْعِ**)، (**عَصْف**) کۆی (**عصفة**)یە کە بریتیە لە گەڵای کشتوکاڵ، (**عصفة**) یانی: یەك پووش، بەڵام (**عَصْف**) واتە: کۆی ئەو پووش و گەڵایانەی کشتوکاڵ.

ئەم ڕستەیەش دوو واتایان دەگەیەنێ:

أ- مەبەست ئەوەیە کە ئەو سەربازانەی ئەبرەهە، وەك ئاڵف و کاو پووشی خوراویان لێهات، وڵاخ و ئاژەڵ کە ئاڵف و پووش و گەڵا دەخوات، چی لێدێ؟ بە شێوەی ڕیخ و تەرس و قشپل و شیاکە، دایدەنێتەوە.

ب- وەك چۆن وڵاخ کە ئاڵف و لەوەڕی بۆ دادەنێی، پووش و پەڵاش دەخوات، ئەوەی لەبەری دەمێنێتەوە، بە کوردیی پێدەڵێن: چەوەڵ، ئەو بەرماوەی دەمێنیتەوە و درشتە بۆی ناخورێ، یان لێی تێربووە و بەجێیهێشتوە، واتە: وەك بەرماوو چەوەڵیان لێهات.

## نۆ وردە سەرنج دەربارەی ئەم سووڕەتە

### سەرنجی یەکەم:

پاراستنی کەعبە لە ساڵی (٥٧٠) زایینیی دا، لەبەر چاوی کاڵی هۆزی قورەیش نەبووە، کە ئەوکاتە بتپەرست بوون، یاخود زەندیق و بێبڕوابوون، بەڵکو دوو حیکمەتی گەورەی تێدا بوون:

**یەکەم:** پاراستنی حورمەتی یەکەمین ماڵی خوا لەسەر زەوی کە کەعبەیە و، ئیبڕاهیم و ئیسماعیلی کوڕی (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ) بنیاتیان نابوو، بە لای کەمەوە دوو هەزارو پێنجسەد ساڵ لەوەو پێش، پێش ئەو کاتە.

**دووەم:** وەك زەمینە خۆشکەرێك بۆ هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، کە ئەو سەر زەمینەی پێغەمبەری کۆتایی تێدا دێ، با لە پەنای ماڵ و کابەیەکدا بێ، کە خەڵك حورمەت و ڕێزی زۆری بۆ دابنێ و سام و هەیبەتی زۆری هەبێ، تاکو هەرچی ڕاست بووەوە هێرش نەکاتە سەر ئەو شوێنە.

ئەم دوو حیکمەتەی تێدابوون و، دەگونجێ حیکمەتی دیکەش دەربهێنرێن.

### سەرنجی دووەم:

خوا ﷻ لە ڕۆژگاری (**الحجاج بن یوسف الثقفي، وأبو طاهر القرمطي**) کە (حەججاج) هێرش دەکاتە سەر عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، کە ئیعلانی حوکمڕانیی و خیلافەتی کردبوو، ئەویش دەچێتە نێو مزگەوتی حەڕامەوە، ئەوانیش بە مەنجەنیق کەعبە دادەگرنەوەو، کەعبە دەڕووخێ و بەشێکی لێ خراپ دەبێ.

هەروەها لە سەردەمی (قرامطة)دا (**أبو طاهر القرمطي**) کە لە ساڵی (٣١٧) ی کۆچیدا دەیڕووخێنێ و تاکو ساڵی (٣٣٩)، واتە: ماوەی بیست و دوو ساڵ ئینجا ئایا بەردە ڕەشەش دەبات بۆ وڵاتی خۆی و بیست و دوو (٢٢) ساڵ بەردە ڕەشە لەوێ دەبێ، لە سەردەمی حەججاجدا کە کەعبە ڕووخێنراو لە سەردەمی (**أبو طاهر القرمطي**)دا کە کەعبە ڕووخێنراو، بەردە ڕەشەش دزرا، بۆچی خوا ﷻ بەرگریی لە کەعبە نەکرد.

وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەوە ئەرکی مسوڵمانان بوو، حەججاج بە حیساب والیی و سەرپەرشتیاری حوکمڕانانی بەنی ئومەییە بوو، نەدەبوو وای کردبایە، هەروەها (**أبو طاهر القرمطي**) کە هاتوە بێگومان مسوڵمانانی زۆری لێ بوون و، لە سەردەمی عەبباسییەکاندا بووەو، دەبووایە مسوڵمانان بەو ئەرکە هەڵسن، بەڵام لە سەردەمی پێش ئیسلامدا، کێ بەرگریی لە کەعبە کربایە؟ وەك لە بەسەرهاتەکەیدا باسمان کرد عەبدولموتتەڵیب پاڕاوەتەوە لە خوا، خوایە! ئەگەر تۆ ماڵەکەی خۆت و ئەو کابەیە بپارێزی دەپارێزرێ، ئەگەرنا ئێمە دەسەڵاتمان نیە، دەسەڵاتی سوپایەکی شەست هەزار (٦٠٠٠٠) سەربازییان نەبووە، ئەوانە تەنیا وەك عەشیرەتێك بوون، بەڵێ عەبدولموتتەڵیب پیاوێکی زۆر بەڕێزو بە حورمەت بوو، باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ئەو دەسەڵات و توانایەیان نەبووە، هەر بۆیەش ئەبرەهە پێی دەڵێ: کە هاتی زۆر لە پێش چاوم بەڕێزو بە حورمەت بووی، بۆیەش لە تەنیشت خۆی دایدەنێ، لەسەر بەڕەیەك دادەنیشن، پێ چاك نابێ بیباتە سەر تەختەکەی خۆی و، پێشی خۆش نابێ خۆی لەسەر تەخت دابنیشێ و عەبدولموتتەڵیب بەو هەموو هەیبەت و ویقارەوە لەسەر زەوی دابنیشێ، ئنجا دەڵێ: فەرموو بۆچی هاتووی؟ دەڵێ: بۆ ئەو دوو سەد (٢٠٠) حوشترە هاتووم کە بردووتانن، ئەویش دەڵێ: لە پێش چاوم زۆر بەڕێز بووی، بەڵام کە داوای حوشترەکان دەکەی، لە حاڵێکدا من هاتووم کەعبە بڕووخێنم لەبەر چاوم کەوتی، عەبدولموتتەڵیب وەڵامێکی عاقڵانەی دەداتەوە کە هەر لە

باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ دەوەشێتەوە، دەڵێ: من خاوەنی وشترەکانم و داوای حوشترەکانم دەکەمەوە، چونکە پیاوێکی خێرخوازم و خانەدانم و میوانم زۆر دێن، بەڵام ئەم کابەو و ماڵە خاوەنێکی هەیە کە خوایەو، ئەگەر خوا بیەوێ دەیپارێزێ و بە من ناپارێزرێ، چونکە دەسەڵات و سوپام هێندە بەدەستەوە نیە، دواییش هەر بەو شێوەیە دەبێ کە ئەبرەهە دەیبینێ، کەواتە: لە سەردەمەکانی دیکەدا کە بەس خوا دەزانێ چیدیکەش لە ڕۆژگاردا دەقەومێ و بەسەر ئەم کابەو ماڵی خودایە دێ، ئەوە ئەرکی مسوڵمانانە کە بە پاراستنی ئەو کابەیە هەڵسن و، ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن.

### سەرنجی سێیەم:

بەسەرهاتی فیلداران (**أصحاب الفيل**) هاوەڵانی فیلەکە، بوو بە هۆکاری زیادبوونی هەیبەت و ڕێزی کەعبە لە لای عەرەب و جگە لە عەرەبیش، چونکە جگە لە عەرەبیش زانیویانەو، بەدڵنیایی سوپایەکی شەست هەزار کەسیی بچێ و بە شڕودڕیی بگەڕێنەوەو، بەو شێوەیان بەسەربێ کە بینیویانە لە هەموو دنیادا دەنگی داوەتەوە، لە دنیای زانراوی ئەو کاتەدا دەنگی داوەتەوە، بۆیەش بۆ گەلی عەرەب بە هەموو هۆزەکانیەوەو، بۆ دەرو دراوسێشیان کابە حورمەت و هەیبەت و ویقارێکی گەورەی پەیدا کرد، کە هەروا خەڵك لە خۆوە نەچێ زیانی پێبگەیەنێ، بۆیەش ئەگەر کەسێك، کەسێك بابی کوشتبایە، برای کوشتبایە، گەورەترین زوڵمی لێ کردبایە، کە دەچووە لای کابە، پارێزراو دەبوو، کەس دەستی بۆ نەدەبرد تاکو لەوێی لانەچووبایە، دەیانگوت: تازە چۆتە پەنای ماڵی خوا، ئەوە شتێکی زانداروو باو بوو لە نێو گەلی عەرەبدا .

### سەرنجی چوارەم:

ڕووداوی فیل لە چەند فەرموودەیەکدا ئاماژەی بۆ کراوەو بۆ وێنە، دوو لەو فەرموودانە دێنین:

**١)-** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ، وسَلَّط عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، فِي سَاعَةٍ مِن سَاعَةِ نهارٍ،وَإِنَّهُ قَدْ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْم كَحُرْمَتِها بِالأَمْس، أَلَا فَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الغَائِبَ**}، (**أخرجه البخاري: ٩٦، ومسلم: ٤٤٧، ٤٤٨**).

واتـە: بەدڵنیایـی خـوا فیلـی حەپـس کـرد لـە مەککـە (واتـە: نەیهێشـت کەعبـە بڕووخێنـن)، بـەڵام خـوا پێغەمبەرەکـەی خـۆی و بڕوادارانـی بەسـەر مەککـەدا زاڵکـرد، لـە کاتێـك لـە کاتەکانـی ڕۆژێکـدا، ئێسـتاش هەمـان حورمـەت و ڕێـزی جارانـی بـۆ گەڕاوەتـەوە کـە جـاران هەیبـوو، بـا کەسـێك کـە لێـرە ئامادەیـە، بیگەیەنـێ بـەو کەسـەی لێـرە نیـە.

واتـە: تەنیـا بـۆ حاڵەتێکـی هەڵاوێـردراو لـە سـاڵی ئـازاد کردنـی مەککـەدا، بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺو بـڕواداران ڕەوا بـووە بـەزۆر بچنـە نێـو مەککـەوە، ئەگەرنـا کەسـی دیکـە بـۆی نیـە.

**٢)-** هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین: {**أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا أَطَلَّ يَوْمَ الْحُدَيْبِيَةِ عَلَى الثَّنِيَّةِ الَّتِي تَهْبِطُ بِهِ عَلَى قُرَيْشٍ، بَرَكَتْ نَاقَتُهُ، فَزَجَرُوهَا فألحَّت، فَقَالُوا: خَلَأَتِ الْقَصْوَاءُ، أَيْ: حَرَنت. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا خَلَأَتِ الْقَصْوَاءُ، وَمَا ذَاكَ لَهَا بِخُلُقٍ، وَلَكِنْ حَبَسَهَا حَابِسُ الْفِيلِ**} (**أخرجه البخاري: ٢٨٨١، ٢٨٨٢**).

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ کاتێـك لـە ڕۆژی حودەیبییـەدا چـووە لای (ثَنِيَّـةِ)، {(ثَنِيَّـةِ) نـاوی چیـاو بەرزاییەکـە} کـە شـۆڕدەبێتەوە بـەرەو لای قورەیـش، {ئـەو کاتـەی قورەیـش سـوپایان هێنـاوە بـۆ ڕێگرتـن لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ} حوشـترەکەی پێغەمبــەر ﷺ یەخبــوو، ئەوانیــش دەنگیــان دا، ئەویــش هــەر ســووربوو لەســەر یەخبوونـی خـۆی، {وەك چـۆن: کەرو وڵاخ دادەنیشـێ، حوشـتر کە دادەنیشـێ، دەڵێن: یـەخ بـوو}، دوایـی گوتیـان: ئـەم حوشـترە (کـە بـە قەصـواء نـاودار بـووە،) جەنـەی گـرت، ئەویـش فەرمـووی: قەصـواء جەنـەی نەگرتـوەو، جەنـە گرتنیـش ڕەوشـتی نیـە، بـەڵام ڕێ لێگـری فیلەکـە ڕێـی لـە حوشـترەکەی مـن گرتـوە (واتـە: ئـەوەی نەیهێشـت

هاوەڵانی فیل بە زۆر بچنە نێو مەککەوەو، کەعبە بڕووخێنن ئەو ڕێی لێگرتوە) بۆیەش دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی دەبێ کە صوڵح و پێکهاتنیان لەگەڵدا بکات بەزۆر نەچێتە نێو کەعبەوە، بەڵکو لە ساڵی داهاتوودا بە ئاشتەوایی لەسەر بناغەی پێکهاتنی صوڵحی، حودەیبییە بچنە نێو مەککەوە .

## سەرنجی پێنجەم:

لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ پێش ئەوەی کۆچ بکات و دوای کۆچکردنی، کۆمەڵێك ماون، کە ڕووداوی فیل، هاوەڵانی فیل و کۆمەڵە باڵندەکانیان بینیون، واتە: گوتوویانە: ئێمە لەو کاتەدا بووین، لەوانە (**حكيم بن حِزام، وحاطب بن عبدالعُزَّى، ونوفل بن معاوية**) ئەم سێ کەسە هەر کامێکیان تەمەنی سەدو بیست (١٢٠) ساڵ بووە، شەست ساڵی لە سەردەمی نەفامییدا ژیاون و، شەست ساڵیش لە ئیسلامدا، واتە زۆر باش بەسەرهاتی هاوەڵانی فیلیان لەبیر بووە[١].

هەڵبەتە ئەو سێیانەش وەك نموونە باسکراون و کەسی ناسراو بوون، ئەگەرنا بە دڵنیایی ڕووداوی فیل چل (٤٠) ساڵ لە سەرەتای لە دایك بوونی پێغەمبەرەوە ﷺ، واتە: پێغەمبەری خوا تەمەنی چل ساڵ بووەو، چل ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ڕووداوی فیلدا، کەواتە زۆر باشیان لەبیر بووە، نەك هەر ئەو سێیە، بەڵکو خەڵکێکی دیکەش هەر بوون .

## سەرنجی شەشەم:

هەڵوێستە باوەکەی شێخ (**محمد عبده**) لە تەفسیری ﴿ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ﴾دا، کە بە میکرۆب تەفسیری کردوەو ئەمە بێژەکەیەتی: (**وَفِي اليَوْم الثَّانِي فَشَى فِي جُنْد الحَبَشِيِّ دَاءُ الجُدْرِي وَالحَصْبَة**[٢])، لە ڕۆژی دووەمدا لە نێو سەربازەکانی

---

(١) محاسن التأويل للقاسمي: ج١٠، ص٢٦٢.

(٢) حَصْبَة: تایەکی قورسی درمە.

حەبەشـەییەکەدا، (واتـە: ئەبرەهـەدا) نەخۆشـیی (جُـدْري)، ئاوڵـە، (خروێلکـە) واتـای قـورس بڵاوبوونـەوە. **(الجُـدْرِيُّ: قُـرُوحٌ إِذَا كَـثُرَتْ أَهْلَكَـتْ، وَإِذَا أَصَابَـتْ الجِلْـدَ بَقِـيَ أَثَرُهَاحَفِـيْراً، وَتُصِيـبُ العَـيْنَ فَيَعْمَـى الْمُصَـابُ)**، **(جُـدْري)**: جـۆرە برینێکـە، جـۆرە کـوان و زڕنووقێکـە لـە جەسـتەدا پەیدادەبێ، ئەگـەر زۆربـن مرۆڤەکـە دەکوژن و تووشـی پێسـت دەبێ و شـوێنەکەی بـە قووڵیـی دەمێنێتـەوە، (کاتـی خـۆی ئـەو نەخۆشـییە هەبـووە خەڵکێـك هەیـە دەم و چاوی قـووڵ بـووە)، ئەگـەر تووشـی چاویـش ببێ چاوەکـە کوێـر دەکات.

ئـەم هەڵوێسـتەی شـێخ **(محمـد عبـده)** ڕەحمەتـی خـوای لێبێ، زۆر پێچەوانـەی هـەم واقیعـی مێژووییـەو، هەم پێچەوانـەی مانا ڕوون و ڕواڵەتییەکەی ئایەتەکانیشـە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ ﴾، **(طَيْر)** هەمووما‌ن دەزانیـن، یـانی: باڵنـدەکان، **(أَبَابِيْـل)** واتـە: کۆمـەڵ کۆمـەڵ: ﴿ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ ﴾، بـەردی پێـدادەدان بـەردەکان لـە قـوڕی وشـك بـووەوەی بەبـەرد بووبـوون، واتـە: قوڕینـە بـەرد بـوون، ئایـا ئـەوە لەکـوێ و ئـەوە لەکـوێ، کـە نەخۆشـیی ئاوڵـەو خروێلکـەو تایـان لەنێـودا بڵاوبۆتـەوە، کـە هۆکارەکـەی میکـڕۆب و ڤایرۆسـێکە کـەس نایبینـێ!

هەڵبەتـە شـێخ **(محمـد عبـده)** ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ، هەندێـك هەڵـەی دیکەشـی هـەن لـە تەفسـیرەکەیدا، ئەویـش زیاتـر لەژێـر کاریگەریـی ئـەوەدا بـووە، کـە هەرچۆنێکـی بـێ مانـای ئایەتـەکان بگونجێنـێ لەگـەڵ عەقڵـی سـەردەمدا، یـان لەگـەڵ کەسـانێکدا کـە ئـەو مەبەسـتی بـووە ڕازی بـن و ڕەخنـە لـە ئیسـلام نەگـرن! بـەڵام گومانـی تێـدا نیـە ئێمـە دەبـێ ئاینیـی خـوای پـەروەردگارو، کتێبـی خـوا، چۆنـە، ئـاوای بخەینـەڕوو بـە پێـی زمانـی عەرەبیـی و بنچینەکانـی زمانـی عەرەبیـی، بـە پێـی تێگەیشـتنی ڕاسـت و دروسـت و، بـە پێـی فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر لـەو بـارەوە هەبـن، هەروەهـا بەپێـی گێـڕدراوە مێژووییـەکان، دەبـێ ئـاوا ئایەتـەکان تەفسـیر بکەیـن، ئنجـا کـێ بـڕوای پێدێنـی بـا بـڕوا بێنـێ و کـێ بـڕوا

ناهێنێ، با بڕوا نەهێنێ، نابێ ئایەتەکان مل پێ خوار بکەین و، لەگەڵ ئارەزوو زەوق و میزاجی کەسانێکدا بیانگونجێنین، لە حاڵێکدا کە پێچەوانەی تێگەیشتنی ڕاستە لە ئایەتەکان و، پێچەوانەی واقیعی مێژوویی و پێچەوانەی بنەمایەکانی زمانی عەرەبییشە.

## سەرنجی حەوتەم:

لە بارەی ئەوەوە کە ئایا ئەو بەردانەی باڵندەکان بە سوپایەکەی ئەبرەهەیان داداون، چۆن بوون؟ ئایا کەس بینیونی و ماون؟ لەو بارەوە دوو دەق دێنین:

**١-** (رَوى أَبُو نُعَيْمٍ عَنْ نَوْفَلِ بْنِ أَبِي مُعاوِيَةَ الدَّيْلَمِيِّ قالَ: **رَأَيْتُ الحَصى الَّتِي رُمِيَ بِها أَصْحابُ الفِيلِ، حَصًى مِثْلَ الحِمَّصِ حُمْرًا بِحُتْمَةٍ (أَيْ: سَوْداءَ) كَأَنَّها جَزْعُ**[1] **ظَفارٍ**)، واتە: (**أَبُو نُعَيْمٍ عَنْ نَوْفَلِ بْنِ أَبِي مُعاوِيَةَ**) گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: ئەو بەردانەی بە سوپای ئەبرەهەدا دراون (بە هاوەڵانی فیلەکەدا دراون) بینیومن، وەك نۆك بوون، بەڵام سوور بوون، هێڵێکی ڕەشیان تێدا بوو وەك: بەردی **ظیفار** بوون.

کاتی خۆی، جۆرە بەردو ملوانکەیەکیان لەوێوە هێناوە، ڕەنگەکەی ئاوا بووە .

**٢)-** (عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: **أَنَّهُ رَأَى مِن هَذِهِ الحِجَارَةِ عِنْدَ أُمِّ هانِئٍ، نَحْوَ قَفِيزٍ مُخَطَّطَةٍ بِحُمْرَةٍ مثل الجَزْعِ الظِّفارِيِّ**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لەخۆی و بابی ڕازیبێ)، دەڵێ لەو بەردانە لە لای (**أُمِّ هانِئٍ**) (خوشکی عەلی کوڕی ئەبی طاڵیب، واتە: کچی ئەبی تاڵیب، بە ئەندازەی ڕبەیەك لەو بەردانەی بینیون، خەت و خاڵی سووری تێدابوون، وێنەی بەردی **ظیفاري** (کە جۆرە ڕەنگێکی هەبووە، سوور بووەو خاڵی ڕەشی تێدا بووەن) ئەمەش (**إبن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2] هێناویەتی.

---

(١) جَزْع: نوع من العقيق فيه خطوط متوازية مستديرة.... المعجم الوسيط.ص١٢١.

(٢) التحرير والتنوير: ج١٢، ص٣٠، ج٣٠، ص٥٥١.

## سەرنجی هەشتەم:

ئـەم دەقـە دێنیـن لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە: (عَـنِ ابْـنِ عَبّـاسٍ رضي اللـه عنهـما، قـالَ: لَـمَّا أَرْسَـلَ اللَّـهُ الحِجـارَةَ عَـلَى أَصْحـابِ الفِيـلِ، لَـمْ يَقَـعْ حَجَـرٌ عَـلى أحَـدٍ مِنهـم إلّا نَفِـطَ جِلْـدُهُ وَثَـارَ بِـهِ الجُـدْرِيُّ، وهـو قَـوْلُ سَـعِيدِ بْـنِ جُبَـيْرٍ) (أخرجـه عبدالـرزاق وعبـد بـن حميـد وابـن المنـذر وأبـو النعيـم في الدلائـل وغيرهـم).

عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لەخـۆی و بابـی ڕازیبـێ)، لـەو سـەرچاوەیەوە کـە هێنامـان گوتوویەتـی: کاتێـك خـوا ئـەو بـەردەی نـاردە سـەر هاوەڵانـی فیلکـە، هیـچ کەسـێك یەکێـك لـەو بەردانـەی پـێ نەدەکـەوت، مەگـەر یەکسـەر هەڵدەتۆقـی (پێسـتەکەی ئـەو شـوێنەی بـەری دەکـەوت هەڵدەتۆقـی، ئەسـتوور دەبـوو و هەڵدەئاوسـا) دوایـی نەخۆشـیی جودریـی (ئاوڵـەو خروێلکـەی) لـێ پەیـدا دەبـوو.

کەواتـە: ئەمـە قسـەکەی شـێخ (محمـد عبـده)ش دەگرێتـەوە نێـو خـۆی، باڵنـدەکان بـوون بەردەکانیـان وەشـاندوون، بـەڵام لـە ئەنجامـی ئـەو بەردانـەدا، هـەر کەسـێك ئـەو بـەردەی پێکەوتـوە، ئـەو نەخۆشـییەی توشـبووە، کـە دەگونجـێ بەهـۆی شـوێنەواری بەردەکانـەوە، نەخۆشـییەکە بڵاوبووبێتـەوە، نـەك باڵنـدەکان بـە میکـرۆب لێکبدرێنـەوە، ئـەو هەمـوو بـەرد هاویشـتن و، ئـەو هەمـوو کۆمەڵـە باڵندانـەی هاتـوون بـە پۆلـە ڤایـرۆس و میکـرۆب، لێکبدرێنـەوە!

## سەرنجی نۆیەم و کۆتایی:

(فخرالديـن الـرازي) ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، دەڵـێ: (وَاعْلَـمْ أنَّ قِصَّـةَ الفِيـلِ واقِعَـةٌ عَـلى المُلْحِديـنَ جِـدًّا، لِأنَّهـم ذَكَـرُوا في الـزَّلازِلِ والرِّيـاحِ والصَّواعِـقِ وَسَـائِرِ الأشْـياءِ الَّتِـي عَـذَّبَ اللَّـهُ تَعـالى بِهـا الأُمَـمَ أعْـذارًا ضَعِيفَـةً، أمّـا هَـذِهِ الواقِعَـةُ، فَـلاَ تَجْـرِي فِيهـا تِلْـكَ الأَعْـذارُ)[1] .

---

(١) مفاتيح الغيب: ج٣٢، ص٩٩.

واتــە: بزانــە کــە بەســەرهاتی فیــل، زۆر چــاك دەمکوتــی مولحیــدەکان دەکات، چونکــە لــە بــارەی بوومەلــەرزەکان و بایــەکان و هــەورە تریشــقەکانەوەو، شــتەکانی دیکــەش کــە خــوا گەلــە پێشــووەکانی پــێ ســزا داون و لەبەیــن بــردوون، هەنــدێ بیانــووی بێهێزیــان هێناونــەوە (کــە لــەو کاتەدا بــا هەڵیکــردوە، هەورە تریشــقەیەکەو لــە ئاســمانەوە هاتــوە، بوومەلەرزەیــەك بــووەو هاتــوە، ئــەو شــتانەیان هێناونــەوە بــۆ ئەوانــە)، بــەڵام ئــەو ڕووداوە، ئــەو جــۆرە پــۆزش و بیانووانــە تێیــدا جێگیــر نابــن و هیــچ مانایــان نیــە.

بێگومــان قسەکەشــی جوانــەو هــەر بــۆ خۆشــی دەڵــێ: بــۆ شــتەکانی دیکــەش بیانــوو و پاســاوی بێهزیــان هێناونــەوە، ئەگەرنــا لــە ڕاســتییدا بیانــووەکان هیــچ نیــن بــۆ وێنــە: خــوای پــەروەردگار گەلــی (عــاد)ی بــە بایــەك لەبەیــن بــردوە، وەك لــەو ئایەتــە موبارەکــەدا، دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ١٩ ﴾ **القمر**، واتــە: ئێمــە بایــەکی زۆر ســاردی بەهێزمــان نــاردە ســەریان لــە ڕۆژێــکی نەگبەتی بــەردەوام دا، ئینجــا ئــەو بایــە زۆر ســاردەش حــەوت شــەو و هەشــت ڕۆژان (**ســبع ليــال وثمانيــة أيــام**) لەســەریان بــەردەوام بــووەو، چاڵیــان هەڵقەنــدوون چوونــە نێــو چاڵان، گوتــراوە: کەســێك ســەری بــەرز کردبێتــەوە بزانــێ داخــۆ بایەکــە هــەر مــاوە یــان نــا؟ چەنــدەی بــەر بایەکــە کەوتبــێ، لیــێ کردۆتــەوە! وەك مێــژوو نووســان دەڵێــن، گرنــگ ئەوەیــە دوایــی وەك کەلەشــە دارخورمــا، دارخورمــا کــە هەڵدەقەندرێــت و دەکــەوێ، ئــاوا کەوتبوونــە گــۆڕێ: ﴿ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ٢٠ ﴾ **القمــر**.

ئنجــا ئــەو بەڵایــە هــەر لەوێش بــووە، ئەگەرنــا ئەگــەر دنیــا گیربووایــەو ناوچەکانی دیکەشــی گرتبانــەوە، دەگونجــا ئــەو بــڕو بیانووانــە بهێنرێنــەوە، یــان گەلــی (**لــوط**) کــە خــوا ﷻ ناوچەکەیانــی بــە زەویــدا بردۆتــە خــوار، بــەرزی کردوونــەوەو بــەرد بــاران کــراون، ﴿ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ٥٣ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ٥٤ ﴾ **النجم**، هەروەهــا گەلەکــەی فیرعــەون کــە ڕاوە دووی بەنــوو ئیســڕائیلیان نــاوەو، لــە دەریــای ســووردا نغــرۆ بــوون و خنــکاون.

هەروەها گەلی (**ثمود**) کە بە چیریکەو هاڕژنێکی بێیڕەزا لەبەین چوون و، تۆفانەکەی (**نوح**) ﷺ، کە ئیقلیمگیربووەو لە کتێبە مێژووییەکانیشدا باسی تۆفانەکەی نووح دەکرێ.

بۆیە ئەو بڕو بیانووانە هیچ نین، بەڵام بە نسبەت هاوەڵانی فیلەوە، وەك فەخرەددینی ڕازیی دەڵێ: هیچ بواری ئەو پینەو پەڕۆیانەو، ئەو بیانوو و پاساوانەی تێدانیە، کە پۆل پۆلی باڵندە بێن سوپایەکی شەست هەزار سەربازیی، کە ئەو هەموو ئیمکانیات و هێزەیان پێ بووە، بەرد بارانیان بکەن و کەس نەگاتە کەس و، هەموویان لەبەین بچن، گومانی تێدانیە، ئەوە هیچ پینەو پەڕۆیەك هەڵناگرێ، بەڵکو بە دڵنیایی ئەوە موعجیزەیەکی خوایی بووە، بەڵام وەك پێشتر گوتمان: نەك لەبەر چاوی کاڵی هۆزی قوڕەیش کە ئەوکاتە بتپەرست بوون، بەڵکو هەم بۆ پاراستنی حورمەتی کەعبە، هەم بۆ ئەوەش کە ببێتە زەمینە سازکردنێك بۆ هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ لەو سەر زەمینەدا، کە شوێنێك بێ حورمەت و پێگەیەکی گەورەی هەبێ و هەر کەسێك ڕاستبۆوە، هەڵنەکوتێتە سەر ئەو شوێنە.

لێرەدا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (**الفيل**) دێنیین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کە (١)ی مانگی(**محـرَّم**)ی ساڵی (١٤٤٢) کۆچییە، بەرانبەر (٢٠٢٠/٨/٢٠) زایینیی، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیر کردنی مانای ئایەتە بەپێزەکانی سوورەتی (قریش)وو سەرەتاش پێناسەو نێوەڕۆکەکەی لە حەوت بڕگەدا دەخەینەڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (قریش) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سووڕەتە دوو ناوی بۆ بەکارهاتوون، زیاتر ناوی (**سُورَةُ قرَيش**)و، جاروباریش ناوی (**سُورَةُ لإِيلافِ قرَيش**)، بەڵام زیاتر بە (**سُورَةُ قرَيش**) ناسراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەم سووڕەتەیان بە مەککەیی داناوەو گوتوویانە: لە مەککە دابەزیوەو، لەو بارەوەش ئەم دەقە دێنین:

**(عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، قَالَ: نَزَلَت لإِيلاَفِ قُرَيش بِمَكَّة) (ذكره السيوطي في الدر المنثور: ج٨، ص٦٣٤، ونسبه لابن مردويه، الإستيعاب: ج٣، ص٥٥٩)**، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گوتوویەتی: سووڕەتی (**لإِيلافِ قُرَيش**)، لە مەککە هاتۆتە خوارێ.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە لـە موصحەفـدا ژمارەکـەی سـەدو شـەش (١٠٦)ەو، لـە دابەزینیشـدا بیسـت و نـۆ (٢٩)یـە، پێـش سـووڕەتی **(القارعـة)** و، دوای سـووڕەتی **(التـين)** دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

لـە لای زۆربـەی ژمێـەران - لـە نێویـان دا خەڵـکی مەککـە - ژمـارەی ئایەتـەکانی چـوار و، بـەلای خەڵـکی مەدینەشـەوە پێنـج ئایەتـە، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی چـوار تەبەننیـی کـراوە لـە موصحەفـەکانی لای ئێمـەدا.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە تایبەتـە بـە هـۆزی قوڕەیشـەوەو، خـوا ﷻ تێیـدا چاکـەکانی خـۆی لەسـەر هـۆزی قوڕەیـش بـاس دەکات، کـە لـە برسـیەتیی دەربـازی کـردوون و، لـە ترسـیش هێمنیـی و ئاسایشـیی بـۆ ڕەخسـاندوون، بۆیـە شایسـتەی ئـەوەن پـەروەردگارو خـاوەنی ئـەو ماڵـەو ئـەو کابەیـە بپەرسـتن، کـە ئـەو چاکـە گـەورەو ناوازانـەی لەگەڵیانـدا کـردوون و، بازرگانیـی بـەرەو یەمـەن لـە زسـتانداو، بـەرەو شـام لـە هاوینـدا، بـۆ ڕەخسـاندوون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سووڕەتە:

بـەڕای بەنـدە چـوار تایبەتمەندیـی لـەم سـووڕەتەدا هـەن، لـە سـووڕەتەکانی دیکـە جیـای دەکەنـەوە:

١- باسی هۆزی قوڕەیش و چاكەی خوا بەسەریانەوە، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە، هەروەها ناوی قوڕەیش لە هەموو قوڕئان دا تەنیا یەكجار، ئەویش لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٢- باسی خوو پێوەگرتن و هۆگربوونی هۆزی قوڕەیش بە بازرگانیی و سەفەری زستانەو هاوینە بەرەو یەمەن و شام، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٣- فەرمانكردنی خوا بە هۆزی قوڕەیش بە پەرستنی پەروەردگارو خاوەنی كابەو، ڕەخسێنەری ئەو چاكەو نیعمەتەی بریتیە لە: نەهێشتنی برسیەتیی و گۆڕینی بە تێریی، هەروەها لابردنی ترس و گۆڕینی بە هێمنیی و ئاسایش، لە پەناوسایەی كابەدا.

٤- چەند وشەیەكی تایبەت بەم سووڕەتە:

١- وشەی (إيلاف) كە دوو جاران هاتوە.

٢- وشەی (قُرَيش) كە لە هەموو قوڕئان دا یەك جارو، تەنیا لەم سووڕەتەشدا هاتوە.

٣- وشەی ﴿ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ﴾، سەفەری زستانەو هاوینە، تەنیا لەم سووڕەتەداو یەكجاریش هاتوە.

٤- ڕستەی ﴿ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ﴾، ئنجا با پەروەردگارو خاوەنی ئەمماڵە بپەرستن، ئەویش تەنیا لێرەدا هاتوەو یەك جاریش هاتوە.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

كۆی ئەو چوار ئایەتە بەپێزەی ئەم سووڕەتە موبارەكە، دەكەینە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هـەر چـوار ئایەتەکـەی ئـەم سـووڕەتە پێکـدێ، کـە خـوا ﷻ تێیانـدا بـاسی هـۆزی قوڕەیـش و چاکـەکانی پەروەردگاریـان لەسـەریان و، ئـەرکی سـەر شانیشـیان لـە بەرانبـەر خـوا ﷻو، چاکـەو نیعمەتەکانیـدا، دەکات، پێشـتریش گوتمـان: وشـەی (**قریـش**) تەنیـا لـەم سـووڕەتەدا هاتـوە، هەروەهـا وشـەی (**إیـلاف**) کـە دووجـار دووبـارە بۆتـەوە، تەنیـا لـەم سـووڕەتەدا هاتـوە.

خـوا ﷻ لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا یەکسـەر بـەوە دەسـت پێـدەکات دەفەرمـوێ: بەهـۆی هۆگرتنـی قوڕەشـەوە، هۆگرتنیـان بـە سـەفەر کـردنی زسـتانەو هاوینـە - کـە زۆربـەی مێـژوو نووسـان دەڵێـن: زسـتانان بـۆ یەمـەن دەچـوون و، هاوینانیـش بـۆ شـام دەچوون - با بەهـۆی ئـەوەوە پـەروەردگاری ئـەم ماڵـە بپەرستن، کـە برسیەتیی بـۆ گۆڕیـون بـە خـواردن پێـدان و تێرکـردن و، تـرس و لەرزیـشی بـۆ گۆڕیـون بـە هێمنیـی و ئاسایـیش لـە وڵاتـدا سـەقامگیر کـردن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ ١ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ٢ فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ ٣ ٱلَّذِيٓ أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٖ وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفِۭ ٤﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

(بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، لەبەر (پەیوەست بوون و) هۆگریی قورەیش (١) هۆگرییان بە سەفەری زستانە (بەرەو یەمەن) و هاوینەوە (بەرەو شام بۆ بازرگانیی) (٢) با پەروەردگاری ئەو ماڵە (کابە) بپەرستن (٣) ئەو کەسەی لە برسیەتیی (دەربازی کردوون و) خواردنی پێداون (بەهۆی بازرگانییان بەرەو شام و یەمەنەوە)و، لە ترسیش (قوتاری کردوون و) هێمنیی بۆ ڕەخساندوون (٤)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(لِإِيلَٰفِ ): (الإِلفُ: إِجتِمَاعٌ مَعَ التِئَام)، (إِلف): بریتیە لە کۆبوونەوە لەگەڵ هۆگر بوون دا، (أَلَّفْتُ بَينَهُم)، واتە: پێکمەوە تەبا کردن و پێکمەوە کۆ کردنەوە، پێکمەوە نووساندن، (وَمنهُ الأُلفَةُ، وَيُقَالُ لِلْمَألُوفِ: إِلْفٌ وَأَلِيفٌ) (أُلْفَة)یش هەر لەوەوە هاتوە، واتە: هۆگریی، بە (مَألُوف) دەگوترێ: (إِلفُ وأَلِيف)، کەسێك یان شتێك کە خەڵك هۆگری بووە.

(قُرَيْشٍ ): (القَرْشُ: الكَسْبُ وَالجَمْعُ، وَقُرَيش إِنْ أُرِيدَ بِهِ الحَيُّ صُرِفَ، وَإِنْ أُرِيد بِهِ القَبيلَةُ لَم يُصْرَف)، (قُرَيْش) لە (قَرْش)ەوە هاتوە، (القَرْشُ: الكَسْبُ وَالجَمعُ)، وەدەستهێنان و کۆکردنەوە، وشەی (قُرَيْش)یش بچووککراوەی (قَرش)ە، لەبەر ئەوەی هۆزی قورەیش کاسبیان بازرگانییان دەکرد، ئنجا ئەگەر مەبەست لە (قُرَيْش) گەڕەك بێ، بە گۆڕراو (مُنْصَرِف) دێ و، ئەگەر مەبەست پێی هۆزو قەبیلە بێ، ئەو کاتە بە نەگۆڕاو ( غير مُنصَرِف) دێ.

(**مُنصَرِف**) و (**غَيرَ مُنصَرِف**)یش سەرفکراو و سەرف نەکراو، دوو زاراوەی ڕێزمانی عەڕەبیین، ناوی (**مُنصَرِف**) ئەوەیە کە سێ حاڵەتەکانی ئیعڕابی بەسەردا دێن، لە حاڵەتی ڕەفعدا بە بۆر (**ضمَّة**) یان جێدارەکەی مەڕفووع دەبێ و، لە حاڵەتی (نصب)دا فەتحەی دەچێتە سەر، یان بە دیلی فەتحەو، لە حاڵەتی ژێردار بوونیشدا ژێر (**كَسَرة**)ی دەچێتە سەر، یاخود جێگری ژێر، بەڵام (**غَيرَ مُنصَرِف**) ئەوەیە کە حاڵەتە ئیعڕابییەکانی هەموویانی تێدا دەرناکەون.

(فَلۡيَعۡبُدُوا۟): واتە: با بپەرستن، بەندایەتیی بکەن، (**العبوديَّةُ: إِظْهَارُ التَّذَلُّلِ، وَالعِبَادَةُ أَبْلَغُ مِنْهَا لأَنَّهَا غَايَةُ التَّذَلُّلِ، وَلا يَسْتَحِقُّها إِلاَّ مَن لَهُ غَايَةُ الإِفْضَالِ**)، (**عبُوديَّةُ**) واتە: دەرخستنی زەبوونیی و ملکەچیی، بەڵام (**عبادة**) مانایەکەی بەهێزترە لە (**عبودية**) چونکە عیبادەت واتە: ئەوپەڕی زەبوونیی و ملکەچیی، هیچ کەسیش شایستەی نیە، مەگەر کەسێ خاوەنی ئەوپەڕی چاکە بێ، ئەویش تەنیا خوای بەرزی مەزنە.

(رَبَّ): (**الرَّبُّ: التَّربيةُ، وَهُوَ إِنْشَاءُ الشَّيءِ حالاً بعد حال إِلَى حَدِّ التَّمَامِ، رَبَّهُ وَرَبَّاهُ وَرَبَّبَهُ، فَالرَّبُّ مَصْدَرٌ مُستَعَارٌ لِلفاعلِ، وَلا يُقَالُ: الرَّبُّ مُطلَقاً إِلاَّ للَّهِ تَعَالَى المُتَكَفِّلِ لِمَصلَحَةِ المَوجُودات...**)، وشەی (**رَبّ**) بە مانای پەروەردەکردنە و بەخێوکردنە، ئەویش بریتیە لە پێگەیاندنی شتێك حاڵ لە دوای حاڵ، تاکو دەگاتە حاڵەتی تەواویی، دەگوترێ: (**رَبَّهُ وَرَبَّاهُ وَرَبَّبَهُ**)، هەر سێکیان یانی: پەروەردەی کرد، بە خێوی کرد، پێیگەیاند، ئنجا وشەی (**رَبّ**) چاوگەو خوازراوەتەوە بۆ بکەر (**فاعل**) ئەگەرنا لە ئەصڵدا وشەی (**رَبّ**) چاوگە، واتە: پەروەردەگار، بەخێوکار، ئنجا بە ڕەهایی ناگوترێ پەروەردگارو بەخێوکار، مەگەر بۆ خوای بەرز، کە بەرژەوەندیی تێکڕای دروستکراوەکانی ڕەچاو کردووەو، وەئەستۆ گرتوە.

(هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ): (**البَيْتُ: أَصْلُ البَيْتِ مَأْوَى الإِنْسَانِ بِاللَّيلِ**)، (**بَيت**): ئەو شوێنەیە کە مرۆڤ بە شەوێ تێیدا دەسرەوێ، دەگوترێ: (**بَاتَ أَي: أَقَامَ بِاللَّيل**)، شەوێ مایەوە لەو شوێنەدا، (**وَالبَيتُ: المَسْكَنُ، جَمْعُهُ أَبيات وَبُيوت، وَبيتُ اللهِ وَالبَيتُ**

العَتيقُ «مَكَّة»، كعبة)، (بَيت): بە مانای ماڵ و خانووەو بە (بُيوت)و (أَبيات)یش، کۆ دەکرێتەوە، [بەڵام زیاتر (أَبيات) بۆ دێڕەکانی شیعر بەکاردەهێنرێ، (بُيوت)ی بۆ ئەو ماڵ و خانووانەی خەڵك تێیاندا نیشتەجێ دەبێ] دەگوترێ: (بَيتُ اللهِ) و (وَالبَيتُ العَتيقُ)، هەردووکیان مەبەست پێیان کابەیە، کە لە شاری مەککەیە.

(رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ): واتە: سەفەری زستانەو هاوینە، کە مێژوونووسان دەڵێن: سەفەری زستانەی بازرگانیی قورەیش بەرەو یەمەن بووەو، سەفەری هاوینەشیان بەرەو شام بووە.

(أَطۡعَمَهُم مِّن جُوعٍ): (الطَّعامُ: ما يُؤْكَلُ، وَيُقَالُ مِطْعَام لِكَثِيرِ الإِطْعَام)، (طَعام): ئەوەیە کە دەخورێ، (خۆراکی خواردن)، پیاوێك کە زۆر خۆراك بدات بە خەڵك، پێی دەگوترێ (مِطْعَام).

(وَءَامَنَهُم مِّنۡ خَوۡفٍ): (الأَمْنُ: طُمَأْنِيْنَةُ النَّفْسِ وَزَوَالُ الخَوفِ)، (أَمْن) بریتییە لە ئۆقرەگرتنی دەروون و لاچوونی ترس و بیم.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنی خوێندنی ئەم سوورەتەم بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندەیە، وەك زۆر جاریش گوتوومانە، لە کاتی بێژتنی ئەو ڕستە موبارەکەدا، پێویستە بێژەر (قائل) بەلای کەمەوە، ئەم چوار ماناو مەبەستە لە عەقڵ و دڵی خۆیدا ئامادە بکات:

١- ئەم کارە - کە قورئانخوێندن یان هەر کارێکی دیکەیە - تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەخشەر دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيۡشٍ﴾، بە هۆی هۆگریی قورەیشەوە، (**إيلاف**) بە کوردیی یانی: هۆگریی، پێوە پەیوەستبوون، خو پێووەگرتن، قورەیشیش هۆزێکی ناوداری عەرەب بووە، کە پێغەمبەری خۆشمان ﷺ هەر لەو هۆزەیە، ئەوانیش چەند تیرەیەك بوون، ئنجا لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ هاتوەو، خوا کردوویەتی بە کۆتا پێغەمبەری خۆی ﷺ ئەو کاتە هۆزی قورەیش باڵادەست بوون لە شاری مەککەدا و، ئەوان ئەو دەوڵەتەیان بەڕێوەبردوەو سەرپەرشتی کردوە، خوا دەفەرموێ: بەهۆی هۆگرتنی قورەیشەوە، پەیوەستەکەی دوایی دێ، کە بەهۆی هۆگریی قورەیشەوە بە چییەوە؟

﴿إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ﴾، هۆگرتنیان و ڕاهاتنیان بە سەفەری زستانەو هاوینەوە، زستانان سەفەری بازرگانییان کردوە و، هاوینانیش سەفەری بازرگانیان کردوە، زۆر لە مێژوونووسان دەڵێن: زستانان بەرەو یەمەن دەچوون و، هاوینانیش بەرەو شام دەچوون، ئنجا لەبەر ئەو هۆگرییەی قورەیشەوە (هۆگرییان بە سەفەری بازرگانییەوە)، زستانان بەرەو یەمەن و هاوینان بەرەو شام:

﴿فَلۡيَعۡبُدُواْ رَبَّ هَٰذَا ٱلۡبَيۡتِ﴾، با خاوەن و پەروەردگاری ئەم ماڵە بپەرستن، کە ئاماژەش دەکات بۆ ئەم ماڵە، بە دڵنیایی مەبەست پێی کەعبەیە، کە مزگەوتی حەرامی بە دەورەوە کراوەو، دوایی شاری مەککەش لە دەوری ئەو یەکەمین ماڵەی خوای پەروەردگار دروستکراوە، کە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (إبراهيم)دا بە درێژیی ئەو بابەتەمان باسکردوە: دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (**خليل الله**) ئیبراهیم صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، هاجەری هاوسەری

لەگەڵ ئیسماعیلی کۆرپەی دا کە تازە لە دایك بووە، دەیانبات و بە فەرمانی خوا، لە شیوێکی قاقڕو بێ ئاو و بێ کشتوکاڵ دا: ﴿بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ ﴿٣٧﴾﴾ **إبراهيم**، دایاندەمەزرێنێ، دواییش کە ئیسماعیل گەورە دەبێ، ئیبراهیم دێ لەو شوێنە ئەو ماڵەی خوا (کەعبە) بنیات دەنێ، کە یەکەمین ماڵە لەسەر زەوی دروستکرابێ: ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِّلْعَالَمِينَ ﴿٩٦﴾﴾ **آل عمران**، واتە: بێگومان یەکەمین ماڵێك بۆ خوا لەسەر زەوی داندرابێ، ئەوەیە کە لە بەککەیە یانی لە مەککەیە (هەردووکیان یەکن) پڕ پیت و پێزەو ڕێنماییە بۆ جیهانییان، واتە: ڕێنماییکاریانە بۆ ئەوەی تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەن و تەنیا خوا بپەرستن، واتە: ئەوپەڕی خۆشویستن و، مل بۆ کەچکردن و بە گەورە گرتن و بە بەرزگرتن و پشت پێ بەستن و، سام و هەیبەت لێکردن، هەموو ئەوانەیان تەنیا بۆ خوا ﷻ بێ.

خوا دەفەرموێ: با پەروەردگارو خاوەنی ئەم ماڵە، واتە: کەعبە، بپەرستن، ﴿ٱلَّذِيٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ﴾، ئەوکەسەی لە برسیەتیی دا خواردنی پێداون و، لە ترس دا، هێمنیی پێداون، واتە: برسیەتیی بۆ گۆڕیون بە هەبوونی خواردەمەنیی و تێروپڕیی و، ترس و لەرزی بۆ گۆڕیون بە ئارامیی و ئاساییش، بەهۆی بازرگانیی زستانان بەرەو یەمەن و، هاوینان بەرەو شام، بەهۆی ئەو بازرگانییەوە، حاڵەتی نەداریی و هەژاریی و برسیەتیی بۆ گۆڕیون بە تێرو پڕیی، حاڵەتی ترسەکەشی کە ترسیان لەسەر بووە، چونکە هێزو توانایەکی وایان نەبووە لە چاو ئەو دەوڵەتانەی دەوروبەریان، بگرە لە چاو هەندێك لە هۆزەکانیش، خوا ﷻ ئەو ترس و لەرزو ناهێمنیی و نائاسایشییەشی بۆ گۆڕیون بە تێدا سەقامگیر بوونی هێمنیی و ئاساییش، بەهۆی ئەو ماڵەوە کە خوا ﷻ پاراستوویەتی و بەرگریی لێکردوەو، هەر کەسێك نیازی بەرانبەری خراپ بووبێ، تەمبێی کردوە، وەك لە تەفسیری سوورەتی (**الفيل**)دا، باسمان کرد.

پوختەی مانای ئەو چوار ئایەتە بەپێزە، کە ئەم سووڕەتە موبارەکەیان لێ پێکدێ، ئاوای لێ دێتەوە:

بەهۆی هۆگریی قوڕەیش، هۆگرییان بە سەفەری زستانەو هاوینەوە بۆ بازرگانیی، با پەروەردگاری ئەم ماڵە بپەرستن، کە برسێتیی بۆ گۆڕیون بە تێریی و، ترس و لەرزیشی بۆ گۆڕیون بە هێمنیی و ئاساییش، واتە: ئەگەر لەبەر هیچ شتێك ناپەرستن، با لەبەر ئەو چاکەو نیعمەتانەی بیپەرستن، کە تەنیا لەگەڵ ئەواندا ئەو چاکەو نیعمەتانەی بەو شێوەیە کردوون و هێندە زەق و بەرچاون.

## مەسەلە گرنگەکان

### یەک مەسەلە:

**فەرمانکـردنی خـوا بـە هـۆزی قوڕەیـش، کـە خـاوەن و پـەروەردگاری ئـەو ماڵـە بپەرسـتن، کـە لـە ئەنجامـی بـۆ ڕەخسـێنرانی سـەفەری بازرگانییـان لـە زسـتان و هاوین دا بـۆ یەمـەن و شـام و، هۆگرییـان بـەو سـەفەرانەوە، بژیـوی بـۆ ڕەخسـاندوون و، بەهـۆی کابەشـەوە خسـتوونیە هێمنیـی و ئاساییشـەوە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ ۝١ إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ ۝٢ فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَٰذَا الْبَيْتِ ۝٣ الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ۝٤﴾..

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ﴾، بەهۆی هۆگریی قوڕەیشەوە، ﴿لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**لِإِلَافِ**)، واتە: بە بێ (**ي**)و بە ژێر (**كَسْرَة**)، لێرەدا کە وشەی (**إيلاف**) لامی ژێردارکەر (**لام الجرّ**)ی چۆتە سەرێ و پێشخراوە (**تَقْدِيمُ المَجرُورِ لِلإِهْتِمَامِ بِهِ، إِذْ هُوَ مِنْ أَسْبَابِ أَمْرِهِم بِعِبَادَةِ اللهِ الَّتِي أَعْرَضُوا عَنْهِ، وَالمَجرُورُ مُتَعَلِّقٌ بِفِعلِ لِيَعبُدُوا**)، واتە: کە ناوە ژێردارەکە پێشخراوە بۆ گرنگیی پێدانە، چونکە هۆگریی قوڕەیش لە هۆکارەکانی فەرمانکردنی خوایە پێیان بە پەرستنی ئەو خوا پەروەردگارەی پشتیان تێکردووەو، (**إيلاف**) یش پەیوەست دەبێتەوە بە کرداری: ﴿فَلْيَعْبُدُوا﴾ەوە، کە دوایی دێ.

ئنجـا بـا بزانیـن وشـەی (**إيـلاف**) لەچییـەوە هاتـوە؟ (**الإِيـلَافُ: مَصـدَرٌ ءَآلَـفَ، بِمَعنَـى أَلِـفَ، وَصِيغَـةُ الإِفْعَـالِ لِلمُبَالَغَـةِ، لأَنَّ أَصْلَهَـا أَنْ تَـدُلَّ عَـلَى حُصُـولِ الفِعْـلِ مِـنَ الجَانِبَـينِ، ثُـمَّ شَـاعَ فِي بَعـضِ الأَفعَـالِ مِثـلُ: سَـافَرَ، عَافَـاه اللـهَ، قَاتَلَهُـمُ اللـه**)، واتـە: وشـەی (**إيـلاف**) چاوگـە لـە (**ءَآلَـفَ**)وە هاتـوە، بـە مانـای (**أَلِـفَ**) واتـە: هۆگـری بـوو، پێـوەی ڕاهـات،

ڕێژگـەی (**إِفعـال**) بـۆ زێدەڕۆییـە، چونكـە لـە ئەصڵـدا ڕێژگـەی (**إِفعـال**) دەلالـەت دەكات لەسـەر پەیدابـوونی كردەوەیـەك لـە دوو لایەنـەوە، (**قَاتَلُـوا**) واتـە: یەكدییـان كوشـت، (**حَـاوَرُوا**) واتـە: یەكدییـان دوانـد، دوایـی بـۆ هەندێـك لـە كـردەوەكان بەكارهێـنراوە، كـە لـە یـەك لاوە ئەنجـام دەدرێـن، نـەك لـە دوو لاوە، وەك (**سـافَرَ**) سـەفەری كـرد، هەرچەنـدە لەسـەر كێـشی (**إِفعـال**)ە، (**سَـافَرَ، يُسـافِرُ، مُسـافَرَةً، فَهُـوَ مُسـافِرٌ**)، بـەڵام بـۆ یـەك لایـە، هەروەهـا (**عَافَـاهُ اللـه**)، هەچەنـدە لەسـەر كێـشی (**مُفاعَلَة**)یـە، بـەڵام بـۆ یـەك لایـە، واتـە: خـوا سـەلامەتی كـردو چـاكی كـردەوە، (**قاتَلَهُـمُ اللـه**) خـوا لـە بەینـی بـردن، یـان لـە بەینیـان بـەرێ.

٢)- ﴿ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ﴾، هۆگرتنیان بە سەفەری زستانەو هاوینەوە، پێشێ خوا دەفەرموێ: بەهۆی هۆگریی قوڕەیشەوە، بەڵام ئایا هۆگرییان بە چییەوە؟ ﴿ إِۦلَٰفِهِمۡ رِحۡلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيۡفِ ﴾، هۆگرییان بە سەفەری زستانەو هاوینەوە، هەر كام لە زستان و هاوین، دوو كەشی بەرانبەر یەكدین لە چوار كەشەكانی ساڵی خۆریی، كە بریتین لە: زستان دوایی بەهار، ئنجا هاوین ئنجا پاییز، زستان و هاوین دەكەونە بەرانبەر یەكدی، زستان چەندە ساردە، هاوین هێندە گەرمە، هەروەك پاییزو بەهاریش دەكەونە بەرانبەر یەكدی، كە دوو كەشی لە ڕووی ئاو و هەواوە، میانجیین، بەڵام هەر كامیان بە جۆرێك.

﴿ رِحۡلَةَ ﴾، (**الرِّحْلَةُ: إِسمٌ لِلإِرتِحال، وَهُوَ المَسِيرُ مِن مَكانٍ إِلَى آخَرَ بَعِيد، وَلِذَلِكَ سُمِّيَ البَعِيرُ الذي يُسافَرُ عَلَيهِ: الرَّاحِلَة**)، ﴿ رِحۡلَةَ ﴾، ناوە بۆ كۆچكردن و گواستنەوە، كە بریتیە لە گواستنەوە ڕۆیشتن لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی دوور، هەر بۆیەش ئەو حوشترەی سەفەری لەسەر دەكرێ، پێی گوتراوە: (**رَاحِلَة**)، لەبەر ئەوەی سەفەری لەسەر دەكرێ و بەهۆیەوە سەفەر دەكرێ.

وشـەی (**إِیـلاف**)، لـە هـەردوو شـوێنەكەدا هـەم بـە (**ي**) هاتـوە: (**إِیـلاف**) هـەم بـە ژێـر (**كَسْرَة**)یـش هاتـوە: (**إِلاف**) مێژوونووسـان هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەكدەنگـن،

وەك پێشتریش باسمان كرد، كە هۆزی قورەیش زستانان بەرەو یەمەن دەچوون و، هاوینان بەرەو شام دەچوون، بۆ بازرگانییكردن و كڕین و فرۆشتن، خوا دەفەرموێ: بەهۆی هۆگریی قورەیشەوە، هۆگرییان بە سەفەری زستانە بەرەو یەمەن و، هاوینە بەرەو شام، چی بكەن؟

٣)- ﴿ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴾، با پەروەردگاری ئەمماڵە (كە كابەیە) بپەرستن، بەندایەتیی بۆ بكەن.

٤)- ﴿ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴾، ئەو زاتەی لە برسیەتییدا خواردنی پێداون و، لە ترسدا هێمنیی كردوون و ئاساییشی بۆ ڕەخساندوون.

لە بارەی وشەی ﴿ مِّن ﴾ەوە، لە هەردووكیاندا: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴾، ڕوونكەرەوانی قورئان دوو ڕایان لە بارەیەوە هەن:

أ- هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: **(من)** **(لهُ مَعنَى مِن البَدَلِيَّةِ، أَي: أَطْعَمَهُم بَدَلاً مِنَ الجُوعِ، وَآمَنَهُمْ بَدَلاً مِنَ الخَوْف)**، ﴿ مِّن ﴾، لێرەدا مانای جێدار بوون دەگەیەنێ، واتە: خوا لە جیاتی برسیەتیی خواردنی پێداون و، لە جیاتی ترس، هێمنیی و ئاساییشی بۆ ڕەخساندوون، بەشێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبیی كە قورئانیان ڕوونكردۆتەوە، ئاوایان گوتوە.

ب- هەندێكی دیكەیان بۆ وێنە: **(مُحي الدِّين درويش)** لە تەفسیرەكەی **(إعراب القرآن)** دا[1]، گوتوویەتی: **(مِن: تَعلِيلِيَّةٌ أَي: أَنْعَمَ عَلَيهِم، وَأَطْعَمَهُم بِإِزَالَةِ الجُوعِ وَالخَوْفِ)**، واتە: **(مِن)** لێرەدا بۆ هۆكار دۆزییە، یانی: خوا چاكەی لەگەڵ كردوون بەوەی تێری كردوون، بە لابردنی برسیەتیی و، هێمنیی و ئاساییشی بۆ ڕەخساندوون، بە لابردنی ترس و بیم و لەرز.

دەڵێم: بەدڵنیایی هەردووكیان لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، ڕێیان تێدەچێ.

---

(١) بەرگی (١٠) لاپەڕە (٥٩١).

## پێنج سەرنج لەبارەی ئەم سووڕەتە موبارەکەوە

### سەرنجی یەکەم:

وشەی قوڕەیش دوو ڕای لە بارەوە هەن:

ڕای یەکەم: زانایان هەندێکیان دەڵێن: (**قُرَيْشٌ: لَقَبُ الْجَدِّ الَّذِي يَجْمَعُ بُطُونًا كَثِيرَةً، وَهُوَ فِهْرُ بْنُ مَالِكِ بْنِ النَّضْرِ بْنِ كِنَانَةَ، هَذَا قَوْلُ جُمْهُورِ النَّسَّابِينَ، وَمَا فَوْقَ فِهْرٍ فَهُمْ مِنْ كِنَانَةَ، وَلُقِّبَ فِهْرٌ بِلَقَبِ قُرَيْشٍ بِصِيغَةِ التَّصْغِيرِ، وَهُوَ عَلَى الصَّحِيحِ تَصْغِيرُ قَرْشٍ (بِفَتْحِ الْقَافِ وَسُكُونِ الرَّاءِ وَشِينٍ مُعْجَمَةٍ) اسْمُ نَوْعٍ مِنَ الْحُوتِ قَوِيٌّ يَعْدُو عَلَى الْحِيتَانِ وَعَلَى السُّفُنِ**)، (**التحرير والتنوير: ج١٥، ص٥٥٦**).

واتە: قوڕەیش نازناوی ئەو باپیرە گەورەیە کە زۆر تیران کۆ دەکاتەوە، ئەویش بریتیە لە: فیهری کوڕی مالیکی کوڕی نە **ضری** کوڕی کینانە، ئەمە قسەی زۆربەی ڕەچەڵەکناسانە، هەرچی لەسەرووی فیهرەوەیە هەموویان لە کینانەن، فیهریش بۆیە نازناوی (قوڕەیش)ی بۆ دانراوە بەشێوەی گچکە کردنەوە، کە ڕای ڕاست ئەوەیە گچکە کردنەوەی قەڕشە، قەڕشیش جۆرێکە لە ماسیی (یان لە نەهەنگ) زۆر بەهێزەو هێرش دەکاتە سەر ماسییەکانی دیکەو، دەیانخوات، هەروەها هێرش دەکاتە سەر بەلەم و کەشتییەکانیش.

ڕای دووەم: خاوەنی (**المُعجَمُ الوَسِيط**)[1] دەڵێ: (**قُرَيش: قَبِيلَةٌ عَرَبِيَّةٌ مِن مُضَر، سَكَنَت فِي مَكَّة قامَت عَلَى الحج، وَمِنها رَسُولُ اللهِ ﷺ مُحَمَّدٌ وَالنِّسبَةُ إِلَيها قُرَشِي وَقُرَيشِي، وَالقِرشُ جِنسٌ مِنَ الأَسماكِ الغُضرُوفِيَّةِ كَبِيرٌ يُخشَى شَرُّهُ**)، واتە: قوڕەیش هۆزێکی عەرەبییە لە موزەڕ، لە مەککە نیشتەجێ بوون و کاروباری حەجییان بەڕێوە بردووەو، پێغەمبەری خواش موحەممەد ﷺ لە قوڕەیشەو، بۆ پاڵدان بۆ

---

(١) ص ٧٣٦.

لای هۆزی قورەیش دەگوترێ: (**قُرَشِي**) و (**قُرَيشِي**)، (**قِرش**)یش جۆرێکە لە ماسییان، کرۆژ کرۆژەییە، زۆر گەورەیەو، جێگەی مەترسییە.

خاوەنی (**المُعجَمُ الوَسِيط**) ڕوونی نەکردۆتەوە ئایا قورەیش لە چییەوە هاتوە؟ بەڵام ئاماژەیەك دەکات و ئەو دەڵی: (**قِرْش**)و ناڵێ: (**قَرْش**)، وادیارە ئەو ژیاندارە، هەم قەرشی بۆ بەکاردەهێنرێ، هەم قیرش.

خاوەنی (**مُختارُ الصِّحاح**)[1]، دەڵی: (**القَرشُ: الكَسبُ وَالجَمعُ، وَبابُهُ ضَرَبَ، بِهِ سُمِّيَت بِهِ قريش وَهُوَ قَبِيلَةٌ**)، (قرش) بریتییە: لە وەدەستهێنان و کۆکردنەوە، لەسەر کێشی (**ضَرَبَ**)یە، (**قَرَشَ يَقرِشُ قَرشاً**)، (**ضَرَبَ يَضرِبُ ضَرباً**)، هۆزی قورەیشیش لەوەوە ناونراوە، چونکە خەریکی بازرگانیی و کۆ کردنەوەی ماڵ و سامان بوون.

## سەرنجی دووەم:

(**إبن عاشور**)[2]، دەڵێ: (**قَالَ فِي «الْكَشَّافِ» : دَخَلَتِ الْفَاءُ لِمَا فِي الْكَلَامِ مِنْ مَعْنَى الشَّرْطِ، لِأَنَّ الْمَعْنَى: إِمَّا لَا، فَلْيَعْبُدُوهُ لِإِيلَافِهِمْ، أَيْ إِنَّ نِعَمَ اللَّهِ عَلَيْهِمْ لَا تُحْصَى، فَإِنْ لَمْ يَعْبُدُوهُ لِسَائِرِ نِعَمِهِ، فَلْيَعْبُدُوهُ لِهَذِهِ الْوَاحِدَةِ الَّتِي هِيَ نِعْمَةٌ ظَاهِرَةٌ**)، واتە: زەمەخشەریی خاوەنی تەفسیری کەششاف دەڵێ: کە دەفەرموێ: ﴿ فَلْيَعْبُدُواْ ﴾، ئەو (ف)ە، چۆتە سەری، چونکە قسەکە هەمووی مانای مەرجی تێدایە، مانایەکەی ئاوایە: ئەگەر هەر ناپەرستن (قورەیش خوا ناپەرستن) با بیپەرستن بەهۆی هۆگرییانەوە، واتە: چاکەکانی خوا لەسەریان ناژمێردرێن، ئنجا ئەگەر لەبەر چاکەکانی دیکەی ناپەرستن، با لەبەر ئەو چاکەیە کە چاکەیەکی زۆر ئاشکرایە (وتایبەتە بەخۆیانەوە) بیپەرستن.

---

(١) ص ٥٢٩.

(٢) ج ٣٠ المجلد: ١٢، ص ٥٥٥.

**سەرنجی سێیەم:**

﴿لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ﴾، ئایا (ل) کە (إِیلاف)ی پێ ژێردار کراوەو پیتی ژێردارکەر (حرف جَرّ)ە، بە کوێوە پەیوەستە؟ لەو بارەوە سێ ڕا هەن:

١- یەکێکیان کە ڕای بەهێزترو باشترە، ئەوەیە کە پەیوەستە بە: ﴿فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ﴾، کە مانایەکەی بەو شێوەیە: (لِتَعبُدَ قُرَيش ﴿رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ ﴿٤﴾﴾، ﴿إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ﴾)، با هۆزی قوڕەیش پەروەردگاری ئەم ماڵە بپەرستن کە لە برسیەتییدا تێری کردوون و، لە ترسیشدا هێمنیی و ئاساییشی بۆ ڕەخساندوون، بەهۆی هۆگرییانەوە بەسەفەری هاوینەو زستانەوە.

٢- ڕای دووەم: (الطبري)، دەڵێ: (**وَالصَّوَابُ مِنَ الْقَوْلِ فِي ذَلِكَ عِنْدَنَا أَنْ يُقَالَ: إِنَّ هَذِهِ اللَّامَ بِمَعْنَى التَّعَجُّبِ، وَأَنَّ مَعْنَى الْكَلَامِ: اعْجَبُوا لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ، وَتَرْكِهِمْ عِبَادَةَ رَبِّ هَذَا الْبَيْتِ الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ**)، واتە: ڕای ڕاست لەو بارەوە لە لای ئێمە ئەوەیە کە بگوترێ: ئەم (ل)ە، بە مانای سەرسوڕماندنەو، واتای فەرمایشتەکە ئاوای لێ دێتەوە: سەرتان سوڕ بمێنێ لە هۆگریی قوڕەیش بە سەفەری زستانەو هاوینەوەو، واز هێنانیان لە پەرستنی پەروەردگار و خاوەنی ئەو ماڵە، کە لە برسیەتیی ڕزگاری کردوون و خواردنی پێداون و، ترسیشی بۆ گۆڕیون بە هێمنیی و ئاسایش، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو سەفەر و بازرگانییەی زستانەو هاوینەیان بۆ ڕەخسێنراوە.

٣- ڕای سێیەم: دەڵێن: (**لإيلفِ قُرَيش: مُتَعَلِّقٌ بِ (كعَصفٍ مَأكُول) أَي: صَنَعتُ هَذَا بِهِم، لأُلفَةِ قُرَيشٍ لِئَلاَّ تتفرَّقَ أُلفَتهُم وَجَمَاعَتَهُم**)، ئەمەش مانایەکی دیکەیە کە سەرەتای ئەم سووڕەتە پەیوەستە بە کۆتایی سووڕەتی (الفيل)ەوە، واتە: بۆیە ئەمەم پێکردن بە خاوەنانی فیلەکە، لەبەر هۆگریی قوڕەیش تاکو ئەو هۆگرییەی پەیدایان کردوە بە سەفەری بازرگانیی زستانەو هاوینەوە، بەرەو یەمەن و شام، لێیان تێك نەچێ.

## سەرنجی چوارەم:

پێویستە بزانرێ کە خوا ﷻ ئەو دوو نیعمەتەی بۆ هۆزی قورەیش ڕەخساندوون، ئەوە گیرابوونی پاڕانەوەی ئیبراهیمە، ئیبراهیم (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە سووڕەتی (البقرة) ئایەتی (١٢٦)دا، خوا لێی گێڕاوەتەوە، کە فەرموویەتی: ﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ...﴿١٢٦﴾ ﴾البقرة، یادبکەوە کە ئیبراهیم گوتی: پەروەردگارم! ئەم وڵاتە پڕ هێمنیی و ئاساییش بکەو دانیشتووەکانیشی بژیو بدە، لەهەموو مێوە و بەرووبوومەکان ئەوانەی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێناوە.

هەروەها لە سووڕەتی (ئیبراهیم) ئایەتەکانی (٣٥ و٣٦ و٣٧)دا، خوا لێی دەگێڕێتەوە دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ ۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّى ۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾إبراهيم.

ئیبراهیم (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە خوا پاڕاوەتەوە کە ئەو وڵاتە هێمنیی و ئاساییشی تێدا سەقامگیر بکات، هەروەها لە بەروبووم و میوەکان و بەرهەمەکان بە دانیشتووەکانی ببەخشێ.

## سەرنجی پێنجەم و کۆتایی:

ئایا هۆزی قورەیش ئەو سەفەری زستانە بەرەو یەمەن بۆ بازرگانیی و، هاوینان بەرەو شام، دیسان بۆ بازرگانیی، چۆن بۆیان ڕەخساوە؟ لەو بارەوە مێژوونووسان زۆر شتیان گوتوە، بەڵام ئەوەی لە هەمووان زیاتر بە عەقڵ و دڵەوە دەنووسێ، دوو ڕان:

ڕای یەكـەم: ئەوەیـە: كەسـێك كـە ئەو دوو سـەفەرەی بۆ هۆزی قوڕەیش ڕەخسـاندن، هاشـیمی كـوڕی عەبدولمەنـاف بـوو، ئەویـش بەهـۆی ئـەوەوە بـوو كـە لەنێـو هـۆزی قوڕەیشـدا عادەتێـك هەبـوو، بـە عەڕەبیـی پێـی دەگوتـرێ: (إعتِفـار)، ئەویـش ئەوەبـوو كەسێك ئەگـەر مـاڵ و منداڵەكـەی برسـیی ببووایـەو نەیتوانیبایـە بیانژیەنـێ، دەچـووە چۆڵاییـەك و چادرێـكی هەڵـدەدا، چادرەكـەی بەسـەردا دەدان، هەتـا هەموویـان لەوێـدا لـە برسـان دەمـردن، عیـززەتی نەفسـیان هەبـووەو سـواڵیان نەكـردوە.

ئنجـا یەكێـك كـە لـە بەنوو ئەسـەد بـووەو، لەگـەڵ بەنوو مەخـزووم پێكـەوە بوون، دەبیسـتێ ڕەفیقەكـەی چـووە بـۆ دەشـتێك و مـاڵ و منداڵەكـەی لـەوێ كۆكردۆتـەوە تاكـو لـە برسـان بمـرن، هیچیـان نەبـووە بیخـۆن، ئەویـش (هاشـیم) دەڵـێ: چـۆن دەبـێ لـە نێـو ئێمـەدا كەسـانێك هەبـن لـە برسـان بمـرن؟ ئیـدی دێنـێ ئـەو سـەفەری زسـتانە بـەرەو یەمـەن و هاوینـە بـەرەو شـام، بـۆ بازرگانیـی دەڕەخسـێنێ و، دوایـی هـەر دەوڵەمەندێـك و هەژارێـك پێكـەوە، دادەنـێ و، هەژارەكـەش لـە مـاڵ و سـامانی دەوڵەمەنەكـەداو لـە بازرگانییەكەیـدا بەشـدار دەكات، تاكـو وەك یـەك هەموویـان دەوڵەمەندبـن و كەسـیان لـە برسـان نەمـرێ.

ڕای دووەم: دەڵـێ: ئەوانـەی ئـەو هۆگریـی بازرگانییەیـان دروسـتكردوە، چـوار بـرا بـوون و هەموویـان لـە بەنـوو عەبدولمەنافـن:

أ- هاشیم لەگەڵ پادشای شامدا ڕێككەوتوە، كە بازرگانیی بكات.

ب- عەبدو شەمس لەگەڵ حەبەشەدا ڕێككەوتوە، كە بازرگانیی لەگەڵدا بكات.

ج- موتتەلیب لەگەڵ حوكمڕانی یەمەندا.

د- نەوفەلیش لەگەڵ حوكمڕانی فارسدا.

هەردوو ڕایەكەش ڕێیان تێدەچێ، دەشگونجێ هەردووكیان لە یەك كاتدا بووبن.

ئەمە كورتەی ماناو مەبەستەكانی چوار ئایەتە بەپێزەكەی سووڕەتی (القریش)، بوو.

## کورتە باسێک لە بارەی خواپەرستییەوە[١]

بەڕێـــزان!

لەبەرتیشـکی فەرمایشـتی خـوا ﴿ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ ... ﴾ دا، لـە بیسـت (٢٠) بڕگـەدا، بـاسی خـوا پەرسـتیی و تەنیا پەرسـتراوێتی خـوا ﷻ دەکەیـن، بەمجـۆرەی خواری:

**بڕگەی یەکەم: بە یەکگرتنی خوا لە پەرستراوێتییدا، بریتیە لە چەقی قورسایی دینداریی و، ئەو سوڕگەیەی هەموو ئایین بە دەوریدا دەسووڕێ و، کتێبی ڕۆشنی خوا مەزنترین بایەخی پێداوە:**

لـەو بـارەوەش کـە خـوا بـە یەکگرتـن لـە لـە پەرسـتراوێتییدا، **(توحيـد اللـه في أُلُوهِيَّـة)** بریتیـە لـە چەقـی قورسـایی ئاییـن و ئـەو کاکڵەیـە کـە ئاییـن هەمـووی لـە دەوری دەسـووڕێ، ئایـەت زۆر زۆرن، بۆیـەش ئـەم بڕگـەی یەکەمـەو بڕگـەی دووەم، تـا ئەندازەیـەك درێژەیـان پێدەدەیـن، تاكـو زیاتـر ئـەو مەبەسـتەی گوتمان ڕوونـی بکەینەوە:

سـەرەتا ئێمـە حـەوت ئایەتـان دێنیـن، بـۆ خسـتنەڕووی ئـەوە کـە خـوا بەیەکگرتن لـە پەرسـتراوێتییدا، چەقـی قورسـایی ئایینـەو ئـەو کاکڵەیـە کـە هەمـوو شـتەکانی دیکـە لـە دەوری دەسـووڕێن:

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾ ﴾البقرة، واتە: پەرستراوی ئێوە [پەرستراوی بە هەقی ئێوە] تەنیا یەکێکە هیچ هاوبەشی نین، جگەلە هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، ئەو ئەوپەڕی بە بەزەیی بەخشندەیە.

---

(١) ئـەم کورتـە باسـە بـە پوختکراویـی و گوشراویـی لـە: (مَوسُـوعَة: الإسـلام كَـما يَتَجَّـلى فِي كِتـابِ اللـه، الكِتـاب الثالـث، الإِيمـان باللـهِ الخالـقِ، الـرَبِّ، الإلـه ذِي الأَسـماءِ الحُسـنى وَالصِفـاتِ العُـلَى)، لـە چاپـی دووەمـی کـە لـە سـاڵی (٢٠١٧)ی زاینییـدا چـاپ بـووە، وەردەگریـن، لەلاپـەڕە (١٣٤ - ٢٤٢) (الفَصـلُ السَّـابِع: الإِيمـان بِأُلوهِيَـةِ اللـهِ تَعـالَى وَولايتِـهِ وَحَاكِميّتِـهِ).

شـایانی باسـە: لێـرەدا خـوا دەفەمـوێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّاهُوَ﴾، جگـە لـەو هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، بـەڵام لـە زۆر ئایەتانـدا خـوا ﷻ بـاسی پەرسـتراوی دیكـە دەكات و، پەرسـتراوانی بێبڕوایـان و هاوبـەش بـۆ خوادانـەرانی بـە پەرسـتراوەكان (ءَالِهَةً) ناوهێنـاون، بـۆ وێنـە دەفەرمـوێ:

أ- ﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾﴾هود.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾﴾يس.

ئنجـا لێـرەدا پرسـیارێك دروسـت دەبـێ، لەلایەكـەوە خـوا دەفەرمـوێ: جگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، دواییـش پەرسـتراوی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و بێبڕوایـەكان بـە (ءَالِهَةً) كـە كـۆی (إِلَٰهَ)ە، نـاو دەبـات؟

وەڵامـی ئـەو پرسـیارەكەش ئەوەیـە: خـوا ﷻ كاتێـك دەفەرمـوێ: هیچ پەرسـتراوێك نیـە، واتـە: هیـچ پەرسـتراوێكی بـە هـەق نیـە، شایسـتەی پەرسـتران بـێ، جگـە لـە خـوا ﷻ، بـەڵام كاتێـك پەرسـتراوی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و بێبڕوایـەكان بـە (ءَالِهَةً) (پەرسـتراوەكان) نـاو دەبـات، مەبەسـت پێیـان ئـەو پەرسـتراوانەن كـە گومـان و خەیاڵكـراوە پەرسـتراون، واتـە: ئـەو شـتانەی بێبڕوایـەكان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكان بـە نەزانیـی، بـە پەرسـتراویان دانـاون، هەرچەنـدە هیـچ پشـك و بەشـیان لـە پەرسـتراوێتییدا نیـە، كـە یـان دروسـتكراوی وەك خـۆرو مانـگ و دار و بـەردو مانـگاو مرۆڤـن، یاخـود هـەر بریتیـن لـە خەیـاڵ و وەهـم و هیـچ بوونێكیـان لـە دنیـای واقیعـدا نیـە.

٢)- ئایەتی ژمارە (٢٥٥)، كە بە ئایەتی كورسیی ناودارە، خوا لە سەرەتایەكەیەوە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ...﴿٢٥٥﴾﴾البقرة، واتە: خوا بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك

نیە، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتییکارە، ئەم ئایەتە موبارەکە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بە مەزنترین ئایەت لە کتێبی خوادا ئەژماری کردوە، وەك لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە، بە ژمارە: (٢٨١٠).

لەم ئایەتە بەپێزەدا - کە لە دە (١٠) ڕستە پێکهاتوە - خوای پەروەردگار خۆی پێناسە دەکات و، سەرەتاش دەفەرموێ: خوا ﷻ جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتیارە.

٣)- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ ﴾الزخرف، واتە: ئەو (خوا) لە ئاسمان پەرستراو و لەسەر زەویش پەرستراوەو، ئەو کاربەجێی زانایە، واتە: دروستکراوەکان بە سەرو خواریانەوە، تەنیا خوا تێیاندا پەرستراوی بە هەقەو، پەرستراوەکانی دیکە هەموویان پەرستراوی بە ناهەقن و، پشك و بەشیان لە پەرستراندا نیە، پەرسترانێك کە بە شێوەی هەق و ڕاست و بەڵگەدار بێ.

٤)- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجْرًا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكْرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمْ لَوَٰحِدٌ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَرَبُّ ٱلْمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ ﴾الصافات، واتە: سوێند بە (فریشتە) ڕیزبووەکان بەڕیزبوون، ئنجا سوێند بەتیوەخورەکان بەتێخوڕین، ئنجا سوێند بەخوێنەرەوانی زیکر، بەدڵنیایی پەرستراوی ئێوە یەکێکە، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان و، پەروەردگاری خۆرهەڵاتەکانە.

٥)- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَلَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾القصص، خوا لێرەدا بە چوار سیفەتان خۆی دەناسێنێ، دەفەرموێ:

١- ﴿ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، ئەو خوایە جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە (پەرستراوی بە هەق).

٢- ﴿ لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ ﴾، ستاییش بەس بۆ ئەوە لە یەکەم و لە کۆتایی دا، واتە: لە دنیاو لە دوارۆژدا.

٣- ﴿وَلَهُ ٱلْحُكْمُ﴾، بڕیارو حوكمی قەدەریی و شەرعیی تەنیا هی ئەوەو بەس ئەو بڕیار دەدات.

٤- ﴿وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾، تەنیا بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە.

٦)- خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾﴾ص، واتە: بڵێ: من تەنیا ترسێنەرو وریاكەرەوەم، هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە خوای تاكی مل پێ كەچكەر، پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەویی و ئەوەی نێوانیانە، زاڵی لێبوردەیە، كەواتە: پەرستراوی هەق تەنیا یەكێكە، ئەویش پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەویی و ئەوەی نێوانیانە، واتە: سەرپەرشتیارو خاوەن و بەڕێوەبەریانەو، خاوەنی ئەوپەڕی باڵادەستییەو، ئەو پەڕی لێبوردەییە.

٧)- خوا دەفەرموێ: ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴿١٩﴾﴾محمد، خوا پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ و دەفەرموێ: بزانە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، داوای لێبوردنیش لە پەروەردگارت بكە، بۆ گوناهەكەت، هەروەها بۆ پیاوانی بڕوادار و ئافرەتانی بڕوادار، خوا شوێنی هەڵسوكەوت و هاتن و چوونتان و، شوێنی تێدا سەقامگیر بوونیشتان دەزانێ.

**بڕگەی دووەم: بە یەکگرتنی خوا لە پەرستراویێتییدا، واتە: تەنیا خوا ﷻ بە پەرستراو دابنرێ، ئەویش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ بە مانای فراوانیی پەرستن، تەنیا خوا ﷻ بپەرسترێ:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾ الأنبياء، واتە: لە پێش تۆدا (ئەی موحەممەد) هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر سرووشمان بۆ لای کردوە، کە بێجگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، ئنجا تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

کەواتە: تێکڕای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) خوا پەیامی بۆ ناردوون: کە جگە لە خۆی پەرستراوێکی دیکەی ڕاست نیە، بۆیە دەبێ بەندایەتیی تەنیا بۆ ئەو بکرێ.

وشەی ﴿إِلَٰهَ﴾، بە مانای پەرستراو (معبود) دێ، کەواتە: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠﴾، یانی: **(لا معبود إلاّ أنا)**، هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەمن.

ڕیشەی وشەی ﴿إِلَٰهَ﴾: لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: **(أَلَهُ، يَأْلَهُ، إِلَهَةً، يَعنِي: عَبَدَ، يَعبُدُ، عِبادَةً)**[1] واتە: پەرستیی، دەپەرستێ، پەرستن، **(تَأَلُّه)**یش، بە مانای **(تَعَبُّد)**ە.

کەواتە کە دەفەرموێ: لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە جگە لە من هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، مانای وایە تێکڕای پێغەمبەران **(عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)** بە تەنیا پەرستنی خواوە، ڕەوانکراون.

چەمکی وشەی (عِبَادَة) لە زمانی عەرەبییدا: **(العِبَادَةُ: الذُّلُّ والخُضُوع، يُقَالُ: طَرِيقٌ مُعَبَّدٌ لِطَرِيقٍ مُمَهَّدٍ يَسْهُلُ المَشِيُ عَلَيهِ بِسَبَبِ كَثْرَةِ مَشي الأَقْدَامِ عليه بِحَيثُ**

---

(١) المِصباحُ المُنير، ص١٦.

ذَهَبَت نتواءاتُهُ وَمَا يَمنَعُ المَشيَ، وَيُسَبِّبُ تعثرُ الأَقدام، وَكَذَلِكَ تُطْلَقُ كَلِمَة (مُعبَّد) عَلَى البعير الَّذي طُلِيَ بِالقَطِرانِ، فَسَكَنَ وَقَلَّت حَرَكَتُهُ وَيُقالُ: بَعِيرٌ مُعَبَّدٌ أَي مُذَلَّلٌ مُخْضَعٌ)[١].

واتە: عیبادەت بە مانای ملکەچیی و زەبوونیی دێ، دەگوترێ: (طَرِيقٌ مُعَبَّدٌ)، یانی: ڕێیەکی خۆشکراو کە ئاسان بێ لەسەری بڕۆی، بەهۆی ئەوەوە کە خەڵك زۆر لەسەری ڕۆیشتوەو، زۆر پێی پێدادراوە، [کاتێ خۆی یان لاقی وەڵاخ بووە، یان پێی مرۆڤان بووە] بەرزیی و نزمییەکانی ڕۆیشتوون و، هەر شتێك کە ڕێگریی لە ڕۆیشتن بکات، لاچووە، هەروەها هەر شتێك هۆکاری ئەوە بێ پێیەکان هەڵبنگون، لاچووە، ڕێیەك کە تەخت و هەموار کرابێ پێی دەگوترێ: (طَرِيقٌ مُعَبَّدٌ)، هەروەها وشەی (مُعبَّد) بۆ حوشترێکیش بەکاردەهێنرێ کە قەترانی تێ هەڵسوورابێ، لە ئەنجامی ئەوەدا کە نەخۆشیی خرووی گرتوە، و ئارام بووبێت و جووڵەی نەمابێ.

دەگوترێ: (بَعِيرٌ مُعَبَّد): واتە: حوشترێکی مل پێ کەچکراوو داسەکناو بەهۆی ئەوەوە کە قەترانی تێدراوەو خرووی شکاوە جووڵەی نەماوە، ئەمە مانایەکەی لە ئەصڵی زمانی عەرەبییدا.

هەروەها لە قورئانیش دا بەهەمان واتا بەکارهێنراوە، بۆ وێنە:

١- لە ئایەتەکانی: (١٦ - ٢٢)ی سوورەتی (الشعراء)دا، خوا ﷻ کە باسی ناردنی مووساو هاروونی برای دەکات بۆ لای فیرعەون، کاتێك فیرعەون هەندێك منەت لەسەر مووسا دەکات و دەڵێ: لە نێو ئێمەدا بەخێوکراوی، مووسا (عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لە وەڵامیدا دەفەرموێ:

﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾﴾الشعراء، ئەو چاکەیەش کە بەچاوی منی دادەدەیەوە، بەهۆی ئەوەوە بووە کە تۆ بەنوو ئیسرائیلت کردبوو بە عەبدی خۆت، لێرەدا وشەی (عَبَّدْتَ) لە: ﴿عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾دا، بێگومان

---

(١) (المِصباحُ المُنِير، ص٢٠٢).

واتـە: ملـت پێکەچکردبـوون بـە ناچاریـی، کەواتـە: ملکەچکـردنی بـە ناچارییـش پێـی دەگوتـرێ: عەبدایەتیـی، یـان عیبـادەت، یـان (تَعَبُّـد)، بۆچـی؟ چونکـە فیرعـەون بـەزۆر بەنـوو ئیسـڕائیلی مـل پێکـەچ کردبـوون بـۆ دەسـەڵاتی خـۆی.

**٢-** هەروەها لە ئایەتەکانی: (٤٥ و ٤٦ و ٤٧) لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، لەوێشدا خوا ﷻ دووبارە باسی ناردنی مووساو هاڕوون دەکات بۆ لای فیرعەون، دوایی فیرعەون دارو دەستەکەی دەڵێن: ﴿ فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ٤٧ ﴾، واتە: گوتیان: ئایا بڕوابێنین بۆ دوو مرۆڤی وەك خۆمان, كە كۆمەڵ و خەڵكەكەشیان بۆ ئێمە ملكەچن؟ ﴿ وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴾، بەدڵنیایی بەنوو ئیسرائیل نوێژ و ڕۆژوویان بۆ فیرعەون نەکردوە، کەواتە: (**لنا عابدون**) یانی: بۆ ئێمە ملکەچن، مەبەست پێی نوێژو ڕۆژوو ڕکووع و سەجدە نیە، بەڵکو یانی: ژێر دەست و بن دەستی ئێمەن، ملکەچی ئێمەن.

کەواتـە: کتێبـی خـوا ﷻ بـە ڕەهایـی ملکـەچ کـردن و فەرمانبەرییکـردن بـە عیبـادەت نـاو دەبـات، چ بـە هەڵبـژاردنی مـرۆڤ و بـە خۆشـیی خـۆی بـێ، چ بەناچاریـی بەسـەریدا سـەپێنرابێ و، ئـەو کەسـەش کـە ملکەچییەکـەی بـۆ ئەنجام دەدرێ، هـەر کەسـێك بـێ، ئـەوە بـە نسـبەت ئەسـڵی وشـەی (**تَعَبُّـد**)ەوە.

ئێسـتا بـا تەماشـای وشـەی عیبـادەت بکەیـن، کـە ژمارەیـەکی زۆر لـە ئایەتـەکانی قوڕئـان چەمـك و واتـای وشـەی عیبادەتمـان بـۆ دەخەنـە ڕوو، بـۆ وێنـە:

**١-** لە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (**الفاتحة**)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانی مرۆڤەکان دەفەرموێ: ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ﴾، هەر تۆ دەپەرستین و یارمەتییش هەر لە تۆ دەخوازین.

**٢-** لە سوورەتی (**الزمر**) ئایەتی (٦٦)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٦٦ ﴾، بەڵكو تەنیا خوا بپەرستەو لە سوپاسگوزاران بە. لەو دوو ئایەتەش دا، لەوبارەوە سێ ڕاستیی دەستگیر دەبن:

**ڕاستیی یەکەم**: ئەو مرۆڤەی مل بۆ خوا کەچ دەکات و بە ڕواڵەت شوێن بەرنامەکەی دەکەوێ، بێ ئەوەی ملکەچیی و تەسلیم بوونەکەی بۆ خوا لە دڵیەوە هەڵقوڵیبێ، بە پەرستەر (**عابد**) بۆ خوا دانانرێ، بەڵکو ملکەچیی و خواپەرستییە ڕواڵەتیی و بەرچاوەکەی هەر شتێکی ڕووکەشییە، لەبەر ئەوەی ئارەزوومەندیی و هەڵبژاردنی خۆی تێدانیە، بۆیە بۆی بە عیبادەت لە قەڵەم نادرێ.

**ڕاستیی دووەم**: مرۆڤێك کە ناچار دەکرێ ملکەچ بکات و فەرمانبەریی بکات بۆ جگەلە خواو، بۆ ئەوەی جگەلە بەرنامەو ئایینی خوا فەرمانی پێدەکات و هیچ چارەیەکی نیە، ملکەچیی و فەرمانبەرییەکەی بە پەرستنی جگەلە خوا دانانرێ، چونکە هەر بە ڕواڵەت ملکەچە، بە جەستە ملکەچە، بەڵام لە دڵ و دەروونیدا ملکەچ نیەو ڕەغبەت و ویستی خۆی لەگەڵ ئەوەدا نیە کە بەناچاریی دەیکات یان پێی دەکرێ.

**ڕاستیی سێیەم**: هەروەها ئەو دوو ئایەتەو، ئایەتی دیکەش لەو بارەوە زۆرن، ئەوەش دەگەیەنن کە پەرستنی خوای بەرز، دەبێ تەنیا بۆ خوا بێ و جگە لە خوای تێدا بەشدار نەکرابێ، چونکە لە سووڕەتی فاتیحەدا بەرکار پێشخراوە: ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ﴾، بەس تۆ دەپەرستین، ئەمەش کورتهەڵێنان دەگەیەنێ، هەروەها لە سووڕەتی (**الزمر**)یشدا هەروایە: ﴿بَلِ ٱللَّهَ فَٱعۡبُدۡ﴾، لەوێش دیسان بەرکار پێش کاروبکەر (**فعل وفاعل**) خراوە.

کەواتە: خواپەرستیی وەك چۆن دەبێ لە ویستێکی ئازادانەو، لە ئارەزوومەندییەکی ڕاستگۆیانەوە بێ، بە هەمان شێوە دەبێ تایبەتیش بێ بە خواوەو، بەشی جگە لە خوای تێدا نەبێ.

٣- هەروەها لە ئایەتی دووەمی سووڕەتی (**الزمر**)دا خوا فەرمانیکردوە: ﴿فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ۝٢﴾**الزمر**، واتە: ئنجا خوا بپەرستە ملکەچیی بۆوی ساغ بکەوە.

٤- دیسان لە سووڕەتی (البینة)دا فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾**البينة**، واتە: تەنیا بەوە فەرمانیان پێکرابوو کە بە ملکەچیی ساغکردنەوەوە خوا بپەرستن، لە پووچیی بەرەو

هەق لابدەن و، نوێژ بەرپابکەن و زەکات بدەن، ئائەوەش بەرنامەی کۆمەڵێکی ڕاست و ڕێکە.

کەواتە: لەو دوو ئایەتەو هاووێنەکانیشیان کە زۆرن لە قورئان دا، ڕاستییەکی دیکەش لە بارەی خواپەرستییەوە دەستگیر دەبێ، کە بریتییە لە:

**ڕاستیی چوارەم**: پێویستە پەرستن (**عبادة**) بۆ خوا ساغ و تێروتەواو و گشتگیربێ و، بەشی جگەلە خوای پێوەنەبێ.

**٥-** هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٤٠)ی سوورەتی (**یوسف**)دا ڕاستییەکی دیکەش لە بارەی چەمك و واتای تەنیا خوا پەرستییەوە ڕوون دەبێتەوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾، واتە: حوکم تەنیا هی خوایە، فەرمانی کردوە جگە لەو نەپەرستن، ئا ئەوە ئایینی ڕێك و ڕاستە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، ئەویش بریتییە لە:

**ڕاستیی پێنجەم**: کاتێك خوا پەرستیی بۆ خوا جێگای ڕەزامەندیی و پەسندیی خوا دەبێ، لە تەرازووی خوادا، بەڕاست و تەواو دادەنرێ، کە خاوەنەکەی خۆی پاڵنەداتە لای هیچ بەرنامەیەك و هیچ حوکمێك، جگە لە حوکم و بەرنامەی خوا ﷻ، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾، حوکم واتە: بڕیاردان، بڕیاردانی تەکوینیی و قەدەریی، هەروەها بڕیاردانی بەرنامەیی و تەشریعیی، هەمووی بەس هی خوایە، ﴿أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾، فەرمانی کردوە جگە لەو نەپەرستن، واتە: وەختێك تەنیا خوا دەپەرستن و، جگە لە خوا ناپەرستن، کە حوکم و بڕیار تەنیا لە خوا وەربگرن، ﴿ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ﴾، ئا ئەوەیە ئایینی ڕێك و ڕاست، واتە: ساغکردنەوەی بەندایەتیی و ملکەچیی بۆ خوا، بەوەی تەنیا شوێن بەرنامەو حوکمی ئەو بکەوی و، تەنیا سەر بە پەیڕەو و بەرنامەی ئەو بی، ئا ئەوەیە ئایینی ڕێك و ڕاست.

کەواتە: ملکەچیی و فەرمانبەریی ئارەزوومەندانە بۆ جگە لە خوا، بە پەرستنی ئەو جگە لە خوایە دادەنرێ، وەك ئایەتەکانی (٦٠ و ٦١) لە سوورەتی(**یس**)

دا بەڕوونیـی ئـەوە دەگەیەنـن، کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَـٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَـٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ ﴾، واتـە: ئـەی وەچـەی ئـادەم! ئایا پێمڕانەگەیاندبوون، کە شـەیتان مەپەرسـتن، ئـەو بـۆ ئێـوە دوژمنێـکی ڕوونـەو، تەنیـا مـن بپەرسـتن ئـەوە ڕێـی ڕاسـتە.

بەڵـێ بەدڵنیایـی: ملکەچیـی و فەرمانبەریـی ئارەزوومەندانـە لـە مرۆڤـەوە بـۆ جگـە لـە خـوا، بـە پەرستنی ئـەو بـۆ جگـە لـە خوایـە لـە قەڵـەم دەدرێ، ئنجـا چ شـەیتان بـێ، چ جگەلـە شـەیتان بـێ.

جیاوازیـی بنەڕەتیـی لـە نێـوان ئـەو دوو حاڵەتـەدا، کـە مـرۆڤ بەنـدە (**عبـد**) بـێ بـۆ خـواو، ئـەوە کـە مـرۆڤ پەرسـتەر (**عابـد**) بـێ بـۆ خـوا، ئەوەیـە کـە لـە دووەمیانـدا ویسـتن و ئارەزوومەندیـی هەیـە، بـەڵام لـە یەکەمیانـدا ئـەوە نیـە، خـوا ڕوونیکردۆتـەوە کـە هەمـوو مرۆڤـەکان بەنـدەن بـۆ خـوا، بـەڵام هەمـوو مرۆڤـەکان پەرسـتەر نیـن بـۆ خـوا، هەموویـان عەبـدن، بـەڵام هەموویـان عابیـد نیـن، وەك لـە سـووڕەتی (مریـم)دا دەفەرمـوێ: ﴿ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَـٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ ﴾، واتـە: هەمـوو ئەوانـەی لـە ئاسـمانەکان و زەوییـدان وەك بەنـدە بـە بەندەیـی دێنـە خزمـەت (خـوای) بـە بەزەیـی ....، بـەڵام لـە سـووڕەتی (**البقـرة**) لـە ئایـەتی (٢١)دا دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ﴾، واتـە: ئـەی خەڵکینـە! ئـەو پەروەردگارەتـان بپەرسـتن کـە ئێـوەی هێناوەتـە دی و ئەوانـەی پێـش ئێـوەشی هێناوتـە دی، بەڵکـو پارێـز بکـەن.

هەروەهـا لـە سـووڕەتی (**الذاریـات**) ئایـەتی (٥٦)دا فەرموویـەتی: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾**الذاریـات**، واتـە: جنـدو مرۆڤـم تەنیـا بـۆ ئـەوە دروسـت کـردوون، بمپەرسـتن.

کەواتە: ئەوە کە مرۆڤ بەبێ ویستی خۆی بەندەی خوایە، ئەوە بریتیە لە عەبدایەتیی، بەڵام ئەوە کە مرۆڤ بە ویستی خۆی خوا بپەرستێ، ئەوە بریتیە لە پەرستنی خوا.

پوختەی پێناسەی خواپەرستیی:

خواپەرستیی تێرو تەواو و ڕێك و ڕاست، لە چوار خاڵدا بەرجەستە دەبێ:

١- ئیمان بە خواو بە هەموو ئەوەی خوا فەرمانی کردوە ئیمانی پێ بهێنرێ و، کوفر بە **طاغووت** و کوفر بە هەموو ئەو شتانەی پێچەوانەو دژی ئیمانن.

٢- وەرگرتنی تێڕوانینەکان و بەهایەکان و پێوەرەکان (**التصورات والقيم والموازين**) لە خوای بەرزو، هەڵهێنجانیان لە سەرچاوەی زوڵاڵی ئایینی خوای پەروەردگارەوەو، ڕەفز کردنی هەر شتێك کە لەگەڵ قوڕئان و سوننەتدا تێکدەگیرێ، لە بواری تێڕوانینەکان و، بەهایەکان و، پێوەرەکاندا.

٣- پێشکەشکردنی دروشمەکانی پەرستن تەنیا بۆ خوا ﷻو، پێ هەڵسانیان بەپێی ئەوەی ڕێبازی پێغەمبەرەکەی ﷺ دیاریی کردوە.

٤- بەڕێوەبردن و سەرپەرشتییکردنی کاروباری ژیان، لەسەر ئاستی تاك و خێزان و کۆمەڵگاو دەوڵەت، بەپێی ئەوەی حوکمەکانی ئایینی ڕێك و ڕاستی خواو، شەریعەتە کاربەجێیەکەی فەرمانیان پێکردوە.

## بڕگەی سێیەم: چەسپاندنی تەنیایی خوا لە پەرستراوێتییداو، پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان و، هەبوونی پەرستراوانی دیکە:

ئەمیش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا خوا ﷻ ڕایگەیاندوەو، پانتاییەکی زۆری لە کتێبی خوا (**کتاب الله**)دا بۆ تەرخانکراوە، کە ئێمە بە چەند نموونەیەکی کەم لێی دەگەڕێین:

١- خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا اتَّخَذَ اللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٩١﴾ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾**المؤمنون**، واتە: خوا هیچ ڕۆڵەی نین و، هیچ پەرستراویشی لەگەڵ نین، ئەگەرنا هەر پەرستراوە ئەوەی دروستیکردوە خۆی سەرپەرشتیی دەکردو، هەندێکیشیان بەسەر هەندێکیان دا زاڵ دەبوون، پاکیی بۆ خوا لەوەی خوای پێ وەسف دەکەن، زانای پەنهان و ئاشکرایە، بەرزە لەوەی دەیکەنە هاوبەش بۆی.

لێرەدا خوا دوو بەڵگان دێنێتەوە، لە سەر تەنیا پەرستراوێتیی خۆی:

بەڵگەی یەکەم: دەفەرموێ: ﴿ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ ﴾، واتە: ئەگەر گریمان پەرستراوێکی دیکە لەگەڵ خوادا ببووایە، دەبووایە بەدیهێنەر بێ، چونکە جگە لە بەدیهێنەر شایستەی پەرستراوێتیی نیە، ئنجا ئەگەر بەدیهێنەرێکی دیکە هەبووایە لەگەڵ خواداو، دروستکراوانی هەبوونایە و، حوکمڕانیی هەبووایە، وەك چۆن خوای بەرزو مەزن هەیەتی، ئەو کاتە هەر کام لە خواو لەو بەدیهێنەرە گریمانە کراوە، دروستکراوەکانی خۆی بەو شێوەیەی خۆی پێیخۆشە بەڕێوەی دەبردن، بۆیە لە ئەنجامدا لە نێوان ویستی ئەو بەدیهێنەرە گریمانە کراوەو، ویستی خوای بەدیهێنەردا، تێکگیران دروست دەبوو، ئەوەیە کە دەفەموێ: ﴿ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ ﴾.

بەڵگەی دووەم: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَعَلَا بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ ﴾، هەندێکیـان بەسـەر هەندێکیـان دا زاڵ دەبـوون، ئـاوا ڕوونی دەکەینـەوە: ئەگـەر گریـمان پەرسـتراوانێکی دیکـە هەبوونایـە، جگـە لـە خـوا ﷻ لـەو حاڵەتـەدا هـچ بـواری تێدانیـە کـە تێکگیـران لـە نێوانیانـدا دروسـت دەبـوو، چونکـە پەرسـتراو ڕازیـی نابـێ، مەگـەر بـەوەی ملپێکەچکـەر بـێ بـۆ جگەلـە خـۆی و، بەسـەریدا زاڵ بـێ، بیخاتـە ژێـر ڕکێفی خۆیـەوەو، هەمـوو شـتێك لـە ژێـر دەسـتی خۆیدابـێ، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی ئێمـە جگـە لـە هەیمەنـەو دەسـەڵاتی خـوای بەدیهێنـەری پـەروەردگار نابینیـن، کەواتـە: پەرسـتراوێکی دیکـە جگەلـە خـوا بـوونی نیـە.

٢- خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمِ ٱتَّخَذُوٓاْ ءَالِهَةً مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ هُمۡ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوۡ كَانَ فِيهِمَآ ءَالِهَةٌ إِلَّا ٱللَّهُ لَفَسَدَتَاۚ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَرۡشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الأنبياء، واته: یان ئایا پەرستراوانێکیان لە زەویدا گرتوون کە زیندوو دەکەنەوەو بڵاو دەکەنەوە دوای ئەوەی مردوون؟ ئەگەر جگە لە خوا پەرستراوانی دیکە ببوونایە لە ئاسمان و زەویدا، تێکدەچوون، پاکیی بۆ خوا، خاوەنی عەڕش، لەوەی پێی وەسف دەکەن.

چونکە ئەگەر پەرستراوانی دیکە ببوونایە، دەبووایە دروستکراویان هەبن، بێگومان ئەو کاتەش ئەو دوو پەرستراوە کە هەر کامیان دروستکراوی خۆی هەن و، سەرپەرشتییان دەکات، دەبووایە تێکبگیرێن!

٣- شەش پرسیارکردنی خوا بەشێوەی نکووڵیلێکردن، لەبارەی شیرکەوە:

پرسـیاری یەکـەم، خـوا ﷻ ئـاوا دەسـتی پێـدەکات: ﴿ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيۡرٌ أَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾النمـل، واتـە: بڵـێ سـتایش بـۆ خـواو سـەلام لەسـەر ئـەو بەندانـەی هەڵیبـژاردوون، ئایـا خـوا باشـترە یـان ئەوانـەی دەیانکەنـە هاوبـەشی؟

پرسـیاری دووەم، خـوا لـە ئایـەتی ژمـارە (٦٠)دا دەفەرمـوێ: ﴿ أَمَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهۡجَةٍ مَّا كَانَ

لَكُمْ أَن تُنۢبِتُوا۟ شَجَرَهَآ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ...﴿٦٠﴾ ﴾، واتـە: یـان ئایا ئەو کەسـەی ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی و لەسـەرێوە ئـاوی بـۆ دابەزانـدوون، کـە بـاخ و گـوڵ و گوڵـزارو بـاخ و بێسـتان و دیمـەن جوانـەکانی پـێ ڕوواندوون، ئێـوە نەتاندەتـوانی درەختـەکانی پـێ بڕوێنـن، ئایا لەگـەڵ خـوادا پەرستراوی دیکـە هـەن؟

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴾، بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکن لادەدەن.

پرسـیاری سـێیەم: ئنجـا خـوا لـە ئایـەتی ژمـارە (٦١)دا پرسـیارێکی دیکـە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ ﴾، واتە:یـان ئایـا کێیـە ئـەو کەسـەی زەوی بـۆ کردوونـە نشـینگەو لـە میانیـدا ڕووبـارەکانی بـەڕێ کـردوون و، چیـا چەسـپاوەکانی تێـدا دانـاون و، لـە نێـوان دوو دەریایـەکان (ئـاوی شـیرین و سـوێر)دا پـەردەی دانـاوە (تاکـو تێکـەڵ بـە یەکـدی نەبـن) ئایـا لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیکـە هەیـە؟ بەڵکـو زۆربەیـان نازانـن، بۆیـەش دەفەرمـوێ: زۆربـە، چونکـە کەمێکیـان زانیویانـە، بـەڵام بـۆ چەواشـەکردنی خەڵکەکەیـان وایـان پیشـانداوە کـە نازانـن.

پرسـیاری چـوارەم: خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ ﴾، واتـە: یـان ئایـا کێیـە ئـەو کەسـەی وەڵامـی بابـای بـێ دەرەتـانی ناچـار دەداتـەوە کاتێـك لێـی دەپاڕێتـەوەو، ئـەو زیـان و خراپەیـەی هەیـە لێـی لادەبـات و، دەتانکاتـە جێنشـین لەسـەر زەوی، ئایـا لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیکـە هەیـە؟ بەڵکـو کـەم بیرتـان دەکەوێتـەوەو پەندوەردەگـرن.

پرسـیاری پێنجـەم: ﴿ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾ ﴾،واتـە: یـان ئایـا کێیـە کـە لـە تاریکاییـەکانی وشـکانیی و دەریـادا ڕێنماییتـان دەکات و، کێیـە

بایـەكان دەنێـرێ، وەك مـوژدە لەپێـش دەسـتی بارانەكەیـەوە، ئایـا جگـە لـە خـوا پەرسـتراوی دیكـە هەیـە؟ بەرزیـی بـۆ خـوا لـەوەی دەیكەنـە هاوبـەشی.

پرسـیاری شەشـەم و كۆتایـی: ﴿أَمَّن يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾﴾، یـان ئایـا كێیـە ئـەو كەسـەی دروسـتكراوان وەدیدێنـێ، دواییـش دەیانگێڕێتـەوەو، كێیـە لـە ئاسـمان و زەوییـەوە (لەسـەرێ و خوارێـوە) بژیوتـان دەدات، ئایـا لەگـەڵ خـوادا پەرسـتراوی دیكـە هەیـە؟ بڵـێ: بەڵگەتـان بێنـن، ئەگـەر لـە ڕاسـتانن؟

## بڕگەی چوارەم: خوا ﷻ فریشتەكانی دابەزاندوون بە پەیامی خۆیەوە بۆ پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) تاكو بە خەڵك ڕابگـەیەنن: تەنیـا خوا بپەرستن و، پارێز لە خوا بكەن:

ئەمیـش لەگەڵیـك ئایـەتی قوڕئـان دا هاتـوە، بەشـێوازی جـۆراو جـۆر، بـۆ وێنـە لـە سـوورەتی **(النحـل)**، ئایەتـەكانی: (٢ و٣)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾﴾**النحـل**، واتـە: (خـوا) فریشـتەكانی بـە ڕووح لـە لایـەن خۆیـەوە بـە فەرمـانی خـۆی دابەزانـدوون، بـۆ سـەر هـەر كەسـێك لـە بەنـدەكانی كـە بیـەوێ، كـە پێیـان ڕابگەیەنـن: بێجگـە لـە مـن (بێجگـە لـە خـوا) هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، دەجـا پارێـز لـە مـن بكـەن، ئاسـمانەكان و زەوی بـە حـەق هێناونـە دی، خـوا بـەرزە لـەوەی دەیكەنـە هاوبـەشی.

**بڕگەی پێنجەم: خوا تێکڕای پێغەمبەرانی صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ ناردوون بۆ ڕوونکردنەوەی تەنیا پەرستراوێتیی خوا بۆ خەڵك و، پێڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە:**

بۆ وێنە:

**١-** لە ئایەتی (٢٥)ی سوورەتی (**الأنبياء**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾﴾الأنبياء، واتە: لە پێش تۆدا هیچ ڕەوانەکراوێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە جگە لە من هیچ پەرستراوێك نیە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن، کەواتە: خوا ﷻ تێکڕای پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بە پەیامی تەوحیدەوە ناردوون.

**٢-** لە سوورەتی (**النحل**) ئایەتی (٣٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾﴾النحل، واتە: لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانەکراوێمان ناردوە، کە خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دوور بگرن، ئنجا خەڵکەکە هەیانبووە خوا ﷻ خستوویەتە سەر ڕاستە ڕێ (لەبەر ئەوەی هیدایەتی خوای قبووڵ کردوە)و، هەشیان بووە گومڕایی لەسەر چەسپاوە، (چونکە پشتی لە هیدایەتی خوا کردوە) بە زەویدا بڕۆن، ئنجا سەرنج بدەن سەرەنجامی بە درۆدانەران چۆن بووە!

**بڕگەی شەشەم: خوا ﷻ زۆر بە سەختیی ڕێگریی کردوە لەوەی هاوبەشی بۆ دابنرێ و، زۆر بە ترسناکیی خەڵکی لە سەرەنجامی شوومی هاوبەش بۆ خوا دانان ترساندوە:**

ئەمیش پانتاییەکی زۆری لە فەرمایشتی خوادا بۆ تەرخانکراوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی **(القصص)** خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ لَهُ ٱلْحُكْمُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٨﴾﴾ **القصص**، واتە: لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە مەپاڕێوە، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، هەموو شتێك لە بەین دەچێ، جگە لە ڕووی وی، حوکم و بریار بەس هی ئەوەو تەنیا بۆ لای ویش دەگەڕێنەوە.

٢- لە سوورەتی **(الشعراء)** ئایەتی (٢١٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾﴾ **الشعراء**، واتە: لەگەڵ خوادا لە پەرستراوێکی دیکە مەپاڕێوە، ئەگەرنا بەدڵنیایی لە سزادراوان دەبی.

**بڕگەی حەوتەم: خوا بەیەکگرتن و تەنیا خوا پەرستن (توحيد الله) ڕێك نابێ مەگەر لەگەڵ خۆ دوور گرتندا لە هاوبەش بۆ خوا دانان و، بە بێ خۆ دوور گرتن لە هاوبەش بۆ خوا دانان، تەنیا خوا پەرستیی نایەتە دی، هەروەك چۆن بەبێ خۆ دوور گرتن لە کوفر، ئیمان نایەتەدی:**

ئەمیش لە زۆر ئایەتان دا هاتوە، بۆ وێنە:

١- خوا لە سوورەتی **(الزمر)** ئایەتی (١٧)دا دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾﴾ **الزمر**، واتە: ئەوانەی خۆیان بە دوور گرتوە لە طاغووت کە بیپەرستن و گەڕاونەوە بۆ لای خوا، ئەوانە دڵخۆشیی و موژدەیان بۆ هەیە.

٢- لە سوورەتی **(البقرة)** ئایەتی (٢٥٦)دا دەفەرموێ: ﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ... ﴿٢٥٦﴾﴾ **البقرة**، واتە: هەر کەسێك

کوفر بە **طاغووت** بکات و ئیمان بە خوا بێنێ، دەستی بە قوڵفە زۆر قایمەکەوە گرتوە کە هەرگیز پچڕان و پسانی بۆ نیە.

## بڕگەی هەشتەم: پەرستراوێتیی خوا ﷻ، هەر کام لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خـــوا، خوازیارینی.

واتە: لەبەر ئەوەی خـــوا ﷻ بەس خۆی بەدیهێنەرەو بەس خۆی پەروەردگارە، ئەو دووانە هـــەر کامێکیان خوازیاری ئەوەیە دەبێ تەنیا خوا بپەرسترێ، ئەمیش لە قـــورئـــان دا زۆر جەختی لە سەر کراوەتەوەو باسکراوە، بۆ نموونە:

**١-** لە سووڕەتی (**فاطر**) ئایەتی (٣)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡۚ هَلۡ مِنۡ خَٰلِقٍ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٣ ﴾**فاطر**، واتە: ئەی خەڵکینە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، ئایا جگە لە خوا بەدیهێنەرێکی دیکە لە ئاسمان و زەویەوە بژیوتان دەدات؟ بێجگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بۆ کوێ لادەدرێن؟

**٢-** لە سووڕەتی (**غافر**)یشدا، خوا ﷻ لە ئایەتەکانی: (٦١ و ٦٢)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ٦١ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ٦٢ ﴾**غافر**، ئایەتی پێشێیان (ئایەتی سێی (**فاطر**)) باسی بەدیهێنەرایەتیی خوا بوو کە خوازیاری ئەوەیە تەنیا خوا بپەرسترێ، ئەمەشیان باسی پەروەردگارێتیی خوایە، پەروەردگارێتیی خواش خوازیاری ئەوەیە تەنیا خوا بەندایەتیی بۆ بکرێ، دەفەرموێ: خوا ئەو زاتەیە شەوگاری بۆ گێڕاون، تاکو تێیدا پشوو بدەن و، ڕۆژگاریشی بۆ گێڕاون بەپێبینەر، (کە تێیدا دەبینن و کاسبیی تێدا دەکەن) بە دڵنیایی خوا خاوەن چاکەو بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی سوپاسگوزار نین، ئا ئەو خوایەتان پەروەردگارتانە بەدیهێنەری هەموو شتێکە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، کەواتە: بەرەو کوێ لادەدرێن؟ (وەك ویستی خۆتانتان لەدەست دابێ!)

## بڕگەی نۆیەم: پێویستە بەندایەتیی تەنیا بۆ خوا بکرێ، هەرچەندە بێبڕوایان پێیان نـاخۆش بێ و، هـەل و مـەرج و بارودۆخ بە هـەر شێوەیەك بێ:

ئەمیش لە زۆر ئایەتی قورئان دا خراوەتەڕوو، بۆ نموونە:

**١-** لە سووڕەتی (**غافر**)دا، خوا ﷻ ڕووی کردۆتە مسوڵمانان و دەفەرموێ: ﴿ فَٱدْعُواْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ ﴾**غافر**، واتە: لە خوا بپاڕێنەوە، ملکەچیی خۆتانی بۆ ساغ بکەنەوە، هەرچەندە بێبڕوایەکان پێیان ناخۆش بێ.

**٢-** هەروەها لە سووڕەتی (**العنكبوت**)یشدا، خوا ﷻ باسی ئەوە دەکات کە بارودۆخ هەر چۆن بێ و چییەك بێ، دەبێ تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکرێ، دەفەرموێ:

﴿ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرْضِى وَٰسِعَةٌ فَإِيَّـٰىَ فَٱعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ غُرَفًا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ نِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ **العنكبوت**.

واتە: ئەی ئەو بەندانەم کە بڕواتان هێناوە! سەر زەوی من فراوانە، تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن [ئەگەر لێرەدا ڕێت لێ گیرا تەنیا بەندایەتیی بۆ خوا بکەی، ئێرە بەجێ بهێڵەو بچۆ بۆ شوێنێکی دیکە، لە مردنیش مەترسێن] هەموو نەفسێك دەبێ مردن بچێژێ، دواییش بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە، [دەبێ بزانن چۆن و بە چ چاوو ڕوویەك دێنەوە] ئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، لە بەهەشتدا نیشتەجێیان دەکەین، لە کۆشکە بەرزەکاندا، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، باشترین

پاداشت پاداشتی کارکەرانە، [ئەوانەی کاریان کردوە بۆ خوا] ئەوانەی خۆیان ڕاگرتوەو پشتیشیان تەنیا بە پەروەردگاریان بەستوە، [لە بژیویش مەترسێن] زۆر زیندەوەر هەن بژیوەکەیان هەڵناگرن، خوا بژیوی ئەوانیش و ئێوەش دەدات، ئەو بیسەری زانایە [دەنگ و قسەتان دەبیستێ و حاڵ و باڵیشتان دەزانێ]

## بڕگەی دەیەم: پەرستنی خوای بەرز، ئەو حیکمەتەیە کە خوا جندو مرۆڤی تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون.

خوای بەرزومەزن لە ئایەتی (٥٦)ی سوورەتی (الذاريات)دا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات، واتە: جندو مرۆڤم تەنیا بۆ ئەوە دروستکردوون، بمپەرستن، بەندایەتییم بۆ بکەن.

هەڵبەتە تەنیا پەرستنی خوا لە لایەنی جندو مرۆڤەوە دەبێ ورد بین! ئەوە خۆیانن جندو مرۆڤن، کە لە پەرستنەکەیان بۆ خوا بەهەرەمەند دەبن، ئەگەرنا خوا ﷻ زۆر لەوە بەرزترە پێویستیی بە پەرستنی جندو مرۆڤ بێ، یان پێویستیی بە پەرستنی جۆرێکی دیکە لە بەندەکانی بێ کە فریشتەکانن، چونکە خوا ﷻ بەر لەوەی فریشتەکان و جندو مرۆڤیش بخوڵقێنێ، چۆن بووە، ئێستاش هەر وایەو، دوای ئەوەی ناشمێنن (بە نسبەت جندو مرۆڤەوە لە ژیانی دنیادا نامێنن) خوا هەر وەك خۆیەتی، ئەو حەقیقەتەش لە زۆر شوێنی قورئاندا ڕوونکراوەتەوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (**فصلت**) لە ئایەتی (٤٦)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾ ﴾ فصلت، هەر کەسێك چاکەیەك بکات سوودەکەی بۆ خۆیەتی و، هەرکەس خراپەش بکات زیانەکەی لەسەر خۆیەتی و، پەروەردگارت ستەمکار نیە بۆ بەندەکانی.

**٢-** هەروەها لە سووڕەتی **(الإسراء)**یشدا دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ... ﴿٧﴾﴾ **الإسراء**، ئەگەر چاکە بکەن سوودەکەی بۆ خۆتانەو, ئەگەر خراپەش بکەن، زیانەکەی هەر بۆ خۆتانە، یانی: ئەوە خۆتانن لە پەرستنی پەروەردگارتان بەهرەمەند دەبن و، خۆشتانن کە لە نەپەرستنی زیانبار دەبن، ئنجا ئایا بۆچی خوا ﷻ جندو مرۆڤی خوڵقاندوون و پەرستنی خۆیشی لەسەر پێویست کردوون، بۆ ئەوەی بەهرەمەندیان بکات؟ بێگومان خوای پەروەردگار ویستی وابووە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ **الأنبياء**، ئەو (خوا) لێی ناپرسرێ لەوەی دەیکات و ئەوان لێیان دەپرسرێ، چونکە خوا هیچ شتێکی بێجێ ناکات و، هەر شتێك دەیکات ئەوپەڕی حیکمەتی تێدایە.

## بڕگەی یازدەیەم: هاوبەش بۆ خوا دانان گوناهێکی مەزنەو، هەرگیز لێبوردنی خواو بەزەیی خوا نایگرێتەوە.

لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەم ڕاستییەش خراوەتە ڕوو، بۆ وێنە:

**١-** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَـٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّـٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾﴾ **الزمر**، خوا بە پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ ﷺ: پێیان بڵێ: ئایا فەرمانم پێ دەکەن (پێم دەڵێن) جگە لە خوا بپەرستم؟ ئەی نەفامینە! بە دڵنیایی بۆ لات توو بۆ لای ئەوانەی پێش تۆش سرووش کراوە (پەیام نێردراوە) کە ئەگەر هاوبەش دابنێی کردەوەکەت هەڵدەوەشێتەوەو لە زیانباران دەبی، بەڵکو تەنیا خوا بپەرستەو لە سوپاسگوزارن بە.

**٢-** هەروەها لە سووڕەتی **(الأنعام)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۚ وَلَوْ أَشْرَكُوا۟ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٨﴾﴾، خوا دوای ئەوەی ناوی هەژدە (١٨) لە پێغەمبەران دێنێ صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێ،

دەفەرموێ: ئەوە ئەو ڕێنماییەیە کە خوا هەر کەسێك بیەوێ لە بەندەکانی پێی ڕاستە ڕێ دەکات و، ئەگەر هاوبەشیان بۆ خوا دانابایە، [ئەو هەژدە پێغەمبەرە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)] کردەوەکەیان هەڵدەوەشانەوە، یانی: هەرچی ئەنجامیان داوە لە کردەوەی باش، هەموویان لێ هەڵدەوەشایەوە، بەهۆی شیرکەوە.

٣- لە سووڕەتی (النساء)دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾النساء، واتە: بە دڵنیایی خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ دابنرێ، بەڵام جگە لەوە بۆ هەر کەسێك بیەوێ، لێی دەبوورێ، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ، درۆیەکی مەزنی بۆ خواوە هەڵبەستوە.

٤- لە سووڕەتی (الحج) لە ئایەتی (٣١)دا، دەفەرموێ: ﴿حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيْرَ مُشْرِكِينَ بِهِۦ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ فِى مَكَانٍ سَحِيقٍ ﴿٣١﴾﴾الحج، واتە: ساغ و پاك گەڕاوە بن لە هەموو ڕێچکەکانەوە بەرەو ڕاستەڕێی خوا هاوبەشی بۆ دامەنێن و، هەر کەسێکیش هاوبەش بۆ خوا دابنێ، وەك ئەوە وایە لە ئاسمانەوە کەوتبێتە خوار، باڵندە ڕفاندبیان، یاخود با بردبێتی بۆ شوێنێکی دوورو قووڵ.

کەواتە: شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان گوناهێکە هەرگیز قەڵەمی عەفووی بەسەردا نایەت و، هیچ گوناهێك لە گوناحەکان لە شیرك گەورەتر نیە، لەو گوناهانەی دەگونجێ خاوەنانی ئیمانیش تووشیان بن، بەڵام بێگومان هەر کەسێك تووشی گوناهی گەورەی شیرك ببێ، هەموو کردەوە چاکەکانی هەڵدەوەشێنەوەو، هەرگیز گوناهی شیرك لێبوردنی بۆ نیە، بەدڵنیاییش شیرك لێرەدا مەبەست پێی شیرکی گەورەیە، شیرکی گەورەش ئەوەیە کە یەکێك لە دروستکراوەکانی خوا بهێنرێتە ئاستی خواو ڕێزی خوا، لە شتێك لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خواوە، وەك لە سووڕەتی (الشعراء)دا، موشریکەکان گوتوویانە: ﴿تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾﴾، واتە: سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا.

یەكسانكردنی هەر شتێك لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییاندا بە شیرك دادەنرێ، چ لە بەدیهێنەرایەتیی و، چ لە پەروەردگارێتیی و، چ لە خاوەندارێتیی و، چ لە پەرستراوێتیی، یاخود لە ناوو سیفەتەكانیدا.

**بڕگەی دوازدەیەم: حیكمەتی ئەوە كە ئیسلام (لا إِلَهَ إِلاَّ الله)ی كردوە بە دروشمی هەرە مەزنی، ئەوەیە كە خوا بە یەكگرتن لە پەرستراوێتییدا (توحيد الله في الألوهية) هەموو جۆرەكانی دیكەی خوا بەیەكگرتن دەگرێتە خۆی:**

ئیسلام گرنگییەكی بەرچاوی داوە بە وشەی بەپێزی (لا إِلَـهَ إِلاَّ الله)و لە قورئاندا لە زۆر شوێنان دووبارە بۆتەوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (**البقرة**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ لَّا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الرَّحْمَٰنُ الرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾﴾، واتە: پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، جگە لەو هیچ پەرستراوێك نیە، بە بەزەیی بەخشندەیە.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**البقرة**)دا: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ .. ﴿٢٥٥﴾﴾. واتە: خوا جگەلەو هیچ پەرستراوێك نیە، هەمیشە ژیاوی سەرپەرشتیارە.

٣- لە سوورەتی (**آل عمران**)دا: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴿٢﴾﴾.

٤- لە سوورەتی (**النساء**)دا: ﴿اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ... ﴿٨٧﴾﴾.

٥- لە سوورەتی (**الصافات**)دا: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾﴾. ئەوان (بێبڕوایان) هەركات پێیان گوترا: جگەلە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، خۆیان بەزل دەگرن.

٦- لە سوورەتی (**محمد**)دا: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ ... ﴿١٩﴾﴾**محمد**، بزانە! كە هیچ پەرستراوێك جگەلە خوا نیە...

٧- لە سوورەتی (التغابن)دا: ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٣﴾ ﴾. خوا هیچ پەرستراوێك جگەلەو نیەو، باوڕوادارانیش تەنیا پشت بە خوا ببەستن.

هەروەها لەو فەرموودەیەش دا كە بە فەرموودەی جیبریل (**حدیث جبریل**) ناسراوە كە بوخاریی و موسلیم هێناویانە، موسلیم لە صەحیحی خۆیدا بە ژمارە: (١) و، بوخارییش بە ژمارە: (٥٠)، بڕوا بوون بە: تەنیا پەرستراوێتیی خوا (**توحید الله**) كراوە پایەی مسوڵمانەتیی، یەكەمین، كە جیبریل بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (**أَخبِرنِي عَنِ الإِسلام**) ئەویش وەڵام دەداتەوە: {**أَن تَشهَدَ أَن لا إِلَهَ إِلاَّ الله وَ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله، وَتُقِيمَ الصَّلاةَ، وَتُؤتِيَ الزَّكاةَ، وَ تَصُومَ رَمَضانَ، وَ تَحُجَّ البَيتَ إِنِ استَطَعتَ إِلَيهِ سَبِيلاً**}، كاتێك جیبریل علیه السلام لە شێوەی پیاوێكی نەناسراودا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەپرسێ: لە بارەی ئیسلامەوە هەواڵم پێ بدە، ئیسلام چییە؟ پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: ئیسلام ئەوەیە كە شایەتمان بێنی جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، موحەممەدیش ڕەوانەكراوی خوایەو، نوێژ بەرپا بكەی و، زەكات بدەی و، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگری و، سەردانی ماڵی خوا بكەی، ئەگەر ڕێت تێبردو توانیت بچی.

١- هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ وشەی تەوحید: (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**)ی خستۆتە بانگەوەو.

٢- خستۆتە قامەتەوەو، ٣- خستۆتە تەحییاتەوەو، ٤- خستۆتە وتاری جومعەوەو، ٥- خستۆتە وتاری جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربان و، ٦- خستۆتە وتاری داوای باران بارین كردن (**الإِستِسقاء**)و، ٧- خستۆتە وتاری داوای ئافرەت كردن (**خُطبَةُ الخِطبَة**)، ئەوانە هەموویان لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ چەسپاون.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وشە موبارەكەی خوا بە یەكگرتن (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**) وشەیەكی دیكەشی پێیەوە پەیوەست كردوە، كە بریتیە لە شایەدیدان بە ڕەوانەكراوێتیی موحەممەد ﷺ لە لایەن خواوە (**محمد رسول الله**) چونكە لە ڕێی موحەممەدەوە ﷺ ئێمە دەتوانین خوا ﷻ وەك پێویست بناسین، بیپەرستین و بەندایەتیی بۆ بكەین.

شایانی باسیشە: زۆرێك لە ڕوونكەرەوانی قورئان هەر كام لە وشەی: ﴿كَلِمَةً طَيِّبَةً﴾، لە ئایەتی (٢٤)ی سووڕەتی (**إبراهیم**)دا، هەروەها وشەی: ﴿ٱلْكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ﴾ لە ئایەتی (١٠)ی سووڕەتی (**فاطر**)و، وشەی: ﴿كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ﴾ لە ئایەتی (٢٦)ی سووڕەتی (**الفتح**)و، وشەی (**الحُسنَى**)، لە سووڕەتی (**الليل**) ئایەتەكانی: (٦ و٩)دا، بە وشەی تەوحید (**لا إِلَـهَ إِلاَّ الله**) مانایان كردوە[1]،

دەتوانین حیكمەت و هۆكاری ئەوە، كە خوا ﷻ ئەم وشەی موبارەكەی (**لا إِلَـهَ إِلاَّ الله**)ی هێندە گرنگیی پێداوەو، كردوویەتی بە دروشمی هەرە مەزنی ئایین و بەرنامەی خۆی، دوا نوسخەی هیدایەت و بەرنامەی خۆی كە بە پێغەمبەری كۆتایی خۆیدا ناردوویەتی، دەتوانین لە سێ شتاندا كورت بكەینەوە:

**یەكەم:** (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**) ئەو وشەیە كە باشترین تەعبیر دەكات لە بەیەكگرتنی خوای بەرز لە پەرستراوێتییدا، واتە: ئەوە كە تەنیا خوا ﷻ پەرستراو بێ و، بەدڵنیایی بە یەكگرتنی خوا لە پەرستراوێتییەكەشیدا، هەموو جۆرەكانی دیكەی خوا بەیەكگرتن دەگرێتە خۆی:

**١-** بەیەكگرتنی خوا لە بەدیهێنەرایەتییداو، بڕوا هێنان بەوە كە تەنیا خوا بەدیهێنەری هەموو شتێكە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ خَـٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾﴾ **الزمر**.

**٢-** خوا بە یەكگرتن لە پەروەردگارێتییداو، بڕواهێنان بەوەی تەنیا خوا بەخێوكارو پەروەردگارو مشوورخۆری هەموو شتێكە، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَـٰمِ ثَمَـٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ خَلْقًا مِّنۢ بَعْدِ خَلْقٍ فِى ظُلُمَـٰتٍ ثَلَـٰثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۖ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٦﴾﴾ **الزمر**.

---

(١) وەك (إبن كثیر) لە تەفسیرەكەی خۆیدا هێناویەتی (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) لاپەڕەكانی (٧٠١ و ١١٢٦ و ١٢٩٢)، هەروەها (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان) ی (عبد الرحمن بن ناصر السعدي)، لاپەڕە (٩٢٧).

**٣-** خوا بە یەکگرتن لە خاوەنداریێتییداو، بڕواهێنان بەوە کە تەنیا خوا خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شتێکە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿لَهُ ٱلْمُلْكُ﴾، واتە: حوکمڕانیی و خاوەنداریێتیی هەمووی هی خوایە.

**٤-** هەروەها خوا بە یەکگرتن لە پەرستراوێتییدا، بە یەکگرتنی خوا لە ناوو سیفەتەکانیشیدا دەگرێتە خۆی، یانی: بڕواهێنان بەوە کە هەرچی ناوی بەرزو پەسندەو هەرچی سیفەتی چاکە، تەنیا هی خوای بەرزومەزن و پەروەردگارن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ...﴿١١٠﴾﴾ **الإسراء**، واتە: ئەو (خوا) ناوە هەرە چاکەکانی هەن... هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ...﴿٢٧﴾﴾ **الروم**، واتە: سیفەتی هەرە بەرز لە ئاسمانەکان و زەویدا، تەنیا هی وی (خوا)یە.. کەواتە: ئەمە حیکمەتی یەکەم، کە خوا بەیەکگرتن لە پەرستراوێتییدا، خوا بە یەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتییداو، لە پەروەردگاریێتییداو، لە خاوەنداریێتییداو، لە ناوو سیفەتەکانیشیدا دەگرێتە خۆی.

**دووەم:** هەر کام لە بەدیهێنەرایەتیی خواو پەروەردگاریێتیی خواو خاوەنداریێتیی خوا، بۆ خوا چەسپاون و خەڵك بیانەوێ و نەیانەوێ، حەز بکەن و حەز نەکەن، هەر دروستکراوی خوان، پەروەردەکراوی خوان و بەس خوا خاوەنیانەو بڕواهێنانیان و بڕوا نەهێنانیان، بەوەی خوا بەدیهێنەریانە، یان پەروەردگاریانە، یاخود خاوەنیانە، هیچ لەو واقیعە ناگۆڕێ، بەڵام پەرستراوێتیی خوا لە ژیانی خەڵکدا بەو شێوەیە نیە، بەڵکو هەر کەسێك بیەوێ خوا بە پەرستراو دەگرێ و تەنیا خوا دەپەرستێ و، دەبێتە بەندەو پەرستەر بۆ خواو، کەسێکیش نەیەوێ، دەتوانێ خوا نەپەرستێ، یاخود بیپەرستێ، بەڵام هاوبەشی بۆ پەیدا بکات، بۆیە بە پەرستەری خواو بەندەی خوا دانانرێ، بەڵام بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریێتیی و خاوەنداریێتیی خوا، هەڵوێستی بەندەکان هیچ لەوە ناگۆڕێ، هەڵبەتە مەبەستمان ئەوە نیە، کە هەرکات خەڵك بێبڕوابوون یاخود هاوبەش بۆ خوا دانەر بوون، مانای وایە سیفەتی پەرستراوێتیی لە خوا ﷻ دادەڕنن، نا، دروستکراوەکان زۆر لەوە گچکەترن، بەڵام مەبەستمان ئەوەیە ئەوان ئەگەر تەنیا خوا بپەرستن، ئەوە خۆیان ژیانیان دەگۆڕێ، ئەگەرنا بێگومان خوای تاك و پاك ئەوان

بپەرستن و نەیپەرستن، هەر تاکە پەرستراوە، واتە: پەرستراوێتیی خوا لە واقیعدا چەسپاوە، بە نسبەت هەموو بوونەوەرەوە، جگە لە چەنگێك لە بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرانی مرۆڤ و جند، ئەوانیش دەبنە شتێکی ڕیزپەڕ و دەگمەن لە سیستمی گشتیی خوا، کە لە دروستکراوەکانیدا دایناوە.

کەواتە: حیکمەتێکی دیکە کە ئیسلام وشەی: (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**)ی کردوە بە دروشمی هەرە مەزنی خۆی، ئەوەیە کە مرۆڤەکان مافی سەرپشك بوون و ئازادییان پێدراوە، کە خوا ﷻ بکەنە تاکە پەرستراوی خۆیان، یاخود نەیکەن، ئنجا کە دەڵێن: (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**) بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، ئەگەر بەڕاستیی و بە هەقەوە وابڵێن، تەعبیر دەکات لە تەنیا پەرستراوێتیی خوا لە لایەن ئەو کەسەوەی وادەڵێ، کە تەنیا خوا پەرستراویەتی و، تەنیا خوا ﷻ ئەو زاتەیە کە ئەوپەڕی خۆشویستن و، لێترسان و، سام و هەیبەت بەرانبەر نواندن و، مل بۆ کەچکردن و، بە گەورە گرتن و، بە بەرز گرتن و، پشت پێبەستنیان بۆی هەیە.

**سێیەم:** ئەم وشە موبارەکە (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**) وەك چۆن یەکتایی خوا لە پەرستراوێتییدا دەچەسپێنێ، لە هەمان کاتیشدا هەموو جۆرەکانی هاوبەش بۆ خوا دانان لادەبات، بۆیەش زانایانی ئیسلام ناویان لەو وشەیە ناوە: (**كَلِمَةُ النَّفي وَالإِثبات**)، وشەی لابردن و چەسپاندن، چونکە هەرچی هاوبەشە بۆ خوا لایدەبات و، تەنیا پەرستراوێتیی خوای پەروەردگاریش دەچەسپێنێ، کەواتە: حیکمەتێکی دیکەی دانانی ئەم وشەیە بە دروشمی هەرە مەزنی ئیسلام و، جیاکەرەوەی مسوڵمان نامسوڵمان و، تەنانەت لە جەنگەکاندا، کەسێك شمشێری لێ بەرز کرابێتەوەو لەو کاتەدا گوتبێتی: (**لا إِلَهَ إِلاَّ الله**) مانای وایە لە ڕیزی هاوبەش بۆ خوا دانەران و بێبڕوایان هاتۆتە دەر، چۆتە نێو ڕیزی خەڵکی ئیسلامەوە، ئەوەیە: هەر کەسێك ئەو وشەیەی گوت، هەرچی جۆری شیرکە لە خۆی دادەڕنێ، بەڵام بە مەرجێك لە قووڵایی دڵیەوەو بەساغیی و بەڕاستیی ئەوەی گوتبێ.

**بڕگەی سێزدەیەم: مرۆڤ چاری ناچارە دەبێ هەر بەندەبێ، یان بەندەی خوای بەرز، یاخود بەندەی شەیتان، بەشێوەیەك لە شێوەكان:**

ئەمیش پێشتریش ئاماژەمان پێدا و، لە زۆر شوێنی قورئاندا ئەو ڕاستییە دووبارە كراوەتەوە، بەڵام لێرەش دا چەند ئایەتێك بە نموونە دێنینەوە:

١- لە سوورەتی (**یس**)دا خوا دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴿٦٢﴾﴾، واتە: ئەی وەچەی ئادەم! ئەی ڕۆڵەكانی ئادەم! ئایا پێم ڕانەگەیاندبوون كە شەیتان مەپەرستن، ئەو بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە، هەروەها پێم ڕاگەیاندن كە تەنیا بەندایەتیی بۆ من بكەن، ئەمە ڕاستە ڕێیە، بەدڵنیایی كۆمەڵێكی زۆریشی لێتان گومڕا كردن، ئایا نەتاندەفامی؟

٢- هەروەها لە سوورەتی (**الأنعام**)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُۥ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِهِمْ لِيُجَٰدِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾﴾، واتە: هەر شتێك ناوی خوای لەسەر نەهێنراوە لێی مەخۆن، چونكە ئەوە لادانە، شەیتانەكان پەیام دەنێرن بۆ دۆستەكانی خۆیان، تاكو شەڕە قسەتان لەگەڵدا بكەن و، ئەگەر بە قسەیان بكەن، ئێوەش دەبن بە هاوبەشدانەر (بۆ خوا).

كەواتە: مرۆڤ ئەگەر خوا پەرست نەبێ، حەتمەن و بە مسۆگەریی بە شێوەیەك لە شێوەكان شەیتان دەپەرستێ، بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی (**النحل**) دا دەفەرموێ: ﴿تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی لە پێش تۆشدا بۆ كۆمەڵگایەكانی دیكەمان ناردبوو (واتە: پێغەمبەرانمان بۆ ناردبوون)، بەڵام شەیتان كردەوەكانی بۆ جوان كردن، ئنجا ئەمڕۆ ئەو دۆست و نیزیكیانەو، ئازارێكی بە ئێش و سەختیان بۆ هەیە.

**٣-** هەر لەو بارەشەوە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: {**تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ، وَعَبْدُ الدِّرْهَمِ، وَعَبْدُ الخَمِيصَةِ، إِنْ أُعْطِيَ رَضِيَ، وَإِنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ، تَعِسَ وَانْتَكَسَ**}[1] واتە: بەدبەختەو بێ مرادە کەسێك کە دەبێتە کۆیلەی دینارو، کۆیلەی درەم و، کۆیلەی جل و بەرگ، ئەگەر بیدرێتێ ڕازی دەبێ و، ئەگەر نەشیدرێتێ تووڕە دەبێ، بێمرادەو سەرەو بنە.

کەواتە: مرۆڤ وەك چۆن دەگونجێ بەندەی خوا بێ، دەشگونجێ بەندەی زێڕو بۆشاکیش بێ، کاتی خۆی زێڕ دراوی ڕۆمەکان بووە و، پێی گوتراوە: دینار، هەروەها زیویش دراوی فارسەکان بووەو پێی گوتراوە: درەم، قەتیفەش جۆرە بەرگ و پۆشاکێکی جوان بووە.

## بڕگەی چواردەیەم: هەڵوێستی خاوەنانی کوفر لە بەرانبەر بانگەوازکردن بۆ خوا بەیەکگرتنداو، شێوازەکانیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی:

ئەگەر تەماشای کۆمەڵێك لە ئایەتەکانی قورئان بکەین، بۆمان دەردەکەوێ، کە بێبڕوایان و ناحەزانی ڕێبازی خوا، هەشت جۆرە شێوازیان گرتووە بەر بۆ دژایەتییکردنی پێغەمبەرانی خواو پەیام و بەرنامەکەیان:

شێوازی یەکەم: سەرسوڕمان و پێ سەیربوون، وەك لە ئایەتی ژمارە پێنجی سوورەتی (ص)دا، خوا لەسەر زمانی بێبڕوایەکان ڕایگەیاندوە کە گوتوویانە: ﴿ أَجَعَلَ ٱلْـَٔالِهَةَ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ۝٥ ﴾، واتە: ئایا هەموو پەرستراوەکانی کردنە یەك پەرستراو؟! بەڕاستیی ئەوە شتێکی سەیرو سەرسوڕهێنەرە! دیارە خەڵك لە شتێك سەری سوڕدەمێنێ و پێی سەیر دەبێ، کە شتێکی نامۆو نەزانراوو نەبیستراو بێ، ئەوان مەبەستیان ئەوەیە کە ئەوە شتێکە پێشتر نەبووەو هەڵەیە.

شێوازی دووەم: بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خوا بەیەکگرتن، بریتی بووە لە فێڵ و نەخشە دانان، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٧٣٠، وابن ماجه: ٤١٣٥، وابن حبان: ٣٢١٨.

﴿إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ يُرَادُ ﴾ص، واتـە: دەستڕۆیشـتووەکانیان ڕۆیشـتن گوتیـان: بـڕۆن و خۆڕاگربـن لەسـەر پەرسـتراوەکانتان، ئەمـە کارێکـە دەویسـترێ، واتـە: ئـەوەی موحەممـەد ﷺ هێناویـەتی، تەگبیرێکـە لـە دژی پەرسـتراوەکانی ئێمـە.

شێوازی سێیەم: شێوازی سێیەمی ڕووبەڕووبوونـەوەی بێبڕوایان، بریتیـە لـە خۆ بەزلگریـی، وەك لـە سـوورەتی (**الصافات**)دا هاتـوە: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، واتـە: ئەوانـە (بێبڕوایـەکان) عادەتیـان وابـووە (لـە ژیـانی دنیـادا) کاتێـك گوترابایـە: جگـە لـە خـوا هیـچ پەرسـتراوێك نیـە، خۆیـان بـە زلدەگرت.

شێوازی چـوارەم: دڵ تێکهەڵاتـن و دڵناڕەحەتیـی، وەك خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْأَخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾، واتـە: کاتێـك بـە تەنیا بـاسی خـوا بکـرێ، ئەوانـەی بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، دڵیـان دەگـووشرێ و تێکهەڵـدێ، بـەڵام کاتێـك ئەوانـەی دیکـەی جگـە لـە خـوا بـاس بکرێـن، دڵخـۆش دەبـن.

شـێوازی پێنجـەم: سـڵەمینەوەو دوورکەوتنـەوە، وەك لـە سـوورەتی (**الإسراء**) دا هاتـوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْاْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴾، کاتێـك بـە تەنیـا بـاسی پـەروەردگارت بکـەی، ئەوانـە پاشـەو پـاش دەکشـێنەوەو دەسـڵەمنەوە.

شێوازی شەشـەم: هەوڵـدان بـۆ ناشـیرین کـردنی سـومعەو نـاوو ناوبانگـی کەسێك کـە بانگـەوازکاری خـوا بـە یەکگرتنـە، وەك لـە سـوورەتی (**الصافات**)دا هاتـوە: ﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ ﴾**الصافات**، (بێبڕوایـەکان) دەڵێـن: ئایـا ئێمـە واز لێهێنـەری پەرسـتراوەکانمان بیـن بـۆ شـاعیرێکی شـێت؟ واتـە: پێغەمبـەر موحەممەدیـان ﷺ تۆمەتبـار کـردوە بـە شـیعر گوتـن و شـاعیریی، هەروەهـا بـە شـێتیی!

شـێوازی حەوتـەم: شـێواندنی بانگەوازەکـە، وەك لـە سـوورەتی (**فصلت**)دا هاتـوە: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾، واتە: ئەوانەی

بێبڕوان گوتیان: گوێ بۆ ئەم قورئانە مەگرن و غەڵبە غەڵبی تێدا بکەن، (دەنگە دەنگی تێدا بکەن) بۆ ئەوەی بەسەریدا زاڵ بن، واتە: تەشویش و شێواندن لە بانگەوازەکەدا پەیدا بکەن.

شێوازی هەشتەم و کۆتایی: کە من کەوتۆتە بەر چاوم، بریتیە لە ترساندن و هەڕەشە لێکردن، وەك لە سوورەتی (الشعراء)دا، هاتوە: ﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، دیارە فیرعەونە بە مووسا ﷺ دەڵێ: ئەگەر تۆ جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەت هەبێ، دەتخەمە گەڵ گیراوان، یانی: ئەوانەی دیکەی گرتوومن وەك تۆ.

کەواتە: بە سەرنجادانی ئەم هەشت شێوازەی دوژمنانی خوا بەیەکگرتن (توحید) بە درێژایی مێژوو گرتوویاننە بەر، بۆمان دەردەکەوێ ئێستاش لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هەر هەمان ئەو شێوازانەن، بۆ دژایەتیی خواو پێغەمبەران بە کاردێن، بەڵام لە دیکۆرو فۆڕمی تازەدا دووبارە دەکرێنەوە.

### بڕگەی پازدەیەم: تەنیا بە پەرستراو دانانی خوا ﷻ و پەرستنی، شتێکی ڕیشەدارە لە زگماکی بەشەردا، بەڵام زانینی چۆنیەتییەکەی، پەکی لەسەر وەحیی کەوتوە:

خوای میهرەبان ئەم ڕاستییەمان زۆر جوان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾الروم، واتە: دەجا ڕووی خۆت ڕێککە بە پاکیی (یاخود: بە گەڕاوەیی لە هەرچی ناهەقە بەرەو هەق) ئەوە ئەو زگماکەیە خوا ﷻ خەڵکی لەسەر سرووشتاندوە، گۆڕین نیە بۆ دروستکراوی خوا، ئا ئەوەیە ئایینی ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

کەواتــە: بــە پاکیــی ڕووکردنــە خــوا ﷻ، هەمــان زگــماك و خــوا ڕســکە کــە خــوا مرۆڤــەکانی لەســەر خوڵقانــدوون، ئــەو زگماکــەی خــواش ناگــۆڕێ، بــەڵام دەگونجــێ مرۆڤــەکان دەســتکاریی بکــەن، کــەم و زۆر، وەك خــوای بــەرز لــە فەرمایشــتێکی قودســییدا دەفەرمــوێ: {**خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمُ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ**}[1] واتــە: بەنــدەکانی خــۆم ســاغ و پــاك و چــاك خوڵقاندبــوون، بــەڵام شــەیتانەکان بــە دەوریانــدا هاتــن و چــوون و لایانــدان.

هــەر لــەو بــارەوە ئــەو فەرمایشــتەی پێغەمبەریــش ﷺ دێنیــن کــە خــوا ناســیی و، تەنیــا خــوا بــە پەرســتراوی خــۆ دانــان و، پــەروەردگارو بــە خــاوەن و بــە بەدیهێنــەری خــۆ دانــان، شــتێکی ڕیشــەدارو ڕۆچوویــە لــە سرووشــت و زگــماکی مرۆڤەکانــدا:

{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه **قَالَ: النَّبِيُّ** ﷺ: **مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلاَّ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِهِ، أَوْ يُمَجِّسَانِهِ، كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَمْعَاءَ، فَهَلْ تَرَوْنَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ!**} (**رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ: ١٣٥٩، وَمُسْلِمٌ: ٦٦٩٩، وَأَبُو دَاوُدَ: ٤٧١٤**)، واتــە: ئەبــوو هورەیــرە خــوا لێــی ڕازی بــێ دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: هەمــوو منداڵێــك لەســەر سرووشــتی خواپەرســتیی و خواناســیی لــە دایــك دەبــێ، دوایــی دایــك و بــاب دەیکەنــە جوولەکــە، یــان دەیکەنــە نەصرانیــی، یــان دەیکەنــە ئاگرپەرســت، (وێنــە دێنێتــەوەو دەفەرمــوێ:) وەك چــۆن بەچکــەی ئــاژەڵ کــە لــە دایــك دەبــێ، بــە ســاغ و ســەلامەتیی لــە دایــك دەبــێ، ئایــا دەبینــن هیــچ کامیــان گوێــی بــڕا بــێ، یاخــود داغ کــرا بــێ؟

نەخێــر، بەڵکــو مرۆڤەکانــن کــە دوایــی دەســتکاریی دەکــەن، واتــە: بەشــەر لــە ئەســڵی سرووشــت و **فیطرە**تیــدا خواناســە، بــەڵام دوایی ژینگــە دەیگــۆڕێ و مرۆڤەکان دەســتکاریی دەکــەن و، بــەو شــێوەیەی لــێ دەکــەن.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٧٥١٩، ومسلم: ٢٨٦٥.

## بڕگەی شازدەیەم: ناگونجێ مرۆڤەكان بە دیداری خواو ڕەزامەندیی خوا بگەن، مەگەر بەهۆی كردەوەی چاك و خوا پەرستیی ساغەوە:

وەك لـە سـووڕەتی (**الكهف**)دا خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾ ﴾**الكهف**، خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: بڵـێ مـن تەنیـا مرۆڤێكی وەك ئێـوەم، بـەڵام سرووشـم بـۆ لا دەكـرێ (وەحییـم بـۆ لا دەنێـردرێ) كـە پەرسـتراوی ئێـوە یـەك پەرسـتراوە، ئنجـا هـەر كەسـێك بـە تەمـای دیـداری پەروەردگاریـەتی (لـە بەهەشـت دا) بـا كـردەوەی بـاش بـكات و لـە پەرسـتنی پەوەردگاریشـیدا، هیـچ كـەس نەكاتـە هاوبـەش.

كەواتـە: بەبـێ كـرداری بـاش، كە باشـترین كـرداری بـاش ئەوەیە خوا ﷻ بپەرسـترێ بـە سـاغیی و بـە بـێ خڵتەیـی، خڵتـەی شـیرك و بیدعـەت و ڕیـای تێكـەڵ نەبـێ، بەبـێ ئـەوە مـرۆڤ نـاگات بـە ڕەزامەندیـی خـواو، ناگاتـە ئـەوەی خـوا بـە دیـداری خـۆی شـادی بـكات، هـەر بۆیـەش پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هۆشـداریی زۆری داوە بـە ئۆممەتەكـەی، كـە وریـا بـن لـە خۆشویسـتنی پێغەمبـەردا ﷺو لـە ڕیـز لێگرتنیـدا، تێنەپەڕێنـن، لـە سـنووری خـۆی بەولاوەتـری نەبـەن، بیبەنـە سـنووری خـوا ﷻ، وەك لـە یەكێـك لـە فەرموودەكانیـدا فەرموویـەتی: {**لا تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النَّصَارَىٰ عِيْسَى بْنَ مَرْيَمَ، فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ، فَقُولُوا: عَبْدُ اللهِ ورسولُهُ**} (**أخرجه البخاري: ٢٥٨٦**)، واتـە: بـە مـن هەڵامەڵێـن و تـێ مەپەڕێنـن لـە مـەدح و ستایشـم دا، وەك نەصرانییـەكان لـە پێـدا هەڵگوتـن و ستاییشـكردنی عیسـای كـوڕی مەریەمـدا تێیـان پەڕانـد، (كـە گوتیـان كـوڕی خوایـە)، بەڵكـو مـن تەنیـا بەنـدەم، بڵێـن: بەنـدەی خـواو ڕەوانەكـراوی خـوا.

كەواتـە: هیچكـەس بـۆی نیـە بـە بیانـووی خۆشویسـتنی پێغەمبـەرەوە ﷺ، لـە پێگـەو مەقامـی خـۆی كـە بەندایەتییـە بـۆ خـواو، پێغەمبەرایەتییـە، بیباتـە دەر، بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـاسی نەصرانییـەكانی كـردوە، چونكە ئێسـتاش لەگەڵدابێ

لە ئینجیلەكانی نەصرانییەكاندا - كە خوا ئینجیلێكی بۆ عیسا ناردوە، بەڵام ئەوان ئێستا چوار ئینجیلییان بە ڕەسمیی هەن - ئێستاش زۆر بە ڕوونیی باسی ئەوە دەكرێ، كە عیسا ﷺ بەشێكە لە خوا، بۆ وێنە[1]:

لە: (**شرحُ رسالة بولس إلى مؤمني كولوسي**)دا هاتوە، دەڵێ: (**وَيَجِبُ عَلَينا مِثلُ المُؤمِنِينَ لِكولُوسِي نؤمِنَ بِألُوهيَّةِ اليَسُوعِ المَسِيح أَي: أَنَّ اليَسُوعَ المَسِيح هُوَ الله، وَإِلاَّ يُصبِحُ إِيمانُنَا أَجوَفَ بِلا أن هَدَفٍ وَلا مَعنَى، هَذَا هُوَ الحَقُّ الرئيسِيُّ في المَسِيحِيَّة**).

واتە: پێویستە لەسەرمان وەك بڕوادارانی كۆڵۆسیی بڕوابێنین بە پەرستراوێتیی یەسووعی مەسیح، واتە: كە یەسووعی مەسیح خوایە، (پاكیی بۆ خوا)، ئەگەرنا بڕوایەكەمان دەبێتە بڕوایەكی بۆشی بێ ئامانجی بێ ماناو، ئەوەش ئەو هەقە سەرەكییەیە كە لە مەسیحییەتدا هەیە.

مەسیحییەتی ئێستا عیسا بە بەشێك لە خواو بە خوا دادەنێن، لە ئەنجامی تێپەڕاندنیاندا لە خۆشویستن دا.

## بڕگەی حەڤدەیەم: ئیسلامی هەق لە خوا بە یەكگرتندا، لە پەرستراوێتیی خوادا بەرجەستە دەبێ:

وەك خوا لە سوورەتی (الأنبياء)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ إِنَّمَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٨﴾ ﴾، خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: بڵێ: من پەیامم بۆلا دەنێردرێ (سرووشم بۆلا دەكرێ) كە پەرستراوی ئێوە یەك پەرستراوە، ئنجا ئایا ئێوە ملكەچن؟

واتە: خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: تۆ بڵێ: ئاوا سرووشم بۆلا كراوەو، پەیامم بۆ نێردراوە كە پەرستراوی ئێوە تەنیا یەكێكە كە خوایە ﷻ، ئنجا ئایا ئێوە ملكەچن بۆ خوا؟ ئەگەر ئەو هەقەتان وەرگرتبێ و هەزم

---

(١) (التفسير التطبيقي للعهد الجديد) لاپەڕە (٧٠٠)، چاپی (١٩٩٦).

کردبێ و پێوەی پابەندبن، مانای وایە ملکەچن بۆ خوا، بۆیە ناوی مسوڵمانتان شایستەیە، ئەگەرنا هەر کەسێك ئەو ڕاستییە مەزنە کە کاکڵ و جەوهەرو بناغەی مسوڵمانەتییە وەرنەگرێ، بێگومان ناوی مسوڵمانەتیی لێ خەسارە.

**بڕگەی هەژدەیەم: خواپەرستیی ڕاستەقینە بۆ خوای بەرز، وا لە مرۆڤ دەکات بە سەرجەم خەسڵەتە پەسندەکان بڕازێتەوە و بژار بکرێ و پاك بێتەوە لە هەرچی خوو و خدەی خراپ و ناپەسندە:**

ئەوەی ئەم ڕاستییە زۆر جوان دەگەیەنێ، ئەم دوازدە ئایەتەی سووڕەتی **(الفرقان)**ن:

﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَٰمًا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتْ مُسْتَقَرًّا وَمُقَامًا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُوا۟ لَمْ يُسْرِفُوا۟ وَلَمْ يَقْتُرُوا۟ وَكَانَ بَيْنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ يَلْقَ أَثَامًا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفْ لَهُ ٱلْعَذَابُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِٱللَّغْوِ مَرُّوا۟ كِرَامًا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا۟ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ ﴾.

ئەوانە سەرجەم شازدە (١٦) سیفەتن، خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەی کۆتایی سووڕەتی **(الفرقان)**دا هێناوی:

یەکەم و دووەم: ڕۆیشتن بە ئارامیی و، خۆ نەهێنانە ئاستی کەسانی نزم و نەفام.

سێیەم و چوارەم: شەو نوێژ کردن و، زۆر مانەوە لە کڕنووش بردن و لە وەستاندا لە خزمەت خوای پەروەردگارداو، داوای بەزەیی لە خوا کردن و پەنا بە خوا بردن بە خوا لە ترسی دۆزەخ.

پێنجەم و شەشەم: لە بواری کارو کاسبییدا میانجیی بوون و، خۆپارستن لە هەردوو سیفەتی خراپی زێدەڕۆیی و چەنگ قوچاویی و چرووکیی.

حەوتەم: لە بواری ئیماندا، ئەوانە ئەهلی تەوحیدن، تەنیا خوا دەپەرستن و خۆیان لە شیرك دەگرن.

هەشتەم و نۆیەم: لە بواری ڕا هێنانی هێزی تووڕەیی و ئارەزوویان دا، خۆیان کۆنتڕۆڵ دەکەن و، بە هەق نەبێ کەس ناکوژن و، خۆشیان لە داوێنپیسیی دەپارێزن.

دەیەم و یازدەیەم: لە کاتێکدا تووشی هەڵەیەکیش دەبن، لەسەر ئەو هەڵەیە هەرچی بێ، بەردەوام نابن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، نائومێد نابن لە بەزەیی خوا ﷻ، ئەوەی تێکیانداوە لە ڕابردوودا بەهۆی تاوان و گوناهەوە، چاکی دەکەنەوە.

دوازدەیەم و سێزدەیەم: لە بواری مامەڵە لەگەڵ کۆڕو مەجلیسەکان و ئەو شوێنانەی گوناهو تاوانیان تێدا دەکرێن، یاخود بە لای کەمەوە خەڵکەکەیان غافڵن بە قسەو کرداری پووچەوە، لەو بوارەدا، لەو کۆڕو مەجلیسانە بەشدار نابن و، کاتێك بەوێدا دەڕۆن بە حورمەت و ڕێزەوە بەلایاندا ڕەت دەبن.

چواردەیەم: لە بواری مامەڵەیان لەگەڵ ئایەتەکانی خوادا، چ ئایەتە خوێندراوەکانی، چ ئایەتە بینراوەکانی، هەڵوێستەکەیان لەوەدا بەرجەستە دەبێ کە گوێ هەڵدەخەن بۆ ئایەتەکانی خواو، چاو ورد دەکەنەوە لە دیتنی و سەرنجدانی نیشانەکانی خوادا.

پازدەیەم: لە بواری ماڵ و منداڵیان دا، دوای ئەوەی زۆر هەوڵ دەدەن چاکیان پەروەردە بکەن، لە خوای بەرزیش دەپاڕێنەوە کە بەهۆی چاکیی ئەوانەوە دڵخۆش و شادمان بن لە دنیاو دوارۆژدا.

شازدەیەم: لە کۆتاییی دا بەندەکانی خوا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە کە شایستەی ئەوەیان بکات و بیانکات بە شایستەی ئەوەی پێشەوابن بۆ پارێزکاران.

## بڕگەی نۆزدەیەم: بەندایەتیی ساغ و تێرو تەواو بۆ خوا، هۆکاری ئەوەیەکە بڕواداران شایستەی جێنشینایەتیی کردنی خوای پەروەردگاربن لەسەر زەوی:

وەك لە سوورەتی (النور)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٥٥﴾ ﴾النور، ڕاستە مانای ئەم ئایەتە بە پێزە بەم شێوەیە: خوا بەڵێنی بەوانەتان داوە کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، بیانکاتە جێنشین لەسەر زەوی، وەك چۆن ئەوانەی پێش ئەوانیشی کردبوونە جێنشین (لەسەر زەوی)و ئەو ئایینەی بۆی هەڵبژاردوون (ئەو بەرنامەیە) بۆیان بچەسپێنێ و، ترس و بیمیان بۆ بگۆڕێ بە هێمنیی و ئاساییش (بەڵام) بەندایەتییم بۆ بکەن، هیچ شتێك نەکەنە هاوبەشم، هەر کەسێکیش دوای ئەوە بێبڕوابێ (یاخود: سپڵە بێ) هەر ئەوانەن لادەران.

کەواتە: لە ئەنجامی تەنیا خواپەرستیی و باش خوا پەرستنداو، هاوبەش بۆ خوا دانەناندا، مسوڵمانان شایستەیی ئەوەیان بۆ پەیدا دەبێ، خوا ﷻ بیانکاتە جێنشین لەسەر زەوی و، ئایین و بەرنامەکەییان بۆ بچەسپێنێ و، ئەوانیش بکاتە باڵا دەست لەسەر زەوی.

**بڕگەی بیستەم: بەهەشــت تایبەتە بە کەســانێکەوە کە تەنیــا خواپەرستن، خواپەرستیی ساغ بۆ خوای بەرز دەکەن و، جگە لەوان هیچکەس بەشی بە بەهەشتەوە نیە:**

ئەمیــش لــە ئایەتــەکانی: (١٠٥ و ١٠٦ و ١٠٧)ی ســووڕەتی (الأنبیــاء)دا زۆر جــوان دەروشــێنراوەتەوە، کــە خــوا دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ ﴿١٠٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾الأنبیاء، واتــە: بــە دڵنیایــی ئێمــە لــە زەبــووردا دوایــی زیکــر (زۆربــەی زانایــان دەڵێــن: (**ذکــر**) واتــە: تــەوڕات) تۆمارمــان کــردوە کــە ســەر زەمینــی مــن بەنــدە چاکەکانــم (بەنــدە شایســتەکانم) بــە میــراتی دەگــرن، لــەوەدا گەیانــدن هەیــە بــۆ کۆمەڵێــك پەرســتەربن بــۆ خــواو، تۆشــمان نەنــاردوە (ئــەی موحەممــەد) مەگــەر بــە بەزەیــی بــۆ تێکــڕای جیهانییــان.

کەواتــە: لــە ئەنجامــی چــاك خــوا پەرستندا، مــرۆڤ لێوەشــاوەیی و شایســتەیی ئــەوەی پەیدادەبــێ ســەر زەمیــن (چ ســەر زەمینــی دنیــاو چ ســەر زەمینــی بەهەشــت) بــە میــرات بگــرێ، چونکــە خــوای پــەورەردگار ئەوێــشی هــەر ناونــاوە ســەر زەمیــن، پێغەمبــەری خاتەمیــش ﷺ تەنیــا بــە ڕەحمــەت و بەزەیــی نێــردراوە بــۆ هەمــوو جیهانییــان، خــوای بــەرزو مــەزن لــە سووڕەتی (**الزمر**)دا لــە ســەر زمــانی بڕوادارانێــك کــە لــە بەهەشــتدا نیشــتەجێ دەبــن، فەرموویــەتی: ﴿ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاءُ فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾، گوتیــان: ســتایش بــۆ ئــەو خوایــەی بەڵێنــی لەگــەڵ ڕاســت بردینــە ســەرو ســەر زەمینــی پــێ دایــن (ســەر زەمینــی بەهەشــت) لــە هــەر شــوێنێك بمانــەوێ لــە بەهەشــتدا نیشــتەجێ دەبیــن، باشــترین پاداشــت پاداشــتی بکەرانــە (ئەوانــەی بــۆ خــوای پــەروەردگار کاریــان کــردوەو تێکۆشــاون).

کەواتـە: بەهەشـت تایبەتـە بـە کەسـانێکەوە کـە خواپەرسـتن و تەنیـا بەندایەتیـی بـۆ خـوا دەکـەن و، هاوبـەش بـۆ خـوا دانانێـن، خواپەرسـتیی و خـوا بەیەکگرتـن هـۆکاری ئەوەیـە خـوا مـرۆڤ دەستڕۆیشـتوو بـکات و باڵادەسـتی بکات لەسـەر زەوی (سـەر زەوی دنیـا)، هەروەهـا لـە دواڕۆژیـش دا شایسـتەیی ئـەوەی هەبـێ، بچێتـە بەهەشـتەکانی خـواوە، بەڵـێ تەنیـا خواپەرسـتییەو ئـەوە کـە مـرۆڤ بـە سـاغیی و بەڕاستیی بەندایەتیـی بـۆ خـوا بـکات و هاوبـەشی بـۆ دانەنـێ، دەسـتەبەرکەری ئـەو شایسـتەییەیە لـە مـرۆڤ دا کـە لـە دنیـاو دواڕۆژدا بـە مـراد گەیشـتوو و سـەرفراز بێ.

ئەمـە کورتـە باسـێك بـوو لـە بـارەی خواپەرسـتییەوە، خـوا بـە لوتـف و کەڕەمـی بـێ سـنووری خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە خواپەرسـتی ڕاسـتەقینە دەبـن، بـە دڵ و دەروونیـان و بـە ڕواڵـەت و جەسـتەیان، لـە ژیـانی تاکییـان و، لـە ژیـانی خێزانییـان و، لـە ژیـانی کۆمەڵایەتییانـداو، لـە هەڵسـووکەوتی سیاسییانداو، لـە هەمـوو بـوارو ڕەهەنـدەکانی دینداریـی و دنیادارییانـدا، پێـش هەمـوو کـەس حیسـاب بـۆ خـوا دەکـەن و، ڕەزامەندیـی خـوا لەسـەرووی هەمـوو شـتێکەوە دادەنێـن و، تاکـە ئامانجێـك کـە بـۆی دەژیـن، ئەوەیـە کـە لـەم ژیانـە دنیاییەیانـدا بتوانـن ڕەزامەندیـی خـوا وەدەسـتبێنن، بەهەشـتی خـوای پـەروەردگار دەسـتەبەر بکـەن، بەهـۆی چـاك خواپەرسـتن و چـاك بەندایەتیـی کـردن بـۆ خـواو، خـۆ سـاغکردنەوە بـۆ بەندایەتیـی بـۆ خـواوە ﷻ، لێرەشـدا کۆتایـی بـە تەفسـیر کـردنی سـوورەتی (قریـش) دێنیـن.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمڕۆ کە (٢/ ١/ ١٤٤٢)ی کۆچییە، بەرانبەر: (٢٠٢٠/٨/١٢) زایینیی، لە شاری هەولێر، خوا پشتیوان بێ، دەست دەکەین بە تەفسیرکردنی سوورەتی (**الماعون**)و، سەرەتاش لە حەوت بڕگەدا پێناسەو نێوەڕۆکی سوورەتەکە دەخەینەڕوو.

## پێناسەی سووڕەتی (الماعون) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ناوی باوی ئەو سوورەتە موبارەکە (**سورة الماعون**)ە، بەڵام وێڕای ئەم ناوە، پێنج ناوی دیکەشی بۆ بەکارهێنراون: (**سورة أرءيت، سورة أرءيت الذي، سورة الدين، سورة التكذيب، سورة اليتيم**)، ئەو ناوانەشی کەم و زۆر بۆ بەکارهێنراون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

زۆربەی زۆری زانایان ئەم سوورەتە بە مەککەیی دادەنێن، هەندێکیشیان بە مەدینەییان داناوە، هەندێکیش سێ ئایەتی سەرەتایان بە مەککەیی و، ئەوانەی دیکەشیان بە مەدینەیی داناون، لەو بارەوەش ئەو دەقە دێنین:

(**عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَبَّاس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: أُنْزِلَتْ:** (أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾) **بمكة**)، (**ذكره السيوطي في الدر المنثور:** ج٨، ص٦٤١، **ونسبه لابن مردويه، وذكر أن ابن مردويه أخرج مثله عن ابن الزبير، الإستيعاب في بيان**

**الأسباب: ج٣، ص٥٦٣**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) گوتوویەتی: سوورەتی ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١﴾، لە مەککە دابەزیوە، هەروەها (**ابن مردویە**)، هەمان شتیشی پاڵداوەتە لای (**عبداللە بن الزبیر**)، خوا لە ئەویش و لە بابیشی ڕازی بێ.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئەم سوورەتە موبارەکە لە (مصحف)دا، ژمارەکەی سەدو حەوت (١٠٧)ەو، لە دابەزینیشدا ژمارەکەی حەڤدە (١٧)یە، پێش سوورەتی (**الكافرون**) و، دوای سوورەتی (**التكاثر**) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

زۆربەی هەرە زۆری ژمێرەران بە شەش (٦)یان داناون، هەندێکیشیان بە حەوت (٧)یان داناون و، ژمارە حەوتەکەش لە موصحەفەکانی لای ئێمەدا تەبەننیی کراوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە، بریتیە لە پێناسەی بابای بێبڕوا بە سزاوپاداشت (**الدین**)، واش پێدەچێ (**دین**) مەبەست پێی سزا و پاداشت بێ، کە بە تێوەخوڕو پاڵپێوەنەری هەتیوو، هانەدەر بۆ خواردنی نەدار پێناسەی دەکات، دواتریش سزای سەخت بۆ نوێژکەری لە نوێژەکەی بێ ئاگای ڕیابازی هاوکاریی گرەوە، دادەنێ، واتە: خوا ﷻ پێناسەی کەسێك دەکات کە بڕوای بە سزاو پاداشتی خوا نیە و، ئەو پێنج سیفەتە خراپەی تێدان:

١- پاڵپێوەنەری هەتیو بە توندیی و دەرکەری و پاڵەستۆدەری، لە جیاتی ئەوەی هاوکاریی بکات و دەستی بەسەر دابێنێ.

٢- هاننەدانی خەڵك بۆ خواردن دان بە نەدار، واتە: ئەوە هیچ کە خۆی یارمەتیی نەدار نادات، بگرە هانی خەڵکیش نادات، بۆ هاوکاریی کردنی.

٣- نوێژ دەکات، بەڵام لە نوێژەکەی بێئاگایەو، نازانێ چی کردو چۆنی کرد!

٤- ڕییابازیی دەکات بۆ بەرچاوی خەڵك و، کردەوەیەك کە تەنیا بۆ خوا دەکرێ، ئەو کاتێك سەرنجی خەڵك بە لای خۆیدا ڕابکێشێ، ئەنجامی دەدات، بەڵام ئەگەر خەڵکی لێ نەبێ، ئەنجامی نادات.

٥- هاوکاریی لە خەڵك دەگرێتەوە، شتێك کە پێویست بێ دەستی خەڵکی پێ بگرێ و هاوکاریی خەڵکی پێ بکات، دەستی لێ دەگرێتەوەو، ئامادەنیە هاوکار و دەستبارگری خەڵك بێ.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لەم سوورەتەدا سێ تایبەتمەندیی سەرەکییمان کەوتوونە بەرچاو:

١- پێناسەکردنی بە درۆ دانەری سزاو پاداشت، بەوەی دەرکەری هەتیوو و هاننەدەری خۆراکدانە بە بابای نەدار، ئایەتەکانی: (**١ و ٢ و ٣**).

٢- سزای سەخت ناردن بۆ نوێژکەری لە نوێژی خۆی بێ ئاگای ڕیابازی یارمەتیی و هاوکاریی گرەوە لە خەڵك، ئایەتەکانی: (**٤ و ٥ و ٦ و ٧**).

٣- هاتنی وشەی (**الماعون**)، کە تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە، هەر بۆیەش بەو ناوەوە ناونراوە.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە هەر حەوت ئایەتەكەی ئەم سوورەتە موبارەكە، دەكەینە دەرسێك لەبەر ئەوەی هەموویان بەیەكەوە پەیوەستن.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هـەر حـەوت (٧) ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێکـدێ، کـە تێیانـدا پێناسـەی بابـای بـە درۆ دانـەری سـزاو پاداشـت کـراوە، بـە پێنج خەسـڵەتی زۆر خـراپ:

١- پاڵپێوەنەری هەتیو بە توندیی و دەرکەری و پاڵەستۆدەری، لە جیاتی ئەوەی هاوکاریی بکات و دەستی بەسەر دابێنێ.

٢- هاننەدانی خەڵك بۆ خواردن دان بە نەدار، واتە: ئەوە هیچ کە خۆی یارمەتیی نەدار نادات، هانی خەڵکیش نادات، بۆ یارمەتییدانی!

٣- نوێژ دەکات، بەڵام لە نوێژەکەی بێئاگایەو، نازانێ چی کردو چۆنی کرد!

٤- ڕیابازیی دەکات بۆ بەرچاوی خەڵك، کردەوەیەك کە تەنیا بۆ خوا دەکرێ، ئەو کاتێك سەرنجی خەڵك بە لای خۆیدا ڕابکێشێ، ئەنجامی دەدات، بەڵام ئەگەر خەڵکی لێ نەبێ، ئەنجامی نادات.

٥- هاوکارییەك کە بۆ ئەو هیچی تێناچێ، لە خەڵك دەیگرێتەوە، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، (**الماعون**)، زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: ناوە بۆ ئەو کەل وپەلانەی خەڵك لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریان دێنن، ماڵە دراوسێیەك دەنێرێ بۆ ماڵی دیکەی دراوسێیان، مەنجەڵم وێیدە، یان چەقۆیەکی پێویستە، یاخود مشارێکی پێویستە، شتی پێ دەبڕێتەوە، یان شتێکی دیکەی پێویستە بە شێوەیەکی کاتیی و، دوایی بۆی دەگێڕێتەوە، کەچی ئەو ئامادەنیە ئەو کەمە هاوکارییانەش بکات!

هەندێـکی دیکـەش لـە زانایـان گوتوویانـە: (**الماعـون**)، هـەر شـتێکە سـوودی بـۆ خەڵـك هەبـێ، هـەر لـە مـاڵ و سـامانەوە بگـرە، تاکـو هـەر شـتێکی دیکـە، خـوا ﷻ

ئـەم سـوورەتە موبارەكـەی تەرخانكـردوە بـۆ پێناسـەكردنی بابایـەكی بێبـڕوا بـۆ ڕۆژی سـزاو پاداشـت، یاخـود بێبـڕوا بـە ئاییـن و، بـەو پێنـج خەسـڵەتە خراپـە پێناسـەی دەكات.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە . ئایـا ئـەو كەسـەت دی (بـە چـاوی عەقڵ و دڵ) كـە سـزاو پاداشـتی بـە درۆ دانا؟ ﴿١﴾ ئـەوە كەسـێكە هەتیـو پاڵەسـتۆ دەدات ﴿٢﴾ هـانی (خەڵك)یـش نـادات لەسـەر خـواردن (پێـدان)ی نـەدار ﴿٣﴾ دەجـا سـزای سـەخت بـۆ نوێژكەرانێـك ﴿٤﴾ ئەوانـەی لـە نوێژەكانیـان بێئـاگان ﴿٥﴾ ئەوانـەی ڕیابازیـی دەكـەن ﴿٦﴾ ئەوانـەی ڕێگریـی لـە هاوكاریـی دەكـەن، (دەسـت لـە هاوكارییكـردن دەگرنـەوە) ﴿٧﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بِٱلدِّينِ): (الدِّيـنُ يُقَـالُ للطَّاعَـةِ وَالجَـزَاءِ، وَاسْـتُعِيرَ لِلشَّرِيعَـةِ)، وشـەی (الديـن)، هـەم بـە مانـای فەرمانبەریـی، هـەم بـە مانای سزاو پاداشـت دێ و، خوازراویشـەتەوە بـۆ بەرنامـە (ی خـوا).

(يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ): (الدعُّ: الدَّفْعُ الشَّدِيدُ، وَأَصْلُهُ أَنْ يُقَالَ للْعَاثِر: دَعْ دَعْ)، (يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ )، (يَدُعُّ) کرداری ئێستا (فعل مضارع)یە، لە (دَعّ)ەوە هاتوە، (دَعَّهُ أي: دَفَعَهُ بِشدَّة)، بە توندیی پاڵی پێوەنا، بۆیە من بە کوردیی بە پاڵەستۆدانم مانا کردوە، پاڵەستۆدان ئەوەیە بە توندیی پاڵیپێوە بنێی، وشەی (دَع): لە ئەسڵدا لەوەوە هاتوە، کە کەسێك دەکەوێ پێی بگوترێ: (دَعْ دَعْ)، یانی: لێیگەڕێ لێیگەرێ، ئەو کەوتن و هەڵەنگوتنەت، گوێی پێ مەدە، لەوەوە هاتوە.

( وَلَا يَحُضُّ ): (الحَضُّ: التَّحْرِيضُ كَالحَثِّ)، (حَضّ) بۆ هاندانەو وەك (حثّ) وایەو مانایەکەیان لێك نیزیکە (وَأَصْلُهُ مِنَ الحَثِّ عَلَى الحضيض، وهوَ قَرَارُ الأرض)، وشەی (حَضّ) لە ئەسڵدا لەوەوە هاتوە، کەسێك هانبدەی لەسەر ژێرەوەو تەختی زەوی، یانی: بە تەختی زەوییەوە نووسان.

(سَاهُونَ): (السَّهو: خَطَأٌ عَنْ غَفْلَةٍ)، (سَهْوُ): بریتیە لە بەهەڵە داچوونێك بەهۆی بێئاگاییەوە، (السَّهو: الغَفْلَة، فَهُوَ سَاهٍ وَسَهْوَانٌ)، (سَهْو): بەبێئاگاییش دەگوترێ، دەگوترێ: (فَهُوَ سَاهٍ وَسَهْوَانٌ)، هەردووکیان ناوی بکەرن، یانی: بێئاگا، یاخود بەهەڵەداچوو.

(يُرَآءُونَ ): دەگوترێ: (راءاه، مُراءاةً ورِءاءً ورِياءً: أراه أنَّهُ مُتَّصِفٌ بالخيرِ والصَّلاح على خلافِ ما هو عليهِ)، ئەم وشانە هەموویان بەکاردێن (راءاه) پێشانی دا، (مُراءاة ورِءاءً ورِياءً)، هەرسێکیان چاوگن، واتە: پێشانی کەسێکیدا کە خۆی ڕازاندۆتەوە بە چاکیی و بە شایستەیی، لە حاڵێکدا حاڵی بە پێچەوانەوەیە، بە کوردیی هەر دەڵێن: ڕیابازیی، یاخود: ڕوودەرباییی.

(ٱلۡمَاعُونَ): (الماعون: إسم جامعٌ لمنافعِ البيت)، (ماعون): ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی لە ماڵدا بەسوودن، هەروەها هەندێك گوتوویانە: (الماعون: المعروف)، واتە: شتی پەسەندو چاك، هەندێکیش گوتوویانە: (ماعون)، واتە: زەکات (مَعْن: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ قَلِيْلاً كَانَ أَوْ كَثِيْرَاً)، وشەی (مَعْن)، هەر شتێکە مرۆڤ سوودی لێ ببینێ و لێی بەهرەمەند بێ، کەم بێ، یاخود زۆر.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە

ئەم گێڕدراوە هەیە دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە:

**(عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ يَسْتَعِيرُونَ مِنَ الْمُنَافِقِينَ الدَّلْوَةَ وَالقِدرَ والفأسَ وَشِبْهَهُ، فَيَمْنَعُونَهُمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ:** ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ ﴿أَرَءَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ ﴿١﴾ فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ ﴿٢﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ ﴿٣﴾ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾، **(أوردهُ السيوطي في الدرّ المنثور: ج٨، ص٦٤٤ ونسبهُ لابن مردويه، الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ٥٦٣).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: مسوڵمانان لە مونافیقەکان، دۆڵچە (کە ئاوی پێ لە بیر هەڵدەهێنجن) هەروەها مەنجەڵ و تەورو تەرداس و وێنەی ئەوانەیان لە مونافیقەکان وەرگرت و لێیان دەخواستن، ئەوانیش پێیان نەدەدان، لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم سوورەتەی دابەزاند.

هەڵبەتە ئەگەر ئەم هۆی هاتنە خوارەوەیە ڕاستیش بێ، تەعبیر دەکات لە بەشێك لە چەمك و واتای ئەو سوورەتە موبارەکە، ئەگەرنا وەك دوایی باسی دەکەین، چەمك و واتای ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، زۆر فراوانن و، ئەگەر ڕای مەککەیی بوونی ئەم سوورەتەش هەڵبژێرین، لەگەڵ ئەم هۆی هاتنە خوارەوەیەدا تێکدەگیرێ، مەگەر بڵێین: سوورەتەکە لە مەککە دابەزیوە، بەڵام چەمك و واتایەکەی، ئەو ڕەفتارەی دەغەڵ و مونافیقەکانی مەدینەش دەگرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای پـەروەردگار سـەرەتا دەفەرمـوێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: خوێنـدنی ئـەم سـوورەتە قورئانـە، دەسـت پـێ دەکـەم، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، کـە وەك زۆرجـاران گوتوومانـە: پێویسـتە بـەلای کەمـەوە چـوار واتـا لـە عەقـڵ و دڵـدا ئامـادە بکرێـن، لـە کاتێکـدا مـرۆڤ دەڵـێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ١﴾، ئایا ئەو کەسـەت دی کـە بـە دیـن بێبڕوایـەو بـە درۆی دادەنـێ، وشـەی (**الدیـن**)، لێـرەدا زیاتـر وا پێدەچـێ مەبەسـت پێـی سـزاو پاداشـت بـێ، وەك زۆرجاریـش گوتوومـە: وشـەی (**جـزاء**) لـە زمـانی عەرەبییـدا هـەم پاداشـت (**ثـواب**)و هـەم سـزا (**عِقـاب**)، دەگرێتـە خـۆی، بـەڵام بـەڕای بەنـدە لـە زمـانی کوردییـدا وشـەیەکمان نیـە پـڕ بـە پێسـتی وشـەی (**الدیـن**)، یاخـود (**الجـزاء**) بـێ، بەڵکـو دەبـێ بڵێیـن: سـزا و پاداشـت، بۆیـە مـن لـە مانـای دەقـاو دەقەکەیـدا ئـاوام تەفسـیر کـردوە: ئایـا ئـەو کەسـەت دی کـە سـزاو پاداشـت بـە درۆ دادەنـێ؟

بێگومـان مەبەسـت لـە دیتنیـش لێـرەدا، بینینـی عەقـڵ و دڵـە، نـەك دیتنـی چـاو، بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: (**الرُّؤْيَـةُ هُنَـا رُؤْيَـةٌ عِلْمِيَّـةٌ وَلَيْسَـتْ بَصَرِيَّـةً**)، دیـتن لێـرەدا، دیتنـی زانسـتییە (پەیپێبردنـە) نـەك دیتنـی چـاو، چونکـە هەمـوو ئەوانـەی ڕۆژی

سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێن، بە چاو نابینرێن، چ دوێنراو پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ، چ هەر کەسێك بێ کە شایستە بێ بدوێنرێ، - ئەو مانایەش وا پێدەچێ ڕاستتر بێ، کە مەرج نیە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ - بێگومان ناگونجێ بە چاوی سەر هەموو ئەوانە ببینێ کە بێبڕوان بە سزاو پاداشت، بە ڕای هەندێك لە زانایانیش وشەی **(الدین)**، لێرەدا هەر بە مانای ئیسلامە، واتە: بەرنامەی خوا، ئایا ئەو کەسەت بینی کە بێبڕوایە بە ئایین و بەرنامەی خوا؟ کە خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴿١٩﴾﴾ **آل عمران**، بەرنامە، (بەرنامەی ڕاست و تێر و تەواو و پەسند) لە لای خوا، تەنیا ئیسلامە.

بەڵام ڕەوتی ئایەتەکان، زیاتر ئەو مانایە زاڵ دەکات کە لێرەدا مەبەست لە **(الدین)**: **(الجزاء)** بێ، واتە: سزاو پاداشت، ئایا ئەو کەسەت بینی بە چاوی عەقڵ و دڵ؟ واتە: ئەگەر بینیوتە، ئەو کاتە دەزانی چەندە زیانبارە!

هەندێکیش گوتوویانە: **(أَرَءَيْتَ)** بە مانای **(أَخْبِرِنِي)**، هەواڵم پێ بدە لە بارەی کەسێکەوە، کە بڕوای بە سزاو پاداشت نیە، کێیە ئەو کەسە؟

﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ﴿٢﴾﴾، ئەوە کەسێکە بە توندیی پاڵ بە هەتیوەوە دەنێ: **(الدَّعُّ: الدَّفْعُ الشَّدِيد)**، پاڵپێوەنانی توند، بە کوردیی پێی دەڵێن: پاڵەستۆدان، منداڵی گچکەی بێ باب، لە جیاتی ئەوەی دەستی بەسەر دابێنێ و بیلاوێنێتەوەو هاوکاریی بکات و، سۆزو بەزەیی لەگەڵ دا بنوێنێ، پاڵەستۆی دەدات و پاڵی پێوە دەنێ و دەری دەکات، ئەوە یەك لە خەسڵەتە خراپەکانی بابای بێبڕوا بە ڕۆژی سزاو پاداشت. ئنجا دێتە سەر باسی سیفەتی دووەمی: ﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴿٣﴾﴾، هانیش نادات (واتە: هانی خەڵك نادات) لەسەر خواردنی نەدار، لەسەر خواردن پێدانی نەدار، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ﴾، وەك ئەو خواردنەی دەدرێ بە بابای نەدار، هی خۆی بێت، یانی: خواردنەکە هی خۆیەتی و پێویستە بیدرێتێ، ئەگەرنا هەندێك گوتوویانە: ﴿طَعَامِ﴾، لێرەدا مەبەست پێی خواردن پێدان **(إِطْعَام)**ە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحُضُّ ﴾، هاننادات واتە: ئەوە هیچ کە بۆ خۆی هاوکاریی بابای نەدار ناکات، لە ڕووی خواردن پێدان و تێر کردنیەوە، بەڵکو ئامادە نیە قسەیەکی خێریشی بۆ بکات، مانای وایە زۆر ڕەزیل و چرووك و بێ خێرە.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: سێ ئایەتی یەکەم لە مەککە دابەزیون و، ئەم چوار ئایەتی دوایی لە مەدینە دابەزیون، کە ئەویش ڕێی تێدەچێ، خوا ﷻ لە مەککە ئەو سێ ئایەتەی پێشێی دابەزاندبن و، ئەو چوار ئایەتەی دوایی لە مەدینە دابەزاندبن، چونکە باسی نوێژکەرانی بێ ئاگا دەکات و، باسی دەستگرتنەوە لە هاوکاریی دەکات و، باسی ڕیابازیی دەکات، ئەوانەش زیاتر لەگەڵ کەش و هەوای مەدینەدا دەگونجێن، لەوێ خەڵك پێویستیی بەوە بووە ڕیابازیی بکات و، لەوێ خەڵك دەستی هاوکاریی گرتۆتەوەو، لەوێش خەڵکێك نوێژیان دەکرد، بەڵام نەیاندەزانی نوێژەکەیان چییان لێ داوا دەکات!

دەشگونجێ هەمووی بەیەکەوە هاتبێ، ئێمەش ئەو ڕایەمان هەڵبژارد کە هەمووی لە مەککە دابەزیبێ، بەڵام خوا کە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾، بۆیە وا دەفەرموێ، چونکە کەسێك کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێ و، هانی خەڵك نادات، خواردن بدرێ بە بابای نەدارو ئاتاج و برسیی، ڕەنگە نوێژکەریش بێ، بۆیە خوا دەفەرموێ: سزای سەخت بۆ نوێژکەرانێك:

﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، کەسانێک کە نوێژەکانیان بێ ئاگان، نەیفەرمووە: (**فِي صلاتهم ساهون**)، (لە نوێژەکانیان دا بێ ئاگان) ئەگەر وای فەرمووبایە، کەس دەرنەدەچوو، چونکە - بەدەگمەن نەبێ - هیچکەس نیە لە نوێژدا کەم و زۆر بیری بە ئەملاولادا نەچێ، مەگەر زۆر ئاگای لە خۆی بێ و خۆی کۆنترۆڵ بکات، تەنانەت پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ جاری وا هەبووە لە نوێژدا تووشی سەهوو بووە، جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات نوێژی

کـردن، نوێـژی عـەسر بـوو یـان نیـوەڕۆ بـوو سـڵاوی دایـەوە، پیاوێـك کـە **(ذو اليديـن)** یـان، پـێ دەگـوت، خـاوەن دوو دەسـتەکان، دیـارە دەسـتی لـە هـی خەڵـکی درێژتـر بـوون، بـە ئەندازەیـەك، گـوتی: **(أقـصرت الصَّـلاةُ أم نَسِـيت يـا رسـول اللـه ﷺ)**[1]؟ ئایـا نوێـژ کورتکراوەتـەوە، یـان لـە بیـرت چـوو، ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ؟ ئەویـش فەرمـووی: هیـچ کام لـەو دووانـە نەبـوون، نـە نوێـژ کورتکراوەتـەوەو نـە منیـش لـە بیـرم چـووە، ئەویـش گـوتی: **(بَـلْ نَسِـيْتَ)**، بەڵکـو لـە بیـرت چـوو دوو ڕکاتـت کـردن و سـڵاوت دایـەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـە هـاوەڵانی فەرمـوو: **(أَصَدَقَ ذو اليديـن؟)**، ئایـا **(ذو اليديـن)** ڕاسـت دەکات لـە بیـرم چـوو؟ گوتیـان: بەڵـێ، ئنجـا بـە بێدەنگیـی هەڵسـا دوو ڕکاتەکـەی دیکـەشی کـردن، دوایـی دوو کڕنووشـی سـەهووی بـردن، پێـش سـڵاودانەوەو سـڵاوی دایـەوە.

ئنجـا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کە لەو کاتـەدا دوو ڕکاتی کردوون و سـڵاوی داوەتەوە، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: بۆیـە وایکـردوە، تاکـو ئەگـەر ئۆممەتەکەی لـە نوێژدا تـووشی هەڵەیـەك بـوون، وەك ئـەو بکـەن و بـە ئانقەسـت وای کـردوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا هیـچ بەڵگەیـەك لەسـەر ئەوەنیـە بـە ئانقەسـت وای کردبـێ، بـە تایبـەتی کـە لەگـەڵ **(ذو اليديـن)**دا موناقەشـەی کـردوە، هەروەهـا جـاری دیکـەش شـتی لەوجـۆرە هـەر بـووە، بـەڵام بەدڵنیایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە تـووشی هەڵـە و سـەهوو بـووە لـە نوێژەکەیـدا، لەبـەر ئـەوە بـووە کـە دڵـی بـە شـتێکی گەورەتـرەوە پەیوەسـت بـووە، هـەر لـە چوارچێـوەی مسـوڵمانەتیی و دینداریيـدا، یاخـود حاڵەتێـکی ئیمانیـی بەهێـز ڕووی تێکـردوەو، لـەو کاتـەدا ئـاگای لـە ژمـارەی ڕکاتـەکانی نوێژەکـەی نەمـاوە، نـەك وەك داڵغـە ڕۆیشـتنی خەڵـکی دیکـە، کـە نوێـژ دەکات و نازانـێ چـی کـردوەو چـی گوتـوە! پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ سـەهوو و هەڵەکـەی بـەو جـۆرە نەبـووە، بێگومانیـش هـەر کەسـە لـە جـۆری خـۆی و لـە قـەدەر خـۆی کار دەدات ﴿ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ ﴿٨٤﴾ ﴾ الإسراء.

---

(١) رواه البخاري: ٤٨٢

ئنجا خوا دەفەرمووێ: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥﴾، لێرەدا حەرامە بوەستی، واتە لەسەر: ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤﴾، سزای سەخت بۆ نوێژکەران، هاوار بۆ نوێژکەران، وەستان لێرەدا دروست نیەو، دەبێ یەکسەر ئایەتەکەی دیکەشی بدەیە دەم و، بەسەر یەکەوە بخوێنرێتەوە، سزای سەخت بۆ نوێژکەران، ئەوانەی لە نوێژەکەیان بێئاگان، ئنجا ئەگەر فەرمووبای: (فِي صلاتهم ساهون)، لە نوێژەکەیان دا بێ ئاگان، هەموو کەسی دەگرتەوە، بەڵام فەرموویەتی: لە نوێژەکەیان بێئاگان، نەك لە نوێژەکانیاندا، لە نوێژ بێئاگابوون، واتە: نوێژ دەکات، بەڵام نازانێ بۆچی کردی! ئەوە لە نوێژ بێ ئاگابوونە، بەڵام لە نوێژدا بێئاگابوون، ئەوەیە مرۆڤ دالغەی بە ئەلاولادا بڕوات، کە وەك گوتم: مەگەر چۆن دەنا هیچکەس لەوە سەلامەت نابێ.

﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ٦﴾، ئەوانەی ڕیابازیی دەکەن، واتە: بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵك ئەگەر نوێژ بکەن، دەیکەن، کەواتە: ئەگەر لە نێو خەڵکدا بن، نوێژەکەیان دەکەن و، ئەگەر لە نێو خەڵکدا نەبن نایکەن، چونکە نوێژەکەیان بۆیە دەکەن، سەرنجی خەڵك ڕابکێشن، ئنجا ئەگەر نوێژە، ئەگەر هەر کردەوەیەکی دیکەیە، کە دەبێ تەنیا بۆ خوا ئەنجام بدرێ و، بەشی جگە لە خوای تێ نەکرێ، ئەوان وەختێك ئەنجامی دەدەن، بۆیە ئەنجامی دەدەن، سەرنجی خەڵك بە لای خۆیاندا ڕابکێشن!

بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەم سوورەتە هەمووی، یان بەلای کەمەوە ئەو چوار ئایەتەی کۆتایی مەدینەیین، دەڵێن: چونکە لە مەککە حاڵ و دۆخ وا نەبووە پێویست بکات، کەس ڕیابازیی بکات، ئەوەی مسوڵمان بووبێ بەڕاستیی مسوڵمان و بڕوادار بووە، ئەگەر خوا پەرستییەکەی خۆیان نەشاردبێتەوە، پێشانی خەڵکیان نەداوە کە سەرنجی خەڵکی پێ ڕا بکێشن، بەڵام لە مەدینەدا دوای ئەوەی ئیسلام دەسەڵاتی پەیدابوو و مسوڵمانان قەوارەی سیاسییان بۆ دروست

بووە، لەوێ هەندێك لە دڵنەخۆشەكان پێویستییان بەوە بووە، سەرنجی خەڵك بە لای خۆیاندا ڕابكێشن، تاكو خەڵك بە مسوڵمان و دیندارو نوێژكەریان بزانێ.

بەڵام ئەگەر بشڵێین سوورەتەكە هەمووی مەككەییە، دەڵێین: كەم و زۆر لە هەر شوێنێك كەسانێكی بێهێز هەن، پێیان خۆشە خەڵك لێیان ڕازیی بێ و، سەرنجی خەڵك بە لای خۆیاندا ڕابكێشن.

﴿ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ۝٧ ﴾، هاوكارییش دەگرنەوە، ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾، بەدوو واتایان لێكدراوەتەوە:

**یەكەم:** هەر شتێك لە ماڵدا بەهرەی لێ وەربگیرێ، ئنجا بەڕەیە، فەڕشە، مەنجەڵە، كەوچكە، تەورە، پاچە، چەقۆیە، قاپە، مشارە، هەموو ئەو شتانەی كاتی خۆی لە كۆمەڵگای ئەو سەردەمەداو ئێستاش هەر پێویستن و، كەم و زۆر خەڵك پێویستییان بە شتی یەكدی هەر دەبێ و مەگەر چۆن، دەنا هیچ ماڵێك نیە هەموو پێداویستییەكانی هەبن، بۆیە ماڵەكان پێویستییان بەوە دەبێ، هەندێك حەواج و كەل وپەل لە یەكدی وەربگرن.

**دووەم:** واتایەكی دیكەی ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾، ئەوەیە كە بریتیە لە هەر شتێك سوودی بۆ خەڵك هەبێ، ئنجا ماڵ و سامانە، بە تایبەت زەكات، كە هەندێكیان ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾یان، بە زەكات، داناوە، یاخود قسەی خێرە، یان سوود پێ گەیاندنێكە، یان هەر جۆرە هاوكاریی كردنێكە، ئەگەر كەم بێ ئەگەر زۆر بێ، وەك دواتر چەمك و واتای وشەی: ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾، زیاتر شی دەكەینەوە.

لە كۆتایی مانای گشتیی ئەم سورەتە موبارەكەدا دەڵێین:

لەم سووڕەتەدا خوا ﷻ پێناسەی كەسێكمان بۆ دەكات كە بێبڕوایە بە **(دین)** كە كەمێك لە زانایان گوتوویانە: **(دین)**، لێرەدا بە مانای ئیسلامە، بەرنامەی خوا، بەڵام زۆربەیان گوتوویانە: **(دین)** لێرەدا بە مانای: سزاو پاداشت **(الجزاء)**ە،

سـەرەتاش خـوای زانـاو توانـا دوو سـیفەتی زۆر خـراپ لەو کەسـە هەڵدەدات: سـیفەتی یەکـەم: ﴿ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ٢ ﴾، ئـەوە کەسـێکە هەتیـو (واتـە: منداڵـی بـێ بـاب، چ کـوڕ بـێ، چ کـچ) بـە توندیـی پـاڵ پێـوە دەنـێ و دەردەکات و تێـوەی دەخـوڕێ و پاڵەسـتۆی دەدات.

سـیفەتی دووەم ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ٣ ﴾، هەروەهـا هاندەریـش نیـەو خەڵـك هـان نـادات لەسـەر خواردنـدان بە نـەدار، بۆیـەش دەفەرمـوێ: ﴿ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴾، چونکـە نـەدارو ئاتـاج و برسـیی، ئـەو خواردنـەی کەسـێك پێـی دەدات، وەك بڵێـی هـی خۆیـەتی و دەیداتـێ، هەندێکیـش گوتوویانـە: ﴿ طَعَامِ ﴾، لێـرەدا بـە مانـای (**إطعـام**)ە، واتـە: خـواردن پێـدان، بـەڵام وا ڕاسـترە هـەر بڵێیـن: لەسـەر خـواردنی نـەدار هاننـادات، واتـە: ئـەو خواردنـە لـە ئەصڵـدا هـی ئـەو نەدارەیـەو دەبـێ هـانی خەڵـكی بـدات، ئـەو خواردنـە تەسـلیم بـە خاوەنەکـەی خـۆی بکـەن، کـە بابـای نـەدارە.

لێـرەدا خـوای بـەرز و مـەزن ئـەو دوو سـیفەتە دێنـێ، بـۆ پێناسـەکردنی کەسـێك کـە بـڕوای بـە (دیـن) نیـە، واتـە: ڕۆژی دوایـی و سـزاو پاداشـتی خـوا، یاخـود بـڕوای بـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا نیـە، ئـەوەش بۆمـان دەردەخـات کـە بێگومـان بڕوابـوون بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت، وا لـە مـرۆڤ دەکات، دڵـی بەرانبـەر بـە هەتیـو نـەرم بـێ و سـۆزی هەبـێ، پەرۆشـی بـێ، هەروەهـا بەرانبـەر بـە نـەدار و برسـیی و خەڵـكی ئاتـاج، دڵـی نـەرم بـێ و هاوکاریـان بـێ، کەچـی ئـەو کەسـەی بێبڕوایـە بـە سـزا و پاداشـتی خـوا، نـەك دەسـت بەسـەری هەتیـودا ناهێنـێ و نایلاوێنێتـەوەو ڕەحمـی پـێ نـاکات، بەڵکـو بـە توندیـی پاڵـی پێوەدەنـێ و پاڵەسـتۆی دەدات، بابـای نەداریـش نـەك هـەر بـۆ خـۆی هاوکاریـی نـاکات، بەڵکـو ئامـادە نیـە قسـەیەکی خێریـشی بـۆ بـکات و، هـانی خەڵکیـش بـدات هاوکاریـی بکـەن!

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥ ﴾، سـزای سـەخت، یاخـود هـاوار بـۆ نوێژکەرانێـك کـە لـە نوێژەکەیـان بـێ ئاگان

واتـە: ئـەو جـۆرە کەسـانە ئەگـەر نوێژێکیـش بکـەن، بـە دڵنیایـی لـە نوێژەکەیـان بـێ ئـاگا بـوون و، پابەنـد نەبـوون بـەوەی کـە نوێژەکەیـان دەبـێ تێیانـدا بەرهـەم بهێنـێ، چونکـە نوێژەکەیـان لەسـەریان پێویسـت دەکات، بەزەیـی و پەرۆشـیی و سـۆزیان بەرانبـەر بـە هەتیـو و نـەدار هەبـێ.

﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ٦ ﴾، ئەوانـەی ڕیابازیـی دەکـەن واتـە: کارێـك دەکـەن وا پێشـانی خەڵـك بـدەن، چاکـن، لـە حاڵێکیشـدا کـە چاك نیـن و، کارێـك دەکـەن وا پێشـانی خەڵـك بـدەن، خـوا پەرسـتن، لـە حاڵێکـدا خـوا پەرسـتیش نیـن، ئـەوە مانـای ڕیابازییـە، ﴿ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ٧ ﴾، چاکـەو هاوکارییـش دەگرنـەوە، دەسـت دەگرنـەوە لـە هاوکارییکـردنی خەڵـك و دەسـتبارگرتنیان بـە تایبـەت لـە پێدانی ئـەو کەلوپـەل و پێداویسـتییانەی لـە ماڵـدا، خەڵـك ڕۆژانـە کاریـان پێیـان دەبـێ و، کاتێـك کەسـێك حەواجێـك وە کەسـێك دەدات، کەلوپەلێـکی وێ دەدات بـە ئەمانـەت و کاری خـۆی پـێ جێبەجـێ دەکات و، بـۆی بێنێتـەوە، ئەمـە کەمتریـن جـۆری هاوکارییـە، هاوکاریـی دیکـەش ئەوەیـە کـە پـارەی بداتـێ، یاخـود ئیمکانییەتێـکی بـۆ بڕەخسـێنێ، ئـەو کـەل وپەلـەی پـێ بکـڕێ، بـەڵام کـە کـەل وپەلەکـەی خـۆتی وێ دەدەی بـۆ کاتێـکی دیارییکـراو، کاری خـۆی پـێ جێبەجـێ بـکات و بـۆت بهێنێتـەوە، ئەمـە کەمتریـن جـۆری هاوکارییـە، بۆیـە کەسـێك ئـەوەش نـەکات، مانـای وایـە هـەر زۆر زۆر چـرووك و دەسـتنووقاوە.

بەڕێـــــزان!

خـوا ﷻ کـە بـەو پێنـج سـیفەتە پێناسـەی کەسـێکمان بـۆ دەکات، کـە بێبڕوایـە بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت، یاخـود بێبڕوایـە بـە ئیسـلام و بـە درۆی دادەنـێ، پێـمان دەفەرمـوێ: هـەر کەسـێك ئـەو پێنـج سـیفەتەی تێدا بـن، بزانـەو ببینـە کـە بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت و، بـە بەرنامـە و ئایینـی خـوا بێبڕوایـە، هەرچەنـدە شـایەتمانیش بێنـێ و، هەرچەنـدە لافیـش لـێ بـدات و، هەرچەنـدە دروشـمی مسـوڵمانییش لـە خۆیـدا

زەق بکاتـەوە، بـەڵام کـە ڕەوشـت و ڕفتـارەکانی بـەو شـێوەیە بـوون، تـۆ نیشـانەی پرسـیاری گـەورە بخـە سـەری و بزانـە بێبڕوایـە، چونکـە مرۆڤـی بـڕوادار بـە ڕۆژی سـزاو پاداشـت، بـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا، دەبـێ سـۆزو عەتـف و بەزەیـی هەبـێ بەرانبـەر بـە هەتیـوو نـەدارو ئاتـاج، کاتێـك نوێژەکـەی دەکات دەبـێ بزانـێ چـی گـوت؟ لـە خزمـەت کـێ دا وەسـتاوەو؟ نوێژەکـەی شـوێنەوارەکانی تێـدا پەیـدا بـکات و نابـێ ڕیابازیـی بـکات، بەڵکـو دەبـێ بـە سـاغیی خـوا بپەرسـتێ و، ناشـبێ هاوکاریی لـە خەڵـك بگرێتـەوە، بەڵکـو دەبـێ دەسـتی هاوکارییـان بـۆ درێـژ بـکات.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**پێناسەی بە درۆدانەری سزاو پاداشت، بەوە کە پاڵەستۆی هەتیو دەدات و، هانی خەڵکی نادات بۆ خواردن پێدانی نەدار:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ۝٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ﴾، ئایا ئەوکەسەت دی کە سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێ؟ خوا ﷻ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەدوێنێ، بە تایبەت و لە پشت ئەویشەوە، هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ و، شایستەی ئەوەیە بدوێنرێ و خاوەنی عەقڵ و هەست بێ، دەفەرمووێ: ئایا ئەو کەسەت دی کە بە سزاو پاداشت بێبڕوایە، یاخود سزاو پاداشت بە درۆدادەنێ؟ ﴿أَرَءَيْتَ﴾، خوێندراویشەتەوە: **(أَرَيْتَ)**، واتە: بەبێ هەمزە، لێرەدا هەمزەی پرسیارکردن لە سەرەتای ئەم ئایەتە بە پێزەوە، بۆ پرسیارکردنی سەرسوڕماندنە، سەرسوڕماندن لە حاڵی کەسێك کە بێبڕوایە بە سزاو پاداشت و، لە ئەنجامی ئەوەشدا ئەو بێبڕواییە، بە درۆ دانانی ڕۆژی سزاو پاداشتەی، ئەو کردەوەو ڕەفتارە خراپانەی دوایی باسیان دەکرێ، تێیدا پەیدا کردوون، ﴿أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ۝١﴾، ئایا ئەو کەسەت بینی کە بێبڕوایە، بە درۆدانەرە بۆ **(دین)**، ئەم وشەیەش هەرچەندە دەگونجێ مەبەست پێی ئیسلام و بەرنامەی خوا، بەڵام ڕەوتی ئایەتەکان واپێشان دەدات زیاتر مەبەست پێی سزاو پاداشت بێ، چونکە وشای **(الدین)**:

أ- هەم بە مانای فەرمانبەریی **(الطاعة)** هاتوە.

**ب-** هەم بە مانای سزاو پاداشت **(جزاء)** هاتوە.

**ج-** هەم بە مانای بەرنامە **(منهج)** هاتوە، بەرنامەی ژیان بە گشتیی و بەرنامەیەك كە خوا دایدەنێ بۆ مرۆڤ بە تایبەتی، كە لە ئیسلامدا بەرجەستەیە.

كە دەفەرموێ: ﴿أَرَءَيْتَ﴾، ئایا دیتت ئەو كەسەی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێ؟ (دیتن) لێرەدا بۆ ناساندنە، واتە: ئایا دەیناسی؟ دەزانی كێیە ئەو كەسەی سزاو پاداشت بە درۆ دادەنێ، لە ئایەتی دواتریش دا پێناسەی دەكات و دەفەرموێ:

**٢)-** ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ﴾، ئەوە كەسێكە هەتیو پاڵەستۆ دەدات، منداڵی بێ باب لە جیاتی ئەوەی دەستی بەسەردا بێنێ و میهرەبانیی لەگەڵ بنوێنێ و بیلاوێنێتەوەو هاوكاریی بكات، لێی توورە دەبێ و بەتوندیی پاڵەستۆی دەكات و دەری دەكات. ﴿يَدُعُّ﴾، لە (دعَّ)ەوە، هاتوە، **(دَعَّهُ، يَدَعُّهُ، دَعّاً، والدَّعُّ: الدَّفْعُ بشِدَّةٍ وعُنْفٍ وَقَهْرٍ)**، (دعّ): پاڵپێوەنانە بە توندیی و سەختیی و زبریی و، بە قسەی ناخۆش و بە تێوەخوڕینەوە.

لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى﴾، ئەم ناوی ئاماژەیە: **(الإِشَارَةُ باسْمِ الإشارة لِتَمييزهِ أَكْمَلَ تَمييزٍ وتَنْزِيلِه مَنْزِلَة الظّاهِرِ المَرْئِيِّ)**، ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى﴾، ئاماژەكردن بە ناوی ئاماژە بۆ جیاكردنەوەیەتی بە تەواوترین شێوەو، بۆ ئەوەشە لە شوێنی كەسێكی دیار دابنرێ، كە بە چاوی سەر دەبینرێ، ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى﴾، ئەوە كەسێكە ﴿يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ﴾، بە توندیی پاڵ بە هەتیووەوە دەنێ، بە كوردیی دەگوترێ: پاڵەستۆی دەدات.

(ف) كە لێرەدا هاتوە، **(الفاء: لِعَطْفِ الصِّفَةِ الأُولَى عَلَى الثَّانِية)**، پیتی (ف) كە خراوەتە سەر (ذَلِكَ)، ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى﴾، بۆ بادانەوەو گێڕانەوەی سیفەتی دووەمە بۆ سەر هی یەكەم، سیفەتی دووەم كە بریتیە لە: ﴿يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ﴾، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر: ﴿يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ﴾.

٣)- ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾، هانیش نادات لە سەر خواردنی نەدار، سیفەتێکی دیکەی ناسێنەری ئەو کەسەی بڕوای بە سزاو پاداشت نیە، ئەوەیە هاننادات بۆ خواردنی نەدار، واتە: (لاَ يَحُضُّ النَّاسَ)، خەڵك هاننادات، بەڵام لەبەر ئەوەی بە سیاق و سەلیقە دیارە کە جگەلە خۆی هان نادات، بۆیە ئەو وشەیە قرتێنراوە. ﴿ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾، هەندێك لە زانایان وایان لێکداوەتەوە، کە (طعام) لێرەدا بە مانای چاوگە واتە: (إِطْعَامِ المِسْكِين)، خواردندان بەنەدار، هەندێکیش گوتوویانە: (طعام)، هەر لەسەر واتای خۆیەتی کە بریتیە لە (خواردن)، بەڵام بۆیە خوا ﷻ ئەم تەعبیرەی هێناوەو، (طعام)ی پاڵداوەتە لای (مِسْكِين)، بۆ گەیاندنی ئەو مانایە کە ئەو خواردنە هی نەدارەکەیە، واتە: ئەو خواردنە لە ئەسڵدا هی نەدارەکەیە، مادام پێویستیی پێیەتی و ئەوی دیکەش لە خۆی زیادە! کەواتە: ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ﴾، خەڵك هاننادات لەسەر خواردنی نەدار، واتە: خواردن پێدان بە نەدار، خواردنی نەدارەکە کە هی خۆیەتی و دەبێ پێی بدرێ.

کەواتە: ﴿ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ۝٣ ﴾، هاننادات لەسەر خواردنی نەدار:

أ- یان (طعام)، هەر بە مانای خواردنەو، پاڵدراوەتە لای نەدار واتە: خواردنەکە هی خۆیەتی.

ب- یاخود لێرەدا (طعام)، بە واتای خواردن پێدان (إطعام)ە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا يَحُضُّ ﴾، (الحَضُّ: الحَثُّ والتَّحْضِيضُ) (حضّ) بریتیە لە هاندان و دنەدان، بێگومان کە دەفەرموێ: خەڵك هاننادات لەسەر خواردنی نەدار، یان خواردن پێدانی نەدار، کەسێك خەڵك هاننەداو قسەی خێر نەکات، بۆ ئەوەی بابایەکی نەداری برسیی تێر بکرێ و خواردنی پێ بدرێ، بە دڵنیایی بۆ خۆشی ئامادە نیە هاوکاریی بکات، کەسێك ئامادە نەبێ قسەی خێر بۆ کەسێك بکات، بە دڵنیایی کرداری خێریشی لەگەڵ دا ناکات! ئایا ئەم ئایەتە موبارەکانە لە بارەی کێ وە هاتوونە خوار؟ لەوبارەوە چەند بۆچوونێك هەن:

١- هەندێکیان گوتوویانە لە بارەی (**العَاص بن وائل السهمي**)ەوە، هاتوونە خوار.

٢- هەندێك گوتوویانە لە بارەی (**الوليد بن المغيرة المخزومي**)ەیەوە، هاتوونە خوار.

٣- هەندێك گوتوویانە لە بارەی (**عمر بن العائِد المخزومي**)ەیەوە، هاتوونە خوار.

٤- هەندێك گوتوویانە لە بارەی (**أبو سفيان بن الحرب**)ەوە، هاتوونە خوار، پێش ئەوەی مسوڵمان بێ.

٥- هەندێك گوتوویانە لە بارەی (**أبو جهل**)ەوە، هاتوونە خوار.

ئەوەش لە حاڵێکدا کە ئەم ئایەتانە مەککەیی بن، بەڵام ئەگەر سوورەتەکە هەمووی مەدینەیی بێ، وەك ڕای هەندێك لە زانایان وایە، ئەو کاتە دیارە لە بارەی بابایەکی مونافیق و دەغەڵەوە هاتۆتە خوار، کە ناوەکەی باسنەکراوە، بەڵام بێگومان یەکسانە چ لە بارەی یەکێك لەو پێنج کەسەی مەککەوە هاتبێ، چ لە بارەی مونافیقێکی مەدینەوە هاتبێ، زانایان بنچینەیەکیان داناوە دەڵێ: (**إنَّ خُصُوصَ السَّببِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى**)، تایبەتبوونی هۆکاری دابەزینی ئایەتێك، ڕێ لە گشتگیربوونی واتایەکەی ناگرێ، خوا ﷻ جاری وا هەیە ئایەتێکی بە بۆنەیەکەوە ناردوە، بە بۆنەی هەڵسوکەوت و ڕەوشت و ڕەفتاری کەسێکەوە، ئەگەر چاکە، ئەگەر خراپە، بەڵام بێگومان چەمك و واتایەکەی گشتییە، لە سەرەتاوە ئەوی گرتۆتەوە، دوای ئەویش هەر کەسێك دەگرێتەوە، کە هەمان ڕەوشت و ڕەفتار لە خۆیدا بێنێتە دی.

**مەسەلەی دووەم:**

**هەڕەشەکردن لە نوێژکەرانی بێئاگا لە نوێژەکانیان، کە ڕیابازیی دەکەن و، دەست لە هاوکاریی دەگرنەوەو، ڕێگریی دەکەن لە یارمەتییدان و هاوکارییکردنی خەڵك:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴿٧﴾﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چوار بڕگەدا:

**١)-** ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾، ئنجا هاوار، سزای سەخت بۆ نوێژكەرانێك، **(الطبري)**، ئاوا ئەم ئایەتە بە پێزە مانا دەكات، دەڵێ: **(فَالْوَادِي الَّذِي يَسِيلُ مِنْ صَدِيدِ أَهْلِ جَهَنَّمَ، لِلْمُنَافِقِينَ الَّذِينَ يُصَلُّونَ، لَا يُرِيدُونَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ بِصَلَاتِهِمْ، وَهُمْ فِي صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ إِذَا صَلُّوهَا)**[1] واتە: ئەو شیوو دۆڵەی لە كێم و زووخاوی خەڵكی دۆزەخ دێتەخوار، بۆ ئەو مونافیق و دەغەڵانەی نوێژ دەكەن، بەڵام مەبەستیان لە نوێژكردنەكەیان خوا نیە (مەبەستیان ئەوە نیە ئەركێك جێبەجێ بكەن، خوا پاداشتیان بداتەوەو لێیان ڕازی بێ، لەبەر ئەوەی فەرمانی پێ كردوە) بەڵكو بۆ ڕیابازیی دەیكەن و لە نوێژەكانیشیان كاتێك دەیانكەن، بێئاگان.

چونكە كەسێك كارێك بۆ خواكات، وردەكارییەكی تێدا دەكات، شایستەی ئەوە بێ بۆ خوا بێ، بەڵام ئەگەر بۆ خوا ئەنجامی نەدات، هەر چۆن بێ لە كۆڵ خۆی دەكاتەوە.

**٢)-** ﴿الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾، (سزای سەخت بۆ ئەو نوێژكەرانە) كەسانێک لە نوێژەكانیان بێ ئاگان، ئاگایان لە نوێژەكانیان نیە، زانایان لە بارەی تەفسیركردنی ئەم ئایەتە بە پێزەوە، ڕای جۆراو جۆریان هەن:

---

(١) جامع البيان ج٢٤، ص٦٥٩

**١-** عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: (ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ: **الَّذِينَ يُؤَخِّرُونَهَا عَنْ وَقْتِهَا) (جامع البيان: ٣٨١٦٢)**، ئەوانەی نوێژەکانیان لە کاتی خۆی دوا دەخەن، واتە: لە کاتی خۆیاندا نوێژەکانیان ناکەن، هەر کاتێك بۆیان هەڵسووڕا دەیکەن! مانای وایە زۆر بە خەمی ئەوەوە نین نوێژەکان لە کاتی خۆیان دا، ئەنجام بدەن.

**٢-** هەر عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ) گوتوویەتی: (ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ: **هُمُ الْمُنَافِقُونَ يَتْرُكُونَ الصَّلَاةَ فِي السِّرِّ، وَيُصَلُّونَ فِي الْعَلَانِيَةِ) (جامع البيان: ٣٨١٦٩)**، مەبەست پێی دەغەڵەکانە، نوێژ لە پەنهانیی دا واز لێ دێنن، ئەگەر خەڵك ئاگای لێ نەبێ، بەڵام لە کاتی ئاشکرابوون داو لە نێو خەڵك دا، نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن، مانای وایە بۆ خەڵك ئەنجامی دەدەن، نەك بۆ خوا!

**٣-** دیسان **(الطبري)** لە **(قتادة)** وە بە ژمارە: **(٣٨١٧٣)** هێناویەتی لەبارەی تەفسیری ئەم ئایەتەوە گوتوویەتی: {ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ: **قَالَ: سَاهٍ عَنْهَا لَا يُبَالِي صَلَّى أَمْ لَمْ يُصَلِّ**}، لە نوێژەکەی بێئاگایەو خافڵاوە، گوێ ناداتێ کردی یان نەیکرد!

**٤-** **(الطبري)**یش ئەو مانایە هەڵدەبژێرێ کە دەڵێ: **(سَاهُونَ لَاهُونَ يَتَغَافَلُونَ عَنْهَا؛ وَفِي اللَّهْوِ عَنْهَا وَالتَّشَاغُلِ بِغَيْرِهَا، تَضْيِيعُهَا أَحْيَانًا، وَتَضْيِيعُ وَقْتِهَا أُخْرَى)**، واتە: خافڵاون و خۆیان لە نوێژەکانیان بێ ئاگا دەکەن، بە قسە و ڕەفتاری پووچەوە دەخافڵێن، (بە جگەلە نوێژەکەیانەوە دەخافڵێن، لە کاتێکدا پێویستە نوێژەکەیان بکەن) ئنجا جاری وا هەیە نوێژەکە خۆی زایەی دەکەن، جاری واش هەیە کاتەکەی زایە دەکەن و، لە کاتی خۆیدا نایکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥﴾، ئایا حیکمەتی چییە وشەی (سَاهُونَ)، بە (عَن) بەرکاری خواستوە؟ **(عُدِّيَ سَاهُون ب «عن» لإفادة أَنَّهُمْ تَجاوزوا إقامة الصلاة وتركوها، ولا علاقة لهذه الآية بأحكام السَّهو في الصلاة)**، واتە: بۆیە (سَاهُونَ)، بە (عَن) بەرکاری پێخوازراوە، تاکو ئەوە بگەیەنێ، کە ئەوانە

لـە بەرپاکردنـی نوێژەکەیـان تێپەڕیـون و وازیـان لـێ هێنـاوەو، ئـەم ئایەتـە هیـچ پەیوەندییەکـی نیـە بـە حوکمەکانـی سـەهووکردن و بـە هەڵـە داچوونـەوە لـە نوێـژدا.

(السـهو: **الذُّهـولُ عَـنْ أَمْـرٍ سَـبَقَ عِلْمُـهُ**)، (**سَـهُو**): بریتیـە لـە بێئاگابـوون لـە شـتێك کـە پێشـتر زانـراوە، دەگوتـرێ: ئـاگام لـەو شـتە نەمـاو لێـی سـەهوو بـووم، واتـە: پێشـتر دەمزانـی، بـەڵام لێـرەدا خوازراوەتـەوە بـۆ وازهێنـان و پشـتتێکردن، ﴿عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥﴾، یانـی: (**تَارِكُـونَ لِصَلَاتِهِـم**)، وازلێهێنـەری نوێژەکەیانـن، ئنجـا وەك (**الطـبري**)، دەڵـێ: یـان ئەوەتـا نوێژەکانیـان هـەر ناکـەن، یاخـود لـە کاتـی خۆیدا نایکـەن، یاخـود بـەو شـێوەیە نایکـەن کـە خـوای پـەروەردگار لێـی داوا کـردووە.

٣)- ﴿ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ﴾، ئەوانەی ڕیابازیی دەکەن، بۆ ڕووە دەربایسیی نوێژەکەیان دەکەن، بۆ بەرچاوی خەڵك، (**الطبري**) ئاوا مانای ئەم ئایەتە موبارەکە دێنێ، دەڵێ: (**الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ النَّاسَ بِصَلَاتِهِمْ إِذَا صَلُّوا، لِأَنَّهُمْ لَا يُصَلُّونَ رَغْبَةً فِي ثَوَابٍ، وَلَا رَهْبَةً مِنْ عِقَابٍ، وَإِنَّمَا يُصَلُّونَهَا لِيَرَاهُمُ الْمُؤْمِنُونَ فَيَظُنُّونَهُمْ مِنْهُمْ، فَيَكُفُّونَ عَنْ سَفْكِ دِمَائِهِمْ، وَسَبْيِ ذَرَارِيِّهِمْ، وَهُمُ الْمُنَافِقُونَ الَّذِينَ كَانُوا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ**)[1] (**جامع البيان: ج٢٤، ص٦٦٤**)، واتە: نوێژەکەیان کە دەیکەن، بۆ ڕیابازیی و بۆ بەرچاوی خەڵك دەیکەن، کاتێك نوێژەکەیان دەکەن، چونکە نوێژەکەیان بۆ ئەوە ناکەن، ئارەزوومەندی پاداشت بن، یاخود مەترسییان لە سزا (ی خوا هەبێ، کە هەڕەشەی کردوە لەو کەسانەی نوێژ ناکەن و بەندایەتیی بۆ خوای پەروەدگار ناکەن) بەڵکو نوێژەکەیان بۆ ئەوە دەکەن بڕواداران بیانبینن و، پێیان وابێ لەوانن (ئەوانیش بڕوادارن) و واز لە خوێن ڕشتن و بەدیلگرتنی وەچەکانیان بێنن، ئەوەش مەبەست پێی موونافیق و دەغەڵەکانن لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ. (یان هەر ڕۆژگارێکی دیکەدا کە نوێژ دەکەن، بەڵام نوێژێکی بێ ڕووح و بێ ئامانج دەکەن)[2].

---

(١) الجامع البيان: ج٢٤، ص٦٦٤

(٢) بێگومـان هەرکـەس بێبـڕوا نامسـوڵمان بـوو، خوێـن و وەچـەی ڕەوانیـە، مەگـەر سـەنگەر لـە دژی ئیسـلام و مسـوڵمانان بگـرێ، بۆیـە دەبووایـە (الطـبري) ئـەو بەنـد (قیـد)ەی بخاتەسـەرو بەرەهایـی نەیڵـێ.

ئەمە لە حاڵێکدا کە ئەم ئایەتانەی دوایی لە مەدینە دابەزیبن (ئەو چوار ئایەتەی کۆتایی) کە ئەمەش ڕایەکی زانایانە، بەڵکو ڕایەك هەیە کە سوورەتەکە هەمووی مەدینەیی بێ، بەڵام ئەگەر مەککەیی بێ، ئەو کاتە مەبەست پێی کەسانێکە کەلە مەککە مسوڵمان بووبن، بەڵام هەروا مسوڵمانبوونێکی لامسەرلایی و هاکەزایی، ئەوە نەبووە مسوڵمانێکی چاك و جیددیی بن و، باش خەم لە نوێژەکانیان و لە پەرستشەکانیان بخۆن.

٤)- ﴿ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴾، ئەو سوودانەی لەلاشیانن ڕێگرییان لێ دەکەن (بگەنە خەڵك).

ئەمە سیفەتی کۆتاییانە، (الطبري)، دەڵێ: (**وَيَمْنَعُونَ النَّاسَ مَنَافِعَ مَا عِنْدَهُمْ، وَأَصْلُ الْمَاعُونِ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ: مَنْفَعَتُهُ؛ يُقَالُ لِلْمَاءِ الَّذِي يَنْزِلُ مِنَ السَّحَابِ: مَاعُونٌ**)[1]، واتە: ئەو سوودانەی لە لایانن لە خەڵکیان دەگرنەوە، وشەی ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾یش، لە هەر شتێك بریتیە لە سوودو کەڵکەکەی، ئەو ئاوەی لە ئاسمان دادەبەزێ، پێی دەگوترێ: ﴿ ٱلْمَاعُونَ ﴾، لەبەر ئەوەی سوودو کەڵکی هەیە.

(**الطبري**)، دەڵێ: (**إِنَّ اللَّهَ وَصَفَهُمْ بِأَنَّهُمْ يَمْنَعُونَ النَّاسَ مَا يَتَعَاوَرُونَهُ بَيْنَهُمْ، وَيَمْنَعُونَ أَهْلَ الحَاجَةِ وَالمَسْكَنَةِ، مَا أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُمْ فِي أَمْوَالِهِمْ مِنَ الْحُقُوقِ، لِأَنَّ كُلَّ ذَلِكَ مِنَ المَنَافِعِ الَّتِي يَنْتَفِعُ بِهَا النَّاسُ، بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ**[2])، (**جامع البيان: ١٥، الجزء:٣٠، ص٣٥٢**)، واتە: خوا ﷻ ئەوانەی بەوە وەسفکردوون کە ئەوەی خەڵك لە نێوان خۆیاندا دەستاو دەستی پێدەکەن و، وەیەکدی دەدەن (لە حەواج و کەل و پەل، ئەوە لە خەڵك دەگرنەوە)و، ئەوانەی پێویستن و ئاتاجن و هاوکارییان لێدەگرنەوە، لەو ماڵ و سامانەدا کە خوا ﷻ مافی ئەوانی تێدا پێویست کردوون، (ئنجا ئەگەر زەکاتە، یان جگەلە زەکاتە) چونکە هەموو ئەوە لەو سوودانەن کە خەڵك لە نێو خۆیاندا لێیان بەهرەمەند دەبن.

---

(١) جامع البيان: ج٢٤، ص٦٦٤

(٢) جامع البيان: ١٥، الجزء ٣٠، ص٣٥٢

واتە: هەم کەل وپەل لە خەڵك دەگرنەوە، هەم لە ماڵ و سامانیان هاوكاریی خەڵكی ئاتاج و نەدار ناكەن، كە خوای كاربەجێ لە ماڵی دەوڵەمەندەكاندا، هاوكارییكردنی نەدارانی پێویست كردوە.

**(القرطبي)** لە مانای ﴿ٱلْمَاعُونَ﴾دا، دوازدە مانای هێناون، بگرە هەندێك لە زانایان زیاتریشیان هێناون، بەڵام **(القرطبي)**، دوازدە **(١٢)** مانای هێناون، دەڵێ: **(الماعون أولاً: الزكاة، وثانياً: المال، ثالثاً: إسم جامع لمنافع البيت، رابعاً: ما كانت فيه منفعة، خامساً: العارية، سادساً: المعروف، سابعاً: الماء والكلأ، ثامناً: الماء وحده، تاسعاً: منع الحق، عاشراً: المستغل من منافع الأموال، حادي عشر: الطاعة والإنقياد، وثاني عشر: المعونة)**.

**(القرطبي)** ڕای زانایانیشی هێناوەو هەموویان پاڵدەداتە لای هاوەڵان و زانایانی شوێنكەوتووانی هاوەڵان (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، كە گوتوویانە: **(الماعون)** بەو مانایانە دێ: ١- زەكات. ٢- ماڵ و سامان بە گشتیی. ٣- ناوێكی كۆكەرەوەیە بۆ هەموو ئەو كەل وپەلانەی لە ماڵدا خەڵك پێویستیی پێیان دەبێت. ٤- هەر شتێك كە سوودی تێدا هەبێ. ٥- ئەو شتەی وەك حەواج و شمەك بە كەسێك دەدرێ. ٦- هەر شتێكی پەسند و هەر هاوكارییەكی پەسند. ٧- ئاو و لەوەڕگایە. ٨- هەندێكیان گوتوویانە: بەس ئاوە. ٩- ڕێ لە هەق گرتن. ١٠- ئەو بەرهەم و سوودەیە كە لە ماڵ و سامانەكان دا دوای ئەوەی دەجووڵێنرێن، وەدەست دێ و پەیدا دەبێت. ١١- ملكەچیی و فەرمانبەریی. ١٢- هاوكاریی.

ئنجا با لەو بارەوە ئەم دەقەش ببینین: **{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه، قَالَ: «كُنَّا نَعُدُّ الْمَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: الدَّلْوَ، وَالْقَأْسَ، وَالْقِدْرَ»} (أخرجه أبو داود: ١٦٥٧، والنسائي: ٧٢١، والبيهقي فِي الكُبرى: ٨٠٤١، وسنده حسن، وله حكم الرفع، وحسَّنه الألباني)**. واتە: عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ماعووغان، بەوە لێكدەدایەوە (كە

وەک سپاردە بەخەڵك دەدرێ)، لە دۆڵچە (کە ئاوی پێ لە بیر هەڵدەهێنجن) و، تەشوێ و، تەورو بیور (کە داری پێ دەقەڵێشرێ و دەشکێنرێ)و، مەنجەڵ (کە چێشتی تێدا دەکوڵێنرێ) واتە: کەل و پەلێك کە ماڵەکان لە بەینی خۆیاندا وەیەکدی دەدەن.

کەسێك دەچێ بۆ ماڵێك دەڵێ: ئەگەر فەرشێکی زیادتان هەیە، وێمدەن، یەکێك داوای شتێکی دیکە لە یەکێکی دیکە دەکات، داوای چەقۆی لێ دەکات، داوای تەرازووی لێ دەکات، داوای کورسیی لێ دەکات و دەڵێ: کورسییمان نین ئەگەر ژمارەیەك کورسییمان پێبدەن بۆنەیەکمان هەیە، هەتا کۆتایی.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ: ﴿ٱلۡمَاعُونَ﴾مان، بە دۆڵچەو تەورو مەنجەڵ، لێك دەدایەوە، ئەمە خۆی گوتوویەتی و، نەیگوتوە پێغەمبەری خوا ﷺ وا دەفەرموێ، بەڵام ئەمە لە زاراوەی پسپۆڕان و فەرموودەناسان دا حوکمی ئەوەی هەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی و بۆ لای وی بەرز کرابێتەوە، چونکە مادام باسی ڕۆژگاری پێغەمبەری کردوەو دەڵێ: لەو ڕۆژگارەدا ﴿ٱلۡمَاعُونَ﴾مان، پێ ئەو شتانە بوو، کەواتە: لەو ڕۆژگارەدا وشەی ماعوون، ئەو چەمك و واتایانەی هەبوون و میصداقەکەی ئەو کەل وپەلانە بوون، کە وەك نموونە ئاماژەی بە هەندێکیان کردوە.

لە تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥﴾.

**(القرطبي)** شتێکی جوان دێنێ لە تەفسیرەکەی خۆی **(الجامع لأحكام القرآن:)**[1] **دا، دەڵێ:**

**(ولا يكون الرجل مُرائياً بإظهار العمل الصالح إن كان فريضة، فمِن حق الفرائض الإعلان بها وتشهيرها)**، واتە: پیاو بە ڕیاباز دانانرێ بەهۆی دەرخستنی کردەوەی

---

(١) ج٢٠، ص١٩٦ و ١٩٧.

باشەوە، مادام ئەو کردەوە باشە بۆ خۆی ئەرك بێ و فەرز بێ، چونکە هەقی فەرزەکان وایە بە ئاشکرا ئەنجام بدرێن و پیشان بدرێن و خەڵك بیانبینێ، مەبەستی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ ﴾، ئەوانەی ڕیابازیی دەکەن، مانای وانیە هەر کەسێك نوێژی لەبەر چاوی خەڵك کرد، ڕیاباز بێ، بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکی تایبەت و دیارییکراو بوون، لە نێو خەڵکدا نوێژیان کردوە بۆ سەرنجڕاکێشانیان و، حاڵییکردنیان کە ئێمەش وەك ئێوە بڕواداریـن، بەلام خوا ﷻ ئاگای لە دڵ و دەروونیان بووە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾، هاوارو سزای سەخت، شیوێك لە دۆزەخ، خراپیی بۆ نوێژکەرانێك، ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، ئەوانەی لە نوێژەکانیان بێئاگان.

ئنجا ئەگەر خوا فەرمووبای: (**الذین هم في صلاتهم ساهون**)، ئەوانەی لە نوێژەکەیان دا بێئاگان، هەموو کەسی دەگرتەوە، بەلام فەرموویەتی: ﴿ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، ئەوانەی لە نوێژەکانیان بێئاگان، واتە: نوێژ دەکەن و بە حیساب نوێژکەرن، بەلام لە نوێژەکەیان بێئاگان، پێشتریش ڕوونمان کردەوە: لە نوێژەکەیان بێ ئاگان واتە:

**أ-نایکەن،** یان بیکەن و نەیکەن، پێیان وەك یەکە.

**ب-** یاخود لە کاتی خۆیدا نایکەن.

**ج-** یاخود بەو شێوەیە نایکەن کە خوای بەرزو مەزن فەرمانی پێکردوەو، نێوەڕۆکێك و هەقیقەتێکی هەبێ کە خوا ﷻ لە نوێژدا بە مەرجی گرتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ ﴾**المؤمنون**، واتە: بە ڕاستیی ئەو بڕوادارانەی لە نوێژەکانیاندا ملکەچن، سەرفرازن، ئەوانەی کارلێك لەگەڵ وشەکانی نوێژەکەیاندا دەکەن و، لەگەڵ جموجۆڵی نوێژەکانیاندا، لە کاتێکدا دەچنە حاڵەتی ڕکووع دەچەمنەوە لە خزمەت خواداو، کاتێك دەچنە حاڵەتی کڕنووش بردن

و سەردەخەنە سەر زەوی و، کاتێك تەحییات دەخوێنن و، کاتێك ڕادەوەستن و، کاتێك قورئان دەخوێنن، لە هەموو ئەو حاڵەتانەدا، دڵیان لەگەڵ نوێژەکەیانەو، لەگەڵ ئەو وشانە دایە کە لە نوێژەکەیاندا دەیانڵێن.

دواییش خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ٦ ﴾، کەواتە: ئەوانە نەك هەر لە نوێژەکەیان بێ ئاگان، بەڵکو نوێژەکەشیان کە دەیکەن هەر بۆ ڕووپامایی خەڵك و سەرنجڕاکێشانی خەڵك و، لەبەر چاوی خەڵك، دەیکەن، مانای وایە ئەگەر خەڵك چاوی لێ نەبێ، هەر ناشیکەن!

لە کۆتاییش دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ٧ ﴾، یارمەتییش لە خەڵك دەگرنەوە، ئەو شتانەی خەڵك لێیان بەهرەمەند دەبێ لە ژیانی ڕۆژانەدا، ئەگەر ماڵ ەو سامانە، ئەگەر کەل وپەلێکە، هەر شتێکە کە خەڵك لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریدەهێنن و، وەیەکدی دەدەن بە ئەمانەت و دوایی بۆ یەکدی دەیگێڕنەوە، دەست لەوەش دەگرنەوەو ئەوەش ناکەن.

## پێوەر و تەرازوویەکی گرینگ بۆ هەڵسەنگاندی خەڵك

لە کۆتایی تەفسیری ئەم سووڕەتە موبارەکەدا دەڵێین:

خوا ﷻ لەم سووڕەتە موبارەکەدا پێوەرو تەرازوویەکمان بۆ دادەنێ، بۆ کێشان و هەڵسەنگاندنی کەسێك کە بڕوای هەیە بە ڕۆژی سزاو پاداشت، یاخود کەسێك کە بڕوای هەیە بە (دین) ئایین و بەرنامەی خوا، ئەو پێوەرو تەرازووەش، زۆر جیایە لەوەی ئێمە بیرمان بۆی دەچێ، ئەگەر ئەو پرسیارە لە ئێمە بکرێ: دەزانی کێ بڕوای بە ڕۆژی سزاو پاداشت نیە، ئایا ئەو کەسە دەناسیی کە بڕوای بە پاداشت و سزای خوا نیە، ئەگەر لە ئێمە بپرسن؟! دەڵێین: بەڵێ ئەو کەسەی بێبڕوایە و گوناهو تاوان دەکات و، ئەو کەسەیە کە بڕوای بە سزا و پاداشت نیەو، حیسابی لای خوا ناکات، بەڵام خوا ﷻ چەند کردەوەو

ڕەفتارێکی بەرجەستە دێنێ، جاری دیکەش باسمان کردوە، هەمیشە خوا ﷻ کە پێناسەی کەسەکان و شتەکان دەکات، بە بەرجەستە کراویی پێناسەیان دەکات، ئەوە تایبەتمەندییەکی فەرمایشتی خوایە، یانی: کە باسی پارێزکاران دەکات، سیفەتەکانیان بەرجەستە دەکات، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (**آل عمران**)دا کە پێناسەی پارێزکاران دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣﴾ **آل عمران**، واتە: خێرایی (و پێشبرکێ) بکەن بەرەو لێبوردنێکی تایبەت لە لایەن پەروەردگارتانەوەو، بە هەشتێك (باخێك) کە پانایییەکەی بە ئەندازەی ئاسمانەکان و زەوییە بۆ پارێزکاران، ئامادە کراوە، ئنجا بەمجۆرە پێناسەی پارێزکارانمان بۆ دەکات:

﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ١٣٦﴾ **آل عمران**.

**یەك:** ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ﴾، ئەوانەی ماڵ و سامانی خۆیان خەرج دەکەن، ﴿فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾، لە کاتی خۆشیی و لە کاتی ناخۆشییدا، یاخود لە کاتی فەڕحانیی و لە کاتی سەغڵەتییدا، لە کاتی هەبوون و لە کاتی نەبووندا و، لە کاتی هەبوون دا لە قەدەر هەبوون دەبەخشن و، لە کاتی نەبوونیشدا لە قەدەر نەبوون دەبەخشن.

**دوو:** ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾، ئەوانەی قووتدەرەوەی پەستیین، ڕقی زۆرو تووڕەیی و پەستیی خۆیان قووتدەدەن و کپ دەکەنەوەو دەری نابڕن.

**سێ:** ﴿وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾، لێبوردەن لە خەڵك، نەك هەر ڕق و تووڕەیی خۆیان لە بەرانبەر، قووتدەدەن و کپ دەکەنەوە، بەڵکو لێشیان دەبوورن.

چوار: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ١٣٤﴾، خواش چاکەکارانی خۆشدەوێن، واتە: نەك هەر لێیانببوورن، بەڵکو هەوڵدەدەن چاکەشیان لەگەڵ دا بکەن.

پێنج: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ١٣٥﴾، (ئەوانە چاکەکانیانن بەڵام ئەگەر هەڵەنگوتن و خراپەیەکیشیان کرد) کەسانێک کاتێك شتێکی ناقۆڵاو دزێویان ئەنجام دا، یاخود ستەمیان لە خۆیان کرد، یادی خوا دەکەنەوەو، بۆ گوناهەکانیان داوای لێبوردن دەکەن، کێش هەیە لە گوناهان ببووریٚ بێجگە لە خواو، لەسەر ئەوەی کردوویانە مکووڕ و بەردەوام نابن لە حاڵێکدا کە دەزانن خراپە، ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾، ئا ئەوانە پاداشتیان لێبوردنێکە لە پەروەردگاریانەوە، ﴿وَجَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، هەروەها باخانێك کە ڕووبار بە ژێریاندا دەڕۆن ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ١٣٦﴾، بە هەمیشەیی تێیان دا دەمێننەوەو، باشترین پاداشت پاداشتی ئەوانەیە کە کار بۆ خوا دەکەن.

هەروەها لە سووڕەتی (**الذاريات**)یشدا، کە خوا پێناسەی پارێزکاران دەکات بە هەمان شێوەو، لە کۆتایی سووڕەتی (**الفرقان**)یش دا کە پێناسەی بەندەکانی خوای بە بەزەیی دەکات: ﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا ٦٣﴾، بە هەمان شێوەو خوا ﷻ شازدە (١٦) بۆ پێناسەکردنی بەندەکانی خۆی دەخاتە ڕوو.

لێرەش خوا دەفەرمویٚ: دەزانی کیٚ بە ڕۆژی سزاو پاداشت بێبڕوایەو بە درۆی دادەنیٚ: ﴿فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ ٣﴾، ئەگەر نایناسیی: ئەو کەسەیە کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنیٚ و تێیەوە دەخوڕیٚ و پاڵەستۆی دەدا، لە جیاتی ئەوەی دەستی بەسەردا بێنیٚ و هاوکاریی بکات، بەنسبەت نەداریشەوە: نەك هەر خۆی هاوکاریی ناکات، بەڵکو ئامادە نیە قسەیەکی خێریشی بۆ بکات و، هانی خەڵکی دیکەش بدات هاوکاریی بکەن، ئنجا ڕەنگە یەکێك بڵیٚ: ئەو کەسەی لەگەڵ هەتیودا بیٚ بەزەیی و

دڵڕەقەو، پاڵەستۆی دەداو دەری دەكات و، لەگەڵ نەداردا بەو شێوەیە، دەبینی نوێژ دەكات و نوێژكەرە؟ بۆیە دەفەرموێ: ﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ﴾، ئنجا سزای سەخت بۆ نوێژكەرانێك ﴿ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾، ئەوانەی لە نوێژەكانیان بێئاگان، بە بەڵگەی ئەوە دەزانین كە لە نوێژەكانیان بێئاگان، واتە: ئاگایان لە ڕووح و جەوهەرو نێوەڕۆكی نوێژەكەیان نیە، كە ئەوە ڕەوشت و ڕەفتاریانە لەگەڵ هەتیوو ئاتاج و نەداردا، كەواتە: نەیانزانیوە نوێژەكەیان بۆچی دەكەن! ﴿ الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ ﴿٦﴾ ﴾، ئەوانەی ڕیابازیی دەكەن، بۆ بەرچاوی خەڵك، ئەگەر شتێك ئەنجام بدەن، دەیكەن.

﴿ وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ ﴿٧﴾ ﴾، هاوكارییش دەگرنەوە لە خەڵك و، دەستی هاوكاریی بۆ خەڵك درێژ ناكەن، خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەكەدا پێنج سیفەتی زۆر خراپ دەداتە پاڵ كەسێك كە بەسزاو پاداشتی خوا، یاخود بە ئایین و بەرنامەی خوا بە گشتیی بێبڕوایەو بە درۆی دادەنێ، نوێژكەرە بەڵام لە نوێژەكەی بێ ئاگایە، هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: مەبەست پێی ئەوەیە كە نوێژ هەر ناكەن، بەڵام نوێژكردنێك بەو شێوەیە بێ، مرۆڤ لە نوێژەكەی بێئاگابێ و، بەرهەمێك كە دەبێ بەهۆی نوێژەوە پەیدابێ، تێیدا پەیدا نەبێ، بێگومان نوێژكردن و نەكردنی هەروەك یەكە.

لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بكەین، ئەویش ئەوەیە: دەبێ لە خۆمان وریابین، تەنیا نوێژكردن و ڕۆژووگرتن و ناوی مسوڵمان لێهەڵدران، بەس نیە، بەڵكو دەبێ لە خۆمان وردبینەوەو، ئاكارو ڕەفتارەكانمان بەو شێوەیە بن، كە نوێژ دەیانخوازێ و بەندایەتیی بۆ خوا دەیانخوازێ و، ڕووكردنە خوا دەیانخوازێ و، دەبێ خۆمان دووربگرین لەو سیفەت و ئاكارو ڕەفتارانەی، پێچەوانەی نوێژو پێچەوانەی بەندایەتیی كردن بۆ خوان، هەر بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی **(العنكبوت)دا**، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ

(٤٥) ﴾، نوێژ (خاوەنەکەی) قەدەغە دەکات لە هەرچی قسەو کردەوەی ناقۆڵاو ناشیرینەو، هەر قسەو کردەوەیەکی خراپ و بەزەڕ.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ کە نوێژەکانمان دەکەین، هەقی خۆیان پێبدەین و، لەو کەسانەمان بگێڕێ کە خۆیان دەڕازێننەوە، بە هەموو ئەو سیفەتە بەرزو پەسندانەی بە مەرجی گرتوون، بۆ کەسانێك کە بڕوادارن بە سزاو پاداشتی خواو، بە ئایین و بەرنامەی خواو، لەو خوو و خدەو خەسڵەتە دەروونیی و ڕواڵەتییانە دوورمان بکات و، بمانپارێزێ، کە کەسانێکی بەو جۆرەی پێ وەسفی کردوون و دەفەرمووێ: ئەوانە بێبڕوان و بەدرۆدانەرن بۆ سزاو پاداشت، یاخود بۆ ئایین و بەرنامەی خوا.

سُبحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمدِكَ، أَشهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنتَ، أَستَغفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١/٣/ ١٤٤٢)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٢/ ٨ /٢٠٢٠)ی زایینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە ڕوونکردنـەوەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێزەکانـی سـوورەتی (**الكوثـر**)و، سـەرەتاش لـە حـەوت بڕگـەدا پێناسـەو نێوەڕۆکـی دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الكوثر) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر بـە (**سـورة الكوثـر**) نـاسراوە، بـەڵام هـەر کام لـە: (**سـورة إنـا أعطينـاك الكوثـر**) و (**سـورة النحر**)یشـی بـۆ بەکارهێـنراون.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ڕاجیایـی زۆر لەوبـارەوە هەیـە، زۆربـەی زانایـان بـە مەککەیـی دەزانـن و، هەندێکیشـیان بـە مەدینەیـی، کەمێکیـش لـە زانایـان ڕایـان وایـە ئـەم سـوورەتە دوو جـاران دابەزیـوە، جارێـك لـە مەککـەو جارێـك لـە مەدینـە، ئـەوەی واشـی لێکـردوون ئـەو ڕایەیـان هەبـێ، ئەوەیـە کـە هەندێـك دەقـی سـوننەت هـەن، مەککەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە دەگەیەنـن و، هەندێـك دەقیـش هـەن، مەدینەیـی بوونـی دەگەیەنـن، وەك دوایـی باسـیان دەکەیـن، بـەڵام ڕای مەککەیـی بوونـی ڕاسـترەو، لـەو بـارەوەش ئـەم دەقـە دێنیـن:

(عَـنْ عَبْدِاللـه بْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄ قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾ بِمكَـة) (أخرجـه ابـن مردويـه كـما فِي الـدر المنثـور: ٨، ص٦٤٦، للسـيوطي، وقـال: وَأَخْـرَجَ عَـنْ عَبْدِاللـه بْـن الزُّبـير مثلـه، الإسـتيعاب: ج٣، ص٥٦٤).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبـاس ﵄، گوتوویەتـی: سـوورەتی ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾، لـە مەککـە دابەزیـوەو، (**ابـن مردویـه**)، وەك (**الـدر المنثـور**)، پاڵیداوەتـەلای گوتوویەتـی: عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیریـش (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) هەمـان شـتی گوتـوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

لـە موصحەفـدا ژمارەکـەی سـەدو هەشـت (١٠٨)ە، لـە دابەزینیشـدا ژمارەکـەی پـازدە (١٥)یـەو، پێـش سـوورەتی (**التکاثـر**)و، دوای سـوورەتی (**العادیـات**) دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە سـێ ئایەتـە، کورتتریـن سـوورەتە، چونکـە هـەر کام لـە سـوورەتی (**العـصر**) و (**النصر**)یـش، یەکـی سـێ ئایەتـن، بـەڵام سـوورەتی (**العـصر**)و، سـوورەتی (**النـصر**)، پیتەکانیـان لـە پیتەکانی سـێ ئایەتی ئەم سـوورەتە موبارەکـە زیاترن، بۆیـە سـوورەتی (**الکوثـر**) کورتتریـن سـوورەتە لـە قورئانـدا، چ لـە ڕووی ئایەتەکانـەوە کـە سـێ ئایەتـەو، چ لـە ڕووی ژمـارەی پیتەکانیـەوە کـە کەمتریـن پیـتن بـە ژمـارە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوورەتە هەمـووی دڵدانـەوەی پێغەمبـەری خـوا موحەممـەدە ﷺ، کـە خـوا ﷻ چاکەیەکـی گـەورەی لەگەڵـدا کـردوە، بۆیـە بـا نوێـژ بـۆ پـەروەردگاری بـکات و، قوربانیـی بـۆ سـەرببڕێ و، دڵنیـاش بـێ کـە دوژمـن و ناحەزەکـەی دوابـڕاوو بـێ ئاکامە،

نـەك ئـەو، وەك دوژمـن و ناحەزانـی بانگەشـەیان لـە دژ دەكـرد، كـە كوڕەكانـی لـە شـاری مەككـە كۆچـی دواییـان كـرد، سـەرەتا (قاسـم)و دوایـی (**عبداللـه**) كە بـە (**الطیب و الطاهر**)یـش ناودەبـرا، -لـە مەدینـەش لـە (**ماریـة الطبطیـة**) (**إبراهیـم**)ی بـوو بـەڵام ئەویـش بـە گچكەیـی مـرد- عەڕەبـەكان عادەتیـان وابـوو ئەگـەر كەسـێك نێـرەوەزی لـە پـاش نەبووایـە، كـوڕی لـە پـاش نەبووایـەو كوڕەكانـی مردبانایـە، دەیانگـوت: (**هـو أبـتر**)، ئـەو دوابـڕاوەو بـێ پاشـەوارە، ئنجـا خـوا ﷻ دڵـی پێغەمبـەری ﷺ دایـەوە كـە تـۆ بـێ پاشـەوار نـی، بەڵكـو كەسـێک ڕقـی لـە تـۆ هەڵدەسـتێ و ناحـەزی تۆیـە، ئـەو بـێ پاشـەوارو بـێ ئاكامـە، ئـەوەی خـواش ﷻ فەرموویەتـی، ڕێـك وایـە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

دوو تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەكە كەوتوونە بەرچاو:

**١)**- كورتترین سوورەتی قورئانە لە ڕووی پیتەكانیەوە، ئەگەرنا سوورەتەكانی (**العصر**) و (**النصر**)یش هەر یەكی سێ ئایەتن، بەڵام پیتەكانیان زیاترن.

**٢)**- هەر كام لە وشەكانی:

١- (ٱلۡكَوۡثَرَ).

٢- (وَٱنۡحَرۡ).

٣- (إِنَّ شَانِئَكَ).

٤- (هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ)، ئەم چوار وشە موبارەكە، تەنیا لەم سوورەتە موبارەكەدا هاتوون.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە هەر سێ ئایەتەكەی ئەم سوورەتە دەكەین بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم سـووڕەتە نێوەڕۆکەکـەی بریتیـە لـە دڵدانـەوەی پێغەمبەری خـوا ﷺ، خوا ﷻ پێـی ڕادەگەیەنـێ و دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾، بەدڵنیایـی ئێمـە (**كوثر**)مـان بـە تـۆ داوە، (**كوثر**)یـش لەسـەر کێشـی (**فَوْعَـل**)، واتـە: ئەوپـەڕی زۆر، کـە مەبەسـت پێـی خێرێکـی زۆرەو چاکەیەکـی گەورەیـە، زانایـان لـە بـارەی ئـەو خێـرە زۆرەوە کـە چییـەو چۆنـە؟ ڕاجیاییـان هەیـە، بـەڵام گرنـگ ئـەوە هەموویـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن: (**الكوثـر**)، یانـی: (**الخير الكثير**)، چاکەیەکـی زۆرو نیعمەتێکـی زۆر.

دوایـی پێـی دەفەرمـوێ: ﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ٢﴾، ئنجـا بـۆ پـەروەردگارت نوێـژ بکـەو قوربانییـشی بـۆ سـەرببڕە، یاخـود ئـاژەڵ کـە سـەردەبڕیٔ تەنیـا بـۆ وی سـەرببڕە، نـاوی خـوای لـێ بێنـە، بـۆ خـوا سـەری ببـڕە، بـۆ ئـەوەی پێـی لـە خـوا نیزیـك بکەویـەوە.

﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ٣﴾، بـە دڵنیایـی ڕق لێبوونـەوەت، کەسێک کـە ناحـەزی تۆیـە، ئـەو دوابـڕاو و بـێ ئـاکام و بـێ سـەرەنجامە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ٣﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ئێمە زۆرترین چاکەمان پێت بەخشیوە (١) ئنجا نوێژ بۆ پەروەردگارت بکەو، قوربانیی بۆ وی سەربڕە (یاخود بەس بۆ وی سەربڕە) (٢) بە دڵنیایی ناحەزی تۆ بێ ئاکام و دوابڕاوە (٣)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلْكَوْثَرَ): زۆر واتایان بۆ هێناون:

أ- (**الكَوْثَرُ: نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ يَتَشَعَّبُ منه الأَنْهَار**)، (**كَوْثَر**) ڕووبارێکە لە بەهەشتدا ڕووبارەکانی دیکە لەو جیادەبنەوە.

ب- (**الكَوْثَرُ: الخَيْرُ العَظِيم الَّذِي أَعْطَاهُ الله النَّبِيَّ الخاتم ﷺ**)، ئەو چاکە مەزنەیە خوا بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ بەخشیوە، (**تَكَوْثَر الشيءُ، أي: كَثُرَ كَثْرَةً مُتْنَاهِيَة**)، (**تَكَوْثَرَ الشيء**)، واتە: هێندە زۆر بوو، بێ سنوور زۆر بوو.

ج- (**الكَوْثَرُ: الرَّجُلُ السَّخِيُّ**) پیاوی بەخشندە.

(وَٱنْحَرْ): (**النَّحْـرُ: مَوْضِـعُ القِـلَادَةِ مِـنَ الصَّـدْرِ**)، (**نَحْـر**): شـوێنی ملوانکەیـە لـە سینەدا، ئـەو شـوێنەی ملوانکـەو گۆبەرۆکـی دەکەوێتـە سـەر، پێـی دەگوتـرێ: (**نَحْـر**)، واتـە: سـەرووی سـینە، (**نَحَرْتُـهُ أي: أَصَبْـت نَحْـرَهُ، وَمِنْـهُ نَحْـرُ البَعِـيرِ**)، (**نَحَرْتُـهُ**)، واتـە: لـە نەحریـەوە لـە سـەرووی سـینگیەوە سـەرم بـڕی، سـەربڕینی حوشـتر (**نحـر**)ی، بـۆ بـەکاردێ بـەڵام هـی ئاژەڵـی دیکـە (**ذَبْـح**).

(**وَانْحَر**)، دوو واتای هەن:

**أ-** سەرببڕە، حوشتر سەرببڕە، یاخود بەگشتیی ئاژەڵان سەربڕە بۆ خوا.

**ب-** (وَانْحَرْ: **أَمْرٌ بوَضْعِ اليد عَلَى النَّحْر**)، دەستت لەسەر سینەت دابنێ لە کاتێکدا بۆ نوێژ دەوەستی، بەڵام هەر مانای یەکەمیان لەگەڵ ڕەوتی ئایەتەکاندا گونجاوە.

(إِنَّ شَانِئَكَ): (**شَانِيء: مِنْ شَنَأَ أي: أَبْغَضَ، وَالشَّانِيءُ: المُبْغِضُ، وَشَنِئَهُ أي: أَبْغَضَهُ**)، (**شَنَأَ**) بە مانای (**أَبْغَضَ**)، ڕقی لێ هەڵسا، دێ (**شَانِيء: مُبْغِض**)، ڕق لێ هەڵساو، ناحەز، وەك چۆن (**شَنَأَ**) بەکاردێ، (**شَنِيءَ**)ش، هەر بەکارهاتووە، واتە: (**عين الفعل**)ەکەی، سەر (**فتحة**)ی هەبێ، یاخود ژێر (**كسرة**)ی هەبێ.

(هُوَ ٱلْأَبْتَرُ): (**البَتْرُ: قَطْعُ الذَّنَبِ، وَالأَبْتَرُ: مَقْطُوعُ العَقَبِ**)، (**بَتْر**): بە مانای قرتاندنی کلکە، بەڵام (**أَبْتَر**)، بە مانای کەسێکە دوابڕاوەو بێ پاشەوارە، کەسی لە دوانیە بە تایبەت کوڕ، نێرەوەز.

## هۆی هاتنە خواری ئەم سوورەتە

دوو گێڕدراوە دێنین، لە بارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سوورەتە موبارەکەوە:

**یەکەم:** {**عَنْ أَنَسٍ ﷺ، قَالَ بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ بَيْنَ أَظْهُرِنَا، إِذْ أَغْفَى إِغْفَاءَةً، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ مُتَبَسِّمًا، فَقُلْنَا: مَا أَضْحَكَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «أُنْزِلَتْ عَلَيَّ آنِفًا سُورَةٌ»، فَقَرَأَ: «بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾»، ثُمَّ قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَا الْكَوْثَرُ»، فَقُلْنَا: أَللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّهُ نَهْرٌ وَعَدَنِيهِ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ، عَلَيْهِ خَيْرٌ كَثِيرٌ، هُوَ حَوْضٌ تَرِدُ عَلَيْهِ أُمَّتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ، آنِيَتُهُ عَدَدُ النُّجُومِ، فَيُخْتَلَجُ الْعَبْدُ مِنْهُمْ، فَأَقُولُ: رَبِّ إِنَّهُ مِنْ أُمَّتِي، فَيَقُولُ: مَا تَدْرِي مَا أَحْدَثَ بَعْدَكَ» (أخرجه مسلم: ٤٠٠)**.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێ: ڕۆژێکیان لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێومان دا بوو، سەرخەوێکی شکاند (تۆزێ خەوی لێکەوت) و سەری بەرز کردەوە بە زەردەخەنەوە، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! بەچی پێدەکەنی و زەردەخەنەت دێ؟ فەرمووی: ئێستا سووڕەتێکم بۆ دابەزی، ئنجا خوێندیەوە: ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ﴿١﴾ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ﴿٢﴾ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾، دوایی فەرمووی: دەزانن (**كوثر**)، چییە؟ گوتمان: خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: ڕووبارێکە لە بەهەشت پەروەردگارم عزوجل بەڵێنی پێداوم، خێرێکی زۆری لەسەرە، ئۆممەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا دەچێتە سەری، دەفرەکانی (کە لەسەری داندراون ئاویان پێ بخورێتەوە) بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانن، یەکێك لە بەندەکان دەیەوێ ئاو بخواتەوە کەچی دوور دەخرێتەوە، منیش دەڵێم: پەروەردگارم ئەمە لە ئۆممەتی منە، ئەویش دەفەرمووێ: تۆ نازانی لە دوای تۆ چی کردوە! واتە: ئەوە هەر بەڕواڵەت شوێنکەوتوو و ئۆممەتی تۆ بوو، بەڵام لەڕاستییدا لە ئۆممەتی تۆ نەبووەو، شایستەی ئەوە نیە لە حەوزەکەت ئاو بخواتەوە.

**دووەم:** {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: لَمَّا قَدِمَ كَعْبُ بْنُ الأَشْرَفِ مَكَّةَ قَالَتْ لَهُ قُرَيْشٌ: أَنْتَ خَيْرُ أهلِ المدِيْنَةِ وَسَيِّدهُم؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالُوا: أَلاَ تَرَى إلى هَذَا المنبتر مِنْ قَوْمِهِ، يَزْعُمُ أَنَّهُ خَيْرٌ مِنَّا وَنَحْنُ، يعني: أهل الحجِيجِ وَأهل السِّدَانَةِ؟ قَالَ: أَنْتُم خَيْر مِنْهُ، فَنَزَلَتْ: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾، وَنَزَلَتْ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾، إلى قَوْلِهِ: ﴿فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾﴾} **(أخرجه النسائي في تفسيره: ٧٢٧، وابن حبان: ١٧٣١، والبزار: ٢٢٩٣، والطبري في جامع البيانج ٣٠، ص٢١٣، قال مؤلِّف الإستيعاب: وقلنا هذا إسناد صحيح).**

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ، دەڵێ: کاتێك کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتە مەککە (کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی جوولەکە) هۆزی قوڕەیش پێیان گوت: ئایا تۆ باشترین خەڵکی مەدینەو گەورەیان نی؟ گوتی: با، گوتیان: ئەدی تەماشای ئەو

دابڕاوە لە خەڵکەکەی ناکەی، پێی وایە لە ئێمە چاکترە، (مەبەستیان موحەممەد ﷺ بووە)، ئێمەش ئەوانەین کە خزمەتی حاجییان دەکەین و خزمەتی کەعبە دەکەین، کەعبی کوڕی ئەشڕەفیش گوتی: ئێوە لەو چاکترن، لەو بارەوە خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾، هەر لەو بارەشەوە ئەو دوو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (**النساء**)یش، دابەزین، کە دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ۝٥١ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ۝٥٢﴾، واتە: ئایا نەتزانیوەو سەرنجی ئەوانەت نەداوە کە بەشێك لە کتێبیان پێدراوەو بڕوا دێنن بە: ﴿بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾، {(**جبت**)، واتە: صەنەم و (**طاغوت**)یش، هەر کەسێکە بە پێچەوانەی بەرنامەی خواوە، فەرمانبەریی بۆ بکرێ} و بە بێبڕوایەکان دەڵێن: ئەوانە لە بڕواداران ڕێی ڕاستتریان گرتوە، ئەوانە کەسانێکن خوا نەفرەتی لێکردوون، هەر کەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات، هیچ یارمەتییدەرو هاوکارێکت بۆی چنگ ناکەوێ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ) بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، لە کاتی گوتنی: (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)دا، دەبێ بەلای کەمەوە ئەم چوار واتایە لە عەقڵ و دڵدا هەبن:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بێ هاوتا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ۝١﴾، بە دڵنیایی ئێمە خێرێکی زۆرمان بەتۆ بەخشیوە، ئەو خێرە زۆرە وەك باسمانکردو، دواتریش لە مەسەلە گرنگەکاندا هەر باسی دەکەینەوە، زۆربەی زانایان بە ڕووبارێك، یان بە گۆمێك، حەوزێك لە بەهەشت، یاخود لە وێستگا (**موقف**)، ئەو شوێنەی خەڵکی لێ ڕادەگیرێ بۆ کۆکردنەوەو سزاو پاداشت درانەوە، بەر لەوەی بەڕێکەون بۆ بەهەشت و دۆزەخ، لەوێ ئەو حەوزە، یاخود ئەو گۆڵە، ئەو ڕووبارە هەیە، کە لە فەرمایشتەکاندا هاتوە: ئاوەکەی لە هەنگوین شیرینترەو، لە بەفر ساردترەو سپییترەو، ئەو دەفرانەی لەسەری داندراون، بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمانن، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئێمە (**کوثر**)مان بە تۆ داوە، واتە: خێرێکی زۆر، کە لە نێو ئەو خێرە زۆرەدا، ئەو ڕووبارەش، یاخود ئەو حەوزەش هەیە.

﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ۝٢﴾، مادام وایە تەنیا بۆ پەروەردگارت نوێژ بکەو، تەنیا بۆ ئەویش سەرببڕە، هەر ئاژەڵێکت سەربڕی، چ هی قوربانیی و حەج بێ، چ هی جگە لە حەج، هەر کاتێك شتێکت سەربڕی، ناوی خوای لێ بێنەو، بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوا سەری ببڕە.

﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ۝٣﴾، بە دڵنیایی ڕق لێبوونەوەت لە کەسێك کە ڕقی لە تۆ هەڵدەستێ و ناحەزی تۆیە، ئەو دوابڕاوو بێخێرەو، ئەو بێ ئاکام و بێ سەرەنجامە، نەك تۆ وەك ناحەزانت بانگەشەت لە دژ دەکەن، لەبەر ئەوەی کوڕەکانت مردوون و کوڕت نین، لەبەر ئەوەی دوو کوڕی مردن (**قاسم و عبدالله**)، کە عەبدوڵڵا (**طیب و طاهر**)یشیان پێ دەگوت، لە مەدینەش لە ماریەی قیبتیی، کوڕێکی بوو بە ناوی (ئیبراهیم)، بەڵام هەرسێکیان بە گچکەیی مردوون، ئنجا ناحەزانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەیان دەکردە ماددەو کەرەستەیەکی بانگەشەی خراپ لە دژی، چونکە لە نێو ئەواندا عادەت وابوو

کەسێك کوڕو نێرەوەزی لەدوا نەبووایە، پێیان دەگوت: (**أبتر**)، واتە: دوابڕاوو بێ خێر، یاخود بێ پاشەوار، نەیاندەزانی موحەممەد ﷺ بەهۆی ئەو پێگەیەوە کە خوای میهرەبان پێیداوە، کە بەرزترین پێگەیە لە نێو بەشەراندا و، سەروەری پێغەمبەرانەو باشترین ئینسانە، نەیاندەزانی باشترین ئاکام و سەرەنجامی هەیەو، چاکترین شوێنەوار لە دنیاو دوارۆژدا بەجێ دەهێڵێ.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**خوا بە پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) دەفەرموێ:**

**ئێمە چاکەی زۆرمان لەگەڵ تۆدا کردوەو خێرێکی مەزنمان پێتداوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە یەك بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١﴾، بە دڵنیایی ئێمە چاکەیەکی زۆرمان لەگەڵ تۆدا کردوەو، خێرێکی زۆرمان بە تۆ بەخشیوە، شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن: **(افتِتَاحِ الكَلَامِ بحَرْف التَّأْكِيد وَضَمِير العَظَمَةِ، للإهْتِمَامِ بالخَبَرِ والإشْعَارِ بعَطَاءٍ عَظِيمٍ، والكلام مسوق مَسَاقَ البَشَارَةِ)**، واتە: دەستپێکی قسەکە بە پیتی جەختکردنەوە کە (إِنَّ)ی (إنا) یە، ﴿إِنَّآ﴾، بۆ جەختکردنەوەو داکۆکییکردنەو، بەکارهێنانی ڕاناوی مەزنیی (إنَّا)، نەیفەرمووە: (إِنِّي)، ئێمە، بۆ گرنگیی پێدانی هەواڵەکەیەو، بۆ ئەوەیە هەست بکرێ کە بەخششێکی مەزن باس دەکرێ و، ئەم قسەیەش مەبەست پێی دڵخۆشکردن و موژدەپێدانە، نەك تەنیا هەواڵدانی ئاسایی.

**(الكَوْثَرُ: عَلَى زِنَةِ (فَوْعَل) وَهِيَ مِنْ صِيغِ الأَسْمَاءِ الجَامِدَةِ، نَحُو الكَوْكَبُ وَالجَوْرَبُ والحَوْشَبُ وَالدَّوْسَرُ، وَلَمَّا وَقَعَ فِيهَا مَادَّةُ الكَثْرَةِ، كَانَت صِيْغَتُهُ مُفِيْدَةً شِدَّةَ المشتقة مِنْهُ)**، (**كَوْثَر**)، لەسەر کێشی (**فَوْعَل**)ە، کە لە ڕێژگەکانی ناوە وشکەکانە، [هیچیان لێ داناتاشرێ] وەك (**كَوْكَب**)، کە بە (**كواكب**)، کۆدەکرێتەوەو (**جَوْرَب**)، بە (**جَوَارِب**)، کۆدەکرێتەوەو (**حَوْشَب**)، بە (**حَوَاشِب**)، کۆدەکرێتەوەو (**دَوْسَر**)، بە (**دَوَاسِر**)، (**كَوْكَب**)، واتە: ئەستێرە، (**جَوْرَب**)، واتە: گۆرەوی، (**حَوْشَب**)، چەند

واتایەكـی هـەن[1]، یەكێـك لـە واتایەكانـی ئەوەیـە كەسـێك هـەردوو كەلەكـەی ئەسـتووربن، (دوسر)یـش، یـانی: قەبـەو زل[2]، ئەوانـە نـاوی جامیـدن، (كوثر)یـش لەسـەر كێشی ئەوانـە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ماددەی زۆریـی (كَـثْرَة)ی چووەتـە نێـو، بۆیـە ئـەو ڕێژگەیـە سـەختیی ئـەوە دەگەیەنـێ كـە لێـوەی هاتـوە.

بۆیـە (الزَّمَخْـشَرِي)، دەڵـێ: (الكَوْثَـرُ: المُفْـرِطُ بالكـثرة)، زێدەڕۆییكـەر لـە زۆرییـدا، (الكوثـر: الخَـيْرُ الكَثِـير)، خێرێـكی زۆر، چاكەیـەكی زۆر.

شـایانی باسـە: زانایـان بـۆ مانـای (كوثـر)، زۆر واتایـان لێكداونـەوە (القرطبـي)، حەڤـدە (١٧) واتـای هێنـاون، كـە پێـم وایـە ئـەم هەشـتەیان لـە هەموویـان گرنگـترن:

١- (نَهْرٌ فِي الجَنَّة): ڕووبارێكە لە بەهەشت.

٢- (حوض النَّبي فِي الموقِف): ئەو گۆل و گۆمەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدرێ لە وێستگا (موقف)دا، لەو شوێنەدا كە خەڵك لێی ڕادەگیرێ، بەر لەوەی بەسەر بەهەشت و دۆزەخدا دابەش بكرێن.

٣- (النُّبُوَّةُ): پێغەمبەرایەتیی.

٤- (القُرْآن): قورئان.

٥- (كَثْرَةُ الأَصْحَابِ وَالأُمَّة): زۆریی هاوەڵان و زۆریی ئۆممەتەكەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

٦- (الإسلام): ئیسلام.

٧- (رِفْعَة الذِّكْر): ناوبانگ بەرز كرانەوە.

٨- (الشَّفَاعَةُ): تكاكردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دواییدا بۆ مرۆڤایەتیی بە گشتیی، پاشان بۆ ئۆممەتی بە تایبەت.

---

(١ المعجم الوسيط، ص ٢٠٧.

(٢هەمان سەرچاوە، ص ٢٨٣.

کۆمەڵێك شتی دیکەش باسکراون، بەڵام ئەمانە گرنگترینیانن.

مانا زمانەوانییەکەی (**کوثر**)یش یانی: (**الخیر الکثیر**)، چاکەیەکی زۆر.

بەڵام بەپێی فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەست لە (**کوثر**)، ئەو ڕووبارەیە، یاخود ئەو حەوزەیە کە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دراوە، لە بەهەشتدا، ئەوە گرنگترین و گەورەترین (**صداق**)ی (**کوثر**)ە، ئەگەرنا بەس ئەو ناگرێتەوە، بەڵکو پێغەمبەرایەتیی و قورئان و ناو بەرزکردنەوەو، هەموو شتەکانی دیکەش دەگرێتەوە.

با لە بارەی (**کوثر**)ەوە، ئەم دوو دەقە بێنین:

**یەکەم:** پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {«**دَخَلْتُ الْجَنَّةَ، فَإِذَا أَنَا بِنَهْرٍ حَافَتَاهُ خِيَامُ اللُّؤْلُؤِ، فَضَرَبْتُ بِيَدِي إِلَى مَا يَجْرِي فِيهِ الْمَاءُ، فَإِذَا مِسْكٌ أَذْفَرُ، قُلْتُ: مَا هَذَا يَا جِبْرِيلُ؟» قَالَ: هَذَا الْكَوْثَرُ الَّذِي أَعْطَاكَهُ اللَّهُ** }(**أخرجه أحمد: ١٣٧٧٦، والبخاري: ٤٩٦٤، والطيالسي: ٢٨١٣، وأبو داود: ٤٧٤٨، والترمذي: ٣٣٥٦، وابن ماجه: ٤٣٠٥**).

واتە: چوومە بەهەشت ڕووبارێکم تێدا بینی، قەراغەکانی لە چادری گەوهەر بوون، منیش دەستم گەیاندە ئەو شوێنەی ئاوەکەی پێدا دەڕوا، تەماشام کرد میسکی ئەذفەرە (**أذفر**[1]: میسکێکی ئەوپەڕی بۆنخۆشە)، گوتم: ئەی جیبریل ئەمە چییە؟ گوتی: ئەو کەوثەرەیە کە خوا بە تۆی داوە (لە بەهەشتدا).

**دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**الْكَوْثَرُ نَهَرٌ فِي الْجَنَّةِ، حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، مَجْرَاهُ عَلَى الْيَاقُوتِ وَالدُّرِّ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ الْمِسْكِ، وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ الْعَسَلِ، وَأَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ الثَّلْجِ**} (**أخرجه الطيالسي: ١٩٣٣، وأحمد: ٥٣٥٥، والترمذي: ٣٣٦١، وقال: حسن صحيح، وابن ماجه: ٤٣٣٤، وأخرجه أيضًا: ابن المبارك: ١٦١٣، وابن أبي شيبة: ٣١٦٦٢، والديلمي: ٤٩٣٢**).

---

(١) المعجم الوسيط، ص ٣١٢، ذفِر وأَذْفَر مِسكٌ جيِّدٌ إلى الغاية.

واتـە: کەوثـەر لـە بەهەشـتدا قەراغـەکانی لـە زێـڕن (واتـە: هـەر لـە زێـڕن، یـان شـێوەی زێـڕ دەکـەن) ئـەو شـوێنەی ئاوەکـەی پێـدا دەڕوات یاقـووت و گەوهـەرە (یاقـوت بەردێـکی زۆر بەنرخـە)، گڵەکـەی لـە میسـك بـۆن خۆشـترە، ئاوەکـەی لـە هەنگویـن شـیرینترەو لـە بەفـر سـپییترە.

ئێمـە لـە هـۆی هاتنـە خواریشـدا دەقێکـمان هێنـا، کەواتـە: ئـەوەی زیاتـر دێتـە بەرچـاو ئەوەیـە کـە مەبەسـت لـە (**کوثـر**)، بـە پلـەی یەکـەم ڕووبارەکەیـە، حەوزەکەیـە، کـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دراوەو، بـەو شـێوەیە وەسـفی کـردوە.

## مەسەلەی دووەم:

**بۆ پەروەردگارت نوێژ بکەو ئاژەڵ سەر ببڕە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە یەك بڕگەدا:

١)- ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾، ئنجا نوێژ بۆ پەروەردگارت بکەو (ئاژەڵانیش) سەربڕە، ئەمەش فەرمانکردنی خوایە ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، کە نوێژ بۆ پەروەردگاری بکات و بۆی سەر ببڕێ، ئایا چی بۆ سەرببڕێ؟ بەدڵنیایی مەبەست پێی ئاژەڵەکانە بە تایبەت هەر چوار جۆری: ڕەشەوڵاخ، حوشتر، مەڕ، بزن. جۆری سەربڕاوەکانیش لە ڕووی وەسفی شەرعییەوە، هەموو جۆرەکانن:

چ قوربانیی لە حەجداو، چ جگەلە قوربانیی، ئنجا نەزر بێ، هەر شێوەیەك بێ، هەر شتێکی سەر بڕی، با بۆ خوا ﷻ سەری ببڕێ.

هەندێك لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا مەبەست پێی نوێژی جەژنی قوربان و قوربانیی سەربڕینە، پێشێ نوێژەکە دەکەن، دوایی قوربانییەکە سەردەبڕن، وەك لە فەرمایشتی لە ڕووی سەنەدەوە صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە نوێژیان کردوە دوایی ئاژەڵەکانیان سەر بڕیون، کەسێك کە پێشتر سەری بڕیوە، فەرموویەتی: ئەوە گۆشتێکەو بیکەن بە خێر، بەڵام قوربانیی دەبێ لە دوای نوێژ بێ، واتە: نوێژ بکرێ، ئنجا قوربانییەکە سەرببڕدرێ، خوا وایفەرمووە: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾، بۆ پەروەردگارت نوێژ بکە، ئنجا سەر ببڕە.

(الطبري)، ئاوا مانای: ﴿ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ ﴾، دەکات، دەڵێ: **(فَاجْعَلْ صَلَاتَكَ كُلَّهَا لِرَبِّكَ خَالِصًا دُونَ مَا سِوَاهُ مِنَ الْأَنْدَادِ وَالْآلِهَةِ، وَكَذَلِكَ نَحْرَكَ اجْعَلْهُ لَهُ دُونَ الْأَوْثَانِ، شُكْرًا لَهُ عَلَى مَا أَعْطَاكَ مِنَ الْكَرَامَةِ وَالْخَيْرِ الَّذِي لَا كُفْءَ لَهُ، وَخَصَّكَ بِهِ، مِنْ إِعْطَائِهِ إِيَّاكَ الْكَوْثَرَ)**، (جامع البيان)[1].

(١) ج١٥، الجزء ٣٠، ص ٣٦١ و ٣٦٢

واتـە: نوێژەکـەت هەمـووی بـا بـۆ پـەروەردگارت بـێ بـە ساغیی، نـەك بـۆ هیـچ کام لـە ئەوانـەی جگـە لـەو، کـە کـراون بـە هاوتـای خـوا لـە پەرسـتراوە سـاختەکان، هەروەهـا بـا سەربڕینەکەشـت تەنیـا بـۆ ئـەو بـێ، جیـا لـە بـت و صەنەمـەکان، ئەویـش وەك سوپاسـگوزاریی لەسـەر ئـەوەی خـوا بـە تـۆی داوە لـە ڕێـز لێگرتـن و، لـەو خێـرەی هیـچ هاوتایـەکی نیـەو، تایبـەتی کـردوە بـە تـۆوە.

شـایانی باسـە: ﴿وَٱنۡحَرۡ﴾، مانـا ڕواڵەتییەکـەی، ئـەو مانایـەی یەکسـەر دێتـە زەینـەوە، واتـە: بـۆ پـەروەردگارت سـەربېڕە، بـەڵام وێـڕای ئـەم واتایـە، واتایـەکی دیکەشـیان بـۆ لێکداوەتـەوە، **(الطبري)** لـە عـەلی کـوڕی ئەبـوو تاڵیبـەوە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، هێناویـەتی، دەڵـێ: **(وَضْـعُ الْيَمِـينِ عَـلَى الشِّـمَالِ فِي الصَّلَاةِ، وَضْعُ الْيَـدِ عَـلَى الْيَـدِ فِي الصَّلَاةِ، أَنْ يَرْفَـعَ يَدَيْـهِ إِلَى النَّحْـرِ، عِنْـدَ افْتِتَـاحِ الصَّـلَاةِ وَالدُّخُـولِ فِيهَـا)**، **(جامـع البيـان: ٣٨٣٠٦)**، واتـە: مەبەسـت پێـی دانـانی دەسـتی ڕاسـتە لەسـەر هـی چـەپ، لـە نوێـژداو، دەسـت لـە سـەر دەسـت دانانـە لـە نوێـژدا، لـە کاتێـك دا دەچێتـە نێـو نوێـژەوە، لـە کاتی **(أَللـه أکـبر)**ی نوێـژ دابەسـتن دا، دەسـتەکانی بـەرز بکاتـەوە بـۆلای سـینەی.

بـەڵام ئـەو مانایـەی باوتـرەو، زیاتـر دێتـە زەینـەوە، ئەوەیـە کـە مەبەسـت پێـی نوێژکـردن و سـەربڕینە، ئنجـا قوربانییـە، نـەزرە، هـەر جـۆرە سـەربڕینێکە، نـاوی خـوای لـێ بێنـەو بـۆ پـەروەردگارت سـەری ببـڕەو، چـاوت لـە پاداشـتی خوابـێ.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**بە دڵنیایی ناحەزی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ دوابڕاوو بێ ئاکامە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ ﴿٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایاتە بە پێزە لە یەك بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾، بە دڵنیایی ناحەزت (ئەی موحەممەد ﷺ!) دوابڕاوو بێ ئاکامە.

(الطبري)، دەڵێ: (**إِنَّ مُبْغِضَكَ يَا مُحَمَّدُ وَعَدُوَّكَ {هُوَ الْأَبْتَرُ}، يَعْنِي بِالْأَبْتَرِ: الْأَقَلَّ وَالْأَذَلَّ الْمُنْقَطِعَ دَابِرُهُ، الَّذِي لَا عَقِبَ لَهُ**)، واتە: ئەی موحەممەد ﷺ! ئەوەی ڕقی لە تۆ هەڵدەستێ و ناحەزو دوژمنی تۆیە، ئەو (أَبْتَر)ە، مەبەستیشی لە (أَبْتَر)، واتە: کەمترین و زەبوونترین و، ئەو کەسەی هیچ سەرەنجام و ئاکامێکی نیەو دوابڕاوە.

هەروەها (**الطبري**) هەر لە تەفسیری ئەم ئایەتە موبارەکەدا، دەڵێ:

(**إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى ذِكْرُهُ، أَخْبَرَ أَنَّ مُبْغِضَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ هُوَ الْأَقَلُّ الْأَذَلُّ، الْمُنْقَطِعُ عَقِبُهُ، فَذَلِكَ صِفَةُ كُلِّ مَنْ أَبْغَضَهُ مِنَ النَّاسِ، وَإِنْ كَانَتِ الْآيَةُ نَزَلَتْ فِي شَخْصٍ بِعَيْنِهِ**).

واتە: خوا ناوی هەر بەرز بێ، هەواڵیداوە کە دژو ناحەزی پێغەمبەری خوا ﷺ کەمترینەو زەبوونترینەو دوابڕاوە، ئنجا ئەمە صیفەتی هەر کەسێکە، کە ڕقی لە پێغەمبەری خوابێ ﷺ لە خەڵك، هەرچەندە ئایەتەکەش لە بارەی کەسێکی دیاریکراوەوە دابەزیبێ.

(**الطبري**) بۆیە وادەڵێ، چونکە لە هۆی هاتنەخواریدا باسمان کرد کە هەندێك لە زلەزلانی قوڕەیش کە ناو هێنراون، گوتوویانە: موحەممەد ﷺ لەبەر

ئەوەی هیچ کوڕی لەدوا نین، بێ پاشەوارەو دوابڕاوەو بێ ئاکامە، پێغەمبەریش ﷺ بەوە دڵی سەغڵەت بووە.

ئنجا (**الطبري**)، دەڵێ: خوا هەواڵیداوە کە هەر کەسێك ڕقی لە پێغەمبەری خوا بێ، لە خەڵکی، ئەوە دوابڕاوەو کەمترینەو زەبوونە، واتە: مەرج نیە تەنیا ئەو چەند کەسە بگرێتەوە کە لە مەککە کاتی خۆی وایان بە پێغەمبەری خوا ﷺ گوتوە، قسەکەشی زۆر جوانە.

زۆرجاریش گوتوومانە: (**إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لاَ يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى**)، تایبەتبوونی هۆکار، ڕێ لە گشتگیر بوونی واتا ناگرێ.

حیکمەتێك کە لەم سوورەتە موبارەکە دەستمان دەکەوێ، ئەوەیە: لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە مەککە بەدەست بێبڕوا کەللەڕەق و ملهوڕەکانەوە، گرفتار بوو، ناوو ناتۆرەیان لە خۆی و لە هاوەڵانی هەڵدەدا، یەکێك لە ناوەکان ئەوەبوو پێیان دەگوت: (**أَبْتَر**)، واتە: دوابڕاوو بێخێر، پێغەمبەریش ﷺ بەوە دڵی سەغڵەت دەبوو، خوا ﷻ ئەم سوورەتەی ناردۆتە خوار بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرەکەی ﷺ و دڵخۆشکردنی و، بەرپەرچدانەوەی ناحەزانی کە نەخێر موحەممەد ﷺ دوابڕاو و بێخێر نیەو خوا خێری زۆری پێداوە،ئنجا ئەو خێرە زۆرەش: چ ڕووبارو گۆلی کەوثەرە، چ پێغەمبەرایەتییە، چ قورئانە، چ ناو بەرزکردنەوەیە، چ مەقامی تکاکردنی گەورەیە (**الشفاعة العُظْمَى**)، چ هەموو ئەو شتانەی دیکەیە، خوا خێرێکی زۆری داوە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆیە پێویستە ئەویش نوێژ تەنیا بۆ پەروەردگاری بکات و، ئاژەڵێکیش کە سەر دەبڕێ، بەس بە ناوی ئەوەوەو بۆ ئەو سەری ببڕێ و، با دڵنیاش بێ کەسێك کە ڕقی لەوەو ناحەزی ئەوە، دوابڕاوەو بێخێرو بێ سەرەنجام و بێ ئاکامە.

خواش بە لوتف و کەرەمی ڕەهای خۆی ئێمە تەوفیق بدات، زیاتر بە دوای ئەو پێغەمبەرە سەروەرو خاتەمە بکەوین و، خوا ئێمەش بەهرەمەند

بـكات بـە ئەنـدازەی خۆمـان، لـەو نیعمەتانـەی بـە پێغەمبـەری خاتەمـی بەخشـیون و، تەوفیقـمان بـدات، ئـەو ئـەرک و کارانـەی بـە پێغەمبـەری خاتەمـی فەرمـوون، مـادام تایبـەت نەبـن پێیـەوە، ئێمـەش پشـك و بەشـمان لـە جێبەجـێ کردنـی ئـەو کارو ئەرکانـەدا هەبـێ، تاکـو پشـك و بەشیشـمان هەبـێ لـەو بەڵێنانـەدا کـە خـوا بـە پێغەمبـەری خاتەمـی داون، بێگومـان هـەر کەسەشـمان لـە قـەدەر خـۆی و بـە ئەنـدازەی خـۆی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٤/ ١/ ١٤٤٢)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٣/ ٨/ ٢٠٢٠) زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی **(الكافرون)**، سـەرەتا پێناسـەو نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە دەخەینـەڕوو، بـۆ ئـەوەی وێنـەی گشـتیی و، هێڵـە سـەرەکییەکانی و چوارچێـوەی ئـەم سـوورەتەمان لەبەرچـاو ڕوون بـێ.

## پێناسەی سوورەتی (الكافرون) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە زیاتـر بـە **(سـورة الكافـرون)** نـاسراوە، بـەڵام ئـەم ناوانەشـی بـۆ بەکارهێـنراون:

**١)-** **(سورة كافرين)**.

**٢)-** **(سورة** قُلۡ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَـٰفِرُونَ **)**.

**٣)-** **(سورة العبادة)**.

**٤-** **(سورة الدين)**.

**٥)-** ئە سوورەتەو سوورەتی **(الإخلاص)**، هەردووکیان **(المقشقشتين)**یشیان پێ گوتراوە.

**(قشـقش)** خـاوەنی **(المعجـم الوسـيط)**[1]، دەڵـێ: **(قَشْـقَشَ اللَّحْـمُ عَـلَى المقْـلَى أَو فِي القِـدْرِ: سُـمِعَ لَـهُ صَـوْتٌ، وقَشْـقَشَ القَطِـرَانُ الجَـرَبَ: أَبـرَأَهُ، تقَشْـقَشَ: تهيَّأَ للـبُرْءِ، تَقَشْـقَشَ**

---

(١) ص٧٣٧.

**الجُـرْحُ: تَقَـشَّرَ للـبُرء**، دەگوتـرێ: (**تَقَشْـقَش اللَّحْـمُ عـلى المِقْلى أوفي القِـدْر**) گۆشـتەكە لەنێـو تاوەكـەدا یـان لـە مەنجـەڵ دا بـرژا یـان سـووركرایەوە، دەنگـی بیسـترا، چ لـە نێـو مەقەڵیـی دا، چ لـە نێـو مەنجەڵـدا كـە گۆشـت دەبرژێـنرێ و دەكوڵـێ، قرچەقـرچ و دەنگێكـی دێ، (**قَشْـقَشَ القَطِـرَانُ الجَـرَبَ**)، واتـە: قەترانەكـە خرووەكـەی نەهێشـت، (**تَقَشْـقَشَ الجُـرْحُ**)، برینـە كـە ئامادەبـوو بـۆ چاكبوونـەوەو گۆشـتە زوونـەی هێنـا، برینەكـە قەتماغـەی بەسـت.

كەواتـە: (**المقشقشـتين**)، یانـی: (**المُبْرِءَتَيْن**)، ئەو دوو سـوورەتەی مـرۆڤ پاكدەكەنەوە، دووری دەخەنـەوە لـە كوفـرو شـیرك و، هەمـوو ئـەو شـتانەی دیكـەی پێچەوانـەی ئیـمان و خـوا بەیەكگرتـن.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

تێكـڕای زانایـان ئـەم سـوورەتەیان بـە مەككەیـی داناوە، لەوبارەوەش ئـەم دەقـە دێنین:

(**عَـنْ عَبْدِاللـهِ بْـنِ عَبَّـاسٍ** ﵄ **قَـالَ: نَزَلَـتْ سُـورَةُ** ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾، **بِمكَـة**)، (**أَوْرَدَهُ السـيوطي فِي الـدر المنثـور: ج٨، ص٦٥٤، وَنَسَـبَهُ لابـن مردويـه، وَقَـالَ: وأخـرج ابـن مردويـه عَـنْ عَبْدِاللـهِ بْـنِ الزُّبـير مثلـه، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣**).

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس ﵄ گوتوویەتـی: ئـەم سـوورەتە: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١﴾، لـە مەككـە دابەزیـوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئـەم سـوورەتە لـە موصحـەف دا ژمارەكـەی سـەدو نـۆ (**١٠٩**)یـە، لـە دابەزینیشـدا ژمـارە هـەژدە (**١٨**)یـە، پێش سـوورەتی (**الفیـل**) دابەزیـوەو، دوای سـوورەتی (**الماعون**).

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمـارەی ئایەتەکانــی ئــەم ســوورەتە شــەش (٦)ە، بەیەکدەنگیــی زانایــان و نــە کەمــترو نــە زیاتریــان گوتــوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە:

پوختــەی نێوەڕۆکــی ئــەم ســوورەتە ئەوەیە، کە خــوا ﷻ فەرمان بــە پێغەمبەرەکەی موحەممــەد ﷺ دەکات، لــە دوای ئەویشــەوە فەرمــان بــە هــەر کەسێك دەکات، کــە لــە دوای پێغەمبــەری خــواوە ﷺ دەڕوات و بــە شــوێن پێــی ئــەودا هەنــگاو دەنــێ، کــە بەبێبڕوایــان ڕابگەیەنــێ بــە گشــتیی: بــە هیــچ شــێوەیەك پەرســتراوانی ئــەوان ناپەرســتێ و، ئەوانیــش پەرســتراوی وی (خــوا عزوجــل) ناپەرســتن، مــادام جگــە لــە خــوا بپەرســتن، نــە ئێســتاو نــە لــە داهاتــووداو، بــا هــەر کەســە لەســەر بەرنامــەی خــۆی بــێ، ئــەم ســوورەتە ســوورەتی دووریــی لێگرتــن و حاشــا لێکردنــی کوفــرە بــە گشــتیی، کــە بــە هیــچ جۆرێــك ئێمــە لــە بــواری بەندایەتیــی کــردن و پەرســتن دا، خاڵــی بەیەکگەیشــتنمان نیــە، بــەڵام ئــەوە مانــای وانیــە کــە لــە بــواری سیاســیی و کۆمەڵایەتیــی و ئابووریــی و ژیــان و گوزەرانــدا، خاڵــی بەیەکگەیشــتن نیــە، بــەڵام لــەوەدا کــە بــڕواداران خــوا دەپەرســتن و بێبڕوایــان جگــە لــە خــوا دەپەرســتن، دوو کۆمەڵــی لێــك جیــان و، لــەوەدا خاتــرو خواییشــی تێــدا نیــەو، خاڵــی بــە یەکگەیشــتن و ڕێککەوتــن نیــە.

هەڵبەتــە هەندێــك لــە زانایانیــش دەڵێــن: (**الكافــرون**)، (**أل**)ەکــە، بــۆ ناســاندنە، بــەڵام ناســاندنی (**عهــد**)ە، واتــە: کۆمەڵــە کافرێکــی دیارییکــراو.

بگــرە هەندێــك گوتوویانــە: مەبەســت چــوار لــە ســەرانی کوفــرە، کــە دوایــی ناویان دێنین.

بەڵام پێم وایە بە پلەی یەكەم ئەو كەسانەی پێغەمبەریان دواندوە، كە لەگەڵیان ڕێك بكەوێ لەسەر ئەوەی لەنێو قەدێ بگەنە یەك، واتە: ئەوانیش خوا بپەرستن و، ئەویش پەرستراوەكانی وان بپەرستێ، بە پلەی یەكەم بەسەر ئەواندا دەچەسپێ، بەڵام بێگومان لە دوای وان، بەسەر هەموو ئەوانەش دا كە بێبڕوان، دەچەسپێ، بە هەموو جۆرو شێوەكانیانەوە، ئەو ڕایە ڕاسترە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی ئەم سوورەتە:

سێ تایبەتمەندیی سەرەكییمان لەم سوورەتەدا دەكەونە بەرچاو:

١- دواندنی نەیارەكان نەیارانی خواپەرستیی، بە ڕوون و ڕاشكاویی كە بە هیچ جۆرێك ئومێدی نەرمكێشییان نەبێ لە پێغەمبەری خوا ﷺ و، لە پشت ئەویشەوە لە هیچ بڕوادارێك كە شوێن پێی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەگرێ.

٢- ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە كە ئەو بەرنامەو ڕێبازانەی سەرجەم بێبڕوایەكانیان لەسەرن، ئایین (دین)ن: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ٦ ﴾.

٣- ڕاگەیاندنی ئەوە كە با هەر كەسە لە سەر بەرنامەی خۆی بمێنێتەوەو، بەرنامەی هیچ كەس هی ئەوی دیكە نیەو، تەواو لێك جیان: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ٦ ﴾.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكانی:

ئێمە كۆی ئەو شەش ئایەتەكەی ئەم سوورەتە موبارەكە دەكەینە دەرسێك.

## پێناسە ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەر شـەش ئایەتەكـەی ئـەم سـوورەتە موبارەكـە پێـك دێ، كـە خـوا ﷻ تێیانـدا ڕوو دەكاتـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، فەرمانـی پـێ دەكات و دەفەرمـوێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ﴾، ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴿١﴾﴾، بڵـێ: ئـەی ئەوانـەی بێبـڕوان، بەگشـتیی ﴿لَا أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾﴾، ئـەوەی ئێـوەی دەیپەرسـتن، ناپەرسـتم، ئـەوەی ئەوانیش پەرستوویانە، جۆراو جۆر بـووە، هەندێكیان خۆریـان دەپەرسـت، هەندێكیـان مانـگ، بەشـێكیان هەندێـك لـە ئەسـتێرەكان، بەشـێكیان هەندێـك مرۆڤیـان پەرسـتوون، هەندێكیشـیان پەیكەریـان پەرسـتوون، هەندێكیـان ئاژەڵیـان پەرسـتوون، هەندێكیـان دارو درەختیـان پەرسـتوون، هەندێكیـان هـەواو ئـارەزووی خۆیانیـان پەرسـتوە، هەمـوو ئەوانـەی ئێـوە دەیانپەرسـتن، مـن نایانپەرسـتم، ﴿وَلَا أَنْتُمْ عَابِدُونَ مَا أَعْبُدُ ﴿٣﴾﴾، ئێـوەش پەرسـتەری ئـەوە نابـن كـە مـن دەیپەرسـتم، واتـە: ئێـوە تاكـو بێبڕوابـن بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺو، هەتـا جگـە لـە خـوا بپەرسـتن، ناتوانـن بڵێـن: خـوا دەپەرسـتین، چونكـە خـوا پەرسـتیی ئەوەیـە خۆتـی بـۆ یەكلایـی بكەیـەوە: ﴿قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا ﴿١١٠﴾﴾ **الكهـف**، واتـە: بڵـێ: مـن تەنیـا مرۆڤێكـم وەك ئێـوە، سرووشـم بـۆ لا دەكـرێ كـە پەرسـتراوی ئێـوە یـەك پەرسـتراوە، ئنجـا هـەر كەسـێك بـە ئومێـدی دیـداری خوایـە، (كـە بەسـەر بەرزیـی بچێتـەوە خزمـەت خـوا) بـا كـردەوەی بـاش بـكات و، لـە پەرسـتنی پەروەردگاریـدا هیچكـەس نەكاتـە هاوبـەش.

﴿وَلَا أَنَا عَابِدٌ مَا عَبَدْتُمْ ﴿٤﴾﴾، ئەمـە دەگونجـێ بـۆ جەختكردنـەوە بـێ، منیـش پەرسـتەری ئـەوە نیـم كـە ئێـوە دەیپەرسـتن، دەشـگونجێ ئـەوەی پێشـێیان بـۆ ئێسـتا بـێ و ئەمەیـان بـۆ داهاتـوو بـێ، یـان بـە پێچەوانـەوە، ئـەوەی پێشـێیان بـۆ داهاتـوو

بێ و ئەمەیان بۆ ڕابردوو بێ، یانی: لەڕابردووشدا ئەوەم نەپەرستوە، كە ئێوە پەرستووتانە، ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥﴾، ئێوەش لەڕابردوودا پەرستەری ئەوە نەبوون كە من پەرستوومە، یاخود: لە داهاتووش دا ئێوە ئەوە ناپەرستن كە من دەیپەرستم، ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾، ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و، ئایین و بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم، واتە: هەر كەسە لەسەر ڕێی خۆی بمێنێتەوە، ئەو دوو ڕێیە پێچەوانەو دژی یەكدیین و پێكەوە كۆك نین، تاكو خاڵێكی پێكگەیشتنیان هەبێ، خوا پەرستیی و جگە لە خوا پەرستیی، دوو شتی دژو پێچەوانەی یەكن و، بە هیچ جۆرێك ڕێككەوتنیان لەنێواندا نابێ، بەڵام ئەوە مانای وانیە هیچ شتێكی بڕواداران لەگەڵ هیچ شتێكی بێبڕوایاندا تێك ناكاتەوە، بەڵكو لە بواری دنیادارییدا، لە بوارەكانی سیاسیی و حوكمڕانیی و ئیدارەدان و ئابووریی و كۆمەڵایەتیی و جەنگ و ئاشتیی و ... هتددا، دەگونجێ خاڵی پێكگەیشتن هەبێ.

بەڵام لەوەدا ئایا خوا بپەرسترێ یان جگەلە خوا؟ هیچ بواری ڕێككەوتن و پێكگەیشتن نیە، یان دەبێ خوا بپەرسترێ بە ساغیی، یاخود جگە لە خوا دەپەرسترێ، بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی پەرستن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ئەی (موحەممەد!) بڵێ: ئەی بێبڕواینە ﴿١﴾ ئەوەی دەیپەرستن نایپەرستم ﴿٢﴾ هەروەها ئێوەش پەرستەرانی ئەوە نابن كە دەیپەرستم ﴿٣﴾ دیسان من پەرستەری ئەوە نابم كە دەیپەرستن ﴿٤﴾ ئێوەش پەرستەرانی ئەوە نابن كە دەیپەرستم ﴿٥﴾ ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و ئایینی خۆیشم بۆ خۆم ﴿٦﴾}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلۡكَٰفِرُونَ): (**الكُفْرِ فِي اللُّغَةِ: سَتْرُ الشَّيْءِ، وَالكُفْرَانُ فِي جُحُودِ النِّعْمَةِ أَكْثَرُ اسْتِعْمَالاً، والكُفْرُ فِي الدِّينِ أَكْثَرُ**)، (**كُفْر**) لە زماندا مانای داپۆشینی شتێكە، لە (**كَفْر**)ەوە هاتووە، (**كَفَرَهُ: سَتَرَهُ**)، داپۆشیی، بەڵام (**كُفْرَان**): لە نكووڵییلێكردنی چاكان دا زیاتر بەكاردەهێنرێ، (**كُفْر**)یش، لە بێبڕوایی بە ئایین دا، زیاتر بەكاردەهێنرێ، دەگوترێ: (**كَفَرَ كُفْراً**)، واتە: بێبڕوابوو بە بێبڕوایی، بەڵام دەگوترێ: (**كَفَرَ كُفْرَاناً**)، واتە: سپڵەبوو بە سپڵەیی و بێنمەكیی.

(لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ): (**العبُودِيةُ: إِظْهَارُ التَّذَلُّلِ، وَالعِبَادَةِ أَبْلَغُ مِنْهَا لأَنَّها غَايَةُ التَّذَلُّلِ ولايستحِقُّها إلاّ من له غاية الإفضالِ**)، (**عبودية**): بریتییە لە دەرخستنی زەبوونیی و ملكەچیی، بەڵام (**عبادة**): مانایەكەی بەهێزترە، چونكە بریتییە لە ئەوپەڕی ملكەچیی و زەبوونیی دەربڕین، ئەویش تەنیا شایستەی كەسێكە خاوەنی ئەوپەڕی چاكە بێ لە ژیانی مرۆڤدا (كە خوای بەرزی مەزنە).

(وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ): (**العَابِدُ: المُوَحِّد، وَالجَمْعُ عَبَدَة وَعُبَّد وَعُبَّاد**)، (عابد) یانی: خوا بە یەكگر، خوا پەرست، كە بە (**عَبَدَة وَعُبَّد وَعُبَّاد**)، كۆدەكرێتەوە.

(مَا عَبَدتُّمْ): ئەمە بە دوو جۆر مانا کراوە:

أ- (ما)، یان (**موصولة**)یە، یانی: (**الذي عَبَدْتُمُوهُ**)، ئەوەی پەرستووتانە، واتە: من پەرستەری ئەوە نابم کە ئێوە دەیانپەرستن.

ب- (ما)، دەگونجێ چاوگیی (**مصدريَّة**) بێ، واتە: (**ولا أنا عابد عِبَادَتَكُمْ**)، من ئەو پەرستنەی ئێوە دەیپەرستن، ئەوە ناپەرستم، کە بریتیە لە پەرستنی جگە لە خوا.

(لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ): ئایینی خۆتان بۆ خۆتان و، ئایینی خۆم بۆ خۆم، (**المعجم الوسيط**)[1]، پازدە (١٥)، مانای بۆ وشەی (دین)، هێناون، دەڵێ:

**(الدِّينُ: الدِّيانة، ١-والدِّينُ اسمٌ لجميع ما يُعبد به الله، ٢-والدِّينُ المِلَّة، ٣-والدِّينُ الإسلامُ، ٤-والدِّينُ الإعتقادُ بالجَنَان والإقرارُ باللسان وعملُ الجوارح بالأَركان، ٥-والدِّينُ السِّيرةُ، ٦-والدِّينُ العادةُ، ٧-والدِّينُ الحالُ، ٨-والدِّينُ الشأْنُ، ٩-والدِّينُ الوَرَعُ، ١٠-والدِّينُ الحسابُ، ١١-والدِّينُ المُلْكُ، ١٢-والدِّينُ السُّلْطَانُ، ١٣-والدِّينُ الحُكْمُ، ١٤-والدِّينُ القَضَاءُ، ١٥-والدِّينُ التَّدْبيرُ، والجمع: أَدْيُنٌ، وديونٌ، وأَديان).**

واتە: (**دین**)، بە مانای دینداریيەو، ئەم پازدە (١٥) واتایەی هەن:

١- ناوە بۆ هەموو ئەوەی خوای پێ دەپەرسترێ.

٢- بە مانای ڕێبازو بەرنامەیەکە، کەسێك لە پێشیەوەیە.

٣- بە مانای ئیسلامە.

٤- بە مانای بڕواهێنانە بە دڵ و، دانپێداهێنانە بە زمان و، کردەوەیە بە ئەندامەکان.

٥- بە مانای ژیاننامە دێ، ڕێبازو ژیاننامە.

٦- بە مانای نەرێت دێ.

٧- بە مانای حاڵ دێ، حاڵ و بارودۆخ.

---

(١ ص٣٠٧.

٨- بە مانای کار دێ.

٩- بە مانای خۆپارێزیی لە حەڕام (**الورع**) دێ.

١٠- بە مانای سزاو پاداشت، یاخود لێپرسینەوە، دێ.

١١- بە مانای حوکمڕانیی دێ.

١٢- بە مانای دەستەڵات دێ.

١٣- بە مانای حوکم و بەرنامەدانان، یاخود دادوەریی دێ.

١٤- بە مانای بڕیاردان، یاخود دادوەریی کردن دێ.

١٥- بە مانای نەخشەدانان و بەرنامەدانان دێ.

وشەی (**دین**)، بە (**أَدْيُنٌ و ديونٌ وأَديان**)، کۆدەکرێتەوە.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سوورەتە

دەربارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سوورەتە موبارەکە، چەند گێڕدراوەیەك هەن، ئێمە دووانیان دێنین، کە لە ڕووی سەنەدەوە گرفت و ئیشکالێکی وایان لەسەر نیە:

**١- {عَنْ سَعِيدِ بنِ مِينَا مَوْلَى البَخْتَرِيِّ، قَالَ: « لَقِيَ الوَلِيدُ بْنُ الْمُغِيرَةِ وَالْعَاصُ بْنُ وَائِلٍ، وَالْأَسْوَدُ بْنُ الْمُطَّلِبِ، وَأُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ، رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالُوا: يَا مُحَمَّدُ، هَلُمَّ فَلْنَعْبُدْ مَا تَعْبُدُ، وَتَعْبُدْ مَا نَعْبُدُ، وَنُشْرِكْكَ فِي أَمْرِنَا كُلِّهِ، فَإِنْ كَانَ الَّذِي جِئْتَ بِهِ خَيْرًا مِمَّا بِأَيْدِينَا، كُنَّا قَدْ شَرَكْنَاكَ فِيهِ، وَأَخَذْنَا بِحَظِّنَا مِنْهُ؛ وَإِنْ كَانَ الَّذِي بِأَيْدِينَا خَيْرًا مِمَّا فِي يَدَيْكَ، كُنْتَ قَدْ شَرَكْتَنَا فِي أَمْرِنَا، وَأَخَذْتَ مِنْهُ بِحَظِّكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ۝١﴾، حَتَّى انْقَضَتِ السُّورَةُ} (أخرجه الطبري فِي جامع البيان: ج٣٠، ص٢١٤، قال مُؤَلِّفا الإستيعاب: هَذَا مُرْسَلٌ حَسَنُ الإِسْنَادِ).**

واتـە: سـەعیدی کـوڕی مینـا خزمەتـکار و کۆیلـەی ئازادکـراوی بەختەریـی، گێڕاویەتـەوە دەڵـێ: وەلیـدی کـوڕی موغیـرە و، عاصـی کـوڕی وائیـل و ئەسـوەدی کـوڕی موتتەڵیـب، و ئومەییـەی کـوڕی خەلـەف، هەرچواریـان گەیشـتنە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتیـان: ئـەی موحەممـەد ﷺ! وەرە بـا ئـەوەی تـۆ دەیپەرسـتی ئێمـەش بیپەرسـتین و، تـۆش ئـەوەی ئێمـە دەیپەرسـتین، بیپەرسـتەو، ئێمـە تـۆ لـە هەمـوو کاروبـاری خۆمانـدا بەشـدار پـێ دەکەیـن، ئنجا ئەگـەر ئـەوەی تـۆ هێناوتـە باشتر بـوو لـەوەی بەدەسـت ئێمەوەیـە، ئێمـە لـە شـتە باشـەکەی تـۆدا هاوبـەش بوویـن و، پشـك و بەشـی خۆمانمـان لێوەرگرتـوە، بـەڵام ئەگـەر ئـەوەی بەدەسـتی ئێمەوەیـە باشتر بـوو، لـەوەی بەدەسـتی تۆوەیـە، تـۆش لـە کاری ئێمـەدا بەشـدار بـووی و پشـك و بەشـی خـۆت لـەو شـتە باشـەی ئێمـە وەرگرتـوە، خـوا عزوجـل ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی دابەزانـد: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾.

**٢- {عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما، أَنَّ قُرَيْشاً، قَالَ: لَوِ اسْتَلَمْتَ آلِهَتَنَا لَعَبَدْنَا إِلَهَكَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾﴾} (ذكره السيوطي فِي الدر المنثور: ج٨، ص٦٥٥، ونسبه لعبد بن حُميد وابن المنذر وابن مردويه).**

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس رضي الله عنهما دەڵـێ: قورەیشـییەکان بـە پێغەمبەریـان ﷺ گـوت: ئەگـەر تـۆ دەسـت بـە پەرسـتراوەکانی ئێمـەدا بێنـی (بەلایانـدا بشـکێیەوەو بیانپەرسـتی) ئێمـەش پەرسـتراوی تـۆ دەپەرسـتین، خـوا عزوجـل ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی دابەزانـد.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ لـەم سـوورەتە موبارەكـەدا دەفەرمـوێ: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێكردنم بـە نـاوی خوایـە، ئـەوەش مەبەسـت پێـی بـەلای كەمـەوە چوارشـتەو، پێویسـتە لـە كاتی بێـژرانی دا لـە عەقڵ و دڵ دا ئامادەبـن:

١ - ئەم كارە تەنیا بۆ خوا دەكەم.

٢- ئەم كارە بە پێی شەرعی خوا دەكەم.

٣- ئەم كارە بە تواناو یارمەتیی خوای باڵادەست دەكەم.

٤- ئەم كارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١ ﴾، خـوا ﷻ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەدوێنـێ، پێـی دەفەرمـوێ بڵێ: ئـەی بێبڕوایـەكان! هەندێك لە زانایـان گوتوویانە: بۆچـی خـوا ﷻ بـۆ خـۆی ڕێـك نەیفەرمـوە: (أَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ )؟ وەڵامەكـەی زۆر ئاسـانە، ئەویـش ئەوەیـە كـە كۆمەڵێـك لـە بێبڕوایـان - وەك لـە هـۆی هاتنەخـواردا باسـمانكرد - هەروەهـا شـتێكی زۆریـش بـاوە، كـە نـەك جارێـك چەنـد جاریـش بێبڕوایـەكان هاتوونـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ و ویسـتوویانە لەگەڵـی ڕێكبكـەون و بـە لای خۆیانیـدا بكێشـن، وەك لـە سـوورەتی (القلـم)دا دەفەرمـوێ: ﴿ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ٩ ﴾، ئـەوان زۆر پێیـان خۆشـەو حـەز دەكـەن، نەرمكێشـیی بكـەی، ئەوانیـش نەرمكێشـیی دەكـەن، ئـەو كەسـەی لەسـەر بەتـاڵ و ناهەقـە بـە ئاسـانیی دەسـتبەرداری باتیڵەكـەی دەبـێ، یاخـود نەرمكێشـیی تێـدا دەكات، بـەڵام گرفـت بـۆ كەسـێكە لەسـەر هەقـە، ناگونجـێ مـرۆڤ لـە سـەر هـەق نەرمكێشـیی بـكات و لێـی دابـبـەزێ و خاتـر خواییشـی تێـدا بەكاربێنـێ، ئنجـا ئەوانـە ئەوەیـان بـۆ پێغەمبـەری

خـوا ﷺ پێشـنیار کـردوە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ ﴾، پێیـان بڵـێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾، ئـەی بێبڕوایـەکان!

﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ ﴾، ئـەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن، مـن نایپەرسـتم، ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ ﴾، ئێـوەش پەرسـتەری ئـەوە نیـن، کـە مـن دەیپەرسـتم، ﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ ﴾، هەروەهـا منیـش پەرسـتەری ئـەوە نیـم، کـە ئێـوە دەیپەرسـتن، ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ ﴾، دیسـان ئێـوەش پەرسـتەری ئـەوە نیـن، کـە مـن دەیپەرسـتم.

بـە نسـبەت ئـەم دوو ئایەتـەی دوایـی - وەك دواییـش لـە مەسـەلە گرنگـەکان دا زیاتـر تیشـکی دەخەینـە سـەر - زانایـان زۆر مشـت و مڕیـان بـووە، کـە ئایا دوو ئایەتـی چـوارەم و پێنجـەم، جەختکـەرەوەی ئایەتـەکانی پێشـوون و، ئایـەتی چـوارەم: ﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴾، جەختکـەرەوەی مانـای ئایەتـی دووەمـە: ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ ﴾، هەروەهـا ئایەتـی پێنجـەم: ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ ﴾، هـەر جەختکـەرەوەو داکۆکییکـەری ئـەو مانایەیـە کـە لـە ئایەتـی سـێیەمدا هاتـوە: ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ ﴾؟

یاخـود مەبەسـت لـە ئایەتـی یەکـەم: ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ ﴾، واتـە: لـە داهاتـوودا ناپەرستم ئەوەی ئێـوە دەیپەرسـتن، ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ ﴾، ئێـوەش لـە داهاتـوودا ئـەوەی مـن دەیپەرسـتم، نایپەرسـتن.

﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ ﴾، لەڕابردووشـدا مـن پەرسـتەری ئـەوە نەبـووم، کـە ئێوە پەرسـتووتانە، ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ ﴾، هەروەهـا ئێوەش پەرسـتەری ئـەوە نەبـوون، کـە مـن پەرسـتوومە؟

یاخـود بەپێچەوانـەوە: ئایەتەکانـی پێشـێ بـۆ ڕابـردوون و هـی دوایـی بـۆ داهاتـوون؟ بـە هەمـوو ئـەو ڕایانـە، زانایـان قسـەیان لـە بـارەی چەمـك و واتـای ئـەم ئایەتـە موبارەکانـەوە کـردوە.

لە كۆتایی دا خوا دەفەرمووێ: ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾، ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و، ئایین و بەرنامەی خۆشم بۆ خۆم.

پوختەو كورتەی واتای گشتیی ئەم سوورەتە موبارەكەش ئەوەیە، كە خوا سُبحانه وتعالى بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمووێ: بانگی بێبڕوایەكان بكات بە گشتیی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾، (أل)ی سەر ﴿ٱلۡكَٰفِرُونَ﴾، بۆ ناساندنە، ناساندنەكەش بۆ جینسە، یانی: تێكڕای كافرەكان، هەموو ئەوانەی بێبڕوان، بانگیان بكەو پێیان بڵێ: ﴿لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢﴾، ئەوەی ئێوە دەیپەرستن (هەرچییەكەو هەر شتێكە) من نایپەرستم، ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٣﴾، ئێوەش (هەتا لەسەر كوفر بن) ئەوەی من دەیپەرستم، نایپەرستن، با بەڕواڵەت پەرستشەكانیشی بۆ ئەنجام بدەن، بەڵام تاكو جگە لە خوا بپەرستن، پەرستنەكەتان بۆ خوا، بە پەرستن دانانرێ، ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ٥﴾، ئەوە ئەگەر بۆ جەختكردنەوە بێ واتە: دڵنیابن من پەرستەری ئەوە نابم، كە دەیپەرستن و، ئێوەش پەرستەری ئەوە نابن كە دەیپەرستم، ﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ٦﴾، كەواتە: سەرەنجام: ئێوە ئایین و بەرنامەی خۆتان، كە بریتیە لە پەرستنی جگەلە خوا، بۆ خۆتان و، ئایین و بەرنامەی منیش، كە بریتیە لە پەرستنی خوا، بە تەنیا بۆ خۆم.

## مەسەلە گرنگەکان

### هەمووی یەك مەسەلەیە:

**فەرمانكردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ بە پێڕاگەیاندنی بێبڕوایەكان، كە بە هیچ جۆرێك ئەو پەرستراوانی ئەوان ناپەرستێ و، ئەوانیش پەرستراوی وی ناپەرستن، واتە: هەر كەسە لەسەر ئایین و بەرنامەی خۆی دەبێ و، لەسەری دەمێنێتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ۝٦﴾

### شیكردنەوەی ئەو ئایەتانە، لە شەش (٦) بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾، بڵێ: ئەی بێبڕوایەكان! دەستپێكردنی سوورەتەكە بە (قُلْ)، بۆ گرنگیی پێدانە بەوەی لە دوای (قُلْ)ەوە دێ، كە قسەیەكە دەویسترێ بە خەڵك ڕابگەیەنرێ بە شێوەیەكی دەق لەسەر كراو و، ئاماژەیە بەوەی موحەممەد ﷺ بۆیە نێردراوەو ڕەوانەكراوە، ئەو پەیامەیان پێ ڕابگەیەنێ، ئەو سوورەتانەش كە لە قورئاندا بە (قُلْ)، دەست پێدەكەن پێنج سوورەتن:

١- سوورەتی (الجن): ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ۝١﴾.

٢- سوورەتی (الكافرون): ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾.

٣- سوورەتی (الإخلاص): ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١﴾.

٤- سووڕتی (الفلق): ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١﴾.

٥- سوورەتی (الناس): ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١﴾.

خوا ﷻ لێرەدا بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەفەرمووێ: بڵێ: ئەی بێبڕواینە! ئایا (ئەی بێبڕوانیە!) مەبەست پێی كێیە؟ ژمارەیەك لە ڕوونكەرەوانی قورئان گوتوویانە: مەبەست پێی ئەو چوار كەسەن، كە ئەو پێشنیارەیان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ كردوە، بە نوێنەرایەتیی كافرەكانی دیكە و، بریتی بوون لە: (**الوليد بن المغيرة المخزومي، العاص بن الوائل السهمي، الأسود بن مطلب، أمية بن خلف**)، هەڵبەتە ئەم چوارەش، چوار كەس بوون لە زلەزلەكانی قورەیش، زۆر ناودارو قسەڕۆیشتوو دەسترۆیشتوو بوون، بێگومان كە هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەوەیان بۆ پێشنیار كردوە، كە لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسمانكرد: ئەی موحەممەد! ئەگەر ئەوەی ئێمە لەسەرینی باشتر بوو، ئەگەر تۆش پەرستراوەكانی ئێمە بپەرستی، پشك و بەشت لەو باشەیەدا دەبێ و، ئەگەر ئەوەی تۆش باشتر بوو، ئێمەش پەرستراوی تۆی دەپەرستین و پشك و بەشمان تێیدا دەبێ، ئەوانە بە دڵنیایی بە نوێنەرایەتیی هەموو بێبڕوایەكان هاتوون بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، كە ڕێككەوتنێكی لەگەڵدا بكەن، لەسەر ئەوەی ئەو لە هەقەكەی خۆی تۆزێك دابەزێ بەرەو ناهەقی ئەوان و، ئەوانیش ئامادەن دەستبەرداری ناهەقەكەی خۆیان بن، ئەوەش ڕێك چەمك و واتای ئەو ئایەتە موبارەكەی سوورەتی (**القلم**) وەبیر دێنێتەوە، كە دەفەرمووێ: ﴿وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ٩﴾، واتە: ئەوان خۆزگە دەخوازن و پێیان خۆشە ئەگەر تۆ نەرمكێشیی بكەی بەلایاندا، ئەوانیش نەرمكێشیی دەكەن.

كەواتە: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ١﴾، واتە: بڵێ: ئەی بێبڕواینە، ئەو چوار كەسە بە پلەی یەكەم و، لە دوای ئەوانیشەوە هەموو بێبڕوایەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەری كۆتایی ﷺ، بەڵام ئەگەر هۆی هاتنەخواریش تایبەت بێ

بەو چوارانەوە و، بە سەرجەم بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەرەوەش ﷺ، بێگومان چەمك و واتای: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ ﴾، پەردەی کات و شوێن دەدڕێ و، تێکڕای بێبڕوایەکان لە هەموو کاتەکانداو، لە هەموو شوێنەکاندا دەگرێتەوە، هەموو ئەوانەی هەقێك کە لە خواوە پێیان دەگات، دایدەپۆشن و ڕەفزی دەکەن و بۆی ملکەچ نابن، کەواتە: ئەگەر هۆی هاتنەخواریش تایبەت بێ بەو چوار سەرانەی خەڵکی کوفرو سەرجەم بێبڕوایەکان لە پشتیانەوە، چەمك و واتایەکەی گشتییە بۆ تێکڕای بێبڕوایان، دیارە ئێمە دوایی کورتە باسێك لە بارەی کوفرو کافرانەوە دەکەین، بۆیە لێرەدا زۆر ناچینە نێو وردەکاریی ئەوەی کوفر بریتیە لە چیی و، کافرەکان کێ و کێن و، چەند جۆرن و، سیفەتەکانیان چیین؟ چونکە دواتر خوا پشتیوان بێ تیشکی دەخەینە سەر، ئنجا دوای ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد، بانگیان بکات، ئەی بێبڕواینە!

٢)- ﴿ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴾، ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، من نایپەرستم.

بێگومان ئەوەی ئەوان پەرستوویانە، هەر دیارە چی بووە، لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا، ئەو پەیکەرانە بوون کە دایاندەتاشین، هەروەها هەندێکیان خۆریان دەپەرست و، هەندێکیان مانگیان دەپەرست و، هەندێکیان ئەستێرەکانیان دەپەرستن، هەندێکیان هەر ئەو سادینانەیان پەرستوون، ئەو بتەوانانەی خزمەتی بتەکانیان کردوەو، لە پەنای بتەکانیش دا ژیاون و، هەندێکیان هەواو ئارەزووی خۆیانیان پەرستوەو، هەندێکیان هەموو یان بەشێك لەو شتانەیان پەرستوە کە پەرستراون لە ڕۆژگاری ئەواندا، واتە: پەرستراوەکانیان زۆرو جۆراو و جۆر بوون.

لێرەدا خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەفەرموێ: پێیانڕابگەیەنە بە هیچ جۆرێك ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، من نایپەرستم.

٣)- ﴿ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴾، هەروەها ئێوەش پەرستەرانی ئەوە نابن، کە من دەیپەرستم، ئنجا لێرەدا هەندێك لە زانایان پرسیارێکیان کردوە و گوتوویانە: بێبڕوایەکان

بە جۆرێك لە جۆرەكان خوایان پەرستوە، بەڵام بت و صەنەم و پەرستراوەكانی دیكەیان كردوونە هاوبەشی خوا، ئەدی بۆچی لێرەدا، دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٣﴾، ئێوە پەرستەرانی ئەوە نابن كە من دەیپەرستم؟

وەڵامەكەی ئەوەیە كە ئەوان بەو شێوەیەی خوا فەرمانی پێكردوون، نەیانپەرستوە، چونكە دەبێ خوا ﷻ بپەرسترێ بەو شێوەیەی فەرمانی پێكردوە، تەنیا خۆشی بپەرسترێ، واتە: دەبێ دوو مەرج هەبن، لە پەرستنی خوادا:

**یەكەم:** خوا بەتەنیا بپەرسترێ.

**دووەم:** بەو شێوەیەش بپەرسترێ، كە خۆی فەرمانی پێكردوە.

بەڵام ئەوانە هیچ كام لەم دوو مەرجەیان لە پەرستنەكەیاندا نەبووە:

**یەكەم:** هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا كردوە.

**دووەم:** بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان خوایان پەرستوە.

٤)- ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ﴾، منیش پەرستەری ئەوە نابم، كە ئێوە پەرستووتانە.

٥)- ﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٥﴾، ئێوەش پەرستەری ئەوە نابن، كە من دەیپەرستم، (هەتا لەسەر كوفر بمێننەوە).

ئێستاش باسەرنجێكی وردتر لە دووبارە بوونەوەی ڕستەكانی ئەم سوورەتە بدەین: كە دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ۝٤ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ۝٥﴾، بێگومان ڕستەیەك كە بەناو دەست پێدەكات، دەلالەت دەكات لەسەر چەسپاویی (**الجُمْلَة الإِسْمِيّة تَدُلُّ عَلَى الثَّبَاتِ والرسوخ**)، پێشێ بە ڕستەی كردەوە هێنای: ﴿لَآ أَعۡبُدُ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ﴾، من پەرستەر نابم بۆ ئەوەی ئێوە پەرستووتانە، ئەمە مانایەكەی زیاتر دەچەسپێ، بەڵام هی ئەوان دووجاران بە وشەی: ﴿عَٰبِدُونَ﴾ هێناویەتی، چونكە ئەوان چەسپاو بوون لەسەر پەرستنی جگە لە خوا، كە پەرستنی پەرستراوەكانیانە، زانایان لە بارەی

ئـەم چـوار جـار دووبـارە بوونەوەیـە، ڕای جـۆراو جۆریـان هـەن و سـەرجەم چـواری سـەرەكیین:

(**ابـن عُثَيْمِـين**) خـوا لێـی خۆشـبێ لـە تەفسـیرەكەی خـۆی (**جـزء عـمَّ**)دا[1]، هـەر چـوار ڕایەكـە دێنـێ، بەمجـۆرەی خـوارێ:

**یەكەم:** ئەوەیە كە دوو ڕستەكەی دوایین: ﴿ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥ ﴾، جەختكەرەوەو تۆخكەرەوەی مانای سێ ڕستەكەی پێشێن، كە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣ ﴾.

(**الشـوكاني**)یش، هـەر ئـەو ڕایـەی هەڵبـژاردووە، زۆرێـك لـە زانایانیـش ئـەو ڕایەیـان هەڵبـژاردوە، هـەروەك چـۆن خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**المرسلات**)دا، دە (**١٠**) جـاران دەفەرمـوێ: ﴿ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ۝١٥ ﴾، هەڵبەتـە وەك كاتـی خـۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (**المرسلات**)دا، باسـمانكردوە، هـەر جارێـك كـە هاتـوە، دووبـارە كردنەوەكـەی پەیوەسـتە بـەو واتایـەوەی لـە پێـش ئـەو ئایەتـەوە هاتـوە، واتـە: هیچـی دووبـارەی كردنـەوەی خاڵیـی لـە حیكمـەت و واتایەكـی نـوێ نیـە.

هەروەهـا سـی و یـەك (**٣١**) جـار لـە سـوورەتی (**الرحمـن**)دا: ﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾، هاتـوە، ئـەی كۆمەڵـەی جنـد مـرۆڤ ! بـە كام لـە چاكەكانـی پەروەردگارتـان بێبـڕوان و بەدرۆیـان دادەنێـن؟ ئەویـش دیسـان لـە بەرانبـەر هـەر نیعمەتێـك دا خـوای پـەروەردگار، ئـەو ڕسـتەیە دووبـارە دەكاتـەوە.

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**القمـر**)دا، كـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ۝١٧ ﴾، ئەمیـش چـوار جـاران دووبـارە بۆتـەوەو هـەر دووبـارە یـەك ئـەو شـوێنە خواسـتوویەتی.

---

(١) ص٣٤١.

**دووەم:** دووەکانی دوایی بۆ داهاتوون و، دووەکانی پێشێ بۆ ئێستان: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢﴾، بڵێ: ئەی بێبڕوواینە! ئێستا ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، من ناپەرستم، ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣﴾، ئێوەش ئێستا پەرستەری ئەوە نابن، کە من دەیپەرستم، ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤﴾، لە داهاتووشدا من پەرستەری ئەوە نابم، کە ئێوە دەیپەرستن، ﴿وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥﴾، هەروەها ئێوەش لە داهاتوودا پەرستەری ئەوە نابن، کە من دەیپەرستم، هەتا لەسەر کوفر بمێننەوە.

**سێیەم:** ڕستەکانی یەکەم و دووەم: ﴿لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣﴾، واتە: بتەکانی ئێوە ناپەرستم و ئێوەش خوا ناپەرستن، بەڵام ڕستەکانی سێیەم و چوارەم: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥﴾، واتە: ئەو پەرستنەی ئێوە ڕەچاوی دەکەن، من ئەم پەرستنە ڕەچاو ناکەم و، ئێوەش پەرستنەکەی من ڕەچاو ناکەن، کەواتە **(ما)** لە: ﴿مَّا عَبَدتُّمْ﴾ و ﴿مَآ أَعْبُدُ﴾دا، لە ڕستەی سێیەم و چوارەم دا، دەگونجێ **(ما الموصولة)** بێ، یانی: ئەوەی ئێوە دەیپەرستن، یاخود **(ما المصدرية)** بێ، واتە: **(عبادتكم)** پەرستنی ئێوە.

**چوارەم:** ڕستەی یەکەم و دووەم: ﴿لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ۝٢ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٣﴾، مەبەست پێیان بواری کردەوەیە: واتە: من بەکردەوە ئەوە ناپەرستم کە ئێوە دەیپەرستن، ڕستەی سێیەم و چوارەم: ﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ۝٤ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ۝٥﴾ لە بواری ڕازییکردن و پەسەند کردندان، واتە: ئەوەی ئێوە دەیپەرستن من قبووڵی ناکەم و لێی ڕازیی نیم[1].

لە کۆتاییدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پێیان بڵێ:

---

(١) (إبن عثيمين) ئەو قسەیەی پاڵداوەتە لای (إبن تيمية) بەڵام کە گەڕامەوە بۆ (مجموع الفتاوى) ج١٦ ص٥٣٤، ئەو عیبارەتەی ئەو بەناوی ویەوە هێناویەتی، نەمبینی!

٦)- ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ۝٦ ﴾، ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان، منیش ئایین و بەرنامەی خۆم بۆ خۆم، ئەگەر **(دین)**، بە مانای ئایین و بەرنامە بێ، بەڵام **(دین)**، دەشگونجێ بە مانای سزاو پاداشت بێ، واتە: من سزاو پاداشتی خۆم بۆ خۆم، ئێوەش سزاو پاداشتی خۆتان بۆ خۆتان، یاخود من پاداشتی خۆم بۆ خۆم، ئێوەش سزای خۆتان لەسەر ئەو كوفرەی لەسەرینی، بۆ خۆتان، بەڵام بێگومان لێكدانەوەی مانای (دین) لێرەدا بە ئایین و بەرنامە، ڕاستە.

لێرەدا كۆتایی بە تەفسیری سوورەتی **(الكافرون)**، دێنین و، خوا پشتیوان بێ داهاتوودا كورتە باسێك لە بارەی بێبڕوایی و بێبڕوایانەوە دەكەین و، تیشكی زیاتر دەخەینە سەر چەمك و واتای وشەكانی: **(كُفْـر، كُفَّـار، كافـرون)**.

## کورتە باسێک لەبارەی بێبڕوایی و هۆکارەکانییەوە[1]

بەڕێـــــزان!

لە چوار تەوەردا باسی بێبڕوایی و هۆکارەکانی بێبڕوایی دەکەین:

تەوەری یەکەم: مانای بێبڕوایی (**مَعْنَى الكُفْر**).

تەوەری دووەم: هۆکارەکانی بێبڕوایی بێبڕوایان (**أَسْبَابُ كُفْرِ الكَافِرِين**).

تـەوەرەی سـێیەم: سـیفەتە گشـتییە هاوبەشـەکانی بێبڕوایـان، (**الصِّفَـات العَامَّـة المشـتركة بـين الكافريـن**).

تەوەرەی چوارەم: جۆرەکانی بێبڕوایان (**أَصْنَافُ الكُفَّار**).

بێبڕوایانیش دەبن بە پێنج جۆری گشتیی:

١- مولحیدەکان.

٢- خاوەن کتێبەکان.

٣- هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان.

٤- مونافیقەکان.

٥- هەڵگەڕاوەکان.

---

(١) ئێمـە ئـەم کورتـە باسـە ڕاسـتەوخۆ زۆر بـە پوختکراوەیـی و گوشراویـی لـە مەوسـووعەی: (الإسـلام كـما يتجـلَّى فِي كتـاب اللـه) وەردەگریـن، لـە کتێبـی دوازدەیـەم لـە چاپـی دووەم و، بەرگـی هەشـت (٨) لـە چاپـی یەکەمیـدا، لاپـەڕە: (١٢٦ -٣١٣).

## تەوەری یەكەم: مانای بێبڕوایی (كفر):

وشەی (كَفْر) لە زمانی عەرەبییدا، بە مانای داپۆشین وشاردنەوە، دێ (الكَفْرُ: السَّتْرُ وَالإِخْفَاءُ)[1]، بابای بێبڕوا بۆیە پێی دەگوترێ: (كَافِر)، چونكە ئەو ڕاستییەی خوا لە زگماكیدا داینـاوەو هەستی پێدەكات، دەیشارێتەوە، كە بریتیە لە بە یەكگرتنی خوا لە بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی و، پەرستراوێتییدا، هەروەها بەندایەتیی خۆی بۆ خوا ﷻ وەك بەندە بوونی تێكڕای دروستكراوەكان و ملكەچبوونیان بۆ خوا، بەڵگەش لەسەر ئەوەی (كُفْر)، لە (كَفْر)ەوە، هاتووەو، بابای بێبڕوا بە مانای داپۆشەرو شێرەوە دێ، جگە لە فەرهەنگەكانی زمانی عەرەبیی، بەڵكو لە پێش ئەوەدا بریتیە لە فەرمایشتی خوا، كە لە سوورەتی (الحديد)، لە ئایەتی ژمارە (٢٠)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمًا ۖ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾ ﴾، واتە: بزانن كە ژیانی دنیا یاریی و خافڵان و جوانیی و خۆهەڵكێشانە لە نێو خۆتانداو، زۆركردنە لە سامان و منداڵاندا، وەك بارانێك كە ڕووەكەكەی جوتیارەكان سەرسام دەكات...

﴿ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ﴾، (كُفَّار)، كۆی (كَافِر)ە، بە مانای جوتیار (زارع)، ئاوێك كە دادەبارێ دووایی ڕووەكی پێ دەڕوێ، یان كشتوكاڵی پێ دەڕوێ، كشتوكاڵكەرەكان جوتیارەكان سەرسام دەبن، بە ڕوانی ئەو ڕووەك و كشتوكاڵە، كە بەهۆی ئەو ئاوەوەی دابەزێنراوە، ڕواوە.

وشەی (كُفْر) لە قورئان دا بە دوو واتایان بەكارهاتوە:

---

(١) المعجم الوسيط، ص٧٩١، (كفر الشيءَ: سَتَرَهُ وغَطّاهُ).

**یەك:** بێبڕوایی بە خواو پێغەمبەرەكەی و قورئان و، سەرجەم ئەوشتانەی خواو پێغەمبەرەكەی فەرمانیان پێكردووین ئیمانیان پێ.بێنین

**دوو:** مانای دووەمی (**كفر**) بریتیە لە سوپاسگوزاریی ئەنجامنەدان بۆ خوا لەسەر چاكەكاریی، بە نسبەت مانای یەكەمی كوفرەوە، ئەم دوو ئایەتە موبارەكە بە بەڵگە دێنینەوە: لە سوورەتی (**الأنفال**) دا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی خراپترین پێڕۆ لە لای خوا، ئەوانەن كە بێبڕوان، چونكە بڕواناهێنن، ئەوانەی پەیمانت لێوەرگرتوون، دوایی هەموو جارێ پەیمانەكەیان دەشكێنن و ئەوان پارێز ناكەن (لە پابەندیی بە پەیمانەوە).

هەروەها دوو ئایەتی دیكەش لەو بارەوە دێنین لە سوورەتی (**التوبة**)دا، كە بێبڕوایی (**كفر**) چی دەگەیەنێ؟ ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةًۢ بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴿٦٦﴾﴾، واتە: ئەگەر لێیان بپرسی دەڵێن: ئێمە تەنیا دەڕژاینە نێو قسان و قسەی ڕێیەو گاڵتەمان دەكرد (خوا ﷻ بە پێغەمبەرەكەی ﷺ دەفەرموێ:) پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بە خواو بە ئایەتەكانی خواو بە پێغەمبەرەكەی دەكرد؟ پۆزش مەهێننەوە، بێگومان دوای ئەوەی بڕواتان هێناوە، بێبڕوا بوونەوە، {واتە: بەو گاڵتەپێكردنە بە خواو بە ئایەتەكانی و بە پێغەمبەرەكەی، كافر بوونەوە} ئەگەر لە كۆمەڵێكتان چاوپۆشیی بكەین {لەبەر ئەوەی دوایی دەگەڕێنەوە} كۆمەڵێك لەبەر ئەوەی تاوانبارن و ناگەڕێنەوە سزایان دەدەین.

بەڵگەش لەو بارەوە كە نادیدە گرتنی چاكەكانی خواو، سوپاس نەكردنی خوا لەسەر چاكەكانی، وشەی كوفری بۆ بەكارهاتوە، زۆرن و نموونەیەك ئەو ئایەتەیە لە سوورەتی (**إبراهیم**): ﴿وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ۖ وَلَئِن

كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِى لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾﴾، واتە: یاد بكەوە كاتێك پەروەردگارتان ڕایگەیاند، ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەن بۆتان زیاد دەكەم و، ئەگەر كوفر (**كُفْرَان**) بكەن، سزای من توندە.

مەبەست لە (**كفر**)، لێرەدا (**كفران**)ە، واتە: ئەگەر چاكەكانی من نادیدەبگرن، من سزام سەختە، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی بكەن لەسەر چاكەكانم، بۆتان زیاد دەكەم.

هەروەها بەڵگەیەكی دیكە لەسەر ئەوەی سپڵەیی، یاخود نادیدەگرتنی چاكە، وشەی (كفر)ی بۆ بەكارهێنراوە، لە قورئاندا ئایەتەكانی (**١٨ و ١٩**)ن لە سووڕەتی (**الشعراء**)، كە دوای ئەوەی مووسا (**عليه السلام**) و هاڕوونی برای دەچنە لای فیرعەون و داوای لێ دەكەن (**بنو إسرائيل**)، چیدیكە نەچەوسێنێتەوەو سۆغرەو بێگاریان پێ نەكات و تەسلیمیان بكات بەوان و، چیدیكە نەیانكاتە كۆیلە، فیرعەون ئاوا وەڵامی دایەوە: ﴿قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِى فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿١٩﴾﴾، (فیرعەون) گوتی: ئایا تۆمان بە گچكەیی لە نێو خۆماندا بە خێونەكردو، چەند ساڵێك لە تەمەنت لە نێو ئێمەدا نە مایەوەو، ئەو كەتنەشت كرد كە كردت و لە كافران بووی؟!

كافر لێرەدا یانی: سپڵە، واتە: تۆ نا سوپاس و بێ ئەمەگ بووی بەرانبەر بە چاكەكانی ئێمە.

كەواتە: لە زاراوەی شەرع داو لە بەكارهێنانی كتێبی خوادا، كە بناغەی شەریعەتی خوایە، (**كفر**) دوو واتای هەن:

**یەكەم:** بێبڕوایی بە خواو، بە هەموو ئەو شتانەی خوا فەرمانی كردوە، بڕوایان پێ بهێنرێ: ئایەتەكانی خواو، پێغەمبەری خواو، دیداری خواو، ڕۆژی دوایی و، فریشتەكان و، پێغەمبەران و...هتد.

**دووەم:** سپڵەیی **(كفران)**، واتە: نكووڵییكردن لە چاكەكانی خواو نا سوپاسیی بەرانبەر بە نیعمەتەكانی خوای بەرزی مەزن.

بەڵام لێرەدا پێویستە ئاگاداری شتێك بین لە مانا كردنی كوفردا، ئەویش ئەوەیە: هەموو ئەوانەی بانگەوازی ئیسلامیان پێناگات، بە شێوەیەكی ڕاست و دروست و، نەفام و نەزان و بێ ئاگان لە ئایینی هەقی خوا، بەڵام نەزانیی و نەفامییەك كە خاوەن پۆزش **(معذور)**بن تێیدا، واتە: جەهل و نەزانینێكیان هەبێ پۆزشیان هەبێ و بەڵگەیان هەبێ، هەموو ئەوانە بە بێبڕوا **(كافر)** دانانرێن و لە ڕیزی كافران دا ئەژمار ناكرێن، چونكە هەقیكیان پێ نەگەیشتوە، بیشارنەوە، **(كافر)**، لەسەر كێشی **(فاعل)**، ناوی بكەر **(اسم فاعل)**ە، واتە: كەسێك كە دادەپۆشێ، ئەو هەقە دادەپۆشێ كە پێیگەیشتوە لە خواوە، بەڵام كەسێ هەقەكەی پێ نەگەیبێ و تێینەگەیبێ، هیچی دانەپۆشیوە، تاكو ناوی كافری بۆ بەكاربهێنرێ، كەواتە: هەموو ئەوانەی لە ئیسلام بێئاگان و، ئیسلامیان بەشێوەی ڕێك و ڕاست پێ نەگەیشتوەو، لە بێئاگاییەكەشدا خاوەنی پۆزش **(معذور)**ن و، خاوەنی بەڵگەو بیانوون، واتە: كەمتەرخەمییان نەكردوە، لەوەدا كە ئیسلام بناسن، هەموو ئەوانە با بڕواشیان بە ئیسلام نەبێ، بە بێبڕوا لەقەڵەم نادرێن، چونكە ئیسلامیان نەناسیوەو پێیان نەگەیشتوە، ئەدی ئایا ئەوانە چ ناوێكیان بۆ بەكاردەهێنرێ؟ ئەوانە زانایان وشەیەكیان وەك زاراوە بۆ داناون كە بریتیە لە: **(أهل الفترة)**، یانی: ئەوانە كەسانێكن لە كاتێكدا ژیاون، كە پەیامی خوا دابڕاوەو بۆیان خوا نەهاتوە، ئەویش لەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة)یان، وەرگرتوە كە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴿١٩﴾ ﴾، **(يعني على انقطاع من الرسل)**، یانی: پێغەمبەرێكتان بۆ هاتوە ئەی خاوەن كتێبەكان! دوای دابڕانێك لە پێغەمبەران، لە نێوان عیسا **(علیه السلام)** كۆتا پێغەمبەری بەنوو ئیسرائیل و، موحەممەد كۆتا پێغەمبەر بۆ هەموو بەشەردا، ﷺ ئەگەر عیسا لە ساڵی یەكی (١)ی زایینی دا لە دایك بووبێ و، موحەممەد ﷺ لە ساڵی (٥٧٠)

یـان (٥٧١)ی، سـاڵی فیـل دا لـە دایـك بووبـێ، کەواتـە: لـە نێـوان لـە دایـك بوونـی عیسـاو موحەممـەددا (٥٧٠) سـاڵ بـووە، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو ماوەیـەی نـاو نـاوە: ﴿عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ١٩﴾، واتـە: پێغەمبـەران لـە نێـوان ئـەو (٥٧٠) سـاڵەدا نەهاتـوون و دابـڕاون، بۆیـە ئەوانـەی لـەو کاتـەدا ژیـاون، بـە کافـر دانانرێـن، مەگـەر بـە ئانقەسـت ئاییـن و بەرنامـەو وەحیـی خـوا کـە لەبـەر دەسـتیاندا بـووە، ئەگـەر جوولەکـە بـوون، ئەگـەر نەصرانییـەکان بـوون، گۆڕیبیـان، ئەگەرنا ئەوانـی دیکـە کـە بێئاگابـوون لـە پەیـام و وەحیـی خـوا، بـە کافـر لـە قەڵـەم نادرێـن و، هـەر کەسێکی دیکـەش لـە هـەر ڕۆژگارێکـی دیکـەدا، بێئـاگا بێتـەوە لـە ئیسـلام و ئیسـلامی پـێ نـەگات و لێـی شـارەزا نەبـێ، نـاوی بێبـڕوا (کافـر)ی بـۆ بەکارنایـەت و، هەمـوو ئـەو حوکمانـەی کافـران دەگرنـەوە، ئـەو حوکمانـە ئـەوان ناگرنـەوە.

## تەوەری دووەم: هۆکارەکانی بێبڕوایی

لـە قورئانـدا خـوای زانـاو شـارەزا زۆر شـتی لـە بـارەی هۆکارەکانـی بێبڕوابوونـی بێبڕوایانـەوە خسـتوونەڕوو، بـەڵام پێـم وایـە هۆکارەکانـی بێبڕوابوونـی بێبڕوایـان لـە سـێ خاڵـی سـەرەکیی دا بەرجەسـتە دەبـن و کۆدەبنـەوە:

### ١- بێئاگایی هۆکاری یەکەم و سەرەکیی بێبڕوایی بێبڕوایانە:

ئـەوەش لـە هـەر کام لـە ئایەتەکانـی: ژمـارە (٧) و ژمـارە (١٧٢)ی لـە سـوورەتی (**البقـرة**)و، ژمـارە (١٧٩) لـە سـوورەتی (**الأعـراف**)و، ژمـارە (٢) لـە سـوورەتی (**الأنفـال**) دا، زۆر بـە ڕوونیـی دیـارە:

١- خوای میهرەبان لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٧﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوان یەکسانە بیانترسێنی یاخود نەیانترسێنی، هەر بڕوا ناهێنن، ئەوانە خوا ﷻ مۆری بەسەر

دڵەکان و بیستنیانەو ناون و، چاوەکانیشیان پەردەیان بەسەر هەڵکشاوەو ئازارێکی مەزنیان بۆ هەیە.

٢- هەروەها خوا لە سوورەتی (**البقرة**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾، واتە: وێنەی ئەوانەی بێبڕوا بوون، وەك وێنەی کەسێکە بانگی ئاژەڵێك دەکات تەنیا بانگکردنەکەو هاوارلێکردنەکە دەبیستێ، ئەوانە کەڕانن و لاڵانن و کوێرانن، بۆیە نافامن.

٣- هەروەها دیسان لە ئایەتی (**١٧٩**)ی لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ باسی ئەو هۆکارە سەرەکییەی بێبڕوایی بێبڕوایان دەکات، کە بێ ئاگاییەو دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ ﴾، واتە:بە دڵنیایی بۆ دۆزەخ زۆرێك لە جند و مرۆڤمان ئامادە کردوون، دڵیان هەن پێیان تێناگەن، چاویان هەن، پێیان نابینن، گوێیان هەن پێان نابیستن، ئەوانە وەك ئاژەڵن بەڵکو گومڕاترن، ئەوانەن بێئاگایان.

٤- هەروەها لە سوورەتی (**الأنفال**)دا، دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلْبُكْمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خراپترین ژیانداران لە لای خوا، ئەو کەڕو لاڵانەن کە نافامن.

هەروەها گەلێك ئایەتەکانی دیکەی قورئان ئەوە دەگەیەنن، کە هۆکاری سەرەکیی بێبڕوایی بێبڕوایان، بریتیە لە نەزانیی و نەفامیی و بێئاگایی، ئنجا ئەو نەزانیی و نەفامیی و بێئاگاییە، ئەگەر بە ئانقەست نەبێ، ئەو کاتە بە بێبڕوا دانانرێن، بەڵام ئەگەر نەزانییەکە بەهۆی کەمتەرخەمیی خۆیانەوە بێ و، بێئاگاییەکەیان بەهۆی پشتتێکردنیان و گوێ نەگرتنیان و گرنگیی و بایەخ پێنەدانیانەوەبێ، یان زانییان بەڵام بڕوایان پێنەهێنابێ، ئەگەر بەهۆی ئەوەوە بێ، بێگومان ناوی بێبڕوا (کافر) دەیانگرێتەوە، چونکە هەقیکیان پێگەیشتوە،

بەڵام ئەو هەقەیان پەنهان کردوەو شاردوویانەتەوە، لەبەر ئەو بەرژەوەندییانەی بەهۆی کوفرەوە بۆیان دابین دەبن و، بەهۆی ئیمانەوە لێیان تێك دەچن، چونکە هەرگیز ئیمان هەڵەو لادان و تاوان قبووڵ ناکات و، هەمیشە لەگەڵ ناهەقیی و بەرژەوەندیی ناشەرعییی دا دژ دەوەستێ.

## ٢- هۆکاری دووەمی بێبڕوایی بێبڕوایان، بریتیە لە خۆ بەزلگریی و خۆ پێ زۆربوون:

ئەمیش لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، خوا ﷻ ئەوەی خستۆتەڕوو کە خۆ بەزلگریی و خۆ پێ زۆر بوون، لە بەرانبەر خواداو، لە بەرانبەر ئایەتەکانی خواداو، لە بەرانبەر پێغەمبەرانی خوادا، هۆکارێکی گەورەو سەرەکیی بێبڕوایی بێبڕوایانە:

١- لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، خوا دەفەرمویْ: ﴿أَخْرِجُوٓا۟ أَنفُسَكُمُ ۖ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَكُنتُمْ عَنْ ءَايَـٰتِهِۦ تَسْتَكْبِرُونَ ﴿٩٣﴾﴾، واتە: (فریشتەکان بە بێبڕوایان دەڵێن:) نەفسەکانتان بێننە دەرێ، ئەمڕۆ سزای ڕیسوایی دەچێژن، بەهۆی ئەوەوەی قسەی ناهەقتان بە ناوی خواوە دەکردو، لە بەرانبەر ئایەتەکانی دا {چ ئایەتە خوێنراوەکانی، چ ئایەتە بینراوەکانی، چ ئایەتە نێردراوەکانی کە موعجیزەکانی پێغەمبەرانن (**علیهم الصلاة والسلام**)} خۆتان بە زلدەگرت.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**الأعراف**)دا، خوا دەفەرمویْ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُوا۟ عَنْهَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٣٦﴾﴾، واتە: ئەوانەی بە نیشانەو ئایەتەکانی ئێمە بێبڕوابوون و، لە بەرانبەریان دا خۆیان بە زلگرت، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن، تێیدا (لەو ئاگری دۆزەخەدا) هەرماو دەبن.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الصافات**)دا، خوا لە بارەی بێبڕوایەکانەوە دەفەرمویْ: ﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: ئەوانە (لە دنیادا عادەتیان وابووە) ئەگەر پێیان گوترابا: جگە لە خوا پەرستراوێك نیە، خۆیان بە زلدەگرت.

٤- هەروەها لە سوورەتی (**النمل**)دا، خوا ﷻ لە بارەی فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە، دەفەرموێ: ﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾﴾، واتە: {کاتێك مووسا (**علیه السلام**) بەبەڵگەکانیەوە چووەلایان} نکووڵییان لێکردن، هەرچەندە لە دەروونیاندا دڵنیابوون لە ڕاستیی بەڵگەکان (مووسا عليه السلام) بەڵام بەهۆی ستەم و خۆبەزلگرییەوە، (نکووڵیان کرد) ئنجا سەرنج بدە سەرەنجامی تێکدەران چۆن بوو!

٥- هەروەها لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾، واتە: هەروەها قارووون و فیرعەون و هامان، بەدڵنیایی مووسا (عليه السلام) بەڵگە ڕۆشنەکانی بۆ بردن، بەڵام لە زەویدا خۆیان بە زلگرت و، ئەوان پێشکەوتووەوەش نەبوون (کە لەبەر دەستمان دەرباز بن و نەتوانین سزایان بدەین).

کەواتە: هۆکاری دووەمی بێبڕوایی بێبڕوایان، بریتیە لە خۆ بەزلگریی و لووتبەرزیی و خۆپێ زۆریی و خۆپەسندییان.

### ٣- هۆکاری سێیەمی بێبڕوایی بێبڕوایان، بریتیە لە خۆشگوزەرانیی و، هەڵبژاردنی ژیانی دنیا بەسەر ڕۆژی دواییدا:

لە زۆر لە ئایەتەکانی قورئاندا، خوا ﷻ ئەم ڕاستییەشی خستۆتەڕوو، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (**يونس**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین و، ژیانی دنیایان پەسند کردووەو دڵیان بەهۆیەوە ئۆقرەی گرتووەو، ئەوانەی لە ئایەتەکانی ئێمە بێئاگان، ئا ئەوانە جێی حەوانەوەیان ئاگری دۆزەخە، بەهۆی ئەوەوە وەدەستیان دەهێنا.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**هود**)دا، خوا ﷻ باسی بێبڕوایان دەكات و دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَآ أُتۡرِفُواْ فِيهِ وَكَانُواْ مُجۡرِمِينَ ١١٦﴾، واتە: ئەوانەی ستەمیان كردبوو شوێن ئەوە كەوتن كە تێیدا خۆشگوزەران كرابوون و، ئەوان تاوانبار بوون.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**الأحقاف**)دا، خوا ﷻ لە ڕۆژی دوایی دا بە بێبڕوایەكان دەفەرموێ: ﴿أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ٢٠﴾، واتە: ئێوە خۆشییەكانی ژیانی دنیاتان تێپەڕاندن (لە دنیادا)و بەهرەتان لێوەرگرتن، ئەمڕۆش سزای ڕیسوایی دەچێژن، بەهۆی ئەوەوەی لە زەویدا خۆتان بە ناهەق بە زلدەگرت و، بەهۆی ئەوەوەش كە لادانتان دەكرد.

هەروەها لە گەلێك شوێنی دیكەدا، خوا خۆشگوزەرانیی و نغرۆ بوون لە ڕابواردنی ماددیی ژیانی دنیادا لەسەر حیسابی ڕووح و قیامەت و، بەڵكو زۆر جار لەسەر حیسابی كەسایەتیی و ئابڕوو و كەرامەتی مرۆڤی، كردوە بە هۆكارێكی سەرەكیی بێبڕوایی بێبڕوایان، بۆ وێنە كە كۆتا نموونەیە بیهێنینەوە:

٤- لە سوورەتی (**سبأ**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ٣٤﴾، واتە: لە هیچ ئاوەدانییەكدا هیچ ترسێنەرێك و وریاكەرەوەیەكمان ڕەوان نەكردوە، مەگەر خۆشگوزەرانەكانی گوتوویانە: ئێمە بەوەی ئێوەی پێڕەوانكراون، بێبڕواین.

كەواتە: خۆشگوزەرانەكان، واتە: ئەوانەی لەسەر حیسابی خەڵكی ڕەش و ڕووت و، جەماوەری بێچارە كراوو، چەوسێنراوە، ڕادەبوێرن و خۆشگوزەرانیی دەكەنە پیشە، ئەوانە هەمیشە هەڵوێستیان بەرانبەر بە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)و، بەرانبەر بە پەیامەكانی خوا، بریتی بووە لە ڕەتكردنەوەو ڕەفزكردن و بێبڕوایی.

لـە كۆتایـی ئـەم تـەوەرەدا دەڵێیـن: ئـەم سـێكوچكەی: نەزانیـی و، خۆبەزلگریـی و، خۆشـگوزەرانیی (**الجهـل والإسـتكبار والإتـراف**)، لـە قورئانـدا زۆر باسـكراوەو خـوا ﷻ فیرعەونـی لەگـەڵ قـارِوون و هامانـدا، لـە چەنـد شـوێنێك لـە قورئـان دا نـاو هێنـاون، بـۆ وێنـە:

أ- له سوورەتی (**العنكبوت**)دا: ﴿وَقَـٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَـٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾﴾.

ب- له سوورەتی (**غافر**)یشدا، ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾﴾.

بەڵـێ ئـەم سـێكوچكەیە، وەك سـێكوچكەیەی مەنجەڵیـان لەسـەر دادەنـرێ، ڕۆڵیـان بـەم شـێوەیە:١- فیرعـەون: ڕەمـزو هێـمای چەوساندنەوەی سیاسـیی بـووە، ٢- قـارِوون: ڕەمـزو هێـمای چەوسـانەوەی ئابووریـی بـووە، ٣- هامـان: ڕەمـزو هێـمای چەوسـانەوەی ڕاگەیانـدن و چەواشـەكردنی خەڵـك بـووە.

ئەگـەر تەماشـای بەسـەرهاتی مووسـاو هاڕوونـی بـرای صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ و گەلـە چەوسـێنراوەكەیان (**بنـو إسـرائيـل**) بكەیـن، لەلایـەك و، فیرعـەون و قـارِوون و هامانیـش لـە بەرانبەریانـدا لەلایـەك، ئـەوە زۆر بەڕوونیـی دەبینـرێ:

أ- فیرعەون زۆر خۆسەپێن و خۆ بە زلگر بووەو، لە ڕووی حوكمڕانیی و سیاسییەوە، له سوورەتی (**غافر**)دا، خوا ﷻ لەسەر زمانی فیرعەون دەفەرموێ: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: فیرعەونیش گوتی: هەر ئەوەتان پێدەڵێم كە خۆم دەیبینم و، ئەوەی منیش دەیڵێم بەس ئەوە ڕێی سەر ڕاستییە، ئا ئەوە لۆژیك و سیاسەتی فیرعەون، بووە بۆیەش خوای دادگەرو باڵادەست لە بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعًا ﴿٤﴾﴾**القصص**، بەدڵنیایی فیرعەون لە زەویدا خۆی بەرزكردەوەو سەپاندو خەڵكەكەی بەش بەش كرد.

**ب-** بە نسبەت قارِوونەوەش کە ڕەمزو هێمای چەوساندنەوەی ئابووریی بووە، لە سوورەتی (**القصص**)دا، خوا ﷻ باسی قارِوون دەکات و دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ ﴿٧٦﴾ ﴾، قارِوون لە گەلی مووسا ﷺ بوو، بەلاٚم لێیان هەلٚگەرِایەوەو هێندەمان مالٚ و سامان پێدابوو کە کلیلەکان (ی قاسەو خەزنەکانی مالٚ و سامانەکە)ی، پیاوانێکی بە هێزو بە زەحمەت بۆیان هەلٚدەگیران، پێیانەوە شەکەت و ماندوو دەبوون.

ئەویش لە ڕووی ئابوورییەوە کوچکی دووەمی ئەو سێکوچکەیەبوو.

**ج-** هەروەها هامانیش لە چەند شوێنێك لە قورئاندا خوای کاربەجێ باس دەکات لە ڕووی چەواشەکاریی ڕاگەیاندنەوە فیرعەون پەنا دەباتە بەر هامان، بۆ نموونە: ﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَـٰهَـٰمَـٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَـٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَـٰبَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَـٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَـٰذِبًا ... ﴿٣٧﴾ ﴾غافر، فیرعەون گوتی: ئەی هامان! کۆشکێکم بۆ دروست بکە، بەلٚکو بگەمە هۆکارەکان، هۆکارەکانی ئاسمانەکان تاکو پەرستراوی مووسا پەی پێ بەرم و پێشم وایە درۆکارە (پەرستراوی وی بوونی نیە) ئەویش ڕۆلٚی بینیوە لە چەواشەکردنی خەلٚك دا، وەك چۆن ئێستاش لە ڕۆژگاری ئێستای ئێمەدا، ئەو سێکوچکەیە هەر بەردەوامە، چەوساندنەوەی سیاسیی، چەوساندنەوەی ئابووریی، چەواشەکردنی ڕاگەیاندن، بۆیەش هەموو ئەوانەی چاویان لەوەیە ستەم لە خەلٚك بکەن و، خەلٚك و جەماوەر بچەوسێننەوە، بە هەموو توانایانەوە هەولٚ دەدەن:

**أ-** هێزی زەبرو زەنگ و عەسکەریی بەدەست بێنن.

**ب-** هێزی سامان و ئابووریی بەدەست خۆیانەوە بێ.

**ج-** ڕاگەیاندنی چەواشەکارانەش بەدەست خۆیانەوە بێ، واتە: ئەوسێکوچکەیەی سێ هۆکاری بنەڕەتیین، بۆ بێبڕوا بوونی بێبڕوایان و لە بێبڕوایی دا هێشتنەوەیان.

## تەوەری سێیەم: سیفەتە گشتییە هاوبەشەكانی بێبڕوایان:

ئەمەش باسێكی زۆر دوورو قووڵە، بەڵام ئێمە هەوڵدەدەین زۆر كورتی بكەینەوەو دەڵێین: تێكڕای ئەو سیفەتانەی - بە بۆ چوونی من - خوا ﷻ كردوونی بە سیفەت و ناسێنەر بۆ بێبڕوایان، بیست و پێنج (٢٥)ن و، ئەوانە سیفەتە گشتییەكانیانن، واتە: بە هەر پێنج جۆرەكانی بێبڕوایانەوە: مولحیدەكان، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، خاوەن كتێبەكان، هەڵگەڕاوەكان، هەروەها دەغەڵ و مونافیقەكان:

**١)**- سیفەتێكی بنەڕەتیی بێبڕوایان بە گشتیی، بریتیە لە پەكخستنی هێزە ئیدراكییەكانی خۆیان، ئەو هێزانەی دەتوانن شتیان پێ بزانن؛ لەكارخستنی چاویان بۆ بینینی هەق، گوێیان بۆ بیستنی هەق، عەقڵ و دڵیان بۆ پەی پێبردنی هەق، لە چەند شوێن لە قورئان دا خوای پەروەردگار ئەم سیفەتە بۆ بێبڕوایان بەكاردێنێ: ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾﴾ **البقرة**، كەڕانن، لاڵانن، كوێرانن بۆیە نافامن، ﴿صُمٌّ بُكْمٌ عُمْيٌ فَهُمْ لَا يَرْجِعُونَ ﴿١٨﴾﴾ **البقرة**، كەڕانن، لاڵانن، كوێرانن بۆیە ناگەڕێنەوە. بەڵێ سیفەتی بنەڕەتیی بێبڕوایان كە هەموویان تێیدا هاوبەشن، ئەوەیە كە هەم هەستەوەرەكانیان و، عەقڵ و دڵی خۆیان بۆ ناسینی هەق پەكخستوون، بەهۆی زۆر ڕۆچوون بە ئارەزووكانیانداو بەلادان و تاواندا، نە چاویان هەق دەبینێ، نە گوێیان هەق دەبیستێ، نە عەقڵ و دڵیشیان هەق پەی پێدەبات.

**٢و٣و٤)**- هەڵبژاردنی ژیانی دنیا بەسەر ژیانی ڕۆژی دواییداو، ڕێگرتن لە خەڵك كە بە دوای ئایین و بەرنامەی ڕاستی خوا بكەون و، هەوڵدان بۆ ئەوەی ئایینی خوای پەروەردگار خوارو خێچ و نارێك بخەنە بەر چاوی خەڵك، ئەمانەش هەر سێكیان لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا، خوای بەرزی مەزن فەرمووني، وەك دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجًا ﴿٣﴾﴾، ئەوكەسانەی ژیانی دنیا بەسەر مەنزڵگای كۆتاییدا هەڵدەبژێرن و، (خەڵك) لە ڕێی خوادا لادەدەن و، لاریی و خوارو خێچیی بۆ ئایین و بەرنامەی خوا دەخوازن.

یانی: دەیانەوێ ئایینی خوا خواروخێچ پیشانی خەڵك بدەن و، لە پێش چاویان ناشیرین و نارێكیی بكەن و بیبێزێنن و، لەبەر چاویان بكەوێ.

**٥و٦و٧)**- ئومێدەوارنەبوون بە دیداری خواو، ڕازیبوون بە ژیانی دنیاو پێوە پەیوەست بوونی و، بێئاگایی لە ئایەت و نیشانەكانی خوا، چ نیشانە بینراوەكانی چ نیشانە خوێنراوەكانی (**آياته المنظورة والمقروءة**)، ئەمیش لە هەردوو ئایەتەكانی: (**٧ و ٨**)ی سووڕەتی (**يونس**)دا، كە پێشتریش هێنامان خوای پەنهانزان هۆكارەكانی: پێنج و شەش و حەوتی باسكردوون:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بە ئومێدی دیداری ئێمە نین، واتە: بێ ئومێدن لەوەی بە دیداری خوا بگەن.

﴿ وَرَضُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّوا۟ بِهَا ﴾، ژیانی دنیایان پەسند كردوەو دڵیان پێوەی بەستوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾، هەروەها ئەوانەی لە نیشانەكانی ئێمە بێئاگان، ئەمانەش سێ سیفەتی دیكە كە سەرجەم بوون بە حەوت.

حەوت سیفەتەكانی: هەشت و نۆ و دەو یازدەو دوازدەو سێزدەو چواردە:

**٨)**- هەوڵدان بۆ بێدەنگكردنی پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**): ﴿ فَرَدُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فِىٓ أَفْوَٰهِهِمْ ﴾.

**٩)**- ڕاگەیاندنی بێبڕوایی بە پەیامەكانی خواو ڕەفزكردنیان: ﴿ إِنَّا كَفَرْنَا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ ﴾.

**١٠)**- دەرخستنی دوو دڵیی لە مەبەستی پێغەمبەران (**عليهم الصلاة والسلام**): ﴿ وَإِنَّا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴾.

**١١)**- بیانووگرتن بەوەی بۆیە بڕواناهێنن چونكە پێغەمبەران مرۆڤن: ﴿ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا ﴾.

**١٢)**- بیانووگرتن بە ئیمان نەهێنان بە پێغەمبەران، لە بەر ئەوەی دەیانەوێ ئەوەی پێشینەکانیان لەسەری بوون بیگۆڕن: ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾.

**١٣)**- تۆمەتکردن کە پێغەمبەران **(علیهم الصلاة والسلام)** بەڵگەیەکی ڕۆشنیان بۆ سەلماندنی دەعواکەیان نەهێناوە!: ﴿ فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴾.

**١٤)**- سەرپشککردنی پێغەمبەرانی بەڕێز صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ، لە نێوان دەرکران لە وڵات و گەڕانەوەیان دا بۆ کوفر: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ ﴾. ئەم حەوت سیفەتەش هەموویان لە سوورەتی (إبراهيم) ئایەتەکانی: (٩ - ١٣)دا هاتوون، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴿٩﴾ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدۡ هَدَىٰنَا سُبُلَنَاۚ وَلَنَصۡبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيۡتُمُونَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ رَبُّهُمۡ لَنُهۡلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ ﴾.

ئایا هەواڵی ئەوانەی پێش خۆتانتان بۆ نەهاتوە گەلی (هوودو عادو سەموود) و ئەوانەی دوای وانیش کە جگە لە خوا نایانزانێ، پێغەمبەرانیان بە (موعجیزان) بەڵگە ئاشکرایەکانەوە هاتنە لایان کەچی ئەوان دەستیان بە زاریانەوە نان، گوتیان: ئێمە بێبڕواین بەوەی پێی نێردراون و بە دڵنیایی ئێمە سەبارەت بەوەی ئێمەی بۆ بانگ دەکەن لە دوو دڵییەکی خەست داین ﴿٩﴾ پێغەمبەرەکانیان گوتیان: ئایا دوو دڵی لە (بوون و یەکتایی) خوای پەیداکەری ئاسمانەکان و زەویدا هەیە! بانگتان دەکات تاکو لە گوناهەکانتان بتانبوورێ و بۆ کاتێکی دیارییکراو دواتان بخات (لە ژیاندا بتانهێڵێ)، بێبڕوایەکان گوتیان: ئێوەش تەنیا مرۆڤێکی وەك ئێمەن و دەتانەوێ لەو پەرستراوانەی باب و باپیرانمان دەیانپەرستن لامان بدەن، دەجا ئەگەر ڕاست دەکەن بەڵگەیەکی ڕوونمان بۆ بێنن (لەسەر ڕاستیی ئەوەی دەیڵێن) ﴿١٠﴾ پێغەمبەرەکانیان پێیان گوتن: ڕاستە ئێمەش وەک ئێوەین، بەڵام خوا چاکە لەگەڵ هەر کام لە بەندەکانیدا دەکا (کە بیەوێ بیکاتە ڕەوانەکراو) بەبێ مۆڵەتی خواش ناتوانین هیچ بەڵگەیەکتان بۆ بێنین (وەک ئەوەی پێمانەو خوای کارزان بە چاکی زانیوە) بڕوادارانیش با تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿١١﴾ ئنجا بۆچی پشت بە خوا نەبەستین لە حاڵێکدا ڕێبازەکانمانی (بۆ گەیاندنی پەیامەکەی) پێشانداوین، مسۆگەریش هەرچەند ئازارمان بدەن خۆڕاگر دەبین و پشت بەستووانیش، با تەنیا پشت بە خوا ببەستن ﴿١٢﴾ ئەوانەی بێبڕواش بوون بە پێغەمبەرەکانی خۆیانیان گوت: بە دڵنیایی لەسەر زەوی خۆمان وەدەرتان دنێین یان دەبێ بگەڕێنەوە نێو ئایین و ڕێبازەکەمان، پەروەردگاریشیان سرووشی بۆ کردن (بۆ پێغەمبەران) مسۆگەر ستەمکاران دەفەوتێنین ﴿١٣﴾.

﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرانیان **(علیهم الصلاة والسلام)**، بەڵگە ڕۆشنەکانیان بۆ بردن، بەڵام ئایا کافرەکان چییان کرد؟ بێگوما هەقیان ڕەدکردەوە ئێستاش ئاماژە دەکەین بەو برگەو ڕستە قورئانییانەی ئەو حەوت سیفەتەی بێبڕوایەکانیان تێدان و سەروتیشکی کورتیان دەخەینەسەر: ١-سیفەتی

یەكەم: ﴿ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ ﴾، دەستیان بەزاریانەوە (زاری پێغەمبەران) گرت، یانی: ویستیان بێدەنگیان بكەن، ئەمە واتایەكیەتی و، واتایەكی دیكەشی: دەستیان بە زاری خۆیانەوە گرت، واتە: وەك گاڵتە پێكردن.

٢- ئنجا سیفەتی دووەم: ﴿ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ ﴾، گوتیان ئێمە بێبڕواین بەوەی ئێوەی پێ ڕەوانكراون، ئەمەش ڕاگەیاندنی كوفرو بێبڕواییە بە پەیامەكانی خواو ڕەفزكردنیان.

٣- سیفەتی سێیەم: ﴿ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴿٩﴾ ﴾، ئێمە لە دوو دڵییداین، دووڵییەكی خەست لەوەی ئێوە ئێمەی بۆ بانگ دەكەن! سیفەتی ٤- سیفەتیی چوارەم: بیانووگرتن بەوەی پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، مرۆڤن بۆیە بڕوایان پێناهێنن: ﴿ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا ﴾، ئێوەش هەر مرۆڤێكن وەك ئێمە!

٥- سیفەتی پێنجەم: بیانووگرتن بە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) كە بۆیە بڕوایان پێناهێنن، چونكە دەیانەوێ ڕێبازی پێشینانیان لێ تێكبدەن: ﴿ تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا ﴾، دەتانەوێ لامانده‌ن لەوەی باب و باپیرانمان و پێشینەكانمان دەیانپەرست!

٦- سیفەتی شەشەم: گوایە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) بەڵگەیەكی ڕۆشنیان بۆ نەهێناون: ﴿ فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: ئەوەی هێناوتانە بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرانیەو بەڵگەیەكی ڕوون و ئاشكرامان بۆ بێن، بەڵام بێگومان درۆیان كردوە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، پێغەمبەرەكان (**علیهم الصلاة والسلام**)، بەڵگە ڕوون و ئاشكرایەكانیان بۆ بردن.

٧- سیفەتی حەوتەم: كۆتا قسەیان هەڕەشەكردنی بێبڕوایانە لە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) و، سەرپشككردنیان لە نێوان لە شارو وڵات دەركران و، گەڕانەوەیان بۆ كوفردا: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِرُسُلِهِمۡ لَنُخۡرِجَنَّكُم مِّنۡ أَرۡضِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۖ ﴿١٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانە بێبڕوا بوون بە پێغەمبەرەكانیان گوت: یان لەسەر زەوی

خۆمان دەرتان دەكەین، یان دەگەڕێنەوە سەر ڕێبازەكەی ئێمە، سەر زەمینەكەیان تەنیا بە هی خۆیان داناوە، وەك بڵێی پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) و شوێنكەوتووانیان خەڵكی ئەو شوێن و شارو وڵاتانە نەبووبن!!

**١٥و١٦و١٧)**- بە درۆ دانانی هەق و، عەزم جەزمكردن لەسەر زیانگەیاندن بە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) و، ئەوانەی شوێن پێغەمبەران دەكەون و، مشتومڕ كردن بە ناهەق بۆ بەرپەرچدانەوەی هەق.

ئەمانەش هەر سێكیان لە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (**غافر**)دا هاتوون، هەڵبەتە وێڕای هاتنی لە ژمارەیەكی دیكەی ئایەتەكان: ١-كە خوا ﷻ لەوێدا دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَعْدِهِمْ ﴾، واتە: لە پێش واندا گەلی نووح و حیزبەكانیش لە دوای وان بێبڕوابوون، (واتە: بێبڕوابوون بە پێغەمبەران و (**علیهم الصلاة والسلام**) پەیامەكانی خوا)، ئەمە سیفەتی یەكەم. ٢- دووەم ئەوە كە عەزمیان جەزم كردوە زیان بە پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**) بگەیەنن: ﴿ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍۭ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ ﴾، هەر كۆمەڵێك ویستی و عەزمی جەزم كرد لە بەرانبەر پێغەمبەرەكەیدا كە بیانگرن، سزایان بدەن، بیانكوژن، ٣- سیفەتی سێیەم ﴿ وَجَٰدَلُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ ﴿٥﴾ ﴾، هەروەها بە بەتاڵ و ناهەق مشتومڕیان كرد، تاكو هەقی پێ بەرپەرچ بدەنەوە.

**١٨)**- سیفەتێكی دیكە هاوبەشی بەینی هەموو جۆرەكانی بێبڕوایان، بریتیە لە: گاڵتەكردن و ڕابواردن بە ئیمانداران، وەك لە ئایەتی ژمارە (**٢١٢**)**ی** سوورەتی (**البقرة**)دا، هاتوە: ﴿ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ژیانی دنیا ژیانی نیزیكتر بۆ بێبڕوایان ڕازێندراوەتەوەو گاڵتە دەكەن بەوانەی بڕوایان هێناوە، ئەمیش بەدڵنیایی سیفەتێكی دیكەی زۆر نزم و پەستی بێبڕوایانە. هەروەها لە سوورەتی (**المطففين**)یش، ئایەتەكانی: (**٢٩ و ٣٠ و ٣١**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ

ﭐنقَلَبُواْ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾، واته: به دڵنیایی ئه‌وانه‌ی تاوانیان كردوه، كاتی خۆی له دنیادا به بڕواداران پێده‌كه‌نین، كاتێكیش به‌لایاندا تێده‌په‌ڕین ئاماژه‌یان بۆ یه‌كدی ده‌كردو، كاتێ ده‌گه‌ڕانه‌وه‌ش بۆ لای خزم و كه‌سیان، به خۆشحاڵیی و شادمانیی ده‌گه‌ڕانه‌وه (وه‌ك ده‌ستكه‌وتێكی زۆر و گه‌وره‌یان بووبێ!).

**١٩و٢٠و٢١)**- خۆشگوزه‌رانیی له ژیانی دنیاداو، نكووڵییكردن له زیندووكرانه‌وه‌و هه‌ڵسێنرانه‌وه‌و، تۆمه‌تباركردنی پێغه‌مبه‌ران **(عليهم الصلاة والسلام)**، به‌وه‌ی به ناوی خواوه درۆیان كردوه‌و شتیان هه‌ڵبه‌ستوه، له ئایه‌ته‌كانی: **(٣١ -٣٨)**ی سووره‌تی **(المؤمنون)**دا، خوا ﷻ ئه‌م سێ سیفه‌ته‌ی هێناون، ئه‌مه‌ش ده‌قی ئه‌و هه‌شت ئایه‌ته:

﴿ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ **واته**: دوایی پاش ئه‌وان سه‌ده‌یه‌كی دیكه‌مان (له خه‌ڵك) پێگه‌یاند ﴿٣١﴾ له نێویاندا پێغه‌مبه‌رێكمان نارد، پێیگوتن: خواپه‌رستن هیچ په‌رستراوێكی دیكه‌تان نیه، (شایسته‌ی په‌رستران بێ) ئایا پارێز ناكه‌ن (له سزای خوا له‌سه‌ر هاوبه‌شدانان)؟! ﴿٣٢﴾ ده‌سترۆیشتوه و بێبڕوایه‌كانی گه‌له‌كه‌ی كه بڕوایان به دیداریی دوارۆژ نه‌بوو و، له ژیانی دنیادا خۆشگوزه‌رانمان كردبوون، گوتیان: ئه‌مه ته‌نیا به‌شه‌رێكی وه‌ك خۆتانه، هه‌ر له‌وه ده‌خوات كه ئێوه لێی ده‌خۆن و، له‌وه‌ش ده‌خواته‌وه كه ئێوه لێی ده‌خۆنه‌وه ﴿٣٣﴾ به مسۆگه‌رییش ئه‌گه‌ر فه‌رمانبه‌ریی به‌شه‌رێكی وه‌ك خۆتان بكه‌ن! كه‌واته: ئێوه له زیانبارانن ﴿٣٤﴾ ئایا به‌ڵێنتان پێ ده‌دات كاتێك مردن و بوونه‌وه به خۆڵ و ئێسكه (پڕتووكاوه)كان، ئێوه له زه‌وی ده‌رده‌هێنرێنه‌وه؟! ﴿٣٥﴾ ئه‌وه‌ی گفتتان پێ ده‌درێ دووره

دوور ﴿٣٦﴾ ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، دەمرین و دەژین و، ئێمە لە زیندوو کراوان نابین ﴿٣٧﴾ ئەو (پیاو)ە بەس پیاوێکە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستێ و ئێمەش بۆی نابینە بڕوادار ﴿٣٨﴾.

**١٩-** سیفەتی نۆزدەیەم: خۆشگوزەرانیی لە ژیانی دنیادا: ﴿ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَـٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾، ئەو دەستڕۆیشتووانەی گەلەکەی کە بێبڕوابوون و، دیداری ڕۆژی دواییان بە درۆ دادەناو، لە ژیانی دنیادا خۆشگوزەرانمان کردبوون، گوتیان: ...، کەواتە یەکێك لە سیفەتەکانیان ئەوەیە کە خۆشگوزەران کراون.

**٢٠-** سیفەتی بیستەم: نکووڵییکردنیان لە هاتنی قیامەت و هەڵسێنرانەوە: وەك خوا لە ئایەتی (٣٥)ی سووڕەتی (**المؤمنون**)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَـٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾، واتە: ئایا بەڵێنتان پێدەدات (ئەو پێغەمبەرە) کاتێك مردن و بوونەوە بە خۆڵ و ئێسقان ئێوە (زیندووکراوەو) دەرهێنراون! زۆر دوورە، زۆر دوورە ئەوەی بەڵێنتان پێ دەدرێ، تەنیا ژیانی دنیامانە دەمرین و دەژین و ئێمە لە زیندووکراوان نابین.

**٢١-** سیفەتی بیست و یەکەم: تۆمەتبارکردنی پێغەمبەر ﷺ بەوەی کە بە ناوی خواوە درۆی هەڵبەستوە: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: ئەو تەنیا پیاوێکە درۆ بە ناوی خواوە دەکات (ئەگەرنا خوا هیچکەسی بە نوێنەری خۆی وەك ڕەوانەکراوی خۆی نەناردوە).

**٢٢)** دڵخۆشیی و بوغڕابوون بە تۆزە زانیارییەك کە لە بارەی ژیانی دنیاوە، هەیانەو، کردنی بە جێگرەوەی ئەو زانیارییە ڕاستەقینەو تێرو تەواوەی لە ڕێی وەحییەوە دێ، ئەمیش لە سووڕەتی (**غافر**)دا هاتوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَرِحُوا۟

﴿ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ ﴾، واتە: ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون، سەرنج بدەن سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟ ئەوان لەوان زیاتر بوون و بەهێزتریش بوون و، شوێنەواریشیان زیاتر بوو لە زەویدا، کەچی ئەوەی وەدەستیان دەهێنا سوودی پێ نەگەیاندن، (لە سزاو بەڵای خوا نەیپاراستن) و، کاتێك پێغەمبەرەکانیان بەڵگە ڕۆشن و ئاشکرایەکانیان بۆ هێنان، زۆر دڵخۆشبوون بەوەندە زانیارییەی لەلایانەو، سەرەنجام ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد دەورەی دان (و سەریان بە فەتارەت چوو).

**٢٣)**- خۆبەزلگریی لە بەرانبەر هەقدا، ئەمیش لە زۆر شوێنی قورئاندا باسکراوە، بۆ وێنە: خوا لە سوورەتی **(الزمر)**دا، دەفەرموێ: ﴿ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَـٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: با نیشانەکانی ئێمەت بۆ هاتن (ئەی بێبڕوا!) بەڵام بە درۆت دانان و خۆت بەزلگرت و لە بێبڕوایان بووی.

زۆر جاران خۆ بەزلگریی سەردەکێشێ بۆ بێبڕوایی.

**٢٤)**- داواکردنی دابەزاندنی فریشتان لە جیاتی پێغەمبەران کە مرۆڤ بوون، یاخود فریشتەکان لەگەڵ پێغەمبەراندا بێن، وەك بەڵگەو شایەد، ئەمیش لە زۆر شوێنی قورئاندا باسکراوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی **(الإسراء)**دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَـٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ ﴾، واتە: هیچ شتێك ڕێی لە خەڵك نەگرت، بڕوابێنن کاتێك ڕێنماییان بۆ هات، مەگەر ئەوە کە گوتیان: ئایا خوا نوێنەرو ڕەوانەکراوێکی مرۆڤی ناردوە؟ (خوا دەفەرموێ:) پێیان بفەرموو: ئەگەر فریشتەکان لەسەر زەوی (ژیابانایەو) بە ئارامیی ڕۆیشتبانایە، ئەو کاتە لە ئاسمان فریشتەمان بە نوێنەر دەنارده سەریان.

بەڵام ئەوانە مرۆڤن و دەبێ نوێنەری خوا هەر لە خۆیان بێ، بۆیە بیانووەکەیان شتێکی بێ جێیەو نا لۆژیکییە.

٢٥)- ملكەچ بوون بۆ تاغووتەكان كە لە ڕۆشنایی دەریان دێنن بۆ تاریكایی، ئەویش لە سووڕەتی (البقرة)دا هاتوە: ﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٢٥٧﴾، واتە: خوا دۆست و پشتیوانی ئەوانەیە كە بڕوایان هێناوە، لە تاریكاییان دەریاندێنێ بەرەو ڕۆشنایی و، ئەوانەش كە بێبڕوان دۆست و پشتیوانەكانیان تاغووتن، لە ڕووناكیی دەریاندێنن و بەرەو تاریكاییان دەیانبەن، ئەوانە هاوەڵانی ئاگرن، لە نێو ئاگر (ی دۆزەخ)دا هەمیشە ماو دەبن.

ئەمانە بیست و پێنج (٢٥) سیفەت، لە سیفەتە هاوبەشە گشتییەكانی بێبڕوایان، واتە: بە هەر پێنج جۆرەكەیانەوە: مولحیدەكان و، هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان و، خاوەن كتێبەكان و، هەڵگەڕاوەكان و، دەغەڵ و مونافیقەكان، هەر پێنجیان خوای بەرزو مەزن بەو بیست و پێنج سیفەتەی باسكردن، پێناسەی كردوون.

## تەوەری چوارەم: جۆرەكانی كافران

جۆرەكانی كافران بەپێی تێگەیشتنی من، سەرجەم بێبڕوایان، پێنج جۆرن:

**١- مولحیدەكان:** ئەوانەی بڕوایان بە هیچ شتێك نیە، بڕوایان بە بوونی خوا نیە، بڕوایان بە وەحیی نیە، بڕوایان بە پێغەمبەرایەتیی و، سزاو پاداشت و زیندوو كرانەوەو بەهەشت و دۆزەخ نیە.

**٢- خاوەن كتێبەكان:** بە تایبەت جوولەكەو نەصڕانییەكان، پاشان هەر كۆمەڵێكی دیكە، كە خۆیان بە خاوەنی كتێبێكی ئاسمانیی دەزانن و، خۆیان پاڵدەدەنە لای خوا، كە بەشێك لە زانایان مەجووسییەكان و صابیئەو، هەر كەسێكی دیكەی لەو جۆرەش بێ، لەو بازنەیەدا دایاناون و، منیش ئەو ڕایەم پێ ڕاستە.

**٣- هاوبەش بۆ خوا دانەران:** ئەوانەی خوا دەناسن، بەڵام هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن.

**٤- موونافیقەکان:** دەغەڵ و دوو ڕووەکان کە خۆیان بە مسوڵمان پیشان دەدەن، بەڵام کوفر لە دڵیاندا هەیە.

**٥- هەڵگەڕاوەکان (المرتدّون):** کە بڕوایان هێناوە، بەڵام دوایی هەڵگەڕاونەوە.

ئێستاش ئێمە بەپێناسەکردنی ئەو پێنج جۆرەی بێبڕوایاندا دەچینە خوار:

## جۆری یەکەم: مولحیدەکان: (الملحدون، الدَّهرِيُّون، الزَّنَادِقَة):

ئەمانە خوا ﷻ لە قورئاندا بەو ناوانە، ناوی نەهێناون، بەڵام لە هەندێك شوێندا باسی کردوون و، باسی هەندێك لە سیفەتەکانی کردوون، دیارە وشەی (**إلحاد**)، لە قورئاندا بەکارهاتوە، بەڵام نەك بەو واتایەی ئێستا باوە (ئیلحاد) ئێستا واتە: بێبڕوایی بە خواو، بە ڕۆژی دوایی و، بە پێغەمبەرایەتیی، بەڵکو وشەی (**إلحاد**) بەکارهێنراوە بە مانای لادان لە ئایەتەکانی خوادا، یاخود لە ناوەکانی خوای پەروەردگاردا، بۆ وێنە:

أ- خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ﴿٤٠﴾ ﴾فصلت، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی لادان لە ئایەتەکانی ئێمەدا دەکەن، لێمان پەنهان نین.

ب- هەروەها لە بارەی قورئانەوە خوا لە سوورەتی (**النحل**)دا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە دەزانین ئەوان دەڵێن: مرۆڤێك فێری (موحەممەدی) دەکات، زمانی ئەو کەسەی ئاماژەی بۆ دەکەن (بەلایدا لادەدەن) ئەعجەمییە، بەڵام ئەم (قورئان)ە بە زمانێکی عەرەبیی زۆر ڕوونە!!

ج- هەروەها لە سوورەتی (**الأعراف**)دا فەرموویەتی: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ ﴿١٨٠﴾﴾، خواش ﷻ ناوە هەرە چاکەکانی هەن، تەنیا بەوان لێی بپاڕێنەوەو واز لەوانە بێنن کە لادان دەکەن، لە ناوەکانی خوادا.

بەڵام خوا ﷻ لە چوار ئایەتەکانی: (**٢١ و ٢٢ و ٢٣ و ٢٤**)، لە سوورەتی (**الجاثیة**) دا، باسی هەندێك لە سیفەت و نیشانەکانی مولحیدەکان دەکات و، لە کۆتاییدا بەوە دەیانناسێنێ، دەفەرموێ: ﴿وَقَالُواْ مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنۡيَا نَمُوتُ وَنَحۡيَا وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾﴾، واتە: گوتیان: ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، دەمرین و دەژین و تەنیا ڕۆژگار دەمانفەوتێنێ و، (خواش دەفەرموێ) زانیارییان لەو بارەوە نیە تەنیا گومان دەبەن.

لێرەدا ئەوانە کە دەڵێن: ڕۆژگار دەمانفەوتێنێ، دیارە ئەوە خاڵی هاوبەشی هەموو مولحیدەکانە کە دەڵێن: خوایەك ئێمەی دروست نەکردووەو ناشمانژیەنێ و ناشمانمرێنێ، بەس خۆمان دەمرین و دەژین، لە پێش ئەم ئایەتە موبارەکەدا، خوا دەفەرموێ: ﴿هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءٗ مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾﴾**الجاثیة**، واتە: ئەمانە ڕۆشنایی و ڕێنمایی و ڕەحمەتن (لە خوای بەبەزەییەوە) بۆ کۆمەڵێك زانیاریی دڵنیاییان هەبێ، یان ئایا ئەوانەی (کردەوە) خراپەکان دەکەن، پێیان وایە وەك ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، ژیانیان و مردنیان، یەکسان بن؟ ئەوە خراپترین بڕیار (حوکم)ە دەیدەن، خواش ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی و، بۆ ئەوەش هەر کەسە سزاو پاداشتی پڕ بەپێستی خۆی وەربگرێ و ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ، (ئنجا دوایی دەفەرموێ:) ئەوانە دەڵێن: ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، دەمرین و دەژین و، تەنیا ڕۆژگار دەمانفەوتێنێ.

کەواتە: لێرەدا باس باسی مولحیدەکانە.

هەڵبەتە دوایی خوا ﷻ بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئەوانە لەو بارەوە هیچ زانیارییان نیە، تەنیا گومان دەبەن.

هەر لەو بارەوە خوا ﷻ لە سوورەتی (الطور)دا، ئەم ئایەتە موبارەکەش دەفەرموێ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾، واتە: یان ئایا ئەوانە بەبێ شت (بە دیهێنەر) پەیداکراون، یان خۆیان بەدیهێنەری خۆیانن؟ بێگومان ئەو دوو ئەگەرە، هەردووکیان پووچن، چونکە نە هیچ شتێك بەبێ پەیداکەر، بەبێ بەدیهێنەر پەیدا دەبێ و، نە هیچ شتێکیش دەگونجێ خۆی بەدیهێنەری خۆی بێ.

کەواتە: تەنیا ئەگەری سێیەم ڕاستە، کە بریتیە لەوەی خوا ﷻ بەدیهێنەرو پەیداکەریانەو پەروەردگاریانە.

هەروەها لە سوورەتی (طه)دا، کاتێك فیرعەون لە مووسا دەپرسێ: ﴿ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَا مُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ ﴾، (فیرعەون) گوتی: ئەی مووسا! پەروەردگاری ئێوە کێیە؟ دیارە فیرعەون خۆی بە پەروەردگار زانیوەو، گوتوویەتی: ﴿ فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾النازعات، (فیرعەون) گوتی: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم، واتە: ئایا ئەو پەروەردگارەی ئێوە ئەگەر خۆم نەبم کێیە؟ مووساش ﷺ وەڵامێکی ددانشکێنی دەداتەوە: ﴿ قَالَ رَبُّنَا الَّذِي أَعْطَىٰ كُلَّ شَيْءٍ خَلْقَهُ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾طه، گوتی: پەروەردگارمان ئەو زاتەیە بوونی بە هەموو شتێك داوەو دوایش ڕێنمایی کردوە، یانی: سیستمی بۆ داناوە، چۆن بەڕێوەبچێ.

کەواتە: لە قورئاندا لە چەند شوێنێك دا ئاماژە کراوە بە بیرۆکەی ئیلحادو پووچەڵیی بیرۆکەی ئیلحاد، کە کرۆکەکەی ئەوەیە ئەم گەردوونە کەس نەیهێناوەتە دی و، ژیانی مرۆڤ هیچکەس سەرپەرشتیی ناکات و بەسەری

ڕاناگات، بەڵكو مرۆڤەكان خۆیان دەمرن و دەژین و، تەنیا ڕۆژگار دەیانفەوتێنێ و، ئەم گەردوونەش كەس نەیهێناوەتە دی!

ئنجا مولحیدەكان كاتی خۆی ڕایان وابووە، ئەم گەردوون (كون) ە بێ سەرەتایەو بێ كۆتاییشە، بەڵام زانستی فیزیاو گەردووناسیی ئێستا دەریخستوە، كە ئەم گەردوونە دستپێكێكی هەیە، كاتێك بووە نەبووەو، پاشان كۆتاییەكیشی هەیە، جارێ بە نسبەت خۆری خۆمانەوە، كە ئەستێرەیەكە لە تریلیۆنێك (١٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ئەستێرە لە ئەستێرەكانی كەهكەشانی كاكێشان، گەردووناسانی ئێستا دەڵێن: خۆر تەمەنی پێنج ملیار ساڵە، یانی: پێنج هەزار ملیۆن (٥٠٠٠٠٠٠٠٠٠) ساڵ وە بایی پێنج ملیار ساڵیش هایدرۆجینی پێماوە بیسووتێنێ و بیكاتە هێلیۆم، ئەو تیشك و وزەیەی جۆریش دەیبەخشێ، ئەوەیە كە غازی هایدرۆجین لەوێدا دەسووتێ، لەهەر چركەیەكدا چەند ملیۆن تەن و، دەگۆڕدرێ بۆ گازی هێلیۆم، ئەوە بە نسبەت خۆرەوە، بەنسبەت كۆی گەردوونەوەش گەردووناسان بە مەزەندە دەڵێن: تەمەنی گەردوون سێزدە ملیارو حەوسەد تا هەشتسەد ملیۆن ساڵە، دەشڵێن: ئەم گەردوونە بەپێی بیردۆزەی تەقینەوەی گەروە (**الإنفجار الكبير**، BIG BANG) هەمووی لە شتێكی یەكجار یەكجار بچووكەوە هاتوە، كە پێی دەگوترێ: سینگۆلاریتی (-SUNGOLAR ITY) هێلكەی گەردوونیی، تۆوی گەردوونیی، یەكەی گەردوونیی (**البیضة الكونیة، البذرة الكونیة، الوحدة الكونیة**)، كە شتێكی زۆر زۆر بچووك بووە، لە ئەلیكترۆنیش بچووكترو، لەو پەڕی گەرمییدا بووەو، لە كاتێكی ئەوپەری كورت و كەم دا تەقیوەتەوەو، سەرەنجام ئەم گەردوونە لەوەوە هاتوە، كەواتە: ئێستا ئەوە كە گەردوون سەرەتای نەبێ و كۆتایی نەبێ، بۆتە ئەفسانەو زانست خۆی كردوویەتە ئەفسانە، وەك ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، بە تەفصیل لەو بارەوە قسەمان كردوە، ئنجا بیرۆكەی بڕوانەبوون بە خوا ﷻ، بیرۆكەیەكی ڕیزپەڕەو دەگمەن بووە لە نێو بەشەردا، بەڵام لە ناسینی خواو مامەڵە لەگەڵ

کـردنی دا، کـەم و کورپـی زۆر بوونـی بـووە، بۆیـەش پێغەمبـەران صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ، جەختیـان کردۆتـەوە لـە سـەر ناسـاندنی خـوا، ناسـاندنی بەدیهێنەرایەتیـی خـواو، پەروەردگاریّتیـی خـواو، خاوەنداریّتیـی خـوا بـۆ هەمـوو شـتێك و، نـاوو سـیفەتەکانی، هەروەهـا جەختیـان کردۆتـەوە لەسـەر شـێوەی ڕاسـت و دروسـتی مامەڵـە لەگـەڵ خـوادا، ئەوشـێوەیەی خـوای پـەروەردگار لـێ ڕازییـە، ئەویـش بـەوەی بـەو شـێوازە بەندایەتیـی بـۆ بکـرێ کـە خـۆی فەرموویەتـی و، تەنیـا بەندایەتییـش بـۆ ئـەو بکـرێ.

شـایانی باسیشـە: لـە مەوسـووعەی: (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، لـە زۆر ڕووەوە بەبەڵگەی عەقڵیـی و زانسـتیی پووچەڵیـی بیرۆکـەی ئیلحادمان سـەلماندوە.

### جۆری دووەم: خاوەن کتێبەکان (أهل الكتاب):

لە سێ بڕگان دا باسی خاوەن کتێبەکان دەکەین:

### بڕگەی یەکەم: پێناسەی خاوەن کتێبەکان:

خـاوەن کتێبـەکان مەبەسـت لێیـان بـە پلـەی یەکـەم جوولەکـەو نەصرانییەکانـن، بـەڵام هـەر کەسـێکی دیکـەش کـە وەك ئەوانـە، حوکمـی وانی هەیـە، مـادام کـەم و زۆر خـاوەنی کتێبـی ئاسـمانیی بـێ، ئنجـا ئەگـەر مەجووسـیین، ئەگـەر صابیئـەن، ئەگـەر هـەر کەسـێکی دیکـەن، کـە خـوا ﷻ لـە سـووڕەتی **(الحج)**دا، باسـی هەمـوو ئەوانـەی کـردوە، دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلْمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْصِلُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە (کـە مسـوڵمانانن) و ئەوانـەی بوونـە جوولەکـەو صابیئـەکان و نەصرانییـەکان و مەجـووس و ئەوانـە هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـاوە، خـوا ڕۆژی قیامەتـدا دادوەرییـان لـە نێوانـدا دەکات، بێگومـان خـوا ﷻ لەسـەر هەمـوو شـتێکەوە چاودێـر و ئـاگادارە.

کەواتە: خاوەن کتێبەکان ئەوانەن کە دەڵێن: ئێمە کتێبێکمان لە خواوە بۆ هاتوە، ئنجا بەنسبەت جوولەکەو نەصرانییەکانەوە ئەوە ڕاستە، جوولەکە تەوراتیان بۆ دابەزێنراوەو، نەصرانی ئینجیل، بەڵام ئێستا جوولەکە وێڕای تەورات سی و نۆ **(٣٩)و**، بە سەرژمێریێك چل و نۆ **(٤٩)** کتێبی دیکەشیان هەیە، نەصرانییەکانیش ئینجیلێکە کردوویانە بە چوارو، کۆمەڵێ کتێبی دیکەشیان خستوونەتە گەڵ، وەك لە شوێنی دیکەش دا باسمان کردوە، بەڵام لە دوای جوولەکەو نەصرانیی، مەجووسیش، لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە فەرموویەتی: وەك خاوەن کتێبان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن: {**سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ**} **(أخرجه مالك: ٦١٦ ، وأبو يعلى: ٨٦٢، والبزار: ٩٤٨)**، صابیئەش دوو کتێبیان هەن، یەکیان کە گرنگترە: **(كنزا ربا: الكنز العظيم، الكتاب المقدس للصابئة المِنْدائيِّين)**، ئەوەی دیکەشیان: **(دراشة أديهيا، مواعظ وتعاليم يحيى بن زكريا)**، مەجووسیش ئەو کتێبەی هەیانە ناوی: (ئاڤێستا)، یان (ئاوێستا)یەو، زانایان لەو بارەوە مشتومڕیان هەیە، کە ئایا دەبێ (ئاڤیستا) کتێبێکی ئاسمانیی و خوایی بووبێ، یاخود کتێبێکە لەو کتێبانەی مرۆڤان دایانناون؟ بەڵام بێگومان خاوەن کتێبەکان بە گشتیی و جوولەکەو نەصرانییەکان بە تایبەت بە بێبڕوا دادەنرێن، بۆچی؟

چونکە بڕوایان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ نیەو، بڕوا بە خوا بوونەکەشیان کەم و کوڕیی تێدایە، هەروەها بڕوابوونیان بە ڕۆژی دوایی و بە سزاو پاداشتی خواو، بڕوابوونیان بە فریشتەکان و بە پێغەمبەرانیش، کەم و کوڕیی زۆری تێدایە، وێڕای بڕوانەبوونیان بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، خوا ﷻ لە سوورەتی **(النساء)**دا، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی کتێبیان پێدراوە! بڕوابێنن بەوەی ناردوومانەتە خوار، بە ڕاستدانەری ئەوەیە کە لەگەڵ ئێوەیە (واتە: کتێبەکانی ئێوە) بەر لەوەی دەم و چاوانێك، (ڕووانێك) بسڕینەوەو

هەڵیانبگێڕینەوە بۆ پشتەوە، یاخود نەفرینیان لێ بکەین، وەك چۆن نەفرینمان لە هاوەڵانی شەممە کرد، کاری خواش ئەنجام دراوە.

هەروەها لە سوورەتی (**البينة**)**دا**، خوا دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أُوْلَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوان لە خاوەن کتێبان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەران، لە ئاگری دۆزەخدان و بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ئەوانە خراپترین دروستکراوانی خوان.

بێگومان بێبڕوابوون (**کافر**) بوونی خاوەن کتێبان، لە لەئیسلام دا بەڵگە نەویستەکانەو شتێکی زۆر ئاشکرایە، بەڵێ خاوەن کتێب بڕوایان بە خوا هەیە، خوا دەناسن و پێغەمبەران بە گشتیی دەناسن و، بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەیە، بەڵام لە هەموو ئەو بڕواهێنانانەدا خەلەل و کەم و کوڕییان هەیە، ئنجا گەورەترین خەلەل و کەم و کوڕییش ئەوەیە کە بڕوایان بە پێغەمبەری کۆتایی صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، نیە.

## برگەی دووەم: تایبەتمەندییەکانی خاوەن کتێبان، بە تایبەتی جوولەکەو نەصرانییەکان:

تایبەتمەندییەکانی خاوەن کتێبان (جوولەکەو نەصرانییەکان) کە تێیاندا هاوبەشن، دەتوانین بڵێین: ئەم چواردە تایبەتمەندییەیان هەن:

**١-** هەر کام لە جوولەکەو نەصرانییان، ئەوەی دیکە ڕەفز دەکات و دانی پێدانهێنێ، دان بە ئایین و بەرنامەکەی دا ناهێنێ، وەك لە سوورەتی (**البقرة**)دا، هاتوە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ لَيْسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَىْءٍ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيْسَتِ ٱلْيَهُودُ عَلَىٰ شَىْءٍ ﴿١١٣﴾﴾.

**٢-** جوولەکەو نەصرانییەکان، لافی ئەوە لێ دەدەن کە تایبەتمەندییان هەیەو ئیمتیازیان هەیە، بەسەر خەڵکی دیکەداو، کوڕانی خواو خۆشەویستانی خوان، وەك لە سوورەتی (**المائدة**)دا، هاتوە: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾﴾.

٣- جوولەکەو نەصرانییەکان پێیان وایە بەهەشت تەنیا بۆ ئەوان دانراوەو، لەواندا کورت هەڵاتوەو، جگە لەوان کەس نایچێتێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا، هاتوە: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ ﴿١١١﴾ ﴾.

٤و٥- هەڵوەشانەوەی پەیمانێك کە لەگەڵ خوادا بەستوویانەو، گۆڕینی کتێبی خواو لە بیرچوونی هەندێکی، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوە: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ ٱثْنَىْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِى وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ ۙ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱصْفَحْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذْنَا مِيثَٰقَهُمْ فَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

٦و٧- خواردنی ماڵی خەڵك بە ناهەق و، ڕێ لە خەڵکگرتن کە دوای ئایین و بەرنامەی هەقی خوا بکەون، وەك لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٣٤)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْأَحْبَارِ وَٱلرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۗ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! زۆرێك لە زانایان و ڕاهیبەکان (هی جوولەکەو نەصرانییەکان) ماڵی خەڵك بە ناهەق دەخۆن و، خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن...

٨- تێپەڕاندن و زێدەڕۆییکردن لەو سنوورەی لە دینداریيدا بۆیان دانراوە، وەك لە سوورەتی (المائدة)دا هاتوە: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ﴿٧٧﴾﴾، واتە: بڵێ: ئەی خاوەن کتێبینە! بە ناهەق لە دینەکەتدا زێدەڕۆیی مەکەن و لا مەدەن.

٩- سەرپێچییکردن لە ئایینی هەقی خوا، کە لە قورئان و، ڕێبازی پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ بەرجەستەیە، دوای زانین و ناسین و شارەزایی، بەهۆی حەسوودیی و ویستنی ستەم و سنوور شکێنیی و، بە مەبەستی مانەوەیان لەسەر ئایینی ناهەقی خۆیان، وەك لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، هاتوە، خوا دەفەرمویّ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ۗ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴿١٩﴾﴾، واتە: بەدڵنیایی بەرنامە (ی ڕاست و تەواو) ئیسلامە ئەوانەی کتێبیان پێدراوە ڕاجیاییان نەکەوتە نێوان، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، بەهۆی ستەمەوە لە نێوياندا.

یانی: بەهۆی حەسوودیی و ستەم و دەستدرێژییەوە، کە چاویان لەوە بوو ئەو بەزم و بازاڕەی هەیانە، لێیان تێکنەچێ.

١٠- فریوخواردنیان بە دینداریيە پووچەڵەکەیان بەهۆی درۆ هەڵبەستنیان بە ناوی خواوە، لە میانی تێکدان و گۆڕینی کتێبی خواداو، هەڵبەستنی هەندێك ڕیوایەتی درۆ، وەك لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، هاتوە: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾، واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە گوتیان: ئێمە ئاگرمان تووش نابێ، مەگەر ڕۆژانێکی ژمێردراوو، ئەوەی لە ئایینەکەیاندا هەڵیانبەستبوو، فریویدان.

١١- تێکەڵکردنی هەق لەگەڵ باتیڵ دا، بە مەبەستی ئەوەی ئەو باتیڵ و ناهەقەی پێیانە لە میانی هەقەکەدا ڕەواجی پێبدەن و، بەسەر خەڵکی نەزاندا ساغی بکەنەوە، وەك لە سوورەتی (**آل عمران**)دا هاتوە: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَلْبِسُونَ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٧١﴾﴾، واتە: ئەی خاوەن کتێبینە! بۆچی هەق لەگەڵ باتیڵدا تێکەڵ دەکەن و هەق دەشارنەوەو، لە حاڵێکیشدا کە دەزانن!

**١٢-** هەوڵدانیان بۆ پێشاندانی ئایینی هەقی خوا (ئیسلام) لەبەر چاوی خەڵك بەلاریی و بە شێوێنراویی، تاكو خەڵكی لێ بسڵەمێننەوە، وەك لە ئایەتی (٩٩)ی، سوورەتی **(آل عمران)**دا هاتوە: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ تَبْغُونَهَا عِوَجًا وَأَنتُمْ شُهَدَآءُ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئەی خاوەن كتێبینە! بۆچی خەڵك لە ڕێی خوا لادەدەن، كەسێك كە بڕوای هێناوە، لاریی بۆ ئایینی خوا دەخوازن، لە حاڵێكدا ئێوە شاهێدن (كە ئایینی خوا ڕاستەو) خواش بێئاگا نیە لەوەی دەیكەن.

**١٣-** گرتنی زانایان و خوا پەرستەكانیان (گۆشە نشینەكانیان) بە پەرستراوو پەروەردگار لە جیاتی خوا، وەك لە سوورەتی **(التوبة)**دا هاتوە: ﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴿٣١﴾ ﴾، واتە: زانایەكان و ڕەبەنەكانیان لە جیاتی خوا كردن بە پەروەردگارو پەرستراوی خۆیان.

**١٤--** هاوكاریی هەندێكیان بۆ هەندێكیان لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان، لەگەڵ ئەوەشدا كە لەنێو خۆیاندا ڕاجیاییان هەیە، وەك لە سوورەتی **(المائدة)**دا هاتوە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ ﴿٥١﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! جوولەكەو نەصڕانییەكان مەگرن بەدۆست، ئەوان هەندێكیان دۆست و پشتیوانی هەندێكیانن.

هەڵبەتە هەر كام لە جوولەكەكان و نەصڕانییەكانیش، دیسان كۆمەڵێك تایبەتمەندیی سەربەخۆی خۆیانیان هەن، جوولەكەكان لەو سەرچاوەیەدا كە ئاماژەم پێدا، بیست (٢٠) نیشانەو تایبەتمەندییانم بۆ ژماردوون، هی نەصڕانییەكانیش دە (١٠) تایبەتمەندییم لێ ژماردوون.

**برگەی سێیەم: هەڵوێستی جوولەكەو نەصڕانییەكان لە بەرانبەر ئیسلام و مسوڵماناندا:**

هەڵوێستیان هەر لەو كاتەوەی خوا ﷻ هەواڵیداوە، تاكو ئەم لە حزەیەی ئێستا تێیدایەن، هەڵوێستێكی خراپە، بەڵام ئەویش بە شێوەیەكی ڕێژەییەو، هەڵوێستی جوولەكەكان هەمیشە خراپتر بووە لە هی نەصڕانییەكان، دەشتوانین

بەگوشـین بوختکردنـەوەوە، هەڵوێسـتی نەرێنیـی و خراپـی جوولەکـەو نەصڕانییـەکان لـە بەرانبـەر ئیسـلام و مسـوڵمانان دا، لـە شـەش خاڵانـدا بخەینـەڕوو:

١- لە مسوڵمانان ڕازیی نین و نابن، مەگەر دەستبەرداری ئایینە هەقەکەی خۆیان بن:

وەك لـە ئایەتـی (١٢٠)ی سـوورەتی (**البقـرة**)دا هاتـوە: ﴿وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ ﴿١٢٠﴾﴾، جوولەکـەو نەصڕانییـەکان لێـت ڕازیـی نابـن، تاکـو شـوێن بەرنامەکەیـان نەکـەوی.

٢- زانینی دڵنیاییان بە ڕاستێتیی ئیسلام و مسوڵمانان و، ڕاستگۆیی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بەڵام شاردنەوەی ئەوە:

وەك لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا هاتـوە: ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ ﴿١٤٦﴾﴾، واتـە: وەك چـۆن کوڕەکانـی خۆیـان دەناسـن، ئـاوا موحەممەدیـش دەناسـن، [کـە پێغەمبـەری کۆتایـی بـە هەقـی خوایـە].

٣- خۆزگە خواستنیان کە مسوڵمانان لە ئایینەکەیان هەڵگەڕێننەوە بە هۆی حەسوودییانەوە، دوای ئەوەی دڵنیان ئیسلام ڕاستەو، پێغەمبەری خاتەمیش ﷺ ڕاستە:

وەك لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا خـوا فەرموویەتـی: ﴿وَدَّ كَثِيرٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ لَوْ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعْدِ إِيمَـٰنِكُمْ كُفَّارًا حَسَدًا مِّنْ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْحَقُّ ۖ ﴿١٠٩﴾﴾.

٤- پەنابردنیان بە شێوازی زۆر نزم و ئامرازی زۆر جۆراو جۆر، بۆ دوورخستنەوەی خەڵك لە ئیسلام:

وەك لـە سـوورەتی (**آل عمـران**)دا هاتـوە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَقَالَت طَّآئِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامِنُوا۟ بِٱلَّذِىٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَجْهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكْفُرُوٓا۟ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٧٢﴾﴾، واتـە: کۆمەڵێـك لـە خـاوەن کتێبـەکان گوتیـان: بەیانـی بڕوابێنـن بـەوەی بـۆ بـڕواداران دابەزێـنراوەو، ئێوارەکـەی بێبڕوابـن، بەڵکـو بگەڕێنـەوە.

یانی: ئەوانیش بکەونە دوو دڵییەوە، بڵێن: ئەوانە بۆیە هەڵگەڕانەوە، دیارە بۆیان دەرکەوتوە ئەو ئایینەی ئێمە لەسەرینی ناهەقە!

٥- لە نێو خاوەن کتێباندا هەیە، زۆر دەست پاکەو ئەمینەو، تێشیاندایە لە ناپاکییکردن لە بچووکترین شتیش ناسڵەمێتەوە:

وەك لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، هاتوە: ﴿وَمِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مَنْ إِن تَأْمَنْهُ بِقِنطَارٍ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ وَمِنْهُم مَّنْ إِن تَأْمَنْهُ بِدِينَارٍ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيْكَ ﴿٧٥﴾﴾.

٦- جوولەکەو نەصرانییەکان هەموویان وەك یەك نین، بەڵکو هەیانە زۆر بە پێچەوانەی خراپەکانیانەوە، کۆمەڵێ سیفەتی باشیان هەن:

وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، دەفەرموێ: ﴿لَيْسُوا۟ سَوَآءً ۗ مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْخَيْرَٰتِ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾﴾ واتە: (خاوەن کتێبەکان) یەکسان نین، لە خاوەن کتێبان کۆمەڵێکی ڕاوەستاو (لە سەر هەق) هەن، لەکاتەکانی شەوگاردا ئایەتەکانی خوا دەخۆێننەوەو کڕنووش (بۆ خوا) دەبەن، بڕوا بەخواو بە ڕۆژی دوایی دێنن و فەرمان بە پەسندو ڕێگریی لە ناپەسند دەکەن و، خێرایی لە چاکەکان دا دەکەن و ئەوانە لە صاڵحانن.

کەواتە: ئیسلام پۆلێنیان دەکات چونکە هەموویان یەك جۆر نین، بەڵکو خەڵکێکی باشیشیان لە نێودا هەیە، ئنجا زانایان و ڕوونکەرەوانی قورئان لەوبارەوە کە ئایا ئەو خەڵکە باشەی لە نێو خاوەن کتێبان دا هەیە، مەبەست ئەوانەن کە مسوڵمان دەبن، یاخود هەر لەسەر ئایینی خۆیان ماونەوە، بەڵام باشیشن؟ زانایان لەو بارەوە ڕای جیاییان هەیەو، کاتی خۆی ئێمە لە دەمی تەفسیری سوورەتی (**آل عمران**)دا، بە تەفصیل لەو بارەوە قسەمان کردوە.

## جۆری سێیەم: هاوبەش بۆ خوادانەران:

هاوبەش بۆ خوا دانەران بریتین لەو کەسانەی خوا دەناسن و، بە جۆرێك لە جۆرەکان دەشیپەرستن، بەڵام هاوبەشی بۆ دادەنێن، ئێمە لە بارەی هاوبەش بۆ خوادانان و هاوبەش بۆ خوا دانەرانەوە، لە کۆتایی تەفسیری سوورەتی (**یوسف**)دا، لە بەر ڕۆشنایی و تەفسیری ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ ﴾، کورتە باسێکمان کردوە، بۆیە لێرە باسی هاوبەش بۆ خوادانەران ناکەین، تەنیا ئەوەندە دەڵێین:

هاوبەش بۆ خوا دانان بریتیە لە: هەندێك لە دروستکراوەکان هێنانە ئاستی خوا ﷻ، أ- چ لە بەدیهینەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی دا.

ب- چ لە ناوو لە سیفەتەکانیدا.

ج- چ لە پەرستراوێتیی و سەرپەرشتییکردنی خواو، حوکمڕانیەتیی خوای بەرزو بێ وێنەدا، لە هەر کام لەو سێ بەشانەدا، یەکێك لە دروستکراوانی خوا بهێنرێتە ئاستی خواو ببرێتە ڕیزی خوا، هاوبەش بۆ خوا دانانە، ئایەتێك لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، هاتوە بە باشترین شێوە تەعبیر دەکات لە شیرك، کە هابەش بۆ خوا دانەران لە دۆزەخ دا پەشێمانیی دەردەبڕن و دەڵێن: ﴿ تَاللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذْ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٩٨﴾ ﴾، واتە: سوێند بە خوا ئێمە لە گومڕاییەکی ڕوون و ئاشکرا دابووین، کە ئێوەمان یەکسان دەکرد لەگەڵ پەروەردگاری جیهانییان دا.

کەواتە: شیرك و هاوبەش بۆ خوا دانان، ئەوەیە تۆ شتێك لە دروستکراوانی خوا بێنیە ئاستی خوا، لەو شتانەدا کە تایبەتن بە خواوە: أ- چ بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی.

ب- چ ناوو سیفەتەکانی، کە تایبەتن بە خواوە.

ج- چ پەرستراویەتیی و حوكمڕانیەتیی و سەرپەرشتییكردنی خوا ﷻ، لە هەر كام لەو سێ بەشانەدا یەكێك لە دروستكراوەكان بێنیە ئاستی خوا، مانای وایە هاوبەشت بۆ خوا داناوە.

پێویستە بزانرێ كە لە قورئان دا باسی شیركی گەورەو شیركی بچوك نەكراوە، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، كە هەندێك قسەو ڕەفتاری بە شیریكی گچكە داناون، بۆ وێنە:

**١-** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ**}، (**أخرجه الترمذي: ١٥٣٥، عَنِ ابْنِ عُمَرَ** رضي الله عنه**، وَصَحَّحَهُ الألباني**)، واتە: هەر كەسێك سوێند بە جگە لە خوا بخوات، كوفری كردوە، یاخود شیركی كردوە.

**٢-** هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك گوێی لە وتاربێژێك بوو وتاری دەدا، لە میانی وتارەكەیدا گوتی: (**مَاشَاءَ اللهِ وَشِئْتَ**)، ئەوەی خوا بیەوێ و تۆ بتەوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: {**أَجَعَلْتَنِي للهِ نِداً؟ قُلْ مَاشَاءَاللهِ وَحْدَهُ**}، (**أخرجه البخاري فِي الأدب المفرد: ٧٨٣، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي «الصحيحة»، برقم: ١٠٩٣**)، واتە: ئایا منت كردە هاوتای خوا؟ بڵێ: مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ بە تەنیا.

**٣-** هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیابازیی بە شیركی بچووك داناوە، فەرموویەتی: {**إِنَّ أَخْوَفُ مَا أَخَافَ عَلَيْكُمْ الشِّرْكُ الأَصْغَرُ، قَالَوا: وَمَا الشِّرْكُ الأَصْغَرُ يَا رَسُولَ اللهِ** ﷺ**؟ قَالَ: الرِّيَاء**}، (**أخرجه أحمد: ٢٣٦٨٠، قال: شعيب الارنؤط: حديث حسن و رجال رجال صحيح**)، واتە: شتێك كە زۆر مەترسییم لێی هەیە بەرانبەرتان، بریتیە لە شیركی بچووك، گوتیان: شیركی بچووك چییە، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: ڕیابازیی.

**٤-** هەروەها هەندێك لە ڕەفتارەكانی بەشیرك داناون، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**إِنَّ الرُّقَى وَالتَّمَائِمَ والتِّوَلَةَ شِرْكٌ**}، (**أخرجه أحمد: ٥٣٦١٥، وأبو داود: ٣٦٨٣، وابن ماجه: ٣٥٣٠، والحاكم: ٨٢٩٠، وقال: صحيح الإسناد على شرط الشيخين**).

واتـە: نوشـتەکان کـە دەنووسرێـن و، ئەوانـەی هەڵدەواسرێـن و، ئـەوەی بـۆ ئـەوە دەکـرێ ئافرەتێـك لـەلای پیـاو یـان پیاوێـك لـەلای ئافرەتێـك خۆشەویسـت بکـرێ، ئەوانـە شـیرکن، واتـە: ئـەو شـتانەی دەنووسرێـن و تێیانـدا پەنـا دەبرێتـە بـەر شـەیتانەکان و، بەشێوەی شـەرعیی نانووسرێـن، کـە فەرمایشـتی خـوای پـەروەردگارو فەرمایشـتی پێغەمبەرەکـەی بـن.

## جۆری چوارەم: دەغەڵ و مونافیقەکان:

مونافیـق و موخەننەتـەکان، خـوای کاربەجـێ بەخراپتریـن جـۆری کافـرانی دانـاون، وەك لـە سـوورەتی (النسـاء)دا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ ﴾، واتـە: بـە دڵنیایـی مونافیقـەکان لـە پلـەی هـەرە خـوارەوەی (پلـەی هـەرە ژێـری) ئاگـر (ی دۆزەخ)دان و هیـچ یارمەتییدەرێکـت بـۆ چنـگ ناکـەوێ.

(**نفـاق**)، لـە (**نفـق**)ەوە هاتـوە، کـە بریتیـە لـە کونێـك کـە لـە ژێـر زەویـدا لێـدەدرێ (تونێـڵ)و، دوو دەرگای هـەن، هـەم چوونـە ژوور (**مدخل**)ێکـی هەیـە، هـەم لـێ دەرچـوون (**مخرج**)ێکـی هەیـە، یاخـود (**نفـاق**) لـە (**نَافِقَـاء**)ەوە، هاتـوە، (**نَافِقَاء**)یـش، بریتیـە لـە کونـی جـرج کـە لـە ژێـر زەویـدا لێـدەداو دوو کونانـی بـۆ دەکات، لـە یەکێکیانـەوە دەچێتـە نێـوو لـەوەی دیکـەوە دەردەچێـت، ئـەوە لـەڕووی زمانەوانییـەوە.

لـە ڕووی زاراوی شـەرعییەوەش: (**المُنَافِـقُ: هُـوَ الكَافِـر الَّـذِي أَظْهَـرَ الإِسْـلَامَ كَذِبَـاً، وَأَخْفَـى كُفْـرَهُ عَـنِ المُسْـلِمِين**) (**المصبـاح المنـير للفيومـي: ص٣١٨**)، واتـە: مونافیـق ئـەو بێبڕوایەیـە ئیسـلام بـەدرۆ بـۆ مسـوڵمانان پێشـان دەدات و، کوفرەکەشـی لـە مسـوڵمانان پەنهـان دەکات و دەشـارێتەوە.

ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (المنافقـون)دا، باسـێکی خەسـت و خۆڵـمان لـە بـارەی نیفـاق و سـیفەتەکانی مونافیقەکانـەوە کـردوە، بۆیـە لێـرەدا ناچینـە نێـو وردەکارییەکانـەوە، ئەوەنـدە دەڵێیـن:

مونافیقـەکان خراپتریـن جـۆری بێبڕوایانـن و بەزەڕترینیانـن، چونکـە هەقیـان ناسـیوە کەچـی بڕوایـان پێنەهێنـاوە، ئەگەرنـا هـەر کەسـێك هـەق نەناسـێ، ئیسـلام نەناسـێ، بـە بێبـڕوا دانانـرێ، بـەڵام مونافیقـەکان لەنێـو خەڵکـی ئیسـلامن و خۆیـان بـە مسـوڵمان پێشـان دەدەن و، ئیسلامیشـیان ناسـیوە کەچـی لـە دڵیشـدا پێـی بێبـڕوان، گرفتـی مونافیقـەکان نـە لـە کردەوەکانیاندایـە، کـردەوە ڕواڵەتییەکانیـان، نـە لـە قسـەکانیان دایـە، بەڵکـو لـە دڵ و دەروونیاندایـە، کوفـر لـە دڵ و دەروونیانـدا هەیـە، ئەگەرنـا بـە قسـە خۆیـان بـە مسـوڵمان پێشـان دەدەن و، بـە کـردەوەش لەگـەڵ مسـوڵماناندان وو زۆرجـار بەشـداریی کردەوەکانـی مسـوڵمانانیش دەکـەن، بـەڵام گرفتەکەیـان لـە دڵ و دەروونیاندایـە.

### جۆری پێنجەم: (المرتدّون):

هەڵگـەڕاوەکان جـۆری پێنجـەم و کۆتاییـن لـە جۆرەکانـی بێبڕوایـان، هەڵبەتـە ئـەوە بـە بـۆ چوونـی مـن ص، لـە چـوار بڕگـەدا باسـی هەڵگـەڕاوەکان دەکەیـن:

١- هەڵگەڕاوە (مرتد) کێیە؟

٢- مرۆڤی بڕوادار بەچی لە ئایینەکەی هەڵدەگەڕێتەوە؟

٣- هۆیەکانی هەڵگەڕانەوە لە ئایین.

٤- سەرەنجامی بابای هەڵگەڕاوەو سزایەکەی چییە؟

### بڕگەی یەکەم: هەڵگەڕاوە کێیە؟

دەتوانیـن زۆر بـە کورتیـی بڵێیـن: (هەڵگـەڕاوە): ئـەو بڕوادارەیـە بڕوایەکـی ڕاسـت و دروسـتی هێنـاوەو، چۆتـە نێـو ئیسـلامەوە، دوایـی لێـی هەڵگەڕاوەتـەوەو چۆتـەوە

نێـو كوفـر، بەهـۆی یەكێـك لـەو هۆكارانـەوە كـە خـوای بـەرز، یـان پێغەمبەرەكـەی بـە كافركـەر (**مُكفِّـر**)و، بـە هـۆكاری چوونـە نێـو كوفریـان دانـاون.

كەواتـە: هەڵگـەڕاوە كەسـێكە كـە دەبـێ ئیمانـی هەبووبـێ پێـش بێبڕوابوونەكەی، ئەگـەر ئیمانـی پێشـتر نەبووبـێ، بـە هەڵگـەڕاوە دانانـرێ، كەسـێك كافـری ئەصڵیـی بـێ، هــەر كافــرەو، كەســێك ئەصڵــەن ئیســلامی نەناســیبێ، ئەگــەر دژایەتییــشی بـكات، ئـەو كاتـە پێـی ناگوتـرێ: هەڵگـەڕاوە، چونكـە ئیسـلامی نەناسـیوەو بـڕوای پێنەهێنــاوە، هەڵگــەڕاوە كەســێكە دەبــێ پێشــێ بــڕوای هێنابــێ و دوایــی لێــی هەڵگەڕابێتـەوە، هـەر بۆیـەش هەندێـك لەو عەلـمانییانەی بـە مەبدەئیی عەلـمانیین و تێیگەیشـتوون، واتـە: شـوێن سـیكۆلاریزم دەكـەون، وەك جێگرەوەیـەك بـۆ ئیسـلام و، بڕوایـان بـە خـوا نیـەو، یاخـود بڕوایـان بـە وەحیـی خـوا نیـە، بڕوایـان بـەوە نیـە ئایینـی خـوا ژیانـی بەشـەر ڕێكبخـات لەسـەر زەوی، لـە هیـچ ڕووێكـەوە، یـان ئـەو پەڕەكـەی ئاییـن بـە پەیوەندییەكـی شـەخصیی لـە نێـوان خـواو مرۆڤـدا دادەنێـن، ئـا ئەوانـە كوفریـش بكـەن، بـە هەڵگـەڕاوە دانانرێـن، چونكـە ئیمانیـان نەهێنـاوە لێـی هەڵگەڕابنـەوە، بەڵكـو ئەوانـە هـەر بـە كافـری ئەصڵیـی دادەنرێـن، هەڵگـەڕاوە كەسـێكە بـڕوای هێنـاوە بڕوایەكـی ڕاسـت و دروسـت و، دوایـی هەڵگەڕابێتـەوەو لـە ئیـمان و ئیسـلام پاشـگەز بـوو بێتـەوە.

## بڕگەی دووەم: بەچی بڕوادار لە ئایینەكەی هەڵدەگەڕێتەوە؟

وەك زۆرجاران گوتوومانە، بڕوا چوار پێكهێنەری هەن:

١- پەی پێبردنی عەقڵ (**إدراك العقل**)، واتە: ئەو زانیارییە ڕاست و دروستانەی، لە بارەی ئیمان و ئیسلامەوە لە عەقڵدا جێگیر دەبن.

٢- كردەوەكانی دڵ، (**أعمال القلب**) وەك بەڕاستزانین، خۆشویستن، مل بۆ كەچكردن، پەسندكردن، ڕازیی بوون، بۆ هەموو ئەو ڕاستییانەی عەقڵ لە بارەی ئیمان و ئیسلامەوە لە خۆیدا جێی كردوونەوە.

٣- دانپێداهێنانی زمان (**إقرار اللِّسَان**)، واتە: دانپێداهێنانی زمان بەو شتانەدا کە مرۆڤیان پێ دەبێتە بڕوادارو، دەبێتە مسوڵمان.

٤- کردەوەی ئەندامەکان (**عمل الجوارح**) واتە: جێبەجێکردنی ئەو فەرمانبەردارییەی کە ئیمان هێنان پەکی لەسەری کەوتوە، کە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئەصڵی کردەوەی ئەندامەکان و جینسەکەی پێکهێنەری ئیمانە.

بەڵام خەواریج دەڵێن: هەموو کردەوە باشەکان پێکهێنەری ئیمانن، بۆیە هەر کەسێ یەك گوناهی گەورە بکات واتە: نوێژێك بچوێنێ، یان ڕۆژوویەك بچوێنێ، پێی کافر دەبێ، هەر کەسێکیش قەدەغەیەك بشکێنێ: زینایەك، قەتڵێك، دزییەك بکات، پێی کافر دەبێ، خەواریج وا دەڵێن.

مورجیئەش دەڵێن: مرۆڤ هەرچەندە گوناهان زۆر بکات، ئیمانەکەی زیانی لێناکەوێ.

موعتەزیلەش گوتوویانە: ئەو کەسەی گوناهێکی گەورە دەکات، چ کە واجبێك دەچوێنێ، چ کە قەدەغەیەك دەشکێنێ، بڕوادار نامێنێ، بەڵام نەشبۆتە بێبڕوا، بەڵکو پێگەیەکی هەیە لەنێو دوو پێگەکانداو، بە هەڵواسراویی دەمێنێتەوە، (**المنزلة بين المنزلتين**)، بێگومان ڕای ڕاست و هاوسەنگیش هەر ئەوەیە کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی ئیسلام لەسەرینی، کە کردەوە لە ئەصڵدا بەشێکە لە ئیمان واتە: جینسی کردەوە، نەك هەموو کردەوەیەك، بۆیەش زۆربەی هەرە زۆری زانایان پێیان وابووە، بەبێ نوێژکردن مرۆڤ نابێتە مسوڵمان، وەك فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش ﷺ بەڕوونیی ئەوە دەگەیەنن، بۆ وێنە: {**الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَر**} (**أخرجه ابن أبي شيبه: ٣٣٩٦، وأحمد: ٢٩٨٧، والترمذي: ٢٦٢١، والنسائي: ٤٦٣، وابن ماجه: ١٠٧٩، وابن حبان: ١٤٥٤، والحاكم: ١١**).

واتە: ئەو پەیمانەی لە نێوان ئێمەو ئەواندا، (واتە: نامسوڵماناندا) هەیە نوێژە، هەر کەسێك وازی لێ هێنا، بێبڕوا بووە.

بـەڵام بێگومـان بـۆ حوكمـدان: كـێ لـە ئاییـن هەڵگەڕاوەتـەوە؟ دەڵێیـن: بـەو شـتانەی لـە دڵـدان و پێویسـتە لـە دڵـدا هەبـن، بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ بـە بـڕوادار لـە دابـنرێ، ئەگـەر ئـەو شـتانە لـە دڵـدا نەمـان، مانـای وایـە ئـەو مرۆڤـە ئیمانـی لـە دڵ دا نەمـاوە، بـەڵام بـۆ حوكمـدان بـەوەی ئایـا لـە بازنـەی ئیسـلام چۆتـە دەرێ؟ دەبـێ تەنیـا بـەو شـتانەی لێـی دەبیسـترێن، یاخـود لێـی دەبینرێـن، حوكـم بـدرێ، ئـەو شـتانەی لێـی دەبیسـترێن، وەك: قسـەكردن، یاخـود لێـی دەبینرێن وەك هەڵسـوكەوت، تەنیـا بـەو دووانـە حوكـم دەدرێ، بـەوەی ئایـا فلانكـەس لـە بازنـەی ئیـمان و ئیسـلام دامـاوە، یاخـود لێیـان چۆتـە دەرێ؟!

### بڕگەی سێیەم: هۆكارەكانی هەڵگەڕانەوە لە ئایین:

بە سەرنجدانی ئایەتەكانی قورئان، دەردەكەوێ كە هۆكارە سەرەكییەكانی هەڵگەڕانەوە لە ئایین ئەم دوازدەیەن، كە ئاماژە ئاساو بە كورتیی و پوختیی دەیانخەینەڕوو:

١- خۆشویستنی ژیانی دنیاو هەڵبژاردنی بەسەر دواڕۆژدا: ﴿يَسْتَحِبُّونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْءَاخِرَةِ ﴿٣﴾﴾ **إبراهيم.**

٢- شوێنكەوتنی ئارەزوو: ﴿وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱلَّذِىٓ ءَاتَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ ٱلشَّيْطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخْلَدَ إِلَى ٱلْأَرْضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ ﴿١٧٦﴾﴾ **الأعراف.**

٣- ڕق لێبوونەوەی ئەو پەیام و وەحییەی خوا دایبەزاندوە، كەسێك بەڕاستیی پەیام و ئایینی خوای خۆشنەوێ لە دڵەوە، ئەگەر پێشتریش بڕواداربووبێ، بەهەڵگەڕاوە دادەنرێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾﴾ **محمد.**

٤- ملكەچ نەكردن بۆ بەرنامەی خواو، پێیەوە و پابەندنەبوونی، وەك لە سوورەتی **(النور)**دا، دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾.

٥- دۆستایەتیی نەگرتن لەگەڵ بڕواداران دا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {عَلَيْكُمْ بالجَمَاعَةِ، وَإِيَّاكُمْ وَالفُرْقَةَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الوَاحِد، وَهُوَ مَعَ الإثْنَيْنِ أَبْعَدُ} (أخرجه أحمد: ١١٤، والترمذي: ٢٢٦٥، وابن حبان: ٧٢٥٤) واتە: لەگەڵ كۆمەڵی بڕواداراندابن و خۆتان لە پەرتەوازەیی بپارێزن، چونكە شەیتان لەگەڵ یەكێكەو لەگەڵ دووان دوورترە.

٦- فەرمانبەریی كردن بۆ ئەهلی كوفر، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾﴾ آل عمران.

٧- دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ ئەهلی كوفردا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ﴿٥١﴾﴾ المائدة.

٨- گوشاری ئەهلی كوفر، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُواْ ﴿٢١٧﴾﴾ البقرە، بەردەوام لە دژتان دەجەنگن تاكو هەڵتاندەگێڕنەوە، ئەگەر بتوانن.

٩- پەرتەوازەیی و ڕاجیایی، وەك خوا لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُواْ وَٱخْتَلَفُواْ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾﴾.

١٠- وازلێهێنانی جیهادو جەنگ لە پێناوی خوادا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾﴾.

١١- خۆڕانەگریی لەسەر تاقیكردنەوەكانی خواو دانەمەزراویی: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾﴾.

**١٢-** كارتێكراو بوون بە شوبهە فیكرییەكان، كە دوژمنەكانی ئیسلام دروستیان دەكەن: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ  ﴾.

**بڕگەی چوارەم و كۆتایی: سەرەنجامی هەڵگەڕانەوەو سزای هەڵگەڕاوە:**

خوا ﷻ لەبارەی سەرەنجامی هەڵگەڕانەوەوە، چەند شتێكی فەرمووە، كە دەرهاویشتەی لە ئیسلام پاشگەزبوونەوەن:

**١-** كردەوەكانیان هەڵدەوەشێنەوە: ﴿ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ﴿٢١٧﴾ ﴾**البقرة**، واتە: هەر كەسێك لە ئێوە لە ئایینەكەی هەڵگەڕێتەوەو بە كافریی بمرێ، ئەوانە كردەوەكانیان لە دنیاو دوارۆژدا هەڵوەشاونەوە.

**٢-** فریشتەكان لە كاتێكدا گیانیان دەكێشن، لە دەم و چاویان و لە پشتیان دەدەن، وەك خوا لە سوورەتی (**محمد**)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ﴾، كە لە سیاقی باسی هەڵگەڕاوەكان (**مرتدّین**)دا هاتوە. واتە: ئنجا چۆن دەبێ كاتێک فریشتە گیانیان كێشان، لە رووەكانیان و لەپشتەوەیان دەدەن!

**٣-** خوا لێیان تووڕەیەو خەشمی خوا دێتە سەریان، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٦﴾ ﴾النحل.

**٤-** بابای هەڵگەڕاوە لە ڕۆژی قیامەتدا ڕووی ڕەش دەبێ، وەك لە سوورەتی (**آل عمران**) دا: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ ﴿١٠٦﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی ڕوویان ڕەش بووە پێیان دەگوترێ: ئایا لە دوای ئەوەی بڕواتان هێنابوو كافر بوونەوە؟

**٥-** زیانباریی ئاشكرا، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ ﴾**آل عمران**.

بەڵام ئایا هەڵگەڕانەوە (**إرتداد**) سزایەکەی چییە؟ سزای بابای هەڵگەڕاوە، بە بۆچوونی بەندە، وەك لە نامیلكەییەكی سەربەخۆشدا گوتوومانەو، هەر لەم تەفسیرەشدا لە كاتی تەفسیركردنی سووڕەتی (**محمد**)دا، باسمانكردوەو، لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)یش لە كتێبی دووەم دا باسمانكردوە، هەروەها لە كتێبی دوازدەیەمی: (**موسوعة: الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله**) دا،[1] پێمان وایە سزایەكی دیاریكراوی شەرعیی بۆ بابای هەڵگەڕاوە نیە، بەڵكو لە سنووری دەسەڵاتی شەرعییدایە، كە سزایەكی پڕ بەپێست بۆ بابای هەڵگەڕاوە دابنێ، چونكە هەڵگەڕاوەكان جۆراو جۆرن و، هەر كامێكیان دەبێ سزایەكی گونجاو دیاریكراوی هەبێ، بەڵامم ئەگەر سزای هەڵگەڕانەوە لە ئایین بریتی بێ لە كوشتن لە هەموو حاڵاندا، ئەوە هەرچەندە زۆرێك لە زانایان گوتوویانە، بەڵام پشت ئەستوور نیە، بە هیچ بەڵگەیەك لە قورئان و سوننەت، بەڵكو بەڵگەی قورئان و سوننەت پێچەوانەی ئەوەمان پێدەڵێن، بۆیە ئێمە پێویستە شوێن وەحیی خواو قورئان و سوننەت بكەوین و، هەر شتێك زانایەك یان زیاتر گوتبێتی، هەمووی دەبێ بگێڕدرێتەوە بۆ مەحەكی قورئان و سوننەت و پێوەری قورئان و سووننەت و، ئەگەر دەرنەچوو، ڕەفز بكرێ و لەو سەرچاوانەش دا كە ئاماژەم پێدان، ئەو ڕایەی تەبەنییم كردوە، خستوومەتە ڕوو و بەڵگەم لە سەرهێناوەتەوە و، ڕێزیشم هەیە بۆ جەماوەری زانایان و ڕایەكەیان، بەڵام پێم ڕاستە و بێ گرفت و ئیشكالی نییە، وەک لەشوێنی خۆیدا بەدرێژایی باسمان كردووە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

(١) بەناوونیشانی: (الإسلام: نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم).

# دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـرۆ کـە (١٤٤٢/١/٥)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٨/٢٤) زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی **(النـصر)** دەکەیـن.

لـە سـۆنگەی ئـەوەوەش کـە سـوورەتی **(النـصر)** لـە بـارەی فەتحـی مەککـەوە دەدوێ، هەروەهـا لـە بـارەی پـۆل پـۆل خەڵـك هاتنـە نێـو ئیسـلامەوەو فەرمانکـردنی خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کـە دوای ئـەوەی بینیـی خەڵـك پـۆل پـۆل هاتنـە نێـو ئاییـن و بەرنامـەی خـواوە، بـە ستایشـکردنەوە خـوا ﷻ بـە پاکبگـرێ و داوای لێبـوردنی لـێ بـکات، بۆیـە باشـم زانی لەبـەر ڕۆشـنایی کتێبـە ناودارەکـەی **(إبـن هشـام)**، **(السـيرة النبويـة)**دا، بەرلـەوەی دەسـت بکەیـن بـە تەفسـیری ئـەم سـوورەتە، کورتەیـەك لـە بەسـەرهاتی ئازادکـردنی مەککـە لە بیسـت و شـەش **(٢٦)** بڕگـەدا بکەین، کـە هـەم بەرچـاو ڕوونیـی زیاترمـان پێـدەدات، لـە بـارەی ئازادکـردنی مەککـەوەو، ئـەو سـەرکەوتنە یەکجارەکییـەی خـوا ﷻ ڕەخسـاندوویەتی بـۆ پێغەمبەرەکـەی ﷺو، هـاوەڵانی بەسـەر ئەهـلی کوفـرو شـیرك دا، لـە نیـوە دوورگـەی عەڕەبییـدا، هـەم بەرچـاو ڕوونیـی زیاتریشـمان بـۆ دەڕەخسـێنێ لـە بـارەی چەمـك و واتـای ئایەتـە بـە پێـزەکانی سـوورەتی **(النـصر)**ەوە.

## کورتەیـەک لەبەسـەرهاتی فەتحـی مەککە

**(إبـن هشـام)** لـە کتێبەکـەی خۆیـدا[1] - کـە ئێمـە زۆر بـە کـورت و پوختکردنەوەوە قسـەکانی دێنیـن و ڕاسـتەوخۆش قسـەکانی دەکەینـە کوردیـی - دەڵێ:

---

(١ ) (السيرة النبوية)، دار ابن الهيثم، السنة: ٢٠٠٦، ج٤، ص٢١٨-٢٣٨

**١)**- هۆزی (**بنو بكر بن عبدالمناف بن كنانة**)، دەستدرێژییان کردە سەر هۆزی خوزاعە، لە حاڵێکدا هۆزی خوزاعە لەسەر ئاوێك بوون لە خواروی مەککەوە، پێی دەگوترا: وەتیر، پێشتریش ئیبنو هیشام باس دەکات: ئەو کێشەی: هۆزی بەنوو بەکرو هۆزی خوزاعە، لەوەوە سەری هەڵداوە، کە کاتی خۆی خوزاعە پێش ئیسلام هێرشیان کردۆتە سەر کوڕەکانی (**الأسود بنو رزن الديلي**)، کە بریتی بوون لە: (**سَلْمى، كلثوم، ذُئَيبْ**)و، ئەو سێ کوڕەیان کوشتوون لە عەرەفە، لەو شوێنەی بەردەکانی حەرەمی لێن، لەوەوە دوژمنایەتییەکەیان دروست بووە.

**٢)** - لە حاڵێکدا هەردووك هۆزی: بەنوو بەکرو خوزاعە بەو شێوەیە بوون، ئیسلام هات و کەوتە نێوانیانەوەو، خەڵك هەر کامێکیان بەهۆی ئیسلامەوە سەرقاڵ بوون و ئاگایان لە شتەکانی دیکەیان نەما، کاتێك صوڵحی حودەیبییە هاتە پێش، لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺو هۆزی قوڕەییش دا، بەنوو بەکر بوونە هاوپەیمانی قوڕەیش و، خوزاعەش بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺ، واتە: بەنوو بەکر لە صوڵحی حودەیبییەدا بوونە هاوپەیمانی هۆزی قوڕەیش و سوهەیبی کوڕی عەمرِ نوێنەریان بوو، ئەبوو سوفیانیش وەك سەرۆکی هۆزی قوڕویش دەبینراو، خوزاعەش بوونە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺو، مسوڵمانان، بەنووبەکرو خوزاعەش هەردووکیان دوو هۆزی هاوبەشدانەرو بێبڕوابوون بە گشتیی.

**٣)**- کاتێك ئەو ڕێکەوتنەی حودەیبییە هاتە پێش، تیرەیەك لە بەنوو بەکر بە ناوی بەنوو ددیل دەرفەتیان بینی کە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە لە خوزاعە، لە کاتێکدا خوزاعە لەسەر ئاوێك بوون بە ناوی وەتیر، بەنوو ددیل لە نەخافڵ هێرشیان کردە سەر خوزاعەو ئەوانیش پەنایان بەکەعبە بردو چوونە مەککە، چوونە لای ماڵی (**بديل بن الورقاء**)، بەڵام هەرچەندە چوونە نێو حەرەمی مزگەوتی حەرامیشەوە، ئەوان هەر لێیان کوشتن، کە لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە: دە (**١٠**) کەسیان لێ کوشتوون و، لە هەندێك ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە بیست (**٢٠**) کەسیان لێ کوشتوون.

**٤)**- ئنجا کاتێ بەنوو بەکرو قوڕەیش لە دژی خوزاعە جەنگان و زەبریان لێدان، مانای وایە ئەو پەیمانەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستبوویان لە حودەیبییە، پەیمانەکەیان

هەڵوەشاندەوە، بۆیە (عمرو بن سالم الخزاعي) کە یەکێکە لە بەنی کەعب و ئەوانیش تیرەیەکن لە هۆزی خوزاعە، لە شوێنەکەی خۆیانەوە چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ مەدینەو ئەم شیعرەی خوێندەوە:

| | |
|---|---|
| يَـا ربِّ إنّـي نَاشِـدٌ مُـحمّدا | حِـلفَ أبينَا وأبيـه الأتـلَدا |
| قَـد كُنتُم وَلْداً وكُنّا وَالِـدا | ثمّت أَسلمنَا فَلم نَنـزِع يَـدا |
| فانْصُر هَدَاك الله نصـرًا أعتدا | وادْعُ عِبَـاد الله يَأتُوا مـدَدا |
| فيهم رسُـول الله قَـد تـجرّدا | إن سِيـمَ خَسْفًا وجهه تَربَّدا |
| فـي فَيلقٍ كالبَحرِ يجـري مُزْبِدا | إن قُـريشاً أخلَفُوكَ المَـوعِدُا |
| ونَقَضُوا مِيثَاقَـك المـؤكَّـدا | وجَعلُـوا لي في كدَاء رصَـدا |
| وزعـمُوا أنْ لست تدعُوا أحَدا | وهُـم أذَلُّ وأقَـلُّ عَددا |
| هـم بيَّتونَا بالوَتـير هُجَّـدا | وقَتَلُـونَا رُكّعًا وسُـجّـدا |

مانای شیعرەکەی بە پوختیی ئەوەیە:

من داوا لە موحەممەد ﷺ دەکەم لەسەر هاوپەیمانەکانی وەدەنگ بێو وەك پابەندیی بەو پەیمانەوەی لە نێوانماندایە، چونکە قورەیش و هاوپەیمانەکانی (بەنوو بەکر) پەیمان هەڵوەشاندۆتەوەو ئێمەیان کوشتوە، کاتێ ئێمە لە ڕکووع و سەجدەدا بووین! پێغەمبەریش ﷺ یەك ڕستەی فەرموو: (**نُصِرتَ يا عمرو بن سالم**)، واتە: ئەی عەمری کوڕی سالیم سەرخرای، پشتگیرییت لێ دەکرێ.

دوایی هەورێك لە ئاسمان دەرکەوت، لەو سەرو حەدەدا، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئەم هەورە داوا دەکات پشتیوانیی لە بەنوو کەعب بکرێ، کە تیرەیەك بوون لە هۆزی خوزاعە، لەبەر ئەوەی ستەمیان لێکراوە و هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا ﷺو مسوڵمانان بوون.

٥)- دواتر (**بدیل بن الورقاء**) لەگەڵ کۆمەڵێك لە خوزاعەدا، چوون بۆ لای پێغەمبەری کۆتایی ﷺو، هەواڵییان پێدا، چییان بەسەر هاتوەو، چۆن هۆزی قوڕەیش یارمەتیی بەنوو بەکریان داوە! دوایی گەڕانەوە بۆ مەککەو پێغەمبەریش ﷺ بە خەڵکەکەی فەرموو: هەر بینیتان ئەبوو سوفیان هات بۆ لاتان، بۆ ئەوەی گرێبەستەکە توند بکاتەوەو ماوەکەی درێژ بکاتەوە، بەدیلی کوڕی وەڕقاء و هاوەڵەکانی ڕۆیشتن لە ڕێگە گەیشتنە ئەبوو سوفیانی کوڕی حەڕب لە عوسفان، کە قوڕەیش ناردبوویان بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە پەیمانەکە مەحکەم بکاتەوەو ماوەکەشی درێژ بکاتەوە، ترسا بوون لەوەی کردوویانە، کاتێ ئەبوو سوفیان گەیشتە بەدیلی کوڕی وەڕقاء گوتی: لە کوێوە هاتووی ئەی بەدیل؟ (پێی وابوو لەلای پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە) ئایا لەلای موحەممەدەوە هاتووی؟ گوتی: نەخێر، ئیدی بەدیل ڕۆیی بەرەو مەککە، ئەبوو سوفیانیش گوتی: ئەگەر بەدیل لە مەدینەوە هاتبێ، حوشترەکانی نێوکە خورمایان خواردوە، چووە ئەو شوێنەی حوشترەکانیان لێی یەخ بوو بوون و، بە هۆی قشپلەکانیەوە زانی نێوکە خورمایان خواردوە، بۆیە سوێندی بە خوا خوارد کە بەدیل چووە بۆ لای موحەممەد ﷺ.

٦)- ئەبوو سوفیان چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ مەدینە، سەرەتا چوو بۆ لای کچەکەی خۆی ئوممو حەبیبەی کچی ئەبوو سوفیان، کە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوو، کاتێك چوو دابنیشێ لەسەر ڕایەخەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممو حەبیبە ڕایەخەکەی هەڵوێزنی و پێچایەوە، گوتی: ڕۆڵە گیان! نازانم منت پێ لەو ڕایەخە ناوەشێتەوە، یان ئەو ڕایەخەکت پێ شایستەی من نیە، واتە: منت پێ گەورەترە، یاخود ڕایەخەکە و پێتوایە لێم ناوەشێتەوە لەسەری دابنیشم؟ ئەویش گوتی: نا، ئەوە شوێنی دانیشتنی پێغەمبەری خوایە ﷺو، تۆش پیاوێکی هاوبەش بۆ خوا دانەرو پیسی، بۆیە حەزم نەکرد لەسەر شوێنی پێغەمبەری خوا ﷺ دابنیشی، ئەویش گوتی: بەخوا کچی خۆم لە دوای من خراپەت تووش بووە، دوایی چوو بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺو پێغەمبەری خوای دواند، ئەویش هیچی نەفەرموو، ئنجا چوو بۆ لای ئەبوو بەکرو، دواندی کە پێغەمبەری خوای بۆ بدوێنێ، ئەویش گوتی: من ئامادە نیم لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ پێغەمبەری

خوادا ﷺ بکەم، ئنجا چوو بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب و دواندی، عومەریش گوتی: من تکاتان بۆ بکەم لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ؟ سوێند بە خوا ئەگەر تەنیا مێرووە سوورە بچووکەکانم دەستبکەون، لە دژتان دەجەنگم، دوایی چوو بۆ لای عەلی کوڕی ئەبوو تالیب، (خوا لە هەموویان ڕازی بێ)، فاتیمەی کچی پێغەمبەری لەلابوو (خوا لێیان ڕازی بێ)، حەسەنی کوڕی عەلی لەوێ بوو، کە منداڵێك بوو دەڕۆیشت، گوتی: ئەی عەلی! تۆ لە هەمووان لەگەڵ من خزمتری و پێویستییەکم پێت هەیە، با بە دەست بە تاڵیی نەچمەوە، تکام لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بکە، عەلی گوتی: ئەبوو سوفیان بێ قەزا بی! پێغەمبەری خوا ﷺ نیەتی لەسەر شتێك چەسپاندوە، کەس ناتوانێ قسەی لەگەڵدا بکات، دوایی ئەبوو سوفیان ڕووی لە فاتیمە کرد، گوتی: ئەی کچی موحەممەد! ئایا ئامادە نی، ئەم منداڵەت کارێك بکات و بکەوێتە بەینی خەڵکەوە، تاکو عەرەب مەدحی بکەن تاکو کۆتایی ڕۆژگار؟ فاتیمە گوتی: بەخوا ئەو منداڵەی من نەگەیشتۆتە ئەو تەمەنە خەڵك لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ پەنا بدات!

دوایی ئەبوو سوفیان گوتی: ئەی ئەبوو الحەسەن! کارەکان لەسەرم زۆر قورس بوون، دڵسۆزییم بۆ بنوێنە، چی بکەم؟ ئەویش گوتی: چیت پێ بڵێم؟ تۆ گەورەی بەنی کینانەی، هەڵسە لە نێو خەڵکدا بڵێ: ئەوە من پەنام وەرگرت، ئەبوو سوفیانیش ئەوەی کرد، بەڵام هیچ بە کەڵکی نەهات.

**٧)- خۆ ئامادەکردن بۆ ئازادکردنی مەککە:**

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد پێداویستییەکانی ئەو سەفەرو جەنگەی بۆ ئامادە بکەن، فەرمانی کرد بە ماڵ و خێزانی کەل و پەلی سەفەری بۆ وەپێچن، ئەبوو بەکر چوو بۆ لای کچەکەی عائیشە (خوا لێیان ڕازی بێ)، کە کەل و پەلی پێغەمبەری خوای ساز دەکرد، گوتی: ڕۆڵە! ئەی کچەکەم! ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوون، کەل و پەلی بۆ ساز بکەن؟ گوتی: بەڵێ، تۆش خۆت ئامادە بکە، ئەبوو بەکر گوتی: پێتوایە ئامانجی بەرەو کوێیە؟ گوتی: سوێند

بەخـوا نازانـم، ئنجـا دوای ئـەوەی کاتی دەرچوونیـان نیزیـك کەوتـەوە، پێغەمبـەری خـوا ئـاگاداری کردنـەوە کـە بـەرەو مەککـە دەچێـت و فەرمووشـی: خوایـە! چـاوەکان و هەواڵـەکان لـە قورەیـش بگـرە، ئەوانـەی چاودێریـی بـۆ دەکـەن و جاسووسـیی بـۆ دەکـەن، تاکـو کـت و پـڕ بەسـەریان دا بدەیـن، لـە شـوێنی خۆیانـدا.

٨)- دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاریداو خۆی یەکلایی کردەوە، بەرەو مەککە بچێ، حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی نووسی بۆ قوڕەیشییەکان، هەواڵی پێدابوون لە بارەی ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ عەزمی لەسەر جەزم کردوە، بەرەو ڕوویان بچێ و، نامەکەی دابووە ئافرەتێك، پێغەمبەری خواش ﷺ هەر کام لە عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب و زوبێری کوڕی عەووامی ناردن فەرمووی: بگەنە ئافرەتێك حاتیبی کوڕی ئەبی بەلتەعە نامەیەکی پێدا ناردوە بۆ قوڕەیش! دەیانترسێنێ و ئاگاداریان دەکاتەوە، لەوەی ئێمە بڕیارمان لە بارەیانەوە داوە، ئەوانیش دەچن و سەرەنجام ئافرەتەکە دەبینن، ئەویش نکووڵیی دەکات، ئەوانیش هەڕەشەی لێ دەکەن و دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ ڕاستی فەرمووەو پۆشاکت لەبەردا دادەنێین و دەتپشکنین! ئەویش نامەکە دەردێنێ - وەك کاتی خۆی لە تەفسیری سووڕەتی **(الممتحنة)**دا، بە تەفصیلْ باسمان کردوە - نامەکەش هەر ئەوەی تێدابووە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێ بێ و، هێزێکی لەگەڵ دایە، هیچ کەس خۆی بۆ ناگرێ.

٩)- پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو مەککە دەرچوو، وەك جێگرەوەو سەرپەشتیاریش لە مەدینەدا: **(أبا الرهم: كلثوم بن حسين بن عتبة بن خلف الغفاري)** دانا، لە کاتێك دا دە **(١٠)** ڕۆژ لە مانگی ڕەمەزان تێپەڕی بوون، لە ساڵی هەشتەمی کۆچییدا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو، بە ڕۆژوو بوو، خەڵکیش بەڕۆژوو بوون، تاکو گەیشتنە **(الكَدِيد)**، لە نێوان عوسفان و ئەمەج، لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر چاوی خەڵکەکە فەرمووی: ئەوە من ڕۆژووم دەشکێنێم بۆ ئەوەی تین و تاقەتیان ببێ بۆ ئەو سەفەرو جەنگە، ئێوەش ڕۆژوو بیشکێنن، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆیشت تاکو گەیشتنە **(مَرُّ الظهران)**، لەگەڵ **(١٠)** هەزار کەس لە مسوڵمانان‌دا، ئنجا لەو ڕێیەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای

(**جعفة**) گەیشتە عەبباسی مامی کە کۆچی کردبوو خۆی و خێزانی دەهاتن بۆ مەدینە، پێشتریش کە لە مەککە بوو، بە مۆڵەتدانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە وێ بوو، ئەرکی ئاودان بە حاجییانی جێبەجێ دەکرد.

**١٠)-** مسوڵمانبوونی (**أبو سفيان بن الحارث بن عبدالمطَّلب**) و (**عَبْدالله بن أَبِي أميَّة بن المغيرة**)، ئەوانەش هەردووکیان لە (**نَيقُ العِقَاب**)، کە شوێنێکە لە نێوان مەککەو مەدینەدا، دەگەنە پێغەمبەری خوا ﷺو سوپایەکەی، ئوممو سەلەمە دایکی بڕواداران لە بارەیانەوە قسە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ دەکات، دەڵێ: یەکیان ئامۆزاتە و یەکیان پورزاتەو زاواتە، ئەویش دەفەرموێ: ئیشم پێیان نیە، دوایی کە هەواڵەکەیان پێ دەگاتەوە، ئەبوو سوفیان، واتە: ئەبوو سوفیانی ئامۆزای دەڵێ: یان دەبێ مۆڵەتمان بدات، یان سوێند بە خوا دەستی ئەو منداڵانە دەگرم و دەڕۆین بە زەویدا، تاکو لە تینوێتییان دەخنکێین، یاخود لە برسان دەمرین، کاتێ ئەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگات، ئەوجار مۆڵەتیان دەداو دەچنە خزمەتی و مسوڵمان دەبن.

**١١)-** کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە (**مَرُّ الظهران**)، سوپایەکەی جێگیر دەکات، (مامی عەبباسی کوڕی عبدولموتتەڵیب) دەڵێ: گوتم: ئەی هاوار بۆ قوڕەیش، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە جەنگ بچێتە نێو مەککە، بەر لەوەی بێن بۆ لای و داوای ئەمانی لێبکەن، هۆزی قوڕەیش دەفەوتێن، لێرەدا زۆر بە تەفصیل باسی ئەوە دەکرێ کە عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەڵیب مامی پێغەمبەر ﷺ دەڵێ: سواری هێسترە سپییەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم و ڕۆیشتم بەرەو مەککە کە بە خەڵکی مەککە بڵێم: پەنا وەربگرن بەڵکو شوانێك، گاوانێك، خاوەن ئیشێك ببینم لە خەڵکی مەککەو بینێرم، هەواڵ بە خەڵکی مەککە بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ دێ و ئەوانیش بێن ئەمانی لێ وەربگرن، تاکو بەجەنگ نەچێتە نێو مەککەوە، دەڵێ: من دەڕۆیشتم گوێم لە قسەی ئەبوو سوفیان و بەدیلی کوڕی وەڕقاء بوو قسەیان دەکرد، ئەبوو سوفیان دەیگوت: هەرگیز کۆمەڵە ئاگری بەقەدەر ئەمشەوم نەبینیون و، هەرگیز سوپای هێندە زەبەلاحم نەبینیوە، بەدیلی کوڕی وەڕقائیش دەیگوت: ئەوە خوزاعەیە نیازی جەنگ گەرمی داهێناوە! ئەبوو سوفیانیش

دەیگوت: خوزاعە لەوە کەمترو زەبوونترن ئەمانە ئاگرەکانیان و سوپایەکەیان بێ، عەبباس دەڵێ: دەنگی ئەبوو سوفیانم ناسیی و، کورتەکەی ئەبوو سوفیان لەگەڵ خۆی دا سواری هێسترەکەی پێغەمبەری خوا دەکات و، دەیبات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، بە لای عومەردا تێدەپەڕن، کە عومەر دەزانێ ئەبوو سوفیان لە پشتیەتی دەڵێ: ئەوە دوژمنی خوا ئەبوو سوفیانە، بێ ئەوەی مسوڵمان بێ و بەڵێن و پەیمانێکی وەرگرتبێ، بە پەلە دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ، عەبباسیش دەڵێ: منیش بە سواری هێسترەکە بەپەلە ڕۆیشتم و من پێش عومەر گەیشتمە ئەوێ، کە گەیشتمە ئەوێ عومەریش گەیشت، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ ئەبوو سوفیان نە مسوڵمانەو، نە پەیمانیشی وەرگرتوە، لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم، عەبباس دەڵێ: منیش گوتم ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ من هێناومەو پەنام داوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بیبەوە بەیانی بیهێنەوە، بەیانی کە دەیهێنێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی دەفەرموێ: ئەبوو سوفیان بێ قەزا بی! کاتی ئەوەت نەهاتوە بزانی جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە؟ ئەویش دەڵێ: دایك و بابم بە قوربانت بن چەندە هێدیی و بەڕێزیی و پەیوەندیی خزمایەتیی گەیەنی، دەزانم ئەگەر لەگەڵ خوادا هاوبەشێکی دیکە ببووایە، سوودێکی پێ دەگەیاندم، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بێ قەزا بی ئەبوو سوفیان! ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بزانی کە من ڕەوانەکراوی خوام؟ ئەویش دەڵێ دایك و بابم بە قوربانت بن، چەندە هێدیی و بەڕێزی و چەندە خزم دۆستیی، ئەمەیان لە نەفسمدا شتێك ماوە، عەبباس دەڵێ: پێمگوت بێ قەزا بی، مسوڵمان بەو شایەتمان بێنە کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیەو، موحەممەد پێغەمبەری خوایە، بەر لەوەی لە گەردنت بدرێ، ئنجا شایەتمانی هێنا.

**١٢)**- عەبباس دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەبوو سوفیان پیاوێکە شانازیی و خۆ دەرخستنی پێخۆشە، شتێکی بدەیە، ئەویش فەرمووی: **(نعم، مَنْ دخل دار أبي سفيان فهو آمن، ومن أغلق بابه فهو آمن، ومن دخل المسجد فهو آمن)**، واتە: بەڵێ (شتێکی دەدەینێ) هەر کەسێ بچێتە ماڵی ئەبوو سوفیانەوە لە خۆی دڵنیایەو، هەر کەسێ دەرگاکە ( ی ماڵەکەی) لەسەر خۆی دابخات، لە خۆی دڵنیایەو، هەر کەسێ بچێتە مزگەوتەوە لە خۆیی دڵنیایە، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی عەبباس! ئەبوو سوفیان

ڕابگرە لە لای تەنگەبەری شیوەکە، لەلای (**خطم الجبل**) تاکو سەربازەکانی خوا تێپەڕن و ئەویش بیانبینێ (تاکو لە دەروونەوە تێك بشکێ کە ئیسلام ئەو هێزە زۆرەی هەیە) ئنجا هێزەکان دەڕۆن بە بەر چاوی ئەبوو سوفیاندا، هۆز هۆز دەڕۆن، ئەویش دەپرسێ: ئەو هۆزە کێیە؟ عەبباس دەڵێ: ئەو هۆزە فلانە، ئەدی ئەوە کێیە؟ ئەویش دەڵێ: ئەوەش فلانە، تاکو دەگاتە ئەو هێزەی پشتیوانان و کۆچکبەرانی تێدان، (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە چەك و ئاسن دا، دەترووسکان، ئەبوو سوفیان گوتی: پاکیی بۆ خوا، عەبباس! ئەوانە کێن؟ گوتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ لەگەڵ کۆچکەران و پشتیواناندا، گوتی: کەس بەوانە ناوێرێ، ئەی ئەبوو لفەزڵ! (ئەوە کونیەی عەبباسە) بێگومان حوکمڕانیی برازایەکەت ئەمڕۆ زۆر مەزن بووە، ئەویش گوتی: ئەبوو سوفیان! ئەوە پێغەمبەرایەتییە، گوتی: کەواتە باشتریش.

**١٣)**- عەبباس دەڵێ: گوتم ئەبوو سوفیان! ئێستا بڕۆ لای گەلەکەت ئاگاداریان بکەوە، کە ئەوە هێزی پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام هات و با خۆیان بپارێزن، دەڵێ: ئەویش بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد: هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبوو سوفیانەوە لە خۆی دڵنیایە، ژنەکەی بۆی هەڵسا، هیندی کچی عوتبە، سمێڵی گرت و گوتی: بیکوژن ئەو کووپە قەڵەوە، بە ڕاستیی تۆ پێشڕەوێکی زۆر خراپی خەڵکەکەتی، ئەبوو سوفیان گوتی: بە قسەی ئەو ئافرەتە هەڵمەخەڵەتێن، ئەو هێزەی دێ هیچکەس ناتوانێ لە بەرانبەریدا بوەستێ، ئنجا گوتی: هەر کەسێ بچێتە ماڵی ئەبوو سوفیانەوە لە خۆی دڵنیایە، گوتیان: خوا بتکوژێ کوا ماڵی تۆ، جێی ئێمەی تێدا دەبێتەوە، دوایی گوتی: هەر کەسێ دەرگای ماڵەکەی لەسەر خۆی دابخات لە خۆی دڵنیایەو، هەر کەسێ بچێتە مزگەوتیش هەر لە خۆی دڵنیایە، ئنجا خەڵك بە زۆریی چوونە ماڵەکانی خۆیان و چوونە مزگەوت، (ئەوەی پێغەمبەری خواش ﷺ بە ئەبوو سوفیانی داوە، ئیمتیازێکی ڕووکەشیی بووە، ئەگەرنا کەسێك بچێتە ماڵی خۆی، یان ماڵی ئەبوو سوفیان هەر وەك یەك بووە).

**١٤)**- ئیبنو ئیسحاق دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبوو بەکری صیددیق بۆی باس کردووم: کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتۆتە (**ذي طوى**)، لەسەر پشتی حوشترەکەی بووەو سەری

خۆی پێچاوە بە قوماشێکی سوورو، سەری خۆی نزم کردوە، هەتا سووچی مێزەرەکەی بە قەڕپووزی کورتانی حوشترەکەی کەوتوە (واتە: سەری زۆر نزم کردوە).

**١٥)**- مسوڵمانبوونی ئەبی قوحافە، بابی ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ): ئەبوو بەکری صیددیق بابی دێنێ بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پیاوێکی بە تەمەن سەرو ڕیش سپیی بوو، ئەویش دەفەرموێ: سەرو ڕیشی ڕەنگێکی لێ بدەن، کەواتە: دروستە بە ڕەنگێك مووی سپیی بگۆڕرێ.

**١٦)**- بۆ چوونە نێو مەککە، پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەکەی لە **(ذي طوى)**، بەش بەش کردوەو، فەرمانی کردوە بە زوبەیری کوڕی عەووام کە لە (کدی)وە بچێتە ژوور، کە شوێنێکە لە لای چەپی سوپایەکەوە بووە، هەروەها فەرمانی کردوە بە سەعدی کوڕی عوبادە ئەویش لەلایەکی دیکەی (کدی)ەوە بچێ، لە کاتی چوونە ژوورەوەدا سەعدی کوڕی عوبادە گوتوویەتی: **(اليوم يوم الملحمة، اليوم تُسْتَحَلُّ الحُرْمَة)**، واتە: ئەمڕۆ ڕۆژی جەنگە، ئەوەی پێشتر حەڕام بووە، ئەمڕۆ حەڵاڵ دەبێ، کاتێ عومەری کوڕی خەتتاب ئەوەی لێ دەبیستێ، دەچێتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ: گوێت لێیە سەعدی کوڕی عوبادە چی دەڵێ! دڵنیا نین لەوەی زەبرێك لە قوڕەیش نەدات، یانی: ئەو خەڵکەی جەنگ ناکات، پێغەمبەریش ﷺ بە عەلی کوڕی ئەبووتالیبی فەرموو: بچۆ ئاڵایەکەی لێ وەربگرەو، بە ئاڵایەکەوە بچۆ نێو شاری مەککەوە.

**١٧)**- سەفوانی کوڕی ئومەییەو، عیکریمەی کوڕی ئەبوو جەهل و، سوهەیلی کوڕی عەمر، لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەڵکدا لە خیندیمە کۆبووبوونەوە لە دژی سوپای ئیسلام بجەنگن، حەماسی کوڕی قەیسی کوڕی خالیدیش، یەکێکە لە بەنوو بەکر، ئەویش چەکی پێبووە، خێزانەکەی پێی گوتووە: چی دەکەی؟ ئەویش گوتوویەتی: خۆم ئامادە دەکەم بۆ موحەممەدو هاوەڵەکانی، ئەویش گوتوویەتی: پێم وانیە ئەمڕۆ هیچکەس خۆی لە بەردەم موحەممەد و هاوەڵەکانی دا بگرێ، گوتوویەتی: پێم وایە هەندێك لەوان دەکەمە خزمەتکاری تۆ، (واتە: لێیان بە دیل دەگرم و دەیانهێنمەوە ماڵێ، وەك

کۆیلە خزمەتت بکەن)، بەڵام دوایی ئەوانەی ئەو سێ کەسە سەرکردایەتییان کردووون، دوازدە (١٢) کەس یان سێزدە (١٣) کەسیان لێ دەکوژرێن و دەشکێن، حەماسی کوڕی قەیسی کوڕی خالیدیش دێتەوە بە شکاویی بە ژنەکەی دەڵێ: دەرگایەکەم لەسەر دابخە، ژنەکەشی پێی دەڵێ: کوا ئەوەی دەتگوت چی لێهات؟ ئەویش ئەم شیعرە دەڵێ:

**إنك لو شهدت يوم الخندمة إذْ فرّ صفوان وفرّ عِكْرِمة**

**وأبو يزيد قائم كالموتمة واستقبلتهم بالسيوف المسلمة**

**يقطعن كل ساعد وجمجمة ضرباً فلا يسمع إلاّ غمغمة**

**لهم نهيت[1] خلفنا وهمهمة لم تنطقي في اللوم أدنى كلمة**

پوختەی مانایەکەی ئەوەیە کە باسی ئەو جەنگە دەکات، کە چەندە مەترسییدار بووەو دەڵێ:

ئەگەر ئەوەت دیبایە کە من دیتم، لۆمەت نەدەکردم، کە ئێستا دەڵێم: دەرگام لەسەر دابخە!

١٨)- دروشمی مسوڵمانان لە ڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، بریتی بووە لە دروشمی کۆچکەران، کۆچکەران گوتوویانە: **(يا بني عبدالرحمن)** و، خەزرەج گوتوویانە: **(يا بني عبدالله)**، هۆزی ئەوسیش گوتوویانە: **(يا ابن عُبَيدالله)**، بەو دروشمانە یەکدییان ناسیوەتەوە.

١٩)- ئەوانەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە کوشتنیان ژمارەیەك بوون، فەرمووی: **(وإن وجدوا تحت أستار الكعبة)**، ئەگەر لە ژێر پەردەی کەعبەش دا بینیتانن، بیانکوژن.

١- یەکێك لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەرح، بوو لەبەر ئەوەی مسوڵمان بووەو، دوای ئەوەی نووسەری وەحیی بووە، هەڵگەڕاوەتەوە، کە دواتر دەهێنرێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەویش لێی بێدەنگ دەبێ، کە یەکێکیان لە گەردنی بدات، بەڵام

---

(١) النَّهيت: الصياح، والصوت من الصدر من المشقة، المعجم الوسيط ص٩٥٧.

**عوسمان** پەنای دەدا، دوایی یەکێك لە هاوەڵان دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! دەبووایە ئەماژەیەکت بۆ کردباین، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێ: (**إن النَّبي لاَ يقتل بالإشارة**)، پێغەمبەر بە ئاماژە ناکوژێ، (ئەوە خیانەتە).

٢- لەوانە عەبدوڵڵای کوڕی خەتەڵ، ئەویش دیارە کەتنێکی کردوە.

٣و٤- فەرتەنا لەگەڵ ئافرەتێکی دیکەی هاوەڵی دا، کە دوو ئافرەتی گۆرانی بێژبوون هێرشیان کردۆتە سەر پێغەمبەری خوا ﷺو، مسوڵمانان، فەرمانی کردوە بکوژرێن و، یەکێکیان کوژراوەو، ئەوی دیکەیان دواتر پەنا دراوە.

٥- حوەیریسی کوڕی نەقیز.

٦- مەقیس کوڕی صەبابە.

٧- سارە، ئافرەتێك بووە لە بەنی عبدولموتتەلیب.

٨- عیکریمەی کوڕی ئەبووجەهل، ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی خەتەڵ کوژراوەو، مەقیسی کوڕی صەبابەش کوژراوە، دوو کەنیزەکەکان فەرتەناو ئەوەی دیکە، یەکێکیان کوژراوەو ئەوەی دیکەیان ڕایکردوە تاکو دوایی پەنادراوەو، سارەش پەنادراوە، حوەیریسی کوڕی نەقیزیش عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب کوشتوویەتی.

٢٠)- دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە نێو حەرەمی مەککەوە، کاتێ خەڵك ئارام دەبن و دەچێتە لای بەیت و، حەوت جاران بە دەوری کەعبەدا تەواف دەکات، بەردە ڕەشەکەش بە گۆچانێك کە بەدەستیەوە بووە (إِستلام)ی، دەکات یانی: گوچانەکەی دەگەیەنێتێ، دوایی تەوافەکە تەواو دەکات و، عوسمانی کوڕی تەڵحە بانگ دەکات، کلیلی کەعبەی لێ وەردەگرێ، دەرگایەکەی بۆ دەکرێتەوەو دەچێتە ژوورو، لەوێدا هێلانە کۆترێکی تێدادەبێ دەیشکێنێ و فڕێی دەدات، دوایی لەسەر دەرگای کەعبە دەوەستێ، لە کاتێك دا خەڵك هەموویان لە مزگەوتەکەدا کۆبوونەوە، ئەویش ﷺ دەفەرموێ: (**لا إله إلا الله وحده لا شريك له، صدق وعْدَه، ونَصر عَبْدَه، وهَزَم الأحزاب وحده**)، ئنجا وتاریان بۆ دەداو پێیان

دەفەرمویّ: ئەی هۆزی قورەیش! پێتان وایە چیتان لیّ دەکەم؟ دەڵێن: بەس چاکەت لیّ چاوەڕیّ دەکەین، برایەکی بەڕێزو برازایەکی بەڕێزی، ئەویش دەفەرمویّ: **(إذهبوا فأنتم الطُّلَقاء)**، بڕۆن ئێوە سەربەستن و، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت دادەنیشیّ و عەلی کوڕی ئەبوو تاڵیب بۆ لای هەڵدەستیّ، کە کلیلی کەعبەی هەر بە دەستەوە بووە دەڵیّ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! وێڕای ئاوپێدان، با کلیل بەدەستیی کەعبە **(حجابة)**شمان هەبیّ! ئەویش دەفەرمویّ: عوسمانی تەڵحە لە کوێیە؟ بۆی بانگ دەکریّ و دەفەرمویّ: ها ئەوە کلیلەکەتە، ئەمڕۆ ڕۆژی چاکەو وەفادارییە، کاتیّ پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە نێو کەعبەوە، وێنەی فریشتان دەبینیّ و، ئیبراهیم دەبینیّ وێنەی بە دەستەوەن و زەلەمەکانی بە دەستەوەن، ئەویش دەفەرمویّ: خوا بیانکوژیّ گەورەی ئێمەیان واداناوە بە زەلەمەکان شتی دابەش کردوە، ئیبراهیم لە کویّ و زەلەمەکان لە کویّ! دوایی ئەوەی خوێندۆتەوە: ﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ ﴾ **آل عمران**، ئنجا فەرمان دەكات ئەو وێنانە هەموویان بسڕێنەوە کە لە دیوارەکانن و، کات دەچێتە نێو کەعبەوە، بیلالیشی لەگەڵدا دەبێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ، بیلال کە لە خزمەتیدا دەبیّ، فەرمانی پیّ دەكات بانگبدات، ئەبوو سوفیانی کوڕی حەڕب و عەتتابی کوڕی ئوسەیدو، حارسیی کوڕی هیشامیش، لەویّ دانیشتوون و عەتتابی کوڕی ئوسەید دەڵیّ: خوا ئوسەیدی ڕێزلێگرت، ئەمڕۆ ئەوەی نەبینی و نەبیست، حاریسی کوڕی هیشامیش دەڵیّ: ئەگەر زانیبام لەسەر هەقە، شوێنی دەکەوتم، ئەبوو سوفیانیش دەڵیّ: من هیچ ناڵێم هەرشتێك بڵێم ئەم بەردانە قسەی بۆ دەکەن، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایان دا ڕەت دەبیّ و دەفەرمویّ: تۆ وات گوت، تۆش وات گوت و، تۆش وات گوت، بیّ ئەوەی هیچکەس قسەی بۆ کردبیّ، ئنجا حاریس و عەتتاب هەردووکیان دەڵێن: شایەدیی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای ﷺ، چونکە هیچکەس ئاگای لەو قسانەی ئێمە نەبوو، ئێمە تەنیا ئەو سێیەمان بووین ئەو قسانەمان دەکردن.

**٢١)**- ترسانی پشتیوانەکان کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە مەککە بمێنێتەوە.

پشتیوانەکان کۆدەبنەوە لە نێوان خۆیان دا قسە دەکەن، لە کاتێك دا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعا دەکات، پێیان دەفەرمویّ: چیتان گوت؟ ئەوانیش دەڵێن: هیچمان نەگوت،

دەفەرموێ: هەر دەبێ پێم بڵێن، چیتان گوت، ئەوانیش دەڵێن: لەڕاستییدا گوتمان: ڕەنگە پێغەمبەری خوا ﷺ یەکجاریی لێرە بمێنێتەوە! ئەویش ﷺ دەفەرموێ: پەنا بە خوا، ژیانم لەگەڵ ئێوەیەو، مردنیشم هەر لەگەڵ ئێوە دەبێت.

**٢٢)-** پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچێتە نێو مزگەوتەکەو بەدەوری کەعبەدا دەسووڕێتەوە، بە سواریی حوشترەکەی، دەبینێ لە دەوری کابە بتەکان دانراون بە قوروقوشم و مس لەوێ بەستراون، ئەویش ﷺ دارێکی پێ دەبێ و ئاماژە بۆ بتەکان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾ ﴾ **الإسراء**، واتە: هەق هات و باتیڵ پووچایەوە بێگومان باتیڵ پووچاوەیە، هەر بتێك ئاماژەی بۆ پشتی دەکرد لەسەر ڕووی دەکەوت و، ئەگەر ئاماژەی بۆ ڕووی کردبایە لەسەر پشتی دەکەوت.

**٢٣)-** لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا ﷺ تەواف دەکات، یەکێك لە کافرەکان لێی نیزیك دەبێتەوە بە ناوی (**فُضالَة**) ئەویش ﷺ دەفەرموێ: فوزاڵەی؟ دەڵێ: بەڵێ، دەفەرموێ: لە دڵی خۆتدا چیت دەگوت؟ دیارە بۆیە دەچێ پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژێت، ئەویش دەڵێ: هیچ بەس یادی خوام دەکرد، پێغەمبەریش ﷺ پێدەکەنێ و دەفەرموێ: داوای لیبوردن لە خوا بکە، دوایی دەست بەسەر سینگی دا دێنێ و دڵی ئارام دەبێتەوە، فوزاڵە دەڵێ: دەستی بەرز نەکردبۆوە لەسەر سینەم، هەتا هیچکەسم لەو لەلا خۆشەویستتر نەبوو.

**٢٤)-** عوروەی کوڕی زوبەیر دەڵێ: سەفوانی کوڕی ئومەییە ڕۆیشت کە بچێ بۆ جیددەو لەوێش سواربێ بۆ یەمەن، عومەیری کوڕی وەهەب بە پێغەمبەری خوا دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! صەفوان گەورەی هۆزەکەی خۆیەتی، ئێستا لە تۆ ڕایکردوە، تاکو خۆی فڕێبداتە نێو دەریاوە، بۆیە دڵنیای بکەوە، ئەویش دەفەرموێ: ئەو دڵنیایە، دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! نیشانەیەکم بدەیە بەهۆیەوە بزانێ، ئەویش مێزەرەکەی کە پێی چۆتە نێو مەککەوە، دەیداتێ، عومەیر دەڕوات هەتا دەگاتە صەفوان، کە دەیەوێت سوار بێت بەرەو دەریا، دەڵێ: صەفوان دایك و بابم بە قوربانت بن، بۆ خاتری خوا، بۆ خاتری خوا، خۆت مەفەوتێنە، ئەمە دڵنیاکردنەوە (أمان)یە لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆ تۆم هێناوە، ئەویش دەڵێ: بێ قەزابی لاچۆ قسەم لەگەڵ مەکە، ئەویش هەر داوای

لێ دەكات، صەفوانیش دەڵی: ئایا لێم دەبووریێ؟ دەڵێ: بەڵێ، دوایی صەفوان لەگەڵی دەگەڕێتەوەو دەڵێ: ئەم كابرایە پێی وایە تۆ منت دڵنیاكردوە؟ دەفەرمویێ: ڕاست دەكات، دەڵێ: كەواتە دوو مانگ مۆڵەتم پێ بدە، ئەویش دەفەرمویێ: ئەوە چوار مانگ مۆڵەت بچۆ بۆ خۆت بیری لێ بكەوە، (داخۆ بڕوا دێنی، یان بڕوا ناهێنی؟)

**٢٥)-** ژمارەیەك لە سەرانی خەڵكی مەككە، لە نێوایان دا صەفوانی كوڕی ئومەییە و ،عیكریمەی كوڕی ئەبوو جەهل، هاوسەرەكانیان مسوڵمان دەبن، عیكریمە دەیەوێ بڕوات، خێزانەكەی دەچێ بۆ سەر كەشتیی و دەیهێنێتەوەو دەڵێ: وەرە موحەممەد ﷺ پیاوێكی ئاوایەو ئاوایەو مەدحی دەكات، ئەویش دەڵێ: لە خۆم دەترسێم (كوڕی ئەبووجەهلە) ئەویش دەڵێ: نەخێر تۆ وەرە ڕێزیشت لێ دەگرێ، كە دێتەوە، عیكریمە مسوڵمان دەبێ و پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی دەگرێ، هەروەها ئافرەتەكانیش كە پێش مێردەكانیان مسوڵمان بوون، هەر لەسەر نیكاحی خۆیان دەیانهێڵتەوە، هەروەها صەفوانی كوڕی ئومەییەش كە خێزانەكەی ناوی فاختیە بووە، ئەویش دیسان مێردەكەی قەناعەت پێ دێنێ و مسوڵمان دەبێ و، دواتریش پێغەمبەری خوا ﷺ هەردووكیان لەسەر نیكاحی خۆیان دەهێڵتەوە.

**٢٦)-** تێكڕای ئەوانەی لە فەتحی مەككەدا بەشدار بوون، دە هەزار (١٠٠٠٠) كەس بوون و، لە هەندێك ڕیوایەتان دا دەڵێ: دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) كەس بوون، بەڵام دە هەزارەكە ڕاسترە، هەڵبەتە دواتر دوو هەزار مسوڵمانی تازەشیان دەكەونە گەڵ و، هەموویان دەبن بە دوازدە هەزار كەس و، بە دوازدە هەزارەكەش جەنگی حونەین دەكەن، بۆیە یەكێكیان دەڵێ: (**لن نُغْلَب اليوم من قِلّةٍ**)، ئەمڕۆ ئێمە لەبەر كەمیی ناشكێین، بەڵام لە سەرەتای جەنگەكەوە، جەنگەكە دەدۆڕێنن و لە كۆتایی دا جەنگەكە دەبەنەوە، كە پێشتر لە كاتی تەفسیركردنی لە سوورەتی (**التوبة**)دا، باسی جەنگی حونەینمان كردوە.

ئەمە كورتەیەك بوو لە چۆنیەتیی ئازادكردنی مەككەو، بەسەرهاتی ئازادكردنی مەككە، لە بیست و شەش (٢٦) بڕگەدا خستمانە ڕوو، لەبەر ڕۆشنایی: (**السيرة النبوية لابن هشام**)دا.

# پێناسەی سووڕەتی (النصر) و بابەتەکانی

## یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە زیاتـر بـە نـاوی: (**سـورة النـصر**)، سـووڕەتی سـەرکەوتن یـان: سـووڕەتی هاتنـی یارمەتیـی خـوا، نـاسراوە، بـەڵام (**سـورة الفتح**)یشـی، پـێ گوتـراوە، لـە ئایـەتی: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾ەوە، هەروەهـا (**سـورة التوديـع**) یـشی پـێ گوتـراوە، واتـە: سـووڕەتی خواحافیزیـی و ماڵئاوایـی کـردن، لەبـەر ئـەوەی بە ڕای زۆرێـك لـە زانایـان ئـەم سـووڕەتە کۆتـا سـووڕەت بـووە، هەمـووی پێکـەوە بـۆ سـەر دڵـی مووبـارەکی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دابەزیـێ و، لـەم سـووڕەتەدا ئامـاژەش کـراوە بـە کۆچـی دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، لەبـەر ئـەوەی ئـەو ئەرکـە گـەورەو گرنگـەی بـۆی ڕەوانکرابـوو، هاتۆتـە کۆتایـی.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

شـوێنی هاتنەخـواری ئـەم سـووڕەتە، بـە یەکدەنگیـی زانایـان مەدینەیـەو، ئـەم سـووڕەتە مەدینەییـە، ئنجـا هەرچەنـدە لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە وشـەی (**الفتح**)، مەبەسـت پێـی ئازادکـرانی مەککەیـە لـە سـاڵی هەشـتەمی کۆچییـدا، بـەڵام لـە بـارەی کاتی هاتنـە خـواری ئـەم سـووڕەتەوە، ڕاجیاییـان هەیـە:

**١-** هەندێك گوتوویانە: دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی خەیبەر لە ساڵی حەوتەمی کۆچییدا، ئەم سووڕەتە دابەزیوە.

**٢-** هەندێکیش گوتوویانە: لە کاتی گەڕانەوەی لە جەنگی حونەین لە ساڵی هەشتەمدا، دابەزیوە.

**٣-** هەندێکیش گوتوویانە: لە نێوەڕاستیی ڕۆژەکانی تەشریق (**أيام التشريق**)دا، کە چوار ڕۆژەکانن، ڕۆژی دەیەم و یازدەیەم و دوازدەیەم و سێزدەیەمی مانگی (**ذي الحجة**)، لە ساڵی حەجیماڵئاواییدا، دابەزیوە.

**٤-** هەندێکیش گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوای دابەزینی ئەم سوورەتە، تەنیا سێ مانگ لە ژیاندا ماوەتەوەو، کۆچی دوایی کردوە.

**٥-** واش پێدەچێ ئەم سوورەتە لە کۆتایی تەمەنی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ، دابەزیبێ، وەك دواییش زیاتر قسە لەو بارەوە دەکەین.

لەو بارەوەش کە ئەم سوورەتە لە مەدینە دابەزیوە، ئەو دوو دەقە دێنین:

**١)-** (**عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أُنْزِلَتْ بالمدَينَة:** ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾) (**الدر المنثور للسيوطي: ج٨، ص٦٥٩، ونسبه لابن مردويه**).

**٢)-** (**عَنْ عَبْدِالله بْن الزُّبير رضي الله عنهما، قَالَ: أُنْزِلَتْ:** ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾، **بالْمَدِيْنَة**)، (**الدر المنثور للسيوطي: ج٨، ص٦٥٩، ونسبه لابن مردويه**).

واتە: هەر کام لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر (خوا لە خۆیان و بابیان ڕازی بێ) گوتوویانە: ئەم سوورەتە موبارەکە: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾، لە مەدینە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزیندا:

لە موصحەف دا ژمارەکەی سەدودە (١١٠)یەو، لە دابەزینیشدا دوو ڕا هەن:

**أ-** هەندێکیان گوتوویانە ژمارە: سەدو سێ (١٠٣)یە.

**ب-** هەندێکیش گوتوویانە: ژمارە: سەدو چواردە (١١٤)یە، واتە: کۆتا سوورەتەو، لەوبارەوەش ئەم دەقە دێنین:

(عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: تَعْلَمُ آخِرَ سُورَةٍ نَزَلَتْ مِنَ الْقُرْآنِ نَزَلَتْ جَمِيعًا؟ قُلْتُ: نَعَمْ، ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾ قَالَ: صَدَقْتَ) (أخرجه مسلم: ٣٠٢٤).

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما لە یەکێک دەپرسێ: دەزانی چ سوورەتێك لە قورئان هەمووی پێکەوە کۆتا سوورەتە دابەزیبێ؟ دەڵێ: گوتم: بەڵێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾، گوتی: ڕاست دەکەی.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی زانایانی ژمێرەرەری ئایەتەکانی قورئان، ئەم سوورەتە ژمارەی ئایەتەکانی سێ (٣)یەو، لە ڕووی کەمیی پیتەکانیەوە، لە سوورەتی **(الكوثر)** درێژترەو، لە سوورەتی **(العصر)**یش کورتترە، ئەگەرنا ئەو سێ سوورەتە، هەرسێکیان یەکی سێ ئایەتن: سوورەتی **(العصر)**و، سوورەتی **(الكوثر)**و، ئەم سوورەتە سوورەتی **(النصر)**.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

## پوختەی نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە بەپێزە

گفت و بەڵێندانی خوای پەروەردگارە بەسەرخستنی پێغەمبەرەکەی ﷺو، هاوەڵانی و، ئاماژەشە بە تەواوبوونی کاری پێغەمبەری خوا ﷺ و مژدەدانی خوایە بە لێبوردنی لێی بە تەواویی.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

لەم سوورەتەدا چوار تایبەتمەندییمان کەوتوونە بەرچاو:

١- تەعبیری: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١﴾، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

**٢-** تەعبیری: ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

**٣-** تەعبیری: ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ﴿٣﴾ ﴾، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

**٤-** ڕاگەیاندنی کاتی مردنی پێغەمبەر ﷺ وەك ئەم دەقەی سوننەتیش زۆر بە ڕوونیی دەیگەیەنێ:

(**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنه، **قَالَ: يَا أَمِيرَ المؤمِنِينَ! هُوَ أَجَلُ رَسُول الله أَعْلَمَهُ اللهُ لَهُ:** ﴿ إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ ﴾، **فتح مكة، فَذَلِكَ عَلاَمَة أَجَلِه،** ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ ﴾، **قال عمر** رضي الله عنه: **والله لا أعلم منها إلا ما تعلم**) (**أخرجه البخاري: ٤٢٩٤**). عومەر رضي الله عنه لە سەردەمی حوکمڕانیی خۆیدا وەك جێنشینی دووەمی پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو، لەگەڵ بەتەمەنەکانی هاوەڵاندا، عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیشی رضي الله عنهما بەشدار دەکرد، ئەویش گەنج بوو، بۆیە هەندێك لە هاوەڵان گلەییان لە عومەر کردو گوتیان: ئێمەش کوڕی وەك عەبدوڵلامان هەن، کەچی کوڕەکانی ئێمە ناهێنی و ئەو دێنی! ئەویش گوتی: ئاخر عەبدوڵڵا جیایە، دوایی ڕۆژێك کە هەموویان دادەنیشن، عومەر پرسیاریان لێ دەکات، لە بارەی سوورەتی (**النصر**)ەوە، ئایا مەبەست پێی چییە؟ ئەوانیش دەڵێن: مەبەست هەر ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: هەر کاتێك یارمەتیی خوا هات و مەککە ئازادکرا، دەروازەکانی لەبەردەمتدا کرانەوەو، خەڵکت بینی پۆل پۆل دێنە نێو ئایینی خوای پەروەردگارەوە، بە ستایشکردنەوە خوا بە پاك بگرەو، داوای لێبوردنی لێ بکە، ئەو زۆر تۆبە وەرگرە.

ئنجا لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەپرسێ؟ ئەویش دەڵێ: فەرماندەی بڕواداران! ئەم سوورەتە، وێڕای مانا ڕواڵەتییەکەی ئاماژەشی تێدایە، بە کاتی مردنی پێغەمبەری خوا ﷺو، خوا سبحانه وتعالى ئەوی لێ ئاگادارکردۆتەوەو دەفەرموێ:

هەر كاتێك یارمەتیی خوا هات و مەككە ئازادكرا (**فتح**)، واتە: ئازادكرانی مەككە نیشانەی مردنی تۆیە، ئنجا ئەگەر خەڵكت بینی پۆل پۆل هاتنە نێو ئایینی خواوە، داوای لێبوردن لە خوا بكە، عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: ئەوەی تۆ لێی دەزانی، منیش هەر ئەوەندەی لێ دەزانم.

## حەوتەم: دابەشكردنی ئایەتەكان:

كۆی ئەو سێ ئایەتە موبارەكەی ئەم سوورەتە، دەكەین بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە هەرسـێك ئایەتـەكانی: (١ - ٣)، ئـەم سـووڕەتە دەگرێتـەوە، ئنجـا ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە، بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ -ئەگـەر پێـش ئازادكـرانی مەككـە دابەزیبـێ- بەڵێـن و مـوژدەی تێـدان و، ئەگـەر دوای ئـەوەش دابەزیبـێ، هەواڵـدانی خـوای پـەروەردگاری تێدایـە بـە پێغەمبەرەكـەی ﷺو، هـاوكات ڕێنماییـشی تێدایـە كـە دەفەرمـوێ: هـەر كات یارمەتیـی خـوا هـات و ئازادكـرانی مەككـە ڕەخسـاو، لـە دەستی ئەهـلی كوفـر هاتـەدەر، كـە كاتی خـۆی دوا قـەڵای مەحكەمـی ئەهـلی كوفـرە بـوو لـە نیـوە دوورگـەی عەڕەبییـدا، هەروەهـا خەڵكـت بینـی دوای شـكاندنی ئـەو قـەڵا مەحكەمـەی ئەهلـی كوفـر، پـۆل پـۆل هاتنـە نێـو ئاییـن و بەرنامـەی خـواوە، كـە وەك دوایـی بـاسی دەكەیـن، تیـرەو هـۆزەكانی عـەڕەب چـاوەڕێ بـوون داخـۆ لـە نێـوان موحەممـەد ﷺ و هـاوەڵانی و، خزمەكانیـدا كـە هـۆزی قوڕەیشـن، چـی ڕوودەدا؟

ئنجـا دوای ئـەوەی مەككـە ئازادكـرا، گوتیـان: كاتـی خـۆی خـوا ئـەو ماڵـەی خـۆی پاراسـتوە لـە خـاوەن فیلـەكان، دیـارە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری خوایـە، بۆیـە خـوا ﷻ یارمەتیـی قوڕەیـشی نـەداو، ئـەو ماڵـەی نەپاراسـت، بۆیـە بـا بـڕوای پـێ بێنیـن، خـوا دەفەرمـوێ: كاتێـك خەڵكـت بینـی پـۆل پـۆل هاتـە نێـو ئایینـی خـواوە، بـە ستایشـكردنەوە پـەروەردگارت بـە پاك بگـرە و داوای لێبوردنیـشی لـێ بكـە، لـە هەڵـە و كـەم و كوڕیـی، كـە هیـچ بەشـەرێك لـە هەڵـەو كـەم و كوڕیـی خاڵیـی نابـێ، هەروەهـا لـەوەی خواپەرسـتییەک كـە ئەنجامـی دەدەی، هەرچەنـدە باشـترین جـۆری خواپەرسـتییە، بـەڵام بـە بـەراورد لەگـەڵ پایـەی بـەرزی خـوای پـەروەردگاردا، دەبـێ هـەر داوای لێبـوردن لـە خـوای میهرەبـان بكـەی، بێگومـان خـواش زۆر تۆبـە وەرگرەو، دەگەڕێتـەوە سـەر بەندەكـەی و گەڕانەوەكـەی لـێ وەردەگـرێ.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ﴿٣﴾﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . هەر کات یارمەتیی خوا هات و سەرکەوتن (بەسەر خەڵکی شاری مەککەدا) ڕەخسا ﴿١﴾ خەڵکیشت بینی کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە نێو ئایین و بەرنامەی خواوە ﴿٢﴾ بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرەو، داوای لێبووردنی لێ بکە، بە دڵنیایی ئەو زۆر گەڕاوەیە (بۆ وەرگرتنی گەڕانەوەی بەندەکانی) ﴿٣﴾}.

## شیکردەوەی هەندێک لە وشەکان

(نَصْرُ ٱللَّهِ): (النَّصْرُ والنُّصْرَةُ: العَوْنُ)، (نَصْر) و (نُصْرة)، واتە: یارمەتییدان و هاوکاریی.

(وَٱلْفَتْحُ): (الفَتْحُ: إِزَالَةُ الإِغْلَاقُ وَالإِشْكَالِ، وَذَلِكَ ضَرْبَانِ، أَحَدُهُمَا يُدْرَكُ بالبَصَرِ كَفَتْحِ البَاب، والثَّانِي: يُدْرَكُ بالبَصِيْرَةِ، وتِلْكَ فَتْحُ الهَمِّ وَهُوَ إِزَالَةُ الغَمِّ)، (فَتح): بە مانای لابردنی داخراویی و گرفت و گرێیە، ئەویش دوو جۆرە: یەکێکیان بە چاو دەبینرێ، وەك کردنەوەی دەرگا، دووەم بە عەقڵ و دڵ دەرك دەکرێ، وەك لابردنی خەم و خەفەت و دڵتەنگیی، دەڵێم: هەروەها (فتح)، بە مانای سەرکەوتن و

زەفـەر پـێ بردنیـش دێ.

(دِينِ ٱللَّهِ ): (الإسْـلاَمُ، كَـمَا قَـالَ تَعَـالَى: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴿١٩﴾ ﴾ آل عمـران)، واتـە: ئایینـی ڕێـك و ڕاسـت لـە لای خـوا تەنیـا ئیسـلامە، وەك خـوا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴿١٩﴾ ﴾.

(أَفۡوَاجٗا ): (جَمْعُ فَـوْجٍ، الفَـوْجُ: جَمَاعَـةٌ مُسْرِعَـة)، (أَفْـوَاج) كـۆی (فَـوْج)ە، (فَوْج)یـش، کۆمەڵێـکی بـە خێرایـی ڕۆیشـتوون.

(تَوَّابَۢا): بێگومـان (تـوَّاب)، ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (تَائِـب)ە، (تَائِـب) گـەڕاوە (تَوَّاب)، زۆر گـەڕاوە، (التَّـوْبُ: تَـرْكُ الذَّنْـبِ عَـلَى أَجْمـلِ الوُجُـوه، وَهُـوَ أَبْلَـغُ وَجُـوهِ الإعْتِـذَار، فَـإِنَّ الإعْتِـذَارَ عَـلَى ثَلاَثَـة أَوْجُـهٍ: إِمَّـا أَنْ يَقُـولَ: المُعْتَـذِرُ لَـمْ أَفْعَـل، أَو يَقُـولُ: فَعَلْـتُ لأَجْـلِ كَـذَا، أَو فَعَلْـتُ وَأَسَأْتُ وَقَـدْ أَقْلَعْـتُ، وَلاَ رَابِـعَ لِذَلِـكَ، وَهَـذَا الآخِـر هُـو التَّوْبَـة)، (تـوب): بریتیـە لـە وازلێهێنـانی گونـاح بـە جوانتریـن شـێوە، ئەویـش باشـترین جـۆری پـۆزش هێنانەوەیـە، چونکـە پـۆزش هێنانـەوەو داوای لێبـوردن کـردن سـێ جـۆرە:

١- یان بابای خراپەکار کە پۆزش دێنێتەوە و دەڵێ: نەمکردووەو نکوولیی دەکات لەوەی کردوویەتی.

٢- یان دەڵێ: ئەو کارەم کردوە لە پێناوی فلان شتەدا (واتە: پۆزشێکی درۆ دێنێتەوە).

٣- یاخود دەڵێ: کردوومەو خراپەم کردوە، بەڵام ئێستا وازم لێ هێناوە، ئیدی حاڵەتێکی چوارەم بۆ ئەم سێیانە نیە، ئنجا ئەوەی سێیەمیان بریتیە لە تەوبە (واتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا، بە باشترین و جوانترین شێوە).

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

دەربـارەی هـۆی هاتنەخـوارەوەی ئـەم سـوورەتە، چەنـد ڕیوایەتێـك هاتـوون، بـەڵام لـە ڕووی سـەنەدەوە پسـپۆڕان و شـارەزایان ئیشـكالیان لـە بارەیانـەوە هەیـە، بـەڵام دووانیـان لـە ڕووی سـەنەدەوە لەوانـەی دیكـە باشـترن:

**١- {عَنِ الزُّهرِيِّ رَحِمَهُ الله، قَالَ: فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ خَالِد بن الوَلِيد، فَقَاتَل بِمَنْ مَعَهُ صُفُوفَ قُرَيْشٍ بِأَسْفَلَ مَكَّةَ، حَتَّى هَزَمَهُم الله، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَرَفَعَ عَنْهُم، فَدَخُلوا فِي الدِّينِ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾، حَتَّى خَتَمَهَا، ثُمَّ رَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمَنْ مَعَهُ مِنْ قُرَيْش كِنَانة، وَمَنْ أَسْلَمَ يَوْمَ الفَتْحِ قَبْلَ حُنَيْنٍ (وَحُنَيْنٌ: وَادٍ فِي قُبُلِ الطَّائِف ذُو مِيَاهٍ) وَبِهِ مِنَ المُشْرِكِين يَوْمَئِذٍ عُجُزُ[١] هَوَازِن، وَمَعَهُم ثَقِيفٌ، وَرَأْسُ المشْرِكِينَ، يَوْمَئِذٍ مَالِكُ بنُ عَوْف النَّضْرِي، فَاقْتَتَلوا بِحُنَيْن، فَنَصَرَ اللهُ نَبِيَّهُ ﷺ وَالمسْلِمِيْنَ، وَكَانَ يَوْماً شَدِيداً عَلَى النَّاس، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: (لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ) التوبة، قَالَ مَعْمَّر: قَالَ الزُّهْرِيِّ: وَكَانَ رَسُول اللهِ ﷺ يَتَأَلَّفهم فَلِذَلِكَ بَعَثَ خَالد بن الوَلِيد يومئذ} (أخرجه عبدالرزاق ٩٧٣٩، وقلنا: وهذا مرسل رجاله ثقات، الإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج٣، ص٥٧٣ و ٥٧٤).**

واتـە: زوهریـی - كـە یەكێكـە لـە زانایـانی دوای هـاوەڵان - دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ خالیـدی كـوڕی وەلیـدی نـارد (واتـە: لـە كاتی ئازادكـردنی مەككـەدا) ئەویـش بـەو هێـزەی لەگەڵیـدا بـوو لـە دژی ڕیـزەكانی قوڕەیـش لـە خـوارووی مەككـەوە جەنـگا، هەتـا خـوا تێكیشـكاندن، دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـانی كـرد، دەسـتی هەڵگرت (لـە كوشـتنیان و ئەوانـەی ڕایانكردبـوو شـوێنیان نەكەوتـن) خەڵكەكەش دوایـی هاتنە نێـو ئاییـنی خـواوەو، خـواش ﷻ ئـەم سـوورەتەی دابەزانـد: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ

---

(١) عُجُز: جمع عجوز: پیاوی بە تەمەن كەواتە: عُجُز هوازن: بە تەمەنەكانی هۆزی هەوازین.

رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾، دوایـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ خـۆی و ئەوانـەی لەگەڵـی بـوون لـە قورەیـش، هـۆزی کینانـەو، ئەوانـەی لـە ڕۆژی ئازادکرانی مەککـەدا مسـوڵمان بـوو بـوون بـەرەو حونەیـن چـوون، (حونەینـش: شـیوێکە پێـش ئـەوەی بگاتـە تائییـف ئـاوی زۆری تێـدا هـەن) لـەو کاتـەدا هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان بەتەمەنەکانـی هـەوازن، هەروەهـا هـۆزی (**ثقيف**)یشـان، لەگەڵـدا بـوون، لەوێدابـوون و لـەو ڕۆژەدا سـەرۆکی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان (**مالـك بـن عـوف النـضري**)، بـوو (گەنجێـکی سەرشـێت و سـەرکێڵ بـووە) ئیـدی لـە حونەیـن بەرەنـگاری یەکـدی بوونـەوە و پێکـەوە بەشـەڕ هاتـن، دوایـی خـوا ﷻ پێغەمبـەری خـۆی ﷺو مسـوڵمانانی سەرخسـت، کـە ڕۆژێـکی قـورس بـوو لەسـەر خەڵـك و، خـوا عزوجـل لـەو بـارەوە ئـەو ئایەتانـەی دابەزانـدن: ﴿ لَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِي مَوَاطِنَ كَثِيرَةٖ وَيَوۡمَ حُنَيۡنٍ إِذۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡ كَثۡرَتُكُمۡ فَلَمۡ تُغۡنِ عَنكُمۡ شَيۡـٔٗا وَضَاقَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ ثُمَّ وَلَّيۡتُم مُّدۡبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾، واتـە: خـوا لـە زۆر شـوێنان ئێـوەی سەرخسـتوەو لـە ڕۆژی حونەینیشـدا کاتێـك بـە زۆرییەکەتـان سەرسـام بـوون، بـەڵام سـوودی پـێ نەگەیانـدن و زەوی بەوفراوانییـەی لێتـان وەتەنـگ هـات، ئنجـا پشـتتان لـە دوژمـن کـرد، دوایـی خـوا ﷻ ئارامیـی ڕژانـدە سـەر دڵـی پێغەمبەرەکـەی و بڕواداران. واتـە: لـە سـەرەتای جەنگەکـەوە مسـوڵمانان تێکشـکان کـە بـە زۆرییەکەیـان سەرسـام بـوون، بـەڵام لـە کۆتاییەکەیـدا خـوا ﷻ سـەری خسـتن.

**٢-** لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئەم سوورەتە موبارەکەوە، ئەم دەقەش هاتوە:

**{عَـنْ عَائِشَـةَ ، قَالَـتْ: كَانَ رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ يُكْـثِرُ مِـنْ قَـوْلِ: «سُـبْحَانَ اللَّـهِ وَبِحَمْـدِهِ أَسْـتَغْفِرُ اللَّـهَ وَأَتُـوبُ إِلَيْـهِ»، قَالَـتْ: فَقُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ! أَرَاكَ تُكْـثِرُ مِـنْ قَـوْلِ سُـبْحَانَ اللَّـهِ، وَبِحَمْـدِهِ، أَسْـتَغْفِرُ اللَّـهَ وَأَتُـوبُ إِلَيْـهِ، فَقَـالَ: «خَـبَّرَنِي رَبِّي، أَنِّي سَـأَرَى عَلَامَـةً فِي أُمَّـتِي، فَـإِذَا رَأَيْتُهَـا أَكْـثَرْتُ مِـنْ قَـوْلِ: سُـبْحَانَ اللَّـهِ وَبِحَمْـدِهِ، أَسْـتَغْفِرُ اللَّـهَ وَأَتُـوبُ إِلَيْـهِ. فَقَـدْ**

رَأَيْتُهَا»: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾ فَتْح مَكَّة، ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾) (أخرجه مسلم: ٤٨٤).

واتە: دایكمان عائیشە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم زیكرەی زۆر دووبارە دەكردەوە: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ»، پاكیی بۆ خوا و ستایش بۆ خواو، داوای لێبوردنی لێ دەكەم و بۆ لای دەگەڕێمەوە، منیش پێمگوت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! دەتبینم زۆر ئەم زیكرە دووبارە دەكەیەوە: «سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ»، ئەویش فەرمووی: پەروەردگارم هەواڵی پێداوم، نیشانەیەك لە ئۆممەتم دەبینم، ئنجا هەر كاتێك بینیم، ئەم قسەیە زۆر دووبارە بكەمەوە: پاكیی بۆ خواو ستایش بۆ وی داوای لێبوردن لە خوا دەكەم و، بۆ لای وی دەگەڕێمەوە، ئنجا ئەو نیشانەیەم بینی، دوایی یەكسەر ئەم سوورەتەی خوێندەوە: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١﴾، خۆی فەرمووی: (فتح مكة)، ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢﴾، خەڵكت بینی پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایینی خواوە، ﴿فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾، لەو كاتەدا پەروەردگارت بەستایش كردنیەوە بە پاك بگرەو داوای لێبوردنی لێ بكە، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾، بە دڵنیاییەوە ئەو زۆر دەگەڕێتەوە بۆ لای بەندەكەی و، گەڕانەوەو تەوبەكەی لێوەردەگرێ.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، ئـەوەش مەبەسـت پێـی - بـەلای کەمـەوە - چوارشـتە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿إِذَا جَاءَ نَصْرُ اللَّهِ وَالْفَتْحُ ①﴾، هـەر کاتێـك یارمەتیی خـوا هـات و، (ئازادکـران، ئازادکرانی مەککـە) و سـەرکەوتن (بەسـەر خەڵـکی بێبـڕوای مەککـەدا) ڕەخسـا، لـەو کاتـەدا: ﴿وَرَأَيْتَ النَّاسَ يَدْخُلُونَ فِي دِينِ اللَّهِ أَفْوَاجًا ②﴾، خەڵکیشـت بینـی ﴿النَّاسَ﴾، (أل)ی ناسـاندنی لەسـەرەو مەبەسـت پێـی (**عهـد**)ە، واتـە: خەڵکەکـەت بینـی، خەڵـکی هـۆزەکانی عـەڕەب، هەندێکیـش لـە زانایان گوتوویانـە: خەڵکـت بینـی واتـە: بـە چاوی عەقـڵ و دڵ بەگشـتیی خەڵکـت بینـی: عـەڕەب هاتنـە نێـو ئایینـی ئیسـلام، دوایـی خەڵکـەکانی دیکـەی وڵاتـانی دیکـەش دێـن، هـەرکات خەڵکـت بینـی دەهاتنـە نێـو ئاییـن و بەرنامـەی خـواوە، لـەو حاڵەتـەدا: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ﴾، بـە ستایشـکردنی پەروەردگارتـەوە بـە پـاکی بگـرە، واتــە: هـەم بڵـێ: (**سبحان الله**)، هـەم بڵـێ: (**الحمدلله**)، یـان بڵـێ: (**سبحان الله وبحمده**)، پاکیـی بـۆ خـواو سـتایش بـۆ وی، ﴿وَاسْتَغْفِرْهُ﴾ داوای لێبوردنیـشی لـێ بکـە، لـە هـەر هەڵـە و کـەم و کوڕییـەك کـە مـرۆڤ لێیـان خاڵیـی نابـێ، ﴿إِنَّهُ كَانَ تَوَّابًا ③﴾، بـە دڵنیایـی ئـەو زۆر تۆبـە وەرگـرە، زۆر دەگەڕێتـەوە سـەر بەندەکـەی خـۆی بـە لێبـوردن و بەزەیـی و میهرەبانیـی خـۆی.

## مەسەلە گرنگەكان

ئـەم سـوورەتە موبارەكـە بـە هـەر سـێ ئایەتەكەیـەوە، دەكەینـە یـەك مەسـەلە كـە لـە ئایەتـەكانی (١و ٢و ٣) پێـك دێ:

فەرمانكـردنی خـوا عزوجـل بـە پێغەمبـەری كۆتایـی خـۆی موحەممـەد ﷺ، كـە هـەر كات یارمەتیـی خـوا هـات و، شـاری مەككـە ئازادكـراو، خەڵـكی بینـی كۆمـەڵ كۆمـەڵ و بەخێرایـی دەهاتنـە نێـو ئاییـن و بەرنامـەی خـواوە، بـا بـە ستایشـكردنیەوە خـوا بـە پاكبگـرێ و، داوای لێبـوردنی لـێ بـكات، بـە دڵنیاییـەوە خـوا زۆر گەڕاوەیـە بـۆ لای بەنـدەی خـۆی و، پەشـێمانیی و تۆبەكـەی لـێ وەردەگـرێ:

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ٣﴾.

### شیكردنەوەی ئەم سێ ئایەتە بە پێزە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ﴾، هەر كات یارمەتیی و سەرخستنی خواو سەركەوتن هات، (**الفَتْحُ**)، (**فتح**) بە مانای كردنەوە دێ و، (أل)ی كە لەسەریەتی بۆ ناساندنەو ناساندنەكەش بۆ (**عهد**)ە، واتە: هەر كات یارمەتیی خواو سەركەوتنەكە هات، سەركەوتنی تۆ بەسەر خەڵكی بێبڕوای شاری مەككەدا ڕەخسا، یاخود ئازادكردنەكە، شاری مەككە لە بەردەم تۆدا دەروازەكانی كرانەوە و مەككە ئازادكرا، بۆچی (**الفتح**)، (أل)كەی بۆ (**عهد**)ە؟ چونكە خوا ﷻ بەڵێنی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابووە، كە دەیگێڕێتەوە بۆ مەككە بە سەربەرزیی، وەك لە سوورەتی (الفتح)دا، دەفەرموێ: ﴿لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ

﴿فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾، واتە: بە دڵنیایی هەر کاتێ خوا بیەوێ بەهێمنیی و کاتێك سەری خۆتان تاشیوە، یان کورتتان کردۆتەوە، دەچنە نێو مزگەوتی حەڕامەوە: (لە دوژمنتان) ناترسن، بەڵام ئەو شتێکی زانی کە ئێوە نەتاندەزانی بۆیە بەرلەوە سەرکەوتنێکی نیزیکی ڕەخساند.

بێگومان سووڕەتی (الفتح) لە ساڵی حودەیبییەدا واتە: ساڵی شەشەم، یان حەوتەمی کۆچیی دا دابەزیوەو، سووڕەتی **(الفتح)یش**، لەو کاتەوەش خوا بەڵێنی دابوو بە پێغەمبەرو هاوەڵانی کە دەچنە نێو شاری مەککەوە بە سەرکەوتوویی و، دەچنە نێو مزگەوتی حەڕامەوەش، بۆیە دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾﴾، هەرکاتێ یارمەتیی خوا هات و سەرکەوتنەکە، ئازادکردنەکە ڕەخسا، ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾﴾، خەڵکیشت بینی پۆل پۆل بە خێرایی دەهاتنە نێو ئایین و بەرنامەی خواوە.

**(إذا: اسم زمانٍ مُبْهَمٍ مُطْلَقٍ يُسْتَعْمَل للمُسْتَقْبَل غالِباً)**، ﴿إِذَا﴾، ناوی کاتە کاتێکی نەزاندراو و ڕەها، بەڵام بە زۆریی بۆ داهاتوو بەکاردەهێنرێ، ﴿وَٱلۡفَتۡحُ﴾، **(الفَتْحُ: امْتِلَاكُ بِلَادِ العَدُوِّ وَأَرْضِهِ، لأَنَّهُ يَكُونُ بفَتْحِ بَابِ البلاد)**، **(الفَتْح)** بریتیە لە دەست خستنی وڵاتی دوژمن و سەر زەمینەکەی، چونکە کاتێك ئەوە دەست دەخرێ، کە دەروازەکانی بکرێنەوە.

**٢)**- ﴿وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا﴾، خەڵکیشت دی پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایینی خواوە، وشەی ﴿ٱلنَّاسَ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، هەندێك گوتوویانە: بۆ جینسە، خەڵکت بە تێکڕایی بینی هاتنە نێو ئایینی خواوەو، هەندێك گوتوویانە: ئەوە (أل)ە بۆ ناساندنە و بۆ (عهد)ە، واتە: خەڵکەکەت دی - کە مەبەست پێی هۆزەکانی عەڕەبن - دەهاتنە نێو ئایین و بەرنامەی خواوە پۆل پۆل، کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن، بە خێرایی، چونکە: **(الأَفْوَاج: جمع فوج: الجَمَاعَةُ السَّائِرةُ المُسْرِعَة)**، کۆمەڵە خەڵکێك بە خێرایی بڕۆن، عەڕەبەکان - وەك لەو دەقەوە دیارە کە دوایی دێ - چاوەڕێ

بوون داخۆ لە نێوان پێغەمبەری خوا ﷺ و، خەڵکەکەی خۆیدا کە هۆزی قوڕەیشن، چی ڕوودەدا؟ مەبەست تەنیا ئەوە نەبوو، کە ئەوانە (هۆزی قوڕەیش) خزمانی پێغەمبەرن ﷺ، بەڵکو زیاتر مەبەستیان ئەوە بووە، چی لەو خەڵکە ڕوودەدات کە لە دەوری کەعبەن، ئەو کەعبەیەی خوا ﷻ پاراستوویەتی لە خاوەنانی فیل و، هێمنیی و ئاساییشی تێدا سەقامگیر کردوە، ئایا ئەو مزگەوتی حەڕام و کەعبەیە، ئەو وڵاتە پڕ هێمن و ئاساییشە لەبەردەم، موحەممەد ﷺ و هاوەڵانیدا دەروازەکانی دەکاتەوە؟ یاخود وەك ڕابردوو چۆن خوا کەعبەی پاراستوە، ئێستاش هەر دەیپارێزێ! عەرەب چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد، وەك لەم دەقەوە دیارە:

**{عَنْ أَنَسِ ابنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا فَتَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَكَّةَ، قَالَتِ الأَعْرَابُ: أَمَا إِنْ ظَفَرَ بأَهْلِ مَكَّةَ، وَقَدْ أَجَارَهُمُ اللهُ من أَصْحَابِ الفِيلِ، فَلَيْسَ لَكُم بِهِ يَدَانٌ، فَدَخَلُوا فِي دِينِ اللهِ أَفْوَاجاً}**[1] .

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ گێڕاویەتەوە دەڵێ: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ مەککەی ئازاد کرد، عەرەبە خێڵەکییەکان (و هۆزەکانی عەرەب) گوتیان: ئێستا مادام زەفەری بە خەڵکی مەککە برد، لە حاڵێکدا خوای بەرز خەڵکی مەککەی پاراستبوو لە خاوەنانی فیل، ئێوە دەسەڵاتتان بەسەر موحەممەد ﷺ و هاوەڵانیدا ناشکێ، ئنجا کۆمەڵ کۆمەڵ هاتنە نێو ئایینی خواوە.

چونکە بۆیان دەرکەوت کە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئەگەرنا سوپای لەسوپای موحەممەد ﷺ زۆر گەورەتر، ئەوان ئەگەر دە هەزار(١٠ ٠٠٠) کەس بوون - وەك پێشتر لە تەفسیری سووڕەتی **(الفیل)**دا باسمان کرد - سوپایەکەی ئەبرەهە کە هات شەست هەزار(٦٠ ٠٠٠) کەس بوون، یانی: شەش ئەوەندەی سوپایەکەی پێغەمبەر ﷺ بوون و **(فیل محمود)**یشیان، لە پێشەوە بوو، بەڵام خوا ﷻ باڵندەی پۆل پۆلی ناردە سەریان، هەر باڵندەیەك سێ بەردی پێ

---

(١) روح المعاني: ج١٥، الجزء ٣٠، ص٦١٩

بـوون، یەکێـك بـە دەندووکیـەوەو، دووش بـە هـەردوو پێیـەوەو، ئـەو بەردانـە بـە هـەر کەسـێك کەوتبـان، وەك تێـزاب دەیانسـووتاندو پێیـدا دەچوونـە خـوار، تاکـو لێـی دەچوونـە دەر، بـەو شـێوەیە ئـەو سـوپای زەبەلاحـە شـکا، جگـە لـە خەڵکێکی پەراگەنـدەی پرژوبـڵاو، کـە لـە هەندێـك گێـردراوەدا هاتـوە، ئەوانیـش دوایـی هەموویـان بـەو نەخۆشـییەی بەهـۆی ئـەو بەردانـەوە لـە نێوانیـان دا بڵاوبـۆوە، فەوتـاون، بۆیـە گوتوویانـە: مـادام موحەممـەد ﷺ دەرگای مەککـەی بـۆ کرایـەوەو، بەسـەر خەڵـکی دەوری مەککـەدا زاڵبـوو، خـواش ﷻ خەڵـکی مەککـەی نەپاراسـت وەك کاتی خـۆی لـە خاوەنـانی فیـل پاراسـتی، کەواتـە: دیـارە موحەممـەد پێغەمبـەری خوایـەو، ئـەوەی دەیڵـێ ڕاسـتە.

٣)- ﴿ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ﴾، [کاتێك کە ئەوەت بینی] بە ستایشکردنی پەروەردگارتەوە بە پاکی بگرەو داوای لێبوردنیشی لێ بکە.

پیتی (ف) لەسەر ﴿ فَسَبِّحْ ﴾، سێ ئەگەریان بۆ داناون:

أ- (**جَوَابُ إذَا، باعتِبَار مَا تَضَمَّنتْهُ مِن معنى الشَّرْطِ:** ﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١﴾، (**إذا**) مانای مەرج دەگرێتە نێو خۆی، بەو مەرجەی یارمەتیی خواو، سەرخستنی گەورە هات و، خەڵکت بینی پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایینی خواوە، بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرە.

ب- یاخود: ئەم تەسبیحە ﴿ فَسَبِّحْ ﴾، بۆ بە پاکگرتنی خوایە، ئەو خوایەی توانی پێغەمبەری خۆی ﷺ و بڕواداران سەربخات بەسەر دوژمنانیاندا، پاکیی بۆ وی.

ج- یاخود مەبەست پێی سەرسوڕمانە، وەك چۆن کاتێك شتێکی سەیرو عەجایب دەبینی، دەڵێی: (**سُبْحَانَ الله**)، ئەوشتە چەندە عەجایبە، چەندە سەیرە!!

٤)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾، بە دڵنیایی ئەو (خوا ﷻ) زۆر تۆبە وەرگرە، بێگومان (**تواب**)، ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (**تائب**)، یانی: گەڕاوە، بەڵام (**تَوَّاب**)، واتە زۆر گەڕاوە،

﴿إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا﴾، بەڕاستیی خوا زۆر گەڕاوەیە، واتە: زۆر دەگەڕێتەوە سەر بەندەکەی، کە گەڕانەوەکەی و پەشێمان بوونەوەکەی لێ قبووڵ بکات.

کەواتە: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ﴾، واتە: بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت بە پاك بگرە لە هەر کەم و کوڕییەك و، ستایشی بکە بە هەموو سیفەتە بەرزو پاك و چاکەکانی، بەنسبەت خۆشتەوە هەر کەم و کوڕیی و هەڵەیەکت بووبێ، داوای لێبوردنی بۆ لە خوا بکە، نەك بەو واتایە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵە و کەم و کوڕیی بووبێ، وەك هی خەڵکی دی، شتێکی زانیبێ گوناهەو کردبێتی! پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لەوە پارێزراو بوون، بە تایبەت سەروەری پێغەمبەران موحەممەد ﷺ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: ئەوەی تۆ ئەنجامتداوە، لەو خواپەرستییە گەورەو گرنگانە، لەو کارە گەورەو گرنگ و چاکانە، بە بەراورد لەگەڵ پێگەی بەرزو بێ وێنەی خوای پەروەردگاردا، دەبێ وەك گوناهێك و هەڵەو کەم و کوڕییەك تەماشایان بکەی، نەك پێغەمبەری خوا ﷺ گوناهێکی کردبێ، بە چەمك و واتای گوناح، کە ئێمە بەکاری دێنین.

لە بارەی ئەوەوە کە خوا دەفەرموێ: هەر کاتێك خەڵکت بینی پۆل پۆل دەهاتنە نێو ئایینی خوای بەرزی مەزنەوە، چۆن خەڵك چاوەڕێیان کردوە چی لە نێوان موحەممەد ﷺ و قوڕەیشدا ڕوودەدات؟ ئەم دەقە دێنین:

**{عَنْ عَمْرِو بْنِ سَلَمَةَ قَالَ: كُنَّا بِمَاءٍ مَمَرَّ النَّاسِ، وكانَ يَمُرُّ بنا الرُّكْبانُ فَنَسْأَلُهُمْ: ما لِلنَّاسِ؟ ما لِلنَّاسِ؟ مَا هَذَا الرَّجُلُ؟ فيَقُولُونَ: يَزْعُمُ أنَّ اللَّهَ أرْسَلَهُ، أوْحَى إلَيْهِ «أوْ أوْحَى اللَّهُ بكَذَا»، فَكُنْتُ أحْفَظُ ذَلِكَ الكَلامَ، وكَأنَّما يُغْرَى في صَدْرِي، وكَانَتِ العَرَبُ تَلَوَّمُ بإسْلامِهِمُ الفَتْحَ، فيَقُولُونَ: اتْرُكُوهُ وقَوْمَهُ؛ فإنَّه إنْ ظَهَرَ عَلَيْهِمْ، فَهْوَ نَبِيٌّ صادِقٌ، فَلَمَّا كانَتْ وقْعَةُ أهْلِ الفَتْحِ، بَادَرَ كُلُّ قَوْمٍ بإسْلامِهِمْ، وبَدَرَ أبِي قَوْمِي بإسْلامِهِمْ} (أخرجه البخاري: ٤٠٥١).**

واتە: عەمری کوڕی سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: ئێمە لەسەر ئاوێك بووین، شوێنی پێدا ڕەتبوونی خەڵك بوو، سوارو کاروان بەلاماندا ڕەت دەبوون،

لێمان دەپرسین: هەواڵی خەڵك چییە؟ هەواڵی خەڵك چییە؟ ئەو پیاوە، (واتە: موحەممەد ﷺ) هەواڵی چییە؟ دەیانگوت: پێی وایە خوا ﷻ ناردوویەتی و سرووشی بۆ لا ناردوە، یاخود خوا ﷻ ئەوەی بۆ سرووش كردوەو بۆی ناردوە، منیش ئەوەی ئەوان دەیانگوت لەبەرم دەكرد و، بە دڵمەوە بە سینەمەوە دەنووسا (پێم خۆشبوو)، عەرەبەكانیش چاوەڕێ بوون و، مسوڵمانەتییەكەی خۆیان (هاتنە نێو ئایینی ئیسلامی خۆیان) لەسەر ئەوە ڕاگرتبوو: ئایا موحەممەد ﷺ بەسەر خەڵكی مەككەدا زاڵ دەبێ و دەچێتە نێو مەككەوە؟ دەیانگوت لێی گەڕێن خۆی و خەڵكەكەی، (واتە: خۆی و قورەیش) ئەگەر بەسەریاندا زاڵبوو، ئەوە دیارە پێغەمبەرێكی ڕاستگۆیە، ئنجا كاتێك ڕووداوی سەركەوتنە كە **(الفتح)** بوو، هەر كۆمەڵەو هۆزە پەلەیان دەكرد و دەچوون مسوڵمان دەبوون، بابیشم پەلەی كردو پێش خەڵكەكەی خۆی كەوت و، چوو ئیعلانی مسوڵمانەتیی خۆی كرد.

كەواتە: ئەوەی خوا ﷻ لەم سوورەتە موبارەكەدا فەرموویەتی: (هەر كاتێك خەڵكت بینی پۆل پۆل هاتنە نێو ئایین و بەرنامەی خواوە) مەبەست پێی ئەوەیە كە هۆزەكانی عەرەب چاوەڕێی ئەوەیان دەكرد، بزانن ئایا لە نێوان موحەممەد ﷺو، كۆمەڵ و خەڵكەكەی خۆیدا كە هۆزی قورەیشن و بە دەوری كەعبەوەن، ئەو كەعبەیەی خوا لە ڕابردوودا پاراستوویەتی، چییان لە نێوانیاندا ڕوودەدات؟ ئەگەر دەروازەكانی شاری مەككەو حەرەمەكەی و، كەعبەو مزگەوتی حەرام، لەبەردەم موحەممەد ﷺو، هاوەڵانی دا كرانەوە، كەواتە: دیارە موحەممەد پێغەمبەری خوایە ﷺ، چونكە پێشتر هەموو ئەوانەی ویستوویانە بە زۆر بچنە نێو مەككەوە، خوا ﷻ فەوتاندوونی و لە بەینی بردوون، كە خاوەنانی فیل **(أصحاب الفيل)** نموونەیەكی زەقن لەوبارەوە.

ئنجا دوایی كە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ دەچێتە نێو مەككەو كەعبەوەو دەروازەكانی بۆ دەكرێنەوە، بۆیان دەردەكەوێ كە موحەممەد ڕاستگۆیە لەوەدا كە دەڵێ: ڕەوانەكراوو پێغەمبەری خوام، بۆیەش دوای ئەوە بەلێشاوو كۆمەڵ

کۆمـەڵ هاتوونـە نێـو ئیسـلامەوە، دوای ئـەوەی ئـەو بەربەسـتە شـکاو، ئـەو قـەڵا مەحکەمـەی شـیرك و کوفـر لـە نیـوە دوورگـەی عەڕەبییـدا ڕووخـا.

## کورتە باسێک دەربارەی ئایین[1]: لەبەر تیشکی ئەم ئایەتە بەپێزەدا: ﴿ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ ﴾.

بەڕێـــزان!

پرسـیاری ئایـا ﴿ دِينِ ٱللَّهِ ﴾، بەرنامـەی خـوا، چییـەو چۆنـە؟ پرسـیارێکی بەجێیـەو شایسـتەی وەڵامدرانەوەیـە، بۆیـە پێویسـتە کورتـە باسـێك لـەو بـارەوە بکەیـن لـە سـێ تـەوەردا:

### تەوەری یەکەم: ئایین چییە؟

ئەویش لە سێ بڕگەدا:

١)- پێناسەی ئایین لە ڕووی زمان و زاراوەییەوە.

٢)- نیشانەو دروووشمە سەرەکییەکانی ئایین، حەوت درووشممان خستوونەڕوو.

٣)- پێنج ڕاستیی گرنگ لەبارەی ئیسلامەوە، کە تاکە ئایینی پەسندکراوی خوایە بۆ مرۆڤایەتیی.

---

(١) ئێمـە ئـەم کورتـە باسـە هەمـووی لـە کتێبـی: (خواناسـیی، ئاییـن، ئیمان، درەوشـاوەیی ئیسـلام و پووچەڵیـی ڕێچـکان)، چاپـی سـێیەم سـاڵی (١٤٤١ - ٢٠٢٠) وەردەگریـن، لـە بەشـی دووەمـی ئەو کتێبـە، بـە ناوونیشـانی: ئاییـن چییـە؟ چـۆن پەیدابـووە؟ بۆچـی هاتوە؟

بێگومــان زۆر بــە کورتکراوەیــی و پوختکراوەییــەوە، ئەگەرنـا ئــەو باســە زۆری خایانــدوە و لاپەڕەکانـی: (٢٢٠ -٣٧٠)، واتـە: (١٥٠)، لاپـەڕەی گرتـوە، بـەڵام ئێمـە زۆر بـە کورتیـی و پوختیـی، ئـەوەی مەبەسـتمانە لێـی هەڵدەبژێریـن.

**تەوەری دووەم: ئایین چۆن پەیدابووە؟**

**١)**- وەڵامی بەرنامەی خوا کە ئایین چۆن پەیدا بووەو، سەرچاوەکەی کوێیە؟

**٢)**- وەڵامی ڕێچکەو بیردۆزەکان، ئەوانیش بەگشتیی پێنج وەڵامیان داونەوە.

**تەوەری سێیەم: ئایین بۆچی هاتوە؟**

لە بیست و یەك (**٢١**) خاڵدا، حیکمەت و ئامانجی نێردرانی ئایین، (واتە: ئیسلام) کۆتا نوسخەی پەیامی خوا بۆ مرۆڤایەتیی، دەخەینەڕوو.

**تەوەری یەکەم: پێناسەی ئایین: ئایین چییە؟**

**بڕگەی یەکەم لەڕووی زمان و زاراوەییەوە:**

**یەك:** لە ڕووی زمانەوانییەوە: ئەگەر تەماشای فەرهەنگەکانی زمان بکەین، دەبینین: هەر کام لە (**إبن منظور**)، لە (لسان العرب: ج٤، ص٤٥٨ - ٤٦٢)دا، هەروەها (**الزمخشري**) لە کتێبی (**أساس البلاغة: ص٢٠٠**)داو، (**راغب الأصفهاني**)، لە کتێبی (**مفردات الألفاظ القرآن: ص١٧٧**)داو، (**الرازي**)، لە کتێبی (**مختار الصحاح: ٢١٨**)دا، هەروەها (**فيروز آبادي**) لە کتێبە ناودارەکەی خۆی (**القاموس المحيط: ج٦، ص٢٧٠ - ٢٢٧**)داو، کتێبی (**المنجد: ص٢٣١**)، هەروەها فەرهەنگەکانی دیکەش، هەموویان ئەوەی ئێستا دەیڵێم، دووبارەی دەکەنەوە:

وشەی (**دین**) لە ئەصڵی زماندا:

**أ**- بە مانای سزاو پاداشت دێ.

**ب**- بە مانای ملکەچکردن دێ، بۆ وێنە: (**ابن منظور**)، دەڵێ: (**الدِّينُ: الجَزَاءُ وَالمُكَافَأَةُ، وَدِنْتُهُ بِفِعْلِهِ دِيْناً: جَزَيْتُهُ، وَمِنْهُ الدَّيَّانُ فِي صِفَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، وَالدِّينُ: الحِسَابُ، وَالدِّينُ: الطَّاعَةُ، دِنْتُهُ وَدِنْتُ لَهُ: أَطَعْتُ لَهُ، وَالجَمْعُ الأَديَان، يُقَالُ دَانَ بِكَذَا دِيَانَةً وَتَدَّين، بِهِ فَهُوَ دَيِّن وَمُتَدَيِّنٌ**).

واتـە: دیـن بـە مانـای سـزاو پاداشـتە، بەرانبـەر دانەوەیـە، بەهـۆی کردەوەکەیـەوە سـزام دا، یـان پاداشـتم دایـەوە، **(الدَّیَّان)**یـش سـیفەتی خوایـە عزوجل (کەسـێکە سـزاو پاداشـتی خەڵـك دەداتـەوە) هەروەهـا **(دیـن)** بـە مانـای لێپرسـینەوەش دێ و، بـە مانـای فەرمانبەرییـش دێ، **(دِنْتُـهُ وَدِنْـتُ لَـهُ)**: هەردووکیـان بـە مانـای فەرمانبەرییـم بـۆ کـرد، **(دیـن)** بـە **(أدیـان)**، کۆدەکرێتـەوە، دەگوتـرێ: **(دَانَ بِکَـذَا دِیَانَـةً وَتَدَّیـن بِـهِ، فَهُـوَ دَیِّـن وَمُتَدَیِّـنٌ)**، واتـە: پابەنـد بـوو بـەو بەرنامـەوەو بـۆی ملکـەچ بـوو، ئـەو **(دَیِّـن و متدیِّـن)**ە، واتـە: بـۆی ملکەچـە.

هـەر هەمـان قسـە زانایانـی دیکـەش کـە نـاوم هێنـان، دووبـارەی دەکەنـەوە، واتـە: وشـەی **(دیـن)** لـە ئەصڵـی زمانـدا بـە دوو واتایـە، یەکـەم: سـزاو پاداشـت، دووەم: فەرمانبەریـی و گەردنکەچیـی.

بـەڵام دوایـی خـوا ﷻ کـە لـە قورئانـدا کـە وشـەی (دیـن)ی بەکارهێنـاوە، چەمـك و واتایەکـی فراوانـتری پێـداوە، ئەویـش ئەوەیـە کـە وێـڕای سـزاو پاداشـت و فەرمانبەریـی و گەردنکەچیـی، نـاو بـێ بـۆ ئـەو بەرنامەیـەش کـە خـوا بـە پێغەمبـەری کۆتایـی خۆیـدا ناردوویەتـی، وەك دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴿١٩﴾﴾ **آل عمـران**، واتـە: ئاییـن لـە لای خـوا تەنیـا ئیسـلامە، واتـە: ئایینێـك کە خـوا پەسـندی بـکات و ڕازی بـێ مرۆڤـەکان شـوێنی بکـەون، لـە ڕوانگـەی قورئانـەوە، کەواتـە: کـە خـوا وشـەی دینـی بەکارهێنـاوە بـە سـێ واتایـان بـەکاری هێنـاوە:

**یەك:** سزاو پاداشت.

**دوو:** گەردنکەچیی.

**سێ:** بەرنامەی ژیان.

**یەکەم:** بۆ مانای یەکەمیان (سزاو پاداشت):

**أ-** خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٞ ﴿٥﴾ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٞ ﴿٦﴾﴾ **الذاریات**، واتە: بێگومان ئەوەی گفتتان پێدراوە (ڕاستەو دوو دڵیی تێدا نیەوە) سزاو پاداشتیش دێتە دی.

**ب-** هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾ ﴾**الفاتحة**، واتە: (خوا) خاوەنی ڕۆژی سزاو پاداشتە.

**ج-** هەروەها دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ ﴾**الواقعة**، واتە: ئەمە میوانداریيانە لە ڕۆژی سزاو پاداشتدا.

**دووەم:** بۆ مانای دووەمیان (گەردنکەچیی):

**أ-** خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٣٩﴾ ﴾**الأنفال**، واتە: لە دژی بێبڕوایەکان بجەنگن تاکو فیتنە نامێنێ و ملکەچیی هەمووی بۆ خوا دەبێ، ئنجا ئەگەر دەستیان هەڵگرت، بێگومان خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، لێرەدا وشەی (**الدِّين**) لە ڕستەی: ﴿ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ﴾دا، بە مانای ئایین و بەرنامەی خوا نیەو، بە مانای ملکەچیی و تەسلیم بوونە،

**ب-** دیسان لە سوورەتی (**النحل**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًا ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویی دایە هی ئەوەو، ملکەچیی بەردەوام و حەتمییش تەنیا بۆوی (خوا)یە.

**ج-** هەروەها خوا فەرموویەتی: ﴿ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ ﴿٣﴾ ﴾الزمر، ئاگاداربن! گەردنکەچیی و پەرستنی بێ خەوش تەنیا بۆ خوایە.

**سێیەم:** بۆ مانای سێیەمیان (بەرنامەو پەیڕەو):

**أ-** خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾**یوسف**، واتە: فەرمانڕەوایەتیی بەس هی خوایە، فەرمانی کردوە جگە لەوی نەپەرستن، ئەوەیە بەرنامەی ڕاست و تەواو، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

**ب-** هەروەها خوا دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ كِدۡنَا لِيُوسُفَۖ مَا كَانَ لِيَأۡخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ ٱلۡمَلِكِ ﴿٧٦﴾ ﴾**یوسف**، واتە: ئاوا تەگبیرمان بۆ یوسف ﷺ کرد، چونکە بۆی نەبوو بە

پێی ئایین و بەرنامەی حوکمڕان (ی ئەوکاتەی میسر) برایەکەی (بنیامین) لەلای خۆی گلداتەوە، بۆیە ئەوانی سەرپشککرد ئایا سزایەکەی چی بێ؟ خۆیان گوتیان: سزایەکەی ئەوەیە هەر کەسێك دزیی کردبێ، لە بەرانبەر دزییەکەیدا، با ببێتە بارمتە لەلای تۆ.

ج- هەروەها لە ئایەتی کۆتایی سوورەتی (**الکافرون**)دا: ﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: بەرنامەی خوتان بۆ خۆتان و، بەرنامەی خۆم بۆ خۆم.

شایانی باسە: وشەی (**الدین**)، بە هەموو ڕێژگەکانیەوە نەوەدو حەوت (**٩٧**) جار لە قورئاندا هاتوە، بیست (**٢٠**) جار بە مانای سزاو پاداشت و حەفتاوحەوت (**٧٧**) جاریش بە مانای بەرنامەو پەیڕەو یان گەردنکەچیی و فەرمانبەریی، لەو (**٧٧**) جارەش، جگە لە چەند جارێکی کەم کە بە ژمارەی پەنجەکانی دەست دەژمێردرێن، ئەگەرنا هەر بە مانای بەرنامەو پەیڕەوی ژیان بەکارهێنراوە، ئنجا ئەوبەرنامەو پەیڕەوە، چ هی خوا عزوجل بێ، یان هی جگە لە خوا بێ.

## دوو: لەڕووی زاراوەییەوە

أ- (**راغب الأصفهاني**)، دەڵێ: (**الدِّينُ يُقَالُ: لِلطَّاعَةِ وَالجَزَاءِ، واسْتُعِيرَ لِلشرِيْعَة**)[1]، واتە، دین بە مانای فەرمانبەریی و سزاو پاداشت دێ و، خوازراویشەتەوە بۆ شەریعەت (کە خوا دایبەزاندوە).

ب- (**الجرجاني**) لە (**التعریفات**)دا گوتوویەتی:

(**الدِّينُ: وَضْعٌ إلَهِيٌّ يدعو أَصْحَاب العُقُولِ إلى القُبُولِ عن الرَّسُول**[2] ﷺ)، واتە: ئایین بەرنامەیەکی خواییە، خاوەن عەقلان بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی ئەوەی لەلای پێغەمبەرە ﷺ.

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن: ص١٧٧

(٢) التعريف ج٢. ص٤٧

هەروەها وشەی (**إسلام**)یش کە وشەی دووەمە، وەك زاراوەیەکی باو (**مصطلح عُرفي**) هەر بە مانای ئەوە بەرنامەیە دێ کە خوا دایبەزاندوە بۆ موحەممەد ﷺ.

بەڵام ئیسلام لە ڕووی زمانەوانییەوە بە مانای ملکەچییە:

أ- (**فيروز آبادي**)، لە (**القاموس المحيط: ج٤، ص١٣١**)دا، دەڵێ: (**أَسْلَمَ أي: انقَادَ وَصَارَ مُسْلِمَاً**)، ملکەچ بوو، تەسلیم بوو یان بوو بە مسوڵمان.

ب- (**إبن منظور**)، دەڵێ: (**الإسلام والإستسلام: الإنقياد**)، (**لسان العرب: ج١٢، ص٢٩٣**)، واتە: ئیسلام یانی: ملکەچ بوون.

ج- (**الجرجاني**)، لە (**التعريفات: ص١٠**)دا، دەڵێ: (**الإسلام: هو الخضوع والإنقياد لما أَخْبَرَ به الرسول ﷺ**)، واتە: ئیسلام بریتیە لە گەردنکەچیی بۆ ئەو بەرنامەو پەیامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن خواوە هەواڵی پێداوە.

کەواتە: گوشراوو کورتەی ئەوەی گوتمان دەتوانین لە حەوت (٧) خاڵدا بە گوشراویی بیخەینەوە ڕوو:

**یەکەم:** وشەی (**الدين**)، لە ئەصڵدا دوو واتای هەن، سزاو پاداشت، لەگەڵ گەردنکەچیی و فەرمانبەریی.

**دووەم:** بەڵام قورئان کە وشەی ناوبراوی بەکارهێناوە، وێڕای واتا ئەصڵییەکەی، واتایەکی سێیەمیشی بۆ زیاد کردوە، کە هەردوو واتا پێشووەکەشی تێدان، ئەویش ئەوەیە (دین) بریتیە لە بەرنامەو پەیڕەوی ژیان، چ سەرچاوەکەی خوا ﷻ بێ، کە ئەوە ئایینی هەقە، چ جگە لە خوا بێ.

**سێیەم:** هەر جارێك ویسترابێ وشەی (دین) بەرنامەی خوا بگەیەنێ، نیشانەو قەیدێکی جوێکەرەوەی خراوەتە سەر، وەك (**أل**) (**الدين**)، یان (**دين الله**)، یان (**الدين الحق**)، یان (**الدين القيم**).

**چوارەم:** وشەی ئیسلامیش لە زماندا دوو واتای هەن: یەکەم: گەردنکەچیی و سەردانەواندن، دووەم: خۆساغکردنەوەو یەکلابوونەوە.

**پێنجەم:** لە بەکارهێنانی قورئاندا (إسلام) هەردوو واتا ئەسڵییەکەی لەبەرچاو گیراون، بەڵام چەمك و مەبەستەکەیان تەسك کراوەتەوەو، تایبەتکراوە بە بەرنامەی خواوە، واتە: سەردانەواندن و یەکلابوونەوە بۆ بەرنامەی خوا.

**شەشەم:** ئیسلام ناوە بۆ هەموو ئەو ئایین و بەرنامانەی خوا بە پێغەمبەرانی دا (**علیهم الصلاة وسلام**) ناردوونی، هەرچەندە لە چۆنیەتیی و چەندیەتییشدا لە یەك جیابووبن، بەڵام لە کاکڵ و مەبەستدا یەکبوون، کە بریتی بووە لە: سەردانەواندن و ملکەچبوون بۆ بەرنامەی خواو، یەکلابوونەوە بۆ بەندایەتیی و فەرمانبەریی بۆ خوا.

**حەوتەم:** ئیسلام ناوی ئایینی هەموو پێغەمبەرانە (**علیهم الصلاة والسلام**)، بەڵام دوایی لە ڕێی عورفەوە، وەك ناوێکی تایبەت دابڕاوە بەسەر کۆتا بەرنامەی خوادا، کە بە پێغەمبەری خاتەم دا ﷺ ناردوویەتی.

بڕگەی دووەم: نیشانەو درووشمە سەرەکییەکانی ئایین:

## کە حەوت درووشم و نیشانەن

**١)**- بەرنامەی ژیان بەس لەلایەن خواوە دادەنرێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَغَيْرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبْغُونَ وَلَهُۥٓ أَسْلَمَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا وَإِلَيْهِ يُرْجَعُونَ ﴿٨٣﴾﴾ **آل عمران**، واتە: ئایا جگە لە بەرنامەی خوا دەخوازن، لە حاڵێکدا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، بە پێخۆشبوون و پێناخۆشبوونەوە بۆ خوا ملکەچن و، هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنەوە؟ کەواتە: بەرنامەی ژیان دەبێ تەنیا خوا ﷻ دایبنێ، چونکە هەموو بوون و گەردوون بۆ خوا ملکەچە.

**٢)**- بەرنامەی ژیانی مرۆڤ لەلای خوا ﷻ، بەس ئیسلامە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴿١٩﴾﴾ **آل عمران**، واتە: بەرنامە لەلای خوا تەنیا ئیسلامە،

واتە: ئەو بەرنامەیەی خوا ڕازی دەبێ مرۆڤ شوێنی بکەوێ، تەنیا بریتیە لەوەی بۆ پێغەمبەری کۆتایی ناردوە، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَـٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ **آل عمران**، واتە: هەر کەسێك جگە لە ئیسلام بەرنامەو ئایینێکی دیکە بخوازێ، لێی وەرناگیرێ و لە دواڕۆژدا لە زیانبارانە.

**٣)-** کاکڵ و نێوەڕۆکی بەرنامەی هەموو پێغەمبەران (**علیهم الصلاة والسلام**)، یەکە، ئەوەش لە قورئان دا زۆر بەڕوونیی هاتوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ: ﴿ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴿١٣﴾ ﴾ **الشورى**، واتە: خوا لە ئایین و بەرنامەی خۆی بەرنامەیەکی بۆ داناون، هەمان بەرنامە کە نووحی عليه السلام پێ ڕاسپارد بوو، هەروەها ئەوەی بۆ لای تۆمان سرووشکردوەو، ئەوەی ئیبڕاهیم و مووسا و عیسامان پێ ڕاسپاردبوون، کە ئایین و بەرنامە (ی خوا) بەرپابکەن و تێیدا پەرتەوازە مەبن.

کەواتە: بەرنامەی هەموو پێغەمبەران کە ئەو پێنجە سەرەکییەکانیانن، لە نێوەڕۆك دا یەکە، فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ زۆرجوان تەعبیر لەو ڕاستییە دەکات، کە دەفەرموێ: {**إِنَّ مَثَلِي وَمَثَلِ الأنبياء مِنْ قَبْلِي، كَمَثَلِ رَجُلٍ بَنَى بَيْتًا، فَأَحْسَنَهُ وَأَجْمَلَهُ، إلاَّ مَوْضِعَ لَبِنَةٍ مِنْ زَاوِيَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَطُوفُونَ بِهِ، ويَعْجَبُونَ لَه، وَيَقُولُونَ: هَلَّا وُضِعَتْ هَذِهِ اللَّبِنَة؟ قَالَ: فَأَنَا اللَّبِنَةُ، وَأَنَا خَاتَمُ النَّبِيِّينَ**} (**أخرجه البخاري: ٦٨٥٤، ومسلم:٦١٠٠**).

واتە: وێنەی من و وێنەی پێغەمبەرانی پێش من، وەك پیاوێکە کۆشکێکی دروستکردوە، چاکی کردوەو جوانی کردوە، جگە لە شوێنی خشتێك لە گۆشەیەکیدا، خەڵك بە دەوریدا هاتوون و چوون و پێی سەرسام بوون و گوتوویانە: بریا ئەم خشتەش دانرابایە، فەرمووی: من خشتەکەم و من کۆتایی پێغەمبەرانم.

٤- بەرنامەی خوا بەسەر هەموو بەرنامەیەکدا زاڵە، وەك دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوْ كَرِهَ

ٱلْمُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ التوبة، واتە: خوا ئەو زاتەیە ڕەوانەكراوی خۆی بە ڕێنمایی و ئایین و بەرنامەی هەقەوە ناردوە، تاكو بەسەر هەموو بەرنامەكاندا سەری بخات و زاڵی بكات، هەرچەندە هاوبەشدانەران پێشیان ناخۆش بێ.

بێگومان ئایین و بەرنامەی خوا لە ڕووی بەڵگەوە هەمیشە زاڵەو، لە دنیای واقیع و كاتی بەرەنگاربوونەوەشدا، ئەگەر شوێنكەوتووانی بەڕاستیی پێوەی پابەند بن، وەك مێژوو سەلماندوویەتی، بێگومان زاڵ دەبن بەسەر نەیاراندا.

٥)- بەرنامەی خوا لەسەر بنچینەی تێگەیشتن وەردەگیرێ:

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾﴾ التوبة، واتە: بۆچی لە هەر كۆمەڵێك لە بڕواداران دەستەیەك بە دوای زانیارییدا ناڕۆنە دەرێ، بۆ ئەوەی لە بەرنامەی خوا شارەزا بن و، كە گەڕانەوە لای گەلەكەیان ئاگاداریان بكەنەوەو، بەڵكو وریا بن و بترسێن.

كەواتە: ئایین و بەرنامەی خوا، لەسەر بناغەی تێگەشتن و ورد تێگەیشتن وەردەگیرێ.

هەروەها خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿قُلْ هَـٰذِهِۦ سَبِيلِىٓ أَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِى ۖ وَسُبْحَـٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٨﴾﴾ یوسف، واتە: بڵێ ئەمەیە ڕێبازی من، لەبەر ڕۆشناییدا خۆم و ئەوانەی شوێنم كەوتوون، بەرەو لای خوا بانگەواز دەكەین و، پاكیی بۆ خوا من لە هابەش بۆ خوا دانەران نیم.

٦)- بەرنامەی خوا نە بۆ خۆی سەغڵەت دەبێ و، نەهیچ كەسیش سەغڵەت دەكات:

خوا ﷻ بەرنامەی خۆی ناردوە كە بۆ خۆی سەغڵەت نابێ لەبەردەم مرۆڤ و چارەسەری كێشەو گرفتەكانیدا، وەك دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱجْتَبَىٰكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى

﴿ ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ ﴿٧٨﴾ ﴾**الحج**، واتە: ئەو (خوا ﷻ) ئێوەی هەڵبژاردووەو لە بەرنامەکەیدا شتێکی وای لەسەر دانەناون پێی سەغڵەت بن.

واتـە: خـوا ﷻ کارێکـی وای نەکـردوە کـە بـە هـۆی شـوێنکەوتنی بەرنامەکەیـەوە، سـەغڵەت بـن و هەسـت بـە ناڕەحەتیـی بکـەن.

سەغڵەت نەبوونی مرۆڤ بەهۆی بەرنامەی خواوەش، لەبەر چەند هۆکارێکە:

١- بەرنامەی خوا واقیع بینانە، سەرنجی مرۆڤ دەداو، هەموو داخوازییەکانی و پێکهاتەکانی دەبینێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٤﴾ ﴾**آل عمران**. واتە: خۆشویشتنی ئارەزووەکان بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە لە ئافرەتان و کوڕان و زێڕو زیوی کە ڵەکەکراوو ئەسپانی نیشانەدارکراوو ئاژەڵان و کشت وکاڵ ئەوەش بەهرەوەرگرتنی ژیانی دنیایە...

٢- بەرنامەی خوا زیاد لە توانا لەسەر کەس پێویست ناکات، ئەمەش لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ﴿٢٨٦﴾ ﴾، واتە: خوا ئەرك ناخاتە سەرهیچ کەس لە توانای خۆی بەدەر.

٣- هەموو کات و هەمیشە دەرگای تەوبەو پاکبوونەوە لەسەر پشتە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: بێگومان تەوبە وەرگرتن لەسەر خوا بەس تایبەتە بەوانەوەی بە نەزانیی خراپە دەکەن، دوایی زوو دەگەڕێنەوە، ئەوانە خوا لێیان خۆش دەبێ و خوا زانای کاربەجێیە.

ئنجـا مـادام دەرگای گەڕانـەوە بـۆ لای خوا هەمیشـە لەسـەر پشـتە، کەواتـە: مرۆڤ هەمیشـە دەرفەتـی هەیـە بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـواو، خـۆی لـە چڵـك و چەپـەری ئـەو گوناهانـەی کردوونـی، پـاك بکاتەوە.

سـەغڵەت نەبوونـی بەرنامـەی خـواش لـە ئاقـار ژیانـی ئینسـاندا، بەهـۆی شـەش هۆکارەوەیـە:

١- هەرچی بەرنامەی خوا فەرمانی پێکردوە، زگماک و ژیریی ساغیش پەسندی دەکات، خوا دەفەرموێ: ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ ﴿١٥٧﴾﴾ **الأعراف**، واتە: فەرمانیان پێدەکات بە هەرچی پەسندە، واتە: هەرچی عەقڵ پێی ئاشنایەو پەسندی دەکات، شەریعەتیش هەربەوە فەرمانیان پێدەکات.

٢- هەرچی بەرنامەی خوا پێشگیریی لێ دەکات و ڕێی لێ دەگرێ، زگماک و ژیریی ساغیش بەهەمان شێوە فڕێی دەدا: ﴿وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ ﴿١٥٧﴾﴾ **الأعراف**، واتە: هەرچی خراپەو ناپەسندە، لێیان قەدەغە دەکات.

ئنجـا ئاینێـك هەرچـی زگـماك و چـاك بـێ پەسـندی بـكات و، هەرچـی خـراپ بـێ ڕێـی لـێ بگـرێ، کەواتـە: هەرگیـز سـەغڵەت نابـێ لـە بـەردەم ڕێکخسـتنی ژیانـی مـرۆڤ و، هیدایەتـی تـاك و، ڕێکخسـتنی ژیانـی کۆمەڵگاکەیـدا، لێـرەدا خشـتەیەکم هێنـاوە، لـە دە (١٠) لـە چاکـەکان و، دە (١٠) لـە خراپـەکان پێکهاتـوە:

| چاکەکان | خراپەکان |
|---|---|
| ١- خوا بەیەکگرتن | ١- هاوبەش پەرستن |
| ٢- دادگەریی | ٢- ستەم و زوڵم |
| ٣- چاکەکاریی | ٣- خراپەکاریی |
| ٤- زانایی | ٤- نەزانیی |
| ٥- ئیخلاص | ٥- ڕیاکاریی |
| ٦- تێکۆشان لە ڕێی خوادا | ٦- ترسان لە جەنگ و تێکۆشان |
| ٧- تێگەیشتن و شارەزابوون لە ئایین | ٧- کەودەنیی و نەشارەزایی لە ئایین |

٨- ماڵ و سامان بەخشین لە ڕێی خوادا ٨- چرووکیی و ڕژدیی و نەبەخشین

٩- خۆڕازاندنەوە بە خەسڵەتە بەرزەکان ٩- خۆشاردنەوە لەژێر چڵکی خەسڵەتە بەدەکاندا

١٠- پاکسازیی و چاکسازیی کردن لە وڵاتدا ١٠- تێکدان و خراپەکاریی لە وڵاتدا.

٣- هەرچی بەرنامەی خوا حەڵاڵی کردوە، هەمووی بەچێژو سوود بەخشە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ١٥٧﴾ **الأعراف**، (**طيبات**)، کۆی (**طيبة**)یەو هەر شتێکە هەستەوەرەکانی مرۆڤ چێژی لێ وەردەگرن و سوودو کەڵکی هەیە بۆ مرۆڤ.

٤- بەرنامەی خوا هەرچی خراپەو زیانبەخشە قەدەغەی کردوە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ١٥٧﴾ **الأعراف**، هەرچی پیس و زیانبەخشە لێیان قەدەغە دەکات، (**خبائث**)، کۆی (**خبيثة**)یە، کە لە بنەڕەتی زمان و زاراوەی قورئاندا بە هەر شتێك دەگوترێ، نزم و بەد و زیانبەخش و چارە نەویستراو بێ، چ بەرهەست بێ و، چ مەعنەویی بێ.

٥- لە بەرنامەی خوادا بنچینەی گشتیی لە شتەکاندا، بریتیە لە حەڵاڵیی، وەك خوا دەفەرموێ:

أ- ﴿أَلَمۡ تَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَسۡبَغَ عَلَيۡكُمۡ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةٗ وَبَاطِنَةٗۗ ٢٠﴾ **لقمان**، واتە: ئایا نابینن خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوییدایە بۆ ڕام کردوون و، نیعمەتە ئاشکراو پەنهانەکانی خۆی بەسەردا ڕشتوون.

ب- هەروەها دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ٢٩﴾ **البقرة**، خوا ئەو زاتەیە هەرچی لە زەویدایە بۆ ئێوەی خوڵقاندە.

ج- پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: **{الْحَلاَلُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَالْحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللَّهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ} (أخرجه الترمذي: ١٧٢٦، وابن ماجه: ٢٣٣٦٧، والحاكم: ٧١١٥).**

واتە: حەڵاڵ ئەوەیە خوا لە كتێبەكەیدا حەڵاڵی كردووەو، حەڕام ئەوەیە خوا لە كتێبەكەیدا حەڕامی كردووەو، هەر شتێك لێی بێدەنگ بووە، لەو شتانەیە بۆ ئێوە وازی لێی هێناوەو لێی گەڕاوە.

٦- بەرنامەی خوا بریتیە لە چەند بنچینەیەكی گشتیی نەگۆڕو، چەند یاسایەكی فراوان و لێككێشراوە لە بواری حەڵاڵ و حەڕام و چاكەو خراپەكاندا، ئنجا ئەو بەرنامە فراوانە و گشتگیرە دەقەكانی زیاتر لە واتایەك هەڵدەگرن، هەرگیز لە بەردەم چارەسەری هیچ كێشەو گرفتێكی بەشەردا دەستەو ئەژنۆ دانانیشێ و دانامێنێ.

٧- جاری وا هەیە بەرنامەی خوا دەكرێتە ئامرازی یاریی و شمەكی بازرگانیی.

وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ **الأعراف**، واتە: ئەوانەی ئایینەكەیانیان كردۆتە هۆی كات پێ بەسەر بردن و یاریی و، ژیانی دنیا فریوی داون، ئەمڕۆش ئێمە لەبیریان دەكەین، وەك چۆن ئەوان دیداری ئەم ڕۆژەیان لە بیرچوو بوو، هەروەها بەهۆی ئەوەوەكە نكوولییان لە ئایەتەكانمان دەكرد.

هەڵبەتە كاتێك ئایینی خوا دەكرێتە ئامرازی یاریی و بازرگانیی و، مامەڵەی پێوە دەكرێ، ئەو كاتە هەر كەسێك عەقڵ و ئینسافی هەبێ، نابێ ئەو گلەییە ئاڕاستەی بەرنامەو ئایینی خوا بكات، چونكە بێگومان ئەوە خەتای ئەو كەسانەیە كە بازرگانیی پێدەكەن و كردوویانە بە ئامرازی یاریی، نەك خودی ئیسلام!

**بڕگەی سێیەم: پێنج ڕاستیی گەورەو گرنگ لە بارەی ئیسلامەوە:**

ڕاستیی یەكەم: ئایینی ئیسلام بە تۆبزیی بەسەر كەسدا ناسەپێنرێ.

خوا دەفەرمووێ: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ﴿٢٥٦﴾ ﴾ **البقرة**، تۆبزیكردن لە ئایین دا (لە سەپاندنی ئایین دا) نیە، بەدڵنیایی سەر ڕاستیی و بێمرادیی لێك جیابوونەوە.

ڕاستیی دووەم: ئایین دژی پەرتەوازەیی و تاقم تاقمێنەیە.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍ ١٥٩﴾الأنعام، واتە: بێگومان ئەوانەی (بەهۆی تاقم تاقمێنەوە) ئاینەکەیانیان پارچە پارچە کردوە، تۆ هیچ شتێکت لەگەڵ وان نیە، واتە: ئەوانە شوێنکەوتەی تۆ نین ئەی موحەممەد ﷺ! لەگەڵ تۆدا هیچ پەیوەندییەکیان نیە، هەمیشە ئایینی خوا بۆ یەکڕیزکردن و یەکڕەنگکردنی خەڵك هاتوە، بۆیە دژی پەرتەوازەیی و بەش بەشیی و شیرو تیر لەیەکدی سوین و سەنگەر لەیەکدی گرتنە، کە بە داخەوە ئەوەش حاڵەتی ئێستای زۆرێکی زۆر لە مسوڵمانانە، لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەیانەوە لە ئایینەکەیان.

ڕاستیی سێیەم: بەرنامەی خوا بە غەریبی هاتوەو بە غەریبییش دەگەڕێتەوە.

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إِنَّ الإِسْلاَمَ بَدَأَ غَرِيْبَاً وَسَيَعُودُ غَرِيْبَاً كَمَا بَدَأَ} (أخرجه مسلم:٣٩٠)، واتە: بێگومان ئایین بە غەریبیی سەری هەڵداوەو، هەروەك چۆن بە غەریبیی هاتوە، کە دەشگەڕێتەوە (بۆ مەیدانی ژیان) هەر بە غەریبیی دەگەڕێتەوە.

ئەم فەرموودەیە بۆیە هێناومە، زیاتر لەبەر ئەو چەمکە هەڵەیەی خەڵکێکی زۆر لەو فەرموودەیەیان وەرگرتوەو وەریدەگرن، پێیان وایە ئایین بە غەریبیی دەمرێتەوە، بەڵام حەدیسەکە دەفەرموێ: (وَسَيَعُودُ غَرِيْبَاً كَمَا بَدَأَ)، کەواتە: وەك چۆن دەستپێکەکەی بۆ هاتنە نێو مەیدان بوو، گەڕانەوەکەشی بۆ هاتنەوە نێو مەیدانی ژیانە.

ڕاستیی چوارەم: ئەو کۆمەڵەیەی بەرنامەی خوایان پێ بەڕێوە دەچێ، ڕازاوەن بە خەسڵەتە بەرزو پەسندەکان.

وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ

﴿لَآئِمٍ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾﴾ **المائدة**، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کەسێك لـە ئێـوە، لـە ئايينەكـەی هەڵگەڕێتـەوە، خـوا كۆمەڵێك دێنـێ (بـۆ ژيانـەوەو گێڕانـەوەی بەرنامەكـەی) خۆشـيدەوێن و خۆشـياندەوێ و، لەگـەڵ بـڕواداران نـەرم و نيـان و ميهرەبانـن و، لەسـەر كافـران ڕەق و بـە دەمـارن و، لەڕێـی خـوادا تێدەكۆشـن و، لـە گلەيـی و لۆمـەی هيـچ لۆمەكەرێـك ناترسـێن، ئـەوەش بەخششـی خوايـە دەيـدات بـە هـەر كەسێك حـەز بـكات و، خـواش (خاوەن دەسـتەڵاتی) فـراوان (٥) و زانايـە.

ڕاسـتيی پێنجـەم: بـۆ هێنانـەوەی ئيسـلام بۆكايـەكانی ژيـان و گـوزەران چـۆن و لـە كوێـوە دەسـت پێبكەيـن؟

بێگومـان ئـەو پرسـيارە كـە: ئێمـە بـۆ دينداريـی ڕێـك و ڕاسـت و، بـۆ هێنانـەوەی ئيسـلام بـۆ كايەكانـی ژيـان، لـە كوێـوە دەسـت پێبكەيـن؟ وەڵامەكـەی هـەر ئەوەيـە دەبـێ هـەر لـەو شـوێنەوە كـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەسـتی پێكـردوەو، ئـەو چـی كـردوە، ئێمـەش وابكەيـن.

چونكـە خوا دەفەرمـوێ: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾﴾ **الأحزاب**، بـە دڵنيايـی لـە پێغەمبـەری خـوادا ﷺ سـەر مەشـقيی و پێشـڕەوييەكی چـاك هەيـە بـۆ ئێـوە، بـۆ هـەر كەسێك بەتەمـای پاداشـتی خـواو ڕۆژی دواييـەو، زۆريـش يـادی خـوا دەكات.

كەواتـە: دەبـێ پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ نـەك تەنيـا لـە ئەنجامدانـی پێنـج درووشـمەكاندا، بەڵكـو لـە هەمـوو وردو درشـتی دينداريـی و دنياداريـيدا، بيكەيـن بـە پێشـڕەو و سـەر مەشـقی خۆمـان، ئـەو چـی كـردوەو چۆنـی كـردوە، كاتێك لەگەڵ كۆمەڵـگای نەفاميـی ڕۆژگاری خۆيـدا ڕووبـەڕوو بۆتـەوە، ئێمـەش بـە هەمـان شـێوە بكەيـن، چونكـە بەداخـەوە كۆمەڵـگا مسـوڵمانەكانی ئـەم ڕۆژگارەش، لـە زۆر ڕووەوە گيـرۆدەی نەفاميـی (**جاهلية**)ی خەسـت و خـۆڵ بوونـە.

**تەوەری دووەم: ئایین چۆن پەیدابووە؟**

لە دوو بڕگەدا ئەم باسە دەخەینە ڕوو، بە کورتیی:

**بڕگەی یەکەم:** وەڵامی بەرنامەی خوا بۆ پرسیاری: ئایین چۆن پەیدابووە؟

خوا ﷻ زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە کە ئایین بەو چەمك و واتایەی ئێستا باوە، واتە: ئایینێك کە خوا دایبەزاندوەو ناردوویەتی و هاتوەو، لە خواوە سەرچاوەی گرتوە، وەك پێشتریش لە سوورەتی **(الشورى)**دا، هێنامان: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰ أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴿١٣﴾﴾، واتە: لە ئایین بەرنامەیەکی بۆ داناون، هەمان شت کە نووحی پێ ڕاسپاردبوو، هەروەها ئەوەی بۆ لای تۆمان سرووش کردوە (ئەی موحەممەد!)و ئەوەی ئیبڕاهیم و مووساو عیسامان پێ ڕاسپاردبوون ... ئەمانە پێنج پێغەمبەرە سەرەکیی و ناودارەکانی نێو پێغەمبەرانن **(علیهم الصلاة والسلام)**، کە هەم لێرەدا خوا هەر پێنجیانی پێکەوە هێناون، هەم لە سوورەتی **(الأحزاب)**یشدا: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِنَ النَّبِيِّينَ مِيثَاقَهُمْ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٍ وَإِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا ﴿٧﴾﴾.

هەروەها لە سوورەتی **(النساء)**دا، خوا زۆر بە ڕوونیی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئایین و بەرنامەیەك کە پێغەمبەران **(علیهم الصلاة والسلام)** لە خواوە هێناویانە، لە خواوە سەرچاوەی گرتوەو، حیکمەتەکەیشیمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو، دەفەرموێ:

﴿إِنَّا أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ كَمَا أَوْحَيْنَا إِلَىٰ نُوحٍ وَالنَّبِيِّينَ مِن بَعْدِهِ وَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَارُونَ وَسُلَيْمَانَ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ وَكَلَّمَ اللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾، واتە: سرووش و

پەیامـــمان بـــۆ لای تـــۆ نـــارد (ئـــەی موحەممـــەد ﷺ!) وەك چـــۆن پەیامـــمان بـــۆ لای نـــووح و پێغەمبەرانـــی دوای وی نـــارد، هەروەهـــا پەیامـــمان بـــۆ لای ئیبراهیـــم و ئیســـماعیل و ئیســـحاق و یەعقـــووب و تیـــرەكان (كـــە لێـــی وەپـــاش كەوتبـــوون) و، عیســـاو ئەییـــووب و یونـــوس و هـــارِوون و ســـولەیمان نـــاردو، زەبووریشـــمان دا بـــە داوودو، پێغەمبەرانێكیشـــمان لـــە پێـــش تـــۆدا نـــاردوون كـــە بۆمـــان باســـكردووی و پێغەمبەرانێـــك كـــە بۆمـــان بـــاس نەكـــردووی و، خـــواش فەرمایشـــتی لەگـــەڵ مووســـادا كـــرد بـــە فەرمایشـــتكردن، ئـــەو پێغەمبەرانەمـــان نـــاردن، مـــوژدەدەرو ترســـێنەر بـــوون تاكـــو لـــە دوای هاتنـــی پێغەمبـــەران، خەڵـــك هیـــچ بەڵگەیەكیـــان نەمێنـــێ لەســـەر خـــواو، خـــواش زاڵـــی كاربەجێیـــە.

كەواتـــە: ســـەرچاوەی ئاییـــن بـــە چەمـــك و واتـــا خوایـــی و ئاســـمانییەكەی، بریتیـــە لـــە خـــوا ﷻ، ســـەرەتای پەیدابوونیشـــی دەگەڕێتـــەوە بـــۆ ســـەرەتای نیشـــتەجێ بوونـــی ئینســـان لەســـەر زەوی، چونكـــە هـــەر لـــە بـــەرە بەیانـــی مێـــژووەوە، خـــوا مرۆڤایەتیـــی فەرامـــۆش نەكـــردوەو لـــە تیشـــكی ڕێنوێنـــی بـــێ بەشـــی نەكـــردوەو، بـــە پێغەمبەرانـــی دا بەرنامـــەی ژیانـــی بـــۆ نـــاردوە.

برِگـەی دووەم: وەڵامـی ڕێچكـەو بیـردۆزەكان: بـۆ پرسـیاری ئاییـن چـۆن پەیدابـووە؟ لـەو كتێبـەدا كـە ئامـاژەم پێدا، باسـم كـردوەو، پێنج لـەو ڕێچكـەو بیردۆزانـەم هێناون، كـە هـەر كامێكیـان ویسـتوویەتی، بۆمـان تەفسـیر بـكات، ئاییـن چـۆن پەیدابـووە؟ بـەڵام لەبـەر دوو هـۆكاران شـوێنكەوتووانی ئـەو ڕێچكـەو بیردۆزانـە شایسـتەیی ئەوەیـان نیـە، وەڵامـی ئـەو پرسـیارە بدەنـەوە: ئایینـی خـوا چـۆن پەیـدا بـووە؟

**یەكەم:** هیچ كام لەو ڕێچكەو بیردۆزانە، لە ئاقار: چۆنیەتیی پەیدابوونی ئاییندا، هەڵوێستەكەیان لەگەڵ هەڵوێستی ئایین و بەرنامەی خوادا تێكناكاتەوە، چونكە ئەوان بەر لەوەی دەست بە لێكۆڵینەوە و بە ورد بوونەوە بكەن، پەیدابوونی ئایینیان لەو سەرچاوە ئاساییەی لێیەوە هاتوە، كە خوای بەرزو مەزنە، ڕەفز كردوە، واتە: ئەوانە قەناعەت هێنانی پێش بیركردنەوەیان هەبووە.

**دووەم:** ئەوانە چونکە تەنیا بڕوایان بە دیاردە ماددییەکان هەیە، بێگومان دینیش بنەماو سەرچاوەکەی مەعنەوییەو، لە پشت ماددەوەیەو میتافیزیکە، بۆیە هەر لە ڕێوە ڕێیان لە خۆیان گرتوە، کە بگەنە ئەنجامێکی ڕێك و ڕاست.

بیـردۆزەی یەکـەم: بیـردۆزەی ئابوورییـە، کـە ئەمـە زیاتـر مارکسـییەکان تەبەنییـان کـردوە، بۆیـە مارکـس و ئەنگڵـس لـەو بـارەوە لـە کتێبـی (مانیفیسـت)، واتـە: بەیانـی حیزبـی شـیوعیی دا، گوتوویانـە: (مێـژووی هەمـوو ئـەو کۆمەڵگایانـەی تاکـو ئێسـتا پەیدابـوون، بریتیـە لـە مێـژووی دژایەتیـی و ناکۆکیـی چینـەکان) ئـەوان هەمـوو شـتێکیان گەڕاندۆتـەوە بـۆ ناکۆکیـی و دژایەتیـی چینـەکان، کە لـە ئەنجامـی جیاوازیی ئابوورییـدا پەیدابـوون! بـەڵام لـە شـوێنی خـۆی لـە شـەش خـاڵان دا وەڵامێکـی ددان شـکێنی ئـەو بیردۆزەیەمـان داوەتـەوە.

بیـردۆزەی دووەم: بیـردۆزەی ترسـانە، گوایـە مـرۆڤ لـە ئەنجامـی ئـەوەدا کـە لـە دیـاردە و دیمەنـە سرووشـتییەکان ترسـاوە، پەنـای بردۆتـە بـەر ئـەوەی بڕوابێنـێ بـە کارسـازێك کـە لـە پشـت ئـەو دیـاردەو دیمەنانەوە یـە! بـەڵام ئێمـە ئەویشـمان لـە شـوێنی خـۆی لـە سـێ خاڵـدا، سـێ وەڵامـمان داونـەوەو پووچەڵـمان کردۆتـەوە.

بیـردۆزەی سـێیەم: بیـردۆزەی نەزانییـە، گوایـە مـرۆڤ هـەر کاتێـك شـتێکی بینیـوەو هۆکارەکـەی نەزانیـوە، بـەوە تەفسـیری کـردوە کـە خـوا لـە پشـتیەوەیەتی! بـەڵام ئێمـە ئـەو بیردۆزەیەشـمان لـە کتێبـی ناوبراودا، لـە چەند خاڵێکـدا پووچەڵـکردۆتەوە.

بیـردۆزەی چـوارەم: بیـردۆزەی جینسـییە، ئەمـەش زیاتـر (فرۆیـد) تەببەننیـی کـردوە، کـە دەڵـێ: هەمـوو دیاردەکانـی ژیانـی مـرۆڤ بەهـۆی غەریـزەی جینسـییەوەن! بـەڵام ئێمـە لـە شـوێنی خـۆی لـە یـازدە (١١) خاڵانـدا بەرپەچـی ئـەو بیردۆزەشـمان داوەتەوە.

بیـردۆزەی پێنجـەم: بریتیـە لـە بیـردۆزەی داخوازییـە دەروونیـی و کۆمەڵایەتییەکان، ئەمـەش زیاتـر دووڕکایـم زانـای کۆمەڵنـاس تەبەننیـی کـردوە، گوایـە: مـرۆڤ بـە هەمـوو شـتێکیەوە: ئاییـن، کلتـوورو فەرهەنـگ، ڕەوشـت، هونـەر کەسـایەتیی ...

وەك چۆن سابوونێك لە قاڵب دەدرێ، ئاوا كۆمەڵگا بەرهەمی دێنێ! بەڵام ئێمە بەرپەچی ئەم بیردۆزەیەشمان داوەتەوە لە سێ خاڵاندا. نەشمویست كاتی زۆر بەبەرپەرپدانەوەی ئەو بیردۆزانەوە بگرین، چونكە مەبەستم زیاتر خستنەڕووی هەڵوێستی نەیارو ناحەزانی ئایین بوو، لە بارەی چۆنیەتیی سەرهەڵدانیەوە.

## تەوەری سێیەم: ئایین بۆچی هاتوە؟

هەڵبەتە لە باسەكانی ڕابردوودا، بە تایبەت لە پێناسەی ئاییندا تاڕاددەیەك ڕوون بۆوە، ئایین بۆچی هاتوە، بەڵام لێرەش بە باشمزانی لە بیست و یەك **(٢١)** خاڵدا، بە كورتیی تیشك بخەینە سەر هۆكارو ئامانجی نێردرانی ئایین:

**یەكەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاكو مرۆڤ شێوازی ژیان گوزەران و جموجۆڵ و چالاكییەكانی، بە پێی زگماك **(فیطرة)**ی بێ و، لە نێوان جموجۆڵ و چالاكییەكانی و زگماكییدا، دژایەتیی و ناكۆكیی نەبێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ﴿٣٠﴾ ﴾**الروم**، واتە: ڕووی خۆت بەرانبەر بە ئایین ڕێك بكە، بە وازلێهێنەریی لە ناهەق و پووچ و بەرەو هەق گەڕاوەیی، هەمان زگماكە خوا خەڵكی لەسەر سرووشتاندوە، گۆڕین بۆ دروستكراوی خوا نیە، دوایی خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ ﴿٣٠﴾ ﴾**الروم**، ئا ئەوەش ئایینی ڕێك و ڕاستە.

كەواتە: ئایین و بەرنامەی خواو زگماك **(فطْرة)**ی ساغی مرۆڤ، دوو ڕووی ڕاستییەكن و، لەگەڵ یەك دا پێكەڵپێكن و جووتن.

**دووەم:** ئایین هاتوە تاكو جووڵەی مرۆڤ لەگەڵ جووڵەی گەردووندا یەك بێت، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴿٤٤﴾ ﴾**الإسراء**، واتە: ئاسمانەكان و زەویی و هەر كەسێك كە تیاندا هەیە، خوا بە پاك دەگرێ و ستایشی دەكات، كەواتە: جووڵەی مرۆڤیش دەبێ لەگەڵ ڕەوتی گەردووندا تێك بكاتەوە.

**سێیەم:** ئایین بۆیە هاتوە تاكو مرۆڤ تەنیا گەردنكەچیی بۆ خوا بكات و، نەبێتە كۆیلەو خزمەتكاری بت و صەنەم و شەیتان و **طاغووتەكان**، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ

بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ ﴿٣٦﴾ ﴾النحل، واتە: لە هەر کۆمەڵگایەکدا ڕەوانە کراوێکمان ناردوە، کە پێیان ڕابگەیەنێ: خواپەرستن و خۆتان لە طاغووت، (هەر پەرستراوێ جگە لە خوا) دووربگرن.

**چوارەم:** بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە، ئینسان بتوانێ بە شێوەیەکی ڕێك و ڕاست بژی، لە هەموو لایەنێکی ژیانیدا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾**التكوير**، واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان، بۆ هەر کامێك لە ئێوە بیەوێ ڕێك و ڕاست بێ، واتە: بیرو عەقڵی ڕاست بێ و، دڵی ڕاست بێ و، لەگەڵ خۆی و لەگەڵ خەڵك و لەگەڵ خوادا، ڕاست بێ.

**پێنجەم:** ئایین بۆ ئەوە نێردراوە کە مرۆڤ بەسەر شەیتاندا زاڵبێ و، ملکەچ و کۆیلەو ژێر دەست و بەردەستی نەبێ، وەك خوا لە سەرزمانی ئیبلیس فەرموویەتی: ﴿ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾**الحجر**، واتە: (ئیبلیس) گوتی: پەروەردگارم! چونکە منت بێمراد کرد، لە زەویدا - هەرچی گوناهە -بۆیان دەڕازێنمەوەو تێکڕایان بێمرادو سەرگەردان دەکەم، بێجگە لە بەندە ساغەکانت لە نێویان دا.

بەڵێ ئەوانەی بەندەی ساغی خوا بن، شەیتان زەفەریان پێ نابات.

**شەشەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاکو مرۆڤ بتوانێ لە ژیانیدا خۆشیی لە خۆی ببینێ و، سەربەرزو شادو بەختەوەر بێ و، تۆوی ئارامیی و ئاسوودەیی بە زەوی دڵ و دەروونی وەربێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾النحل، واتە: هەر کەسێك کردەوەی چاك بکات لە نێر یان مێ و بڕواداریش بێ، لە ژیانێکی خۆشدا دەیژیەنین و، بەپێی باشترینی ئەوەی دەیانکرد پاداشتی چاکەکانیان دەدەینەوە.

**حەوتەم:** ئایینی خوا بۆیە هاتوە، تاکو بەرەی مرۆڤ بکاتە یەکڕیزو، ڕەش و سپیی و سوورو بۆرو، تیرەو گەلانی جۆراو جۆر، لە ژێر سێبەری درووشمی هەرە بەرزی

خۆیدا بحەوێنێتەوەو کۆ بکاتە، کە بریتیە لە: (**لا إله إلا الله، محمَّدٌ رسول الله**)، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٩٢﴾ ﴾**الأنبياء**، ئەم کۆمەڵەی ئێوە یەك کۆمەڵە، منیش پەروەردگارتانم، ئنجا تەنیا بەندایەتیی بۆ من بکەن.

**هەشتەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە مرۆڤەکان لە دووبەرەکیی و پرژوبڵاویی و بێسەروبەریی، یەکدیی بوغزاندن و یەکدی گەوزاندن، قوتار بکات و بیانکاتە برای یەك و، دەستیان پێ لە گەردنی یەکدی بکات، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْۚ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ كُنتُمۡ أَعۡدَآءٗ فَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِكُمۡ فَأَصۡبَحۡتُم بِنِعۡمَتِهِۦٓ إِخۡوَٰنٗا ﴿١٠٣﴾ ﴾**آل عمران**.

**نۆیەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاکو مرۆڤەکان بتوانن بە دادگەرانە بژین و بەڕێوەبچن و، بەپێی بۆ لوان، وەك یەك و یەکسان بن و، هەموویان بە بێ جیاوازیی لە هەل و مەرجەکانی ژیاندا بەشداربن و، لە نیعمەتەکانی خوا بەهرەمەند بن، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ ﴿٢٥﴾ ﴾الحديد.

**دەیەم:** بەرنامەی خوا بۆیە هاتوە، تاکو لە خەڵکی بگەیەنێ: نەپلەو پایە، نەسامان و دارایی، نە ڕەگەزو ڕەچەڵەك، نەڕەنگ، نەزمان، نەبنەماڵە، نە هیچ شتێکی دیکەی لەو بابەتانە، تەرازووی هەڵسەنگاندن و سەنگی مەحەك نین، بۆ نرخاندنی بەندەکانە بەڵکو تەرازوو و پێوەر تەنیا پارێزکارییە، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ﴾**الحجرات**.

**یازدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە، کە مافە ڕەواو سرووشتییەکانی گەلان دابین بکات و، چارەنووس و قەوارەیان بپارێزێ و، هەر کەسە لە نشتیمان و خاك و زێدو ئاوی خۆیدا، ئازاد و سەربەخۆ بێ و، لە دەستدرێژیی بۆ سەر کران و، هەڵکوتانە سەر، پارێزراو بێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ ﴿١٣﴾ ﴾**الحجرات**، واتە: ئێوەمان گێڕاوە بە چەند نەتەوەو هۆزێك تاکو پێك ئاشنابن، یەکدی بناسن و پێکەوە هاوکاربن.

**دوازدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە کە باری کەوتووی چەوسێنراوان ڕاست بکاتەوەو، ڕەنجی دزراوو مافی خوراویان بۆ وەستێنێ و، تۆڵەیان بۆ لە **طاغووتان** وەکا، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ ٧٥﴾ **النساء**، واتە: بۆچی لە پێناوی خواو (ڕزگاریی) چەوساواندا ناجەنگن؟ کەواتە: ئەوانەی هەوڵدەدەن بۆ ڕزگارکردنی چەوساوان، وێڕای جوامێریی نواندن و ئازایەتیی و خەباتی ڕزگارییخوازیی، هاوکات کارێکیشیان کردوە خوای پەروەردگار لێیان ڕازی بێ.

**سێزدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاکو کۆشك و تەلار و بارەگای ستەمکاریی بڕووخێنێ و چەوسێنەرو زۆردارانی، خوا بە پەروەردگارزان و خۆبەزلگر بڕەتێنێ و، بنج و ڕیشەی چینایەتیی لە بیخەوە دەربێنێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ٢٣﴾ **الزخرف**، واتە: هەر بەم شێوەیە (ئەی موحەممەد ﷺ!) لە پێش تۆدا لە هیچ ئاوەدانییەکدا هیچ ترسێنەرێك و وریاکەرەوەیەکمان نەناردوە، مەگەر خۆشگوزەرانانی ئەو ئاوەدانییە گوتوویانە: ئێمە باب و باپیرانمان لەسەر ڕێیەك لێ هەڵکەوتوون و هەر لەسەر شوێنەوارانی و وانیشین و لە سەر ئەو ڕێیەش دەڕۆین.

هەمیشە ئەوانەی پارێزگاریی دەکەن لە ئایینی تێکدراوو پڕ لە ئەفسانە کراو، ئەو چینەن کە بەرژەوەندییان لەوە دایە واقیعی کۆمەڵگا چۆنە، بەو شێوەیە بمێنێتەوە، تاکو ئەوان بەزم و بازاڕی خۆیان لێ تێکنەچێ.

**چواردەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە، تاکو ئینسان بتوانێ لە چەنگ چەنگاڵی نەفس و ئارەزووەکانی ڕزگاری بێ، جڵەوی نەفسی هارو سەرکێشی بکەوێتە دەست عەقڵ و هۆشی، نەك بە پێچەوانەوە، وەك خوای تاك و پاك فەرموویەتی: ﴿وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ٤٠ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ٤١﴾ النازعات، واتە: بەڵام کەسێك لە ڕاوەستانی بەر بارەگای پەروەردگاری بترسێ (لە ڕۆژی دواییدا)و جڵەوگیریی نەفسی بکات لە ئارەزووە (ناڕەوایە)کانی ئەو کەسە جێگاو ڕێگای بەهەشتە.

**پازدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە، ڕەوشت و خووی بەرزو پەسند و لایەنی مەعنەویی و فریشتەیی ئینسان، گەشە پێ بکات و پەرە بستێنێ و، خوو خدەی بەدی شەیتانیی و ڕەفتاریی دزێوی ئاژەڵیی، ڕیشەکێش بکرێ و نەمێنێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو بارەوە دەفەرموێ: {**إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاَقِ**}، **(أخرجه الحاكم: ٤٢٢١، وقال: صحيح على شرط مسلم)**. واتە: تەنیا بۆ تەواوکردنی ڕەوشت و ئاکارە بەرزەکان نێردراوم.

هەروەها دایکمان خاتوون عایشە وەك لە (صحیح مسلم)[1]دا هاتوە، گوتوویەتی: {**كَانَ خُلُق النَّبِيّ الله ﷺ الْقُرْآن**}، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا ﷺ قورئان بوو، کەواتە: قورئانیش بۆ تەواوکردنی ڕەوشتە بەرزەکان هاتوە، چونکە خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾القلم.

**شازدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە، جڵەوی حوکم و سیاسەت بە دەستەوە بگرێ و، نەهێڵێ کەس لەو ڕێیەوە خۆی لەسەر خەڵکی بکاتە نۆو نیو بیانچەوسێنێ، بەواتایەکی دیکە: نەهێڵێ هیچکەس خۆی بکاتە پەرستراو و بڵێ: من بەرنامەی ژیان و گوزەرانتان بۆ دادەنێم و، پێویستە ئێوە داشی دامەبن بە دەستمەوەو، خاوەنی خۆتان نەبن و، لە ڕاست مندا هیچتان سەرتان پێوە نەبێ! وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾یوسف: واتە: حوکم تەنها هی خوایە، فەرمانی کردوە جگە لەو نەپەرستن، ئا ئەوەیە ئایینی ڕێك و ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

بەڵام **طاغووت** و حوکمڕانە سیفەت فیرعەونەکان، هەمیشە هەوڵیانداوە، ئەو حاڵەتەی بەسەر خەڵکدا سەپاندوویانە، بیهێڵنەوەو تێکنەچێ، وەك فیرعەون گوتوویەتی: ﴿ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾ غافر.

واتە: تەنیا ئەوەتان پێشان دەدەم کە خۆم دەیبینیم (پێم باشە) و تەنیا بەرەو ڕێی سەر ڕاستیی و بەمراد گەیشتنیشتان ڕێنمایی دەکەم.

---

(١) برقم: ٧٤٦.

**حەڤدەیەم:** ئایین بۆیە هاتوە، کاروباری ژیان ڕێك بخات و، هیچکەس لە ڕێی دەست بەسەردا گرتنی سامانە سرووشتییەکانەوە حوکمی خەڵك نەکات و، ئیرادەی کۆمەڵگا نەبێتە ڕژێمی سەرمایەداریی و چینایەتیی و، قڕو پڕیی نەیەتە کایەوەو، مرۆڤەکان بە یەکسانیی لە خێرو بێرەکانی سەر زەوی بەهرەمەندبن و، کەس بەری ڕەنجی کەس نەبات و، کەس مافی ڕەوای کەس نەخوات و، کەس خوێنی جەستەی کەس نەمژێ و، کەس بەرهەمی دەستی کەس نەدزێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾الرحمن، واتە: خوا زەوی داناوە بۆ خەڵك، هەروەها فەرموویەتی: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴿٢٩﴾ ﴾البقرة، واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە ئەوەی لە زەویدایە بۆ هەمووتانی خوڵقاندوە.

**هەژدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە، پەردەی سەر چاو و گوێی مرۆڤ لاببات و، لە ئەفسانەسازیی قوتاری بکات و وای لێ بکات، پەی بە ڕازو نهێنییەکانی بوونەوەر بەرێ و مەتەڵەکانی هەڵێنێ و تێبگات، وەك لە چەندان ئایەت دا خوای موتەعال ئەو ڕاستییەی خستۆتە ڕوو، بۆ وێنە: ﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴿٦﴾ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍۭ بَهِيجٍ ﴿٧﴾ تَبْصِرَةً وَذِكْرَىٰ لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٨﴾ ﴾ق.

**نۆزدەیەم:** ئایین بۆ ئەوە هاتوە، پەیوەندیی نێوان ژن و پیاوو چۆنیەتیی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکدیی دا، بەشێوەیەکی دادگەرانەو سرووشتییانە دیاریی بکات، بە جۆرێك کەسیان زیانبار نەبن، چونکە زیانبار بوونی هەر کامێکیان، ماڵوێرانیی و زیانباریی هەموو مرۆڤایەتیی تێدایە، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا ﴿١﴾ ﴾النساء، واتە: ئەی خەڵکینە! خۆتان لە (سزای) ئەو پەروەردگارەتان بپارێزن، کە لە یەك نەفس درووستی کردوون و، هەر لەویش هاوسەرەکەی دروستکردوە، واتە: لە هەمان جۆرە نەفسی وی و بەبێ جیاوازیی.

**بیستەم:** ئایین، ئیسلام بۆ ئەوە هاتوە، مرۆڤ وا لێ بکات، هەوڵبدات چەندەی پێی دەکرێ، سوودبەخشتر بێ بۆ خەڵکی، وەك دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ

﴿أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ﴾ الملك، (خوا) ئەوکەسەی مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەکەی باشترە! پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە فەرموویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ أَنْفَعُهُمْ لِلنَّاسِ}[1]. واتە: باشترینی خەڵك سوود بەخشترینیانە بۆ خەڵك.

**برگەی بیست و یەکەم و کۆتایی:** لە کۆتاییدا ئایین بۆ ئەوە هاتوە، مرۆڤ بەهۆیەوە لەم ژیانەدا خوای تاك لە خۆی ڕازیی بکات و، دۆزەخ لە خۆی بە دوور بکات و، بەهەشت لە خۆی حەڵاڵ بکات و، بەختەوەریی دابین بکات، ئایەتەکانی قورئانیش لەوبارەوە یەکجار زۆرن، کە لە ئەنجامی تەنیا بەندایەتیی بۆ خواو، تەنیا پەرستنی خواو، گرتنی بەرنامەو ڕێبازی خوای پەروەردگاردا، مرۆڤ هەم لە دنیادا بەختەوەر دەبێ، هەم لە دواڕۆژیشدا سەرفراز دەبێ، ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارە: ئایین بۆچی هاتوە؟ لێرەش دا کۆتایی بەو کورتە باسە دێنین لە بارەی ئایینی خواوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی بێ سنووری خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەرچی زیاتر قووڵترو فراوانتر لە ئایینی خوا تێدەگەن و، باشتر پێوەی پابەند دەبن، تاکو هەم لە دنیادا دڵخۆش بن، هەم لە ڕۆژی دواییش دا سەربەرزو سەرفراز بن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

---

(١ أخرجه الطبراني في الأوسط: ٥٧٨٧، والقضاعي: ١٢٩، وقال الألباني: حسن صحيح.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٤٤٢/١/٨) کۆچییـە، بەرانبـەر بـە: (٢٠٢٠/٨/٢٧) زاینیـی، لـە شـاری دێرینـی هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (المسـد)، سـەرەتاش پێناسـەو نێـوەڕۆکی ئـەو سـوورەتە بەپێـزە دەخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (المسد) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە موبارەکـە نـاوی هـەرە بـاوی بریتیـە لـە: (سـورة المسـد)، (المسـد) یـش یـانی: چـنراو، هۆنـراوە، شـتێك کـە دەهۆنرێتـەوەو دەچـنرێ و دەڕێـسرێ.

هەروەهـا چەنـد ناوێکـی دیکەشـی بـۆ بەکارهاتـون، وەك: (سـورة تبـت)، (سـورة أبي لهـب)، (سـورة لَهـب).

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە یەکدەنگیی زانایان ئەم سوورەتە مەککەییەوە، لەو بارەشەوە ئەم دەقە دێنین:

(عَـنْ عَبْدِاللـهِ بْـنِ عَبَّـاسٍ ﵄ قـال: أُنْزِلَـتْ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾، بِمَكَّـةَ) (أورده السـيوطي فِي الـدر المنثور: ج٨، ص٦٦٥، ونسبه لابن مردويه، وقـال: وأخـرج ابـن مردويـه عـن عبداللـه بـن الزبـير ﵄، عـن عائشـة ﵂ مثلـه، الإسـتيعاب فِي بيـان الأسـباب: ج٣، ص٥٧٥).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس ﷺ، گوتوویەتـی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ①﴾، لـە مەککـە دابەزیـوە، (**السیوطي**)، پاڵیداوەتـە لای (**إبـن مردویـە**)، کـە هەمان شـتی لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زوبەیـرو عائیشـەوە ﷺ هێنـاوە، ئەوانیـش گوتوویانـە: ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە لـە مەککـە دابەزیـوە .

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین دا:

ئـەم سـووڕەتە موبارەکـە لـە موصحـەف دا، ژمارەکـەی سـەدو یـازدە (**١١١**)یـەو، لـە دابەزینـدا ژمارەکـەی شـەش (٦)ە، پێـش سـووڕەتی (**التکویـر**)و، دوای سـووڕەتی (**الفاتحـة**) دابەزیـوە، بـەڵام پێـم وایـە، ئـەم ڕایـە ڕاسـت نیـە، چونکـە ناگونجـی لـە مـاوەی چـوار سـاڵان دا تەنیـا شـەش سـووڕەتی قورئـان دابەزیـن و دواتریـش - لـە بڕگـەی پێنجـەم دا - دەیهێنیـن کـە ئـەم سـووڕەتە لـە سـاڵی چـوارەم دا دابەزیـوە!

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکان:

ژمێرەرانـی ئایەتەکانـی قورئـان، لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن، کـە ژمـارەی ئایەتەکانی: پێنـج (٥)ە، زیاتـرو کەمتریـان نەگوتوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئـەم سـوڕەتە هەمـووی لـە بـارەی مـام و ئامۆژنـی پێغەمبەرەوەیـە ﷺ مامـی نـاوی (**عَبْدُالعُـزَّى**) بـووەو ئامۆژنـی نـاوی (**أَرْوَى**) بـووە، (**عَبْدُلْعُـزَّى**)، بـە (**أَبِي لهـب**) نـاودار بـووەو (**أَرْوَى**)ش، کـە ئامۆژنیەتـی و خوشـکی (**أبـو سُـفْيَان**)و، کچـی (**حَـرْب**)ە، بـە (**أُمُّ جَمِيـل**) نـاسراو بـووە.

گوتراویشـە: ئـەم سـووڕەتە لـە سـاڵی چـوارەم دا دابەزیـوە، دوای ئـەوەی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ سـێ سـاڵان بـە پەنهانیـی پەیامـی خـوای بـە خەڵـك

ڕاگەیانـدوە، سـاڵی چـوارەم خـوا فەرمانـی پێکـردوە: ﴿ فَٱصۡدَعۡ بِمَا تُؤۡمَرُ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٤﴾ ﴾الحجر، ئـەوەی فەرمانـت پێدەکـرێ بـە دەنگـی بـەرز ڕایبگەیەنـەو پشـت لـە هاوبـەش بـۆ خوادانـەران بکـەو، گوێیـان پـێ مـەدە.

پێغەمبەریـش ﷺ - وەك دوایـی لـە هـۆی هاتنەخـواردا باسـی دەکەیـن - خەڵکـی مەککـەی کـۆ کردۆتـەوەو پێـی فەرمـوون: مـن ڕەوانەکـراوی خـوام بـۆ لاتـان کـە بتانترسـێنم و ورياتـان بکەمـەوە، ئێـوە ڕۆژێکـی ترسـناکتان لـە بـەردەم دایـە، لـەو حاڵەتـەدا (مامـی ئەبـوو لەهـەب) قسـەی بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتـوە، هەروەهـا خێزانەکەشـی، واتـە: ئامۆژنـی پێغەمبەریـش ﷺ پێغەمبـەری خـوای ئەزیـەت داوە، چ بـە قسـە پێگوتـن و پڕوپاگەنـدەی خـراپ، چ بـە گوێـرەی هەندێـك لـە گێـڕدراوەکان کۆڵـە دڕکـی هێنـاوەو لەسـەر ڕێـی پێغەمبـەر ﷺ ڕۆی کـردوە[1]، تاکـو پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە بـە شـەو چـوو بـۆ نوێـژ، یـان بەیانیـان، لـە پێـی هەڵبچەقـن! خـواش سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى بەرگریـی لـە پێغەمبەرەکـەی خـۆی ﷺ کـردوەو ئـەم سـوورەتە موبارەکـەی دابەزانـدوە، کـە هـەم هەڕەشـەی سـەختی لـە ئەبـوو لەهـەبی مامـی پێغەمبـەرو، هـەم لـە ئامۆژنیشـی، ئـەڕوای کچـی حـەرب، کـردوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئێمە پێنج تایبەتمەندییمان لەم سوورەتە موبارەکەدا، کەوتوونە بەرچاو:

**١)**- لە هەموو بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ناوی (**عَبْدُالعُزَّى**) هاتوە، ئەویش بە شۆرەتەکەی (**أَبِي لَهَب**)ە، - چونکە لە ناوەکەی باوتربووە - لە نێو هەموو کافراندا تەنیا ناوی وی لە قورئان دا تۆمارکراوە، هەروەك لە نێو هەموو هاوەڵان دا تەنیا ناوی (**زید**) خوا لێی ڕازی بێ، هاتوە، (زەیدی کوڕی حاریسە).

---

(١) ڕۆی کردوە: هەڵیڕشتوە بە پڕژوبڵاویی.

٢)- ڕستەی: ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ ﴾، واتە : هەردوو دەستی ئەبی لەهەب لە بەین بچن و، لە بەینیش چوو، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە .

٣)- ڕستەی: ﴿ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ٣ ﴾، لەمەودوا دەسووتێنرێ بە ئاگرێکی خاوەن بڵێسە، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

٤)- ڕستەی: ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ٤ ﴾، ژنەکەشی هەڵگری کۆڵەدار دەبێ، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە .

٥)- ڕستەی: ﴿ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ٥ ﴾، لە گەردنیندا پەتێکی هۆنراوە هەیە، پەتێکی هۆنراوە لە پووشی دا، خورما، یان لە هەر شتێکی دیکە کە چنراوەو هۆنراوە، تەنیا لەم سووڕەتەدا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمە کۆی پێنج ئایەتەکەی موبارەکەی ئەم سووڕەتە، دەکەین بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە موبارەکە، بریتیە لە بەرگرییکردن و لەسەر کردنەوەی خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ لە بەرامبەر مامی و ئامۆژنی دا.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە لووتکەی بەرزی ڕەوشت و ئەدەبی جواندا بووە، کاتێك مامی قسەی پێ گوتوەو، ئامۆژنی ئەزیەتی داوەو چقڵ و دڕکی لە ڕێدا ڕۆکردوون، هەروەها قسەی ناخۆشی پێ گوتوون، وەك دواتر لە هۆی هاتنە خوارەوەدا باسی دەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ بە شایستەی نەزانیوە خۆی وەڵامیان بداتەوە، خواش ﷻ لە جیاتی وی، بەرگریی لە پێغەمبەرەکەی خۆی کردوە، فەرموویەتی:

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ①﴾، لە وەڵامی ئەو قسەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەڵکی مەککەی کۆ کردەوەو فەرمووی: ئایا ئەگەر بڵێم: سوپایەك لە دامێن ئەو چیایە خۆی پەنا داوەو، دەیەوێ بەسەرتاندا بدات و شەبەیخۆنتان بکاتە سەر، بڕوام پێ دەکەن؟

گوتیان: بەڵێ، درۆمان لێ نەبیستووی، فەرمووی: دەجا ئاگادارتان دەکەمەوە لە ئازارو سزایەکی بە ئێش، کە چاوەڕێتان دەکات، ئەگەر لەسەر ئەو کوفرو شیرکەی ئێستا لە سەرینی، بمێننەوە، مامیشی (ئەبوو لەهەب) پێی گوت: (**تَبًّا لَكَ سَائِرَ اليَومِ، أَلِهَذا جَمَعْتَنَا؟**)، ئەمڕۆ لە بەین بچی مردن بۆ تۆ، ئایا بەس بۆ ئەوە کۆت کردبووینەوە؟

خواش فەرمووی: ﴿تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ①﴾، هەردوو دەستی ئەبوو لەهەب، لە بەین بچن، لەبەینیش چوو.

﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ۝٢ ﴾، نەماڵ و سامانەکەی سوودی پێ گەیاندو نە ئەوەی وەدەستی هێنا، ماڵ سامانەکەی ئەوە بوو کە هەیبوو، ئەوەی وەدەستی هێناوە، ئەو ماڵ و سامانەی بووە کاری پێکردووە و گێڕاویەتی بۆ ئەوەی بەرهەمی بێ.

یاخود: ﴿ وَمَا كَسَبَ ۝٢ ﴾، واتە: کوڕو کچانی سوودیان پێ نەگەیاندوە، یان ئەو کردەوانەی وەدەستی هێناون لە دژایەتیی پێغەمبەری خوادا ﷺ سوودیان پێ نەگەیاندو، بە هیچ ئاکامێکیان نەگەیاند، بگرە لە دنیاداو لە دوارۆژیشدا، بۆی بوون هۆکاری سزاو جەزرەبەی سەختی خوا.

﴿ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ۝٣ ﴾، بە دڵنیاییەوە لەمەودا دەخرێتە نێو ئاگرێکی خاوەن کڵپەو بڵێسەوە.

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ۝٤ ﴾، ژنەکەشی هەڵگری کۆڵەدارە، وەك چۆن لە دنیادا کۆڵە چقڵ و دڕکی هەڵدەگرتن بۆ سەر ڕێی پێغەمبەری خواﷺ و بڵاوی دەکردنەوە، لە دوارۆژیشدا لە دۆزەخدا کۆڵەدارو چیلکە هەڵدەگرێ.

﴿ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ۝٥ ﴾، لە گەردنیدا پەتێکی هۆنراوە هەیە، لە پووشی دار خورما، یان لە چەرم، یان لە هەر شتێکی دیکە کە لێی دەهۆنرێتەوەو دەچنرێ، لە جیاتی ملوانکەی زێڕ کە لە دنیادا خۆی پێ ڕازاندۆتەوە، لە ڕۆژی دواییدا لە دۆزەخدا، پەتێك گوریسێك لە پووشی دار خورمای، لەگەردن دەکرێ و سزا دەدرێ.

واتایەکی دیکەشی هەیە کە مەبەستی پێ ئەوەیە: لە دنیادا وەك چۆن کەسێك داران دێنی و ئاگریان پێ خۆش دەکات، ئەویش هەر ئاگری دووبەرەکیی و دوژمنایەتیی لە نێوان مێردەکەی (ئەبوو لەهەب)و، پێغەمبەری خوا ﷺدا، خۆش دەکردو، هەر خەریکی قسە هێنان و بردن بوو، فیتنەیی دەکرد.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾﴾

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. هەردوو دەستی ئەبوو لەهەب لە بەین بچن (و بەبڕین بچن) و فەوتاش ﴿١﴾ سامانەکەی و ئەوەی وەدەستی هێنابوو، (هیچ دادی نەداو) سوودی پێنەگەیاند ﴿٢﴾ بە دڵنیایی بە ئاگرێکی خاوەن کڵپەو بڵێسە دەسووتێ (و سزا دەدرێ) ﴿٣﴾ (ژنەکەشی بە هەمان شێوە سزا دەدرێ لە حاڵەتێکدا) هەڵگری کۆڵە دارێکە ﴿٤﴾ پەتێکی لە پووشی دار خورما هۆندراوەی لە مل دایە (لە دۆزەخدا) ﴿٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ): واتە: هەردوو دەستی ئەبی لەهەب لە بەین بچن، (التَّبُّ وَالتَّبَابُ: الإِسْتِمْرَارُ فِي الخُسْرَانِ)، (تَبّ وتَبَاب): بریتیە لە بەردەوام بوون لە زیانبارییدا، کەواتە: کە دەفەرموێ: (وَتَبَّ : أي اسْتَمَرَّ فِي خُسْرَانِهِ)، بەردەوامیش بوو لە زیانبارییدا .

( مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ): سامانەکەی سوودی پێنەگەیاندو، دادی نەداو، ئەوەش کە وەدەستی هێنا، (أَغْنَى عَنْهُ كَذَا أي: كَفَاهُ)، واتە: ئەو شتە

بۆ ئەو بەس بوو، دادی دا، بە کەڵکی هات و کەلێنی بۆ گرت، (وَمَا كَسَبَ)، ئەوەش کە وەدەستی هێنا بوو، چ ماڵ و سامانی وەدەستیهێنراو بووبێ، بە هۆی بازرگانیی و هەڵش و وێلش و ئاڵوگۆڕی کەسابەتەوە، چ مەبەست پێی ئەو کردەوە خراپانەی بێ، کە وەدەستی دەهێنان، کە بریتی بوون لە دژایەتیی کردنی پێغەمبەری خاتەم ﷺو، پەیامی خوا، چ مەبەست کوڕو کچانی بێ، کە وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ داهاتوە: (وَإِنَّ أَوْلَادَكُم مِنْ كَسْبِكُم) ڕۆڵەکانتان لە وەدەستهێنراوتانن.

(سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ): (الصَّلي: الإيقَاد بالنَّار، وَصَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُهَا، وَهِيَ مَصْلِيَّة)، (الصَّلي): سووتاندنە بە ئاگر، (صَلَيْتُ الشَّاةَ: شَوَيْتُهَا)، واتە: مەڕەکەم برژاند، (وَهِيَ مَصْلِيَّةٌ)، واتە: ئەو برژێنراوە، (صَلِي): بریتی نیە لە تەنیا برژاندن و سووتاندن، بەڵکو بریتیە لە جۆرێکی تایبەت لە سووتاندن، ئەویش ئەوەیە لە هەر چوارلاوە گەرمیی بگاتێ، بێ ئەوەی بسووتێ، بەڵکو بپیشێ، یان ببرژێ، ئەوەش جۆرە سووتانێکی تایبەتە.

(حَمَّالَةَ): ڕێژگەی زێدەڕۆیی (حَامِلَة)یە، (حَامِلة)، واتە: هەڵگر، لە کۆڵنەر، ﴿حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ﴾، واتە: زۆرداران لە کۆڵێ دەنێ، زۆر هەڵگری دارانەو لە کۆڵیان دەنێ، (الحَطَبُ: مَا يُعَدُّ للإيقَادِ، حَطَبْتُ حَطَبَاً وَاحْتَطَبْتُ)، (حَطَبْ): بریتیە لەوەی دادەنرێ و ئامادە دەکرێ بۆ سووتاندن، دەگوترێ: (حَطَبْتُ حَطَبَاً وَاحْتَطَبْتُ)، واتە: دارمکردن و دارو سووتەمەنییم ئامادەکرد.

(فِي جِيدِهَا): لە ملیدا، لە گەردنی دا، (الجِيدُ: العُنُقُ وَمُقَدَّمُهُ، مَوْضِعُ القِلَادَةِ، وَالجَمْعُ الأَجْيَادُ)، (جِيد): بریتیە لە گەردن، مل، (مُقَدَّمُهُ)، پێشەوەی گەردن، لای پێشەوەی پێی دەگوترێ: (جيد)، ئەو شوێنەی ملوانکەی تێ دەکرێ، ئافرەتان عادەتیان وایە، گەردەنبەندو ملوانکە لە ملیان دەکەن، (جيد)، بە (أَجياد)، کۆدەکرێتەوە، هەندێك گوتوویانە: (جيد)، تەنیا بە مل و گەردنی ئافرەت دەگوترێ، بەڵام هی پیاوو ئافرەت هەردووکیان، (عُنُق)ی پێ دەگوترێ .

(حَبۡلٞ): پەت و گوریسە، هەر شتێکە شتی پێ بپێچرێ و ببەسترێ.

(مَّسَدِۭ): (المَسَدُ: لِيفٌ يُتَّخَذُ مِنْ جَرِيدِ النَّخْلِ، أي: مِنْ غُصْنِهِ فَيُمْسَدُ، أي: يُفْتَلُ، وَامْرَأَةٌ مَمْسُودَةٌ: مَمْشُوقَةٌ، حَسَنَةُ القِوَامِ، قَلِيلَةُ اللَّحْمِ)، (مَسَد): بریتیە لە شتێك كە لە پووشی دار خورما، هۆنراوە، لە لقەكانی ئەو پووشەی دەریدەكەن (فَيُمْسَدُ)، واتە: دەهۆنرێ و دەچنرێ، لە زمانی عەرەبییدا دەگوترێ: (امْرَأَةٌ مَمْسُودَةٌ: مَمْشُوقَةٌ)، واتە: ئافرەتێك قەدی باریك بێ و، قەدو قیافەی جوان بێ و بەزو چەوریی كەم بێ.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم سوورەتە

لەو بارەوە دوو گێڕدراوە دێنین، كە لە ڕووی سەنەدەوە لە وانی دیكە بەهێزترن:

### گێردراوەی یەكەم:

(عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: مَا كَانَ أَبُو لَهب إِلَّا من كُفّار قُرَيْش، مَا هُوَ حَتَّى خرج من الشّعب حِين تمالأت قُرَيْش، حَتَّى حصرونا فِي الشّعب وظاهرهم، فَلَمَّا خرج أَبُو لَهب من الشّعب وظاهرهم، لَقِي هنداً بنت عتبَة بن ربيعَة حِين فَارق قومه، فَقَالَ: يَا ابْنة عُتْبَة! هَل نَصَرْتُ اللاّت والعزّى؟ قَالَت: نعم، فجزاك الله خيراً يَا أَبَا عُتْبَة، قَالَ: إِن مُحَمَّدًا يَعِدُنا أَشْيَاء لَا نرَاهَا كائنة، يَزْعُم أَنَّهَا كائنة بَعْدَ الْمَوْت، فَمَا ذَاك وصنع فِي يَدِيه، ثمَّ نفخ فِي يَدَيْهِ، ثمَّ قَالَ: تَبًّا لَكمَا مَا أَرَى فِيْكُمَا شَيْئاً مِمَّا يَقُول مُحَمَّد، فَنزَلَتْ: ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾، قَالَ ابْن عَبَّاس: فَحُصِرْنَا فِي الشِّعَبِ ثَلاَثَ سِنِين وَقَطعُوا عَنَّا الْمِيرَةَ، حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لِيَخْرُج مِنَّا بِالنَّفَقَةِ، فَمَا يُبَايَعُ حَتَّى يَرْجِعَ، حَتَّى هَلَكَ فِيْنَا مَنْ هَلَك} (ذَكَرَهُ السيوطي فِي الدر المنثور: ج٨، ص٦٦٥، والإستيعاب فِي بيان الأسباب: ج٣، ص٥٧٥).

واتـە: ئیبنـو عەبـاس ﵄ دەڵـێ: ئەبـوو لەهـەب، تەنیا یەکێـك بـوو لـە بێبڕوایانی قوڕەیـش، ئـەو لەگەڵـمان بـوو لـە شێوەکانی ئەبـوو تاڵیبدا، کاتێـك هـۆزی قوڕەیـش (لـە دژی ئیسـلام و مسـوڵمانان) دابڕینیـان ڕاگەیاند (دابڕینی ئابووریـی و کۆمەڵایەتیی و سیاسـییان ڕاگەیانـد)، ئێمەیـان لـە شـیوەکانی ئەبـوو تاڵیبـدا، گۆشـەگیر کـردو ئابڵووقـەدا (ئەبـوو لەهەبیـش سـەرەتا لەگەڵیـان چـووە، وەك خـزم و قـەوم) دوایـی هاتنـەدەرەوە پشـتگیریی کافرەکانـی قوڕەیشـی کـرد (لـە دژی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و مسـوڵمانانێك کـە لـە خزمەتـی دابـوون و، هەندێـك لـە خزمانیشـی لـە بەنوو هاشـیم، وەك دەمارگیریـی خزمایەتیـی لەگەڵـی چووبوونـە شـیوەکانی ئەبـوو تاڵیبـەوە)، ئنجا کاتێـك ئەبـوو لەهـەب دەرچـوو گەیشـتە هینـد کچـی عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە (واتـە: هاوسـەری ئەبـوو سـوفیان، کـە کچـی عوتبـەی کـوڕی ڕەبیعـە بـووە) کاتێـك ئەبـوو لەهـەب وازی لـە خەڵکەکـەی هێنـا (واتـە: وازی لـە بەنـی هاشـیم هێنـا) گوتـی: ئـەی کچـی عوتبـە! ئایـا لات و عـوززام سەرخسـتن؟ گوتـی: بەڵـێ، خـوا پاداشـتت بداتـەوە ئـەی بابـی عوتبـە، ئنجـا ئەبـوو لەهـەب، گوتـی: موحەممـەد ﷺ بەڵێنـی هەنـدێ شـتمان پێـدەدا، پێـمان وانیـە بێنـەدی، پێـی وایـە لـە دوای مـردن ئـەو شـتانە پەیدادەبـن، بـەڵام وانیـە، دوایـی هـەردووك دەسـتی خـۆی سـووڕاندن ئنجا فـووی لـە هـەردوو دەسـتی کـردو گوتـی: لەبەیـن بچـن هـەردووك دەسـتەکانم، هیـچ شـتێك لـەوەی موحەممـەد ﷺ دەیڵـێ، نابینـم هاتبێتـە تێتـان! ئیـدی بـەو بۆنـەوە خـوا ئـەم سـووڕەتە موبارەکـەی دابەزانـد: ﴿ تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ١ ﴾، هـەردوو دەسـتی (ئـەبی لەهـەب) لـە بەیـن بچـن (وەك بـۆ خۆشـی دوعـای لـە خـۆی کـردوە) لـە بەینیـش چـوو.

عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس دەڵـێ: ئێمەیـان سـێ سـاڵان لـە شـیوەکانی ئەبـوو تاڵیبدائابڵووقـەدا، خواردنیـان لێگرتینـەوە، هەتا پیاومـان دەردەچوو، سـامانێکی لەگەڵ خۆی دەبـرد، کەچـی دەگەڕایـەوەو هیچـی پـێ نەدەفرۆشرا! سـەرەنجام هەندێـك خەڵکمان لـە شـیوەکانی ئەبـوو تاڵیبـدا (بـە هـۆی نەبـوونی خـۆراك و برسـیەتییەوە) لـێ مـردن.

## گێڕدراوەی دووەم:

{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ إِلَى البَطْحَاءِ، فَصَعِدَ إِلَى الجَبَلِ، فَنَادَى: «يَا صَبَاحَاهْ» فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ، فَقَالَ: «أَرَأَيْتُمْ إِنْ حَدَّثْتُكُمْ أَنَّ العَدُوَّ مُصَبِّحُكُمْ أَوْ مُمَسِّيكُمْ، أَكُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟» قَالُوا: نَعَمْ، قَالَ: «فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ» فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا! تَبًّا لَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾}، (أخرجه البخاري: ١٣٩٤، ٣٣٢٥، ٤٨٠١، ٤٩٧١، ٤٩٧٢، ٤٩٧٣، ومسلم: ٣٥٥، ٣٥٦).

واتە: ئیبنو عەبباس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەرچوو بۆ (بطحاء)، [شوێنێك لە شوێنەكانی مەككە] سەركەوتە سەر چیایەكەو بانگی كرد: «يَا صَبَاحَاهْ»، ئەمە درووشمی عەرەبەكان بووە، ئەگەر مەترسییەك ڕووی تێكردبن، كەسێكیان چۆتە شوێنێكی بەرزو گوتوویەتی: «يَا صَبَاحَاهْ» واتە: شەبەیخوونتان كرایە سەر] ئیدی قوڕەیشییەكان لێی كۆبوونەوە، ئەویش فەرمووی: ئەگەر پێتان بڵێم: دوژمن لە بەرەبەیان دا هێرشتان دەكاتە سەر، یاخود لە ئێوارەدا هێرشتان دەكاتە سەر، بە ڕاستم دادەنێن و بڕوام پێدەكەن؟ گوتیان: بەڵێ، گوتی: دەجا من ترسێنەرو وشیاركەرەوەی ئێوەم، لەبەردەم ئازارو سزایەكی سەختدا، واتە: قیامەت و ڕۆژی سزاو پاداشت چاوەڕێتانە، ئەگەر لەسەر كوفرو شیرك بمێننەوە، (ئەبی لەهەب)یش، بە پێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئەمڕۆ لە بەین بچی، هەر بۆ ئەمە ئێمەت كۆكردبۆوە؟ ئیدی لەو بارەوە ئەم سووڕەتە موبارەكە دابەزی.

وەك وەڵامدانەوەی (ئەبی لەهەب)و، بەرگرییكردنی خوا لە پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، مەبەسـتیش لـەوە بـەڵای کەمـەوە چوارشـتە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەخشەر دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ①﴾، هـەردوو دەسـتی ئـەبی لەهـەب لـە بەیـن بچـن و، لەبەینیـش چـوو. وەك لـە هـۆی هاتنـە خـوارەوە باسـمان کـرد، ئەمـە وەڵامـی قسـەی (ئەبـوو لەهـەب)ە، کـە ئـاوای بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتـوە، بـە پێـی گێڕدراوەیـەك، یاخـود وای بـە خـۆی گوتـوە وەك گاڵتەپێکـردنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، گوتوویـەتی: موحەممـەد هەواڵـمان پێـدەدا بـە هەندێـك شـت کـە دوای مـردن دێتـە دەسـتمان، دەسـتەکانم! کـوا لـە بەین بچـن، لـەوەی موحەممەد دەیڵـێ هیچتـان نەهاتۆتـە نێـو، هیچتـان نەهاتۆتەتـێ! خـواش دەفەرمـوێ: (ئەبـوو لەهـەب)، هـەردوو دەسـتی لەبەیـن بچـن و لەبەینیـش چـوو، پێشـتر گوتمـان (تَبّ) بـە مانـای لـە بەیـن چـوون و زیانباربـوون و فەوتانـە.

﴿مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ﴾، سـامانەکەی سـوودی پـێ نەگەیانـد، بـە کەڵکـی نەهـات، کەلێنـی بـۆ نەگـرت، بـەڵای خـوا لێـی دوورنەخستەوە، ﴿وَمَا كَسَبَ ②﴾، هەروەهـا ئـەوەی وەدەسـتی هێنابـوو، چ لـە مـاڵ و سـامانێك کـە وەدەسـتی دەهێنـا بەهـۆی بازرگانیـی و هەڵـش و وێڵشـی مامەڵـەوە، چ کـوڕو

کچانێك کە وەدەستی هێنابوون، چ مەبەست پێی ئەو کردەوە خراپانە بێ کە وەدەستی دەهێنان لە دژایەتیکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەو پەیامە خواییەی پێیدا نێردراوە.

﴿ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ۝٣ ﴾، بە دڵنیایی لەمەودوا بە ئاگرێکی بڵێسەدار دەسووتێ، (صلي)، جۆرێکی تایبەتە لە سووتێنران، کە پیشێنران و برژێنرانە لە هەموو لاوە، ﴿ سَيَصۡلَىٰ ﴾، خوێندراویشەتەوە: (سَيُصْلَى)، هەروەها خوێندراویشەتەوە (سَيُصَلَّى)، واتە: دەبرژێنرێ و دەپیشێنرێ، هەروەك چۆن (أبي لَهب)یش، بە زۆریی خوێندراوەتەوە: (أبي لَهَب)، بەڵام خوێندراویشەتەوە: (أبي لَهْب)، واتە: بە زەنە (سكون)ی (هـ)ەکە، خوا دەفەرموێ: بە دڵنیایی لەمەودوا دەچێتە ئاگرێکی خاوەن بڵێسەوەو خاوەن کڵپەوەو پێی دەپیشتێ و دەبرژێ، (سين)ی، (سَيَصْلَى)، لێرەدا بۆ ساغکردنەوەو دڵنیاکردنەوەیە.

﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ۝٤ ﴾، ژنەکەشی زۆر هەڵگری داران دەبێ، (حَطَب)، ئەو دارانەن کۆدەکرێنەوە بۆ سووتاندن، ﴿ حَمَّالَةَ ﴾، ڕێژگەی زێدەڕۆیی (حَامِلَة)یە، واتە: هەڵگر، بەڵام: ﴿ حَمَّالَةَ ﴾، واتە: زۆر هەڵگر، داران زۆر هەڵدەگرێ، کۆڵە دارو چیلکە هەڵدەگرێ، ئایا ئەمە مەبەست پێی وەسفکردنیەتی کە لە دنیادا کۆڵە دارو چیلکەی هەڵگرتوون، چقڵ و دڕکی هەڵگرتوون بۆ ڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ، یاخود مەبەست پێی سزای ڕۆژی دوایەتی؟ هەروەها لە دنیاش دا: ئایا مەبەستی پێ ئەوەیە: کۆڵە چقڵ و دڕکی هەڵگرتوون بۆ ڕێی پێغەمبەر ﷺ، یاخود مەبەست ئەوەیە کە فیتنەچیی و ئاژاوەگێڕ بووە؟ وەك یەکێك بە یەکێك دەڵێ: فڵانکەس بەنزین بە ئاگرەکەدا دەکات، هەردوو واتایەکەی هەن.

﴿ فِي جِيدِهَا حَبۡلٞ مِّن مَّسَدِۭ ۝٥ ﴾، لە گەردن وملیدا لە جیاتی گۆبەرۆك و ملوانکەی زێڕو زیو، کە لە دنیادا خۆی پێ دەڕازاندنەوە، پەتێکی هۆنراو هەیە،

پەتێك كە لە پووشی دار خورما هۆنراوە، یاخود لە چەرم هۆنراوە، یاخود لە خوریی و تووك هۆنراوە، یاخود لە دارو درەختی دیكە، چنراوەو هۆنراوە، بەڵام زۆربەیان گوتوویانە: **(مسد)**، مەبەست پێی: **(لِیفُ النَّخْلِ)**، پووشی دارخورمایە.

## مەسەلە گرنگەکان

هەموو سوورەتەکە لە یەك مەسەلەدا شیدەکەینەوە:

**هەڕەشەکردنی خوا ﷻ لە ئەبی لەهەب و، ژنەکەی، مام و ئامۆژنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە لە نێوچوون و برژاێندران بە ئاگری بڵێسەداری دۆزەخ و، کۆڵەدار هەڵگرتنی ژنەکەی و، پەتێکی لە پووشی خورما هۆنراو لە مل کردنی:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴿٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ﴾، هەردووك دەستی ئەبوو لەهەب لەبەین بچن، لە بەینیش چوو، (لَهَب) خوێندراوەتەوەش: (لَهْب)، بۆچی بە مامی پێغەمبەر ﷺ گوتراوە: ئەبوو لەهەب؟ گوتراوە:

أ- لەبەر ئەوەی پیاوێکی سوورو سپیی بووەو، دەم و چاوی وەك بڵێسە ئاگریان لێ بەرزبێتەوە، ئاوا سوورو سپیی و درەوشاوە بووە، یانی: ڕواڵەتی جوان، بەڵام نێوەڕۆکی ناشیرین و وێران بووە.

ب- هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: بۆیە خوا ﷻ ناوەکەی نەهێناوە کە ناوەکەی (**عبدالعُزّى**)یە، چونکە نەیویستوە ناوی هیچ بت و صەنەمێك لە قورئاندا بێنێ، کاتێك بەندەیەکی خوای پاڵ دەدرێتە لا، (**عبدالعُزَّى**)، واتە: بەندەی عوززا، بێگومانیش (**عُزّى**) ناوی پەرستراوێکی مێینە بووەو، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: مێینە (**مؤنث**)ی (**عزيز**) یان (**أعزّ**)ە، هەرچۆنیش بێ خوا ﷻ نەیویستوە لە فەرمایشتەکەی خۆیدا ناوی مامی

پێغەمبەر بێنێ، کە بریتی بووە لە پاڵدانی بەندەیەکی خوا بۆ لای بت و صەنەمێك و بە ئەبوو لەهەب هێناویەتی و، ئەو نازناوەش گونجاوە لەگەڵ ئەو ئاگرە بڵێسەدارەدا کە پێی سزادەدرێ.

٢)- ﴿ مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴾، سامانەکەی و ئەوەی وەدەستی هێنابوو هیچ سوودی پێنەگەیاند، یانی: هیچ سوودی پێنەگەیاند کە لە دنیادا سەری بخات، یاخود: هیچ سوودی پێنەگەیاند کە لە ڕۆژی دواییدا، سزای خوای لێ وەدووربخات، ﴿ وَمَا كَسَبَ ﴾، مانایەکەی سێ ئەگەری هەن:

أ- مەبەست ماڵ و سامانێکە کە وەدەستی هێناوە.

ب- مەبەست پێی منداڵەکاننی ئەو کوڕو کچانەی وەدەستی هێناون، پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ، وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ**}، (**أخرجه الترمذي: ١٣٥٨، وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيح**)، واتە: حەڵاڵترین شتێك کە خواردووتانە، ئەوەیە خۆتان وەدەستتان هێنابێ و، منداڵەکانیشتان (کوڕ و کچەکانیشتان) وەدەستهێنراوی خۆتانن.

ج- دەشگونجێ مەبەست لە: ﴿ وَمَا كَسَبَ ﴾، ئەوەبێ کە وەدەستی دەهێنا، لە کردەوەی خراپ بۆ دژایەتییکردنی پێغەمبەرو پەیامی خوا.

٣)- ﴿ سَيَصۡلَىٰ نَارٗا ذَاتَ لَهَبٖ ﴾، بەدڵنیایی لە مەودوا بە ئاگرێکی بڵێسەدار دەبرژێ و دەپیشێ، خوێندراویشەتەوە: (**سَيُصْلى**)و (**سيُصَلَّى**)، یانی: دەبرژێنرێ و دەپیشێنرێ، (**ذَاتَ لَهَبٖ**: **يعني: صَاحِبَةَ لَهَب**) خاوەن کڵپەو بڵێسەیە، ئنجا چونکە هەموو ئاگرێك جۆرێك لە کڵپەو بڵێسەێ هەر هەیە، کەواتە: ئەو ئاگرە بڵێسەو کڵپەکەی جیایەو تایبەتە.

٤)- ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ﴾، ژنەکەشی زۆر کۆڵەدار هەڵدەگرێ، ﴿ حَمَّالَةَ ﴾، ڕێژگەی زێدەڕۆیی (**حَامِلَة**)یە، (**حَامِلَةُ الحَطَب**)، واتە: کۆڵەداری هەڵگرتوە، بەڵام: ﴿ حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ ﴾، واتە: زۆر کۆڵەداری هەڵگرتوە.

لێرەدا زانایان لە بارەی مانای ﴿ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴾ەوە چەند ڕایەکیان هەن:

١- مەبەست لەو کۆڵەدار هەڵگرتنەی، ئەوەیە کاتی خۆی کۆڵە دڕك و چقڵی هەڵگرتوون بۆ لەسەر ڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ و بڵاوی کردوونەوە، تاکو لە پێی ڕابچن.

٢- مەبەست ئەوەیە قسەی لە نێوان خەڵکدا هێناوەو بردوە، چونکە لە زمانی عەرەبییدا بۆ بابای دووزمان گوتوویانە: یان (**فلان حمّال حَطَبٍ**)، یانی: قسە دێنێ و دەباو ئاگری دووبەرەکیی و دژایەتیی خۆش دەکات.

٣- مەبەست پێی ئەو گوناهو تاوانانەن کە وەك کۆڵێکی قورس لە کۆڵی ناون.

ئنجا لەلایەکی دیکەوە:

١- ئایا مەبەست ئەوەیە لە دنیادا ئەو کۆڵە چقڵ و دڕك و چیلکەو دارانەی هەڵدەگرتن، یاخود مەبەست ئەوەیە لە دۆزەخدا خوا کۆڵە دارو چیلکەی پێ هەڵدەگرێ تاکو پێی بسووتێنرێ؟

٢- هەروەها ئایا مەبەست ئەوەیە ئەوژنە ئەو کۆڵەدارە هەڵدەگرێ، تاکو پێی بسووتێنرێ، یاخود هەر وەك سۆغرەو بێگارێك پێی دەکرێ؟ خوای پەروەردگار ڕوونی نەکردۆتەوەو ئەگەری هەیە، کە مەبەستی پێ حاڵەتی دنیا بێ و خوا بۆمان وێنا دەکات و دەفەرموێ: ئاوا کۆڵەداری هەڵدەگرت، کۆڵە دڕك و چقڵی هەڵدەگرت بۆ سەر ڕێی پێغەمبەری خوا ﷺ یاخود: بەو شێوەیە ئاگری فیتنەو دووبەرەکیی خۆش دەکرد، یاخود: کۆڵی گوناهی خۆی هەڵدەگرت لە دنیاداو، کە لە قیامەتیش دا هەر لەکۆڵیەتی.

٥)- ﴿ فِي جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍ ﴾، لە گەردنیدا پەتێکی هۆنراو هەیە، (**جید**) کۆیەکەی (**أجیاد**)ەو بریتیە لە گەردن، بەڵام لای پێشەوەی گەردن (**مُقَدَّمُ العُنُق**)و (**جید**)، زیاتریش بۆ گەردنی ئافرەت بەکاردەهێنرێ، ئەو شوێنەی ملوانکەی تێدەکرێ بە لای پێشەوەیدا، وشەی ﴿ مَّسَدٍ ﴾، واتە: هۆنراو و چنراو، گوتراوە: (**المَسَدُ مِنْ صُوفٍ، مِنْ شَجَرٍ، مِنْ جِلْدٍ، مِنْ وَبَرٍ، وَمِنْ لِيف النَّخْلِ**)، ﴿ مَّسَدٍ ﴾، واتە: هۆنراو، ئنجا لە خووریی

هۆنراوە، لە گەڵای دارو درەخت، پووشی دارو درەخت، لە پێست و چەرم، لە تووکی حوشتر، (یان لە موو)، لە پووشی دارخورما.

﴿ حَبۡلٌ ﴾، (الحَبْلُ: مَا يُرْبَطُ بِهِ الأَشْيَاءُ، ضَفِير مِنَ اللِّيفِ، أَوْ مِنْ سير جِلْدٍ)، (حبل): هەر شتێکە شتی پێدەبەسترێ، شتێکی هۆنراوە لە پووشی دارخورما یاخود لە زوێڵە چەرم.

(**مسد**)یش: بریتیە لە جۆرە پووشێکی یەمەنیی و، ئەو پەت و گوریسانەی لێی دروست دەکرێن، زۆر بەهێزو پتەون.

## پێنج هەڵوەستەی کورت لەبارەی ئەم سوورەتەوە

لە کۆتایی ئەم سوورەتە موبارەکەدا، چەند هەڵوەستەیەکی کورت دەکەین:

**١)**- تاکە کافرێك ناوی لە قورئاندا هاتبێ، مامی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، کەواتە: لە ئایین و بەرنامەی خوادا خاتر خواییش نیەو خزمایەتیی ناخوێندرێتەوە، بەڵکو ئەوە دەخوێندرێتەوە خودی ئەو مرۆڤە چۆنە؟ نەك مامی کێیەو، خزمی کێیەو، کوڕێ کێیەو، خێزانی کێیەو، بابی کێیە، لە قورئاندا خوا ﷻ بۆمان باسی بابی ئیبراهیم دەکات، (ئازەر)، هەروەها بۆمان باسی خێزانی هەر کام لە نووح و لووط (**عليهما الصلاة السلام**) دەکات، لە سوورەتی (**التحريم**)دا، دیسان بۆمان باسی کوڕەکەی نووح (**عليه الصلاة والسلام**) دەکات لە سوورەتی (**هود**)دا، لێرەشدا بۆمان باسی مامی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ دەکات و، ناویشی دێنێ لە نێو هەموو کافرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ.

**٢)**- چونکە مام و ئامۆژنی زۆر ئەزیەتیان داوە، پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە خوا بە خاوەن ڕەوشتی مەزن وەسفی دەکات، لە خۆی نەوەشاندۆتەوە، وەڵامی مام و ئامۆژنی بداتەوە، بەڵام خوا لەسەری وەدەنگ هاتوە: ﴿ تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١ ﴾، هەروەها باسی ژنەکەی ئەبوو لەهەب (ئامۆژنی پێغەمبەر)یش دەکات، کە سزا بارە.

٣)- لەم سووڕەتە موبارەکەدا پیاو و ژن یەکسانن لە سزادران دا، هەروەك لە پاداشتدرانەوەشدا یەکسانن، کێ خراپ بێ، نێر بێ، یان مێ بێ، سزا دەدرێ، کێش چاك بێ، نێر بێ یان مێ بێ، پاداشت دەدرێتەوە.

٤)- لێرەدا زانایان ئیشکالێکیان باسکردوە بەمجۆرە: خوا ﷻ لێرەدا ڕایگەیاندوە کە ئەبوو لەهەب و ژنەکەی دەچنە نێو ئاگرێکی خاوەن بڵێسەوە، ئەبوو لەهەب و ژنەکەشی پابەندکراون، بڕوا بێنن بە قورئان، ئنجا لە نێو قورئاندا ئەم سووڕەتەیە کە دەفەرموێ: ئەبوو لەهەب و ژنەکەی دەچنە نێو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە، کەواتە: دەبێ ئەبوو لەهەب و ژنەکەی بڕوابێنن، بەوەی دەچنە نێو ئاگرێکی بڵێسەدارەوە؟!

وەڵامەکەشی ئەوەیە: خوا ﷻ فەرمایشتی لە بارەی ئەو حاڵەتەوە کردوە کە ئەوان تێیدابوون، لەبەر ئەوەی بەو شێوەیە دژایەتیی پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەکەن، ئەوە سزایەکەیانە، بەڵام بە دڵنیایی خوا ﷻ نەیفەرمووە: ئەگەر ئیمانیش بێنن، هەر ئەوە سزایانە، فەرموویەتی: ئێستا حاڵی حازر کە ئەوە حاڵیانە، ئەوەش سزایانە، بۆیە پابەندو مولزەم کراون بەوەی بڕوابێنن کە دەچنە نێو دۆزەخەوە، چونکە ئەگەر بڕوایان هێنابایەو، خوا ﷻ زانیبای بڕوا دێنن، بە دڵنیایی بە جۆرێکی دیکە فەرمایشتی لە بارەیەوە دەکردن و، ئەوەی فەرموویەتی هی ئەو حاڵەتەیان بووە، کە تێیدا بێبڕوابوون.

ئەمەش وەك هەموو شتەکانی دیکە وایە، خوا ﷻ لە ئەزەلدا زانیویەتی کە هەر کام لە ئێمە چاکە دەکات یان خراپە دەکات و، بەپێی ئەوەی زانیویەتی لە بارەمانەوە، سزا یان پاداشتیشی بۆ دیارییکردووین، بەڵام ئەوە مانای وانیە ئێمە پابەندو مولزەم کراوین کە دەبێ هەر چاکە بکەین، یان دەبێ هەر خراپە بکەین، بەڵکو خوا ﷻ زانیویەتی کە بەویستی ئازادانەی خۆمان ئیمان دێنین و چاکە دەکەین، بۆیە بەهەشتی بۆ داناوین، یاخود بەویستی ئازادانەی خۆمان، بێبڕوا دەبین و خراپە دەکەین، بۆیە دۆزەخی بۆ داناوین.

٥- لە بارەی ژنەکەی (أبو لهب)ەوە، پێم باشە ئەم گێڕدراوەیە بێنین و، بیکەینە کۆتایی ئەم دەرسەمان، کە چۆن دژایەتیی پێغەمبەری خوای ﷺ کردوە:

{عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنها، قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾، أَقْبَلَتِ الْعَوْرَاءُ أُمُّ جَمِيلٍ بِنْتُ حَرْبٍ، وَلَهَا وَلْوَلَةٌ، وَفِي يَدِهَا فِهْرٌ، وَهِيَ تَقُولُ: مُذَمَّمًا أَبَيْنَا، وَدِينَهُ قَلَيْنَا، وَأَمْرَهُ عَصَيْنَا، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ، وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ ، فَلَمَّا رَآهَا أَبُو بَكْرٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ أَقْبَلَتْ، وَأَنَا أَخَافُ أَنْ تَرَاكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهَا لَنْ تَرَانِي» وَقَرَأَ قُرْآنًا اعْتَصَمَ بِهِ، كَمَا قَالَ تَعَالَى:﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ٤٥﴾الإسراء، فَأَقْبَلَتْ حَتَّى وَقَفَتْ عَلَى أَبِي بَكْرٍ، وَلَمْ تَرَ رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَتْ: يَا أَبَا بَكْرٍ، إِنِّي أُخْبِرْتُ أَنَّ صَاحِبَكَ هَجَانِي، فَقَالَ: لَا، وَرَبِّ هَذَا الْبَيْتِ مَا هَجَاكِ، قَالَ: فَوَلَّتْ، وَهِيَ تَقُولُ: قَدْ عَلِمَتْ قُرَيْشٌ أَنِّي ابْنَةُ سَيِّدِهَا} (أخرجه إبن حبان: ٦٥١١، وقال شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح بشواهد، والحاكم: ٣٣٧٦، وقال: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحُ الْإِسْنَادِ وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، ووافقه الذهبي).

واتە: ئەسمائی کچی ئەبوو بەکری صیددیق (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: کاتێك ئەم سووڕەتە دابەزی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ١﴾، ئافرەتە یەك چاوەکەی کچی حەڕب، ئوممو جەمیل (دیارە یەك چاوی هەبووە)، هات و بەردێکیشی بەدەستەوە بوو، دەیگوت: ئێمە ڕازی نابین بە (مُذَمَّم)، {قوڕەیشییە کافرەکان بە (محمد)یان دەگوت: (مُذَمَّم)، (محمد)، یانی: ستایشکراو (مُذَمَّم)، واتە: زەمکراو}، ڕقمان لە ئایینەکەیەتی و، لە فەرمانەکەشی سەرپێچیی دەکەین، پێغەمبەریش ﷺ لە مزگەوت دانیشتبوو، ئەبوو بەکری لە خزمەتدا بوو، کاتێك ئەبوو بەکر ئەو ژنەی بینی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەوە هات و من دەترسم بتبینێ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نا، ئەو نامبینێ، پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانی خوێندو بەهۆی قورئانەکەوە خۆی پاراست بە خوا، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا

مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ ﴾الإسراء، واتـە: کاتێـك قورئانـت خوێنـد، ئێمـە لـە نێـوان تـۆو ئەوانـەدا کـە بڕوایـان بـە ڕۆژی دوایـی نیـە، پەردەیەکـی داپۆشراو دادەنێیـن، هـات هەتـا ڕاوەسـتا لەسـەر ئەبـوو بەکـرو پێغەمبـەری خـوای نەبینـی، گوتـی: ئـەی ئەبـوو بەکـر! هەواڵـم پێـدراوە هاوەڵەکـەت هێرشـی کردۆتـە سـەر مـن؟ ئەبـوو بەکریـش گوتـی: نـا سـوێند بـە پـەروەردگاری ئـەم ماڵـە، ئـەو هێرشـی نەکردۆتـە سـەر تـۆ، [چونکـە خـوا ﷻ ئایەتـی دابەزانـدوە] ئیـدی ڕۆیشـت لـە حاڵێکـدا دەیگـوت: هـۆزی قورەیـش دەزانـن کـە مـن کچـی گەورەکەیانـم.

دیـارە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ خـوا ﷻ پاراسـتوویەتی لـەوەی ببینـێ، چونکـە دیـارە ئامۆژنیشـی بـووەو ئافرەتێکیـش بـووە زۆر لـە خـۆی ڕازی بـووە، بـەڵام خـوای پـەروەردگار بـەو شـێوەیە ئایەتـی لەسـەر ناردۆتـە خـوار تاکـو خـۆی و مێردەکـەی ببنـە پەنـدی زەمانـەو، ببنـە جێـی عیبـڕەت بـۆ هـەر کەسـێك، کـە خـۆی بـە نەسـەب و ڕەچەڵـەك و بـە خزمایەتیـی ئـەم و ئـەوەوە هەڵدەکێشـێ!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ کـە (٨)ی (محـرم)ی سـاڵی (١٤٤٢)ی کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٨/٢٧)ی زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الإخـلاص)، بـەڵام سـەرەتا پێناسـەی ئـەم سـوورەتە بەپێـزە دەکەیـن و لـە حـەوت بڕگـەدا، دەیخەینـەڕوو:

## پێناسەی سوورەتی (الإخلاص) و بابەتەکانی:

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

نـاوی هـەرە بـاوی ئـەو سـوورەتە موبارەکـە، بریتیـە لـە (**سـورة الإخـلاص**) واتـە: سـوورەتی سـاغکردنەوە، سـاغکردنەوەی مـرۆڤ بەندایەتییکردنـی بـۆ خـوا و خڵتـەی پێـوە نەهێشـتنی، بـەڵام جگـە لـەوەش لەسـۆنگەی ئـەوەوە کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکـە گرنگییەکـی زۆر تایبەتیـی هەیـە، بۆیـە هەندێـك لـە تەفسـیرەکان بـۆ وێنـە: (التفسـیر الکبیـر)و، تەفسـیرەکانی دیکـەش، زیاتـر لـە بیسـت ناویـان بـۆ ئـەم سـوورەتە هێنـاوە:

١)- (**سورة الإخلاص**)، واتە: سوورەتی ساغکردنەوە.

٢)- (**سورة قل هو الله أحد**)، واتە: سوورەتی: بڵێ خوا تاکە.

٣)- (**سورة التفرید**) واتە: سوورەتی تاك کردنەوە.

٤)- (سورة التجرید)، واتە: سوورەتی داڕووتاندن لە هەرخڵتەیەك.

٥)- (سورة التوحيد)، واتە: سووڕەتی بەیەکگرتنی خوا.

٦- (سورة النجاة)، واتە: سووڕەتی دەرباز بوون.

٧)- (سورة الولاية)، واتە: سووڕەتی دۆستایەتیی و نزیکی کردن لە خزمەت خوادا.

٨)- (سورة النسبة)، واتە: سووڕەتی وەسف کردن و باسکردنی خوا، ئایا خوا پاڵ دەدرێتە لای هیچ شتێك؟

٩)- (سورة المعرفة)، واتە: سووڕەتی زانست و ناسینی خوا.

١٠)- (سورة الجمال)، واتە: سووڕەتی جوانیی.

١١)- (سورة المُقَشْقِشَة)، واتە: سووڕەتی چاککەرەوەو لابەری ناڕەحەتیی.

١٢)- (سورة المُعَوِّذة)، واتە: سووڕەتی پەنا پێبەر.

١٣)- (سورة الصمد)، واتە: سووڕەتی جێینیازو بێنیاز.

١٤)- (سورة الأساس)، واتە: سووڕەتی بناغە.

١٥)- (سورة المانعة)، واتە: سووڕەتی ڕێگر، واتە: ڕێگر لە سزای خوا.

١٦)- (سورة المحضر)، واتە: سووڕەتی لەلائامادەبوو، هەر کەس ئەم سووڕەتە بخوێنێ فریشتە لە لای ئامادە دەبن.

١٧)- (سورة المُنَفِّرة)، واتە: سووڕەتی سڵەماندنەوەو دوور خستنەوە، دوورخستنەوەی شەیتانەکان.

١٨)- (سورة البراءة)، واتە: سووڕەتی حاشا لێکردن و دووریی کردن لە شیرك و کوفر.

١٩)- (سورة المذكِّرة)، واتە: سووڕەتی بیرخەرەوە.

٢٠)- (سورة النور)، واتە: سووڕەتی ڕووناکیی.

٢١)- (سورة الأمان)، واتە: سووڕەتی پەنادان و خستنە ئەمینی و دڵنیاییەوە[1].

---

(١) التفسير الكبير: ج٣٠، ص ٢٧٧- ٢٧٨.

## دووەم: شوێنی دابەزینی.

زۆربـەی زانایـان ئـەم سـوورەتە بـە مەككەیـی و هەندێكیـان بـە مەدینەیـی و، هەندێكیشـیان بەهەردووكیانیـان دانـاوە، واتـە: گوتوویانـە: هـەم لـە مەككـەو هـەم لـە مەدینـەش دابەزیـوە، بـەڵام مەككەیـی بوونـی ئـەم سـوورەتە ڕاسـترە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزیندا:

لـە موصحـەف دا ژمارەكـەی سـەدو دوازدە (١١٢)یـە و، لـە دابەزینـدا ژمارەكـەی بیسـت ودوو(٢٢)یـە، پێـش سـوورەتی (النجـم) و دوای سـوورەتی (النـاس) دابەزیـوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەكانی:

زانایانـی مەدینـەو كووفـەو بەسـڕا، ژمـارەی ئایەتەكانییـان بـە چـوار (٤) دانـاوەو، هـی مەككـەو شـامیش بـە پێنـج (٥)یـان دانـاوە، واتـە: (لـم یلد)یـان كـردوە بـە ئایەتێك و، (ولـم یولد)یـش بـە ئایەتێكی دیكـە، بـەڵام زیاتـر ژمـارەی (٤) تەبەننیـی كـراوە، لـەو موصحەفانـەی لەبەردەسـتی ئێمـەدان.

## پێنجەم: نێوەڕۆكی:

ئـەم سـوورەتە موبارەكـە نێوەڕۆكێكـی زۆر مەزنـی هەیـە، كـە بریتیـە لـە چەسـپاندنی یەكتایـی خـوا، یەكتایـی خـوا لەهەمـوو ڕوویێكـەوە، خـوا تاكـە، بێوێنەیـە، بـێ هاوەڵـە، تاكـە لـە بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی و خاوەندارێتیـی و سەرپەرشـتیارییكردن و، پەرسـتراوێتیی و، ناوەكانـی و، سـیفەتەكانی و، ...هتـد دا، هەروەهـا جێـی نیازیـی و بێنیازیـی خـواو، نەبوونـی ڕۆڵـە و، نەبوونـی سـەرچاوەی لێوەهاتـن بـۆ خـواو، بێوێنەیـی و بێهاوتایـی خـوا.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

هـەر چـوار ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە لـە قورئانـدا بێوێنـەو بێهاوتـان و، هاووێنەیـان نیـە:

١- ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾، واتـە: بڵـێ: ئـەو خـوا تاکـە، ئەمـە تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوە.

٢- ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢﴾، خوایەکی جێینیازو بێنیازە.

٣- ﴿لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣﴾، کەسـی لـێ نەبـووە، لەکەسیش نەبـووە، نـە ڕۆڵـەی هەیـەو، نـە سەرچاوەیەکیشـی هەیـە لێـوەی هاتبـێ.

٤- ﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾، هیـچ کەسـیش هاوتـای وی نیـە، ئـەم چـوار ئایەتـە موبارەکـە لـە هەمـوو قورئانـدا، تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوون.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

ئێمـە کـۆی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە بـە هـەر چـوار ئایەتەکەیـەوە، دەکەیـن بـە دەرسـێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە هـەر چـوار ئایەتەکـە پێـك دێ، خـوا ﷻ لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا باسـی یەکتایی خـۆی دەکات، باسـی بێنیازیـی خـۆی دەکات، باسـی جێـی نیازیـی خـۆی دەکات، باسـی ئـەوە دەکات کـە وەك هیـچ کام لـە دروسـتکراوەکان نیـە، لقـی لـێ بووبێتـەوە، یـان لـە ئەسـڵێکەوە هاتبـێ، یـان ڕۆڵـەی هەبـێ، یـان بـاب و دایکـی هەبـن، هەروەهـا خـوا هیچکـەس و هیـچ شـتێك هاوتـای نیـە، لـە هیـچ ڕووێکـەوە.

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ۝٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ۝٤﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

(بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، بڵـێ: ئـەو خـوا تاکـە (١) خـوا بێنیـاز و جێـی نیـازە، (٢) کەسـی لـێ نەبـووە (و ڕۆڵـەی نیـە)و لەکەسـیش نەبـووە (وڕۆڵـەی کـەس نیـە) (٣) هیـچ کەسـیش هاوتـای وی نیـە (لـە هیـچ ڕووێکـەوە) (٤)).

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱللَّهُ): (قِيلَ: أَصْلُهُ إِلَه فَحُذِفَتْ هَمْزَتُهُ، وَأُدْخِلَ عَلَيْهَا الأَلِف والـلاَّم، فَخُصَّ بالبَارِي) ئەمە ڕایەکە لە بارەی بێژەی (أَللە)وە، کە لەبنەڕەت دا (إِلە) بووەو هەمزەکەی لابراوەو، (أل)ی خراوەتە سەرێ، ((أللە) ئەگەر هەمزەکە لابرێ دەبێتەوە (لاە)، (أل)ی بخرێتە سەر دەبێتە (أَللە)،) تایبەتیشە بەو زاتەوە کە بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەنی هەموو شتێکە.

هەندێکیش گوتوویانە: (أللە)، لە (أَلَهَ يَأْلَهُ)وە هاتووە، یانی: پەرستیی، دەیپەرستێ، (أَلَهَ إلهةً، عَبَدَ عِبَادَةً) واتە: پەرستیی پەرستن، کەواتە: (أللە) ئەو زاتەیە کە دەپەرسترێ.

هەندێك گوتوویانە: لە (أَلِه إلَهَةً)ەوە هاتووە، (أَلِهَ أي: تَحَيَّرَ) سەرسام بوو، لەبەر ئەوەی دروستکراوەکان لە ناسینیدا سەرسامن.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (وِلَهَ)وە هاتووە، (أي: المخلوقات والِهَةٌ نَحوَهُ)، یانی دروستکراوەکان بەرەو وی شەیدان، عەودالن، (والِهٌ ولِهَ بِهِ) واتە: شەیدای بوو، عەودالی بوو.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: (أَللە) لە (لاه يَلُوهُ لِياهاً)ەوە هاتووە، (أَي: إِحْتَجَبَ يَحْتَجِبُ احْتِجَاباً) پەنهان بوو، پەنهان دەبێ، پەنهان بوون، لەبەر ئەوەی خوا پەنهانە.

دەشگونجێ هەر چواریان لە یەك کاتدا مەبەست بن، چونکە خوا هەم پەرستراوە، هەم دروستکراوەکان تێیدا سەرسامن، هەم دروستکراوەکان بۆی شەیداو تامەزرۆو عەودالن، هەروەها پەنهانیشە لە دروستکراوەکان.

(أَحَدٌ): (أَحد يُسْتَعمَلُ عَلَى ضَرْبَيْن: أَحَدُهمُا: فِي النَّفِي فَقَطْ، وَالثَّانِي: فِي الإِثْبَاتِ) وشەی (أحد) بە دوو جۆر بەكاردێ:

**یەكەمیان:** تەنیا لە لابردندا (دەگوترێ: (مَا فِي الدَّارِ أَحَد) (لَم يَأتِني أَحَد)، ماڵكە كەسی تێدا نیە، كەس نەهاتوە بۆ لام، بە زۆریی لە حاڵەتی لابردن (نفي)دا بەكاردێ).

**دووەم:** لە حاڵەتی چەسپاندن و ئیسپاتیشدا بەكاردێ، ئەویش بەسێ شێوە:

١- وەك: (أَحَدَ عَشَر، وَأَحَدٌ وَعِشْرين) واتە: یازدە، بیست و یەك، پاڵ دەدرێتە لای (عَشر) یان (عِشرُون).

٢- دەكرێتە پاڵدراو یان پاڵ وەلادراو (مضاف إليه)، دەكرێتە پاڵدراو وەك (أَحَدُهمَا) یەكێك لەو دووانە، یان (أَحَدُهُم) یەكێك لەو كۆمەڵە.

ئەگەر ببێتە پاڵ وەلادراویش وەك: (يَومُ الأَحَد) ڕۆژی یەكشەممە.

٣- حاڵەتی سێیەم لە بەكارهێنانی (أَحَد)دا بۆ چەسپاندن، ئەوەیە بۆ وەسفێكی ڕەها بەكاردەهێنرێ، ئەویش بەس بۆ خوا بەكاردێ، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، بڵێ: ئەو خوایەكی تاكە، تەنیا بۆ خوا وشەی (أحد) بەكاردەهێنرێ، چونكە زاتێك وێنەی نەبێ و هاوتای نەبێ، هەر خوایە، ئەویدیكە هەمووی وێنەی هەیە و، هاوتای هەیە.

(ٱلصَّمَدُ): (الصَّمَد: السَّيِّد: الَّذي يُصْمَدُ إِلَيْهِ فِي الأَمْرِ) (صمد): ئەو گەورەیەی لەكاروباردا پەنای پێ دەبردرێ و پشتی پێ دەبەسترێ، داوای لێ دەكرێ و، ڕووی تێدەكرێ، واتە: جێی نیاز، هەروەها واتە: ئەو زاتەی لە جگە لە خۆی بێنیازە، بۆیە من وام لێكداوەتەوە: (جێی نیازو بێنیاز)، هەموو كەس و شتێك پێویستیی پێیەو، ئەو پێویستیی بەهیچ كەسێك و شتێك نیە.

واتایەكی دیكەی (ٱلصَّمَدُ): (الصَّمد الَّذي لَيسَ بِأَجْوَف) واتە: ئەو زاتەی بۆش نیە، پڕەو بۆش نیە، ئەو مانایەش بۆ وشەی (الصَّمد) هاتوە لە زمانی

عەرەبییـدا، بـەڵام بـە دڵنیایـی بەنسـبەت خـوای پـەروەردگارەوە ئـەو مانایەیـان مەبەسـتە کـە (الصَّمـد) واتـە: ئـەو زاتـەی جێـی نیـازەو، بـێ نیازیشـە.

(كُفُوًا): (الكُـفْءُ: المُمَاثِـل، وَالقَـوِيُّ القَـادِر عَـلى تَصْرِيـف العَمَـل، وَالجَمْـعُ أَكْفَـاءُ، وَكِفَـاءٌ)، خوێندراویشـەتەوە: (كُـفُءاً) واتـە: وێنـە، هاوتـا، بەهێـزی توانـا لەسـەرکار کـە کاروبـار بـەو شـێوەیەی دەیـەوێ هەڵیسـووڕێنێ، وشـەی (كُفوًا) بـە (أَكْفَـاء) و (كِفَاء)یـش کۆدەکرێتـەوە.

## هۆی هاتنه خوارەوەی ئەم سوورەتە موبارەکە

لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە موبارەکەوە، چەند گێڕراوەیەك هەن، بەڵام ئێمە تەنیا یەکێکیان دەهێنین، کە لە ڕووی سەنەدەوە بە باش (حسن) دانراوە:

{عَـنْ أُبَيِّ بْـنِ كَعْـبٍ ﷺ: أَنَّ الْمُشْرِكِـينَ قَالُـوا لِرَسُـولِ اللَّـهِ ﷺ: انْسُـبْ لَنَـا رَبَّـكَ، فَأَنْـزَلَ اللَّـهُ: «قُـلْ هُـوَ اللَّـهُ أَحَـدٌ، اللَّـهُ الصَّمَـدُ» لأَنَّـهُ لَيْـسَ شَـيْءٌ يُولَـدُ إِلاَّ سَـيَمُوتُ، وَلَيْـسَ شَـيْءٌ يَمُـوت إِلاَّ سَـيورَثُ، وَإِنَّ اللـهَ جَـلَّ ثَنَـاؤه لاَ يَمُـوتُ وَلاَ يُـورَثُ «وَلَـمْ يَكُـنْ لَـهُ كُفُـوًا أَحَـدٌ» قَـالَ: لَـمْ يَكُـنْ لَـهُ شَـبِيهٌ وَلَا عِـدْلٌ وَلَيْـسَ كَمِثْلِـهِ شَيْءٌ} (أخرجـه الترمـذي٣٣٦٤، وأحمـد: ٢١٢٥٦، والبخـاري في التأريـخ الكبـير: ج١، ص٢٤٥، قـال مؤلّفـا الإسـتيعاب: سـنده حسـن).

واتـە: ئوبەیـی کـوڕی کەعـب ﷺ دەڵـێ: هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان بـە پێغەمبـەری خوایـان ﷺ گـوت: پەروەردگارمـان بـۆ وەسـف بکـە (سـەر بـە کێیـە، لـە کوێـوە هاتـوە؟) خـواش ئـەم ئایەتانـەی دابەزانـدن: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، بڵـێ: ئـەو خوایـە تاکـە، ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢﴾، خوایەکـە جێـی نیـازەو بـێ نیـازە، ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣﴾، (الصمـد) بریتیـە لـەوەی لێـی نەبـووەو لەکـەس نەبـووە، چونکـە هیـچ شـتێك نیـە لـە دایـك ببـێ، مەگـەر دەمـرێ، هـەر کەسـیش شـتێکی

بمرێ، بە میرات دەگیرێ، بەڵام خوای پەروەردگار نە دەمرێ و نە بەمیراتیش دەگیرێ، ﴿ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤ ﴾، هیچ کەس هاوتای خوا نیە، هیچ کەس وێنەی خوا نیەو، هیچ شتێك وەك خوا نیە.

وەك گوتمان: لە بارەی هۆی دابەزینی ئەم سوورەتە موبارەکە گێڕانەوەی دیکە هەن، یەکێك لە گێڕراوەکان دەڵێ: جوولەکەکان لە مەدینە بە پێغەمبەریان ﷺ گوت: پەروەردگاری تۆ چییە، چۆنە؟ خوای پەروەردگاریش ئەم سوورەتە موبارەکەی دابەزاند.

بەڵام وا پێدەچێ هەر ئەوەیان ڕاستبێ، کە هاوبەشدانەرانی مەککە لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسیوە، چونکە ئەم سوورەتە هەر لە شاری مەککە دابەزیوە، وەك پێشتریش باسمان کرد، بەڵام لە مەدینەش کە لێیان پرسیوە: خوای تۆ کێیەو چۆنە؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەم سوورەتە موبارەکە وەڵامی جوولەکەکانیشی داوەتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خوای پاك و تاك دەفەرموێ: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، وەك هەمیشە گوتوومانە ئێستایش دووبارەی دەکەینەوە، کاتێك مرۆڤ دەڵێ: ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە.

بێگومانیش ناوی خوا هێنان لەسەر هەر شتێك مایەی بەرەکەت تێکەوتنییەتی و، ناوی خوا نەهێنان چ بە ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، چ بە (**الحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ العَالَمِين**) مایەی دوابڕاویی و بێخێریی ئەو کارەیە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ

فەرموویەتی: (**كُلُّ أَمْرٍ ذِي بالٍ لا يَبْدَأُ فِيهِ بِبِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ أَقْطَع**)[1] واتە: هەر کارێکی گرنگ بەناوی خواوە دەست پێ نەکرێ و، ناوی خوای لەسەر نەهێنرێ، دوابڕاوە، بەڵێ هەر کاتێك مرۆڤ دەڵێ: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، دەبێ بەلایەنی کەمەوە چوار واتایان لە عەقڵ و دڵی خۆی دا ئامادە بکات:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بێ هاوتا دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾، بڵێ: ئەو خوایەکی تاکە، پێشتریش گوتمان: لە هەموو قورئاندا پێنج سوورەت بە (قُل) دەست پێدەکەن:

١- سوورەتی (الجن)، دەفەرموێ: ﴿قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ١﴾ **الجن**.

٢- سوورەتی (الكافرون)، دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ١ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ٢﴾ **الكافرون**.

٣- ئەم سوورەتە موبارەکە، سوورەتی ئیخلاس ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾.

٤و٥- هەردوو سوورەتی فەلەق و ناس: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ١﴾ **الفلق**، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١﴾ **الناس**.

لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾، بەدڵنیایی خوا لە وەڵامی پرسیارێکدا فەرمان بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەکات، ئەوە بفەرموێ، بڵێ: ئەو خوایەکی تاکە، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: (هو) لێرەدا ڕاناوی

---

(١ ) ذكره العظيم آبادي (١٣/١٢٧) وقال: وهو حديث حسن..

حاڵ (**ضمير الشَّأْن**)ە، واتە: حاڵ و دۆخ بەو شێوەیە، ئەو خوایەکی تاکە، دواتر لە مەسەلە گرنگەکان زیاتر قسەی لێ دەکەین و سووڕەتەکە هەمووی دەکەین بە یەك مەسەلەی گرنگ، لێرەدا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرمووێ: بفەرمووو: ئەو خوایەکی تاکە.

(**أَحَد**) لە کوردییدا دەبێتەوە بە تاك، بەڵام (واحد) واتە: یەك، خوای پەروەردگار وشەی (واحد)یشی بۆ خۆی بەکارهێناوە: ﴿ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ٣٩﴾ **یوسف**، یەکی ملپێکەچکەر، پێشتر باسی واتاو چەمکی وشەی (أحد)مان کرد، لە ڕووی زمانەوانییەوە.

لێرەدا کە خوا دەفەرمووێ: ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾، بڵێ: خوا تاکە، هەموو واتایەکانی دیکەی دوایی دێن، هەموویان دەگرێتە نێو خۆی، چونکە خوا ئەگەر تاك بێ، مانای وایە: جێی نیازو بێ نیازەو، ئەگەر تاك بێ: کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووەو، و ئەگەر تاك بێ: مانای وایە هیچ هاو وێنەو هاوتاو شێوەی نین، ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢﴾، خوا جێی نیازە، نەیفەرمووە: (**وَهُوَ الصَّمَد**) بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢﴾، خوا جێی نیازە، چونکە خەڵکی دیکەش و شتی دیکەش هەیە، خەڵك پێویستیی پێی دەبێ و، سەری تێی دەوەستێ و داوای لێدەکات، بەڵام خوا فەرموویەتی: ﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢﴾ یانی: خوا بە هەموو مانای وشە: جێی نیازو بێنیازە، ﴿لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣﴾، کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە، بۆچی پێشێ فەرموویەتی: کەسی لێ نەبووە، لە ڕووی ڕێزبەندیی لۆژیکییەوە دەبێ بڵێی: فڵانکەس لە کەسەوە نەهاتووە، پێشێ دەبێ باسی ئەسڵ بکرێ، ئنجا باسی لق بکرێ، بەڵام لێرەدا خوا ﷻ بەپێی عەقڵی هەموو ئەوانەی ئەم سووڕەتەی ئاڕاستە کردوون، بەڵکو بەپێی عەقڵی هەموو ئەوانەی بە درێژایی زەمان، هەر لە ڕابردووەوە تاکو کۆتایی لە خوا پەرستیی لادەدەن، لە یەکتاپەرستیی لادەدەن، دواوە، کە هەموو ئەوانە ڕۆڵەیان پاڵداوەتە لای خوا، نەك خوا پاڵدەنە لای سەرچاوەیەك کە لێوەی هاتوە،

هەمیشە ئەوان گوتوویانە: شەیتانەکان کوڕانی خوان، فریشتەکان کچانی خوان، نەصڕانییەکان دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، هەروەها هیندۆسەکان و، هەموو ئەوانە لقیان بۆ خوای پەروەردگار داناوەو، گوایە شتانێك لێی پەیدا بوون، بۆیە خوا سەرەتا دەفەرموێ: ﴿لَمۡ يَلِدۡ﴾، واتە: (لَم يَلِد مِنهُ أَحَد) لێی نەبووە، کەسی لێ پەیدا نەبووە، ﴿وَلَمۡ يُولَدۡ ٣﴾، لە کەسیشەوە پەیدا نەبووە، نە لقێك هەیە لێی جیا بووبێتەوە، نە ئەسڵێك هەیە ئەو لێوەی هاتبێ، خاوەنی بوونێکی زاتییەو، بوونەکەی خوازراو نیەو بوونێکی سەربەخۆیە، بوونێکی بێ سەرەتاو بێ کۆتاییە.

﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾، هیچ کەسیش هاوتای وی نیە، واتە: هیچ کەس هاوئاستی خوا نیەو، هاوتای وی نیە، چونکە هەموو ئەوانی دیکە جگە لە خوا، دروستکراوی خوان، بە دیهێنراوی خوان، ئەگەر فریشتەن، ئەگەر مرۆڤن، ئەگەر جندن، ئەگەر ڕووەکن، ئەگەر ئاژەڵن، ئەگەر دڕندەن، ئەگەر پەڕەورن، ئەگەر هی ژێر دەریان، ئەگەر هی سەرزەوی و بن زەویین، ئەگەر هی نێو هەوان، ئەگەر ماددەی بێ ژیانن، ئەگەر کەهکەشانن، ئەگەر گەردیلەن، ئەگەر بچووکن، ئەگەر گەورەن، هەموویان دروستکراوی خوان، دروستکراوی خواش هەرگیز نایەتە ئاستی خوا، چونکە کاتێك بووە نەبووەو خوا بوونی پێداوە، کاتێکیش دەبێ خوا نایهێڵێ.

## مەسەلە گرنگەکان

کۆی ئەم سوورەتە دەکەینە یەك مەسەلە:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ، کە بە پرسیارلێکەرانی لە بارەی پەروەردگاریەوە بفەرموێ: ئەو خوای تاکە، جێی نیازو بێ نیازە، کەسی لێ نەبووەو لە کەس نەبووەو، هیچ کەسیش هاوتای وی نیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ٤﴾.

### شیکردنەوەی ئەم چوار ئایەتە لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، ئەو خوایەکی تاکە، لە ڕووی ڕێزمانییەوە تۆزێك وردەکاریی باس دەکەین: ﴿قُلْ﴾ بڵێ، ئەمە فەرمانی خوای بەرزو مەزنە، ﴿هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، ئەو خوایەکی تاکە، زۆرێك لە پسپۆڕان و شارەزایانی زمانی عەرەبیی دەڵێن:

**{(هـو): مبتدأ أول، (ألله): مبتدأ ثان، (أحد): خبر المبتدأ الثاني، والجملة خَبر المبتدأ الأول}.**

ئەمە لە ڕووی ڕێزمانییەوە، لە هەموو ڕایەکانی دیکە بەهێزترە: (هو) نیهادی یەکەمە، (ألله) نیهادی دووەمە، (أحد) گوزارەی نیهادی دووەمە، ڕستەکەش هەمووی دەبێتە گوزارەی نیهادی یەکەم، بۆ ئیعڕابی ئەم ئایەتە موبارەکە هەندێ ڕای دیکەش هەن، بەڵام ئەوەی هەڵمانبژارد پێم وایە بژاردەیە.

کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾، بڵێ: ئەو خوایە تاکە، تاك ئەوەیە دووەمی نەبێ، وێنەی نەبێ، هاوتای نەبێ، شێوەی نەبێ، لە کوردییدا کە

دەڵێـی: فـڵان شـتە تاکـە، واتـە: دووەمێکـی نیـە، هاوتایەکـی نیـە، وێنەیەکـی نیـە، شـێوەیەکی نیـە، هەڵبەتـە ئـەوەی بـە ڕەهایـی وشـەی (أحـد)ی بـۆ بەکاربـێ، تەنیا خوایـە، چونکـە هیـچ مرۆڤێـك نیـە هاوتـای نەبـێ، هاوشـێوەی نەبـێ، وێنـەی وی نەبـێ، هیـچ دروسـتکراوێکیش نیـە بێوێنـەو بێهاوتـاو بـێ شـێوە بـێ، تەنیا خـوای پـەروەردگار بێوێنەیـە، بێهاوتایـە، بێشـێوەیە، بـێ دووەمیشـەو تاکـە، واتـە: دووەمـی نیـە، بـەڵام دروسـتکراوەکانی دیکـە هەموویـان دووەمیـان هەیـە، بگـرە هیـچ دروسـتکراوێك نیـە جـووتی نەبـێ: ﴿ وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ ﴿٣﴾ ﴾**الفجـر**، سـوێند بـە جـووت و بـە تـاك، هەمـوو دروسـتکراوەکان جووتـن، نێـرو مـێ، یـان پێچەوانـەی یەکدیـن، وەك سـاردو گـەرم، ئاسـمان و زەوی، دنیـاو دوارۆژ، زسـتان و هاویـن، ...هتـد، تەنانەت مـاددەی بـێ ژیانیـش لـە نێـوك و ئەلیکـترۆن پێـك دێ، نێوکەکـە پرۆتـۆن و نیۆترۆنـی تێدایـەو، ئەلیکـترۆن بـە دەوری نێوکـدا دەخولێتـەوەو، ئەویـش هـەر جووتـە.

**٢)-** ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾: خوایەکی بێنیازەو جێی نیازە، ئەمە گوزارەی دووەمە، بۆ (هو) یانی: ئەو خوایەکی جێنیازو بێنیازە، وشەی (ألله) جێداری (هو)یە: (هو الله)، هەواڵەکەیشی بریتیە لە (أحد) ئەگەر بێت و (هو) ڕاناوی حاڵ (**ضمیر الشأن**) بێ، واتە: حاڵ بەو شێوەیە کە ئەو خوایەکی تاکە، ئەوەی دێ هەمووی هەواڵ و ڕوونکەرەوەی ئەو (هو) دەبێ، ﴿ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴾، ئەو خوایەکی جێی نیازو بێ نیازە.

**٣)-** ﴿ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴾ (ئەمیش دیارە گوزارەیەکی دیکەیە) ئەو کەسی لێ نەبووەو لە کەسیش نەبووە.

**٤)-** ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴾، هیچ کەسیش هاوتای وی نیە.

﴿ لَمۡ يَلِدۡ ﴾، واتە: (**لَم يَلد غَيـرَهُ**): جگەلە خۆی لێ نەبووە.

﴿ وَلَمۡ يُولَدۡ ﴾، واتە: (**وَلَم يَلِدْهُ غَيْره**) جگە لەو ئەوی نەبووە.

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴾، (لَـهُ) کـە (**جـارّو مجـرور**)ە و پێشـخراوە، لەسـەر (كُفُوًا) لەبـەر گرنگیـی پێدانـە، بـەوە کـە خـوای

بێهاوتـا هیـچ کـەس هاوتـای نیـە، هیـچ کـەس وێنـەی نیـە، هیـچ کـەس هاوئاسـتی نیـە. بۆیـەش لـە ئایەتەکـەی پێشـێدا لابـردنی ڕۆڵـە لـە خـوا، پێشـخراوە، ئـەوە کـە خـوای پـەروەردگار سـەرچاوەیەکی هەبـێ لێـوەی هاتبـێ، چونکـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان زیاتـر ئـەو بیرۆکەیـە لـە نێویانـدا ڕەواجـی هەبـووە، کـە خـوا ڕۆڵـەی هەیـە، کـوڕی هـەن و کچـی هـەن، لـە نێـو هیندۆسییەکانیشـدا ئـەو بیرۆکەیـە هەیـە، بەڵکـو ئێسـتا لـە نێـو نەصرانییەکانیشـدا ئەوەیـان تەبەننیـی کـردوە کە عیسا سـەلامی خـوای لێبـێ کـوڕی خوایـە، هـەر لەبـەر ئـەوەی بابـی دیـار نیـە، بـەڵام خـوا عیسـای بۆیـە بـەو شـێوەیە خوڵقانـدوە، تاکـو بزانـرێ خـوا دەتوانـێ بەبـێ بابیـش ئینسـان بخوڵقێنـێ، هـەروەك دەتوانـێ بەبـێ بـاب و دایکیشـی بیخوڵقێنـێ، کـە ئـادەم و حـەووان، دەشـتوانێ بـە بـاب و دایکـەوە بیانخوڵقێنـێ، وەك مرۆڤەکانـی دیکـە.

## حەوت وردە سەرنج لە بارەی سوورەتی ئیخلاصەوە

### سەرنجی یەکەم:

وشـەی (قُلْ): خـوای کاربەجـێ کـە دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ۝١﴾ **الإخـلاص**، هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: بۆچـی خـوای زانـاو کارزان بـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ فەرمـووە، بفەرمـوێ: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ۝١﴾، بڵـێ: ئـەو خوایـە کـە تاکـە، بۆچـی ڕاسـتەوخۆ نەیفەرمـووە: (**هُـوَ اللـهُ أَحَـد**)؟ ئـەو خوایـە کـە تاکـە؟!

هەڵبەتە هیچ وشەیەك لە فەرمایشتی خوادا بێ حیکمەت نیە.

یەکێـك لـە زانایـان دەڵـێ: حیکمەتەکـەی ئەوەیـە: (**المأْمـورُ بِـهِ سَـواءٌ كانَ مُعَيَّنـاً أَمْ لاَ، مَأْمـورٌ بِالإِقـرارِ بِالقَـول، فَأُثْبِـتَ القَـول لِيَـدُلَّ عَـلى إِيجَـابِ مَقولِـهِ وَلـزُومِ الإِقـرارِ بِـهِ عَـلى مَـرِّ الدُّهُـور**): فەرمانپێکـراو چ دیارییکـراو بـێ (کـە پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ) یاخـود دیارییکـراو نەبـێ، (ومەبەسـت پێـی هـەر کەسێك بـێ کـە قورئـان دەخوێنـێ) فەرمانـی پێکـراوە کـە دان بـە گوتنـی ئـەوەدا بنێـێ، ئنجـا بۆیـە گوتنەکە چەسـپێنراوە، تاکـو ئـەوە بگەیەنـێ کـە پێویسـتە فەرمـان پێکـراو (مقول)ەکـە بگوتـرێ و دانـی پێـدا بهێنـرێ، بـە درێژایـی زەمـان و ڕۆژگار.

واتـە: کاتێـك ئێمـە دەخوێنینـەوە (قُـل)، چاوەڕێیـن گوتـراوە (مقول)ێـك بێـت، ئایـا ئـەوەی دەبـێ بگوتـرێ، چییـە؟ دوایـی کـە دەفەرمـوێ: ﴿هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ﴾، بۆیـە پێشـێ فەرموویەتـی: (قـل) تاکـو بزانـرێ کـە گوتنـی ئـەو فەرمایشـتە شـتێکی پێویسـتەو، فەرمانپێکـراوەو، بابـای فەرمانپێکـراو پابەندکـراوە بـەوەی ئـەو وشـەیە بڵـێ.

## سەرنجی دووەم:

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾، زۆربـەی زانایـان دەڵـێ: (هـو) ئـەو (**ضَمیر الشَّأْن**)ە، ڕانـاوی حاڵەتـە، واتـە: حـاڵ بـەو شـێوەیە کـە ئـەو خوایـە تاکـە.

ئنجـا هەندێـك گوتوویانـە: لـە وەڵامـی قسـەی ئەوانـەدا کـە گوتیـان: (**إِنْسُـبْ لَنَا رَبَّـك**) یـان (**صِـفْ لَنَـا رَبَّـك**) واتـە: پەروەردگارمـان بـۆ پێناسـە بکـە، بۆمـان دەربخـە چۆنـەو چـۆن هاتـوە؟ خـواش وەڵامـی داوەتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾، ئـەو پـەروەردگارەی ئێـوە لێـی دەپرسـن، خوایەکـی تاکـە.

(فخرالديـن **الـرازي**) لـە بـارەی (هـو)ەوە، شـتێکی هێنـاوە، کـە هـەر کام لـە (**آلـوسي**) لـە (روح **المعـاني**)داو (**إبـن** عاشـور) یـش لـە (التحريـر والتنويـر)دا، بەبـێ ڕەخنەلێگرتـن هێناویانــە.

(فخرالديـن **الـرازي**) دەڵـێ: خـوای پـەروەردگار دوای وشـەی (قـل)، سـێ وشـەی فەرمـوون، کـە بریتیـن لـە وشـەکانی: (هـو) و (ألـله) و (أحـد)، ئـەم سـێ وشـەیەش هـەر کامیـان دەلالـەت دەکات لەسـەر پێگـەو پلەیەکـی تایبـەت، بـۆ ئـەو کەسـانەی بەرزتریـن پێگـەو مەقامیـان هەیـە، لـە خواناسـیی و خواپەرسـتییدا، کـە تەماشـای چییەتـی شـتەکان دەکـەن:

أ- کۆمەڵی یەکەم: (قل هو) هەر بە (هو) لە هەموو شتێك تێدەگەن، ئەمە مەقام و پێگەیەك، کە بەرزترینە و هی زۆر نزیکخراون (**مُقَرَّبین**)ە.

ب- کۆمەڵی دووەم: کە هاوەڵانی ڕاستە (أصحاب اليمين)ن، دەبێ خوایان بە ناوی خۆی بۆ ناو ببردرێ، کە (أَلله)یە،

ج- کۆمەڵی سێیەم: کە هاوەڵانی چەپە (أصحاب الشمال)ن، پێویستە ئاگادار بکرێنەوە کە خوا تاك و بێهاوبەش (أحد)ە، چونکە ئەوان لە پەرستنی خوادا بەهەڵەدا دەچن و جگە لە خوا دەپەرستن، بۆیە فەرموویەتی: (أحد).

ئـەو قسـەیە وەك گوتـم: ئـەو سـێ تەفسـیرەی سـەرەوە هێناویانـەو، ڕەنگـە تەفسـیرەکانی دیکـەش ئاماژەیـان پێکردبـێ، بـەڵام پێـم وایـە ئـەو قسـەیە هـەر هەڵهێنجانێکـە هیـچ بەڵگەیەکـی لەسـەر نیـەو، پێشـم وانیـە هەڵهێنجانێکـی ڕاسـت و دروسـت بـێ، چونکـە ئـەو و (هـو) کێیـە؟ هەتـا (أللـه) نیەیـەت، نازانیـن ئـەو ڕانـاوە پەیوەسـتە بـە کێـوە، بۆیـە ئـەو جـۆرە ئەنجامگیرییانـە لـە قورئـان بـە شـتێکی ڕاسـت و دروسـت دانانێـم، چونکـە ئەگـەر تـۆ بـەم شـێوەیە ئەنجامگیریـی دەکـەی لـە قورئـان، یەکێکـی دیکـە دێ ئەنجامگیرییەکـی دیکـە دەکات و، یەکـی دیکـە ئەنجامگیرییەکـی دیکـە، کـە لەگـەڵ ڕواڵەتـی بێژەکانـی قورئانـدا کـۆك و تەبـا نیـە.

## سەرنجی سێیەم:

پێشتریش وشەی (ألله) هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەر وشەی (إله)ەو (أل)ێکی بۆ دانراوە.

لەبارەی ڕیشەکەیشیەوە، زانایان ڕاجیاییان هەیە:

١- هەندێك گوتوویانە: (ألله) لە (أَلَه)وە هاتوە، (**أَلَه، يَأْلُه، إلهةً**)، (**أي: عَبَدَ، يَعْبُدُ، عِبَادةً**)، لەبەر ئەوەی (الله) ئەو زاتەیە بەندایەتیی بۆ دەکرێ و دەپەرسترێ.

٢- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (**أَلِهَ**)وە هاتوە، بە مانای: (**تحَيَّر**)، (**أَلِهَ، يَأْلَهُ، إلَهةً**)، یانی: (**تَحَيَّر، يتَحيَّرُ، تَحَيُّراً**)، لەبەر ئەوەی دروستکراوەکان لە ناسینی خوادا سەرسامن و بۆیان وەخۆ ناگیرێ و، لە عەقڵ و دڵیاندا جێگای نابێتەوە، وەك چییەت و خودی خۆی، نەك وەك پەیپێبردنی و ناسینی.

٣- هەندێکی دیکە گوتوویانە: وشەی (ألله) لە (**وَلِهَ**)ەوە هاتوە، (**وَلَهْ**) واتە: شەیدایی و عەوداڵیی و هۆگریی، (**لِأَنَّ المَخْلوقَاتَ وَالِهَةٌ نَحوهُ**) لەبەر ئەوەی هەموو دروستکراوەکان شەیداو عەوداڵی خوای پەروەردگارن.

٤- هەندێکی دیکە گوتوویانە: لە (لاهَ)ەوە هاتوە، (**لاهَ، يَلُوهُ، لِياهاً**)، (**أي: احتَجَبَ، يحتَجِبُ، احْتِجاباً**)، لەبەر ئەوەی خوای بێ وێنە پەنهانە لە دروستکراوەکانی خۆی.

ئەمانە چوار ڕای زانایان لە بارەی وشەی (أَللە)وە، کە ئایا لە چییەوە هاتوە؟ هەندێکیش لەزانایان گوتوویانە: وشەی (أَللە) لە هیچ وشەیەکی دیکەوە دانەتاشراوە، بەڵکو ناوی ناسین (علم)ە بۆ خوا، لە زمانی عەرەبییدا و، لە کوردییدا دەڵێین: (خوا)، لە فارسییدا دەگوترێ: (خدا) لە ئینگلیزییدا دەگوترێ: (god) و، لە هەموو زمانەکاندا ناوی خوا هەیە.

## سەرنجی چوارەم:

لەسەر وشەی (**أَحَد**)، زانایانی شارەزای زمان زۆریان قسە لە بارەوە کردووەو پێشتر هەندێکیمان باس کرد، بۆ وێنە:

أ- (**ابن الأثير**) لە کتێبی: (**النهاية في غريب الحديث والأثر**)دا دەڵێ: {**أَحَدٌ من أَسماءِ اللّهِ تَعالى، الأَحدُ وَهوَ الفَرْد الَّذي لَم يَزل وَحدَه ولَم يَكن مَعه آخرُ، وَالهَمْزَة فِيهِ بَدل الوَاوِ، وَأَصْلهُ وَحَد، لأنَّه مِنَ الوَحْدة**}، واتە: (أحد) لە ناوەکانی خوای بەرزە، ئەو تاکەیە کە بەردەوام هەر تەنیا بووە، کەسی دیکەی لەگەڵدا نەبووە، هەمزەی (**أَحَد**) جێگرەوەی (و)وە، لە ئەصڵدا (**أَحَد**) (**وَحد**) بووە، چونکە لە (**الوَحْدة**)ەوە هاتوە، واتە: تاکێتیی.

ب- لە فەرهەنگی (المصباح المنير)دا دەڵێ: {**ويَكونُ (أَحَدٌ) مُرادِفاً (لِوَاحِدٍ) في مَوْضِعَين سَمَاعاً: (أَحَدُهُمَا) وَصْفُ اسمِ البَاري تَعَالى فَيُقال: هُوَ (الوَاحِدُ) وَهوَ (الأَحَدُ) لاخْتِصاصِهِ بِالأَحَدِيّة، فَلاَ يُشرِكُهُ فِيها غَيْرهُ، وَلِهذا لا يُنْعَت بِهِ غَيْرُ اللهِ. وَالمَوضِع (الثّاني) أَسماءُ العَدَدِ لِلْغَلَبَةِ وَكَثْرَةُ الإِسْتِعْمالِ، فَيُقال: (أَحَدٌ وَ عِشْرُونَ) و (وَاحِدٌ وَ عِشْرُونَ)**}، واتە: بەپێی بیستنی کە لە عەرەبییدا بیستراوە، وشەی (**أَحَد**)، دەبێتە هاووتای وشەی (**واحِد**) لە دوو شوێناندا: یەکەمیان: وەسفکردنی ناوی خوا، چونکە خوا یەکەو تاکەو خوا تایبەتە بە تاکێتییەوە، [واتە: وشەی (**أَحَد**) بە ڕەهایی تەنیا بۆ خوا بەرکاردەهێنرێ، بەڵام هەموو (واحد)ێك

دووان (**إِثْنَيْن**)ی لە بەرانبەرەو، سێ (**ثَلاَثٌ**)ی لە بەرانبەرە، بەڵام (أحد) کاتێك بۆ خوا بەکاردەهێنرێ، واتە: زاتێکە هیچ شتێکی دیکەی لە بەرانبەردا نیەج.

شـوێنی دووەمیـان کـە (**أَحَـد**) بـە مانـای (واحـد) بەکاردەهێـنرێ، لـە کاتێکـدا بـۆ نـاوی ژمـارە بەکاربـێ، لەبـەر ئـەوەی زۆر بەرکارهێـنراوە، دەگوتـرێ: (**أَحَـدٌو عِـشْرُون**) یانـی: بیسـت و یـەك و،(**وَاحِـدٌ وَعَـشْرَون**)، یـەك وبیسـت [جگـە لـەم دوو شـوێنە، هەمیشـە وشـەی (أحـد) و (واحـد) جیـان].

## سەرنجی پێنجەم:

لە بارەی وشەی (الصمد)ەوە:

أ- (الشهاب) کە یەکێکە لە زانایان دەڵێ: وشەی {(**صَمَد) فَعَلٌ بِمَعْنى المَفْعول، وَصَمَد أي: قَصَدَ، إذاً الصَّمَدُ أَيْ: المَصْمودُ، وَهُوَ المَقْصودُ المَطْلوبُ**}، واتە: وشەی (صمد) لەسەر کێشی (**فَعَل**)ە، بەڵام بە مانای (مفعول)ە، کەواتە: (صمد) بە مانای (مصمود) یان (مقصود) کەسێك داوای لێدەکرێ و، ڕووی نیازو مەبەستەکانی تێ دەکرێ، وەك (**قَبَس**) بە مانای (**مَقْبُوس**) یانی: ئاگرێك کە وەردەگیرێ.

ب- (**إبن تيمية**) دەڵێ: لە بارەی وشەی (صمد)ەوە، زانایانی پێشین دوو ڕای سەرەکییان هەبوون:

١- {**الَّذي يُصْمَدُ إِلَيهِ فِي الحَوائِج**}، (صمد): ئەو زاتەیە ڕووی نیازو مەبەستی تێدەکرێ بۆ پێویستییەکان، داوایی لێ دەکرێ.

٢- مانای دووەمیان: {**الصَّمَد هُو الَّذي لاَ جَوْفَ لَه**} ئەو زاتەیە کە بەتاڵایی، بۆشایی نیە.

بۆچی (أل)ی ناساندن چۆتە سەر (**الصَّمَد**)، بەڵام نەچۆتە سەر (**أَحَد**)؟

حیکمەتەکەی ئەوەیە:

لە نێو دروستکراوەکاندا، تەنها زاتێك پێی بگوترێ: (**الأحد**) لە کاتی چەسپاندا تەنیا خوایە، جگە لە خوا هیچ کەسێکی دیکەو، هیچ دروستکراوێکی دیکە بە (**الأحد**) وەسف ناکرێ، بەڵام وشەی (الصمد) بۆیە (أل)ی ناساندنی چۆتە سەر، چونکە جگە لە خواشی پێ وەسف دەکرێ، کەسێك خەڵك داوای لێبکات و چاوەڕوانیی لێی هەبێ، جێی نیازو مەبەستی مرۆڤان بێ، ئەویش وشەی (صمد) ی بۆ بەکاردەهێنرێ، بۆیە (أل) چۆتە سەر (صمد) واتە: ئەو زاتەی بەتەواویی جێی نیازیی و بێنیازی لەو دایە.

٣- خوای پەروەردگار وشەی (الله)ی لەگەڵ (**الصَّمَد**)دا دووبارە کردۆتەوە، لەوبارەوەش (أبو السُّعود) دەڵێ: بۆیە ناوی خوا لەگەڵ (**الصَّمَد**)دا دووبارە بۆتەوە تاکو بزانرێ: هەر کەسێك خاوەنی صەمەدییەت نەبێ، مانای وایە لە خوایەتیی بە دوورە، هەر کەسێك ئەوەنەبێ هەموو دروستکراوەکان پێویستییان پێی هەبێ و داوای لێ بکەن، ئەویش لە هەموویان بێنیاز بێ، هەر کەسێك وا نەبێ، شایستەی پەرستران نیە.

## سەرنجی شەشەم:

ئەوانەی خوای پەروەردگاریان چواندوە بە دروستکراوەکانی، یان دروستکراوەکان دەچوێنن بە خواوە (**المُشَبِّهة**)، وشەی (أللە الصمد)یان بە بەڵگە هێناوەتەوە، لەسەر ئەوەی خوا جیسمە، واتە: خوا لەو شتانەیە کە ئێمە بتوانین بە پێنج هەستەکان دەرکی بکەین! بەڵام ئەمە قسەیەکی پووچە، چونکە وشەی (أحد) پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا لە مادده بێ و لە چەند بەشێك پێکهاتبێ، چونکە هەر شتێك لە مادده بێ لە گەردیلەکان دەبێ، گەردیلەکانیش مۆلکۆل گەرد (**جُزَیئي**) پێك دەهێنن، ئەوانیش شتی لە خۆیان گەورەتر، تاکو سەرەنجام ئەو جەستەیە پێکدێ، بەڵام خوا لە سەرووی ماددەوەیە.

## سەرنجی حەوتەم:

وەك دوایی باسی دەكەین، پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: سوورەتی **(إخلاص)** یەك لەسەر سێی قورئانە، یانی: هەر كەسێك بیخوێنێ، وەك ئەوەیە یەك لەسەر سێی قورئانی خوێندبێ، زانایان لەو بارەوە زۆریان قسە كردوە، ئایا مەبەست لەمە چییە؟

زۆربەی هەرەزۆریان گوتوویانە: بە دڵنیاییەوە مەبەست ئەوە نیە، هەر كەسێك هەموو قورئان بخوێنێ و، یەكێكی دیكە سێ جاران سوورەتی ئیخلاس بخوێنێ، پاداشتەكەی هێندەی هی ئەو كەسەیە كە هەموو قورئانی خوێندوە، ئەدی مەبەست پێی چییە؟

**١-** هەندێكیان گوتوویانە: ئیسلام یان قورئان هەمووی دەبێتەوە بە سێ بەش:

**أ-** یاساكان، **(الأحكام)**،

**ب-** موژدەكان و هەڕەشەكانی خوا

**ج-** ناوو سیفەتەكانی خوا، لەم سوورەتە موبارەكەشدا باسی ناوو سیفەتەكانی خوا كراوە، واتە: یەك لەسەر سێی ئەو ڕاستییانەی لە قورئاندا هاتوون، لەم سوورەتەدا بە پوختیی و بە گوشراویی هاتوون، سێیەكەكەی دیكەش: گفت و بەڵێنی خوا بە بەبڕواداران و هەڕەشەی خوایە لە بێبڕوایان و خراپەكاران.

سێیەكەكەی دیكەش بریتیە لە یاساو حوكمەكانی خوا، **(أبو عباس السُّرَيج)** بۆچوونێكی وای هەبووە.

**٢-** **(أبو حامد الغزالي)** لە **(جَواهِر القُرآن)**دا دەڵێ: قورئان دەبێتەوە بە سێ بەش: **(معرفة الله، ومعرفة الآخرة، ومعرفة الصراط المستقيم)** واتە: قورئان یان باسی ناسینی خوایە، یان باسی زانینی ڕۆژی دواییە، یان باسی ناسینی ڕاستەڕێی خوایە، لەم سوورەتە موبارەكەشدا باسی ناسینی خوا كراوە.

٣- (**إبن القيم**) لە (زاد المعاد)دا دەڵێ: قورئان دەبێتەوە بە سێ بەش: یەکەم: خوا بەیەکگرتن بەزانیاری و کردەوە (**تَوحيد العِلم والعَمل**)، دووەم: خوا بەیەکگرتن بەناسین ویستن (**توحيد المعرفة والإرادة**)، سێ: خوا بەیەکگرتن بەبڕواو بەئامانج گرتن (**توحيد الإعتقادِ وَالقَصد**)، ئەو پێی وایە لەم سوورەتە موبارەکەدا (**توحيد الإعتقادِ وَالقَصد**) هاتوە.

٤- هەندێکیش بێدەنگیان هەڵبژاردوەو گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ وای فەرمووە، بەڵام ئێمە بە وردیی نازانین مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ چییە.

٥- منیش وای تێدەگەم کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك سوورەتی ئیخلاس بخوێنێ، وەك ئەوە وایە سێ یەکی قورئانی خوێندبێ، مەبەست پێی ئەوەیە کەسێك بە بڕوا پێبوون و، کارلێك لەگەڵ کردن و لێ وردبوونەوەو، بە حاڵەتێکی دەروونیی و ڕووحیی هێندە بەهێز بیخوێنێ، کە وەك خوای پەروەردگار ببینێ، کەسێك ئاوا ئەم سوورەتە بخوێنێ، وەك ئەوەیە یەك لەسەر سێی قورئانی خوێندبێ و، ئەگەر سێ جاران بیخوێنێ، وەك ئەوەیە هەموو قورئانی خوێندبێ.

# پێگەی گەورەی ئەم سوورەتەو سوورەتی (الكافرون)و، پاداشتی خوێندنیان

لەو بارەوە پێغەمبەری خاتەم ﷺ چەند فەرمایشتێکی لێ گێڕدراونەوەو ئێمەش دە (١٠) یانمان لە نێودا هەڵبژاردوون:

**١)- {عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رضى الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: مَنْ قَرَأَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، فَكَأَنَّمَا قَرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنْ} (أخرجه أحمد: ٢١٣١٢، قال الهيثمي (١٤٧/٧): رجاله رجال الصحيح. والنسائي في الكبرى: ١٠٥٢١).**

واتە: ئوبەیی کوڕی کەعب ﷺ گووتویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) بخوێنێ، وەك ئەوەیە سێیەکی قورئانی خوێندبێ.

**٢)- {عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضى الله عنه، قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي أُحِبُّ هَذِهِ السُّورَةَ «قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ» فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ} (أخرجه الترمذي: ٢٩٠١، والدارمي: ٣٤٣٥، وابن الضريس: ٢٧٨، من حديث أنس وإسناده لا بأس به، لأجل مبارك بن فضالة، لكن توبع فقد أخرجه: ٧٧٤، من وجهٍ آخر تعليقاً، ووصله الترمذي: ٢٩٠١، وإسناده حسن، رجاله ثقات).**

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە، کە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەم سوورەتەم خۆشدەوێ: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) پێغەمبەری خواش ﷺ پێی فەرموو: خۆشویستنت بۆی، تۆی خستۆتە بەهەشتەوە.

**٣)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضى الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «احْشُدُوا، فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ»، قَالَ: فَحَشَدَ مَنْ حَشَدَ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فَقَرَأَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، ثُمَّ دَخَلَ، فَقَالَ:**

بَعْضُنَا لِبَعْضٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِنِّي سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، إِنِّي لَأَرَى هَذَا خَبَرًا جَاءَ مِنَ السَّمَاءِ، ثُمَّ خَرَجَ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنِّي قُلْتُ: سَأَقْرَأُ عَلَيْكُمْ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، أَلَا وَإِنَّهَا تَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ} (أخرجه أحمد: ٩٥٣١، ومسلم: ٨١٢).

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك فەرمووی کۆببنەوە، چونکە من سێیەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنم، دەڵێ: ئەوەی کۆبوّوە، کۆبۆوە، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدەرو سوورەتی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)ی خوێند، دوایی چووە ژوور، هەندێکمان بە هەندێکمان گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: سێیەکی قورئانتان بەسەردا دەخوێنم، کەچی تەنیا ئەم سوورەتەی خوێند! من پێم وایە ئەوە هەواڵێك بوو لە ئاسمانەوە هات![1] دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەوەدەر، فەرمووی: من گوتم: سێیەکی قورئانتان لەسەر دەخوێنم، ئاگاداربن! ئەم سوورەتە بەرانبەر سێیەکی قورئانە.

٤)- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضى الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ، أَي: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)} (أخرجه أحمد: ١١٣٢٤، والبخاري: ٤٧٢٦).

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەمە بەرانبەر یەك لەسەر سێی قورئانە، واتە: سوورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ).

٥)- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضى الله عنه، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِأَصْحَابِهِ: أَيَعْجِزُ أَحَدُكُمْ أَنْ يَقْرَأَ ثُلُثَ الْقُرْآنِ فِي لَيْلَةٍ؟ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، وَقَالُوا: أَيُّنَا يُطِيقُ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ! فَقَالَ: اللَّهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ، ثُلُثُ الْقُرْآنِ} (أخرجه أحمد: ٢٣٦٠٠، والدارمي: ٣٤٣٧، الترمذي: ٢٨٩٦، وقال: حسن، والنسائي في الكبرى: ١٠٥١٥).

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان بە هاوەڵانی فەرموو: یەکێك لە ئێوە ناتوانێ یەك لەسەر سێی قورئان لە شەوێکدا

(١) بێگومان ئەمە قسەی (أبو هريرة)یە نێواخنی فەرموودەکەی کردوە.

بخوێنێ؟ بەڵام ئەوە لەسەریان قورس بوو، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! کێمان دەتوانێ لە شەوێکدا یەك لەسەر سێی قوڕئان بخوێنێ؟ فەرمووی: (اللَّـهُ الْوَاحِدُ الصَّمَدُ)، (واتە: ئەو سووڕەتەی ئەو وشە موبارەکانەی تێدان)، سێیەکی قوڕئانە.

**٦)- {عَنْ عَائِشَةَ رضى الله عنها، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ رَجُلًا عَلَى سَرِيَّةٍ، وَكَانَ يَقْرَأُ لِأَصْحَابِهِ فِي صَلَاتِهِمْ فَيَخْتِمُ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، فَلَمَّا رَجَعُوا ذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: سَلُوهُ لِأَيِّ شَيْءٍ يَصْنَعُ ذَلِكَ؟ فَسَأَلُوهُ فَقَالَ: لِأَنَّهَا صِفَةُ الرَّحْمَنِ، وَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللَّهَ يُحِبُّهُ} (أخرجه البخاري: ٧٣٧٥، ومسلم: ٨١٣).**

واتە: دایکمان عائیشە ﵂ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ بەشێك لە سوپای ناردوە، پیاوێکیان لەگەڵدا بووە (ئەو پیاوە سەرپەرشتیاریان بووە) کە نوێژی دەکرد بۆ هاوەڵەکانی هەر کۆمەڵە ئایەتێك، یان سووڕەتێکی خوێندبایە لە کۆتاییدا سووڕەتی (قُلْ هُوَ اللَّـهُ أَحَد)یشی دەخوێند! کاتێك گەڕانەوە ئەوەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ **باسکرد**، ئەویش فەرمووی: لێی بپرسن بۆچی وای کردوە؟ لێیان پرسی، گوتی: لەبەر ئەوەی ئەم سووڕەتە سیفەتی (خوای) بەزەییە، منیش حەز دەکەم بیخوێنم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەواڵی پێ بدەن خوا خۆشیدەوێ.

**٧)- {عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ يَؤُمُّهُمْ فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ، فَكَانَ كُلَّمَا افْتَتَحَ سُورَةً يَقْرَأُ لَهُمْ فِي الصَّلَاةِ فَقَرَأَ بِهَا، افْتَتَحَ بِقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْهَا، ثُمَّ يَقْرَأُ بِسُورَةٍ أُخْرَى مَعَهَا، وَكَانَ يَصْنَعُ ذَلِكَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَكَلَّمَهُ أَصْحَابُهُ، فَقَالُوا: إِنَّكَ تَقْرَأُ بِهَذِهِ السُّورَةِ، ثُمَّ لَا تَرَى أَنَّهَا تُجْزِئُكَ حَتَّى تَقْرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى، فَإِمَّا أَنْ تَقْرَأَ بِهَا، وَإِمَّا أَنْ تَدَعَهَا وَتَقْرَأَ بِسُورَةٍ أُخْرَى، قَالَ: مَا أَنَا بِتَارِكِهَا إِنْ أَحْبَبْتُمْ أَنْ أَؤُمَّكُمْ بِهَا فَعَلْتُ، وَإِنْ كَرِهْتُمْ تَرَكْتُكُمْ، وَكَانُوا يَرَوْنَهُ أَفْضَلَهُمْ وَكَرِهُوا أَنْ يَؤُمَّهُمْ غَيْرُهُ، فَلَمَّا أَتَاهُمْ النَّبِيُّ ﷺ أَخْبَرُوهُ الْخَبَرَ، فَقَالَ يَا فُلَانُ! مَا يَمْنَعُكَ مِمَّا يَأْمُرُ بِهِ أَصْحَابُكَ، وَمَا يَحْمِلُكَ أَنْ تَقْرَأَ هَذِهِ السُّورَةَ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ؟، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أُحِبُّهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِنَّ حُبَّهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ} (أخرجه البخاري: ٨٧٤، تَعْلِيقاً، ووصله الترمذي:**

**٢٩٠١، من حديث أَنَس، وَإسنَاده حسن، وورد من وجه آخر مختصراً، أخرجه ابن حبان: ٧٩٢، والترمذي: ٢٩٠١).**

واتـە: ئەنـەس ﷺ دەڵـێ: پیاوێـك لـە پشـتیوانان لـە مزگەوتـی قوبـا پێشـنوێژیی بـۆ دەکـردن، هـەر سـوورەتێکی خوێندبووایـە، ئـەم سـوورەتەی پێشـێ دەخوێنـد سـوورەتی (**قُـلْ هُـوَ اللَّـهُ أَحَـدٌ**) هەتـا تـەواوی دەکـرد، دوایـی سـوورەتێکی دیکـەی لەگـەڵ دەخوێنـد، لـە هەمـوو ڕکاتێکـدا وای دەکـرد، هاوەڵەکانـی گوتیـان: تـۆ بـە خوێندنـی سـوورەتی (**قُـلْ هُـوَ اللَّـهُ أَحَـدٌ**) دەسـت پـێ دەکـەی، ئایـا پێـت وانیـە بـەرت کەوتبـێ، یـان تەواوبـێ، هەتـا سـوورەتێکی دیکەیشـی لـەدوا دەخوێنـی؟ یـان هـەر ئـەو سـوورەتە بخوێنـە، یـان مەیخوێنـەو ئـەوەی دیکـە بخوێنـە، ئەویـش گوتـی: واز لـە خوێندنـەوەی ئـەو سـوورەتە ناهێنـم، ئەگـەر حـەز دەکـەن ئـاوا پێشـنوێژییتان بـۆ دەکـەم، ئەگـەر حەزیـش ناکـەن وازتـان لـێ دەهێنـم، ئەوانیـش پێیـان وابـوو لـە هەموویـان باشـترە پێشـنوێژییان بـۆ بـکات و، حەزیـان نەکـرد یەکێکـی دیکـە پێشـنوێژییان بـۆ بـکات، ئنجـا کاتێـك پێغەمبـەری خـوا چـوو بـۆ لایـان، ئـەو هەواڵەیـان پێـدا، فەرمـووی: فلانکـەس! چ شـتێك ڕێـت لـێ دەگـرێ، ئـەوەی هاوەڵانت فەرمانـت پـێ دەکـەن، بیکـەی؟ (چ شـتێك وات لێدەکات لـە هەمـوو ڕکاتێکـدا ئـەم سـوورەتە بخوێنـێ؟) ئەویـش گوتـی: خۆشـمدەوێ، پێغەمبـەری خـواش ﷺ فەرمـووی: خۆشویسـتنی تـۆ بـۆ ئـەو سـوورەتە، تـۆی خسـتۆتە بەهەشـتەوە.

٨)- {**عَنْ مُعَاذِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ خُبَيْبٍ عَنْ أَبِيهِ رضى الله عنها، قَالَ أَصَابَنَا طَشٌّ وَظُلْمَةٌ، فَانْتَظَرْنَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِيُصَلِّيَ لَنَا، فَخَرَجَ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَقَالَ: قُلْ، فَسَكَتُّ، قَالَ: قُلْ، قُلْتُ: مَا أَقُولُ قَالَ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ حِينَ تُمْسِي وَحِينَ تُصْبِحُ ثَلَاثًا، يَكْفِيكَ كُلَّ يَوْمٍ مَرَّتَيْنِ**} **(أخرجه أبو داود: ، والترمذي: وقال حسن صحيح غريب).**

واتـە: (**معـاذ**)ی کـوڕی (**عبداللـە**)ی کـوڕی (**خُبَیـب**) لـە باببیـەوە ﷺ دەگێڕێتـەوە دەڵـێ: جارێـك نمـە بارانێـك بـاری و تاریکاییـەك ڕووی تێکردیـن، ئێمـەش چاوەڕێـی

پێغەمبەری خوامان ﷺ کرد، نوێژمان بۆ بکات، (وا پێدەچێ نوێژی شێوان یان خەوتنان بووبێ)، ئەویش دەرچوو، دەستی گرتم، فەرمووی: بڵێ، منیش بێدەنگ بووم، دووبارە فەرمووی: بڵێ. گوتم: چی بڵێم؟ فەرمووی: هەر سێ سوورەتی (**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَالْمُعَوِّذَتَيْنِ**) بخوێنە، کاتێك بەیانی دەکەیەوەو ئێوارە دەکەیەوە، سێ جاران بیانخوێنە، ئەو کاتە لە شەوو ڕۆژدا دوو جاران ئەو سێ سوورەتە بۆ تۆ بەسن.

لە ڕیوایەتێکی دیکەی نەسسائییدا هاتووە: (**تكفيك كلَّ شيء**)، لە جیاتی هەموو شتێك بۆ تۆ بەسن، واتە: هەموو خێرێکت بۆ دەستەبەر دەکەن.

**٩)-** لەو بارەوە کە ئەگەر سوورەتی ئیخلاس بکرێتە دووعا، ڕەت ناکرێتەوە، بە مەرجێك لە دڵ و دەروونێکی پاکەوە بخوێنرێ، ئەم دەقە هاتوە:

**{عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ عَنْ أَبِيهِ ﷺ، قَالَ خَرَجَ بُرَيْدَةُ عِشَاءً، فَلَقِيَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَأَخَذَ بِيَدِهِ فَأَدْخَلَهُ الْمَسْجِدَ، فَإِذَا صَوْتُ رَجُلٍ يَقْرَأُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: تُرَاهُ مُرَائِيًا؟ فَأَسْكَتَ بُرَيْدَةُ، فَإِذَا رَجُلٌ يَدْعُو فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، الْأَحَدُ الصَّمَدُ، الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَقَدْ سَأَلَ اللَّهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ، الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٢٩٣٦١، وأحمد: ١٣٨٢٤، وأبو داود: ١٤٩٥، والترمذي: ٣٥٤٤، وقال: حسن غريب. والنسائي: ١٣٠٠، وابن ماجه: ٣٨٥٨، وابن حبان: ٨٩٣، والحاكم: ١٨٥٦، وقال: صحيح على شرط مسلم).**

واتە: ئیبنو بورەیدە لە بابییەو ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بورەیدە جارێك چۆتە مزگەوت، دەنگی پیاوێك هاتوە خوێندوویەتی (نوێژی کردوەو پاڕاوەتەوە) پێغەمبەریش فەرمووی: بەڕیابازی نابینی؟ بورەیدەش بێدەنگ بوو، ئنجا پیاوێك دەپاڕایەوە گوتی: داوات لێ دەکەم بەهۆی ئەوەوە کە من شاهێدیی دەدەم

بێجگە لە تۆ هیچ پەرستراوێك نیە تۆ تاكی جێی نیازو بێ نیازی، ئەو زاتەی كەست لێ نەبووەو لە كەس نەبووی، هیچ هاوتایەكی نیە، پێغەمبەری خواش ﷺ (كە گوێی لەم دووعایە بوو) فەرمووی: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بەدەستە، داوای لە خوا كردوە بە ناوی هەرە مەزنی، كە ئەگەر بەو ناوەی داوای لێ بكرێ دەبەخشێ، ئەگەر بەو ناوەی پاڕانەوەی لێ بكرێ، وەڵام دەداتەوە.

**١٠)**- سوورەتی ئیخلاس و فەلەق و ناس، هۆی پارێزران و شیفان بۆ مرۆڤ:

**{عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ، جَمَعَ كَفَّيْهِ، ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ، يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ} (أخرجه البخاري: ٦٣٢٠، ومسلم: ٢٧١٤، والترمذي: ٣٤٠٢، وغيرهم).**

واتە: دایكمان عائیشە ﵂ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەر شەوێك چۆتە سەر جێگایەكەی، هەردوو لەپە دەستی كۆكردوونەوە، ئینجا ئەو سێ سوورەتەی تێدا خوێندوون: (**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ**) فووی لێكردوون، دوایی دەستی بە پێشەوەو دواوەی جەستەی خۆیدا هێناون، ئەوەندەی دەستی گەیبێتێ، بەسەری و ڕووی پێشەوەی جەستەی دەستی پێكردوە، هەموو شەوێك سێ جاران بەو شێوەیەی كردوە.

واتە: بۆی دەبن بە پەرژین و قەڵا لە بەرانبەر شەیتان و جڕوجانەوەرو، هەر مەترسییەكدا، ڕوو لە ئینسان بكات.

لە بارەی هەردوو سوورەتی (الإخلاص) و (الكافرون)ەوە، ئەو گێڕانەوانەش دەهێنین:

**١)- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ فِي رَكْعَتَيْ الْفَجْرِ: قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} (أخرجه مسلم: ٧٢٦).**

واتە: ئەبوو هورەیرە رضی الله عنه، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی بەر لە نوێژی بەیانیدا، لە ڕکاتی یەکەمدا (**قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ**)ی دەخوێندو، لەڕکاتی دووەم دا(**قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ**)ی دەخوێند.

**٢)- {عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضى الله عنهما قَالَ: رَمَقْتُ النَّبِيَّ ﷺ شَهْرًا، فَكَانَ يَقْرَأُ فِي الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ، بِقُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ، وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ} (أخرجه ابن ماجه: ١١٤٩، والترمذي: ٤١٧، والنسائي في الكبرى: ١٠٦٤).**

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنه، دەڵێ: مانگێك چاودێریی پێغەمبەری خوام ﷺ کرد، تەماشایم دەکرد لە دوو ڕکاتی پێش بەیانیدا، لە ڕکاتی یەکەم دا (دوای سوورەتی فاتیحە) سوورەتی (کافرون)ی دەخوێندو، لە ڕکاتی دووەمیشدا (دوای فاتیحە) سوورەتی ئیخلاصی دەخوێند.

**٣)-** پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتی (الكافرون) و سوورەتی (الإخلاص)ی لە دوو ڕکاتی ڕاتیبەی دوای نوێژی شێواندا خوێندوون[1].

**٤)-** هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی دوای تەواوبوونی تەوافدا، سوورەتی (الكافرون)ی لە ڕکاتی یەکەمدا (لە دوای سوورەتی فاتیحە) خوێندوەو، سوورەتی (الإخلاص)یشی لە ڕکاتی دووەم (لە دوای فاتیحە) خوێندوە[2].

**٥)-** هەروەها لە نوێژی ویتردا پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتی (الإخلاص)ی لە ڕکاتی کۆتایی نوێژی وەتردا خوێندوەو، لە سێ ڕکاتە وەترەکەدا، لە ڕکاتی یەکەمدا، دوای فاتیحە سوورەتی (**الأعلى**)ی خوێندوەو، لە ڕکاتی دووەمدا سوورەتی (الكافرون)و، لە ڕکاتی سێیەمیشدا سوورەتی (الإخلاص)[3].

---

(١ـ أخرجه الترمذي: ٤٣٣، وابن ماجه: ١١٦٦.

(٢ـ أخرجه مسلم: ١٢١٨.

(٣ـ أخرجه الترمذي: ٤٦٣.

کەواتە: ئەم سوورەتی (الإخلاص) پێگەو مەقامێکی زۆر بەرزی هەیە، هەروەها سوورەتی (الکافرون)یش بە هەمان شێوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات ئەو دوو سوورەتە لەو کاتانەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندوونی، بخوێنین، زۆر باش تێیان دا قووڵ ببینەوەو بیریان لێ بکەینەوە.

کۆتا قسەشم ئەوەیە کە بێگومان سوورەتی (الکافرون) وەك زانایان گوتوویانە: ((**توحید العملي**) خوا بە یەکگرتن بە کردەوەی تێدایە، چونکە ئەو سوورەتە ڕاگەیاندنە بە بێبڕوایەکان کە من ئەوانەی ئێوە دەیانپەرستن ناپەرستم و، ئێوەش پەرستارانی ئەوە نابن کە من پەرستوومە، هەروەها منیش پەرستەری ئەوە نابم کە ئێوە دەیانپەرستن و، ئێوەش پەرستەری ئەوە نابن کە من دەیپەرستم، ئایین و بەرنامەی خۆتان بۆ خۆتان و، بەرنامەی خۆم بۆ خۆم، ئەمەش خوا پەرستیی کردەییە.

بەڵام لە سوورەتی (الإخلاص)دا، باسی خوا بە یەکگرتنی زانیاریی (التوحید العلمي) یە، واتە: کە لە ڕووی زانیارییەوە یەکتایی خوا بزانی.

## دەستپێک

بەڕێـــزان!

ئەمـڕۆ (٩)ی (محـرم)ی سـاڵی (١٤٤٢) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/ ٨/٢٨) زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی (الفلق)، سـەرەتاش لەحـەوت بڕگـەدا پێناسـەی دەکەیـن:

## پێناسەی سووڕەتغ (الفلق) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئـەم سـووڕەتە زیاتـر بـە سـووڕەتی (الفلـق) نـاسراوە، بـەڵام نـاوی سـووڕەتی: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١﴾یشـی بـۆ بەکارهێـنراوە.

هەروەهـا ئـەم سـووڕەتەو سـووڕەتی (النـاس)، نـاوی (**المُعَوِّذَتَيْن**)یـان بـۆ بەکارهێـنراوە، واتـە: ئـەو دوو سـووڕەتەی پەنـا بـە مـرۆڤ دەگـرن بـە خـوای پـەروەردگار.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

لـە بـارەی شـوێنی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم سـووڕەتەو سـووڕەتی (الناس)یشـەوە، ڕاجیاییەکـی زۆر هەیـە، حەسـەنی بەسـڕایی و عیکریمـەو جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵا (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، گوتوویانـە: ئـەم سـووڕەتە (مەککەیی)یـە و لـە مەککـە دابەزیـوە.

ئیبنو عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە یەکێك لە دوو قسەکانیدا، هەروەها قەتادەش دەڵێن: سووڕەتێکی (مەدینەیی)یە، واتە: ئیبنو عەبباس قسەیەکیشی هەیە کە ئەم سووڕەتە مەککەیی بێ.

بەڵام بەپێی گێڕدراوەکان کە دوایی دەیانهێنین، مەدینەیی بوونی سووڕەتی (الفلق)، هەروەها سووڕەتی (الناس)یش بەهێزترە، هەندێکیش لە زانایان، چ بۆ ئەم سووڕەتە، چ بۆ هەندێ ئایەت، یان سووڕەتی دیکە گوتوویانە: لە مەککەش دابەزیون و، لە مەدینەش دووبارە دابەزیونەوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و لە دابەزین:

لە موصحەفدا سووڕەتی (الفلق) ژمارەکەی سەدوسێزدە (١١٣)یە، واتە: سووڕەتی پێش کۆتاییە، لە دابەزیندا ئەگەر مەککەیی بێ، ژمارە بیست (٢٠) و، ئەگەر مەدینەییش بێ، لە دوای ژمارە سەد (١٠٠)ەوەیە، ڕەنگە هەندێکیش لە زانایان بڵێن: لە (١٠٠) کەمترە، یان لە سەدو ئەوەندەیەمینە، گرنگ ئەوەیە زانیارییەکی ورد لەوبارەوە نیە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بە یەکدەنگیی توێژەرەوانی ئایەتەکانی قورئان، ئەم سووڕەتە موبارەکە پێنج ئایەتە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە، بریتیە لە فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی محمد ﷺ، کە پەنا بەخوا بگرێ، پەروەردگاری قڵیشاندنی سپێدەی بەرەبەیان، کە لە تاریکیی شەوی جیا دەکاتەوە، یان پەروەردگاری قڵیشاندنی هەموو

تـۆو نێوکـەکان، کـە دوایـی چەکـەرە دەدەن، یـان پـەروەردگاری قڵیشـاندنی بـوون (وجـود)و جیاکردنـەوەی لـە نەبـوون (عـدم)، بۆچـی پەنـا بەخـوا بگـرێ؟ لـە خراپـەو زیانـی دروسـتکراوەکانی، ئنجـا دوایـی لـە نێـو دروسـتکراوەکاندا، سـێیان بـە تایبـەت باسـکراون:

**یەکەمیان:** شەوێك کە تاریك دادێ.

**دووەمیان:** جادووگەرانی فوو لە گرێیانکەر.

**سێیەمیان:** حەسوودێکی ئێرەیی بەر، کە حەسوودییەکەی دەخاتە حاڵەتی کردەییەوە.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

پێنـج ئایەتەکـەی ئـەم سـوورەتە، تەنیـا لـەم سـوورەتەدا هاتـوون، هـەروەك ئایەتەکانـی سـوورەتی (الإخـلاص) و، هەندێـك لـە سـوورەتەکانی دیکـەش هەروابوون.

**١-** خوای پەروەردگار کە دەفەرمویٚ: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ ﴾ **الفلق**، ئەمە تەنیا لێرەدا هاتوە، بلّێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری (فلق)، واتە: قلّیشاندن، جیاکردنەوە، کە مەبەست پێی بەرەبەیانە کە لە تاریکیی شەو جیا دەبێتەوە، یاخود قلّیشێندرانی هەموو تۆو نێوکەکانە، یاخود پەیدابوونی هەموو ژیانلەبەرەکانە، یاخود پەیدابوونی هەموو گەردوون و بوونە.

**٢-** لە خراپەی ئەوەی خوا دروستیکردوە، خوای پەروەردگار دروستکراوەکانی هەموو بە باشترین شێوە دروست کردوون، بەڵام هەندێك لە دروستکراوەکان بۆ تاقیکردنەوەی ئێمە، بۆ ئێمە جێی زیانن، درندەیەك کەسێك دەخوات، مارێك بە کەسێکەوە دەدات، ئێستا لەم ڕۆژگارەدا (٢٠٢٠/٨/٢٨ز) ڤایرۆسی کۆڤید نۆزدە (١٩)، کۆرۆنا، بە هەزاران کەسی کوشتوەو، ڕەنگە لە چەند ملیۆنیش تێپەڕێنێ، ئەوانە هەموویان دروستکراوی خوان، بەڵام زیانیش دەگەیەنن بە مرۆڤەکان، لەبەر ئەوەی خوا ئەم ژیانی دنیایەی داناوە، تێیدا تاقی بکرێینەوە، بە خۆشییان و بە ناخۆشییان.

٣- ﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ ﴾، لە خراپەی شەو كە تاریك دادێ.

٤- ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ ﴾، لە خراپەو زیانی ئافرەتانی جادووگەر كە فوو لە گرێیەكان دەكەن.

٥- ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾، لە خراپەی بابای حەسوود وەختێك ئیرەیی دەبات، یانی: حەسوودییەكەی دەخاتە حاڵەتی كردەییەوە.

ئەم پێنج ئایەتەی ئەم سوورەتە موبارەكە، تەنیا لێرەدا هاتوون.

## حەوتەم دابەشكردنی ئایەتەكان:

ئێمە ئەم سوورەتە موبارەكە بە هەر پێنج ئایەتەكەیەوە، دەكەین بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە پێنـج (٥) ئایەتـی کـە ئـەم سـوورەتە موبارەکـە پێکدێنـن، پێـك دێ: (١-٥)، خـوای پـەروەردگار دوای (بسـم اللـه الرحمـن الرحیـم) بـە پلـەی یەکـەم فەرمـان دەکات بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ و، بـە پلـەی دووەم بـە هـەر کەسێکی دیکـە کـە بەرێـی ئـەودا دەڕواو قورئـان دەخوێنـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ۝١ ﴾**الفلـق**، بڵـێ: پەنـا دەبەمـە بـەر پـەروەردگاری (فلـق)، کـە یـان بـە مانـای بەیانییـە، سـپێدەی بەیانیـی، یـان بـە مانـای قڵیشـاندنی دروسـتکراوەکانەو، جیاکردنەوەیانـە لـە تاریکییـی و نەبـوون، یـان هێنرانـە دی ژیاندارانـە، یان قڵیشـاندنی تـۆو نێوکەکانـە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلْحَبِّ وَٱلنَّوَىٰ ۝٩٥ ﴾**الأنعـام**.

﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ ﴾، لـە خراپـەی ئـەوەی ئـەو خـوا پـەروەردگارە هێناویەتـە دی، دروستیکردوە.

ئنجـا هەندێـك لـە زانایـان ویسـتوویانە ئـەوە پینـەو پـەڕۆ بکـەن، یەکێـك لەوانـە شـێخ موحەممـەد عەبـدە (ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ)، لـە تەفسـیری سـوورەتی بەشـی جـزء (عـم)داو تەفسـیری ئـەم سـوورەتەدا، دەڵـێ:

خـوای پـەروەردگار دروسـتکراوەکانی هەمـوو بـە باشـترین شـێوە دروسـت کـردوون، ئـەوەش گومانـی تێدانیـە کـە وایـە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِىٓ أَحْسَنَ كُلَّ شَىْءٍ خَلَقَهُۥ ۝٧ ﴾**السـجدة**، واتـە: خـوا هـەر شـتێکی دروسـتکردبێ، بـە باشـترین شـێوە دروسـتیکردوە، بـەڵام دوایـی دەڵـێ: دوو پشـکێك کـە پێـوە دەدا ئەرکـی خـۆی جێبەجـێ دەکات، دڕندەیـەك کـە کەسـێك دەخـوات، یاخـود ئاژەڵـی کەسـێك دەخـوات، ئـەوە ژیانـی ئاسـایی خـۆی بـەڕێ دەکات، بـەڵام مرۆڤـەکان دەبـێ لـە خۆیـان وریابـن و لـە مامەڵەیـان لەگـەڵ دروسـتکراوەکاندا تووشـی زیـان نەبـن.

منیش پێم وایە: خوای کاربەجێ ئەم ژیانی دنیایەی وا هەڵخستوە، خۆشییشی تێدابن و ناخۆشییشی تێدابن، شتی وای تێدابێ کە سوودمان پێ بگەیەنێ و، شتی واشی تێدابێ زیانمان لێ بدات، هەورە تریشقەیەك دێ جاری وا هەیە دە پازدە کەس پێیەکەوە دەکوژێ، شوێنێك وێران دەکات، پارچە نەیزەکێك دێتە خوارێ، شارێك کاول دەکات، بوومەلەرزەیەك دێ، وڵاتێك کاول دەکات، ئەوانە هەموویان دروستکراوی خوان و زیانیشیان هەیە، چونکە ئێمە لەم سەر زەوییە خوای کارزان بۆ تاقیکردنەوەی داناوین، ئایە بەچی تاقیمان دەکاتەوە؟ بۆ خۆی فەرموویەتی: ﴿وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ۝٣٥﴾**الأنبياء**، واتە: ئێوە تاقی دەکەینەوە بە زیان و بە قازانج، یان بەشتێك کە بۆ ئێوە خراپەو بە شتێك کە بۆ ئێوە چاکە، یان بەشتێك کە پێتان ناخۆشەو شتێکیش کە پێتان خۆشە، وشەی (الشر) هەموو ئەو واتایانەی هەن، وشەی (الخیر) واتە: (**مَا يَرغَبُ فيهِ الكُلّ**) خێر ئەو شتەیە کە هەموو لایەك بۆی تامەزرۆن، (الشر) پێچەوانەیەتی، واتە: (**مَا يَرغَبُ عَنه الكُلّ**) ئەوەی هەمووان حەزی لێناکەن و نایانەوێ، خوا دەفەرموێ: ئێوە بە شەڕو بە خێر تاقی دەکەینەوە، دوایی بۆ لای ئێمە دەگێڕدرێنەوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣﴾**الفلق**، هەروەها پەنا بگرە بە خوا بە پەروەردگاری بەدیهێنان و قڵیشاندنەکان، بە هەموو واتاکانیانەوە، لەشەو کە تاریك دادێ، (غَاسِقٍ ) واتە: شەو، (إِذَا وَقَبَ ) کاتێك تاریك دادێ و دێ، (وَقْب) بە کونێك دەگوترێ ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە، کەواتە: (إِذَا وَقَبَ ) یانی: کاتێك دێ، وەك چۆن ئاو دەچێتە نێو کونە بەردەکەوە، کە بە کوردیی (ماقۆڕ)ی پێدەڵێن، ئەو بەردەی ئاوی تێدا کۆدەبێتەوە (ئاوی باران)و خەڵك دەیخواتەوە.

﴿وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ۝٤﴾، لە خراپەو زیانی ئافرەتانی فووکەر بە گرێیاندا، کە مەبەست پێی ئافرەتانێکە جادوو دەکەن و فوو لە گرێیەکان دەکەن.

﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾، لە خراپەو زیانی بابای حەسوود، کاتێك حەسوودییەکەی بەکاردێنێ، ئەگەر هەر لە ناخی خۆیدا بێ، ئەوە بۆ خۆی خراپە، بەڵام کاتێك کە بەپێی ئیرەیی و حەسەدەکەی ڕەفتار دەکات، ڕەنگە بیەوێ زیان لە بەرانبەرەکەی بدات بە شێوەیەك لە شێوەکان، تۆ پەنای لێ بەخوا بگرە، کە شتێکی پەنهانە.

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەزەیی بەخشندە. بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری سپێدە (ی قڵیشاو) ﴿١﴾ لە خراپەو زیانی ئەوەی دروستیکردوە (سەرجەم دروستکراوان) ﴿٢﴾ (هەروەها) لە خراپەو زیانی شەوی تاریك کە دادێ ﴿٣﴾ دیسان لە خراپەو زیانی (ئافرەتانی جادووگەری) فووکەران لە گرێیان (بۆ جادوو کردن) ﴿٤﴾ هەروەها لە خراپەو زیانی ئیرەیی بەر کاتێك ئیرەیی دەبات (و کار بە حەسوودییەکەی دەکات) ﴿٥﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَعُوذُ): واتە: پەنا دەگرم، پەنا دەبەم، (**العَوْذُ: الإلْتِجاءُ إلى الغَيْرِ وَالتَّعَلُّقُ بِهِ، يُقَالُ: عَاذَ فُلانٌ بِفُلانٍ، وَعَوَّذَهُ: إذَا وَقَاهُ، العَوذة: التَّميمَةِ وَالرُّقيَّةِ**)، (عَوْذ): بریتیە لە پەنا پێ بردن بە غەیرو پێوە پەیوەست بوونی، دەگوترێ: (**عَاذَ فُلانٌ بِفُلانٍ**)

فڵانکەس پەنای بردە بەر فڵانکەس، (وَعَوَّذَهُ) واتە: پەنای دا، پاراستی، (عُوذَة): بەو دوعایە دەگوترێ کە دەکرێ و دەنووسرێ، ئەگەر هەڵبواسرێ، پێی دەگوترێ: (تَمِيمَةِ) بەڵام ئەگەر، هەڵنەواسرێ، پێی دەگوترێ: (رُقيَّة).

(ٱلْفَلَقِ ): (الفَلْقُ: شَقُّ الشَّيْءِ وَإِبَانَةُ بَعْضِهِ عَنْ بَعْض، أَي: الصُّبْح) (فلق): بریتیە لە قڵیشاندنی شتێك و جیاکردنەوەی هەندێکی لە هەندێکی، (فَلَق)یش بە سەری لامەکە واتە: بەیان.

هەڵبەتە (الفَلَق) مانای دیکەشی هەر هەن، (فَلَق) هەر قڵیشاوێکە، هەر جیاکراوەیەکە، بەرەبەیان بۆیە پێی دەگوترێ: (الفَلَق) چونکە ڕووناکیی بەرەبەیان لە تاریکیی شەو جیادەبێتەوە، هەروەها دروستکراوەکان بوونیان لە نەبوونیان جیادەبێتەوە، هەروەها ژیاندارەکان بە هەموو جۆرەکانیانەوە لە ئەمیباوە بگرە تاکو گەورەترین ژیاندار لە ڕووی قەبارەوە، کە نەهەنگی شینە لە دەریاداو، فیلە لە وشکانییدا، هەموو ژیاندارەکان کاتێك ژیانیان پێ دەبەخشرێ و لە ماددەی بێ ژیان جیادەبنەوەو نەشونمایان دەبێ، جموجۆڵیان دەبێ، گەشە کردنیان دەبێ، هاتن و چوونیان دەبێ، هەروەها دەشگونجێ قڵیشاندن بە مانای قڵیشاندنی تۆو نێوکەکان بێ، کە دەقڵیشێن و چەکەرەیان لێ دێتەدەر، تۆو نێوکەکان خۆیان لە بەین دەچن، بەڵام جارێکی دیکە درەختێك، یاخود ڕووەکێك لەوان بەرهەم دێ.

(شَرِّ): (الشَّرّ: الَّذي يَرْغَبُ عَنْهُ الكُلُّ، كَمَا أَنَّ الخَيْرَ هُوَ الَّذي يَرْغَب فيهِ الكُلُّ، وَالشرُّ: المكْرُوه، رَجُلٌ شَرٌّ وَشِرِّيرٌ: مُتَعَاطٍ لِلشَّرِّ)، (شَر): ئەو شتەیە کە هەموو لایەك نایانەوێ، هەروەك چۆن خێر ئەو شتەیە کە هەمووان دەیانەوێ و بۆی تامەزرۆن، شەڕ بە مانای شتی ناپەسند دێ و، دەگوترێ: پیاوێکی خراپ وخراپەکار (الشَّرُّ و شرِّير)، ئەو پیاوەی هەمیشە خەریکی خراپەیە.

(غَاسِقٍ ): (غَسَقُ اللَّيْلِ: شِدَّةُ ظُلْمَتِهِ، والغَاسِق: اللَّيْل المُظْلِمُ)، (غَسَقُ اللّيل) شەوێك كە تاریكییەكەی زۆر خەست و سەخت دەبێتەوە، (غاسق) واتە: شەوی تاریك.

(إِذَا وَقَبَ ): دەگوترێ: (وَقَبت الشَّمْسُ تَقِبُ وَقْباً، أي غَابَتْ، وَقَبَ القَمَرُ دَخَلَ في الخُسوُفِ، وَقَبَ الشَّيْءَ: أَدخَلَهُ في شيءٍ، وَالوَقْبَة: نَقْرَةٌ في صَخرٍ يَجْتَمِع فيها المَاءُ)، خۆر كە ئاوا دەبێ دەگوترێ: (وَقَبتِ الشَّمسُ تَقِبُ وَقْباً)، خۆرەكە، ئاوابوو خۆرەكە، ئاوادەبێ، وەك ئەوەی كەوتبێتە چاڵێكەوە، (وَقَب القمر) مانگەكە گیرا، (وقَبَ الشَّيءَ) شتەكەی خستە نێو كونێكەوە، (وَقْبة): كونێكە لە بەردێكدا، ئاوی تێدا كۆ دەبێتەوە، بەكوردیی بەو بەردەی ئاوی تێدا كۆدەبێتەوە دەگوترێ: (ماقۆڕ): زۆر كەس لە چیاو چۆڵ ئەگەر ئاوێكی وایان دەستبكەوێ، زۆر سوپاس و ستایشی خوا دەكەن.

(ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ ): كۆی (نَفَّاثَة)یە، ڕێژگەی زێدەڕۆییە بۆ (نافِثَة)، ئەویش لە (نَفْث)ەوە هاتوە، (النَّفْثُ: قَذْفُ الرِّيقِ القَلِيلِ، وَهُوَ أَقَلُّ مِنَ التَّفْلِ، وهو أَقَلُّ من البُصاق، ونَفْثُ الرَّاقي وَالسَّاحِرِ، أَنْ يَنْفُثَ فِي عَقْدِهِ، وَقيلَ: لَوْ سَأَلْتَهُ نُفَاثَةَ سِوَاكٍ، مَا أَعْطَاكَ، أَي: مَا بَقِيَ فِي أَسْنَانِكَ فَنَفَثْتَ بِهِ) (نَفْث): بریتیە لە تۆزە تفێكی كەم، كە لەگەڵ فوودا دەڕوا، كەمترە لە (تَفْل) ئەویش كەمترە لە (بُصاق) تف فڕێدان، بابای دوعاكەر یان جادووكەر كە فوو دەكات، واتە: فوو لە گرێیەكە دەكات، لە زمانی عەرەبییدا هاتوە دەڵێ: (لَوْ سَأَلْتَهُ نُفَاثَةَ سِواكٍ مَا أَعْطَاكَ) ئەگەر بە ئەندازەی (نُفَاثَةَ)ی سیواكێكیش داوای لێ بكەی ناتداتێ، (نُفَاثَةَ): بریتیە لەوەی كە لەسەر ددانت دەمێنێتەوە، دوایی بەهۆی سیواكەوە لادەچێ.

(ٱلْعُقَدِ ) (جمع عُقْدة): واتە: گرێ، كاتی خۆی و ئێستاش عادەت وایە ئەوانەی جادوو دەكەن بە زۆریی گرێ لە شتێك دەدەن، هەندێك دوعا دەخوێنن، ناوی شەیتانەكان دێنن، لەگەڵ هەر گرێیەكدا ناوی شەیتانێك دێنن، لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو جادووە دەگرێ.

(حَسَدَ): (الحَسَـدُ: تَمَنِّـي زَوَالِ نِعْمَـةٍ مِـنْ مُسْـتَحَقٍّ لَهَـا، وَرُبَّمَـا كَانَ مَـعَ ذَلِـكَ سَـعِي فِي إِزَالَتِهَـا، قِيـلَ: «الْمُؤْمِـنُ يَغْبِـطُ وَالمُنَافِـقُ يَحْسُـدُ»)، (حَسَـد): بریتیـە خۆزگـە خواسـتنی لاچوونـی چاکەیـەك لـە کەسـێك کـە شایسـتەیەتی، جـاری وا هەیـە لەگـەڵ ئـەو بەئـاوات خواسـتنەدا، هـەوڵ و کۆشـیش هەیـە بـۆ لادانـی، گوتـراوە: بـڕوادار خۆزگـە دەخـوازێ، بـەڵام موونافیـق حەسـوودیی دەبـات.

(غِبْطَـة): بریتیـە لـە خۆزگـە خواسـتن، (غِبْطَـة) ئەوەیـە تـۆ پێـت خۆشـبێ، وەك ئـەوت هەبـێ، جـاری واش هەیـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وشـەی (حَسَـد)ی بـە مانـای (غِبْطَـة) بەکارهێنـاوە، بـۆ وێنـە دەفەرمـوێ:

{لَا حَسَـدَ إِلَّا فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُـلٌ آتَـاهُ اللَّـهُ مَـالًا فَسَـلَّطَهُ عَـلَى هَلَكَتِـهِ فِي الْحَـقِّ، وَآخَـرُ آتَـاهُ اللَّـهُ حِكْمَـةً فَهُـوَ يَقْـضِي بِهَـا وَيُعَلِّمُهَـا} (أخرجـه أحمـد: ٣٦٥١، والبخـاري: ١٣٤٣، ومسـلم: ٨١٦).

واتـە: خۆزگـە خواسـتن نیـە مەگـەر لـە دوو شـتاندا، پیاوێـك خـوا مـاڵ و سامانێکی داوەتـێ، زاڵیشـی کـردوە بەسـەر سـەرفکردنی لـە هەقـدا (لـەو ڕێیانـەدا کـە خـوا پێیخۆشـە خەرجـی دەکات)و، ئـەوی دیکـەش (پیاوێکـە) خـوا زانیارییەکـی پێـداوە، بۆخۆشـی کاری پێـدەکات و خەڵکیشـی فێـردەکات.

## هۆی هاتنە خوارەوەی هەردوو سوورەتی (الفلق) و (الناس)

لە بارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو دوو سوورەتە، ئەم سێ گێڕراوەیەی خوارەوە دەهێنین:

### گێڕدراوەی یەکەم:

{عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضی الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتْ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ} (أخرجه مسلم: ٨١٤، والترمذي: ٢٩٠٢، وَقَالَ: حسن صحيح. والنسائي: ٥٤٤٠).

واتە: عوقبەی کوڕی عامیر (رضی الله عنه)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا نابینی ئەمشەو هەندێك ئایەت دابەزێنراون، هەرگیز وێنەیان نەبینراوە، ئەوانیش: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ)ن.

### گێڕدراوەی دووەم:

{عَنْ عَائِشَةَ رضی الله عنه، قَالَتْ: سَحَرَ النَّبِيَّ ﷺ يَهُودِيٌّ مِنْ يَهُودِ بَنِي زُرَيْقٍ، يُقَالُ لَهُ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، حَتَّى كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَلَا يَفْعَلُهُ، قَالَتْ: حَتَّى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَوْ كَانَ ذَاتَ لَيْلَةٍ، دَعَا رَسُول اللَّهِ ﷺ ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ دَعَا، ثُمَّ قَالَ: يَا عَائِشَةُ، أَشَعَرْتِ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ، جَاءَنِي رَجُلَانِ فَجَلَسَ أَحَدُهُمَا عِنْدَ رَأْسِي وَالْآخَرُ عِنْدَ رِجْلِي، فَقَالَ: الَّذِي عِنْدَ رَأْسِي لِلَّذِي عِنْدَ رِجْلِي، أَوْ الَّذِي عِنْدَ رِجْلِي لِلَّذِي عِنْدَ رَأْسِي: مَا وَجَعُ الرَّجُلِ؟ قَالَ: مَطْبُوبٌ، قَالَ: مَنْ طَبَّهُ؟ قَالَ: لَبِيدُ بْنُ الْأَعْصَمِ، قَالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَالَ: فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ وَجُفِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ، قَالَ: وَأَيْنَ هُوَ؟ قَالَ: فِي بِئْرِ ذِي أَرْوَانَ، قَالَتْ: فَأَتَاهَا النَّبِيُّ ﷺ فِي أُنَاسٍ مِنْ أَصْحَابِهِ، ثُمَّ جَاءَ فَقَالَ: وَاللَّهِ يَا عَائِشَةُ لَكَأَنَّ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَأَنَّ نَخْلَهَا رُءُوس الشَّيَاطِينِ، قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُول

**اللَّـهِ ﷺ أَفَلَا أَحْرَقْتَـهُ؟ قَـالَ: لَا أَمَّـا أَنَـا فَقَـدْ عَافَـانِي اللَّـهُ، وَكَرِهْـتُ أَنْ أُثِـيرَ عَـلَى النَّـاسِ مِنْـهُ شَرًّا، فَأَمَـرَ بِهَـا فَدُفِنَـتْ}** (أخرجـه أحمـد: ٢٤٣٩٣، والبخاري: ٥٧١٦، ومسـلم: ٢١٨٩).

واتە: دایکمان عائیشـە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جادووی لێکرا، جوولەکەیەك لـە جوولەکەکانـی بەنـی زوڕەیـق جـادووی لێکـرد، پێـی دەگوتـرا: لەبیـدی کـوڕی ئەعصـەم، تاکـو بەهـۆی ئـەو جـادووەوە وای لێهـات هەنـدێ شـت وای دەزانـی کردوویەتـی، نەشـیکردبوو، هەتـا ڕۆژێـك یـان شـەوێك لـەلام بـوو، پاڕایـەوە، دوایـی پاڕایـەوە، دوایـی پاڕایـەوە (لـە خـوا)، دوایـی فەرمـووی: ئـەی عائیشـە! هەسـتت کـرد لـەو بـارەوە داوام لـە خـوا کـرد، خـوا وەڵامـی دامـەوە؟ دوو پیـاو هاتنـە لام یەکێکیـان لـە لای سـەرم دانیشـت، ئـەوەی دیکـە لـەلای دوو پێیەکانـم، ئەوەیـان کـە لـەلای سـەرم بـوو بەوەیانـی گـوت کـە لـەلای دوو پێیەکانمـە، یاخـود ئـەوەی لـەلای دوو پێیەکانـم بەوەیانـی گـوت کـە لـەلای سـەرم بـوو، (لـە گێڕانـەوەی دیکـەدا هاتـوە کـە ئـەو دووانـە جیبریـل و میکائیـل بـوون) گوتـی: ئـازاری ئـەو پیـاوە چییـە؟ ئـەوی دیکە گوتـی: جـادووی لێکـراوە، گوتـی: کـێ جـادووی لێکـردوە؟ گوتـی: لەبیـدی کـوڕی ئەعصـەم، گوتـی: لـە چ شـتێکدا جـادووی لێکـراوە؟ گوتـی: لـە شـانەیەك و قژێـك کـە لەگـەڵ شـانەدا دێ و، لەکیفـی هێشـووی دارخورمـای نێـر، گوتـی: لـە کوێیـە؟ گوتـی: لـە بیـری (**ذِي أَرْوَان**) عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەگـەڵ کۆمەڵێـك لـە هاوەڵانـی چـوو، تەماشـای کـرد، دوایـی هاتـەوە فەرمـووی: بەخـوا ئـەی عائیشـە! ئاوەکـەی وەك ئاوێـك کـە خەنـەی تێدەکـرێ و ڕەنگـی شـین هەڵدەگـەڕێ، ئاوابـوو، دارخورمایەکانـی وەك سـەری شـەیتان وابـوون، منیـش گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ! بۆچـی نەتسـووتاند؟ فەرمـووی: مـن خـوا چاکـی کردمـەوە، پێشـم ناخـۆش بـوو خراپـە لـە نێـو خەڵکیـدا پەیـدا بکـەم، بۆیـە فەرمانـم کـرد بیرەکەیـان داپۆشـی، (دوای ئـەوەی جادووەکەیـان هێناوەتـەدەر).

## گێڕدراوەی سێیەم:

{عَنْ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ رضى الله عنه، قَالَ: سَحَرَ النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ، قَالَ: فَاشْتَكَى لِذَلِكَ أَيَّامًا، قَالَ: فَجَاءَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام، فَقَالَ: إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْيَهُودِ سَحَرَكَ، عَقَدَ لَكَ عُقَدًا عُقَدًا فِي بِئْرِ كَذَا وَكَذَا، فَأَرْسَلَ إِلَيْهَا مَنْ يَجِيءُ بِهَا، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَلَّمَ عَلِيًّا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَاسْتَخْرَجَهَا، فَجَاءَ بِهَا فَحَلَّلَهَا، قَالَ: فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ كَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَمَا ذَكَرَ لِذَلِكَ الْيَهُودِيِّ، وَلَا رَآهُ فِي وَجْهِهِ قَطُّ} (أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥٦٩، وأحمد: ١٨٧٨١ والنسائي في الكبرى: ٣٥٤٢، وعبد بن حميد: ٢٧١، سنده صحيح).

واتە: زەیدی کوڕی ئەرقەم ﷺ دەڵێ: پیاوێك لە جوولەکەکان جادووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش چەند ڕۆژێک ئازاری هەبوو، ناڕەحەت بوو، جیبریل هاتە لای (مُعَوِّذَتَيْن)ی بۆ دابەزاندو، پێی فەرموو: پیاوێك لە جوولەکە جادووی لە تۆ کردووە، جادووەکەش لە فڵان شوێندایە، پێغەمبەری خوا عەلی خوا لێی ڕازیبێ نارد، جادووەکەی هێناو گرێیەکانی کردنەوە (فەرمانی پێکرد هەر گرێیەك بکاتەوە، ئایەتێك بخوێنێ، ئەویش هەر گرێیەکی دەکردەوەو ئایەتێکی دەخوێند) پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چۆن کەسێك بە گوریسێك دەبەسترێ، دوایی بەردەبێ، بەو شێوەیەی لێهات، چاکبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی بۆ ئەو جوولەکەیە باس نەکردووە، بابای جوولەکە هەرگیز لە ڕووی پێغەمبەریش دا هەستی پێ نەکرد.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە:

١- ئەم سووڕەتە موبارەکە بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە دەخوێنم.

٢- بە مەبەستی ڕازییکردنی خواو، بەدەستهێنانی پاداشتی خوا دەیخوێنم، بە پێی بەرنامەی خوا دەیخوێنم.

٣- بە پشت و هێزو توانای خوا دەیخوێنم.

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ١﴾، بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری سپێدەو بەرەبەیان، کاتێك ڕووناکییەکەی لە تاریکیی جیادەبێتەوە، یاخود: پەروەدگاری قلیشاندنی هەموو تۆو نێوکەکان، دوای چەکەرە دانیان، یاخود پەروەردگاری سەرجەم ژیانداران، دوای دەرهاتنیان لە دەریای بێ ژیانیی، یاخود پەروەردگاری هەموو دروستکراوەکان و، هێنانەدەریان لە دەریای تاریکیی نەبوون.

﴿مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ٢﴾، لە خراپەی هەرچی دروستیکردوە، هەموو ئەو شتانەی خوا دروستیکردوون و خراپەیان هەیە، خوایە! پەنا بەتۆ دەگرم لە هەموویان.

﴿وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ﴾، لە خراپەی شەوی تاریك کە تاریکییەکەی دێ و هەموو شتێك دادەپۆشی، لەبەر ئەوەی شەوی تاریك مەزەنەی ئەوەیە شەیتانەکان تێیدا بڵاودەبنەوە، جڕو جانەوەر تێیدا بڵاودەبێتەوە، پیاو خراپ تێیدا بڵاودەبنەوە، دزو جەردەو ڕێگر، ئەوانەی بیانەوێ زیان لە خەڵکی بدەن، لە تاریکی شەو دەرفەت وەردەگرن.

﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلۡعُقَدِ ﴾، لە خراپەو زیانی ئافرەتانی فوو لەگرێیانکەر، واتە: ئەو ئافرەتانەی جادوو دەکەن، شت گرێ دەدەن و فووی لێ دەکەن، لە کاتێکدا هەندێك قسە دەکەن و، ناوی هەندێك لە شەیتانەکان دەهێنن.

﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾، لە خراپەو زیانی بابای حەسوود کە حەسوودییەکەی دەخاتە حاڵەتی کردارییەوە، ﴿إِذَا حَسَدَ ﴾، واتە: بەوەندە ئیکتیفا ناکات حەسوودیی لە دڵ و دەروونیدا هەبێ، بەڵکو کاری پێدەکات.

## مەسەلە گرنگەکان

هەموو سووڕەتەکە دەکەینە یەك مەسەلە:

**فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەرەکەی (موحەممەد) ﷺ، کە پەنا بەرێتە بەر پەروەردگارو خاوەنی سپێدە، یان پەروەردگارو خاوەنی قڵیشاندنی تاریکیی لە ڕووناکیی، یان خاوەنی قڵیشاندنی دەنك و تۆوەکان، یاخود: جیاکردنەوەی بوون لە نەبوون، لە خراپەو زیانی دروستکراوەکان بە گشتیی، بە تایبەت شەو کە تاریك دادێ و، ئافرەتانی جادووگەری فوو لە گرێیانکەر، هەروەها بابای ئێرەیی بەر کاتێك ئێرەییەکەی کارپێدەکات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ۝١ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ۝٣ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ۝٤ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ۝٥﴾.

### شیکردنەوەی ئەم سووڕەتە پێنج ئایەتییە لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾، بڵێ پەنادەگرم بەپەروەرگاری قڵیشاندن، **(الطبري)** دەڵێ: **(وَالفَلَق في كَلامِ العَرَبِ: فَلَق الصُّبْحِ)** وشەی فەلەق لە قسەی عەڕەباندا بە قڵیشانی بەرەبەیان دەگوترێ، دەگوترێ: **(هُوَ أَبْيَنُ مِنْ فَلَقِ الصُّبْح)** فڵان شتە ڕوونترە، ئاشکراترە لە قڵیشانی بەیان.

هەروەها گوتراوە: (القلق: **فَلْق ظُلْمَةِ العَدَمِ عَن صُبْحِ الوُجُودِ**)، کە واتایەکەی گشتییترە، واتە: قڵیشاندنی تاریکیی نەبوون لە بەرەبەیانی بوون، دەرهێنانی بوون لە تاریکیی نەبوون، یاخود: دەرهێنانی هەموو چەکەرەکان لە دەنك و

تۆوەكان كـە دەخرێنـە بـن زەوی، یاخـود: دەرهێنانـی هەمـوو ژیانـداران كـە پێشـتر بـێ ژیـان بـوون، لەچـی؟

٢)- ﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴾، له خراپەی هەرچی دروستیكردوە، **(الطبري)** دەڵێ: **(مِنْ شَرِّ كُلِّ شَيْءٍ، إِذْ كَانَ كُلُّ مَا سِوَاهُ، فَهُوَ مَا خَلَقَ)** له شەڕی هەموو شتێك، چونكە هەرچی جگە له خوایە، هەمووی (دروستكراوی خوایە و) ئەوەیە كر دروستی كردووە.

ئنجـا لـە نێـو خراپـەی دروسـتكراوەكاندا، سـێیانیان كـە زەقـترن لـە خراپییـدا، دەیانهێنــێ:

٣)- ﴿ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴾، له خراپەی شەو كە تاریك دادێ، **(غاسِق)**: هەر شتێكە شتێك تاریك دابێنێ، شەوگار سەر زەوی تاریك دادێنێ، شەوگار كە هاتە سەرزەوی، زەوی تاریك دادێ.

**(وَقْـب)** بـەو كونـە بـەردە دەگوتـرێ، كـە ئـاوی تێـدا كۆدەبێتـەوەو بـە كوردیـی (ماقـۆڕ)ی پـێ دەڵێـن.

٤)- ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِي ٱلْعُقَدِ ﴾، هەروەها له شەڕو زیانی ئافرەتانێكی فوو له گرێیانكەر، یانی: **(السَّواحِر، وَالسَّحَّرة)**، ئافرەتانی جادووگەرو، پیاوانی جادووگەر، چونكە (ٱلنَّفَّٰثَٰتِ ) كۆی **(نَفَّاثَة)**یە، كە ئەویش ڕێژگەی زێدەڕۆیی **(نافِثَة)**یە، **(نافِثَة)** واتە: فووكەر، **(نَفَّاثَة)** زۆر فووكەرو **(نَفَّاثَات)** كۆیەكەیەتی، ئنجا هەندێك له زانایان گوتوویانە: مەبەست پێی **(سواحِر)**ە، یانی: ئافرەتانی جادووگەرو، هەندێك گوتوویانە: نەخێر، مەبەست پێی كۆمەڵانی جادووگەرانن، با پیاویش بن، وەك چۆن دەگوترێ: **(هَذا رَجُل عَلاَّمَة، وَفَهَّامَة)**، دەشگونجێ بگوترێ: **(هَذَا رَجُلٌ نَفَّاثَة فِي العُقَدِ)** ئەمە پیاوێكە زۆر فوو له گرێیان دەكات، زۆر جادوو دەكات، هەردووكیان دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر ڕەنگە ئافرەتان بگرێتەوە، چونكە ئایەتی كۆتایی زیاتر پیاوان دەگرێتەوە.

**(نَفْـث)**: بریتیـە لـەو فـووەی لـە شـتێک دەكـرێ لەكاتـی جادووكـردن داو، وردە تفێكـی كەمـی لەگەڵدایـە، هەندێـك دەڵێـن: تفیـشی لەگـەڵ دا نیـە.

٥)- ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾، هەروەها لە خراپەو زیانی حەسوودیی بەرێك، (ئیرەیی بەرێك) كە حەسوودیی دەبات، (**إذَا أَظْهَرَ مَا فِي نَفْسِهِ مِنَ الحَسَدْ وَعَمِلَ بِمُقْتَضاهُ، وَحَمَلَه الحَسَدُ عَلى إلقاءِ الشَّرِّ بِالمَحْسود**)، كاتێك ئەو حەسەدەی لەدڵیدا هەیە و دەری دەخات و، كار بەپێی داخوازیی ئەو حەسەدەی خۆی دەكات، حەسەد وای لێ دەكات زیان بە بابای حەسوودیی پێبراو بگەیەنێ، ئەگەرنا حەسەد ئەگەر هەر لە دڵ و دەروونی خاوەنەكەیدا بێ، تەنیا خۆی زیانبار دەبێ، وەك گوتراوە: (**لِلَّهِ دَرُّ الحَسَدِ مَا أَعْدَلَه، بَدَأَ بِصَاحِبِهِ فَقَتَلَه**): لە چاوی منی بكەوێ حەسوودیی چەندە دادگەرە لە خاوەنەكەی خۆیەوە دەستی پێكردووەو كوشتوویەتی.

## کورتە باسێک

## پێگـەی فەلـەق و نـاس و، جادوولێکرانـی پێغەمبـەری خـواو، هەڵوێسـتی عەبدوڵـڵای کـوڕی مسـعوود لەبـارەی ئـەو دوو سـوورەتەوە:

**ئەم کورتە باسە لە سێ بڕگان دەخەینە ڕوو:**

بڕگـەی یەکـەم: چەنـد فەرموودەیـەك لەبـارەی پێگـەی هـەردووك سـوورەتی (الفلـق) و(النـاس)ەوە.

بڕگـەی دووەم: قسـەیەکی کـورت و پوخـت لـە بـارەی جادوولێکرانـی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ.

بڕگـەی سـێیەم: لـە بـارەی هەڵوێسـتی عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوودەوە رضي الله عنه کـە نکووڵیـی کـردوە ئـەم دوو سـوورەتە، قوڕئـان بـن و گوتوویەتـی: تەنیـا دوو دوعـان، پێغەمبـەری خـوا ﷺ خوێندوونـی.

**بڕگەی یەکەم: حەوت فەرموودە لەبارەی پێگەی بەرزی ئەو دوو سوورەتەوە:**

**١- {عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَيْتُ الْمَدِينَةَ فَلَقِيتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ، فَقُلْتُ لَه أَبا المُنذِرْ: إِنِّي رَأَيْتُ إِبْنَ مَسْعودٍ، لَا يَكْتُبُ الْمُعَوِّذَتَيْنِ فِي مُصْحَفِهِ، فَقَالَ: أَمَا وَالَّذِي بَعَثَ مُحَمَّداً بِالحَقِّ، لَقَدْ سَأَلْتُ رَسولَ اللهِ ﷺ عَنْهُمَا، وَمَا سَأَلَني عَنْهُما مُنْذُ سَأَلْتُ، غَيْرُك، قَالَ: قِيلَ لِي قُلْ، فَقُلْتُ، فَقُولُوا، فَنَحْنُ نَقُولُ مَا قَالَ النَّبِيُّ ﷺ}** (أخرجه أحمد: ٢١٢٢٤، والبخاري: ٤٩٧٦، والحميدي: ٣٧٤، والنسائي في تفسيره: ٧٤٦).

واتـە: زیـرری کـوڕی حوبەیـش رضي الله عنه دەڵـێ: چوومـە مەدینـە، گەیشـتمە ئوبەیـی کـوڕی کەعـب، پێمگـوت: ئەبـا مونزیـر! عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوودم رضي الله عنه بینـی

لـە موصحەفەکەیـدا (مُعَوِّذَتَـيْن) نانووسـێ، ئەویـش گوتـی: سـوێند بـەو کەسـەی موحەممـەدی بـە هـەق نـاردوە، لـەو بـارەوە لـە پێغەمبـەری خـوام ﷺ پرسـی، لـەو کاتـەوەش کـە مـن لێـم پرسـیوە، بێجگـە لـە تـۆ (کـە ئێسـتا لێـم دەپرسـی) هیچکـەس پرسـیاری لـێ نەکـردووم، لێـم پرسـی، ئەویـش فەرمـووی: پێـم گوتـراوە، بڵـێ، گوتوومـەو، ئێـوەش بڵێـن، وەك مـن گوتوومـە، (ئنجـا ئـەو هاوەڵـە گوتـی:) ئێمـەش ئـەوە دەڵێیـن، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتـی.

٢- {عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أُنْزِلَ عَلَيَّ آيَاتٌ لَمْ أَرَ مِثْلَهُنَّ: الْمُعَوِّذَتَيْنِ ثُمَّ قَرَأَهُمَا} (أخرجه مسلم: ٨١٤).

واتـە: عوقبـەی کـوڕی عامـرٍ ﷺ دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ئـەم شـەو چەنـد ئایەتێکـم دابەزینـە سـەر، هەرگیـز وەك وێنـەی وانـم نەبینیـوە: دوو پوناپێبـەرەکان [النـاس) و (الفلـق]، دوایـی خوێندنیـەوە.

٣- {عَن عُقْبَة بنِ عَامِر رضى الله عنه، قَالَ: قُلْت يَا رَسُولَ الله، أَقْرأُ مِنْ سُورَة يوسُف وَسورَة هُود، قَالَ: يَا عُقْبَة! إقْرأ بِأعوذُ بِرَبِّ الفَلَق، فَإنَّك لَنْ تَقْرأ بِسُورَةٍ أَحَبَّ إلَىَ الله عَزَّ وَجَلّ وَأَبْلَغ عِنْده مِنْهَا، فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَنْ لا تَفوتَكَ فَافْعَل} (أخرجه ابن حبان: ١٨٤٢، والحاكم: ٣٩٨٨، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ٢٥٦٦، والنسائي في الكبرى: ٧٨٤٠، والدارمي: ٣٤٣٩).

واتـە: عوقبـەی کـوڕی عامیـرِ ﷺ دەڵـێ: گوتـم: ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ! لـە سـوورەتی یوسـووف و سـوورەتی هـوود بخوێنـم؟ فەرمـووی: ئـەی عوقبـە! سـوورەتی فەلـەق بخوێنـە، سـوورەتێك ناخوێنـی لـە لای خـوا خۆشەویسـترو گەیەنەرتـر بـێ (لـە مانـاو مەبەسـتەکانی دا) لـەم سـوورەتە، ئەگـەر توانیـت هەرگیـز لەدەسـتت نەچـێ (هەمـوو کاتێـك بیخوێنـی) بیخوێنـە.

٤- {أَنَّ ابْنَ عَابِسٍ الْجُهَنِيَّ رضى الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَا ابْنَ عَابِسٍ، أَلَا أُخْبِرُكَ بِأَفْضَلِ مَا تَعَوَّذَ بِهِ الْمُتَعَوِّذُونَ؟ قُلْتُ: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَقُلْ أَعُوذُ

بِرَبِّ النَّاسِ} (أخرجه النسائي في الكبرى: ٧٨٤٧، وابن سعد (٢١٢/٢)، والبيهقي في شعب: ٢٥٧٤، وأخرجه أيضًا أحمد: ١٧٤٢٧، وصححه الألباني).

واتە: ئیبن و عابیس ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی کوڕی عابیس! هەواڵت پێ نەدەم بە باشترین شتێك كە پەنابەران پەنایان پێ بردوە بە خوا؟ گوتم: با ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) [ئەوانە دوو سوورەتە پەناپێبەرەکانن بەخوا].

٥- {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخدري رضى الله عنه، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَعَوَّذُ مِنْ عَيْنِ الْجَانِّ، وَعَيْنِ الإِنْسِ، فَلَمَّا نَزَلَتْ الْمُعَوِّذَتَانِ، أَخَذَ بِهِمَا وَتَرَكَ مَا سِوَى ذَلِكَ}(أخرجه الترمذي: ٢٠٥٨، وإسناده حسن، وله شواهد، وابن ماجه: ٣٥١١، والنسائي: ٥٤٩٤).

واتە: ئەبوو سەعیدی خودریی ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە چاوی جندو لە چاوی مرۆڤان پەنای بە خوا دەگرت، دوعای دەکردن، کاتێك (مُعَوِّذَتَانِ) دابەزین، ئەو دوو سوورەتەی گرتن و، دوعایەکانی دیکەی واز لێ هێنان.

٦- {عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضى الله عنهما، قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ اقْرَأْ يَا جَابِرُ، قُلْتُ: وَمَاذَا أَقْرَأُ بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: اقْرَأْ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ، فَقَرَأْتُهُمَا، فَقَالَ: اقْرَأْ بِهِمَا وَلَنْ تَقْرَأَ بِمِثْلِهِمَا} (أخرجه النسائي: ٥٤٤١، وابن حبان: ٧٩٦).

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی جابیر بخوێنە! گوتم: دایك و بابم بە قوربانت بن چی بخوێنم؟ فەرمووی: (أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ و قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ) بخوێنە، منیش خوێندمن، فەرمووی: بیانخوێنە هەرگیز وێنەی ئەو دووانە ناخوێنی.

٧- {عَنْ عَائِشَةَ ﷺ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ، كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ بِيَدِهِ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا} (أخرجه البخاري: ٤٧٢٨، ومسلم: ١٧٢٣).

واتـە: دایكـمان عائیشـە رضـی اللـە عنهـا، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگـەر ئازارێكـی ببوایـە (**معوذتین**)ی بەسـەر خۆیـدا دەخوێنـدن و، فـووی لـە خـۆی دەكرد، كاتێك ئـازاری زۆربـوو، مـن ئـەو دوو سـوورەتەم بەسـەردا دەخوێنـدن، بـەڵام لەبـەر بەرەكەتـی، دەسـتی خۆیـم بەسـەر خۆیـدا دەهێنـا.

## بڕگـەی دووەم: قسـەیەكی كـورت و پوخـت لەبـارەی جـادوو لێكرانـی دەربـارەی ئـەوە كـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ

وەك پێشـتر فەرموودەكەمـان لەبـارەی جادوولێكرانـی پێغەمبـەری خـواوە ﷺ لـە هـۆی هاتنەخوارەكەیـدا هێنـاو، كۆمەڵێـك لـە زانایـان ئـەو فەرموودەیـان ڕەتكردۆتـەوە، لەوانـە: (سـەید قوتـب)، (ئیبنـو عاشـور)، (موحەممـەد عەبـدە)، وێـڕای ژمارەیەكـی دیكـەش.

گوتوویانـە: یەكێـك لـەو تۆمەتانـەی بێبڕوایـان دەیاندایـە پـاڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئەوەبـوو دەیانگـوت: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٨﴾﴾ **الفرقـان**، واتـە: ئێـوە بـەس شـوێن پیاوێـكی جادوولێكـراو دەكـەون، ئنجا ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ جـادووی لێكرابـێ، كەواتـە: قسـەی كافـرەكان ڕاسـتە!

بـەڵام زانایانـی دیكـە، كـە زۆربـەن و ڕایـەكی دیكـەی دوەمیـان هەیـەو، منیـش ڕای دووەمـم بـە دڵـە، دەڵێـن: كافـرەكان كـە دەیانگـوت: پێغەمبـەری خـوا ﷺ جـادووی لێكـراوە واتـە: شـێتەو، عەقڵـی لەسـەر خـۆی نیـە، ئـەوان مەبەسـتیان پێـی ئـەوە بـووە، بـەڵام ئـەوەی لـەو فەرموودەیـەدا هاتـووە، وەك دایكـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) گێڕاویەتـەوە، ئەوەیـە كـە ئـازاری لـە جەسـتەیدا پەیـدا بـووەو، جـاری واش هەبـووە وایزانیـوە شـتێكی كـردوەو نەشـیكردوە، واتـە: جادووەكـە زیانـی بـە جەسـتەی گەیانـدوەو بـە ژیانـی ڕۆژانـەی گەیانـدوە، بـەڵام زیانـی بـەو لایەنـەی نەگەیانـدوە كـە پەیوەندیـی بـە پێغەمبەرایەتییـەوە هەیـە، پێغەمبـەران صـەڵات و سـەلامی خوایـان لێبـێ لـەوە پارێـزراون، بـەڵام وەك پێغەمبـەران چـۆن لـە زەبـرو

تیرو شیری خەڵك نەپارێزراون، لە جادووش نەپارێزراون، هەروەها لە ڤایرۆس و میکرۆبەکانیش نەپارێزراون، لە ڕووی جەستەییەوە، بەڵام لە ڕووی فیکریی و ڕووحییەوە کە پەیوەندیی هەیە بە پەیامی خواوە، خوای پەروەردگار پێغەمبەرانی لەوە پاراستووەو دەقەکەش کە هێنامان، باسی ئەوە ناکات کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی گەیاندنی پەیامی خواوە، زیانێکی پێ گەیشتبێ، بەڵکو تەنیا لەڕووی جەستەییەوە ئازاری هەبووەو ناڕەحەت بووە، ئنجا کە ئەو دوو سوورەتە موبارەکەی بەسەردا خوێنراونەوە، کە بەهەردووکیان یازدە (١١) ئایەتن، (الفلق) پێنج و سوورەتی (الناس)یش شەش، جادووەکە بە تاڵ کراوەتەوە، وەك چۆن شتێك بەستراوەتەوەو دوایی بەر دەبێ، ئاوا بەو شێوەیە پێغەمبەری خواش ﷺ کاریگەریی جادووەکەی لەسەر نەماوە، کەواتە: وەك چۆن نەخۆش بووە، ئەو جادووەش لە ڕووی جەستەییەوە زیانی پێ گەیاندوە، بەڵام لەو ڕووەی کە پەیوەندیی بە پەیامی خواوە هەیە، زیانی پێ نەگەیاندوە.

### بڕگەی سێیەم: هەڵوێستی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ لە بارەی ئەم دوو سوورەتەوە:

شتێکی باوو زانراو بووە کە (عبدالله ابن مسعود) نکوڵی کردووە لەوەی هەردووك سوورەتی (الفلق) و (الناس) دوو سوورەتی قورئان بن[١]، بەڵام زۆرێك لە زانایان گوتوویانە: دواتر عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود گەڕاوەتەوە بۆ ڕای گشتی هاوەڵان، گرنگ ئەوەیە هاوەڵان هەموویان یەکدەنگ بوون، لەسەر ئەوەی ئەم دوو سوورەتەش دوو سوورەتن، لەوانەی خوای پەروەردگار بۆ پێغەمبەری خاتەمی ﷺ دابەزاندوون، ئنجا زانایان هەندێکیان گوتوویانە:

---

(١ ) لە کتێبی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەرەدا) بە درێژیی باسی ئەو بابەتەمان کردووەو، کتێبی ناوبراویش لە چاپی دووەمی ئەم تەفسیرەدا، دەبێتە پێشەکی گشتی کۆی تەفسیرەکەو دەخرێتە سەرەتای بەرگی یەکەمەوە.

عەبدڵڵای کوڕی مەسعوود بۆیە لە موصحەفەکەی خۆیدا نەینووسیون، چونکە لە بەری بوون[1].

زۆربەشیان گوتوویانە: پێی وابووە دەبێ وەك دوو دوعا بخوێنرێن، نەك وەك دوو سوورەت، بێگومانیش ئەگەر (إبن مسعود) لەسەر هەڵوێستەکەی خۆی سوور بووبێ و نکووڵیی کردبێ کە ئەمانە دوو سوورەتن، بەهەڵەدا چووەو، قسەی تێکڕای هاوەڵان ڕاستەو، ئەو جۆرە قسەو بیروڕاو هەڵوێستە ڕێزپەڕو دەگمەنانە هیچ ئیعتیباریان نیە.

---

(١) ئەو پاساوەش بێهێزە، چونکە (إبن مسعود) کۆی سوورەتەکانی قورئانی لەبەر بووە.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمــڕۆ ڕۆژی عاشــوڕایە (١٠)ی (محــرم)ی ســاڵی (١٤٤٢)ی کۆچییــە، بەرانبــەر (٢٠٢٠ /٨/٢٩) زایینیــی، لــە شــاری هەولێــر، خــوا پشــتیوان بــێ دەســت دەکەیــن بــە تەفسـیرکردنی سـووڕەتی کۆتایـی لـە قورئانـی بـەرزی بـە پێـز، کـە ئەویـش بریتیـە لـە سـووڕەتی (النـاس)و، سـەرەتاش لەحـەوت بڕگـەدا پێناسـەو نێـوەڕۆکی دەخیەنـە ڕوو:

## پێناسەی سووڕەتی (الناس) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئــەم ســووڕەتە موبارەکــە نــاوی باوتــری بریتیــە لــە: (**سُــورَةُ النَّــاس**)، بــەڵام ئــەم ناوانــەش بــۆ بەکارهاتــوون:

**١**- سووڕەتی: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾.

**٢**- (**المعوذة الثانية**).

**٣**- هەروەها لەگەڵ (**سُورَةُ الفلق**) دا بە: (**المعوِّذتين**) و (**المُشَقْشِقَتَيْن**) و (**المُقَشْقِشَتَيْن**)، ناونراون، (شقشق و قشقش)ش هەردووکیان یانی: (صوَّت) دەنگی لێهات، دەنگی پەیدا کرد، یاخود: (**برأ**) چاك بووەوە، یان ئامادەبوو بۆ چاکبوونەوە، واتە: ئەم دوو سووڕەتە بە پێزە، مایەی لابردنی دەردو نەخۆشیی و گرفتاریین، لە کەسێك کە بەدڵێکی پڕ لە قەناعەتەوە بیانخوێنێ.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ڕاجیایی لەو بارەوە هەیە، پێشتر لە تەفسیرکردنی سوورەتی (الفلق)دا باسمان کرد، لەوێش گوتمان و لێرەش دەیڵێم: پێم وایە مەدینەیی بوونی ئەم دوو سوورەتە بەهێزترە، بێگومان ئەم دوو سوورەتەش، پێکەوە، یاخوود بە دوای یەکدا دابەزیون، سەرەتا سوورەتی (الفلق)و، دواتر سوورەتی (الناس)، بەڵگەشمان لەسەر مەدینەیی بوونی ئەم سوورەتە، ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوان ﷺ، کە پێشتر زۆربەیانمان هێنان و، پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینە بە هاوەڵانی بەڕێزی فەرموویەتی، یان بە یەکێك لە هاوەڵان بە گشتیی فەرموویەتی: دوو سوورەتم بۆ دابەزیون وێنەیان نەبینراوە، دوایی ئەو دوو سوورەتە موبارەکەی خوێندوونەوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

لە موصحەفدا ژمارەکەی سەدو چواردە (١١٤)یەو سوورەتی کۆتاییە، بەڵام ڕیزبەندیی لە دابەزیندا ئەگەر مەککەیی بێ، کە ئەوەش گریمانەیەکی بێهێزە، ژمارەکەی بیست و یەك (٢١)یان داناوەو، ئەگەر مەدینەییش بێ، لە سەرووی ژمارە سەد (١٠٠)ەوەیە، هەرچۆن بێ ئەم سوورەتە لە دوای سوورەتی (الفلق) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە بە ڕای تێکڕای زانایان، کە پسپۆڕن لە ژماردنی ئایەتەکانی قورئاندا، شەشە، کەسیان نەکەمتر، نەزیاتریان نەگوتوە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە بەم شێوەیە: خوای پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کردوە، هەروەها بە هەر کەسێکی دیکەش کە بە شوێن پێی پێغەمبەری خوادا ﷺ هەنگاو دەنێ و، شایستەیە بەوەی خوای بەرزو مەزن بیدوێنێ، کە لە خراپەو زیانی خوتخوتەکاری دنەدەری خۆ پەنهانکەر، پەنا بە پەروەردگارو حوکمڕان و پەرستراوی خەڵك بگرێ، کە دنەدان و خوتخوتەی بەد دەخاتە سینەی خەڵکەوە، ئنجا ئەوانەی دنەدەدەن و خوتخوتەو خەیاڵی خراپ دەخەنە سینەو دڵی خەڵکەوە، چ لە جندان بن، چ لە مرۆڤان بن.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

دوو تایبەتمەندیی لەم سووڕەتە موبارەکەدا دەخەینە ڕوو:

١- پەنا بە خوا گرتن و باسکردنی هەر سێك سیفەتی: (رَبّ، مَلِك، إِلَه)، ئێرە تەنیا شوێنێکە لە هەموو قورئاندا بەو شێوەیە هاتبێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ۝٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ۝٣ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ۝٤﴾ **الناس**، بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵك، حوکمڕانی خەڵك، پەرستراوی خەڵك، لە خوتخوتەو دنەدانی خراپی ئەو شەیتانەی زۆر خۆی پەنهان دەکات، [خوتخوتەو دنەدانی خراپ دەخاتە دڵی خەڵکەوە].

٢- هەروەها هەردووك تەعبیری: ﴿مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ۝٤ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥﴾ **الناس**، لە هەموو قورئاندا تەنیا لەم سووڕەتە موبارەکەدا هاتوون.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان:

کۆی شەش ئایەتە موبارەکەکەی ئەم سووڕەتە، دەکەین بە دەرسێك.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە شەش (٦) ئایەت پێك دێ، كە سووڕەتی (الناس) لێیان پێكهاتوە: (١-٦) خوای بێ هاوتا فەرمان دەكات بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، دوای ئەویش بە هەر كەسێك كە بە ڕێی ویدا دەڕوات و، بە شوێنپێی دا هەنگاو دەنێ، كە پەنا بگرێ بە پەروەردگاری خەڵك، حوكمڕانی خەڵك، پەرستراوی خەڵك : ﴿ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴾ لە زیان و خراپەی خوتخوتەكەری زۆر خۆ پەنهانكەر، واتە: ئەو كەسەی هاندان و دنەدانی خراپ دەخاتە سینەی خەڵكەوەو، عادەتیشی وایە زۆر خۆی پەنهان دەكات، بە پەنامەكیی كارەكەی خۆی دەكات و، خوتخوتەو دنەدانەكەی بۆ خراپەكاریی، دەخاتە سینەی خەڵكەوە، ئنجا ئەو دنەدەرو خوتخوتەكەرەش، چ لە جندانبێ، چ لە مرۆڤان بێ.

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەكان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵك ﴿١﴾ حوكمڕانی خەڵك ﴿٢﴾ پەرستراوی خەڵك ﴿٣﴾ لە زیان و خراپەی خوتخوتەكەری زۆر خۆ پەنهانكەر ﴿٤﴾ كە خوتخوتە (و دنەدانی خراپ) دەخاتە سینەكانی خەڵكەوە ﴿٥﴾ لە جندان و لە خەڵك}.

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَعُوذُ): واتە: پەنا دەبەم، پەنا دەگرم، (**إِسْتَعَاذَ بِهِ: لَجَأَ إِلَيْهِ، هُوَ عِيَاذُهُ: مَلْجَأُهُ، أَعَاذَ غَيْرَهُ، وَعَوَّذَهُ بِمَعْنَىً**) واتە: پەنای بردە بەر، ئەو پەناگەی ئەو كەسەیە، جگە لە خۆی پەنادا، حەواندیەوە و، پاراستی، یەك واتایان هەیە، دەگوترێ: (**أَعُوذُ بِاللهِ مَعَاذاً**)، پەنا بەخوا دەگرم بە پەنا پێبردن، (**والعوُذَةُ، وَالوَعَاذَةُ، وَالتَّعْوِيذُ، بِمَعْنَىً**) ئەمانە (**عوذة و عاذة و تعويذ**) هەر سێكیان یەك واتایان هەیەو، بریتیە لە دوعایەك كە مرۆڤی پێ پەنا دەدرێ و دەپارێزرێ لە بەڵاو خراپەیەك.

(بِرَبِّ ٱلنَّاسِ): (**رَبُّ كُلِّ شَيْءٍ: مَالِكُهُ**) (ربٌّ)ی هەر شتێك خاوەنی ئەو شتەیە، هەروەها وشەی (ربّ) بە چەند واتایەكی دیكەش هاتوە:

(السَّيِّد): سەرۆك، گەورە.

(**المُرَبِّي**): پەروەردەكەر، بەخێوكەر.

(**القَيِّم**): سەرپەرشتیار.

(**المُنْعِم**): خاوەن چاكە.

(**المُدَبِّر**): تەگبیربۆكار.

(**المُصْلِح**): چاكسازییكار.

(مَلِكِ ٱلنَّاسِ): (**المَلِك: المالِكِ المُطْلَق**)، (ملك) یانی: خاوەنی ڕەها، هەروەها (**مَلِك**) بە مانای (**ذُو المُلْك**) خاوەن حوكمڕانیی و دەسەڵات، (**وَالمَلِك: صَاحِبُ الأَمْرِ وَالسُّلْطَةِ عَلى أُمَّةٍ أَوْ قَبيلَةٍ، أَوْ بِلادٍ**)، دیسان (مَلِك): بە مانای خاوەن فەرمان و دەسەڵات دێ لەسەر كۆمەڵگەیەك، یان لەسەر هۆزێك، یان لەسەر وڵاتێك.

(إِلَٰهِ): (**كُلُّ مَا اتُّخِذَ مَعْبُوداً**) (إِلَٰهِ) هەر شتێكە بە پەرستراو گیرابێ، (**أَلَهَ يَأْلَهُ إِلهاً، أَي: عَبَدَ، أَلَهَ يَأْلَهُ أَلَهَا، أَي: تَحَيَّرَ**).

واتــە: ( إِلَـٰـهِ ) لـە (أَلَـهَ يَأْلَـهُ إِلهـاً)ەوە هاتــوە، بـە مانــای (عَبَـدَ، يَعبُـدُ، عِبَـادَةً) پەرسـتیی، دەپەرسـتێ، پەرسـتن، (إلـه) یـانی: ئـەو زاتـەی دەپەرسـترێ، یـان لـە: (أَلَـهَ يَأْلَـهُ أَلَهـاً)ەوە هاتـوە، واتـە: سەرسـام بـوو، سەرسـام دەبـێ، سەرسـام بوون، پێشـتریش لـە توێژینـەوەی چەمـك و واتـای (أللـه)دا، قسـەی زیاترمـان لەوبـارەوە كـرد، كـە دەگونجـێ ( إِلَـٰـهِ ) لـە شـەیدایی و عەودالّیـی (وَلَـهْ)، یـان پەنهانیـی و شـێراوەیی (لیـاه)ەوە هاتبـێ.

(ٱلْوَسْوَاسِ): واتە: خوتخوتەكەر، دنەدەرو هاندەر بۆ خراپە.

(ٱلْخَنَّاسِ): (خَنَـسَ يَخْنِـسُ خَنْسَـاً وَخُنُوسَـاً وَخِنَاسَـاً: تَأَخَّـرَ، تَـوَارى و غَـابَ) (خنّاس): ڕێژگـەی زێدەڕۆیـی (خَانِـسَ)ە، ئەمیـش لـە (خَنَـسَ)ەوە هاتـوە، واتـە: دواكـەوت، یـان خـۆی شـاردەوە، یـان لـەوێ نەبـوو، كەواتـە: (الخنَّـاس) یانـی: زۆر خۆپەنهانكـەر، زۆر خۆشێرە.

(يُوَسْوِسُ): (وَسْـوَسَ إِلَيْـهِ الشَّـيْطانُ، وَوَسْـوَسَ لَـهُ، وَفِي صَـدْرِهِ وَسْوَسَـةٌ، وَوِسْـوَاسٌ، أي: حَدَّثَـهُ بِمَـا لا يَنْفَـعُ، ومـا لاَ نَفْـعَ فِيـهِ وَلاَ خَـيْرَ)، شـەیتان وەسوەسـەی بـۆ كـرد، وەسوەسـەی بـۆ لا كـرد، یـان دەگوتـرێ، لـە سینەیدا وەسوەسـە هەیـەو ویسـواس هەیـە، واتـە: شـەیتان قسـەی بـۆ كـرد، قسـەیەك هیـچ سوودو خێـرو كەڵكـی نەبـێ، (وَسْوَسَـتِ النَّفْـسُ: يتَكَلَّـمَ بِـكَلاَمٍ خَفْـيّ مُخْتَلَـطٍ لَـمْ يُبَيِّنْـهُ، أَوْ هَمَسَـتْ)، (وَسْوَسَـتِ النَّفْسُ) (واتـە: ئـەو كەسـە دەروونەكـەی قسـەیەكی پەنهانـی تێكەڵـی كـرد، كـە ڕوون نیـە، یاخـود بـە دەنگێكـی كـپ و نـزم قسـەی بـۆ كـرد.

(صُدُورِ ): (جَمْـعُ صَـدرٍ، وَالصَّـدرُ مُقَـدَّم كُلِّ شَيءٍ، صَـدرُ الكِتَـاب، وَصـدْرُ النَّهَـارِ، وَهُـوَ فِي الإِنْسَـانِ الْجُـزءُ الْمُمْتَـدُّ مِـن أَسـفَلِ العُنُـق إِلى فَضَـاءِ الجَـوْفِ، وَسُـمِّيَ القَلْـبُ صَـدْراً لِحُلُولِـهِ بِـهِ)، (صـدور) كـۆی (صـدر)ە ئەویـش پێشـەوەی هـەر شـتێكە، دەگوتـرێ: (صَـدْر الكتـاب) واتـە: سـەرەتای كتێبەكـە، (وَصـدْرُ النَّهَـارِ) سـەرەتای ڕۆژ،(صـدر) لـە مرۆڤـدا بریتیـە لـەو بەشـەی لەخـوار گەردنـەوە دەسـت پـێ دەكات تاكـو بۆشـایی

هەنـاو.

(سـینەی مـرۆڤ بـە بیسـت وچـوار (٢٤) پەراسـوو، دوازدە (١٢) لـەم لاو (١٢) لـەولا، دەورە دراوەو قەفەسـی سـینگ پێکدێنـن) جـاری وا هەیـە (دڵ)یـش بـە (صـدر) ناوبـراوە، لەبـەر ئـەوەی دڵ لـە نێـو سـینە دایـە.

(ٱلۡجِنَّةِ): واتـە: جنـدەکان، (**وَالجِـنُّ خِـلافُ الإِنْـس**) (جند)یـش پێچەوانـەی مرۆڤە، تاکـی جنـد پێـی دەگوتـرێ: (**جنِّـي**)، هـەروەك تاکـی (إنـس) پێـی دەگوتـرێ: (إنسـان) واتـە: مرۆڤـەکان، مـرۆڤ، جنـدەکان، جنـد.

(وَٱلنَّاسِ): (**إِسْمٌ لِلْجَمْـعِ مِـن بَنـي آدَم وَوَاحِـدُهُ الإِنْسَـانُ مِـنْ غَـيْرِ لَفْظِـهِ**)، (الناس) ناوێکـە بـۆ کـۆی وەچـەی ئـادەم، یـان بـۆ کۆمەڵێـك لـە وەچـەی ئـادەم، تاکەکـەی بریتیـە لـە ئینسـان، کـە لـە بێـژەی (النـاس) نیـەو بێژەکـەی جیایـە.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سوورەتە

پێشـتر لـە کاتـی تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الفلـق)دا، هـۆی هاتنـە خـوارەوەی هـەردوو سـوورەتەکەمان بـاس کـرد، بـەڵام لێـرەش ئـەم گێڕراوەیـە دێنیـن:

**{عَـنْ عُقْبَـةَ بْـنِ عَامِـرٍ رضـى اللـه عنـه، عَـنِ النَّبِـيِّ ﷺ قَـالَ: لَقَـدْ أُنْـزِلَ عَـلَيَّ آيَـاتٌ، لَـمْ يُـرَ مِثْلُهُـنَّ: قُـلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ الْفَلَـقِ إِلَى آخِـرِ السُّـورَةِ، وَ قُـلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ النَّـاسِ إِلَى آخِـرِ السُّـورَةِ} (أخرجـه مسـلم: ٨١٤، والترمـذي: ٢٩٠٢، وقـال: حسـن صحيـح. والنسـائي: ٥٤٤٠، وغيرهـم).**

واتـە: عوقبـەی کـوڕی عامـرٍ ﷺ لـە پێغەمبـەری خـواوە ﷺ گێڕاویەتـەوە، کـە فەرموویەتـی: چەنـد ئایەتێکـم دابەزیونە سـەر وێنەیان نەبینـراوە، (دوایـی خوێندیەوە): (**قُـلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ الْفَلَـقِ**) هەتـا کۆتایـی و (**قُـلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ النَّـاسِ**) هەتـا کۆتایـی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

بەڕێـــــزان!

لـە سـووڕەتی (الفلـق)دا خـوای پـەروەردگار فەرمانـی بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کـردو، بـە هـەر کەسێك کـە لـە ڕێـی ئـەوەوە دەڕوا، بـە ئۆممەتەکـەی و بـە شـوێنکەوتووانی، فەرمـووی: بڵـێ پەنـا دەگـرم بـە پـەروەردگاری سـپێدە، بەرەبەیـان، یاخـود: پـەروەردگاری هەمـوو ئـەو شـتانەی خـوا دەیانقڵیشـێنی، چ بـوون (وجـود) کـە لـە نەبـوون (عـدم)ی دەردێنـێ، چ ژیانـداران کـە لـە حاڵەتـی بێژیانییـان دەردێنێ، چ تـۆو نێوکـەکان کەدەیانقڵیشـێنێ و چەکەرەیـان لـێ دەردێنـێ، پەنـا دەگـرم بـەو پـەروەردگارە، لـە خراپـەی هەرچییـەك کـە دروسـتیکردوە، دوایـی خـوای پـەروەردگار سـێ لـەو شـتە خراپانـەی دروسـتیکردوون و، دەگونجـێ زیـان و زەڕیـان بـۆ مرۆڤەکان هەبـێ، ڕوونـی کردوونـەوە: ﴿ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ ﴾، لـە خراپـەی شـەوی تاریـك کـە دادێ، ﴿ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّـٰثَـٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ ﴾، لـە خراپـەو زیانـی فوولێکەرانـی گرێیـەکان، واتـە: ئافرەتانـی جادووگـەر، یاخـود جادووگـەرەکان بـە گشـتیی کـە فـوو لـە گرێیـەکان دەکـەن، ﴿ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾، لـە خراپـەو زیانـی بابـای ئیرەیـی بـەر کـە ئیرەییەکـەی دەخاتـە حاڵەتـی کـردارەوە.

لـەوێ خـوای پـەروەردگار فەرمانـی کـرد بـە پەنابردنـە بـەر پـەروەردگاری جیاکردنـەوەو قڵیشـاندن (فلـق) لـە زیـان و خراپـەی هەرچـی دروسـتیکردوە، ئنجـا زیـان و خراپـەی شـەوی تاریـك کـە دادێ و، جادووگـەرانی فـوو لەگرێیـان کـەرو، حەسـوودی ئیرەییەکـەی جێبەجێکـەر.

بـەڵام لێـرەدا خـوای پـەروەردگار فەرمـان دەکات بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتـە: ئـەم سـووڕەتە دەخوێنـم و نـاوی خـوای لەسـەر دێنـم، وەك هەمووجارێـك لەسـەرەتای تەفسـیری

سـوورەتەکان دا گوتوومانـەو، لێـرەش دووبـارەی دەکەینـەوە، وەك کۆتـا جـار: کاتێـك مـرۆڤ دەڵـێ: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، دەبـێ بـەلای کەمـەوە چـوار واتایـان لـە عەقـڵ و دڵـی خۆیـدا ئامـادە بـکات، واتـە:

١- ئەم کارە تەنیا بۆ خوا دەکەم.

٢- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٣- ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای بەخشەر دەکەم.

٤- ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

ئنجـا دەفەرمـوێ: ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١﴾، بڵـێ: پەنـا دەگـرم بـە پـەروەردگاری خەڵـك، هانـاو پەنادەبەمـە بـەر، خـاوەن و پـەروەردگاری خەڵـك.

﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢﴾، حوکمڕانی خەڵك.

﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣﴾، پەرستراوی خەڵك.

لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا خـوای بـەرز فەرمـان دەکات کـە ئێمـە هانـاو پەنـای ببەینـە بـەر، ئنجـا خـوا خـۆی بـە سـێ سـیفەتان پێناسـە دەکات، ئەوانیـش بریتیـن لـە: (ربّ)، (مَلِـك)، (إلـه)، پـەروەردگارو خـاوەن، حوکمـڕان، پەرسـتراو، واتـە:

سـێ لـە سـیفەتە بەرزەکانـی خـوا بـاس دەکرێـن، یانی: پەنـا بـە خوایـەك دەبـەم کـە هـەم پـەروەردگارو خاوەنـە، هـەم حوکمـڕان و هەمـوو، شـت بەدەسـتە، هـەم پەرسـتراوەو، دەبـێ بەندایەتیـی و ملکەچیـی تەنهـا بـۆوی بکـرێ، لەچـی؟

﴿مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ٤﴾، لـە خراپـەو زیانـی خوتخوتەکـەری زۆر خـۆ پەنهانکـەر، ئنجـا ئایـا ئـەو خوتخوتەکـەرو دنـەدەرە بـەرەو خراپـە، کـە خـۆی زۆر پەنهـان دەکات، چـی دەکات؟

﴿ٱلَّذِى يُوَسۡوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦﴾
ئەو کەسەی خوتخوتەو خەیاڵ و دنەدانی خراپ دەخاتە سینەکانی خەڵکەوە، ئەو خوتخوتەکەرو دنەدەرەش بەرەو خراپە: چ لە جندان بێ، چ لە خەڵك بێ، لە مرۆڤان بێ.

ئەمەش بۆمان دەردەخات کە زەرو زیانی خوتخوتەو دنەدانی شەیتانەکان، چ لە جند بن، کە نایانبینین، چ لە مرۆڤان بن، خوتخوتەو دنەدانی خوتخوتەکەرو هاندەران بەرەو خراپە، زۆر مایەی مەترسییە، بۆیە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الفلق)دا دەفەرموێ: بڵێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری فەلەق (سپێدە، یان قڵیشاندنی تۆو نێوکەکان و دەرهێنانی چەکەرەکانیان، یان: هێنانەدی ژیانداران، یان شەقکردنی دروستکراوان و، دەرهێنانیان لە تاریکیی نەبوون، بۆ ڕووناکیی بوون) لە خراپەو زیانی هەرچی خوا دروستی کردوە، دواییش خوای کاربەجێ سێ لەو شتە خراپانەی دەگونجێ مرۆڤ لێیانەوە تووشی زیان ببێ، دەخاتە ڕوو:

١- شەوی تاریك کە دادێ.

٢- جادووگەرەکان کە فوو لە گرێیەکان دەکەن.

٣- بابای حەسوود کە حەسوودییەکەی دەخاتە حاڵەتی کردەییەوە.

بەڵام لێرەدا پەنا گیراوە بە خوای بەرز و مەزن و، وەسفکراوە بە سێ لە سیفەتە زۆر گەورەو بەرزو گشتگیرەکانی: پەروەرگار، حوکمڕان، پەرستراو، لە خراپەو زیانی خوتخوتەکەری خۆ پەنهانکەر، کە خوتخوتەو دنەدانەکەی دەخاتە سینەکانی خەڵکەوەو، خوتخوتەکەرەکانیش لە جندو مرۆڤن، واتە: کەسێك کە خەڵك هان دەداو دنە دەدا بەرەو خراپە، دەگونجێ جندێك بێ، کە نایبینین و، دەشگونجێ مرۆڤێك بێ کە دەیبینن، بەڵام بەشێوەیەکی پەنهان و لێزانانە، خوتخوتەو دنەدان و خەیاڵە خراپەکەی دەخاتە سینەی خەڵکەوەو، دەیخزێنێتە نێو عەقڵ و دڵیانەوە.

ئەمەش لێی وەردەگیرێ کە:

خراپەو زیانی هاندان و خوتخوتەکردن بەرەو خراپەو تاوان و لادان، لە جۆرە خراپەکانی دیکە، زۆر مەترسیدارترو بەزەرترەو، شایستەی وریایی و ئاگا لێبوونی زیاترە.

ئەگەر سەرنجی واقعی ژیان و گوزەرانی خەڵکیش بدەین، هەروای دەبینین و، هەمیشە خولیاو نیازو مەبەستە خراپ و بەدەکانی خەڵکی بەزەو زەلکاوی گوناهو لادان و تاوان پەلکێش دەکەن و، بەزۆریی گونهانی پەنهان (**باطن الإثم**) چاوگی گوناهی ئاشکرایە (**ظاهر الإثم**)ەو، هەتا ئاویش هەتا لەسەرچاوەوە ڕوون نەبێتەوە، لە جۆگایەدا ڕوون نابێتەوەو، بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستە.

## مەسەلە گرنگەكان

كۆی سوورەتەكە دەكەینە یەك مەسەلە:

**فەرمانكردنـی خـوا بـە پێغەمبەرەكـەی ﷺ كـە پەنـا بگـرێ بـە: پـەروەردگاری خەڵـك و، حوكمڕانـی خەڵـك و، پەرسـتراوی خەڵـك، لـە خراپـەو زیانـی خوتخوتەكەری زۆر خـۆ پەنهانكـەر، كـە خوتخوتـەو خەیاڵـی خـراپ دەخاتـە سـینەكانی خەڵكـەوە، ئـەو خوتخوتەكـەری خۆپەنهانكـەرەش لـە جنـدان و لـە مرۆڤانـە:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾﴾.

### شیكردنەوەی ئایەتەكان، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، بڵێ پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵك، وشەی (رب) لە ئەسڵ دا بە مانای خاوەن دێ، خاوەنی ڕەها، بەڵام وێڕای ئەوە بە مانای (**سَيِّدو مُدَبِّرو مُصلِح متوَلِّي**) واتە: گەورەو سەرۆك و سەرپەرشتیارو چاككەرو مشوورخۆریش دێ.

قۆناغـی یەكەمـی مرۆڤـان لـە خزمـەت خـوادا، ئەوەیـە كـە ئـەو بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو خاوەنیانـەو، هەمـەكارەی دنیـاو دواڕۆژیانـە.

٢)- ﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ﴾، حوكمڕانی خەڵك.

قۆناغـی دووەمـی پەیوەندیـی مرۆڤـان لەگـەڵ خـوادا، ئەوەیـە كـە خـوا حوكمڕانیانـە، سـەرەتا مـرۆڤ هەسـت بـە بەدیهێنراوێتیـی و پەروەردگارێتیـی و

خاوەندارێتیی خوا دەكات بۆ خۆی، بەڵام دوایی هەست دەكات كە خوای بەرزو مەزن، بەڵێ خاوەن و پەروەردگارو بەخێوكەرییەتی، بەڵام حوكمڕانیشیەتی و، ئەو دەبێ بەرنامەی بۆ دابنێ و بۆی دیاریی بكات، چۆن بژی و چۆن نەژی، چی چاكەو چی خراپە، چی حەڵاڵەو چی حەڕامە، چ لە ژیانی تاكیی، چ لە ژیانی خێزانیی، چ كۆمەڵایەتیی، چ سیاسیی دا.

ئنجا دوایی ئەو مرۆڤە بۆی دەردەكەوێ كە دەبێ پەرستنیش بەس بۆ خوا بكرێ:

٣)- ﴿ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾، پەرستراوی خەڵك، دەبێ پەرستش و بەندایەتیی تەنیا بۆ ئەو زاتە بكرێ، كە تاكە پەروەردگارو خاوەنی خەڵكەو حوكمڕانی خەڵكە، بۆیە دەبێ هەر ئەویش تاكە پەرستراوی خەڵك بێ.

هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: لێرەدا كە خوای پەروەردگار ئەو سێ وشەیەی بەكارهێناون: ﴿ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ٣ ﴾، هۆكارەكەی ئەوەیە كە: مرۆڤ سەرەتا تاكو گچكەیەو منداڵە پێویستیی بەوەیە خوا بەخێوی بكات و بیژیەنێ، ئەوەتا كاتێك كۆرپەلەیە لە نێو منداڵدانی دایكی دا، لە ڕێی نێوكیەوە بژیوی دەدات، هەر لە جەستەی دایكی، دوایی كە لە دایك دەبێ و ناوكی دەبڕن، ئنجا خوا دوو مەمكی دایكی بۆ ڕەخساندوون، ئینجا دوای ئەوەی دوو ساڵان شیر دەخوات و لە مەمكی دەبڕنەوە، خوای پەروەردگار وردە وردە سێ و دوو ددانی بۆ دروست دەكات، دوایی وردە وردە مرۆڤ كە لە تەمەندا پێهەڵا دەچێ و دەچێتە قۆناغی گەنجیی و وردە وردە كامڵ بوون، ئنجا هەست بە حوكمڕانیی خوا دەكات، پێشێ هەست بە پەروەردگارێتیی و بەخێوكردنی خوا دەكات بۆی، دوایی هەست بە حوكمڕانیی خوا دەكات، دوایی لە قۆناغەكانی دیكەی تەمەندا، زیاتر هەست بە پەرستراوێتیی خوا دەكات و دەزانێ دەبێ خوا بپەرستێ.

منیـش دەڵێـم: لەهەمـوو قۆناغـەکانی ژیـان و تەمـەنی مـرۆڤ دا: پەروەردگاریـەتی خـوا بـەر لـە هـەر سـیفەتێکی دیکـەی بـۆی دەدرەوشـێتەوە، پاشـان حوکمڕانیـی و سەرپەرشـتیارێتی خـواو، دواتریـش پەرسـتراوێتییەکەی .

ئایا بۆچـی و لەچـی فەرمانکـراوە بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ و، بـە هـەر کەسـێك کـە لـە ڕێـی پێغەمبـەری خاتەمـەوە ﷺ دەڕوات، پەنـا بگـرێ بـە پـەروەردگار حوکمڕان و پەرسـتراوی خەڵك؟

وەڵامی ئەو پرسیارە لە ئایەتی دواتر دایە:

٤)- ﴿ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴾، لە خراپەو زیانی دنەدەرو خوتخوتەکەری زۆر خۆ پەنهانکەر، (شرّ) ئەوەیە کە هەموو لایەك نایانەوێ و، پێچەوانەی (خیر)ە، خێر ئەوەیە هەموو لایەك بۆی ئارەزوو مەندن **(الخَيْرُ ما يَرغَبُ فيه الكُلُّ)** و، هەموو لایەك خوازیارنی کە هەیانبێ، کەواتە: (**شرّ**)بە مانای زیان و خراپە دێ، لە خراپە و زیانی ﴿ ٱلۡوَسۡوَاسِ ﴾، واتە: خوتخوتەکەر، (**الوَسْوَاس: إِسمٌ بِمَعْنى الوَسْوَسَةِ، كَالزِّلْزالِ بِمَعنى الزَّلْزَلَةِ، و المَصْدَر وِسواسٌ مِثْلُ الزِّلزَالِ**) واتە: (**الوَسوَاس**) ناوە و بە مانای وەسوەسەیە، واتە: خوتخەتەو دنەدەر، وەك (**زِلْزالِ**) بە مانای (**زَلْزَلَة**)، لەرزینەوە، بەڵام چاوگی (**وَسْواس**) بریتیە لە (**وِسْوَاس**) واتە: دنەدان، خوتخوتەکردن، وەك (**زَلزَالِ**) واتە: هەژاندن و لەرزینەوە.

کەواتـە: ﴿ ٱلۡوَسۡوَاسِ ﴾، بەکارهێـنراوە بـۆ ئـەو کەسـەی وەسوەسـە دەکات، یاخـود وەسوەسـە دەڵـێ، (**اسْـتُعْمِلَ الشَّـخْص الفَاعِـل لِلوَسْوَسَـةِ و المُتَكَلِّـم بِالوَسْوَسَـة**) وەسوەسـە یانـی چـی؟ (**الوَسْوَسَـةُ: الخَطْـرَةُ الرَّدِيئَـةُ، وَأَصْلُـهُ مِـنَ الوَسْـوَاسِ، وَهـوَ صَـوْتُ الحُـلِيِّ، وَالهَمْـسُ الخَفِـيُّ**) واتـە: وەسوەسـە خەیاڵـی خـراپ و بیرۆکـەی خراپـە (کـە بەسـەر عەقـڵ و دڵـی مرۆڤـدا دێ) بنەڕەتەکـەی لـە (وسـواس)ەوە هاتـوە، کـە بریتیـە لـە دەنگـی خشـڵ و، بریتیـە لـە دەنگـی کپ،(کەسـێك کـە بـە چپـە قسـە بـۆ کەسـێك دەکات.

﴿ ٱلْخَنَّاسِ ﴾: (خَنَسَ، يَخْنِسُ، خَنَساً، وَخُنُوساً، وَخِنَاساً) واتە: خۆی پەنهان کرد، ئنجا (الخنَّاس) ڕێژگەی زێدەڕۆییە لە (خانِس) واتە: خۆپەنهانکەر، ﴿ ٱلْخَنَّاسِ ﴾، واتە: زۆر خۆ پەنهانکەر، عادەتی بۆتە خۆپەنهانکردن و خۆشاردنەوە.

٥)- ﴿ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴾، ئەو (خوتخوتەکەرە خۆپەنهانکەر)ەی بیرۆکەی بەدو خوتخوتەی خراپ دەخاتە سینەکانی خەڵکەوە، دەیخاتە دڵ و سینەیانەوە، سینەکان شوێنی دڵەکانن، دڵ (قلب)یش، چەقی بڕیاردانە لە مرۆڤدا، چەقی ویستن و نەویستنە، چەقی چاکیی و خراپییە، بۆیەش خوای کاربەجێ دڵ (قلب)ی زەم و سەرزەنشتکردووە، وەك فەرموویەتی:

١- ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴿٧﴾ ﴾ **البقرة.**

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ **محمد.**

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ **المطففين.**

هەروەها خوا مەدح و ستایشی دڵ (قلب)یشی کردوە:

١- کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ ﴾ **الرعد.**

٢- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ﴿١٤﴾ ﴾ **الحجرات.**

٣- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ ﴿٢٢﴾ ﴾ **المجادلة.**

٤- هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ ﴿٢﴾ ﴾ **الأنفال.**

چونکە لە ڕێی عەقڵەوە، مرۆڤ شتەکان دەزانێ، بەڵام لە ڕێی دڵەوە، شتەکانی دەوێن یان ناوێن، خۆشیدەوێن یان ڕقی لێ دەبنەوە، دڵ و دەروون چەقی ویستن و نەویستن و هەڵبژاردن و بڕیاردانە، ئنجا لەبەر ئەوەی سینە شوێنی دڵە، بۆیە جاری وا هەیە خوای بەرزو مەزن لە جیاتی دڵ (قلب) باسی سینە (صدر) دەکات، چونکە دڵەکان لە سینەکاندان.

ئنجا ئایا ئەو خوتخوتەکەرو هاندەرە بەرەو خراپە، کێیە؟

٦)- ﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ﴾، لە جندەو لە خەڵکە، لە جندانە کە ئێمە نایانبینین و، لە مرۆڤانیشە.

**(الجِنُّ جمع جنّي، والنَّاس جمع إِنْسان)** **(جِنَّة)** کۆی **(جنّي)**ەو، **(ناس)**یش کۆی **(إِنْسان)**ە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ٦﴾، لە جندان و لە خەڵك، کەواتە: وەك چۆن جند خوتخوتەو خەیاڵ و دنەدانی خراپ دەخاتە دڵ و سینەی مرۆڤەوە، کە بەرەو خراپە بیجووڵێنێ و، دەبێ پەنای لێ بە خوا بگرێ، بە هەمان شێوە لە مرۆڤانیش هەیە، کە هاندەرە بۆ خراپە بە شێوەیەکی پەنهان و لێزانانە و، دەیەوێ ئەو بیرۆکە خراپەیەی مەبەستیەتی بیخاتە عەقڵ و دڵی ئەو کەسەوەی دەیەوێ.

خوای زاناو توانا لەو بارەوە کە کەسانی پەنا بە خوا بردوو، کەسانی پەنا بە خوا گرتوو، کەسانێك هانا بۆ خوا ببەن و لە پەنای خوادابن، شەیتان زەفەریان پێ نابات، لە سوورەتی **(الأعراف)**دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ٢٠١﴾، واتە: بە دڵنیاییی ئەوانەی پارێزیان کردوە، هەر کاتێك هەستێکیان لە شەیتانەوە پێگەیشت، هۆشیار دەبنەوە، یەکسەر دەبنە بینەر(ی فێڵ و تەڵەکەی شەیتان) یانی: شەیتان ناتوانێ فریویان بدات و فێڵیان لێ بکات.

لەو بارەوەش هەندێك شوێنەوار گێڕراونەوەو، هەندێکیان بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ دانراون، بەڵام دوایی زانایانی پسپۆڕ لێکۆڵەرەوە ساغیان کردۆتەوەوو دەرکەوتوە، کە ئەوانە زیاتر لە هاوەڵانەوە هاتوون، بە تایبەت لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە، یەکێك لەوانەش ئەم دەقەیە:

{إِنَّ الشَّيْطَانَ وَاضِعٌ خَطْمَهُ عَلى قَلْبِ ابْنِ آدَمَ، فَإِنْ ذَكَرَ اللهَ خَنَسَ، وَإِنْ نَسيَ اللهَ الْتَقَمَ قَلْبَهُ، فَذَلِكَ الوَسْوَاسُ الخَنَّاس} (أخرجه ابن أبي الدنيا في مكايد الشيطان: ٢٢، والبيهقي في شعب الإيمان: ٥٤٠، وأبو يعلى: ٤٣٠١، قال الهيثمي (١٤٩/٧): فيه عدي بن أبي عمارة، وهو ضعيف).

واتە: شەیتان لووتی لەسەر دڵی ڕۆڵەی ئادەم داناوە، ئەگەر یادی خوا بکات، خۆی پەنهان دەکات و دەکشێتەوە، بەڵام ئەگەر خوای لە یاد چوو، دڵی لە دەم دەگرێ، ئنجا ئەمەیە خوتخوتەکەری زۆر خۆپەنهانکەر.

هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش هاتوە و هەندێك بە فەرمووەشیانداناوە، بەڵام سەنەدەکەی بێهێزەو، ڕای ڕاست - وەك شەوكانیی لە تەفسیرەکەی خۆی (فتح القدیر)دا گوتوویەتی- ئەوەیە کە فەرمووده نیە، (الشوكاني) گوتوویەتی: (**وَالصَّوابُ كَوْنُه كَلام ابنِ عَبَّاسٍ** ﭭ) واتە: ڕای ڕاست ئەوەیە کە قسەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەﭭ:

{**الشَّيْطانُ جَاثِمٌ عَلَى قَلْبِ ابْنِ آَدَمَ، فِإذَا سَهَا وَغَفَلَ وَسْوَسَ، وَإِذَا ذَكَرَ اللهَ خَنَسَ**} (**أخرجه ابن أبي شيبة: ٣٥٩١٩**) واتە: شەیتان ئەژنۆی داکوتاوە لەسەر دڵی ڕۆڵەی ئادەم، ئینجا ئەگەر بێئاگابوو و خافڵا، خوتخوتە دەخاتە دڵی و هانی دەدات بۆ خراپە، بەڵام ئەگەر یادی خوای کرد، دەکشێتەوەو خۆی پەنهان دەکات و خۆی دەشارێتەوە.

کەواتە: لێرەدا خوای بەرزی مەزن فەرمان دەکات بە پێغەمبەری خاتەم محمد ﷺ، لە پشت ئەویشەوە بە ئۆممەتەکەی و پەیڕەوانی، کە پەنا بگرن بە پەروەردگاری خەڵك، حوكمڕانی خەڵك، پەرستراوی خەڵك، لە خراپەو زیانی هەر خوتخوتەکەرێکی زۆر خۆ پەنهانکەر، کە خوتخوتەو دنەدانی خراپی خۆی دەخاتە سینەو دڵی مرۆڤەکانەوە، ئەویش دەگونجێ لە جند بێ و، دەشگونجێ لە خەڵك و مرۆڤان بێت.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە بپارێـزێ لـە هـەر خولیـاو بیرۆکەیەکـی خـراپ، کـە شـەیتانی جنـد دەیخاتـە عەقـڵ و دڵمانـەوە، یاخـود شـەیتانە مرۆڤـەکان دەیانـەوێ چەواشـەمان بکـەن و کڵاومـان لەسـەر بنێـن و هەڵمانخەڵەتێنـن، خـوا بەمیهرەبانیـی و بەزەیـی بـێ سـنووری خـۆی، لـە خراپـەو زیانـی هەمـوو ئـەو خوتخوتەکـەرو دنەدەرانـە، بـەرەو خراپـەو تـاوان و لادان، پەنامـان بـدات و چەپاڵەمـان بـدات و بمانپارێـزێ، چونکـە بەدڵنیایـی بناغـەو سـەرچاوەی چاکیـی، یـان خراپیـی مـرۆڤ، دڵ و دەروون و دیـوی پەنهانیـەتی و، جەسـتەو ڕواڵەتیـش سـێبەرو ڕەنگدانـەوەی نـاخ و دڵیـەتی.

## کورتە باسێک لەبارەی سوورەتی (الفلق) و سوورەتی (الناس)ەوە

بەڕێـــزان!

خـوا پشـتیوان بێـت، کورتـە باسـێك دەخەینـەڕوو، کـە لـە پێنج بابـەت پێکـدێ و هەمووشـیان پەیوەسـتن بـە هـەردوو سـوورەتی (الفلـق) و (النـاس)ەوە:

**بابەتـی یەکـەم: ڕەتکردنـەوەی دەقـی جادوولێکرانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، کـە بوخاریـی و موسـلیم هێناویانـە، هیچکـەس بـۆی نیـە بیکاتـە مایـەی تانەلێدانـی زانایانێـك کـە ڕەتـی دەکەنـەوە:**

مەسـەلەی جادوولێکرانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەلایـەن لەبیـدی کـوڕی ئەعصەمی یەهودییـەوە، کـە پێشـتریش فەرموودەکەمـان هێنـاو دواتریـش دەقەکـەی بەتەواویـی دێنیـن، ئنجـا ژمارەیـەك لـە زانایـان دەقەکـە ڕەت دەکەنـەوە، هەرچەنـدە بوخاریـی بـە ژمـارە: (٥٧٦٥)و، موسـلیم بـە ژمـارە: (١٧١٩) هێناویانـەو، هەندێـك لـە زانایانـی دیکـەی فەرموودەناسـیش هێناویانـە: ئـەو زانایانـەش کـە ڕەتـی دەکەنـەوە، زیاتـر ئـەوە بەبەڵگـە دێننـەوە، کـە یەکێـك لـەو تۆمەتانـەی ناحەزانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆیـان هەڵبەسـتوە، ئـەوە بـووە کـە گوتوویانـە: ﴿إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾﴾، واتـە: ئێـوە تەنیـا بـە دوای پیاوێکـی جادوولێکـراو دەکـەون، دەڵێـن: ئەگـەر ئـەو دەقـە ڕاسـت بـێ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ جـادووی لـێ کرابـێ، کەواتـە: ئـەو تۆمەتـەی ناحـەزانی ڕاسـتە!

بـەڵام زانایانـی دیکـە، کـە دەسـت بـە دەقەکـەوە دەگـرن، لەبـەر ئـەوەی بـە سـەنەدێکی ڕاسـت پێـمان گەیشـتوە، دەڵێـن: ئـەو تۆمەتـەی ناحەزانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ گوتوویانـە، مەبەسـتیان ئەوەیـە ئـەوەی ئـەو دەیڵـێ، قسـەی جادووگەرانـەو

قسـەی شـێتانەیە، یـان: موحەممـەد ﷺ عەقڵـی لـە دەسـتداوەو جـادووی لێکـراوە، هـەروەك تۆمەتباریشـیان کـردوە بـە جادووگەریـی، بـە شـاعیریی، بـە کاهینیـی، بـە هەمـوو ئەوانـە تۆمەتباریـان کـردوە، بـەڵام ئـەوەی فەرموودەکـە دەیڵـێ، ئەوەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە ڕووی جەسـتەییەوە، تووشـی ئـازار و ناڕەحەتیـی بـووە، نـەك لـە ڕووی گەیاندنـی پیامـی خـواوە، تووشـی خەلـەل و کـەم و کورتییـەك بووبـێ، تاکـو ئـەوە ببێتـە بەڵگەیـەك بـۆ ئـەو تۆمەتـەی لەلایـەن ناحەزانیـەوە بـۆی کـراوە!

پێشـتریش گوتـم، مـن ئـەو ڕایـەی زانایانـم بەدڵە،کـە دەڵـێ: فەرموودەکـە لەجێـی خۆیەتـی، چونکـە وەك ئێسـتا قسـەی لـێ دەکەیـن، ئەگـەر تەماشـای ڕواڵەتـی مانـای دەقەکـە بکەیـن، پێویسـت نـاکات بڵێیـن: تۆمەتـی ناحەزانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ وەڕاسـت دەگێـڕێ، دەقەکـە بـەم شـێوەیە:

{عَـنْ عَائِشَـةَ ﵂، قَالَـتْ: سَـحَرَ النَّبِـيَّ ﷺ يَهُـودِيٌّ مِـنْ يَهُـودِ بَنِـي زُرَيْـقٍ، يُقَـالُ لَـهُ: لَبِيدُ بْـنُ الْأَعْصَـمِ، حَتَّـى كَانَ النَّبِـيُّ ﷺ يُخَيَّـلُ إِلَيْـهِ أَنَّـهُ يَفْعَـلُ الـشَّيْءَ وَلَا يَفْعَلُـهُ، قَالَـتْ: حَتَّـى إِذَا كَانَ ذَاتَ يَـوْمٍ أَوْ كَانَ ذَاتَ لَيْلَـةٍ دَعَـا رَسُـول اللَّـهِ ﷺ ثُـمَّ دَعَـا، ثُـمَّ دَعَـا، ثُـمَّ قَـالَ: يَـا عَائِشَـةُ، أَشَـعَرْتِ أَنَّ اللَّـهَ قَـدْ أَفْتَـانِي فِيـمَا اسْـتَفْتَيْتُهُ فِيـهِ، جَـاءَنِي رَجُـلَانِ فَجَلَـسَ أَحَدُهُـمَا عِنْـدَ رَأْسِي وَالْآخَـرُ عِنْـدَ رِجْـلِي، فَقَـالَ: الَّـذِي عِنْـدَ رَأْسِي لِلَّـذِي عِنْـدَ رِجْـلِي أَوْ الَّـذِي عِنْـدَ رِجْـلِي لِلَّـذِي عِنْـدَ رَأْسِي: مَـا وَجَـعُ الرَّجُـلِ؟ قَـالَ: مَطْبُـوبٌ، قَـالَ: مَـنْ طَبَّـهُ؟ قَـالَ: لَبِيـدُ بْـنُ الْأَعْصَـمِ، قَـالَ: فِي أَيِّ شَيْءٍ؟ قَـالَ: فِي مُشْـطٍ وَمُشَـاطَةٍ وَجُـفِّ طَلْعَـةِ ذَكَـرٍ، قَـالَ: وَأَيْـنَ هُـوَ؟ قَـالَ: فِي بِـئْرِ ذِي أَرْوَانَ، قَالَـتْ: فَأَتَاهَـا النَّبِـيُّ ﷺ فِي أُنَـاسٍ مِـنْ أَصْحَابِـهِ، ثُـمَّ جَـاءَ فَقَـالَ: وَاللَّـهِ يَـا عَائِشَـةُ لَـكَأَنَّ مَاءَهَـا نُقَاعَـةُ الْحِنَّـاءِ، وَلَـكَأَنَّ نَخْلَهَـا رُءُوسِ الشَّـيَاطِينِ، قَالَـتْ: قُلْـتُ يَـا رَسُـول اللَّـهِ ﷺ أَفَـلَا أَحْرَقْتَـهُ؟ قَـالَ: لَا، أَمَّـا أَنَـا فَقَـدْ عَافَـانِي اللَّـهُ وَكَرِهْـتُ أَنْ أُثِـيرَ عَـلَى النَّـاسِ مِنْـهُ شَرًّا، فَأَمَـرَ بِهَـا فَدُفِنَـتْ} (أخرجـه أحمـد: ٢٤٣٩٣، والبخاري: ٥٧١٦، ومسـلم: ٢١٨٩).

واتە: دایکمان عائیشـە ﵂ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ جادووی لێکرا، جوولەکەیەك لـە جوولەکەکانـی بەنـی زوڕەیـق جـادووی لێکـرد، پێـی دەگوتـرا: لەبیـدی کـوڕی

ئەعصەم، تاکو بەهۆی ئەو جادووەوە وای لێهات هەندێ شت وای دەزانی کردوویەتی، نەشیکردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك لەلام بوو، پاڕایەوە، دوایی پاڕایەوە، دوایی پاڕایەوە (لە خوا)، دوایی فەرمووی: ئەی عائیشە، هەستت کرد لەو بارەوەی داوام لە خوا کرد، خوا وەڵامی دامەوە؟ دوو پیاو هاتنە لام یەکێکیان لە لای سەرم دانیشت، ئەوەی دیکە لەلای دوو پێیەکانم، ئەوەیان لەلای سەرم بوو بەوەیانی گوت کە لەلای دوو پێیەکانمە، یاخود ئەوەی لە لای دوو پێیەکانم بەوەیانی گوت کە لەلای سەرم بوو، (لە گێڕانەوەی دیکەدا هاتوە ئەو دووانە جیبریل و میکائیل بوون) گوتی: ئازاری ئەو پیاوە چییە؟ ئەوی دیکە گوتی: جادووی لێکراوە، گوتی: کێ جادووی لێکردوە؟ گوتی: لەبیدی کوڕی ئەعصەم، گوتی: لە چ شتێکدا جادووی لێکراوە؟ گوتی: لە شانەیەك و قژێك کە لەگەڵ شانەدا دێ و، لەکیفی هێشووی دارخورمای نێردا، گوتی: لە کوێیە؟ گوتی: لە بیری **(ذِي أَرْوَان)** عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی چوو، تەماشای کرد، دوایی هاتەوە فەرمووی: بەخوا ئەی عائیشە، ئاوەکەی وەك ئاوێك کە خەنەی تێدەکرێ ڕەنگی شین هەڵدەگەڕێ، ئاوابوو، دارخورمایەکانیش وەك سەری شەیتان وابوون، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی نەتسووتاند؟ فەرمووی: من خوا چاکی کردمەوە، پێشم ناخۆش بوو خراپە لە نێو خەڵکیدا پەیدا بکەم، بۆیە فەرمانی کرد بیرەکەیان داپۆشی (دوای ئەوەی جادووەکەیان هێناوەتەدەر).

**(البيهقي)** لە کتێبی **(الدلائل)**دا هێناویەتی، کە ئەو دووەی لەلای سەری و لە لای قاچەکانی وەستاون، جیبریل و میکائیل بوون، هەروەها تیشکی زیاتر دەخاتە سەر فەرموودەکەی پێشووتر، کە **(ابن مردويه)** هێناویەتی لە ڕێی عیکریمەوە، ئەویش لە ڕێی ئیبنو عەبباسەوەو، دەقەکەی بەم شێوەیە:

**{فَلَمَّا أَصْبَحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ غَدَا ومَعَهُ أَصْحَابُهُ إِلَى الْبِئْرِ، فَدَخَلَ رَجُلٌ فَاسْتَخْرَجَ جُفَّ طَلْعَةٍ مِنْ تَحْتِ الرَّاعُوثَةِ، فَإِذَا فِيهَا مِشْطُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَمِنْ مُشَاطَةِ رَأْسِهِ،**

وَإِذَا تِمْثَالٌ مِنْ شَمْعٍ تِمْثَالُ رَسُولِ اللهِ ﷺ، وَإِذَا فِيهَا إِبَرٌ مَغْرُوزَةٌ، وَإِذَا وَتَرٌ فِيهِ إِحْدَى عَشْرَةَ عُقْدَةً، فَأَتَاهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ بِالْمُعَوِّذَتَيْنِ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ، وَحلَّ عُقْدَةً، مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، وَحَلَّ عُقْدَةً، حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، وَحَلَّ الْعُقَدَ كُلَّهَا، وَجَعَلَ لَا يَنْزَعُ إِبْرَةً إِلاَّ وَجَدَ لَهَا أَلَمًا، ثُمَّ يَجِدُ بَعْدَ ذَلِكَ رَاحَةً، فَقِيلَ، يَا رَسُولَ اللهِ، لَوْ قَتَلْتَ الْيَهُودِيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «قَدْ عَافَانِي الله، وَمَا وَرَاءَهُ مِنْ عَذَابِ اللهِ أَشَدُّ} ئەم دەقە تیشكی زیاتر دەخاتە سەر بابەتەكە.

واتە: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی كردەوە، چوو بۆ لای بیرەكە **(ذي أروان)**، كۆمەڵێك لە هاوەڵانیش لەگەڵیدا چوون، پیاوێك چووە نێو بیرەكە، كیفی هێشووە دار خورمای دەرهێنا لەژێر ئەو بەردەی لەسەری دەوەستن بۆ هەڵهێنجانی ئاو، شانەی پێغەمبەری خوا ﷺ و، ئەو مووانەی كە لە كاتی شانەكردندا لێدەبنەوە تێیدابوون، هەروەها پەیكەرێك لە مێو كە پەیكەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو و، چەند دەرزییەكی تێ چەقێنرابوو، هەروەها ژێیەكی چەرم، یازدە گرێی لێ درابوون، جیبریل **(علیه الصلاة والسلام)** هات و دوو پەناپێبەرەكە (ئەلموعەوویزەتەین)ی بۆ هێنا: {سوورەتی (الفلق و الناس)}، گوتی: ئەی موحەممەد ﷺ ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ۝١ ﴾، گرێیەكی كردەوە، ﴿ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ۝٢ ﴾، گرێیەكی دیكەی كردەوە، هەروا بەو شێوەیە یازدە ئایەتەكانی خوێندن، هەرجارێك ئایەتێكی دەخوێند، گرێیەكی دەكردەوە، پاشان هەر دەریدە كە هەڵیدەكێشا، پێغەمبەری خوا ﷺ ئازارێكی دەبوو، بەڵام دواتر ئاسوودەیی بۆ دروست دەبوو، تاكو ئەو ئازار و ناڕەحەتییەی كە بۆی دروست بوو بوو، نەما، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی ئەو جوولەكەیە ناكوژی؟ ئەویش فەرمووی: خوای بەرز منی چاك كردەوە، ئەوەی دوایی لە سزا و ئازاری خواش دەیبینێ، سەختترە.

ڕیوایەتێكی دیكەی ئەم دەقە هاتوە، ئەویش دیسان هەندێك تیشكی زیاتر دەخاتە سەر ئەو ڕووداوە، ئەمەش دەقەكەیەتی:

{إِنَّ الَّـذِي تَـوَلَّى السِّـحْرَ لَبِيـدُ بْـنُ الأَعْصَـمِ وبَناتُـهُ، فَمَـرِضَ النَّبِـيُّ ﷺ، فَنَـزَلَ جِبْرِيـلُ بِالْمُعَوِّذَتَـيْنِ، وأَخْـبَرَهُ بِمَوْضِـعِ السِّـحْرِ، وبِمَـن سَـحَرَهُ، وبِـمَ سَـحَرَهُ، فَأَرْسَـلَ ﷺ عَلِيًّا والزُّبَـيْرَ وعَـمّارًا، فَنَزَحُـوا مـاءَ البِـئْرِ وهـو كَنُقاعَـةِ الحِنَّـاءِ، ثُـمَّ رَفَعُـوا راعُوثَـةَ البِـئْرِ، فَأَخْرَجُـوا أَسْـنانَ الْمُشْـطِ، ومَعَهـا وَتَـرٌ قَـدْ عُقِـدَ فِيـهِ إِحْدى عَـشْرَةَ عُقْـدَةً مُغَـرَّزَةً بِالإِبَـرِ، فَجاءُوا بِهـا النَّبِـيَّ ﷺ فَجَعَـلَ يَقْـرَأُ الْمُعَوِّذَتَـيْنِ عَلَيْهـا، فَـكَانَ كُلَّـما قَـرَأَ آيَـةً، انْحَلَّـتْ عُقْـدَةٌ، ووَجَـدَ عَلَيْـهِ الصَّلاةُ والسَّلامُ خِفَّـةً، حَتّـى انْحَلَّـتِ العُقْـدَةُ الأَخِيرَةُ عِنْـدَ تَمـامِ السُّـورَتَيْنِ. فَقـامَ ﷺ كَأَنَّمـا أُنْشِـطَ مِـنْ عِقَـالٍ} (أخرجـه أحمـد: ج ٤، ص٣٦٧، والنسـائي: ٤١٠٩، وإسـناده صحيـح).

واتـە: ئـەوەی جادووەكـەی كـرد، لەبیـدی كـوڕی ئەعصـەم و كچەكانـی بـوون، (ماڵـە جوولەكەیـەك بـوون)، پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەخـۆش بـوو، جیبریـل دابـەزی و ئەلموعەوویزەتەینـی بـۆ هێنـان، هەواڵیشـی پێدا بـەو شـوێنەی جادووەكـەی لێكراوەو، بـەو كەسەشـی جادووەكـەی كـردوە، هەروەهـا جادووەكەشـی بەچـی كـردوە؟ پێغەمبـەری خـواش ﷺ عەلـی كـوڕی ئەبـوو تاڵیـب و زوبەیـری كـوڕی عـەووام و عەمـماری كـوڕی یاسیری (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) نـاردن، ئـاوی بیرەكەیـان هەڵهێنجـا، وەك ئاوێـك بـوو كـە خەنـەی تـێ دەكـرێ و ڕەنـگ دەگـرێ، بـەو شـێوەیە ئاوەكـەی شـین هەڵگەڕابـوو، دواتـر ئـەو بـەردەی لەسـەری دەوەسـتان، بەردەكەیـان بـەرز كـردەوە، لەژێـر بەردەكـەدا، دەنكەكانـی شـانە هەبـوون، هەروەهـا ژێیەكـی كـەوان كـە یـازدە گرێـی لـێ درابـوون، گرێیـەكان هەموویـان دەرزییـان تـێ چەقێنرابـوون، هێنایـان بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ، ئەویـش سـوورەتی (الفلـق) و (النـاس)ی لەسـەر خوێنـدن، هەركاتێـك ئایەتێكـی دەخوێنـد، گرێیـەك دەبـۆوە و، پێغەمبەریـش قالبـی سـووك و خـۆش دەبـوو، تاكـو گرێـی كۆتایـی بـۆوە لـە كۆتایـی سـوورەتەكاندا، هـەروەك چـۆن كەسـێك بـە پەتێـك دەبەسـترێ، دواتـر كـە پەتەكـەی لـێ دەكرێتـەوە، قالبـی خـۆش و سـووك دەبـێ،، پێغەمبەریـش ﷺ بـەو شـێوەیە بـوو.

ئـەوەی لـە دەقەكانـدا دیـارە، ئەوەیەكـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئـەو جادوویـەی لێـی كـراوە، تەنهـا زیانـی جەسـتەیی پێگەیانـدوە، كەواتـە: پێویسـت نـاكات نكووڵیـی

لـە ڕاسـتی دەقەکـە بکەیـن و بڵێیـن: قسـەی ناحەزانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کـە دەڵێـن: جـادووی لـێ کـراوە، بـە ڕاسـت دەگێـڕێ، چونکـە لـە ڕووی جەسـتەییەوە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ چەندیـن نەخۆشـیی دیکەشـی گرتـوون و، لـە جەنگـی بـەدردا ددانـی پیـرۆزی شـکاوە و سـەری برینـدار بـوو، هەروەهـا جـاری دیکـە نەخۆشـیی دیکـەی گرتـوەو چارەسـەریان کـردوە، ئنجـا بەهەمـان شـێوە ئـەو جادوویـەش کـە لێـی کـراوە زیانـی جەسـتەیی پێگەیانـدوە، کەواتـە: لـەو ڕووەوە نەبـووە زیـان بگەیەنـێ بـە پەیامهێنانـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، هـەروەك لـە هەمـوو دەقەکانـدا ئـەوە بەڕوونیـی دیـارە.

لـە کۆتایـی ئـەم بابەتـەدا قسـەیەکی **(إبـن تیمیـة)** دێنیـن لـە کتێبێکیـدا بـە نـاوی **(المسـودة)**، کـە خاوەنـی **(محاسـن التأویـل**: ج١٠، ص٣٦٥) لێـی خواسـتۆتەوەو قسـەیەکی زۆر حەکیمانەیـە، دەڵـێ:

**{وَلِهَـذا كَانَ الصَّـوَابُ أَنَّ مَـنْ رَدَّ الخَـبَرَ الصَّحِيْـحَ، كَمَا كَانَـتِ تَـرُدُّهُ الصَّحَابَـةُ اعْتِقَـاداً لِغَلَـطِ النَّاقِـلِ أَو كَذِبِـهِ، لاعْتِقَـادِ الـرَّادِّ، أَنَّ الدَّلِيـلَ قَـد دَلَّ عَـلَى أَنَّ الرَّسُـولَ ﷺ لا يُقُـولُ هَـذَا، فَـإِنَّ هَـذَا لاَ يُكَفَّـرُ وَلا يُفَسَّـقُ، وَإِنْ لَـمْ يَكُـنْ اعْتِقَـادُهُ مُطَابِقَـاً، وَقَـدْ رَدَّ غَـيْرُ وَاحِـدٍ مِـنَ الصَّحَابَـةِ، غَـيْرَ وَاحِـدٍ مِـنَ الأَخْبَـارِ الَّتِـي هِـيَ صَحِيْحَـةٌ عِنْـدَ أَهْـلِ الحَدِيـثْ}.**

واتـە: ڕای ڕاسـت ئەوەیـە کـە هەرکەسـێك هەواڵێکـی ڕاسـت ڕەت بکاتـەوە، هـەروەك چـۆن هـاوەڵان جـاری وابـووە هەواڵـی ڕاسـتیان ڕەتکردۆتـەوە، چونکـە ئـەو کەسـەی هەواڵـە ڕاستەکە ڕەت دەکاتـەوە، بـڕوای وایـە بابـای هەواڵهێنـەر بەهەڵـەدا چـووە، یاخـود درۆی کـردوەو، بۆیـە ئـەو دەقـە ڕەتدەکاتـەوە، چونکـە قەناعەتـی وایـە بەڵگـە لەوبـارەوە هەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ قسـەی وا نـاکات، (کەسـی ئاوا کـە هەواڵـی ئـاوا ڕەتدەکاتـەوە)، نـەك بـە کافـر دانانـرێ، بەڵکـو بـە لاڕێـش دانانـرێ، هەرچەنـدە بیـرو ڕایەکەشـی ڕاسـت نەبـێ لەگـەڵ واقیعـدا، چونکـە یەکێـك زیاتـر لـە هـاوەڵان، یەکێـك زیاتـر لـە هەواڵەکانیـان ڕەت کردۆتـەوە، کە لـەلای فەرموودەناسـان ڕاسـتن.

یانی: فەرموودەیەك بوخاریی هێناویەتی ڕەتیان کردۆتەوە، موسلیم هێناویەتی ڕەتیان کردۆتەوە، ئەوانی دیکە کە هێناویانە بەهەمان شێوە، بەڵام بە بەڵگەوە.

کەواتە ڕەتکەرەوەی فەرموودەیەك، کە لە سەرچاوەکاندا بە فەرموودەیەکی ڕاست دانراوە، مادام هەر فەرموودەی ئاحاد بێ و، ڕەتکەرەوەکەی بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێ قەناعەتی وا بێ پێغەمبەری خوا ﷺ شتی وا نافەرموێ، ئەوە نەك نابێ کوفری پاڵ بدرێتە لا، بەڵکو نابێ گوناهباربوونیشی پاڵ بدرێتە لا، بەڵام بە مەرجێك ڕەتکردنەوەکەی لەو ڕووەوە بێ کە پێغەمبەری خوا ﷺ شتی وا نافەرموێ، نەك بڵێ: دەزانم پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بەڵام هەر ڕەتیشی دەکەمەوە! بە دڵنیایی ئەوە کوفرەو مرۆڤ بەوە کافر دەبێ.

## بابەتی دووەم: ئیلهام و خورپەی چاك و، وەسوەسەی خراپ، جیاوازییەکەیان بەهۆی قورئان و سوننەتەوەیە:

هەر شتێك کە دەچێتە نێو دڵی مرۆڤ و، قورئان و سوننەت دەبنە بەڵگەی ئەوەی پارێزکردنە بۆ خواو، خوا لێی ڕازییە، ئەوە پێی دەگوترێ خورپەیەکی باش و ستایشکراو، بەڵام ئەگەر قورئان و سوننەت بەڵگەبن لەسەر ئەوەی بەرەو تاوان و خراپەیە، ئەوە پێی دەگوترێ: وەسوەسەیەکی خراپ، دەبێ ئەو شتانەی بە دڵماندا دێن، بیانگێڕینەوە بۆ تەرازووی شەریعەت، کە لە قورئان و سوننەتدا بەرجەستەیە، ئنجا هەرشتێك پێکەڵپێك و ڕێك بوو لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، دەڵێین: ئەوە ئیلهامێکی خواییە و لە فریشتانەوەیە، بەڵام ئەگەر پێچەوانەی قورئان و سوننەت بوو و، لەگەڵیاندا تێك دەگیرا و مایەی گوناهو تاوان بوو، دەبێ بزانین کە ئەوە خوتخوتە و خەیاڵێکی شەیتانییە.

بێگومانیش مرۆڤ بەوە کە خەیاڵێکی خراپی بەسەر دڵدا دێ، گوناهبار نابێ، بەمەرجێك لە دڵی خۆیدا نەیچەسپێنێ و لێی ڕازی نەبێ و، نەیکاتە عەزم و ویستن و، قسەو کاری پێ نەکات، لەوبارەوەش ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەیە:

{إِنَّ اللـهَ تَعَالَى تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَعْمَلْ أَوْ تَتَكَلَّمْ بِهِ}
**(أخرجه البخاري: ٢٥٢٨، ومسلم: ١٢٧، وأبو داود: ٢٢٠٩، والترمذي: ١١٨٣، والنسائي في الكبرى: ٥٦٢٨، وابن ماجه: ٢٠٤٤).**

واتە: بە دڵنیایی خوای بەرز لە ئوممەتم خۆش بووەو چاوپۆشیی لێکردوە، لەوەی لە عەقڵ و دڵیاندا دێ و دەچێ (لە خوتخوتەو خەیاڵی خراپ) مادام قسەی پێ نەکەن، یاخود کاری پێ نەکەن.

## بابەتی سێیەم: بێگومان پەناگرتن بەخوا، تەنیا بە قسە پێك نایەت، بەڵكو بریتیە لەوەی مرۆڤ لە دڵەوە، پەنا بەخوا بگرێ و، بە کردەوەش خۆی لەو شتانە بە دوور بگرێ کە پەنای لێ بەخوا گرتوون:

واتە: دەبێ کاتێك مرۆڤ دەڵێ خوایە! پەنا بە تۆ دەگرم، دەڵێ: **(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)** پەنا بەخوا دەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو دوورخراوە لە بەزەیی خوا، دەبێ لە دڵەوە وا بڵێ و، بە کردەوەش هەموو ئەو شتانەی پەیوەستن بە شەیتانەوەو، شەیتان پێیخۆشن و مرۆڤیان بۆ هاندەدا، خۆیان لێ بەدوور بگرێ، بەڵام بۆ وێنە: کەسێك کە بە بازاڕێکدا دەچێ، بڵێ: **(أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)**، بەڵام چاوی خۆی لە ڕوانینی حەرام نەپارێزێ و، گوێی خۆی لە بیستنی خراپە نەپارێزێ و، زمانی خۆی لە قسەی خراپ نەپارێزێ و، ئەندامەکانی لە ڕۆیشتن بەرەو خراپە نەپارێزێ، مانای ئەوەیە هەر قسەیەکە و کردوویەتی، پەنا بەخوا گرتن ئەوەیە کە لە دڵەوە مرۆڤ پەنا بەرێتە بەر خوا، بە کردەوەی ئەندامەکانیش خۆی بەدوور بگرێ لە هەمووو ئەو شتانەی پێچەوانەی ڕەزامەندیی خوان و، شەریعەتی خوای پەروەردگار قەدەغەی کردوون و، ڕێی لێگرتوون، هەروەها بەرەو ئەو شوێنانەو ئەو شتانەش خۆی بکوتێ[1]، شەریعەتی خوا فەرمانی پێکردوون و پەسندی کردوون.

---

(١) خۆی بۆگرت: هەوڵی بۆدا، خۆی بەرەولا پەلکێش کرد.

## بابەتی چوارەم: بنك و ڕیشەی بەرو خراپە یان چاكە چوون، لە عەقڵ ودڵ و بیروخولیایەكانیانەوەیە:

بێگومان مرۆڤ لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە، كە دیتن و بیستن و بۆنكردن و تامكردن و دەست لێكوتانن، لە ڕێی ئەو پێنج هەستانەوە زانراوەكان دێنێتە نێو عەقڵ و دڵی خۆی و كەرەستەی خاوی زانیارییەكان كۆدەكاتەوە، كە بریتین لە:

١- بینراوەكان (**المرئيات**).

٢- بیستراوەكان (**المسموعات**).

٣- تامكراوەكان (**المذوقات**).

٤- بۆنكراوەكان (**المشمومات**).

٥- دەست لێدراوەكان (**الملموسات**).

لەو ڕێیانەوە مرۆڤ بەردەوام هەتا پێنج هەستەكانی كار بكەن، زانیاریی دێتە نێو عەقڵ و دڵیەوە.

٦- ڕێیەكی دیكەش كە مرۆڤ دەجووڵێنێ، بریتیە لە هەستە نێوەكییەكان: خەیاڵ دەكات، بیر دەكاتەوە، هەروەها هەستی تووڕەیی هەیە، هەستی ئارەزووی هەیە، واتە: هێزە پەنهانەكانیشی مرۆڤ دەجووڵێنن، وێڕای پێنج هەستەكانیش، مرۆڤ هەم لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە پەیوەندیی دەكات بە جیهانی دەرەوەی خۆیەوە، هەم لە ڕێی هەستە نێوەكییەكانیشەوە دەجووڵێ، ئنجا لە ئەنجامی ئەو شتانەدا كە لە ڕێی پێنج هەستەكانەوە دێن و، لە ئەنجامی هەستە نێوەكییەكان دا، مرۆڤ سەرەتا خولیا (**خاطر**)ێكی بۆ دروست دەبێ، واتە: شتێك كە بە دڵیدا دێ، لە كوردەوارییشدا دەڵێن: (دڵی خەتەرەی كرد)، واتە: شتێك بە مێشكی دادێ، بە دڵیدا دێ، دواتر وردە وردە ئەو خولیاو بە دڵداهاتنە، دەبێتە ئارەزوو، ئنجا دەبێتە ئارەزوو (**رغبة**)، دواتر ئارەزووەكە دەبێتە عەزم، دوایی عەزمەكەش دوای دەبێتە نیازو مەبەستێكی دامەزراو، پاشان ئەو نیازو مەبەستە ئەندامەكان دەجووڵێنێ.

کەواتـە: دەسـتپێکی جووڵانـی ئەندامـەکان، لـەو فیکـرو غایلەوەیـە کـە مـرۆڤ بـۆی دێـت:

أ- چ بەهۆی شوێنەواری پێنج هەستەکانەوە بێ، بۆ وێنە: ئافرەتێکی جوان دەبینێ، تەماشای دەکات، دواتر فیکر و خەیاڵێکی بۆ دێ، چۆن بەو ئافرەتە بگات؟ یان خواردنێك دەبینێ کە حەرامیشە، بەڵام دڵی بۆ دەچێت، یان: شتێك دەبیستێ، یان: بۆنێکی خۆشی بۆ دێ، یاخود تامی شتێك دەکات، یان دەست لە شتێك دەدا، ئەوە لە ڕێی پێنج هەستەکانەوە.

ب- یاخود لەڕێی هەستە دەروونییەکانیەوە بێ ڕق هەڵسانە، خۆشویستنە، ئارەزوو جووڵانە، خەیاڵکردنە، بیرو خەیاڵ و خولیایەك لە عەقڵ و دڵیدا پەیدادەبێ، دوایی لەوێوەوە ئەو خەیاڵ و خولیایە کە لە عەقڵ و دڵیدا پەیدابووە، کە لە سەرەتادا بە ئەسپایی پەیدادەبێ، دواتر وردە وردە دەبێتە ئارەزوو، پاشان دەبێتە عەزم، دواتر دەبێتە نیازو مەبەست، ئنجا کە بوو بە نیازو مەبەست، ئەندامەکان دەجووڵێنێ، کەواتە: مرۆڤ دەبێ ئاگای لەو سەرەتایە بێ، بۆیەش خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ۝٢ إِلَـٰهِ ٱلنَّاسِ ۝٣ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ۝٤ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ۝٦﴾.

واتـە: بڵـێ: پەنـا دەگـرم بـە پـەروەردگاری خەڵـك، حوکمڕانـی خەڵـك، پەرسـتراوی خەڵـك، لـە خراپـە و زیانـی خوتخوتەکـەری زۆر خۆپەنهانکـەر، کـە خوتخوتەکـەی دەخاتـە سـینەی خەڵکـەوە، لـە جنـدو لـە مـرۆڤ.

بۆیـە دەبـێ لەوێـوەوە ئـاگات لێبـێ و لەوێـوە ئاگربەسـتی خـۆت بکـەی، دەبـێ هـەر لەوێـوە لەمپـەری بـۆ دابنێـی، ئەگەرنـا دوای ئـەوەی دەبێتـە بیرۆکـەو خولیـا، ئەگـەر دەرتنەکـردو ڕێـت لێنەگـرت، ببێتـە بیرۆکـەو خولیـا، یـانی: دوای ئـەوەی

خولیایەکەت بەدڵدا هات، دەرت نەکرد، دەبێتە ئارەزوو، ئارەزووەکەش دەبێتە عەزم، دواتر عەزمەکەش دەبێتە نیازو مەبەست، ئنجا کە بوو بە نیازو مەبەست، ئەندامەکانیش دەجووڵێنێ.

ئنجا پێشتریش گوتمان و پێویستە لێرەش ئاماژە بەوە بکەینەوە کە خوا، ﷻ لە سووڕەتی (الفلق)دا دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾﴾.

واتە: بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری سپێدە (یان: پەروەردگاری قڵیشاندنی بوون لە نەبوون، یان پەروەردگاری قڵیشاندنی ژیاندار لە بێ ژیان، یان: قڵیشێنەری تۆو نێوکەکان لەو چەکەرانەی لێیان دێنە دەر) لە خراپەو زیانی هەرچی خوا دروستیکردوە، ئنجا دوایی لە خراپەی شەوی تاریك کە دادێ، هەروەها لە خراپەی جادووگەران کە فوو لە گرێیەکان دەکەن، هەروەها لە خراپەی حەسوود کە کاربە حەسوودییەکەی دەکات.

١- بەڵام لە سووڕەتی (الناس)دا، خوا ﷻ فەرمانی کردوە کە پەنا بگرین بە: پەروەردگاری خەڵك، حوکمڕانی خەڵك، پەرستراوی خەڵك، لە زیان و خراپەی خوتخوتەکەری خۆپەنهانکەر، کە خوتخوتەو خەیاڵ و خولیایەکەی دەخاتە سینەکانی خەڵکەوە، کەواتە: بێگومان خوتخوتە (**وسوسة**) مەترسیی و زیانی زیاترە، چونکە لە ڕاستییدا مرۆڤ کاتێك لە شتەکانی دیکەشەوە زیانی پێدەگات، هەر لەبەرئەوەیە کە بۆ خۆی کەلێنی داوە، شەیتانەکان زەفەر بە مرۆڤێك دەبەن کە لە بەرانبەریاندا بێهێز بێت و بترسێ، هەروەها شتەکانی دیکەش بەزۆریی وایە، بۆیە ئەگەر مرۆڤ لە دەروونەوە پتەوو مەحکەم بێ، مانای وایە لە بەرانبەر شتەکاندا قایم و مەحکەم دەبێ، بۆیەش خوای پەروەردگار ﷻ بۆ قایمکردن و بەهێزکردنی دڵ و دەروونی مرۆڤ، لە بەرانبەر خوتخوتەو دنەدانی خراپدا، کە لە لایەن شەیتانەکانی جند و مرۆڤەوەیە، فەرمانی کردوە پەنای پێ بەرین

و، بە سێ لە سیفەتە بەرزەکانی وەسفی بکەین، کە بریتین لە: پەروەردگارێتیی و حوکمڕانێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی.

## بابەتی پێنجەم و کۆتایی:

لەم بابەتەدا پێنج دەقی سوننەت دێنینەوە، لەبارەی شەیتان و دنەدانیەوە بۆ خراپە، کە لێرەدا مەبەست لە شەیتان لە دەقەکان دا شەیتانی جندە، ئەگەرنا خوای پەروەردگار ناوی لە مرۆڤی خراپەکاریش ناوە شەیتان، کە خەڵك هاندەدات بۆ خراپە: ﴿ شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ ١١٢ ﴾ **الأنعام**، هەروەها لە سووڕەتی (**البقرة**)ش لەبارەی مونافیقەکانەوە کە دەگەڕێنەوەلای گەورەو بڕیار بەدەستەکانیان، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ ﴾، واتە: کاتێك گەڕانەوە بۆ لای شەیتانەکانیان (سەرکردەکانیان).

**دەقی یەکەم:** پێغەمبەری خاتەم ﷺ ئەو ڕاستییەی پێ ڕاگەیاندووین کە هەرکامێکمان شەیتانێکی جندمان لەگەڵدایە، و دەفەرموێ:

**{مَا مِنْكُم مِنْ أَحَدٍ، إِلَّا وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الجِنِّ، قَالُوا: وَإِيَّاكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَإِيَّايَ، إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَعَانَنِي عَلَيْهِ فَأَسْلَمَ، فَلَا يَأْمُرُنِي إِلَّا بِخَيْرٍ} (أخرجه مسلم: ٧٠٣٩، وفي حديث سفيان: «وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الجِنِّ وَقَرِينُهُ مِنَ المَلَائِكَةِ»، أخرجه مسلم:٧٠٤٠).**

واتە: هیچ کامێك لە ئێوە نیە، مەگەر هاونشینە جندەکەی لەگەڵ دانراوە، گوتیان: تۆش ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: منیش، ئەوەندە هەیە خوا یارمەتیی منی داوە لەسەر شەیتانەکەم، مسوڵمان بووە، بۆیە تەنیا فەرمانم پێ دەکات بە چاکە، (موسلیم لەو فەرموودەیەدا کە سوفیان هێناویەتی دەڵێ: هاونشینەکەی لەگەڵ دانراوە لە جندو لە فریشتان) جندەکە فەرمانی پێ دەکات بە خراپەو فریشتەکەش فەرمانی پێ دەکات بە چاکە.

**دەقی دووەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللَّهِ يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ** } (**أخرجه الترمذي: ٢١٤٠، قَالَ: وَهَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ**)، واتە: بێگومان دڵەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوادان، چۆنی بوێ، بەو شێوەیە هەڵگێڕ و وەرگێڕیان دەکات.

لێرەدا دوو پەنجە - وەك زانایانی لێکۆڵەرەوەو ساغکەرەوە دەڵێن- مەبەست پێیان ئەو دوو دروستکراوەن کە خوا لەگەڵ مرۆڤدا دایناون، فریشتەیەك کە هانی دەدا بۆ چاکەو، ئیلهامی بۆ دەکات بۆ خێر و چاکەو، شەیتانێك کە هانی دەدا بۆ خراپە، وەك پێشتریش گوتمان: بۆ ئەوەی ئەو دوو هاندەرە لێك جیابکەینەوە، تەرازوو و پێوەر قورئان و سوننەتە، هەر خوتخوتە و بیر و خولیایەکت هاتە دڵ، لە تەرازووی قورئان و سوننەت دا دایبنێ، ئەگەر مایەی پارێزکاریی بوو، پەسندی خواو شەریعەت بوو، دیارە خورپە و ئیلهامی مەلائیکەیەو ئەگەر پێچەوانەی ئەوەش بوو، مایەی تاوانباریی و خراپەکاریی بوو و لە لای قورئان و سوننەت ڕەتکراوە بوو، ئەوە دیارە خوتخوتە و خەیاڵی شەیتانە.

**دەقی سێیەم:** هەر لەو بارەوە ئەم دەقەش دێنین: {**عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) أَنَّ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حَدَّثَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ مِنْ عِنْدِهَا لَيْلاً، قَالَتْ: فَغِرْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ فَرَأَى مَا أَصْنَعُ، فَقَالَ: مَا لَكِ يَا عَائِشَةُ؟ أَغِرْتِ؟ فَقُلْتُ: وَما لِيَ لَا يَغَارُ مِثْلِي عَلَى مِثْلِكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَقَدْ جَاءَكِ شَيْطَانُكِ؟ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَوْ مَعِيَ شَيْطَانٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: وَمَعَ كُلِّ إِنْسَانٍ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: وَمعَكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَكِنْ رَبِّي أَعَانَنِي عَلَيْهِ حَتَّى أَسْلَمَ**} (**أخرجه مسلم: ٧٠٤١**).

واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) لە دایکمان عائیشەوە (خوا لێی ڕای بێ) هاوسەری پێغەمبەر ﷺ، دەگێڕێتەوە، کە دایکمان عائیشە بۆی باسکردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ شەوێك لەلای ئەوەوە چۆتە دەرێ،

دەڵێ: منیش غەیرەم بەرانبەری کردو شوێنی کەوتم، دواتر کە پێغەمبەر ﷺ گەڕایەوە، زانی، دیتی من چیم کردوە، فەرمووی: ئەی عائیشە، چیتە؟ ئایا غەیرە و هەستی هەوێدارییت جوولا؟ دەڵێ: گوتم: ئنجا چۆن وێنەی من هەستی هەوێداریی نابێ بەرانبەر بە وێنەی تۆ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئایا شەیتانەکەت هاتۆتە لات؟ عائیشە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا شەیتانم لەگەڵدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: هەموو مرۆڤێك شەیتانی لەگەڵدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا تۆش شەیتانت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام پەروەردگارم هاوکاری منی لە دژی شەیتانەکەم کردوە، هەتا مسوڵمان بووە.

لە فەرمایشتەکەی دیکەدا فەرمووی: (**قرينه من الجن**)، لێرەدا دەفەرموێ: (**شيطان**)، واتە: ئەو قەرینە جندەی کە لەگەڵ مرۆڤە، شەیتانە، بەڵام دیارە هی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، خوا ﷻ یارمەتیی پێغەمبەری داوە تاکو مسوڵمان بووەو ئێستا بە چاکە نەبێ فەرمانی پێ ناکات.

**دەقی چوارەم: {عَنْ صَفِيَّةِ بِنْ حُيَيّ (رَضِيَ اللهُ عَنهَا) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُعْتَكِفاً، فَأَتَيْتُهُ أَزُورُهُ لَيْلًا فَحَدَّثْتُهُ، وَقُمْتُ فَانْقَلَبْتُ، فَقَامَ مَعِي لِيَقْلِبَنِي «وَكَانَ مَسْكَنُهَا فِي دَارِ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ» فَمَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَلَمَّا رَأَيَا النَّبِيَّ ﷺ أَسْرَعَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ»، قَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنَ الْإِنْسَانِ مَجْرَى الدَّمِ، فَخَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئاً»، أَوْ قَالَ: «شَرّاً»} (أخرجه البخاري: ٧١٧١، ومسلم: ٥٦٤٣، وأبو داود: ٤٩٩٤، وابن ماجه: ١٧٧٩).**

واتە: صەفییەی کچی حویەی (خوا لێی ڕازی بێ)، (کە هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیعتیکافدا بوو، منیش بە شەو سەردانیم کردو قسەم لەگەڵدا کرد، دواتر هەڵسام بگەڕێمەوە، ئەویش لەگەڵم

هەڵسا بمگەیەنێتەوە ماڵێ، شوێنی نیشتەجێبوونی صەفییەش لە لە خانووەکەی ئوسامەی کوڕی زەیددا بوو، دوو پیاو لە پشتیوانان لەو کاتەدا تێپەڕین، کاتێك پێغەمبەری خوایان بینی ﷺ ئافرەتێکی لەگەڵدایە، بەخێرایی ڕۆیشتن، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: لەسەرخۆبن (ڕاوەستن)، ئەمە صەفییەی کچی حویەییە (واتە: هاوسەری خۆمە)، ئەوانیش گوتیان: پاکیی بۆ خوا، ئەی پێغەمبەری خوا (واتە: شتێکی جێی سەرسوڕمانە، لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە: ئەگەر گومانی خراپ بە هەرکەسێك بەرین، بە تۆی نابەین) ئەویش فەرمووی: شەیتان لە مرۆڤدا بە شوێنی خوێنیدا دەڕوات، منیش ترسام خراپەیەك، یاخود شتێکتان بخاتە دڵەوە.

واتە: خوێن بە کوێی مرۆڤدا جووڵە دەکات، شەیتانیش دەتوانێ بەوێدا جووڵە بکات، ئنجا ئایا مەبەست خودی شەیتانە، کە دەچێتە نێو جەستەی مرۆڤەوە؟ یاخود مەبەست پێ خوتخوتە و خەیاڵەکەیەتی کە دەیخاتە دڵی مرۆڤەوە؟ هەردوو واتایەکەی هەیە.

### دەقی پێنجەم و کۆتایی:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أُحَدِّثُ نَفْسِي بِالشَّيْءِ، لَأَنْ أَخِرَّ مِنَ السَّمَاءِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَتَكَلَّمَ بِهِ؟ قَالَ: فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، اللَّهُ أَكْبَرُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ} (أخرجه أحمد: ٢٠٩٧، وأبو داود: ٥١١٢، والنسائي في الكبرى: ١٠٥٠٣، وابن حبان: ١٤٧).**

واتە: ئیبنو عەبباس ﵄ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من جاری وایە شتێك بە دڵمدا دێ، حەز دەکەم لە ئاسمانەوە بکەومە خوار، ئەوەم پێخۆشترە لەوەی ئەوە بڵێم، کە بە دڵمدا هاتوە؟ گوتی: پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: خوا گەورەترە! خوا گەورەترە! خوا گەورەترە! ستایش بۆ ئەو خوایەی فێڵی وی (شەیتان) گێڕاوەتەوە بۆ دنەدان و خەیاڵی خراپ.

لێرەدا گەیشتینە كۆتایی ڕوونكردنەوەی سووڕەتی (الناس)و، بەمەش كۆتایی دێنین بە تەفسیری سەد و چواردە (١١٤) سووڕەتەكەی قورئانی بەرزو بەپێز.

شایەنی باسە لە ڕۆژی: (١٣-٩-٢٠٠٧)ی زایینیی دا، دەستمان بەم تەفسیرە كردو، ئەمڕۆش: (٢٩-٨-٢٠٢٠) یانی: سێزدە (١٣) ساڵ (١٤) ڕۆژ كەمترە، خەریكی ئەم تەفسیرەین!

بەڵام بێگومان ئەو سێزدە (١٣) ساڵە هەمووی پێكەوە پەیوەست نەبووە، بەڵكو لە ساڵانی سەرەتادا تەنیا لە مانگەكانی ڕەمەزاندا سەرگەرمی ئەم تەفسیركردنە دەبووین، بەڵام لەم چوار پێنج ساڵەی دواییدا، زیاتر دەستم لێ جووڵاندو، لێرەش دا ستایشی خوای پەروەردگار دەكەم و دەڵێم:

**(الحمد لله الذي بنعمته تتم الصالحات)**، ستایش بۆ خوا كە كردەوە چاكەكان بەهۆی چاكەی ویەوە تواو دەبن، بێگومان وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾ ﴾، هەر چاكەیەك لە ئێوەدا هەیە لە خواوەیەو، ئەگەر ئازارو ناخۆشییەكیشتان تووش بوو، هەر پەنا بەخوا دەبەن، ئەگەر هاوكاریی و ئاسانكاریی خوای پەروەردگار نەبووایە، نەماندەتوانی ئەم تەفسیرە تەواو بكەین، كە ئومێدم وایە كەلێنێكی باش پڕ بكاتەوە، نەك هەر بۆ خەڵكی كوردزمان، بەڵكو دواتر بۆ زمانەكانی دیكەش، كە هەندێك بەشی، یان هەمووی وەردەگێڕدرێ، بە تایبەت زمانی عەرەبیی، ئومێدم وایە لەنێو تەفسیرەكاندا دیار بێ و كەلێنێكی باش بگرێ، خوای بەخشەر بیكاتە مایەی بەرچاوڕوونیی بۆ مسوڵمانان، تاكو قووڵتر و فراوانتر و باشتر لە كۆتا فەرمایشتی خوای بەرزی مەزن حاڵیی بن.

خوا بە لوتف و كەرەمی بێ سنووری خۆی یارمەتیی منیش و هەموو خوێنەرانی بەڕێزیش بدات، كە زیاتر لە كۆتا فەرمایشتی خوا وردبینەوەو تێوەی ڕامێنین و لێی حاڵیی بین، پاشان كارلێكی لەگەڵدا بكەین و، هەوڵ

بدەین کۆمەڵگاو دەورووبەری خۆشمان لەگەڵ ئەم فەرمایشتەی خواداو، لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ دا، کە هەر بریتیە لە جێ بەجێکردن و بەرجەستەکردنی فەرمایشتی خوا هاوڕەنگ و هاودەنگ بکەین، خوا تەوفیقمان بدات ژیانمان - لە هەموو بوارەکانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا - هەمیشە لە سێبەری قورئانی بەرزو، بەپێزو کۆتا فەرمایشتی خۆیدا بێ و بەپێیی ڕێبازەکەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بێ.

# نێوەڕۆک